# سەرجەم بەرهەمەکانی





# دکتۆر کەمال مەزهەر

## بەرگی یەکەم

ئامادەکردنی

دکتۆر جەبار قادر     دکتۆر دڵشاد مەحموود
دکتۆر ئازاد عوبێد     دکتۆر کامەران محەمەد

هەولێر ٢٠٢٢

# سەرجەم بەرهەمەکانی
# دکتۆر کەمال مەزهەر

## بەرگی یەکەم

ئامادەکردنی

دکتۆر جەبار قادر          دکتۆر دڵشاد مەحموود
دکتۆر ئازاد عوبێد          دکتۆر کامەران محەمەد

هەولێر ٢٠٢٢

لەسەر ئەرکی ڕێزدار نێچیرڤان بارزانی
سەرۆکی هەرێمی کوردستان
چاپ کراوە

* ناوی کتێب: سەرجەم بەرهەمەکانی - دکتۆر کەمال مەزهەر- بەرگی یەکەم
* ئامادەکردنی: لێژنەی کۆکردنەوەی نووسین و بەرهەمەکانی پ. د. کەمال مەزهەر
* گشت کارە هونەرییەکان و سەرپەرشتی چاپ: عوسمان پیرداود کواز
* وێنەی سەر بەرگ: هونەرمەند نورەدین جاف
* چاپی یەکەم - هەولێر - ٢٠٢٢
* تیراژ: (١٠٠٠) دانە
* چاپخانە: چاپخانەی دانیشفەر- هەولێر
* لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی (٩١٨) ساڵی (٢٠٢٢)ی پێ دراوە.
* نرخ (٦٠،٠٠٠) دینار

## بەرگی یەکەم:

### ئەم کتێبانە لەخۆ دەگرێت:

* کوردستان لە ساڵەکانی شەڕی یەکەمی جیهاندا.
* مێژوو کورتە باسێکی زانستی مێژوو و کورد و مێژوو.
* خەباتی ڕزگاریخوازی کورد و ئازمر لە ئێراندا.

## پێشەکی

مایەی شانازی لێژنەی تایبەتی کۆکردنەوە و بڵاوکردنەوەی بەرهەمە زانستی و ڕووناکبیرییەکانی مێژووناسی ناودار و پەروەردەکاری گەورەی کۆچکردوو پرۆفیسۆر دکتۆر کەمال مەزهەرە، سەرجەم بەرهەمەکانی لە (١٠) بەرگدا بە هەردوو زمانی کوردی و عەرەبی بخاتە بەردەستی خوێنەرە بەڕێزەکان. لەو دە بەرگە شەشی یەکەمیان بە زمانی کوردیین و ئەوانی دیکەشیان، واتا لە حەوتەمەوە تا دەیەم بە زمانی عەرەبیین. ئەمە بەشی یەکەمی ئەو پرۆژە گەورەیەیە کە ئامانجەکەی ئەوەیە سەرجەم کارە زانستی و ڕووناکبیرییەکانی کۆبکاتەوە و سەرلەنوێ لە چاپیان بداتەوە.

دکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد پێشەنگی لێکۆڵەرانی مێژووی نوێی کورد و کوردستانە و بگرە بە دامەزرێنەری قوتابخانەیەکی تایبەتیی مێژوویی کورد دەژمێردرێت؛ چونکە لە حەفتاکانی سەدەی ڕابردووەوە چەندین نەوە بۆ یەکەمین جار لە ڕێگەی لێکۆڵینەوە مێژووییەکانی ئەوەوە سەبارەت بە کورد و کوردستان ئاشنای میتۆدی زانستی بوون لە بواری مێژوودا، کە پێشتر پێی ڕانەهاتبوون. تا ئەو ڕۆژانە خوێنەرانی کورد بەو چیرۆک و ئەفسانانە ڕاهاتبوون کە باسیان لە مێرخاسی و ئازایی میر و سەرکردە خۆجێییەکانیان دەکرد و ئەوانەیان بە سەرچاوە و بەڵگەی مێژوویی دادەنا. کتێب و وتارە مێژووییەکانی دکتۆر کەمال مەزهەر کارێکی وایان کرد، خوێنەرانی ئاسایی و ڕووناکبیرانی نەوەی نوێی کورد، مێژوویان لە لا خۆشەویست بێت و هەوڵبدەن توانای خۆیان بۆ لێکدانەوەی مێژووی نەتەوە ستەملێکراوەکەیان بخەنەگەڕ، ئەوە سەرباری ئەوەی کە دکتۆر کەمال دەورێکی گەورەی هەبوو لە هاندانی چەندین خوێندکار لە بەشەکانی مێژووی زانکۆکان بۆ تەواوکردنی خوێندنی باڵا لە بواری مێژوودا لە ناوەوە و لە دەرەوەی عیراق. جگە لەوەش وانەکانی بۆ قوتابیان کە زۆربەیان کوردیش نەبوون هەمان دەوریان هەبوو لە ڕووکردنە خوێندنی باڵا بۆ خوێندنی مێژوو بە ڕێبازێکی زانستی، ئەو شاگردانە بە درێژایی تەمەنیان و کاروانی زانستییان بە دڵسۆزی و وەفاداری بۆ مامۆستای گەورەیان مانەوە. ئەم کارانەی

تەنیا خوێندکارانی کوردی نەدەگرتەوە، بەڵکو هەموو ئەو خوێندکارانەشی دەگرتەوە کە سەرپەرشتی نامە و تێزەکانی کردوون یان بۆ پرس و ڕاوێژ ڕوویان لێی ناوە بۆ هەڵبژاردنی بابەتی لێکۆڵینەوە و پرۆژەی توێژینەوە زانستییەکانیان.

دکتۆر کەمال بەردەوام ئەوەی دووپات دەکردەوە کەوا بواری مێژووی کورد وەک کێڵگەیەکی نەکێڵراو و نەچێندراوە، بۆیە ئەو ئەرکە مەزنە پێویستی بە چەندین نەوەی توێژەر هەیە بۆ ئەوەی بەشێکی بەجێبێنن. دکتۆر کەمال زۆر بەوە دڵخۆش بوو کاتێ ئاوڕی دواوەی دەدایەوە بەرهەمی کاری پەروەردەیی خۆی دەبینی، کە چەندین توێژەر و پسپۆڕ لە بواری مێژووی کورددا لەوانەی ڕاستەوخۆ بەشداریی لە پێگەیاندنیاندا کردبوو خەریکی کارکردنن لەسەر مێژووی کورد و کوردستان. ئەوانەی سەرپەرشتی نامە و تێزە زانستییەکانیانی کردبوو یا لە ڕێی کتێب و وتار و توێژینەوە مێژووییەکانییەوە کاریگەری لەسەر دانابوون. بەرهەمی زانستیی دکتۆر کەمال مەزهەر جێی بایەخی کۆڕ و ناوەندی بەرفراوانی خوێنەران و ڕووناکبیرانی کورد و عێراقییەکان بوو.

گومان لەوەدا نییە کە کۆکردنەوە و ساغکردنەوەی سەرجەم بەرهەمەکانی مێژووناسێکی پڕ بەرهەمی وەک کۆچکردوو دکتۆر کەمال مەزهەر پێویستی بە پاڵپشتی و هاوکاریی چەندین توێژەر و ڕووناکبیر هەیە، تەنانەت ئەوە ئەرکی دامەزراوەیەکی تایبەتمەندە لەگەڵ چەندین کادیری زانستی و کارگێڕی تەرخانکراو بۆ ئەو کارە، نەک ئەرکی لیژنەیەکی خۆبەخشی چوار کەسیی، کە لێرە و لەوێ کار دەکەن و سێ کەسیان لە هەمان کاتدا مامۆستای زانکۆن و دەبێ سەرقاڵی وانە وتنەوەو و کاری زانستیی خۆیان بن.

ئەم لیژنەیە بەر لە کۆچی دوایی زانای گەورەمان بە چەند ڕۆژێک پێکهات، بە مەبەستی کۆکردنەوەی کارە زانستی و ڕووناکبیرییەکانی و پۆلێنکردنیان و پاشان لە چاپدان و بڵاوکردنەوەیان. لیژنەکە پێی باشە کۆی بەرهەمەکانی خوالێخۆشبوو بەم شێوەیەی خوارەوە بەسەر شەش بەشدا

دابەش بکات:

**بەشی یەکەم:** کە بە خۆشحاڵییەوە وا دەیخەینە بەردەستی خوێنەران، کە هەموو کتێبە بڵاوکراوەکانی بە هەردوو زمانی کوردی و عەرەبی لە دە بەرگدا دەگرێتە خۆ. سەرلەبەری لاپەڕەکانی ئەم بەشە حەوت هەزار و دوو سەد و پەنجا لاپەڕەن.

**بەشی دووەم:** ئەو لێکۆڵینەوە زانستی و وتارانەن کە لە گۆڤار و ڕۆژنامە کوردی و عەرەبییەکاندا بڵاوی کردوونەتەوە. لێژنەکەمان بەشێکی لەو وتارانە بەدەستهێناوە و وێنەیانی گرتووە، بەڵام لەم بوارە هێشتا کاری زۆر ماوە، پێویستی بە هاوکاری ژمارەیەکی زیاتر لە ئەندامانی لێژنەی سەرپەرشتیار هەیە.

**بەشی سێیەم:** ئەم بەشە ئەو کارە زانستی و رۆژنامەوانییانەی دکتۆر کەمال مەزهەر دەگرنەوە کە بە زمانی ڕووسی نووسیونی و بڵاوی کردوونەتەوە و خۆیان لە هەزار و پێنج سەد لاپەڕە دەدەن. ئەمانەیان پێویستە بکرێن بە کوردی، لێژنە هەنگاوی یەکەمی بۆ ئەمە ناوە. لە بەسەرکردنەوەی لیستی دانراو و توێژینەوەکانیدا بۆ لێژنەکە دەرکەوت کە هەندێ لەم توێژینەوە و وتارانە لە کاتی خۆیدا خوالێخۆشبوو کردوونی بە کوردی یان عەرەبی یانیش لە توێژینەوە و لێکۆڵینەوەکانی دواتری خۆیدا بەکاری هێناون.

**بەشی چوارەم:** ئەم بەشەیان تەرخانکراوە بۆ کۆکردنەوەی ئەو پێشەکییانەی بۆ ژمارەیەکی بەرچاو لە کتێب و دانراوی توێژەرانی کورد و عەرەب نووسیوونی، وێڕای ئەو یادداشتنامانەی کە بۆ بڵاوکردنەوە ئامادەی کردوون و پێشەکی بۆ نووسیون. ئەو پێشەکییانە زانیاری و لێکدانەوەی گرنگیان تێدان و وا پێویست دەکات بایەخ بە کۆکردنەوەیان بدەین لە زیاتر لە بەرگێکدا.

**بەشی پێنجەم:** لێژنە هەوڵدەدات ئەم بەشە بۆ ئەو دیمانە و دیدار و چاوپێکەوتنە ڕۆژنامەوانیانە تەرخان بکات کە لەگەڵ دکتۆر کەمالدا کراون، کە تێیاندا بیروبۆچوون و لێکدانەوەکانی بۆ زۆر پرسی زانستی

و هزری و ڕووناکبیری دەربڕیون. ئەمانە شایەتی بۆ ئەوە دەدەن کە ئاگاداریی بەرفراوانی لەمەڕ پرسەکان هەبووە و ڕاستیی و دروستیی گەلێ لە بۆچوونەکانی و قووڵیی لێکدانەوەکانی دەردەخەن. ئەمەشیان بابەتگەلێکی دەوڵەمەندن؛ بۆ توێژینەوە و لێکدانەوە لە بیروبۆچوونە هزری و ڕووگە ڕووناکبیرەکانی.

**بەشی شەشەم:** بە ئومێدی ئەوەین ئەم بەشەیان هەموو ئەو نووسینانە بگرێتەخۆ کە لەبارەی کۆچکردووەوە نووسراون و بڵاوکراونەتەوە، جا چ کتێب و نامەی ماستەر و تێزی دکتۆرا بن یان لێکۆڵینەوە و وتار کە لە سەروبەندی کۆچکردنی یان لە بیرەوەری یەکساڵەی کۆچی دوایی گوتران. پێمانوایە ئەو نامەی ماستەر و کارنامەی دکتۆرایانە کە پرۆفیسۆر دکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد سەرپەرشتی کردوون و بەپێی ڕێنماییەکان توێژینەوەی هاوبەشن، لەم بەشەدا جێیان بکەینەوە. کۆچکردوو لە دارشتنی کاری زانستی خوێندکارانیدا داهێنەر بوو، لە پرۆژەی ماستەرنامە و کارنامەکانی دکتۆرا لە بیرۆکە و ناوونیشانی بابەت و پلانی لێکۆڵینەوە بگرە تا دەگەیشتە لێکدانەوە و ڕێکخستنیان، بۆیە بە پێویست زانرا پێرستێک بە ناوونیشانی ئەو نامەی ماستەر و کارنامەی دکتۆرایانەی کە سەرپەرشتی کردوون و ناوی خوێندکار، و ئاستی کارەکە و مێژووەکەیان لەم بەشەدا جێگە بکرێنەوە. جێی خۆیەتی لێرە ئاماژە بە بەشداریی پڕجۆش و دەوڵەمەندانەی دکتۆر کەمال بکەین لە گفتوگۆی دەیان نامەی ماستەر و کارنامەی دکتۆرادا کە پڕ بوون لە زانیاری دەگمەن و بیرۆکەی هێژا. لەبەر ئەوەی ئەو گفتوگۆیانە بە وێنە و دەنگ تۆمار کراون؛ هەوڵدەدەین پەیوەندی بە لایەنی پەیوەندیدارەوە بکەین بۆ ئەوەی ئەو تۆمارانە دەست بخەین، لە داهاتوودا بخرێنە سەر کاغەز و لە چوارچێوەی سەرجەم بەرهەمەکانیدا بڵاو بکرێنەوە. هەروەها لیژنەی تایبەت پەیوەندی بە خوێندکارە بەتواناکانی کۆچکردووەوە دەکات بۆ ئەوەی وتاری بابەتیانە سەبارەت بە شێوازی وانەوتنەوەکانی بنووسن.

لیژنەی تایبەت کە لەم بەڕیزانە پێکهاتووە: پرۆفیسۆر دکتۆر جەبار قادر، پرۆفیسۆر دکتۆر ئازاد عوبێد ساڵح، پرۆفیسۆری یاریدەدەر دکتۆر دڵشاد مەحموود عەبدولڕەحمان، پرۆفیسۆری یاریدەدەر دکتۆر کامەران محەمەد حاجی، لە ساڵی یەکەمی تەمەنیدا بیبلیۆگرافیایەکی سەرەتایی بۆ سەرجەم کارە زانستی و ڕووناکبیرییەکانی کۆچکردوو دکتۆر کەمال مەزهەر ئامادە کردووە، ئەوە وێڕای ئامادەکردنی کتێبە دانراو و وەرگێڕانەکانی بە هەردوو زمانی کوردی و عەرەبی بۆ چاپ، کە ئەم بەشەیە وا لێرەدا دەیخەینە بەردەستی خوێنەران و توێژەران.

خۆشبەختانە ئەندامانی لیژنەکە دەستیان گەیشت بە بەشێکی گرنگ لە نووسین و بەرهەمەکانی دکتۆر کەمال مەزهەر کە لە کتێبخانە تایبەتییەکەی خۆیدا پارێزراون. ئەوەی لەوێدا کەوتە بەرچاویان وێنەیان گرتن و هەندێ کاریان لەسەر کراوە. هاوڕێ و دۆستانیش لە دەرەوەی لیژنەکە لە هەبوونی کۆمەڵێ وتار و توێژینەوە و کتێب کە پەیوەندییان بە کۆچکردووەوە هەیە ئاگاداریان کردینەوە. بەشێکیش لەو توێژینەوە، وەرگێڕان، لێدوان یان ئەو نووسینانەی خوێندکارەکانی و مامۆستاکانیان و هەڤاڵانی کۆچکردوو لەبارەی ژیانی تایبەتی و زانستی ئەوەوە نووسیوویانە دۆسیی تایبەتییان بۆ ڕێکخراون. لیژنە ژمارەیەک وتار و توێژینەوەی مامۆستای کۆچکردوویان تایپ کردووەتەوە و بە وردی پێیانداچوونەوەتەوە و هەڵەچنیان بۆ کردوون.

لیژنەکە دوابەدوای بڵاوکردنەوەی سەرجەمی کتێبەکانی بە کوردی و عەرەبی، کە ئەم بەشەی پرۆژەکە پێکدێنن، کۆشش بۆ تەواوکردنی بەشەکانی دیکەی ئەم پرۆژە زانستی و ڕووناکبیرییە گەورەیە دەکات؛ ئەم کارە بۆ خزمەتی ڕاستی و مێژووە و بەرز ڕاگرتنی بەخششی ئەم مرۆڤە مێژووزان و پەروەردەکارە مەزنەی نەتەوەی کورد کە بەدەگمەن هاوشێوە و هاوتای دووبارە دەبێتەوە. لێرەوە لیژنەی سەرپەرشتیار داوا لە توێژەران و ئەو خوێنەرانە دەکات کە بایەخ بە بەرهەم و داهێنانەکانی ئەم پیاوە مەزنە دەدەن دەستی یارمەتی بۆ لیژنەکە درێژ بکەن و هەر گۆڤار و ڕۆژنامەیەکیان لە لا پەیدا دەبێ کە لێکۆڵینەوە، وتار یان دیدار و چاوپێکەوتنی

ڕۆژنامەوانی بڵاوکراوەی کۆچکردوویان لە لایە، بیخەنە بەردەستی لیژنەکە.
بێگومان هاوکاری و یارمەتی هەمووان لەم بارەیەوە دەبێتە بنەما و بناغە بۆ دامەزراندنی کتێبخانەیەکی مێژوویی و مۆزەخانەیەکی تایبەت بە کۆچکردوو کە دەکرێ هەرچی پەیوەندی بەوەوە هەبێت تێیدا کۆبکرێتەوە و بپارێزرێت.
دابەشکردنی کتێب و بەرهەمەکانی کۆچکردووی گەورە لە ڕووی بابەت و ژمارەی لاپەڕەکانەوە بەسەر بەرگەکانی ئەم چاپەدا کێشەیەکی هەندێ ئالۆز بوو لە بەردەم لیژنەکەدا، لەم بارەیەوە گفتوگۆی زۆر کرا تا ئەوەی لە کۆتاییدا لەسەر ئەم شێوە دابەشکردنەی خوارەوە گیرسایەنەوە:

**بەرگی یەکەم**: "کوردستان لە ساڵەکانی شەڕی یەکەمی جیهاندا"، "مێژوو- کورتە باسێکی زانستی مێژوو و کورد و مێژوو"، "خەباتی ڕزگاریخوازی کورد و ئازەر لە ئێراندا".

**بەرگی دووەم**: "تێگەیشتنی ڕاستی و شوێنی لە ڕۆژنامەنووسیی کوردیدا"، "چەند لاپەڕەیەک لە مێژووی گەلی کورد – بەرگی یەکەم".

**بەرگی سێیەم**: "چەند لاپەڕەیەک لە مێژووی گەلی کورد – بەرگی دووەم".

**بەرگی چوارەم**: وەرگێڕانی کوردیی کتێبی: "وردبونەوەیەکی مێژوویی دەربارەی مەکیاڤیللی و مەکیاڤیللیزم"، "ڕێنیسانس لەگەڵ باسێکی تر بە ناونیشانی ئەدیب و ئەرکەکانی قۆناغ"، "ئافرەت لە مێژوودا- کورتە باسێکی مێژوویی و کۆمەڵایەتی"، "چینی کرێکارانی عێراق - دروست بوون و سەرەتای بزووتنەوەی".

**بەرگی پێنجەم**: "کورد و کوردستان لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی حکوومەتی بەریتانیادا – بەرگی یەکەم".

**بەرگی شەشەم**: "کورد و کوردستان لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی حکوومەتی بەریتانیادا – بەرگی دووەم".

**بەرگی حەوتەم**: وەرگێرانی عەرەبیی کتێبی: "كردستان في سنوات الحرب العالمية الأولى" و کتێبی "كركوك وتوابعها حكم التأريخ والضمير- دراسة وثائقية عن القضية الكردية في العراق".

**بەرگی هەشتەم**: "دراسات في تاريخ إيران الحديث والمعاصر"، "أضواء على

قضايا دولية في الشرق الأوسط"، "النهضة".

**بەرگی نۆیەم:** "صفحات من تاريخ العراق المعاصر- دراسات تحليلية"، "الطبقة العاملة العراقية- التكون وبدايات التحرك"، "ثورة العشرين في الإستشراق السوفيتي"، "رأي للمناقشة: الإطار الزمني لتأريخ العراق الحديث والمعاصر".

**بەرگی دەیەم:** "دور الشعب الكردي في ثورة العشرين العراقية"، "إنتفاضة عام ١٩٢٥ الكردية في تركيا - دراسة تحليلية"، "حول مسألة الإقطاع بين الكرد"، "ميكافيلي والميكافيلية"، "محاضرات في تاريخ الدول الكبرى بين الحربين العالميتين". وەک لەسەرەوە ئاماژەی پێکرا، شەش بەرگی یەکەمی بە زمانی کوردین و چوار بەرگی دواییش بە زمانی عەرەبیین.

لە کۆتاییدا لیژنەکەمان سوپاسی هەموو ئەو ناوەند و بەڕێزانە دەکات کە ئامادەییان دەربڕی پشتگیری مادی یا مەعنەوی لە پرۆژەکە بکەن، دیارە بە ژمارە زۆرن، لە پێشەوەشیان سەرۆکی ئەکادیمیای کوردی پرۆفیسۆر دکتۆر عەبدولفەتاح بۆتانی، کە ژوورێکی تایبەتی بۆ ئەم لیژنەیە لە ئەکادیمیا تەرخان کرد. هەروەها سوپاسی دۆستی هێژا پرۆفیسۆر دکتۆر عیماد جەواهیری دەکەین کە تێبینی و سەرنجەکانی ڕۆڵی گرنگیان هەبوو لە زیادکردنی تەوەرێکی نوێ بۆ بەشی شەشەمی پرۆژەکە. هەروەها سوپاسی هەموو ئەو بەڕێزانە دەکەین کە ئەرکیان کێشا و لیژنەکەیان لە وتار و لێکۆڵینەوەکانی کۆچکردوو ئاگادار کردەوە. هەروەها لیژنەکە سوپاسی مامۆستا جەلال زەنگابادی دەکات کە دڵسۆزانە بۆ سەرخستنی پرۆژەکە بە باشترین شێوە کار دەکات.

**لیژنەی تایبەت بە کۆکردنەوە و**
**بڵاوکردنەوەی بەرهەمەکانی دکتۆر**
**کەمال مەزهەر**

لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد

د. کەمال مەزهەر ئەحمەد

# کوردستان

## لە ساڵەکانی شەڕی یەکەمی جیهاندا

چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد - بەغداد ١٩٧٥

ر چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد

د. کەمال مەزهەر ئەحمەد

# کوردستان

## لە ساڵەکانی شەڕی یەکەمی جیهاندا

چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد - بەغدا

١٩٧٥

# پێشەکی

بە داخەوە تا ئێستە بە قووڵی و بە شێوەیەکی رێکوپێک و زانستیانە لە هیچ قۆناغێکی مێژووی گەلی کورد نەکۆڵراوەتەوە . رەنگبێ بتوانین تا رادەیەک مێژووی نوێی ( بە تایبەتی سەدەی نۆزدە ) و چەند روویەکی بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد لەم حوکمە دەرهاوێژین[1] . دیارە بێ لێکۆڵینەوەیەکی وا قووڵی هەموو قۆناغەکانی مێژووی کورد و کوردستان ئەڵقەیەکی ون بووی گرنگ لە لێکۆڵینەوەی مێژووی سەردەمی جیاوازی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا دەمێنێتەوە و زۆر پرسیاری زانستی گرنگیش هەر وا بێ وەڵام دەبن .

ساڵەکانی شەڕی یەکەمی جیهان یەکێک لەو قۆناغانەی مێژووی

---

(1) کوردناسانی سۆڤیەت ، بە تایبەتی ن. أ. خالفین و م. س. لازاریێف و جەلیلی جەلیل ، لە گەلێک رووی گرنگی مێژووی کورد لە سەدەی رابوردوودا کۆڵیونەتەوە . یەکێک لە هۆ یاریدەرە گرنگەکانی ئەم کوردناسانە بریتییە لە دەوڵەمەندی ئارشیفەکانی سۆڤیەت بە هەواڵ و بەڵگەی گرنگ لە بارەی ئەو قۆناغەی مێژووی کوردەوە چونکە ئەو سەردەمە رووسیا بایەخێکی زۆری بە کوردستان دابوو . هەر لە سۆڤیەتدا لە چەند روویەکی بزووتنەوەی نەتەوەیی کوردیش کۆڵراوەتەوە .

کورد پێك دەهێنن کە تا ئێستە پێویستیان بە لێکۆڵینەوەی قووڵە . لەو پلانەدا کە ڕۆژهەڵاتناسانی سۆڤیەت بە دەستیانەوە بوو لە بارەی مێژووی گەلی کوردەوە بینوسن ، شوێنێکی تایبەتی بۆ ئەم باسە دانرابوو . کاتێ خۆی لێکۆڵینەوەی ئەو بەشە لەگەڵ چەند بەشێکی تردا بە دانەری ئەم کتێبە سپێردرا و ئەوە بۆ خۆی بووە سەرەتای بایەخ پێدانی بەم قۆناغە .

ساڵەکانی شەڕی یەکەمی جیهان ( ١٩١٤ ـ ١٩١٨ ) یەکێك لە ڕووداوە هەرە گرنگەکانی گێتی پێك دەهێنن . کارەسات و ئەنجامەکانی ئەم شەڕە هەموو جیهانیان گرتەوە و بوونە هۆی ئاڵوگۆڕی گەورە لە ژیانی زوربەی گەلاندا . بەڵام ئاگری شەڕی یەکەم و ئەنجامەکانی لە هەموو لایەك زیاتر وڵاتانی ئەوروپا و ڕۆژهەڵاتی نزیك و ناوەڕاست و بە ڕادەیەکی کەمتر باکووری ئەفریقایان گرتەوە کە بووبوونە جەنگەی شەڕ .

دیارە کوردستانیش وەك بەشێکی گرنگ لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست جێگەیەکی دیاری لە شەڕی یەکەمدا هەبوو . ڕووداو و ئەنجامەکانی شەڕ کارێکی گەورەیان کردە سەر ژیان و دوارۆژی گەلی کورد . بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا مێژووی « کوردستان لە ساڵەکانی شەڕی یەکەمی جیهاندا » تا ئێستە بە تەواوەتی دەرس نەکراوە و وەك قۆناغێکی تایبەتی لە کارێکی سەربەخۆدا نەخراوەتە بەر چاو .

شتێکی ئەوتۆ بە زمانی کوردی لە بارەی ئەم باسە گرنگەوە نەنوسراوە . مێژوونوسانی کورد مامۆستایان ئەمین زەکی و ڕەفیق

حیلمی و حەسەین حوزنی موکریانی[٢] ( بە تایبەتی یەکەمیان )
تەنها باســی لایــەك لەو دەرد و ئازار و پرسیتی یە زۆرەیان کردووە کە گەلی کورد لە ساڵەکانی شــەڕدا توشی هات .
دیارە هەر ئەو لێکۆڵینەوەیەش بۆتە هۆی ئەوەی نەك گەلی کورد بە گشتی ، بەڵکو تەنانەت خوێندەوارەکانیشی ئاگاداری ئــەو قۆناغە گرنگەی مێژووی میللەتەکەیان نەبن . هەر بۆ نمونە بە دەگمەن کوردی وا هەیە شتێکی لەوتۆ سەبارەت بە دەوری کورد لە کوشتارەکانی ئەرمەندا بزانێ لە کاتێکدا کە دەیان کتێبی ئەوروپایی و هی تر لەو باســە دواون . ئەمە بۆ خۆی ـ جگە لە گەلێك هۆی زانستی ـ بایەخێکی تایبەتی دەدەن بە لێکۆڵینــەوەی مێژووی پڕ لە ڕووداو و دەرس و ئاڵوگۆڕی کورد لە ساڵەکانی شەڕی یەکەمدا .

لەبەر ئەوەی لەشکری ڕوس لە ساڵەکانی ئەو شەڕەدا گەیشتۆتە هەموو ناوچەکانی کوردســـتان و لە هەموویاندا لەگەڵ لەشکری عوسمانیدا توشی شەڕ بووە ، لەبەر ئەوە ئارشــیفەکانی یەکیەتی سۆڤیەت پڕن لە بەڵگە و زانیاری بە نرخ لـە بارەی ڕووداوەکانی ئەو سەردەمەی کوردستانەوە . هەر ئەمەش بۆ خــۆی ڕێگەی بە کوردناسی سۆڤیەتی م. س. لازەریێف داوە بتوانێت بە قووڵی لە زۆر ڕووی مێژووی کورد لە ساڵەکانی شــەڕی یەکەمــدا بکۆڵێتــەوە .
هەروەها ئەکادیمی گەردلێفسکی[٣] کە بەر لە شەڕ و لە ساڵەکانی

---

(٢) ناوی بەرهەمەکانی ئەم نوسەرانە و ئەوانی تر لە کتێبەکەدا هاتووە .

(٣) بڕوانە ل ٩٨ پەراوێزی ١٤ .

شەڕدا بە زۆر ناوچەی کوردستان و ئەرمینیادا گەڕاوە گەلێک شتی بایەخدار و نایابی بڵاوکردۆتەوە . بەرهەمی ئەم دوو زانایە و ژمارەیەکی تر لە ڕۆژهەڵاتناسانی سۆڤیەت یاریدەیەکی زۆری دانەری ئەم کتێبەیان داوە بۆ لێکۆڵینەوەی چەند ڕوویەکی گرنگی مێژووی کوردستان لە ساڵەکانی شەڕی یەکەمی جیهاندا .

سەرچاوە ئینگلیزیەکانیش بایەخێکی زۆریان بۆ ڕوون کردنەوەی گەلێک باسی گرنگ هەیە ، بە تایبەتی ئەوانەیان کە پەیوەندییان بە کوردستانی عیراقەوە هەیە ، چونکە ، وەک ئاشکرایە ، ئینگلیزەکان بایەخی زیاتریان پێ دابوو . جگە لەوە لەشکری ئینگلیز تەنها بە چەند ناوچەیەکی کەمی ئەم بەشەی کوردستان گەیشت ، ئەویش لە دەوروبەری کۆتایی شەڕدا . لەبەر ئەوە زوربەی سەرچاوە ئینگلیزیەکان تەنها باسی کوردستانی عیراق ئەکەن و بە دەگمەن شتێکی ئەوتۆیان لە سەر پارچەکانی تری کوردستان لە ساڵەکانی شەڕدا تیا دەبینرێ . لەگەڵ ئەوەشدا دەتوانرێ بۆ ڕوون کردنەوەی زۆر باس کەڵکێکی باش لە نوسینەکانی ئارنۆلد ویلسن و ئەدمۆندس و ماسۆن و چەند نوسەرێکی تری ئینگلیز وەربگیرێ . جگە لەوە سەرچاوە ئینگلیزیەکان پڕن لە بەڵگە لە بارەی بایەخ پێدانی دەوڵەتە گەورەکانەوە بە کوردستان چ لە ساڵەکانی شەڕ و چ بەر لە شەڕدا .

بە زمانی عەرەبیش سەرچاوەی کەڵکدار هەیە ، بەڵام ئەمانیش زیاتر باسی کوردستانی عیراق دەکەن . بە وێنە کتێبەکەی شوکری

مەحموود نەدیم تەنها بۆ باسی شەڕی لەشکری تورك و ڕووس لە بەرەی شەڕی سلێمانی و خانەقین و ڕەواندوزدا تەرخان کراوە . لەم قوژبن و ئەو قوژبنی کتێبی تری عەرەبیدا جاروبار هەندێك زانیاری بەکەڵك لە بارەی کوردەوە دەکەوێتە بەر چاو .

بەم جۆرە نەبوونی سەرچاوەی باوەڕ پێ کراو یەکێکە لە کۆسپە هەرە گەورەکانی لێکۆڵینەوەی مێژووی کوردستان لە ساڵەکانی شەڕی یەکەمی جیهاندا . بەشێکی زۆر لە ڕووداوەکانی ئەو ساڵانە بە دەگمەن شتیان لە بارەوە دەست دەکەوێ ، بە تایبەتی خەباتی کورد کە لەبەر ئەوە زۆر نووسەر وایان داناوە گوایە ئەو خەباتە بە هۆی شەڕەوە وەستاوە .

وەك لە سەرەتای ئەم پێشەکییەدا وتمان ، مێژووی کورد وە نەبێت تەنها لێی نەکۆڵرابێتەوە و بەس ، بەڵکو لە هەمان کاتدا بەشێکی زۆر لەو نووسینە کەمانەش کە لەبارەیەوە نووسراون ، بۆ شێواندنی ، نەك بۆ لێکۆڵینەوەی ، تەرخان کراون . لەبەر ئەوە زۆر جار مێژوونووسی زانا و بێ لایەن بێ ئەوەی هەست بکات لە پڕ خۆی لە مەیدانی دیفاعدا لەسەر کورد دەبینێ و لەبەر خزمەتی مێژوو دەکەوێتە هەوڵ دان بۆ دەرخستنی ڕاستی . یەکێك لەو مەسەلە هەرە گرنگانەی دەوری کوردیان تیا شێوێنراوە و ناوی کوردیان پێ زڕێنراوە ، کوشتارەکانی ئەرمەنە لە سەردەمی سوڵتان عەبدولحەمید و بە تایبەتی لە ساڵەکانی شەڕی یەکەمی جیهاندا . بە لای یەکێکی وەك پرۆفیسۆر پۆل تیمیلەوە هەر وا بە ئاسانی و بێ جیاوازی لە کاتی کوشتارەکانی

ساڵی ١٩١٥دا « هەمو ئینسانێك لە تورکیادا بە سەرباز و جەندرمە و کورد و چەتە و رێکخراوەوە کەوتنە گیانی ئەرمەن »[٤] . لەوەش خراپتر : لوتا زۆدۆ لە بارەی کوشتارەکانی سەردەمی فەرمانڕەوایی سوڵتان عەبدولحەمیدەوە نوسیویە دەڵێ :

« ... کە سوڵتان عەبدولحەمید ویستی ئەرمەن و ئاشورێکان لە ناو بەرێ لە کورد بەولاوە کەسی بۆ جێ بەجێ کردنی نیازەکانی نەدۆزییەوە ئەویش بە هۆی مەیل سروشتییانەوە (واتە مەیلی سروشتی کورد ـ ك. م.) بۆ کوشتار . بەم جۆرە هەرێکی ئایینی لە نێوانیاندا بەرپا کرد کە بووە هۆی کوشتارێکی گەورەی ئەوتۆ تا ئێستە لە ویژدانی ئەم نەوەیەدا دەنگ دەداتەوە »[٥] .

ئەم جۆرە قسەیە لە نوسراوی بەشێکی زۆر لە مێژونوسانی رۆژئاوادا لە بارەی پەیوەندی کورد و ئەرمەنەوە شتێکی ئاساییە . هیچ دور نەڕۆین نوسەری ئینگلیز کیلینگ لەو کتێبەی خۆیدا کە بە ناوی « سەرەرۆیی ـ مغامرات ـ لە تورکیا و روسیادا » ساڵی ١٩٢٤ لە لەندەن چاپی کردووە و بۆ گەشت و گەڕانەکانی خۆی لە ساڵەکانی شەڕ و یەکسەر دوای شەڕ لەو دو وڵاتەدا تەرخانی کردووە ، باسی ئەوەش دەکات چۆن خۆی دیویە لە زۆر ناوچەدا کوردەکان داڵدەی ئەرمەنە

---

(٤) لوتا زودو ، للمسألة الكردية و القوميات العنصرية في العراق ، بيروت ١٩٦٩ ، ص ٨٠ .

(٥) البروفيسور بول أميل ، تاريخ أرمينيا ، ترجمة شكري علاوي ، بيروت ، ص ٥٣ .

ئاوارەکانیان داوە و منداڵەکانیان لە مەرگ رزگار کردوون . جگە لەوە باسی ئەوەش دەکات چۆن کورد و ئەرمەن دەتوانن پێکەوە هەڵ بکەن و چۆن سوڵتان عەبدولحەمید زۆر لەوە دەترسا بۆیەکا سوارەی حەمیدیی دامەزراند[٦] . کەچی لەگەڵ ئەو هەمو راستییە گرنگانەشدا هەر لەوکتێبەدا ئەمە دەخوێنینەوە :

« ئەم کارە ( واتە دامەزراندنی سوارەی حەمیدیی بۆ لە ناو بردنی ئەرمەن ـ ک. م.) لە جێی خۆیدا بوو چونکە کورد لە رۆژانی زەینەفوتنەوە وەك چەتە و رێگری بێ ئیمان و بێ هەستی بێ هاوتا ناوبانگیان دەرکردووە »[٧] .

هەر بۆ زیاتر جێگیر کردنی ئەم قسەیە لە دڵ و بیری خوێنەرەوەدا کیلینگ لە پەراوێزی هەمان لاپەڕەدا باسی ئەو ئەفسانە فارسییە دەکات کە دەڵێت سالامۆن کاتی خۆی ناردوویە بۆ ٤٠٠ کیژی جوان لە رۆژهەڵاتەوە و گوایە لە ناوچەی سەروو میسۆپۆتامیاوە لە لایەن دێو و درنجەوە بە دیل گیراون و کورد لە نەوەی ئەوان پەیدا بوون .

ئەم جۆرە هەڵسەنگاندنە هەر لە زووەوە سەرنجی دانەری ئەم کتێبەی راکێشا و پاڵی پێوە نا بایەخێکی تایبەتی بە پەیوەندیی نێوان کورد و ئەرمەن و دەوری یەکەمیان لە کوشتارەکانی دووەمیاندا بدات . بەرهەمی ئەو بایەخ پێدانە لە بەشی پێنجەمی ئەم کتێبەدا

---

(٦) E. H. Keeling, Adventures in Turkey and Russia, London, 1924, pp. 208 - 209, 229.

(٧) Op. Cit, p. 228.

«کورد و کوشتاری ئەرمەن» رەنگی داوەتەوە . ئەو مەسەلەیەش بۆ خۆی یەکێکە لە باسە هەرە گرنگەکانی مێژووی کورد لە ساڵەکانی شەڕی یەکەمی جیهاندا و یەکێکە لەو باسانەی زۆر رۆیان بە تازەوا مێوێنراوە ، بۆیەکا جێگەیەکی دیاری لەم کتێبەدا بۆ تەرخان کراوە .

بۆ لێکۆڵینەوەی باسی «کورد و کوشتاری ئەرمەن» کەڵک لە سەرچاوەی زۆر و هەمە جۆر و بابەت وەرگیراوە ، بەڵام لێرەدا پێویستە بە تایبەتی سەرنج بۆ سەرچاوەیەکی زۆر گرنگ رابکێشین - «قەلاچۆی ئەرمەن لە ئیمپراتۆرتی عوسمانیدا» کە ساڵی ١٩٦٦ لە ژێر چاودێرتی پرۆفیسۆر ئێرسیسیاندا بە زمانی رۆسی چاپ کراوە و بریتییە لە کۆکراوەی سەدان بەڵگەی مێژوویی گرنگ و کەم زانراو دەربارەی کوشتارەکانی ئەرمەن کە لە سەرچاوەی جیاواز و ئەرشیفی جیاوازەوە وەرگیراون[٨] . هەر لەوێشدا گەلێک باس و بەڵگەی گرنگ لە بارەی دەور و جێگەی کوردەوە لەو کوشتارانەدا هەیە .

لە بەشی پێنجەمی ئەم کتێبەدا نوسەر گەلێک مەبەستی رەچاو

(٨) شایانی باسە رۆژهەڵاتناسی ئینگلیزی هێربەرت ئێڤانس لە وتارێکی خۆیدا کە لە ژمارە دوی ساڵی ١٩٦٨ی گۆڤاری «The Middle Eastern Studies» دا بڵاوی کردۆتەوە ئەو کتێبە و کتێبی دانەری ئەم بەرهەمە کە ساڵی ١٩٦٧ بە زمانی رۆسی لەسەر مێژوی کورد لە دوای شەڕی یەکەمەوە تا ساڵی ١٩٣٢ بڵاوی کردۆتەوە ، بە گرنگترین دو بەرهەمی رۆژهەڵاتناسی سۆڤیەت لە کۆتایی ساڵی ١٩٦٦ و سەرەتای ساڵی ١٩٦٧دا دادەنێ .

کردووە کە لە سەرێ هەمتویانەوە دیارکردنی چوارچێوەی راستەقینەی دەوری کوردە لە کوشتارەکانی ئەرمەندا . دیارە بەو جۆرە و تەنها بەو جۆرە دەتوانین نەك هەر راستی پیشان بدەین و بەس ، بەڵکو دەرسیش لە مێژوی رابوردومان وەرگرین .

بێ گومان لێکۆڵینەوەی هەمو رووەکانی مێژوی کورد لە ساڵەکانی شەڕی یەکەمی جیهاندا پێویستی بە چەند بەرهەمێکی تری وەك ئەم کتێبە هەیە ، پێویستی بە دەرس کردنی بەڵگە رەسمیەکانی دەوڵەتی عوسمانی و دەوڵەتە ئەوروپاییە بەشدارەکانی شەڕ هەیە . بەڵام لەوانەیە بتوانم رێگە بە خۆم بدەم ئەم کتێبە بە سەرەتایەك دابنێم بۆ ئەو مێژووە ، جا رادەی سەرکەوتنم تێیدا کاری نرخاندنی خوێنەران و شارەزایانی بەڕێزە . هەرچۆنێك بێ هیوامە ئەم کتێبە بتوانێت کەلێنێك لە کتێبخانەی کوردیدا پڕ بکاتەوە و زۆری تری بە دوادا بێت .

شایانی باسە چوار بەشی یەکەمی ئەم کتێبە وەك وتار لەگەڵ کورتەیەکی عەرەبیدا لە « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد »دا بڵاوکراوەتەوە[9] . پێشەکی و بەشی پێنجەم[10] و بەشی شەشەم و ئەنجامی بۆ یەکەم جار بڵاو دەکرێنەوە . لە نێوان چوار بەشی یەکەم و بەشەکانی تری

---

(٩) بڕوانە : « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، بەرگی یەکەم ، بەشی یەکەم ، ١٩٧٣ ، ل ٢٧٤ ـ ٣١٥ ؛ بەرگی دووەم ، بەشی یەکەم ، ١٩٧٤ ، ل ١٧٩ ـ ٢٥٥ .

(١٠) بڕیار وایە بەشی پێنجەم لە ژمارەی داهاتوی گۆڤاری کۆڕدا بڵاو بکرێتەوە .

کتێبەکەدا هەندێک جیاوازی کەم لە رێنووسدا هەیە و ئەوەش ئەنجامی دەرچوونی بڕیاری نوێی ئەنجومەنی کۆڕی زانیاری کوردە لە بارەی رێنووسی کوردییەوە .

لە کۆتاییدا بە گەرمی سوپاسی برایان کاک محەمەدی مەلا کەریم و کاک حسەین جاف و کاک ئەنوەر قادر محەمەد دەکەم کە هەر یەکەیان بە جۆرێک دەستیان لە دەرکردنی ئەم کتێبەدا هەیە . کرێکارانی چاپخانەی کۆڕ و لێپرسراوی چاپخانەکەش هیچ درێغییەکیان نەکرد بۆ دەرکردنی بەم شێوەیەی ئێستەی ، سوپاسی گەرمم بۆ ئەوانیش .

• • • •

# بەشی یەکەم

## گرنگی کوردستان و
### بایەخ پێدانی لەلایەن دەوڵەتە گەورەکانەوە

شەڕی یەکەمی جیهان ( ١٩١٤ ـ ١٩١٨ ) یەکێکە لە ڕوداوە هەرە گەورە پڕ کارەساتەکانی مێژوی ئادەمیزاد ، کڵپەی ئاگرو ئەنجامەکانی ئەم شەڕە زۆر لای جیهانی گرتەوە . لە شەڕی یەکەمدا حەفتاو پێنج ملیۆن سەربازو ئەفسەر بەشدار بونو لەمانە ١٠ ملیۆنیان لێ کوژراو پتر لە ٢٠ ملیۆنیشیان لێ بریندارو سەقەتو کەفتەکار بو . جگە لەوەش دەورو بەری ١٠ ملیۆن کەس لە ساڵەکانی شەڕدا بە نەخۆشیو لە برسا مردنو نزیکەی شەش هەزار کەشتی بازرگانیش بە کەلوپەلەوە لە دەریاکاندا نقوم کران [١] .

---

(١) بڕوانە : "Советская Историческая Энцикло-педия", т.IO, Москва, I967, стр. IOOO-I.

« ئەنسیکلۆپیدیای مێژویی سۆڤیێتی » ، بەرگی ـ ١٠ ـ ، مۆسکۆ ، ١٩٦٧ ، ل ١٠٠٠ – ١٠٠١ .

هەوێنی گەورەی شەڕی یەکەمی جیهان بریتی بو لە تێکچونی پارسەنگی هێز لە نێوان دەوڵەتە سەرمایەدارە گەورەکانی رۆژئاوادا و ئەمەش ئەنجامی ئەوەبو کە ئەمەریکاو ئەڵمانیای جاران دواکەوتو لە کۆتایی سەدەی نۆزدەوە وایان لێ هات لە بەرهەم هێنانی کەلوپەلی پیشەسازیدا جێگەی یەکەم و دوەم بگرنەوەو بەم جۆرە بکەونە بەربەرەکانێ کردنی بەریتانیاو فەرەنسە لە بازاڕەکانی جیهاندا کە زۆربەیان وەك (مستعمرە) لە دەست بەریتانیاو فەرەنسەدا بون . ئەمە ئەڵمانیای لە هەر دەوڵەتێکی تر زیاتر جوڵاند چونکە بەرهەمی پیشەسازی ئەڵمانیا گەلێك لە پێویستی بازاڕی ناوخۆو هەندێك لە وڵاتە دەرودراوسێکانی زیاتر بو ، بۆیەش ئەڵمانیا لە کۆتایی سەدەی رابوردوەوە زۆر بە گەرمی کەوتە پەل هاویشتن بەم لاو بەو لاداو لە هەمو شوێنێکیش توشی بەرهەڵستی فەرەنسە وە بە تایبەتی بەریتانیا دەهات .

لە رۆژهەڵاتی نزیك و ناوەڕاستدا بەربەرەکانێ و دوبەرەکایەتی هەمو دەوڵەتە گەورەکانی گرتبۆوە ، بە تایبەتی بەریتانیا ، فەرەنسە ، ئەڵمانیاو روسیا . کوردستانیش وەك بەشێکی دەوڵەمەندو لە روی ستراتیژەوە گرنگی ئەم ناوچەیە لە پلانەکانی چ پێش شەڕو چ ساڵەکانی شەڕی دەوڵەتە گەورەکاندا شوێنێکی تایبەتی هەبو . لە پێش دەست پێکردنی شەڕی یەکەمی جیهانەوە بە ماوەیەکی زۆر بەریتانیاو روسیاو فەرەنسەو ئەڵمانیا بە هەمو جۆرێك هەوڵیان دەدا جێ پێی خۆیان لەم وڵاتەدا قایم بکەن و دەست بەسەر سامانەکانیدا بگرن و بازاڕی بە بازاڕەکانی خۆیانەوە ببەستنەوە . یەکێك

له هۆی نەهێنیی گەورەکانی ئەمەش نەوت بۆ .

هێشتا سەدەی نۆزدە کۆتایی نەهاتبو کە هەندێك لە زانا جیۆلۆجیێکانی رۆژئاوا بەگەرمی کەوتبونە باسی دەوڵەمەندی چاڵە نەوتـــە دەرنەهێنراوەکانی بابەگورگور . تەنانەت زاناکانی فەرەنسە (بە تایبەتی ج. مۆرگان) توانییان سنوری نزمانی (حەوزی) نەوتی ناوچەی کەرکوك تا خانەقینو شاخ کوێخای پشت قەسری شیرین دیاری بکەنو بە نزیکەی ٣٠٠ کیلۆمەتری لە قەڵەم بدەن (٢) . ساڵی ١٩٠٣ ئەڵمانەکان مافی کەڵك لێوەرگرتنی هەمو ئـــەو کانانەیان وەرگرت کە بۆ ماوەی بیســت کیلۆمەتر دەکەوتنە ئەملاو ئەولای خەتی شەمەندەفەری بەغداوە کە دەمێك بو پلانی دروست کردنی ، وەك دوایی باسی لێ دەکەین ، بە جۆرێکی ئەوتۆ دانرابو کە بەشێکی بە خاکی کوردستاندا تێبپەڕێت . هەر دوای ئەوەش بە ساڵێك مافی تری نوێی بۆ دەرهێنانی نەوتی ویلایەتی موسڵ درا بە ئەڵمانەکان . لەهەمان کاتدا کۆمپانیای بەریتانیایی « دارسی » لە هەوڵو تەقەلادا بو بۆ ئەوەی نەوتی ئەم ناوچەیە بگرێتە دەست خۆیو لە ساڵی

---

(٢) بڕوانە : A.Адамов, Ирак Арабский. Бассорский вилайет в его прошлом и настоящем, Петербург, 1912, стр.26.

أ. ئادامۆف ، عیراقی عەرەبی . ویلایەتی بەسرە لە دوێنێو ئەمڕۆیدا ، پیتەربورگ ، ١٩١٢ ، ل ٢٦ . ئادامۆف

ئەم زانیاریانەی لەم کتێبەی مۆرگان خۆی وەرگرتوە : J. de Morgan, Mission Scientifique en Perse. Etudes Geographiques, T.II, Paris, 1895, P. 86.

١٩٠٦ دا کاربەدەستە عوسمانییەکان بۆ ئەم مەبەستە لەگەڵیدا کەوتنە گفتوگۆ . ئەمەریکاییەکانیش بەشی خۆیان بۆ هەمان مەبەست هەوڵ و تەقەلایان دەداو تەنانەت رۆزڤلت ساڵی ١٩٠٨ ئەدمیرال چێستەری وەك نوێنەری تایبەتی خۆی بۆ ئەم ئامانجە ناردە تورکیا[٣] .

کار بەمەوە نەوەستا ، بێنەو بەرەو پیلان گێڕانێکی زۆر کەوتە ناو دەوڵەتە رۆژئاواییەکانەوە لە پێناوی نەوتی ویلایەتی موسڵداو تەنانەت کۆمپانیا ئینگلیزیو ئەڵمانییەکان کە بە خوێنی سەری یەکتر تینوو بوون لە گێژاوی تەماعدا ناچار بوون یەك بگرن بۆ ئەوەی هەرچۆنێك بێت دەستیان لە نەوتەکە گیر ببێت ، ئەوەبوو لە ساڵی ١٩١١ دا بۆ ئەم مەبەستە بە جووتە کۆمپانیایەکی تایبەتییان دامەزراند کە لە ساڵی داهاتودا ناوی « کۆمپانیای نەوتی تورکی » یان لێ نا . ئەم کۆمپانیایە پێش دەست پێ کردنی شەڕ بە ماوەیەکی زۆر کەم تواتی مافی دەرهێنانی نەوتی ویلایەتی موسڵ لە دەوڵەتی عوسمانی وەربگرێت ، بەڵام هەڵگیرسانی ئاگری شەڕی یەکەم بووە هۆی روودانی ئاڵوگۆڕێکی گەورە لەم مەیدانەداو ئینگلیزو ئەڵمان لە ساڵەکانی شەڕدا دووبارە بەجیا تێ هەڵچوونەوە . ئینگلیزەکان لە یەکەم رۆژی پاش دەست پێ کردنی شەڕەوە دەستیان بەسەر بەشی ئەڵمانەکاندا

---

(٣) بڕوانە : حکمت سامی سلیمان ، النفط في العراق ـ دراسة سیاسیة واقتصادیة ، بغداد ، ١٩٥٨ ، ص ٢١ ـ ٢٢ ، ٢٧ ، ٣٠ ـ ٣١ . هەروەها بڕوانە

Б.М.Данциг, Ирак в прошлом и настоящем, Москва, 1960, стр.176-7.

بەرۆبەسۆر

ب. م. دانتسیگ، عیراق دوێنێو ئەمڕۆ، مۆسکۆ، ١٩٦٠ ، ل ١٧٦ ـ ١٧٧ .

لە « کۆمپانیای نەوتی تورکی » دا گرت و ئەڵمانەکانیش بە جیا کەوتنە کارو وەك هەندێك سەرچاوە دەیگێڕنەوە لە نزیك زاخۆوە دەستیان بە بیر هەڵکەندن و نەوت دەرهێنان کرد[٤].

بەم جۆرە تا دەهات دەوری نەوت وەك هێزێکی جوڵێنەری گەورەی سیاسەتی دەوڵەتە رۆژئاواییەکان بەرامبەر بە کوردستان پەرەی دەسەند و لە ساڵەکانی شەڕدا زیاتر دەیجوڵاندن بۆ ئەوەی هەرچۆنێك بێت دەست بەسەر خاکی کوردستاندا بگرن.

شوێنی ستراتیژی کوردستان لە ناوجەرگەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا هێزێکی جوڵێنەری تری گرنگی سیاسەتی ئەو دوەڵەتانە بوو بەرامبەر بە دوارۆژی کوردستان. ئەمە لەپێش شەڕو لە ساڵەکانی شەڕدا بە رادەیەکی ئاشکرا لە پرۆژەی خەتی شەمەندەفەری بەغدادا[٥]

---

(٤) بڕوانە : یوسف ابراهیم یزبك ، النفط مستعبد الشعوب ، الجزء الاول ، بیروت ، ١٩٣٤ ، ص ١٦٩ ــ ١٧١ .

(٥) « خەتی شەمەندەفەری بەغدا » پرۆژەیەکی بەناوبانگە لە مێژووداو یەکێك بوو لە روە گرنگەکانی هەوڵ و تەقەلای دەوڵەتە رۆژئاواییەکان بۆ چەسپاندنی دەسەڵاتی سیاسی و ئابووریان لە رۆژهەڵاتی نزیك و ناوەڕاستدا. بڕیار وابوو ئەم خەتە کە درێژایی دەگەیشتە نزیکەی ٢٤٠٠ کم دەریای سپی ناوەڕاست بە کەنداوی عەرەبەوە ببەستێت و بۆ ئەم مەبەستەش پێویست بوو خەتەکە بەشێك لە تورکیاو کوردستان و سووریاو میسۆپۆتامیا ببڕێت. هەوڵ و تەقەلای بۆسنۆری ئەڵمانەکان بۆ دروست کردن و بەکار هێنانی « خەتی شەمەندەفەری بەغدا » لە کۆتایی سەدەی نۆزدەوە بەجارێك بوە هۆی قووڵ کردنەوەی دژبەرەکایەتی نێوان دەوڵەتە گەورەکان لەسەر رۆژهەڵاتی ناوەڕاست ، بەتایبەتی چونکە ئەڵمانەکان دەیانویست لەو رێگەیەوە دەسەڵاتی ئینگلیز لە =

دەرکەوت کە ئەویش بەش بەحاڵی خۆی مێژوویەکی دوورو درێژی هەیە سەرەتاکەی دەگەڕێتەوە بۆ نیوەی دووەمی سەدەی ڕابوردوو ، واتە بۆ کاتی دەست پێ کردنی دانانی کەلێك پڕۆژە بۆ بەستنی دەریای سپی ناوەڕاست بەکەنداوی عەرەبەوە بە خەتی شەمەندەفەر . ئەوەی لەم بارەیەوە پێویستە سەرنجی بۆ ڕابکێشرێت ئەوەیە کە زۆربەی ئەم خەتانە دەبوو بە خاکی کوردستاندا تێبپەڕن . بەوێنـە ئەو پڕۆژەی شەمەندەفەرەی لۆڤێت کامیرۆن لە ساڵی ۱۸۸۰ دا دایناو بڕیار وابوو ناوچەی ئورفەو ماردین و موسڵ ببڕێت و لەوێوە بەرەو بەغداو کەنداو درێژ بێتەوە (٦) .

ئەڵمانەکان کە لە کۆتایی سەدەی نۆزدەوە ڕۆژ بەڕۆژ دەسەڵاتیان لە تورکیادا بە هێزتر دەبوو بایەخێکی یەکجار زۆریان دا بە دروست

---

= هیندستان و میسر و دەسەڵاتی ڕووسیش لە ناوچەی قەفقاس و ناوەندی ئاسیادا نەجەنە مەترسییەوە ، هەر لەبەر ئەوەشە هەندێك لە مێژوونووسەکان ئەم پڕۆژەیە بـە یەکێك لە هۆ گەورەکانی هەڵگیرسانی شەڕ دادەنێن ( لە بارەی « خەتی شـەمەندەفەری بەغـدا » وە بە درێژی بـڕوانە : الدکتور لؤی بحـری ، سکة حدیـد بغـداد ، بغـداد ، ۱۹٦۷ . هەروەهـا Zaki Saleh, Mesopotamia - Iraq 1600 - 1914, Baghdad, 1957;

А.С.Аветян, Германский империализм на Ближнем Востоке, Москва, 1966, стр.24-35.

(ا. س. ئاڤێتیان ، ئیمپریالیزمی ئەڵمانی لە ڕۆژهەڵاتی نزیکدا ، مۆسکۆ ، ۱۹٦٦ ، ل ۲٤ ــ ۳٥ ) .

(٦) بڕوانە : Zaki Saleh, Op. Cit, pp. 258 - 9

کردنی خەتی شەمەندەفەر لەم وڵاتەدا . ئەمە بێ‌گومان بایەخێکی یەکجار زۆری هەبوو بۆ بەرژەوەندەکانی ئەڵمان لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا ، بە تایبەتی لەبەر ئەوەش کە هەر لە زووەوە بەرلین‌و ئەستەمبوڵ بە خەتی شەمەندەفەر بە یەکەوە بەسترابوون . کۆمپانیا ئەڵمانیێکان مافی دامەزراندن‌و بەکار هێنانی ژمارەیەك خەتی شەمەندەفەریان لە خاکی ئیمپراتۆرتی عوسمانیدا وەرگرت‌و لە ئەنجامدا رۆژی پێنجی مارتی ساڵی ١٩٠٣ یش مافی دروست کردنی خەتی شەمەندەفەری بەغدایان پێ درا کە زۆر بەر لەوە کاربەدەستانی هەندێك لە دەوڵەتە گەورەکان بیریان لە دامەزراندنی کردبووەوە . شایانی باسە کەلێك پلان لە لایەن شارەزایانەوە بۆ راکێشانی خەتی شەمەندەفەری بەغدا دانرابوو کە سەراپایان بە پێی نەخشەکانیان دەبوو بە خاکی کوردستاندا تێ‌بپەڕن . بەپێی یەکێك لەو پلانانە کە ناو نرابوو « پلانی باکوور » و لە ساڵی ١٨٩٣ دا دانرابوو دەبوو خەتی شەمەندەفەری بەغدا بە شاری سیواسدا تێپەر بکات‌و بڕیاریش وابوو لقێکی لێ ببێتەوە بۆ ئەرزنجان‌و ئەرزروم‌و بایەزیت‌و لقێکی تریش بۆ خەرپووت‌و دیاربەکرو لەوێشەوە درێژ ببێتەوە تاوەکو بەغدا . جێ‌بەجێ کردنی ئەم پلانە چەند کۆسپێکی هاتە بەردەم وەك ناڕەزایی رووسیاو سەختی شاخەکانی ئەرمینیاو کوردستان ، بۆیەکا شارەزایان هەر ئەو ساڵە « پلانی ناوەند » یان خستە بەردەست کە بە گوێرەی ئەمیش دەبوو خەتەکە لە ئەنقەرەو قەیسەری‌یەوە بچێتە مەلاتیەو دیاربەکرو لەوێوە بەرەو بەغداو کەنداو رابکێشرێت ، بەڵام لە ئەنجامی چەند کێشەیەکی تەکنیکیدا جێ‌بەجێ کردنی ئەم پلانەش خرایە پشت گوێ‌و پلانی سێیەم کە بە « پلانی باشوور » ناسراوە

جێگەی گرتەوە. بە پێی «پلانی باشـوور» دەبوو خەتی شەمەندەفەری بەغدا مەرعەش و ئورفەو دیاربەکرو ماردین و موسڵ و کەرکووك ببڕێت و لەوێوە بگەیێنرێتە بەغداو بەسرەو کوێت[7].

بە پێی دوا پلان کە بەر لە شەڕ بە ماوەیەکی کەم لە لایەن ئەڵمانەکانەوە دانرابوو دەبوو خەتی شەمەندەفەری بەغـــدا لە رێـگەی نەسیبەینەوە خاکی کوردستانیش ببڕێت. بۆ ئەم مەبەستە کۆمیتەیەکی تایبەتی ئەڵمانیایی بە سەرۆکایەتی کۆن-ولی کنسوڵی ئەڵمانیا لـــە ئەستەمبوڵ سەری لە چەند شوێنێکی کوردستان دا بۆ لێکۆڵینەوەی زرووفی ئەو ناوچانە لە هەموو رویەکەوە.

ئەڵمانەکان بە گەرمی کەوتنە دروست کردنی خەتی شەمەندەفەری بەغداو لە ساڵی ١٩٠٩ دا بە شـانازییەوە بڵاویان کردەوە کە وا ٩٤٦ کیلۆمەتری ئـــەم رێـگەیە تەواو بووەو ٧٤٠ کیلۆمەتری تریشی لە تەواوبووندایەو دروست کردنی ئەو بەشەش کە ماوەتەوە لە هەموو بەشەکانی تری خەتەکە ئاسانترە[8]. هەرچەند شەڕ نزیکتر دەکەوتەوە هەوڵو تەقەلای ئەڵمانەکان بۆ تەواو کردنی خەتی شەمەندەفەری بەغدا زیاتر پەرەی دەسەنـــدو بەرامبەر بەوەش مەترسی ئینگلیزو رووس و فەرەنسەییکان تا ئەهات زۆرتر دەبوو، وە زۆر جار ناچار دەبوون لەم

---

(٧) أ. ئادامۆف، سەرچاوەی ناوبراو، ل ٥٣٦ ـ ٥٣٧.

(٨) Zaki Saleh, OP. Cit, P. 281

(٩) بە درێژی بڕوانـــە: ا. س. ئاڤێتیان، ســەرچاوەی ناوبراو، ل ٢٥ ـ ٣٣.

بارەیەوە لەگەڵ ئەڵمانو تورکەکاندا بکەونە گفتوگۆ[۱۰] . بەڵام
نەك ئەم جۆرە گفتوگۆیە بەڵکو تەنانەت کارەساتەکانی شەڕی
یەکەمی جیهانیش ئەڵمانەکانیان نەوەستاند ، وە بەپێچەوانەوە پاڵیان
پێوە نان هەوڵ بدەن ڕۆژێك زوتر ڕێگەکە تەواو بکەن . ئەوەبوو
هەر لە سەرەتای شەڕدا کەوتنە خۆ بۆ دروست کردنی ئەو بەشانەی
ڕێگەکە کە دەبوو بە کوردستانو میسۆپۆتامیادا تێپەڕنو ئەو پارچەیەیان
تەواو کرد کە کەوتبوە نێوان بەغداو سامەڕاوەو دەستیان بەکار کرد
بۆ درێژ کردنەوەی لە ژوروی سامەڕاو خواروی بەغداوەو تەنانەت
ژمارەیەکی زۆر کرێکاری کوردیشیان بۆ ئەم کارە بەکرێ گرت ؛
توسەری ئەڵمانی داگۆبێرت لەم بارەیەوە توسیوێتی دەڵێت :
« ئەندازیارە ئەڵمانەکان لە کاتی دروست کردنی خەتی شەمەندەفەری

---

(۱۰) ڕوسەکان بەجارێك لە پلانەکانی ئەڵمانیا بۆ دامەزراندنی خەتی
شەمەندەفەری بەغدا زراوەترەك بوبون چونکە دەیانزانی دەبێتە هۆی لاواز
کردنی دەسەلاتی سیاسیو ئابوریان نەك تەنها لە ئاسیای بچوك بەڵکو لە
ڕۆژئاوای ئێرانیشدا ، بەتایبەتی لە ئازەربایجانو کوردستان . یەکێك لە
شارەزاکانی ڕوس لە ساڵی ۱۹۰۸دا بە ئاشکرا دەستی بۆ ئەم ڕاستیە کێشاوەو
داوای لە کاربەدەستەکانی وڵاتەکەی کردوە کە ئەوانیش بکەونە خۆیان
(بڕوانە : Инженер Ю.Лебедев, Багдадская желез-
ная дорога и современное состояние её стро-
ительства, Петербург, 1908, стр. 3.
ئەندازیار یو. لێبێدێف ، خەتی شەمەندەفەری بەغداو باری دروست کردنی ئەمڕۆی ،
پیتەربورگ ، ۱۹۰۸ ، ل ۳ ).

بەغدادا هەستیان کرد کە وا کوردەکان باشترین و ئیشکەرترین کرێکارن » [11] .

بەم جۆرە سامان و شوێنی ستراتیژی کوردستان رۆژ لە دوای رۆژ زیاتر سەرنجی دەوڵەتە گەورەکانیان رادەکێشاو ئەمەش بوە هۆی ئەوەی ئەو دەوڵەتانە ، وە بە تایبەتی بەریتانیاو ئەڵمانیاو رووسیا ، بایەخێکی زۆر بە چەسپ کردنی جێ پێیان لە کوردستاندا بدەن و ئەمەش لە ساڵەکانی پێش شەڕو کاتی شەڕدا بە تەواوی روون و ئاشکرا بوو .

ئەڵمانەکان پێش شەڕو لە ساڵەکانی شەڕدا بەهۆی پەیوەندی یەکجار نزیکیانەوە بە چینە دەسەڵاتدارەکانی تورکەوە بە ئاسانی دەیانتوانی خۆیان بگەیێننە کوردستان وە بە تایبەتی کوردستانی تورکیا کە کاربەدەستەکانی بە ئاشکرا هاریکاریان لەگەڵ دەکردن . ژمارەیەکی زۆر لە ئەڵمانەکان کەوتنە گەڕان بە کوردستانداو یەکێك لە ئەفسەرە کۆنەکانیان کە ناوی گوربرۆد بوو لە ساڵی ١٩١٢ دا توانی بگاتە هەندێك شوێنی وەهای کوردستان کە بەر لەو هیچ ئەوروپاییەك پێی تێ نەنابوو . گوربرۆد لە کاتی گەشتەکەیدا گەلێك وێنەی گرتوەو

---

Dagobert von Mikusch, Mustapha Kemal between (11)
Europe and Asia, ( translated by John Linton ) , London,
1931, P. 360 .

نەخشەی چەند شوێنێکی کێشاوە [١٢]. لە هەمان کاتدا ئەندێرسی کۆنسوڵی ئەڵمان لە ئەرزروم لە جەو جۆڵدا بۆ وە کەوتبوە گەڕان بە کەلێك ناوچەی کوردستانداو چوبوە هەندێك شاری وەك دەرسیم‌و خەرپوت‌و وانو هی تر وە لە نزیکەوە پەیوەندی لەگەڵ ژمارەیەك لە سەردارە کوردەکاندا بەستبۆ.

بێ گومان مەبەستی ئەڵمانەکان لەم جۆرە گەشت‌و هاتوچۆیانە تەنها دەستکەوتی سیاسی نەبۆ، بەڵکو لە ڕوی ئابوریشەوە توانیان جێ پێ بۆ خۆیان لە کوردستاندا بکەنەوە. بەوێنە شاری شنۆ لە کوردستانی ئێران پێش شەڕ بۆبوە ناوەندێکی گەورەی خوری کڕین لەلایەن ئەڵمانەکانەوەو لەوێوە ئەیانبرد بۆ ئەو فابریقەیەی لە تەورێز دایانمەزراندبۆ بۆ دروست کردنی رایەخ. ئەوەی سەرنج رادەکێشێت ئەوەتە کە ئەڵمانەکان بە ئالای ولاتەکەیان مەڵبەندە بازرگانێکانی خۆیانیان لە شارەکانی کوردستاندا دەڕازاندەوە [١٣].

لە ساڵەکانی شەڕدا ئەڵمانەکان کەوتنە بایەخ پێدانێکی زیاتر بە کوردستان، بەتایبەتی لەبەر ئەوەی کە بۆبوە یەکێك لە مەڵبەندە گرنگەکانی شەڕ لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستداو کەوتبوە سەر سنوری

---

(١٢) М.С.Лазарев, Курдистан и курдская проблема (90 годы XIX века - 1917 г.), Москва,1964, стр.247. م. س. لازەرێف، کوردوستان‌و کێشەی کورد (لە ساڵەکانی نەوەدی سەدەی نۆزدەوە تا ساڵی ١٩١٧)، مۆسکۆ، ١٩٦٤، ل. ٢٤٧.

(١٣) هەمان سەرچاوە، ل ٢٤٩ و ٢٦٢.

یەکێك لە دوژمنە هەرە گەورەکانی ئەڵمانیاوە کە ڕوسیا بو . ئەڵمانەکان لە کاتی شەڕدا هەوڵیان دەدا هەمو بەیاننامەو چاپەمەنیەکانی تری پان ـ ئیسلامەکان بە هەمو کوردستانی ئێراندا بڵاو بکەنەوە بۆ ئەوەی هەستی خەڵکەکەی بەلای تورکیادا پێ رابکێشن و لە ڕوسیان دور بخەنەوەو بۆ ئەم مەبەستە ژمارەیەك لە جاسوسە بە ناوبانگەکانیان لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا (شیونمان ، لیتێن و هی تر) بەکەری کەوتبونە کار . ئەوەی شایانی باسە ئەوەیە کە هەوڵ و تەقەلای ئەڵمانەکان لەم بارەیەوە بێ ئەنجام نەبو ، ئەوەبو تا ساڵی ١٩١٦ بەیارمەتی هەندێك لە سەرەك هۆزە کوردەکانی ناوچەی کرماشان توانییان پەیوەندی لەشکری ڕوس بە لەشکری ئینگلیزەوە لە خواروی عیراقدا بپچڕێنن .

ئینگلیزەکان دەمێك بو بە رادەی ئەڵمانەکان و بگرە زیاتریش بایەخیان بە کوردستان دابو . لە نیوەی دوەمی سەدەی هەژدەوە پیاوەکانی کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتی[14] دەستیان کرد بە گەڕان

(١٤) « کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەلاتی » ـ کۆمپانیایەکی ئینگلیزی بەناوبانگە کە ساڵی ١٦٠٠ ژمارەیەك لە بازرگانە ناودارەکانی بەریتانیا دایانمەزراند بۆ بەهێز کردن و پەرە پێدانی پەیوەندی ئەوروپا لەگەڵ هیندستان و خوارۆی ڕۆژهەلاتی ئاسیاو چینداو بەرە بەرە بوە دەزگایەکی دەوڵەتی و دوای ئەوەی چەند فابریقەیەکیشی لە هیندستان دامەزراند رەگی داکوتا بۆ زۆر شوێنی ڕۆژهەلاتی نزیك و ناوەڕاستیش . ئەم کۆمپانیایە تا ناوەندی سەدەی رابوردو دەورێکی دیاری بینی لە بلاوکردنەوەی دەسەلاتی سیاسی بەریتانیا لە زۆر ولاتی ڕۆژهەلاتداو ئەمەش داخی کردبوە دلی گەلانی ئەو ولاتانەوەو ئینگلیزەکان لە کاتی تەقینەوەی ڕاپەڕینی ساڵی ١٨٥٧ ـ ١٨٥٩ لە هیندستان =

بە کوردستانیشدا . ساڵـــی ١٧٥٨ دوکتۆرێکی ئەم کۆمپانیایە لە رێـگەی کەرکوکەوە تا شاری ماردین چوو ، دوای ئەویش بە ماوەیەك هەندێك لە کاربەدەستانی ئەم کۆمپانیایە ( د. کامپبێل ، ت. هاولو هی. تو ) بە چەند شوێنێکی تری کوردستاندا گەڕان[15] . لە ساڵی ١٨٢٠ یشدا نوێنەری هەمان کۆمپانیا لە بەغدا کلۆدیۆس جێمس ریچ گەشتێکی گەورەی بەچەند ناوچەیەکی کوردستانی خـــواروو و رۆژهەڵاتدا کردو[16] یەکێك لە ئەنجامە گرنگەکانی ئـــەم گەشتە دانانی کتێبێکی گەورە بـۆ لەبارەی کوردو کوردستانەوە[17] .

---

= ناچار بوون دابخەن .

کۆمپانیای هیندی رۆژهەڵاتی هەر زوو جێ پێی خۆی لە عیراقدا کردەوەو دەسەڵاتی رۆژ لە دوای رۆژ پەرەی دەسەند بە رادەیەك سلێمان پاشای گەورە بە یارمەتی ئەو نەبوایە ساڵی ١٧٨٠ نەدەکرا بە والی و لەسەر ئارەزووی هەر ئەویش ساڵی ١٨١٠ سلێمان پاشای بچووك نەك هەر دەرکرا بەڵکو بە سێدارەشـدا کرا . ئەم کۆمپانیایە لە هەمان کاتدا هەوڵی دەدا لە رێگەی بەغداوە بگاتە کوردستانیش .

(١٥) دەربارەی ئەمانو ژمارەیەکی تـر لە گەڕۆکە ئـەوروپاییەکان بڕوانە :- S. H. Longrigg, Four Centuries of Modern Iraq, London, 1925, PP. 334 - 340 .

(١٦) ریچ بەر لەوەش چەند جارێکی تر بـە خاکی کوردستاندا تێپەڕیبوو ، بەتایبەتی لەو کاتانەدا کە لە بەغداوە دەچوو بۆ ئەستەمبوڵ ، ژیانی کەمینەکانی کوردستان دەمێك بوو سەرنجی ریچی راکێشابوو .

(١٧) Cl. J. Rich, Narrative of a Residence in Kurdistan, Vol. I - II, London, 1836 ( 808 P. ) بەرگی یەکەمی ئەم کتێبە لەلایەن مامۆستا بەهادین نورییەوە ساڵی ١٩٥١ لە ژێر ناوی « رحلة ریچ في العراق عام ١٨٢٠ » داکراوە بە عەرەبی ( ٣٠٠ ل.) هەر لە ساڵی ١٨٣٦ یشدا بە زمانی =

ك. ج. ریچ لە ماوەی ئەم گەشتەیدا لە نزیکەوە پەیوەندی لەگەڵ هەندێك لە سەردارە ناودارەکانی کورد، بە تایبەتـــی لە ناوچەی سلیمانیو ســـنەدا دامەزراندبێ وە بۆ یەکەم جار نەخشەی چەند شوێنێکی کوردستانی کێشـابێ، هەروەها لە کتێبەکەشیدا بە درێژی باسی ژیانی کۆمەڵایەتیو ئابوری کوردستانی کردوە.

شایانی باسە کە وا لە ســـەدەی نـۆزدەوە ژمارەیەکیش لـە ئەفسەرەکانی ئینگلیز کەوتنە گەڕان بە کوردستاندا. ئەوەبێ لە ساڵی ١٨٣٦دا ئەفسەری بەریتانیایی راولنسنو پاش ماوەیەك مێجەر ف. میللینگن سەریان لە زۆر لای کوردستان داو گەلێك شتی بەنرخیان لەبارەیەوە کۆکردەوەو هەندێکیشیان لێ بڵاوکردنەوە(١٨). سەرەڕای ئەمانە ژمارەیەکی زۆر لە گەڕۆکەکانی ئینگلیز کە هاتونەتە ئێرانو تورکیا سەریشیان لە کوردستان داوەو لە کتێبەکانیاندا زۆر یا کەم باسی ژیانی

---

= فەرەنسیش بە ناوی ریچەوە بڵاوکراوەتەوە:

Cl. J. Rich, Relation d'une residence dans le Kourdistan l'emplacement de l'antique Ninive etc., London, 1836 (398 P.).

(١٨) بڕوانە: H. C. Rawlinson, Notes on a journey from Tebriz, through Persian Kurdistan ..., – « The Journal of the Royal Geographical Society », London, Vol. X, 1840
راولنسن لە وتاریکی تریشـیدا بەر لەوە بە کورتی چەند جارێك باسی کوردو کوردستانی کردوە (بڕوانە هەمان گـۆڤار، بەرگـی ـ ٩ ـ ساڵی ١٨٣٩).
F. Millingen, The wild life among the Koords, London, 1870

ئابوری و کۆمەڵایەتی کوردیان کردوە . بەوێنە چ مۆرێیرو[19] چ کینەر[20] لە کتێبەکانیاندا کە هەر پاش یەك دو ساڵ گۆڕدراونەتە سەر فەرەنسەیی و ئەڵمانی باسی گەلێك ڕوی گرنگی ژیانی کوردو کوردستانیان کردوە .

بایەخ پێدانی ئینگلیز بە کوردستان لە سەرەتای سەدەی بیستەوە ئەوەندەی تر پەرەی سەندو ئەمەش ئەنجامی دۆزینەوەی نەوت و ئەو بایەخە زۆرە بو کە ئینگلیز بە میسۆپۆتامیایان دابو کە دەیانویست بە کوردستانی عیراقەوە بیکەنە بنکەیەکی گرنگی بلاوکردنەوەو پاراستنی دەسەلاتیان لە ڕۆژهەلاتی نزیك و ناوەڕاستدا . لەم سەردەمەدا ژمارەی ئەو ئینگلیزانەی دەهاتنە کوردستان و پیایدا دەگەڕان لە زیادبوندا بو ، ئەوەش کە هەندێکیان پێش هاتنیان فێری زمانی کوردی بوبون یارمەتیەکی زۆری دان بۆ لێکۆڵینەوەی باری ژیانی کوردو ولاتەکەیان لە هەمو ڕویەکەوە . لەم بارەیەوە

---

(١٩) J. Morier, Journey through Persia, Armenia and Asia Minor to Constantinople in the years 1808 and 1809, London, 1812 ; J. Morier, A Second journey through Persia, Armenia and Asia Minor to Constantinople between the years 1810 and 1816, London, 1818 . موریێر لە ئەسڵی شازدەو حەڤدەی کتێبی یەکەمیدا باسی ئەو ناوچانەی کوردستانی کردوە کە پیایاندا تێپەڕیوە ، لە کتێبەکەی تریشیدا گەلێك زانیاری لەبارەی ئەتنۆگرافیاو مێژوی کوردەوە بلاو کردۆتەوە .

(٢٠) J.M. Kinner, A geographical memoir of the Persian Empire, London, 1813; J. M. Kinner, Journey through Asia Minor, Armenia and Koordistan in the years 1813 and 1814, London, 1818.

گەشتە بە ناوبانگەکەی مێجەر سۆن و نوسینەکانی[٢١] نمونەیەکی رۆن و ئاشکران . مێجەر سۆن پاش ئەوەی ساڵێکی ( ١٩٠٦ ـ ١٩٠٧ ) لە کرماشان بردەسەرو کوردیەکی باش فێر بو[٢٢] لە ساڵی ١٩٠٧ دا کەوتە گەڕان بە کوردستانی خوارۆداو لە نزیکەوە لە زیانی کوردو

---

(٢١) کارە بلاوکراوەکانی مێجەر سۆن کە جێگەیەکی دیاریان لە مەیدانی کوردناسیدا هەیە ئەمانەن :

1- « To Mesopotamia and Kurdistan in disguise », London, 1912 ( second edition, 1926 - 421 P. ) ;

2- « A Southern Kurdish Folksong in Kermanshahi Dialect », JRAS, 1909, PP. 35 - 51 ;

3- « Notes on a Kurdish Dialect, the Shadi Branch of Kermanji », JRAS, 1909, PP. 895 - 921 ;

4- « Notes on a Kurdish Dialect, Sulaimania ( Southern Turkish Kurdistan ) », JRAS, 1912, PP. 891 - 940 ;

5- « Grammar of the Kurmanji or Kurdish Language », London, 1913, P. 13 + 289 ;

6- «Elementary Kurmanji Grammar», Baghdad, 1919, 197 P.;

7- « Kitabi Awalamini Qiraat i Kurdi », Baghdad, 1920

8- « A Short Anthology of Guran Poetry », JRAS, January, 1921, PP. 57 - 81 ;

9- « Notes on the Phonology of Southern Kurmanji », JRAS, April, 1922, PP. 191 - 226.

(٢٢) مێژونوسی بە ناوبانگی کورد مامۆستا ئەمین زەکی دەبارەی کوردی زانینی مێجەر سۆنەوە نوسیویتی دەڵێت : « بەقەدەر کوردێك کوردی ئەزانی و لە عالمێکی کورد زیاتر شارەزای زمانەکمان بو » ( محمد امین زکی ، خلاصەیەکی کوردو کوردستان . جلدی اول ( جزی دوەم ) ، بەغدا ، ١٩٣١ ، ل ٢٩١ )

باری کوردستان کۆڵییەوەو پەیوەندییەکی یەکجار زیکی لەگەڵ هەندێك لە سەردارەکانی جاف دامەزراند[٢٣]. هەمـــو ئەمانەو نوسینەکانی لە دوایدا بـە نیسبەت ئینگلیزەکانەوە جێگەی تەواوی خۆیان گرت[٢٤]، وە لە دەوروبەری کۆتایی شەڕدا جۆبەجێ کردنی کەلێك ئەرکی گرنگی لە کوردستانی عیراقدا پێ سپێردرا، ئەوەبوو هەر دوای داگیر کردنی بەغدا لە لایەن سوپای ئینگلیزەوە سۆن بەرەو خانەقین کەوتە رێ. دوای کۆتایی هاتنی شەڕیش بە ناوی ئەفسەری سیاسی بەریتانیاوە دەورێکی گەورەی لە چەسپانـدنی دەســەلاتی ئینگلیزەکاندا لە کوردستانی عیراقدا بینی وە هەروەك نوســەری ئینگلیز ئیرنست مێین دەڵێت کارەکانی ســۆن « بە رادەی کارەکانی لۆرانس گرنگ بوون هەرچەندە کەمتر بە ناوبانگن »[٢٥].

هەرچەندە ئینگلیزەکان بایەخیان بە خواروی کوردستان زیاتر دەدا وەك لە بەشەکانی تری، بەڵام لەهەمان کاتدا بەشەکانی تریشیان

---

(٢٣) ئەوەی شایانی باسە ئەوەتە مێجەر سۆن پێش ئەوەی دەست بە گەشتەکەی بە کوردستاندا بـکات کاربەدەستی کـۆمپانیای نەوتی « ئینگلیزی ـ فارسی » بو وە دوای گەشتەکەی بە فەرمانی کۆمپانیای ناوبراو لە ناوچەکانی دەورو بەری قەسری شیرین و خانەقین کەوتە گەڕان بەدوای نەوتدا.

(٢٤) نوسینەکانی نابەوێت لە نرخ و بایەخی زانیاری یەکجار زۆری کارو بەرهەمی زمارەیەکی زۆر لە گەڕۆکە ئەوروپاییەکان کەم بکەینەوە کە کوردو کوردناسان تا ئەمڕۆش لە زۆر رووەوە کەلکیان لێ وەردەگرن.

(٢٥) E. Main, Iraq from Mandate to Independence, London, 1935, P. 51.

نەخستە پشت گوێی‌و ئەواتیش جێگەیەکی دیاریان لە پلانەکانیاندا هەبو . بۆیەکا ژمارەیەکی زۆریش لە گەڕۆك‌و کاربەدەستە ئینگلیزەکان بە ئاشکراو بە دزییەوە پێش شەڕو لە ساڵەکانی شەڕدا خۆیان دەگەیاندە ناوچە هەرە گرنگەکانیان‌و بەڵکو هەندێکیان ئەگەیشتنە قوژبنی وەهای ئەو ناوچانە کە بەر لەوان بێگانە پێی تێ نەنابو . هەر لە سەردەمی گەشتەکەی مێجەر سۆندا کاربەدەستی سیاسی بەریتانیایی مارك سایکس گەشتێکی دوورو درێژی ٧٥٠٠ میلی بە کوردستانی ژوورودا کردو لە نزیکەوە لەباری ژیانی ژمارەیەکی یەکجار زۆر لە هۆزە کوردەکان کۆڵییەوەو لە هەمو روەیەکی ژیانی ناوچەکانیان ورد بوەوە . ئەو زانیاریانەی مارك سایکس لە گەشتەکەیدا کۆی کردنەوەو کە هەندێکیانی لێ بڵاو کردنەوە(٢٦) بەکەڵکی هەمو ئەو کەس‌و لایەنانە دەهاتن کە بایەخیان بە کوردستان‌و دوا رۆژی دەدا .

لەگەڵ نزیك کەوتنەوەی شەڕدا هاتو چۆو جم‌و جوڵی ئینگلیزەکان لە کوردستاندا ، وەك زۆربەی شوێنەکانی تری رۆژهەڵاتی نزیك‌و ناوەڕاست ، پەرەی دەسەندو مەبەستی راستەقینەی کاریان ئاشکراتر دەبو . هەر بەر لەوەی شەڕ دەست پێ بکات وەکیلی کۆنسولی بەریتانیا لە شاری وان کەوتە دامەزراندنی پەیوەندییەکی نزیك لەگەڵ سەردارە دەسەڵاتدارەکانی ناوچەی بەدلیسدا . لە لایەکی

(٢٦) بڕوانە : M. Sykes, The Kurdish tribes of the Ottoman Empire,- « The Journal of the Royal Anthropological Institute of Great Britain and Ireland », Vol. XXXVIII, 1908 ( July to December ) , PP. 451 – 486 .

ئەوە كۆنسولەكانی ئینگلیز لـــە دیاربەكرو متوسڵ بە گەرمی كەوتنە پڕوپاگەندە دژی ڕوسیا كە ، وەك دوایی باسی دەكەین ، چاوی بڕیبوە كوردستانی ڕۆژهەڵات و ژوورو . ئەمانە لە هەمو لایەك خەڵكەكەیان وا لێ دەكرد وا تێ بگەن كە وا لە دواڕۆژێكی زۆر نزیكدا هەمو ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست یەكسەر دەكەوێتە ژێر ركێفی ئینگلیزەوە [٢٧] .
بەم جۆرەو بە پارە ئینگلیزەكان توانییان ژمارەیەكی زۆر لە سەرۆكی هۆزە ناودارەكانی كوردی وەك كەڵهوڕ بكڕنو تەنانەت توانییان لـــە ساڵی ١٩١٧ دا بیانكەن بەگژ هۆزە سەربە ئەڵمانو توركەكاندا .

ئینگلیزەكان لەهەمان كاتدا هەوڵیان دەدا كەڵك لە كەمینە نەتەوەیی و ئاینییەكانی كوردستان وەربگرنو جێ پێی خۆیان لە ناویاندا قایم بكەن . بۆ ئەم مەبەستە بەر لە شەڕو لە ساڵەكانی شەڕدا هەوڵێكی زۆریان لەگەڵ ئاسوورییەكاندا داو ئەم ئەركەیان خستە سەر شانی ئـــەو قوتابخانە ئاینییە عیسایییەی لە دێی ( قوجانس ) كردیانەوە كە كەوتۆتە ناوچەی هەكارییەوە . ئـــەم قوتابخانەیە یەكسەر لـــە لایەن كۆنسولی بەریتانیاوە لە وان سەرپەرشتی دەكرا [٢٨] . ئەنجامی پڕوپاگەندەی ئینگلیز لەناو ئاسوورییەكاندا لە كاتی شەڕو ساڵەكانی یەكەمی دوای شەڕدا بە ئاشكرا دەركەوت . ئینگلیزەكان هەرچەند هەندێك كەمتر لەو هەوڵەی لەگەڵ ئاسوورییەكاندا دەیاندا بایەخیان دابێ بـە خۆ

---

(٢٧) بڕوانە : م.س. لازەرێف ، سەرچاوەی ناوبراو ، ل ٢٤٨ .

(٢٨) صديق الدملوجي ، إمارة بهدينان الكردية أو إمارة العمادية ، الموصل ، ١٩٥٢ ، ص ١٢٠.

نزیك‌خستنه‌وه له کورده ـ یه زیدیه‌کان ، به‌لام هه‌وڵو ته‌قه‌لای ئه‌م لایه‌نه‌شیان بۆ سوودو ئه‌نجام نه‌بوو . له ساڵه‌کانی شه‌ڕدا ، وه به تایبه‌تی له ڕۆژی داگیرکردنی به‌غداوه له لایه‌ن له‌شکری ئینگلیزه‌وه ، ئه‌فسه‌ره سیاسیه‌کانی ئه‌م له‌شکره که‌وتنه دامه‌زراندنی په‌یوه‌ندی له‌گه‌ڵ کورده یه‌زیدیه‌کانداو بۆ ئه‌م مه‌به‌سته ئه‌فسه‌ریه‌کیان به نهێنی ناردە ناوچه‌ی ژه‌نگارو شێخان [٢٩] .

به‌م جۆره وه‌ك ده‌بینین کوردستان شوێنێکی دیارو بایه‌خداری له سیاسه‌تی به‌ریتانیادا به‌رامبه‌ر ڕۆژهه‌ڵاتی ناوه‌ڕاست هه‌بوو وه ڕۆژ به‌ڕۆژیش ئه‌مه ئاشکراتر ده‌بوو . به‌وێنه دیپلۆماسی هه‌ره به‌ناوبانگی ئینگلیز لۆرد کێرزن له سه‌ره‌تای ساڵه‌کانی نه‌وه‌دی سه‌ده‌ی ڕابوردوودا به ئاشکراو به گه‌ری ته‌نها باسی مێسۆپۆتامیای ده‌کرد که ده‌یوت « ده‌بێت بکه‌وێته ژێر ده‌سه‌ڵاتی ته‌نها به‌ریتانیاوه‌و به‌س » [٣٠] ، که‌چی هه‌مان لۆرد دوای ئه‌وه به بیست ساڵێك ، واته پێش ده‌ست پێکردنی شه‌ڕی یه‌که‌م به ماوه‌یه‌کی که‌م ، له به‌رده‌می ئه‌نجومه‌نی لۆرده‌کاندا بێ پێچو په‌نا بڵاوی کرده‌وه که وا « هه‌ڵه‌یه وا لـــه قه‌ڵه‌م بدرێت که گوایه به‌رژه‌وه‌نده سیاسیه‌کانمان ته‌نها لـــه ناوچه‌ی که‌نداودایه ( مه‌به‌ستی که‌نداوی عه‌ره‌به ـ ك. م. ) ، ئه‌و به‌رژه‌وه‌ندانه ته‌نها له‌و سنووره‌دا نین‌و ته‌نانه‌ت ته‌نها ناوچه‌ی نێوان به‌سره‌و به‌غداش

---

(٢٩) بڕوانه : اسماعيل چول ، اليزيديه قديماً وحديثاً ، بيروت ، ١٩٣٢ ، ص ٥٩ ـ ٦١

(٣٠) G. N. Curzon, Persia and the Persian question, Vol. II, London, 1892, P. 578 .

ناکرنەوە بەڵکو کەلێك زۆروَی بەغداش دەکرنەوە »[٣١] ، « کەلێك زۆروَی بەغداش » وەك ئاشکرایە کوردستان دەگەیێنێت . هەر ئەمەش بۆ کارێکی وەهای کرد ئینگلیزەکان لە ساڵەکانی شەڕدا ئەوەندەی تر بایەخ بە کوردستان ، وە بە رادەی یەکەم کوردستانی خوارۆ بدەن . ئارنۆڵد ویلسن کە دوای داگیرکردنی عیراق لەلایەن بەریتانیاوە بوە یەکەم حاکمی سیاسی ئینگلیز لە عیراقدا دەڵێت کە وا لە ساڵەکانی شەڕی یەکەمدا « پیاوە هەرە بەتواناکانمان لە ناوەندی نیمچە دۆرگەی عەرەبو کوردستانو خوارۆی رۆژئاواو زۆروَی رۆژئاوای ئێرانو کەنداوی بەسرەدا کاریان دەکرد »[٣٢] .

رۆسەکانیش هەروەك ئینگلیزەکان دەمێك بۆ چاویان بڕیبوە کوردستانو بەتایبەتی ئەو ناوچانەی کە کەوتبۆنە سەر یا نزیك سنوری خوارۆی وڵاتەکەیان . رۆژ بەرۆژ لەگەڵ لاواز بونی دەوڵەتی عوسمانیو نزیك بونەوەی شەڕدا بایەخ پێدانی رۆس بە کوردستان زیاتر پەرەی دەسەند . یەکێك لە مەبەستە گەورەکانی سیاسەتی رۆس بەرامبەر بە کورد بەر لە شەڕو لە سەرەتای شەڕدا بریتی بو لە پاراستنی هێمنیو ئاسایش لە ناوچەکانی سەر سنوری قەفقاسدا بەتایبەتی لەبەر ئەوەی کە ئەڵمانو تورك کەوتبونە هاندانی هۆزە کوردەکانی نزیك ئەو ناوچانە دژی رۆسیاو ئەمیش بەرامبەر بەوە هەوڵی دەدا

---

(٣١) بڕوانە : P. W. Ircland, Iraq. A Study in political development, London, 1937, PP. 48 – 49 .

(٣٢) بڕوانە : « العالم العربي » ، بغداد ، ٢٢ تشرين الاول ١٩٢١ .

هەرچۆنێك بێت کوردەکان بەلای خۆیدا رابکێشێت‌و لە راستیشدا لەم رووەوە زرۆفێکی باشی بۆ هەڵکەوتبو چونکە ژمارەیەکی زۆر لە سەرداره کوردە ناودارەکانی وەك عەبدورزەزاق بەدرخان کە لە دەست کاربەدەستانی تورکیاو ئێران داخ لە دڵ بون ، وایان دەزانی بە یارمەتی روس دەتوانن کوردستانی سەربەخۆ دابمەزرێنن ، تەنانەت هەندێك لەو سەردارانە بەگەرمی پشتگیری دامەزراندنی کوردستانێکی ئۆتۆنۆمی‌داریان دەکرد بە مەرجێك لەژێر چاودێری روسیادا بێت . روسەکان هەرچەندە بێ گومان ئەمەیان زۆر بە دڵ بو بەلام لە ترسی دروست بونی کێشەیەکی گەورە لەسەر سنورەکانی خواروی ولاتەکەیاندا نەیاندەوێرا خۆیانی لە قەرە بدەن چونکە ئەمە لەو سەردەمە ناسکەدا لەوانەبو ئەنجامەکەی بە خێر نەگەڕێت بۆیان لەبەر ئەوەی کە دەیانزانی کاربەدەستەکانی تورکیاو ئێران‌و ئەڵمانیا بە هەمو جۆرێك دەکەونە بەرهەڵستی کردنی ئەو پرۆژەیە .

لەگەڵ ئەوەشدا روسەکان زۆریان بایەخ بە بلاوکردنەوەی دەسەلاتی سیاسی‌و ئابوری خۆیان لە کوردستاندا دەداو بەڵگەی زۆری وەها بە دەستەوەیە کە گومان لەوەدا ناهێڵن کە وا روسەکان خۆیان مەلاس دابو بۆ ئەوەی هەر کاتێك بۆیان بلوێت چەند بەشێکی کوردستان داگیر بکەن . بە وێنە شۆڕشی مەشروتییەی ئێران (۱۹۰۵—۱۹۱۱) یان بەهەل زانی بۆ ئەوەی لە سالی ۱۹۰۹ دا ناوچەیەکی فراوانی کوردستانی ئێران داگیر بکەن‌و بە تەما بون وەك ولاتەکانی پشت قەفقاس بیخەنە سەر ئیمپراتورییە بەدەرەتانەکەیان .

بایەخی کوردستان لە لای ڕوٗسەکان پالی پێوە نابوٗن بوٚ دامەزراندنی گەلێك کوٚنسولخانەو قوتابخانەی تایبەتی‌و بنکەی ئایینتی لە هەندێك لە شارەکانی کوردستانی تورکیاو ئیرانداو تەنانەت پێش دەست پێ‌کردنی شەڕ بە ماوەیەکی کەم چاپخانەیەکیشیان لە شاری ورمێ دانا. یەکێك لەو کاربەدەستە گەورانەی ڕوٗس(٣٣) کە بەگەرمی لەناو کوردا کاریان دەکرد کوٚنسولی کوٚنی ڕوٗسیا لە دیمەشق شازادە باریس شاخوٚفسکی بوٗ کە لە ساڵەکانی شەڕدا سەرپەرشتی کاروباری هەموٗ کوردستانی لەلایەن وەزارەتی دەرەوەی ڕوٗسیاوە پێ سپێردرا. شاخوٚفسکی بایەخێکی زوٚری دابوٗ بە بەستنی ئابوٗریٚ کوردستان بە ڕوٗسیاوە، وە لە ڕاستیشدا دواکەوتوٗیی کوردستان‌و نزیکی لە ڕوٗسیاوە هەلێکی باشیان خولقاندبوٗ بوٚ پەرەسەندنی پەیوەندی بازرگانی لە نێوان گەلێك لە شارە نزیکەکانی کوردستان‌و هەندێك شاری ولاتەکانی پشت قەفقاسدا(٣٤). ئەوەی شایانی باسە ئەوەتە کە وا نەك تەنها کەل‌و پەلی ڕوٗسیا خوٚی بەڵکو زوٚر بەرهەمی پیشەسازی ولاتەکانی تری ئەوروٗپاش هەر لە ڕێگەی ڕوٗسیاوە دەگەیشتنە بەشێکی زوٚر لە بازاڕەکانی کوردستان. ئەمە پالی بە وەزارەتی بازرگانی‌و پیشەسازی ڕوٗسیاوە نا داوا لە وەزارەتی دەرەوە بکات کوٚنسولخانەو

---

(٣٣) شایانی باسە ژمارەیەك لە کاربەدەستەکانی ڕوٗسیا لە کوردستان لە دواڕوٚژدا کوردناسی گەورەو ناوداری لە وێنەی مینوٚرسکی‌و نیکیتینیان لێ دەرچوٗ.

(٣٤) لە ڕێگەی ئەو پەیوەندییە بازرگانییەوە هەندێك وشەی نوێ تێکەڵی زمانی کوردی بوٗن کە تا ئێستەش بەکار دەهێنرێن وەك سەماوەرو وارشاوو ئەشتەرخان‌و هی تر.

بنکەی بازرگانی بولی لە شارەکانی کوردستاندا بکاتەوە. لە راستیشدا پەرەسەندنی پەیوەندی بازرگانی کوردستان بە رووسیاوە گەیشتە رادەیەکی ئەوتۆ ئەڵمانەکانی وەها بێ تاقەت کرد کە بکەونە هەوڵدان بۆ کەمکردنەوەی دەسەڵاتی ئابووری بازرگانە رووسەکان، بەتایبەتی لە کوردستانی ئێراندا[٣٥] . لە کوردستانی تورکیاشدا هەر بە هاندانی ئەڵمانەکان تورکەکان بە ئاشکرا کەوتنە شەڕ فرۆشتن بە ئەفسەرو پیاوە دیپلۆماسیەکانی رووس. دەوڵەتەکانی تریش هەر بەو رادەیەو بە پێی توانا دژی هەموو جۆرە بڵاوبوونەوەیەکی دەسەڵاتی رووس لە کوردستاندا کەوتنە کار. ئەمەو تا رادەیەکی زۆر ساردی رووسەکان خۆیشیان[٣٦] لەراستیدا بوونە هۆی ئەوەی سیاسەتیان لە کوردستاندا زۆر سەرنەکەوێت و کار گەیشتە رادەیەك تەنانەت پاراستنی هێمنی سنوورەکانی سەر کوردستانیشیان پێ هەڵنەسووڕێنرا. لـە

(٢٥) بڕوانە : م. س. لازەرێف، سەرچاوەی ناوبراو، ل ٢٦٢ .

(٣٦) شایانی باسە ژمارەیەکی زۆر لە سەردارە کوردە ناودارەکان هەوڵیان دەدا بە یارمەتی رووس شتێك بۆ کورد جێ بەجێ بکەن و بۆ ئەم مەبەستە هەندێکیان زۆر لە نزیکەوە پەیوەندییان لەگەڵدا بەستبوون و یەکێکی وەك عەبدورەززاق بەدرخان گەلێك پڕۆژەی قووڵ و دووربینی لەم بارەیەوە پێشکەش کردبوون . هەروەها سمکۆش چەندەهای جار هاریکاری لەگەڵ پیاوە دیپلۆماسیەکانی رووسدا کردووەو داوای یارمەتی لێ کردوون . هەر بۆ ئەم مەبەستە تەنانەت شێخ مەحموودیش کە ناوچەی دەسەڵاتی لە هەموو شوێنێکی تری کوردستان لە رووسیاوە دوورتر بوو چەند جارێك بەر لە شەڕو لە ساڵەکانی شەڕدا هەوڵی داوە پەیوەندییان لەگەڵ دابمەزرێنێت ، بەڵام رووسەکان بە شێوەیەکی گشتی هەڵوێستێکی ساردیان بەرامبەر ئەم جۆرە هەوڵ و تەقەلایەی سەردارەکانی کورد بووە .

ساڵەکانی شەڕیشدا کاربەدەستەکانی ڕوسیا بە نیسبەت کوردەوە تەنها بیریان لەوە دەکردەوە کە دەوریان لە مەیدانەکانی شەڕدا لە ئاسیای بچوک چی دەبێت‌و چۆن بتوانن کارێکی وەها بکەن ئەگەر کوردەکان نەشدەنە پاڵ لەشکرەکانی ئەمان هیچ نەبێت دژیشیان نەوەستن .

بەم جۆرە وەك دەبینین ڕوسیا لەگەڵ ئەوەشدا کە وەك زوربەی دەوڵەتە گەورەکانی تر چاوی بڕیبوە خاکی کوردستان‌و سامانەکانی بەڵام خەتێکی سیاسیی دیارو دوربینی بەرامبەر بە کوردستان نەبو ، وە زۆر جار ئەم سیاسەتەی بە پێی کات‌و شوێن دەگۆڕڕا . کۆنسولی ڕوس لە ورمێ لە یەکێك لە دەکومێنتە نهێنێکانیدا بە ئاشکرا دانی بەوەدا ناوە کە وا ڕوسەکان بە رادەی یەکەم لە قوزبنی دامەزراندنی دەوڵەتی ئەرمینیای سەربەخۆوە سەیری کێشەی کوردو دوا ڕۆژی کوردستانیان دەکرد[٣٧]. ئەمەش لە راستیدا بوە هۆیەکی گەورەی دوور کەوتنەوەی تەنانەت کوردەکانی سەر سنوریش لە ڕوسیا کە بە ئاشکرا دو سیاسەتی جیاوازی لەگەڵ کوردو ئەرمەندا پەیڕەوی دەکرد ، بەنیسبەت کوردەوە جارێك نەبو بە تەواوی لە مەسەلەیەکی گرنگدا پشتیان بگرێت کەچی لە هەمان کاتدا بێ‌وچان پشتگیری ئاسوری‌و بەتایبەتی ئەرمەنی دەکردو لە کاتی پێویستدا چەکی دەدانێ ، جگە لەوەی سیاسەتێکی دیاری کراوی ڕون‌و ئاشکراشی لەبارەی دوارۆژی ئەرمینیاوە هەبو . لە

(٣٧) م. س. لازەرێف ، سەرچاوەی ناوبراو ، ل. ٣٠١ .

ساڵەکانی شەڕی یەکەمدا ئەم هەڵوێستانەی ڕوس ئەوەندەی تر ڕوون‌و ئاشکرا بوون. شازادە شاخۆفسکۆی ناوبراو لەم بارەیەوە لە نامەیەکی ڕەسمیدا نوسیویەتی دەڵێت: «لەگەڵ دەست پێکردنی شەڕدا چ لە بارەگای قەفقاس‌و چ لە پیترۆگراد... پشت بە ئەرمەن دەبەستراو هیوایەکی زۆریان پێیان بو وە دەستیان کرد بە دامەزراندنی تیپی پشتماڵەی چەکدار لە ئەرمەنەکان کەچی هیچ گوێیان نەدایە کورد» [٣٨]. ئەم جۆرە هەڵوێستەی ڕوسەکان ئەوەندەی تر ئەرمەنە نەتەوە پەرستە داخ لەدڵەکانی هانزدا کە بە ڕەفتی لەگەڵ کوردەکانی دراوسێیاندا بجوڵێنەوە [٣٩]. لە ساڵەکانی شەڕدا زۆر جار ئەرمەنە

---

(٣٨) بڕوانە:

Курд-Оглу, Курды и империализм, "Бюллетень прессы Среднего Востока". - Ташкент, № 13-14, 1932, стр. 108. کورد ئۆغلو، کوردو ئیمپریالیزم، گۆڤاری «بلوتینی چاپەمەنی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست»، تاشکەند، ژمارە ٣ - ١٤، ١٩٣٢، ل. ١٠٨.

(٣٩) دوای پەیدا بونی جوڵانەوەی ئازادی - نەتەوایەتی لەناو ئەرمەنەکاندا چینە کاربەدەستەکانی دەوڵەتی عوسمانی ڕقێکی زۆریان لێ هەڵگرتن‌و لەگەڵ پەرەسەندنی خەباتی ئەرمەن لە پێناوی سەربەخۆیی نیشتمانەکەیاندا تورکە عوسمانیەکان بیری قڕکردنیان کەوتە کەللەوەو ئەوەبو ساڵی ١٨٩٦و بۆ دوەهەم جار ساڵی ١٩١٠ کەوتنە گیانی ئەرمەنەکان‌و بە سەدەها هەزاریان لێ قەلاچۆ کردن‌و ئەمەش بەجارێك ڕای گشتی ئەوروپایی خرۆشاندو فشارێکی گەورەی سیاسی کەوتە سەر فەرمان ڕەواکانی تورکیا، ئەمانیش بۆ پاکانەی خۆیان ویستیان دەستە چەورەکەیان بە سەر کورددا بسون. ئەمەو بەشداری کردنی چەند دەرەبەگێکی کورد لەو کوشتارانەدا ڕقی نەتەوەپەرستەکانی ئەرمەنی لە کورد هەڵساندبو بۆیەکا بەدوای هەلێکی وەك ڕوداوەکانی شەڕی یەکەمدا دەگەڕان بۆ تۆڵە سەندنەوە.

چەکدارەکانی ئەو ناوچانەی تورکیا کە لەشکری رۆسیان تێ دەهاتن دەکەوتنە گیانی دانیشتوە کوردەکانیان بۆ ئەوەی سەرکردەکانی لەشکری رۆس دەست بێننە بەردەمیانو ئەمەش بێگومان ئەوەندەی تر کوردی لە لەشکری رۆس کرد .

جگە لە بەریتانیاو ئەڵمانیاو رۆسیا فەرەنسەو ئەمەریکاش هەریەکەیان بەپێی سیاسەتیان بەرامبەر دوارۆژی دەوڵەتی عوسمانیو بەرژەوەندەکانی خۆیان بایەخیان دابۆ بە کوردستان . ناردنی ئەدمیرال چێستەر، هەر وەك لە سەرەوە باسمان کرد ، یەکێکە لە بەڵگەکانی ئەو بایەخ پێدانە لە لایەن ئەمەریکاییەکانەوە کە لە لایەکی تریشەوە میسیانێرەکانیان[٤٠] دەمێك ساڵ بۆ لە کوردستان بەگەرمی لەکاردا بونو جمو جۆڵو هاتوچۆیان زۆر ناوچەی کوردستانی گرتبۆوەو ناویان لە زۆر لا دەرکردبو وە لە نزیکەوە پەیوەندییان لەگەڵ کەمینەکانی کوردستان ، بە تایبەتی لەگەڵ ئاسورێکاندا دامەزراندبو بە رادەیەك ژمارەیەکی زۆریان بە هاندانی ئەمەریکاییەکان دەستبەرداری کڵێسەی کاتۆلیك بونو بونە پرۆتستانت[٤١] . هەر بەو جۆرەو بگرە چالاکانەتریش میسیانێرە ئەمەریکاییەکان لەناو

---

(٤٠) بە مانای ( مبشر )ە کە لە زمانە ئەوروپاییەکانەوە وەرگیراوە . ( مبشر ) بە فارسی ( مبلغ ، مبلغ مذهبیو میسیۆنر )ە .

(٤١) بڕوانە : Sir Percy Sykes, A Summary of the history of the Assyrians in Iraq, 1918 - 1932, - « Journal of the Royal Central Asian Society », April 1934, p. 256.

ئەرمەنەکانیشدا لە کاردا بوون [42] .

ئەوەی شایانی باسە بوونی ئەم جۆرە میسیانێرانە لە کوردستاندا بوە هۆی قووڵ کردنەوەی ناکۆکتی نێوان دانیشتوە موسوڵمانو گاورەکانیو [43] ئەمەش لە ساڵەکانی شەڕدا لە زۆر شوێن بوە هۆی تەقینەوەی هەراو کوشتار . بە وێنە لە سەرەتای شەڕدا لە ناوچەی ورمێ کە میسیانێرە ئەمەریکاییەکان لە ساڵی ١٨٣١ وە کردبویانە مەڵبەندی کاریان هەرایەکی گەورە قەوما کە لە ئەنجامیدا ژمارەیەکی زۆر گاوری بێ گوناە بونە قوچی قوربانی [44] .

فەرەنسەییەکانیش هەرچەندە وەك ئەمەریکاییەکان هەوڵیان دەدا لە ڕێگەی پیاوە ئاینیەکانیانەوە جێ پێی خۆیان لەناو کەمینەکانی کوردستاندا قایم بکەن [45] بەڵام بایەخێکی زیاتریان بە تەقەلای سیاسی

---

(٤٢) بڕوانە : أ. ئادامۆف ، سەرچاوەی ناوبراو ، ل ٢١٨ ـ ٢١٩ .

(٤٣) پێویستە ئەوەش بوترێت کە زوربەی ئەو میسیانێرانە کەم یا زۆر یارمەتی دانیشتوانی ئەو ناوچانەیان دەدا کە کاریان تێدا دەکردن ، بە تایبەتی نەخۆشەکانیان . جگە لەوە بونیانو جۆری ژیانو رەفتاریان هۆیەکی سا کاری پەیدا کردنی پەیوەندی بو بۆ خەڵکی ئەو ناوچانە لەگەڵ شارستانیتی رۆژئاوادا .

(٤٤) بڕوانە : علي سيدو الكوراني ، من عمان الى العمادية أو جولة في كردستان الجنوبية ، القاهرة ، ١٩٣٩ ، ص ٢٠٥ ـ ٢٠٨ .

(٤٥) فەرەنسەییەکان لەم رووەوە بایەخێکی زۆریان بە ناوچەکانی ویلایەتی مۆسڵ ، وە بە تایبەتی شاری مۆسڵ خۆی دابو .

دابتێ بۆ ئەوەی ئەوانیش جێ‌پێی خۆیان لە کوردستاندا ، وەك دەوڵەتە گەورەکانی تر ، جێگیر بکەنو لە هەمێ شوێنێکیش زیاتر چاویان بڕیبوە ویلایەتی مێوسڵو لە هەمێ لایەك زیاتر لە سیاسەتی ئینگلیز بەرامبەر بەم ناوچەیە بێ تاقەت بێن .

بەم جۆرە وەك دەبینین زۆربەی دەوڵەتە گەورەکان لە سنێری بەرژەوەندە سیاسیو ئابێریەکانی خۆیانداو بەپێی سیاسەتی دیازی کراویان بەرامبەر بە دوارۆژی دەوڵەتی عوسمانێ بایەخیان دەدا بە کوردستانو ئەنجامەکانی ئەم بایەخ پێدانەش لە ساڵەکانی شەڕی یەکەمی جیهاندا بە رۆنی دەرکەوتنو کارێکی زۆریان کردە سەر رۆداوو ئەنجامەکانی ئەم شەڕە بەنیسبەت کوردستانەوە وەك لە بەشە داهاتوەکانی ئەم کتێبەدا باسیان لێ دەکەین .

* * * * * *

# بەشی دوەم

# باری گشتی کوردستان

## بەر لە دەست پێ کردنی شەڕ

لاوازی و پەککەوتەیی ئێران و تورکیا بەر لە دەست پێ‌کردنی شەڕی یەکەم بە چەند ساڵێك گەیشتبوە رادەیەك ، بەولاوەی تەنها کەوتن و رووخان بوو . شەڕی ساڵی ۱۹۱۱ی نێوان تورکیا و ئیتالیا و شەڕی ساڵی ۱۹۱۲ی تورکیا لەگەڵ وڵاتانی ناوچەی بەلقاندا و ناکۆکی نێوان « ائتلاف »ی ئیتیحادیەکان لە ناو تورکیا خۆیدا و هەراوبکری ئێران و تورکیا لە سەر سنوری نێوان هەردوو لایان و باری ئاڵۆز و سەختی ژیانی ئابوری و کۆمەڵایەتی ئەم دوو وڵاتە و گەلێك هۆی تر بەو دەردەی بردبوون کە لە هەموو

قوژبنێکیاندا هەستی پێ دەکرا . لە کوردستاندا دەسەڵاتی ئەم دوو دەوڵەتە تا رادەیەکی ئاشکرا کز بوو بوو وە لە هەندێك لە ناوچە سەخت و ناو هۆزە بەهێزەکانیدا تەنانەت هەست بە بوونی نەدەکرا . لاوانی ئەو جۆرە ناوچانە بە ئاشکرا و بێ ترس مل پێچییان لە سەربازی دەکرد و جوتیارانی زۆر شوێنیش باج و سەرانەیان نەئەدا و وایان لێ هاتبو زەبتیە و جاندرمەکانی میریان بە هیچ ئەزانی ؛ وەك نوسەری عەرەب صەدیق دەملوجی دەیگێڕێتەوە لە و سەردەمەدا کاربەدەست و زەبتیەکانی میری تەنهـا بەگوند و لادێی پچوکەکانی فەلەکانیـان دەوێرا و توخنی زوربەی گونـدی هۆزە کوردەکان نەدەکەوتن[1] .

(سوارەی حەمیدی) ش کە لە سەردەمی سوڵتان عەبدولحەمیدا بۆ پاراستنی دەسەڵاتی خۆی و لێدانی بزوتنەوەی ئازادی ـ نەتەوەیی گەلە ناتورکەکان لە چەکدارانی هەندێك لە هۆزە کوردەکان پێکهێنرابوو بەر لە ساڵەکانی شەڕ ببوە لەشکرێکی بێ گیان و توانا و بەو جۆرە بە جارێك سـەنگی جەنگی خۆی لە دەسـت دا بوو و ئەوەندەی تر لە ناو کۆمەڵدا سوك و ریسوا بوو بوو ، بۆیەکا هەموو هەوڵ و کۆشی کاربەدەستانی تورکیا بۆ ئەوەی گیـانی بکەنەوە بە

(١) صدیق الدملوجی ، إمارة بهدینان الکردیة ، ص ٨١ . شایانی باسە دانەری ئەم کتێبە خۆی بەر لە شەڕ بۆ ماوەی چەند ساڵێك لە بادینان کاربەدەستی میری بووە .

بەردا بە فیزۆ چوو وە لە زۆر شوێن بووە بار بەسەر کۆمەڵانی خەڵکی کوردستانەوە .

بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا فەرمانڕەوایانی تورکیا هەر لە هەوڵ و کۆششدا بوون بۆ ئەوەی کەڵک لە هێز و توانای هۆزە کوردەکان وەربگرن و دەیانویست بۆ شەڕی داهاتوو ئامادەیان بکەن چونکە دەیانزانی بێ ئەوە کەلێنێکی دیار دەکەوێتە ناو توانای جەنگییانەوە . کاربەدەستانی تورکیا دەیانویست گەلی کورد بکەنە یەکێک لە قەڵا سەختەکانی بەربەرەکانێی ڕوس کە لەم کاتەدا زۆر چاوچنۆکانە دەیانڕوانییە خاکی دەوڵەتی عوسمانی بۆیەکا تورکەکان دەیانویست زیاتر خۆیان لە هەندێك لە سەرەك هۆزە دەسەڵاتدارەکانی کوردستان نزیك بخەنەوە و دژی ڕوسیا بیانجوڵێنن و بۆ ئەم مەبەستەیان پەیمانی چەوریان دەدانێ و بەو جۆرە تەنانەت توانییان چەند تیپێکی سوارەی حەمیدی لە سەر سنووری ئەو وڵاتە ڕیز بکەن(٢) .

لەگەڵ ئەوەشدا هەوڵ و تەقەلای تورکەکان لەم مەیدانەدا تەواو کەم ئەنجام و بێ سوود بوو چونکە تەنها ژمارەیەکی کەم لە سەرەك هۆزە کوردەکان بە دەنگیانەوە چوون کەچی لە هەمان کاتدا هەندێك سەرەك هۆزی تر بە ئاشکرا و بێ ترس بڵاویان دەکردەوە کە وا لە کاتی شەڕدا دژی لەشکری تورك دەوەستن و دەدەنە پاڵ

---

(٢) بڕوانە : م . س . لازەرێف ، سەرچاوەی ناوبراو ، ل ٢٩٥ .

رۆس . ئەوەی لەم بارەیەوە شـــایانی باسە ئەوەتەکە وا ژمارەیەك لە نیشتمانپەروەرە داخ لە دڵەکانیش تا رادەیەکی زۆر پشتگیرێ ئـــەو بیرەیان دەکرد چونکە زوڵم و زۆری عوسمانییان وای لێ کردبۆن تەماع و پیلانی چینە کاربەدەستەکانی رۆسیا نەبینن .

بەر لە شــەڕ باری نالەباری ژیانی ئابۆری و کۆمەڵایەتی کوردســتان وەك زوربەی هـــەرە زۆری ناوچەکانی تری ئێران و دەوڵەتی عوسمـانی گەیشتبووە رادەیەك زیاتر لە جاران کۆمـــەڵانی خەڵك بجوڵێنێ و هەستی نەتەوەییان بزوێنێ . ئەمە و چەنـــد هۆیەکی تر کارێـــکی وایان کردبۆ رۆژ بە رۆژ ژمارەی ئەو کەسانەی ســەربەخۆیی ، یان بەلای کەمەوە خودموختاری ( ئۆتۆنۆمی ) کوردیان دەویست لە زیاد بۆندا بێ و ئەمە لە پەرەسەندنی هەندێك چالاکی سیاسی و کۆمەڵایەتیدا خۆی نواند ، ئەوە بۆ بەر لە شەڕ ژمارەی کۆمەڵ و رێـکخراوە سیاسییە نهێنیـکانی کوردستان زۆر بۆ وە تا دەهات سەنـگیان لە ناو کۆمەڵانی خەڵك و بە تایبەتی رۆشنبیراندا پتر دە بۆ . ئەم کۆمەڵ و رێـکخراوانە بە هەر چوار لادا کەوتنە بڵاوکردنەوەی بەیاننـامە و پەخشـــە « نشرە » ی ئەوتۆ کە پڕ بۆن لە هەستی نەتەوەیی و رق و کینەی رەوا بەرامبەر زۆر و زۆرداری میری و کاربەدەستانی . یەکێك لەو پەخشـانە لە ژێر ئـەم ناوە پڕ مانایەدا بڵاو دەکرایەوە : « ئەڤ خۆڵە خۆڵی ئەمەیە » کە بە ئاشکرا دژی دەسـەڵاتی تورك دەدوا و دەیگوت « تورك بە هیچ جۆرێك

بەرێوە بردنی کوردستانیان لە باردا نییە ». وەك کوردناسی سۆڤێتی م . س. لازەرێڤ باسی دەکا ئەم پەخشەیە لە ناو خەڵکدا دەنگی دا بۆوە و دەگەیشتە زۆر قوژبنی کوردستان[٣] . شایانی باسە زوربەی ئەو پەخشە و بەیاننامانە لە کوردستانی باکور و هەندێکیان لە کوردستانی ئێران دەر دەکران بەڵام ژمارەیان لێ دەگەیشتە کوردستانی باشوریش و بە شێوەیەکی تایبەتی دەنێررانە تەکێکانی بارزان و لەوێوە بڵاو دەکرانەوە[٤] .

هەر لەو ساڵانەشدا هەندێك کۆمەڵ و رێکخراو کە لە کاتی سەرکەوتنی شۆڕشی تورکە لاوەکانەوە پەیدا بوبون[٥] بە ئاشکرا کاریان دەکرد و چاپەمەنی خۆیان بڵاو دەکردەوە و سەنگیان ، بە تایبەتی لە ناو رۆشنبیرانی کوردا ، تا دەهات قورستر دەبو . بەر لە شەڕ « کورد طلبه هیفی جمیتی » ( کۆمەڵی هیڤی شاگردانی کورد ) لە هەمو رێکخراوێکی تری کورد چالاکتر لە کاردا بو و

---

(٣) هەمان سەرچاوە ، ل ٢٠٠ .

(٤) بڕوانە : صديق الدملوجي ، سەرچاوەی ناوبراو ، ل ٩٥ .

(٥) بەشێکی گرنگ لە زانیارێکانی بەشی دوەمی ئەم وتارە ، بە تایبەتی ئەوانەیان کە پەیوەندییان بە چالاکی رێکخراو و کۆمەلە سیاسی و سەردارەکانیانەوە هەیە لەلایەن نوسەر خۆیەوە کۆکراونەتەوە و لەم بارەیەوە کەڵکێکی زۆری لە مامۆستایان مەمدوح سەلیم و ئەکرەم جەمیل پاشا وەرگرتووە کە خۆیان لە دامەزراندنی زوربەی ئەو کۆمەڵانەدا بەشدار بون .

تەنانەت توانیبوشی چەند لقێك لە هەندێ شاری ئەوروپا دابمەزرێنێ.
ئەم كۆمەڵە ئۆرگانێكی تایبەتی خۆی بە ناوی ( رۆژا كورد ) ەوە
بڵاو دەكردەوە كە دوایی ناوی گۆڕا بە ( هەتاڤا كورد ) و ئینجا
بە ( ژین ) . ( هیڤی كورد ) تا دەست پێ كردنی شەڕی یەكەمی
جیهان لە كار نەكەوت ، بەڵام دوای ئەوەی بە بۆنەی ئەو شەڕەوە
زوربەی كادرەكانی راپێچ كرانە ناو سوپاوە ئیتر وەك هەمو كۆمەڵ و
رێكخراوانی تری ئەو سەردەمەی كوردستان توانای كار كردنی نەما.
كۆمەڵێكی تری كاریگەری سیاسی ئەو سەردەمەی كوردستانی
توركیا «كورد تعالی و ترقی جمعیتی» ( كۆمەڵی بەرزی و
پێشكەوتنی كورد ) بو كە یەكەم رێكخراوی سیاسی كوردستان بو
وە ژمارەیەك گەورە پیاوی ناوداری وەك ئەمین عالی بەدرخان و
شەریف پاشا و شێخ عەبدولقادری شەمزینی تێدا كۆبوبۆوە[٦] ،
بەڵام سیاسەتی شۆڤینی توركە لاوەكان كارێكی وای كرد چالاكی
ئەم كۆمەڵە بەر لە دەست پێ كردنی شەڕ لە سنورێكی تەسكی
نهێنی تێپەڕ نەكا .

هەرچەندە لەبەر چەند هۆیەكی تایبەتی نیشتمانپەروەرانی كوردستانی
توركیا لەو سەردەمەدا لە هەمو لا زیاتر لە جم و جۆڵدا بون ،
بەڵام لە هەمان كاتدا هەست بە وریابونەوە و راپەڕینی كوردستانی ئێرانیش
دەكرا . بەر لە شەڕ و لە ساڵەكانی شەڕدا لەو بەشەی كوردستاندا

---

(٦) بڕوانە : الدكتور بلەج شیركوە ، القضیە الكردیە . ماضی الكرد وحاضرهم ، القاهرە ١٩٣٠ ، ص٥١ .

کۆمەڵی « ئیستخلاصی کوردستان » بە گەری کەوتبووە خۆ و دروشمی یەککگرتنی کورد و سەربەخۆیی کوردستانی بەرز کردبۆوە . هەر لەو دەور و بەرەشدا ( ساڵی ١٩١٢ ) کۆمەڵی «جیهاندانی»(٧) لە کوردستانی ئێران دامەزرێنرا ؛ ئەم کۆمەڵە دەیویست خەباتی گەلی کورد بە رێبازێکی راستدا بەرێ و لە چوارچێوەیەکی یەککگرتودا کۆی بکاتەوە(٨) .

یەکێك لە رووە هەرە گرنگە نوێکانی خەباتی رۆشنیری کۆمەڵ و رێکخراو و پیاوە سیاسییە ناودارەکانی ئەو سەردەمەی کوردستان بریتی بو لە بایەخدان بە بڵاوکردنەوەی خوێندن و خوێندەواری لە ناو منداڵ و لاوی تازە پێگەیشتوی کوردا لەگەڵ خزمەت کردنی زمان و ئەدەبی گەلی کورد وەك دوو هۆی کاریگەری

(٧) لەوە ئەچێ دامەزرێنەرانی ئەوکۆمەڵە خۆیان ئەو ناوەیان بۆ دارشتبێ کە وا دیارە مەبەستیان مەعریفەت و شارەزاییە .

(٨) بڕوانە :

И.О.Фаризов, Место национально-освободительного движения курдов в борьбе народов Ближнего и Среднего Востока против империализма, Канд.дисс. (реферат), Москва, 1953, стр.19.

ئی . و . فاریزۆف ، شوێنی بزوتنەوەی ئازادی ـ نەتەوەیی کورد لە خەباتی گەلانی رۆژهەلاتی نزیك و ناوەڕاستدا دژی ئیمپریالیزم ، ( کورتەی نامەی دوکتۆرێکەی ) ، مۆسکۆ ١٩٥٣ ، ل ١٩ .

پاراستن و پەرە پێدانی نەریت و هەستی نەتەوەیی لە ناو کۆمەلانی خەڵکدا . مامۆستا خەلیل خەیالی یەکێك بوو لەوانەی لە کار و خەباتی رۆژانەیاندا جێگەیەکی بەرز و شایانیان بۆ ئەم باسە دانابوو . ئەم نیشتمانپەروەرە دڵسۆزە بە گەرمی هانی رۆشنبیرانی کوردی دەدا بە چاوێکی دووربینەوە بڕواننە ئەم ئەرکە گرنگەی سەر شانیان و هەمیشە و لە هەموو شوێنێك باسی ئەوەی کردوە کە نەخوێندەواری یەکێکە لە دەردە گەورەکانی کۆمەڵگای کورد . بە هاندانی مامۆستا خەیالی ژمارەیەك لە رۆشنبیرانی شاگرد و هاوەڵی، « کورد تعمیم معارف جمیتی » ( کۆمەڵی بڵاوکردنەوەی خوێندەواری کورد )یان دامەزراند کە بەر لە شەڕ فێرگەیەکی تایبەتی لە ئەستەنبوڵ بۆ منداڵانی کورد کردەوە[9] .

هەر لەو سەردەمەدا عەبدوڕڕەزاق بەدرخانی بەناوبانگ جێگەی مامۆستا خەیالی لە ناو کوردی ئێراندا گرتبوو و بە گەرمی لە هەوڵ و کۆششدا بوو بۆ بڵاوکردنەوەی خوێندن و خوێندەواری لە ناویاندا و یەکێك لە باسە گرنگەکانی دیوەخانی ئاوەدانی بریتی بوو لە باسی نرخی خوێندن و هاندانی خەڵکی بۆ ئەوەی بایەخی پێ بدەن . چالاکی عەبدوڕڕەزاق بەدرخان لەم مەیدانەدا بەوەوە نەوەستا ، لە سەرەتای ساڵی ١٩١٣دا لە شاری

---

(٩) لەم فێرگەیەدا خوێندن بە زمانی کوردی بوو و شاگردەکانی بە لیباسی کوردایەتی گۆش دەکران ، بەلام بە داخەوە زۆری نەخایاند بە ناچاری دەرگای ئەم فێرگەیە داخرا .

(خۆی) کۆمەڵێکی رۆشنبیری دامەزراند و نیازی بوو چاپخانەیەکیشی بۆ دابنێ و رۆژنامەیەکی بەناوەوە دەربکا و لە ژێر سەرپەرشتی ئەودا چەند قوتابخانەیەکیش بکاتەوە . هەنگاوی هەرە گەورە و پڕ مانای ئەم کۆمەڵە بریتی بوو لە کردنەوەی یەکەم فێرگە (قوتابخانە)ی کوردی لە شاری (خۆی) بە پارەی کۆکراوەی دانیشتوانی ناوچەکە خۆیان[10] .

لە هەمان کاتدا هەندێك بەڵگەی بە نرخ هەن کە نیشانەی بایەخ پێدانی پیاوە سیاسییە رۆشنبیرەکانی کوردستانن بە زمان و ئەدەبی کورد بەر لە دەست پێکردنی شەڕ بە ماوەیەك[11] ، ئەمەش ، وەك ئاشکرایە ، هەنگاوێکی گەورە و گرنگە بە نیسبەت

(١٠) ئەم فێرگەیە لە رۆژی ٤ی تەشرینی دووەمی ساڵی ١٩١٣دا کرایەوە و بەم بۆنەیەوە لە شاری (خۆی) ئاهەنگێکی گەورە سازکرا . ژمارەی یەکەم دەستەی شاگردانی ئەم فێرگەیە ٢٩ کەس بوو کە بە زمانی کوردی دەرسیان دەخوێند و بە ئەلف و بێی رووسی دەیاننووسی و زمان و ئەدەبی رووسیشیان دەخوێند ؛ لەناو فێرگەکەدا نەخۆشخانەیەکی بچووکیش هەبوو (بڕوانە : م . س . لازرێف ، سەرچاوەی ناوبراو ، ل ٢٢٧ – ٢٢٨) .

(١١) « کوردستان »ی یەکەم رۆژنامەی کوردی لەسەر لاپەڕەکانی بایەخێکی باشی دەدا بە ئەدەبی کورد و بە شێوەیەکی تایبەتی هەوڵی دەدا لە رێگەی شیعرەکانی (خانی)یەوە هەستی خوێندەوارانی کورد بجووڵێنێ و داوای لێ دەکردن بە وردی گوێ لە ئامۆژگارییەکانی بگرن (بڕوانە : « کردستان » ، عدد ٦ ، ٢٥ جادي الاول ١٣١٦) .

ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی هەمتو گەلێکەوە . رێکخراو و پیاوە سیاسێکانی کوردستانی تورکیا وە بە رادەی یەکەم مامۆستا خەلیل خەیالی تەنانەت کەوتبونە بیرکردنەوە لە دانانی رێبازێکی تایبەتی بۆ نزیکخستنەوە و یەکخستنی کرمانجی و سۆرانی . لە کوردستانی ئێرانیش عەبدورزەزاق بەدرخان لە مانگی شوباتی ساڵی ۱۹۱۳دا لە رێگەی وەکیلی کۆنسولی رۆسەوە لە (خۆی) داوای لە رۆسیا کرد رۆژهەڵات و کوردناسی بەناوبانگ ئۆربێلی[12] بنێرێت بۆ کوردستان بۆ دانانی رێزمان و فەرهەنگ بە زمانی کوردی و وەرگێڕانی بەرهەمی ئەدەبی رۆسی بۆ سەر زمانی کوردی و هەروەها داواشی کرد بەشێکی کوردی لە دەزگای رۆژهەڵاتناسی پیترۆگراد دابمەزرێنن کە بە بیری ئەو دەبێ یەکەم فەرمانی بریتی بێ لە دانانی (ئەلف و بێ)یەکی تایبەتی کوردی بە یارمەتی (ئەلف و بێ)ی رۆسی .

شایانی باسە لە ساڵەکانی پێش شەڕدا لە کوردستانی باشور (کوردستانی عیراق) هەست بەو جم و جۆڵ و چالاکییەی کوردستانی ئێران و بە تایبەتی کوردستانی تورکیا نەدەکرا ، بەڵام دامەزراندنی کۆمەڵ و رێکخراوەکانی کوردستانی تورکیا و

---

(۱۲) رۆژهەڵاتناسی بەناوبانگی رۆسیا و یەکێتی سۆڤێت یوسف ئەبگاروڤیچ ئۆربێلی (۱۸۸۷ - ۱۹٦۱) یەکێکە لەو زانا پایە بڵندانەی لە قوڵاییی دڵەوە کوردیان خۆش ویستوە و دڵسۆزانە بایەخیان بە کوردناسی داوە . لە سەر پێشنیاری ئۆربێلی بەشی کوردی لە ئامۆزگای رۆژهەڵاتناسی لقی لینینگراددا دامەزرێنرا .

چاپەمەنیەکانیان لە هەنـدێك ناوچەی ئەم بەشەی کوردسـتاندا دەنگیان دابڵاوە و هەر وەك لە سەرەوە باسمان کرد ژمارەی ئەو بەخشـە سیاسییە نهێنیانەی لە کوردستانی تورکیا چـاپ دەکران دەگەیشتە چەند ناوچەیەکی بادینان . بەر لە شەڕیش بە ماوەیەکی زۆر کەم (جـەمالەددین بابان) دەستی کرد بە بڵاو کردنەوەی گۆڤارێـکی کوردیی - تورکیی بە نـاوی (بانـگ کرد)[بانگی کورد]ەوە کە لە بەغدا لە چاپخانەی « اداب » چاپی دەکرد و لەوێوە بڵاوی دەکردەوە[١٣] .

ئەوەی لێرەدا پێویستە بە شێوەیەکی تایبـەتی سـەرنجی بۆ رابکێشین ئەوەتە کە وا هەستی نەتەوەیی لە زۆر شـوێنی ناوەڕۆکی ئـەم گۆڤارەدا خـۆی نوانـدووە . « بانـگ کرد » لە یەکێك لە وتارەکانیدا بە درێژی باسی نرخی خوێنـدن و کاری لە ژیانی گەلاندا کردوە و نموونەی لە سەر ژاپۆن و بەریتانیـا هێناوەتەوە و دەڵێ :

« مثلا[١٤] ژاپونیا ! ام قومە بوچوکە چی بو ! بخدا هیـچ نەبو . فقط بسایەی سعی و تقدیر قیمت وقتەکەیان دولتیکی عظیمی

(١٣) ژمارە یەکی ئەم گۆڤارە رۆژی ١٢ ای « ربیع الاول »ی سـالی ١٣٣٢ ك ، واتە ٨ی شوباتی سـالی ١٩١٤ چاپ کراوە ، لە ژمارە یەکێوە تا ژمارە سێی بە سـەر یەکەوە ٧٢ لاپەڕەن ، واتە هـەر ژمارەیەی ٢٤ لاپەڕە بووە .

(١٤) بۆ دەستکاری کردنی جۆری رێنووسەکەی بڵاوی دەکەینەوە .

وەکو روسیەی شکان و تارومار کرد .

مثلا انکلترە . امانش وکو ایمە انسان فقط بوچی او نوعە اختراع و ایجادە کە بسایەی عقل و فکریان دیهننە وجود انسانان شیت دەکا و همو کسی مجبور تعظیم و تقدیر شخصیان دەکن »[15] .

لە هەمان کاتدا « بانک کرد » داوای دامەزراندنی کۆمەڵ و کردنەوەی قوتابخانەی دەکرد و لەم بارەیەوە لە یەکێک لە ژمارەکانیدا ئۆسیوێتی دەڵێ :

« ... لبر امەیە اوندە هاوار و داد و بیدادمانە دەلین لە بغدادا جمعیتی کشاد بکین کە بە تشویق و کوشش ام جمعیتە لە همو جیکەیە مکتبی کشاد بکری و قوم کردانی لم جهالتە تخلیص بکا . دەبزانین کی لە کردان سرهلکری نائل ام شرف عظیمە دەبی . فقط حیف کە ام خدمتە بە کسی بە دو کس نا کری اکر وا بوبوبایە لە بغدادا زور کسانی هیە کە دیدەدوز انتظار ام خدمتەیە »[16] .

وا لێرەشدا بۆ نموونە چەند بەیتێک لە یەکێک لەو شیعرانە دەهێنینەوە کە لە « بانک کرد » دا بڵاو دەکرانەوە و ئەمیش بۆ خۆی بەڵگەی پەرەسەندنی هەستی نەتەوەیی و بایەخ پێدانی رۆشنبیرانی کوردە بە گۆڤارەکە :

---

(۱۵) « بانك كرد » ، ژمار ۳ ، ۱۳۳۲ ، ل ٦۸ .

(۱٦) هەمان ژمارە ، ل ٦۹ .

« بو ترقی ملك و ملت اتحادمان واجبه

صرف غیرت چاکه باغیبی نه‌که‌ین ئه‌م فرصته »[17]

« محفظه‌ی دین و شریعتمانه خو خاك وطن

آوه‌دانی او بزوری علم و فن و صنعته

ایش اگر وابی وطن نورانیو معمور ابی

رستکاریمان ابی ایمش لدست ام ظلمته

دشمنی ، علم و معارف خانه‌مان ویران اکا

زور خراب و مهلکه درمانیکین ام علته »

* * * * * *

« بانك كرد جداً حكيم خسته‌كی ام قومه‌یه

با له خواب غفلت و وحشت خبرمان بیتوه

پایدار بی تا قیامت بو شفای ام امته

حال و اوضاع زمانه طعنه درس عبرته »

« بانگ کرد » له هه‌مان کاتدا به تورکی وتاری له باره‌ی میژووی گه‌لی کورده‌وه بلاو ئه‌کرده‌وه[18] و له سنوری توانا و

---

(۱۷) ئه‌م به‌یتانه هی قه‌سیده‌یه‌کن که به ناوی ( صائب زاده سلیمانیه‌لی محمد عارف )ه‌وه له ژماره سێی « بانك كرد »دا بلاوکراوه‌ته‌وه ( ل ٦٩ ـ ٧٠ ) .

(۱۸) ( شکری الفضلی ) وتارێکی درێژی به تورکی به ناوی « میژوی کورد له سه‌رده‌می ئیسلامدا » له چه‌ند ژماره‌یه‌کی « بانگ کرد »دا بلاوکردوته‌وه .

تێگەیشتنی ئەو سەردەمەدا بایەخیشی بە ژیانی ئابووری و کۆمەڵایەتی گەلی کورد دەدا[19] . هەموو ئەمانەش بەڵگەی گومان لێ نەکراوی ئەوەن کە وا هەستی نەتەوەیی لە ناو گەلی کوردی عیراقیشدا بەر لە شەڕی یەکەمی جیهان لەکەف و کوڵ و ئاڵ و گۆڕدا بوو کە بەڵگەیەکی تریشی لە کارەکانی ئەو سەردەمەی شێخ مەحموودا بەدی دەکرێ ، بە تایبەتی ئەوەی کە پەیوەندی لەگەڵ بەدرخانیەکاندا دامەزراند و لە ساڵی ١٩١٣دا هەوڵی رێککەوتنی لەگەڵ کامیل بەگ و حسەین بەگی کوڕانی بەدرخان پاشادا دا بۆ خەبات کردن لە پێناوی رزگار کردنی کوردستاندا لە دەسەڵاتی عوسمانی و دامەزراندنی دەوڵەتێکی فیدرالی کوردی تیایدا ؛ شێخ مەحموود لە هەمان کاتدا چەند نامەیەکی لە بارەی دوارۆژی سیاسی کوردستانەوە ناردوە بۆ کاربەدەستانی روسیا .

ناڕەزایی کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان و خەباتیان لە پێناوی رزگاریدا بەر لە دەست پێ کردنی شەڕ بە ماوەیەکی زۆر کەم دووبارە گەیشتەوە رادەی تەقینەوە کە لە شێوەی راپەڕینی چەکداردا چەند ناوچەیەکی گرتەوە . گەورەترینی ئەو راپەڕینانە لە بەهاری ساڵی ١٩١٤دا لە ناوچەی تبلیس بە سەرکردایەتی مەلا سەلیم[20] و چەند

---

(١٩) وتارێك لە ژمارە سێی ئەم گۆڤارەدا ( ل ٦٤ ـ ٦٦ ) بە ناوی «کردلردە زراعت» ەوە بلاوکراوەتەوە .

(٢٠) بە مەلا سەلیم ئەفەندی خێزانی مەشهوورە .

سەردارێکی نیشتمانپەروەری تر ڕوویدا کە داوای پەیڕەوی کردنی شەریعەت و دوورخستنەوەی کاربەدەستانی تورکیان دەکرد چونکە ، وەك لە یەکێك لە ڕاپۆرتە دیپلۆماسییە نهێنییەکانی ئەو سەردەمەدا نوسراوە ، بە لای ئەو سەردارانەوە دەزگای کارگێڕی تورك « کورد دەڕووتێنێتەوە و وڵات بە بێگانە دەفرۆشێ »[21] .

ئاگری ئەم ڕاپەڕینە زوو تەشەنەی کرد و ژمارەیەکی زۆر لە چەکدارانی هۆزە کوردەکانی ئەو مەڵبەندە دایانە پاڵی بە ڕادەیەك ڕۆژی ٩ی مارت ژمارەی بەشدارانی گەیشتە دەوروبەری چوار هەزار کەس و دوای یەك ڕۆژ ، واتە لە ١٠ی مارتدا ژمارەیان خۆی لە ٨ هەزار کەس زیاتر دا . بەمە ڕاپەڕینی نوێی کوردستان هێندەی تر دەنگی دایەوە و تەنانەت سەربازە کوردەکانی لەشکری عوسمانی ئەو ناوچەیەش بە خۆیان و چەکیانەوە دایانە پاڵی . سەردارانی ڕاپەڕینی بتلیس نیازیان وابوو بەرە بەرە ئاگری شۆڕش لە ناوچەکانی تری کوردستاندا بەرپا بکەن و بۆ ئەم مەبەستە بەر لە هەموو شتێك ویستیان جێ پێی خۆیان لە ناوچەی بتلیسدا بە تەواوی قایم بکەن و تەنانەت داوای پشتگیری و یارمەتییان لە ئەرمەن و ئاسووری ئەو دەوروبەرەش کرد[22] .

---

(٢١) بڕوانە : م . س . لازەریێف ، سەرچاوەی ناوبراو ، ل ٢١٥ .

(٢٢) A. Safrastian, Kurds and Kurdistan, London, 1948, P. 73 هەوڵدانی سەردارانی ڕاپەڕینی بتلیس بۆ نزیك کەوتنەوە لە ئەرمەن و ئاسووری کاربەدەستانی ئەستەنبوڵی بێ تاقەت کرد چونکە =

ئەم ڕووداوانە و کورج و کۆڵی سەردارانی ڕاپەڕینەکە و دەنگدانەوەی لە ناو کوردی شوێنەکانی تردا مەترسییان خستە دڵی کاربەدەستانی تورکیاوە کە لە ترسی عاقیبەتی ویستیان بە زوترین کات و بە هەر نرخێك بێ ڕادەیەکی بۆ دابنێن و لە ڕاستیشدا باری ئەو سەردەمەی تورکیا و نزیك بوونەوەی شەڕ و بێزاری کەلە ناتورکەکان و چەند هۆیەکی تر کارێکی وەهایان کردبوو هەموو ڕاپەڕین و بزوتنەوەیەك فەرمانڕەوایانی تورکیا بە جارێك بتۆقێنێ بۆیەکا بە گەڕی کەوتنە خۆ بۆ دامرکاندنەوەی ڕاپەڕینەکەی بتلیس و بۆ ئەو مەبەستە والییەکی بە توانا و هێزێکی زۆریان ناردە ئەو ناوچەیە. لەم کاتەدا شۆڕشگێڕانی کوردیش کەوتنە هەڵەیەکی گەورەوە بەوەی شوێنە ستراتیژیەکانی خۆیانیان بەجێ هێشت و ئابلوقەی شاری بتلیسیان دا و ڕۆژی ٣ی نیسان توانییان بیگرن، بەڵام لە ڕاستیدا ئەمە بووە هۆیەکی یاریدەری گەورە بۆ لەشکری عوسمانی کە توانی بە باشی کەڵکی لێ وەربگرێ و لە ناو شاردا لە شۆڕشگێڕانی کورد بدا و سەریان لێ بشێوێنێ و بەو جۆرە ڕاپەڕینەکەیان دامرکێنێتەوە[٢٣]. مەلا سەلیم ئەفەندی و چەند سەردارێکی تری کورد ناچار بوون پەنا بەرنە بەر کۆنسوڵخانەی ڕووس لە شاری بتلیس.

---

= ئەوان بە پێچەوانەوە لە هەموو شوێنێك بە گەرمی هەوڵیان ئەدا کورد دژی ئەو کەمینانە، وە بە تایبەتی ئەرمەن، بجوڵێنن.

(٢٣) هاتنە ناو شاری بتلیسەوە بە جارێك ئەرکی هێزەکانی تورکی ئاسان کرد، هەر ئەو ڕۆژە توانییان بە زیانێکی کەم (٤ کوژراو) سەر لە شۆڕشگێڕانی کورد بشێوێنن و ٦٠ کەسیان لێ بکوژن.

دوای ئەوە بە نیازی تۆقاندنی کورد و ئەرمەن و ئاسـوری کاربەدەستانی عوسمانی بە رەقی کەوتنە گیانی خەڵکی ناوچەی بتلیس و زیندانەکانیان لێ ئاخنین و هـەر رۆژە تا رۆژێکیش کۆمەڵێکیان لێ هەڵدەواسین[٢٤] .

بەر لە شەڕ لە ناوچەی بارزان و دەوروبەریشی وەزع تێکچوبو و خەڵکی لەسەر پێی بون بۆ چەك هەڵگرتن دژی دەسەڵاتی تورکە عوسمانیێکان و بۆ ئەم مەبەستە هەمو لە دەوری شێخ عەبدولسەلامی بارزانی کۆبوبونەوە و ئەمیش کەوتبووە هاندانی سـەرەك هۆزە کوردەکان بۆ ئەوەی یەك بگرن و زەغت بخەنە سەر ئەستەنبول تا ناچاری بکەن دەست لە سیاسەتی خستنە پشت گوێی کوردستان هەڵبگرێ . بێ گومان فەرمانڕەوایانی تورکیا نە ئامادە بون گوێ لە داخوازی وەها بگرن و نە لە باریشیاندا بو جێ بەجێی بکەن بۆیەکا لە بەهاری سـاڵی ١٩١٤دا زوربەی ناوچەی بادینانیشان لێ یاخی بو بە تایبەتی دوای ئەوەی لەم کاتەدا میری باج و سـەرانەی لەسەر جوتیاران زیاد کرد . شـێخ عەبدولسەلام هەوڵی دا ئاگری راپەڕین لە هەمو کوردسـتاندا خۆش بکا و هەندێك لـە دەوڵەتە گەورەکان ( بە تایبەتی روسـیا و بەریتانیا ) بجولێنێ بۆ ئەوەی پشتگیری داخوازێـکانی کورد بکەن و کاربەدەسـتانی عوسمانی ناچار بکەن بە دەنگیانەوە بچن .

---

(٢٤) تەنهـا رۆژی حەوتی مایـسی سـاڵی ١٩١٤ لە بتلیس یازدە کەس لە سەردارانی راپەڕینەکە کران بە سێدارەدا ( بڕوانە : م.س. لازەرێف ، سەرچاوەی ناوبراو ، ل ٢١٦ ) .

ئەم راپەڕینەش مەترسییەکی زۆری خستە دڵی کاربەدەستانی تورکیاوە چونکە دەیانزانی شێخ عەبدولسەلام دەتوانێ ژمارەیەکی زۆر لە هۆزە ناودارەکانی عیراق و ئێران لە دەوری خۆی کۆبکاتەوە و بە شەڕی چەتەگەریی لە ناوچە سەختەکانی بادینانداا لەشکری تورک هیلاك بکا و هەروەها لەوەش دەترسان کە ئەم راپەڕینە کارێکی وەها بکا جڵەوی کاریان لە ویلایەتی موسڵ و بەغداشدا لە دەست دەربچێ چونکە دەیانزانی هۆزە چەکدارەکانی ئەو ناوانەش لەسەر پێن بۆ راپەڕین . لەبەر ئەم هۆیانە عوسمانییەکان زۆر بە خێرایی هێزێکی گەورەیان لە رەواندز و عەقرە و ئامێدی کۆکردەوە و بەو جۆرە تا سەرەتای حوزەیرانی ساڵی ١٩١٤ توانییان بەشی زۆری ئەم راپەڕینەش دابمرکێننەوە[٢٥] ؛ شێخ عەبدولسەلام و هەندێك لە هاوەڵەکانی ناچار بوون بپەڕێنەوە کوردستانی ئێران و لە ناوچەی ورمێ بۆ ماوەیەك جێگیر بوون .

ئەم هەموو راپەڕین و بزوتنەوانەی دایشتوانی کوردستان کە بریتی بوون لە رۆیەکی تری ناڕەزایی گەلانی ئیمپراتۆریی عوسمانی نەبوونە دەرس بۆ کاربەدەستانی ئەو وڵاتە بەڵکو بە پێچەوانەوە

---

(٢٥) یەکێك لەو هۆیانەی ئەرکی عوسمانییەکانی لە دامرکاندنەوەی راپەڕینەکانی ئەو سەردەمەی کوردستاندا ئاسان کرد نەبوونی یەکێتی و پەیوەندیی بوو لە نێوانیاندا ، بە وێنە هیچ هەنگاوێك لە لایەن سەردارانی بزوتنەوەی ئازادیی کوردەوە نەنرا بۆ یەکخستنی راپەڕینەکانی بتلیس و بارزان کە هەردووکیان لە یەك کاتدا بەرپا بوون .

ئا دەهات زیاتر لەسەر سیاسەتی چەوسانەوەی نەتەوەیی خۆیان سوور دەبوون و لەو ڕێگەیەوە دەیانویست بزوتنەوەی ئازادیی ـ نەتەوەیی گەلی کورد زیندە بە چاڵ بکەن و بۆ ئەم مەبەستەشیان هەر ڕۆژە بەنــد و باوێــکی نوێیان دەهێنایــە کایەوە . « بەرزترین » پلەی ئەم ڕێبازە ناهەموارەیان ئەوەبوو کە بەر لە دەست پێ کردنی شەڕی یەکەم بە ماوەیەکی کەم پلانێــکی نوێیان بۆ لێدانی کورد دانا کە بریتی بوو لە بڕیاری گواســـتنەوەی زوربەیانــ بۆ ناوچــەکانی ڕۆژئاوای ئەنادۆل و دابەش کردنیان بەسەر تورکی ئەو مەڵبەندانەدا بە نیازی تواندنەوەیان ، بەڵام دەســـت پێ کردنی شەڕ بووە کۆسپ لەبەر دەمی جێ بەجێ کردنیدا[٢٦] .

بەم جــۆرە ناڕەزایی و بێزاریی بێ ســـنوری دانیشتوانی کوردستان و پەرەسەندنی هەستی نەتەوەیی لە ناویاندا چوارچێوەی باری گشتی کوردستانی پێش شەڕیان پێك دەهێنا و هیچ دوور نییە ئەگەر ئاگری شەڕی یەکەمی جیهان هەڵنەگیرسایە کوردستان ببوایە بە بەڵقانێـکی نوێی[٢٧] بۆ ئیمپراتۆریی عوسمانی ، بەڵام ئەو شەڕە و ئەنجامەکانی کارێــکی یەکجار گەورە و دیاریان کردە سەر ژیانی کورد و دوا ڕۆژی نیشتمانەکەیان کە ببوە یەکێك لە مەیدانە گرنــگەکانی شەڕ

---

(٢٦) « Memorandum sur la situation des Kurdes et leurs revendications » , Paris, 1948 , P . 1 1 .

(٢٧) ولاتەکانی ناوچەی بەڵقان بەشێك بوون لە ئیمپراتۆریی عوسمانی ، بەڵام پەرەسەندنی هەستی نەتەوەیی لە ناو گەلانی ئەم ناوچەیەدا و سیاسەتی=

لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا و لە ڕاستیشدا کاربەدەستانی تورکیا بە ناوی ئایینەوە توانییان بەشێکی زۆر لە هێز و توانای گەلی کورد بکەنە یەکێك لە چەکەکانی دەستیان لە مەیدانی شەڕدا ؛ نیکیتین لەم بارەیەوە توسیوێتی دەڵێ :

« بانگەوازێ ـ غەزا ـ کە دیسان بە پەردەی ئیسلامەتی داپۆشرابێ ، توانی هێزی جەنگێ گەلی کورد بە ڕێگەیەکی ئەوتۆدا بەرێ کە بە هیچ جۆرێك لەگەڵ بەرژەوەندە نیشتمانێکانی ئەو گەلەدا نەدەگونجا »[٢٨] . دیارە کارەساتە سامناکەکانی جەنگ

= نەتەوەپەرستی و زۆرداری عوسمانێکان بەرامبەریان بوونە هۆی تەقینەوەی زنجیرەیەك ڕاپەڕین و شۆڕش لە ناویاندا و لە ئەنجامی ئەوەدا لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەوە یەك لە دوای یەك ئەو گەلانە توانییان خۆیان لە دەسەلاتی عوسمانی ڕزگار بکەن . جا باری کوردستانیش بەر لە شەڕ تا رادەیەکی زۆر لە باری زیانی ولاتانی ناوچەی بەلقانی ئەو سەردەمەی دەکرد . شایانی باسە کاربەدەستانی تورکیا خۆیشیان هەستیان بەمە کردبێ و ترسی ئەوەیان لێ نیشتبێ کوردستانیان لەکیس بچێ بۆیەکا چەند جارێك لەم باسە کۆڵینەوە و تەنانەت کۆمیتەی « ئیتیحاد و تەرەقی » ڕۆژی چواری نیسانی ساڵی ١٩١٣ کۆبوونەوەیەکی تایبەتی تەنها بۆ لێکۆڵینەوەی سیاسەتی بەرامبەر بە کورد بەست . بەلام ئەم جۆرە کارانەی فەرمانڕەوایانی تورکیا لە ڕاستیدا بێ ئەنجام بوون چونکە چ ئەوان و چ کاربەدەستانی ئەو سەردەمەی ئێران دەیانویست یا لە ڕێگەی چەکەوە یا لە ڕێگەی چەند ئاڵوگۆڕێکی کرچ و کاڵی سەرپێییەوە « چارەسەری » کێشەی کورد بکەن .

(٢٨) B . Nikitine, Les Kurdes. Etude sociologique et historique , Paris , 1956 , P . 195 .

ئەوەندەی تر ئەنجامی ئەم کارەی خراپ کرد چونکە ، هەروەك بە درێژی لە شوێنی خۆیدا باسی دەکەین ، کوردستان کەوتە ناوجەرگەی کڵپەی ئاگری مەیدانەکانی شەڕی یەکەمی جیهانەوە لە ڕۆژهەڵاتدا .

* * * * * *

# بەشی سێیەم

# کوردستان

# لە کڵپەی ئاگری شەڕدا

لەگەڵ ئەو هەموو ناڕەزاییەی گەلی کورددا کە چەند ڕوویەکیان لە بەشی دووەمی ئەم باسەدا خستە بەر چاو ، کاربەدەستانی عوسمانی توانییان تا رادەیەکی زۆر تێکەڵی ئاگری شەڕی بکەن[1] و بۆ ئەم مەبەستە پەنایان بردە بەر هەموو ڕێگەو فڕوفێڵێك و لە هەموو شتێکیش زیاتر هەستی ئایینی خەڵکی ساویلکەی کوردستانیان دەجوولاند جگە لەوەی بە ڕاست و بە چەپیشدا پەیمان و گفتی دامەزراندنی ڕژێمی ئۆتۆنۆمییان لە کوردستاندا بڵاو دەکردەوە هەرچەندە جێ بەجێ کردنی ئەوەیان بە تەواو بتوونی شەرەوە دەبەست . لە راستیشدا گەلی کورد لەبەر ئەوەی نیشتمانەکەی بوو مەیدانی

---

(۱) بە تایبەتی لە سەرەتادا .

شەڕی سێ سوپا ـ تورك و ڕوَس و ئینگلیز ـ نەیدەتوانی بە جارێك دوَرەوپەرێز بوەستێ چونكە ئاگری شـەڕ لە زوَر لاوە و بە زوَر ڕەنـگ دەیگرتەوە بە تایبەتی دوای ئەوەی تورکیا لە کوَتایی پایزی سـالّی ١٩١٤وە دایە پالّ ئەلّەمانیا و بە و جوَرە بە ئاشکرا دژی بەرەی ولاّتە سوێندخوَرەکان تێکەلّی شـــەڕ بوَ[٢] . هـەر لەو ڕوَژەشـەوە دوژمنانی تورك ، بە تایبەتی ڕوَسەکان کەوتنە هاندانی کورد دژی دوژمنەکانیان و بوَ ئەم مەبەستەیان لە نزیکەوە پەیوەندییان لەگەلّ چەند سەردارێـکی دەسەلاّتداری کوردسـتاندا دامەزرانـد و

---

(٢) کە شەڕی یەکەمی جیهان دەستی پێ کرد ( یەکی ئابی سـالّی ١٩١٤ ) تورکیا یەکسـەر تێـکەلّی نەبوَ هەرچەندە لە هەموَ ڕوَیەکەوە و بە دلّ لەگەلّ ئەلّەمانیادا بوَ و تەنانەت تەنها یەك ڕوَژ بەسەر دەست پێ کردنی شەڕدا نێیەڕیبوَ کە پەیمانێـکی نهێنیی لە ئەستەنبوَل لە بارەی هاریکاریی جەنـگییەوە لەگەلّ ئەلّەمانەکاندا موَر کرد ، لەگەلّ ئەوەشـدا لە هەمان ڕوَژدا بە سەرزاری بوَ لایەنی خوَی بە نیسبەت شەڕەوە بلاّو کردەوە و ولاّتە سوێندخوَرەکانیش بەرامبەر بەوە ڕوَژی ٢٨ی ئابی هەمان سالّ رایان گەیاند کە وا ئەوانیش توخنی خاکی دەولّەتی عوسمـانی ناکەون بە مەرجێك بێ لایەن بمێنێتەوە . بەلاّم ڕوَژ بە ڕوَژ هاریکاریی نێوان ئەلّەمانیا و تورکیا ئاشکراتر دەبوَ تا کار گەیشت بەوەی ڕوَژی ٢٩ ی تەشرینی یەکەمی سالّی ١٩١٤ پاپوَڕە جەنـگیکانی هەردوَ لایان بە جوَتە بوَمباباران ڕوَخەکانی بەری ڕوَسـیای دەریای ڕەشـیان کرد و ئەمە بە سەرەتای تێـکەلّ بوَنی تەواو و ئاشـکرای تورکیا لە شەڕی یەکەمدا دەژمێردرێ ؛ ڕوَژی ٣ی تەشرینی دوَهەم ڕوَسیا و دوای دوَ ڕوَژیش بەریتانیا جاڕی شەڕیان دژی دەولّەتی عوسمانی دا .

تەنانەت شێخ عەبدولقادری شەمزینان پەیمانی دانێ بە هەموو توانایەوە بداتە پاڵیان بە مەرجێك ئەوانیش دامەزراندنی رژێمی ئۆتۆنۆمی بۆ کورد مسۆگەر بکەن و هەر بەم بۆنەیەشەوە نامەیەکی تایبەتی بە کوردستاندا بڵاوکردەوە کە تێیدا داوای لە کورد کردبوو بەرەنگاری لەشکری رووس نەبەن[٣] .

بەم جۆرە گەلی کورد بێ ئەوەی لە دەست خۆیدا بێ یا ئارەزووی لێ بێ لە سەرەتاوە تێکەڵێ رووداوەکانی شەڕی یەکەمی جیهان بوو وە خاکی نیشتمانی نەك تەنها بووە یەکێك لە مەیدانە گەورەکانی جەنگ ، بەڵکو وەك لازەرێڤ دەڵێ « لە راستیدا دەنگی یەکەم تەقەی شەڕ لە رۆژهەڵاتی نزیکدا لە کوردستانی ئێران بەرزبۆوە نەك لە دەریای رەشدا »[٤] . لەو کاتەوە بۆ ماوەی نزیکەی چوار ساڵ لەشکری تورك و رووس و ئینگلیز لە گەلێك ناوچەی کوردستاندا بە یەکیانا دا و گەلێك شەڕی قورسیان کرد کە ئەنجامی هەندێکیان بە ئاشکرا کاری دەکردە سەر تەرازووی هێزی

---

(٣) بڕوانە : م. س. لازەرێڤ ، سەرچاوەی ناوبراو ، ل ٣٠٤ .

(٤) هەمان سەرچاوە ، ل ٢٩٩ . وەك لە پەراوێزی ٣٠دا باسمان کرد هێرشی تورك و ئەڵمان بۆ سەر رۆخەکانی بەری رووسیای دەریای رەش بە سەرەتای دەستپێکردنی شەڕی یەکەمی جیهان لە رۆژهەڵاتی نزیکدا دادەنرێ ، بەڵام بەر لەوەش بێنەوبەرە لە نێوان رووسیا و تورکیادا لە کوردستانی ئێران چەند جارێك گەیشتە رادەی تەقینەوە بۆیەکا لازەرێڤ دەڵێ یەکەم تەقەی شەڕ لە مەیدانی رۆژهەڵاتی نزیکدا لە کوردستانی ئێران بەرز بۆوە .

شەڕکەرانی مەیدانەکانی رۆژهەڵات و لە هەمان کاتدا دەبووە هۆی ماڵ ویرانی و سەرگەردانی زۆر ناوچەی کوردستان جگە لەوەی ژمارەیەکی بێ شومار کوڕە کوردی تازە پێگەیشتوش دەبونە قوچی قوربانییان چونکە زوربەی لەشکری نۆهەمی ناوچەی ئەرزرۆم و لەشکری دەهەمی ناوچەی سیواس و لە شکری یازدەهەمی ناوچەی ئەلعەزیز و لەشکری دوازدەهەمی ناوچەی موسڵ کورد بون(٥) سەرەڕای هێزەکانی سوارەی حەمیدیش کە لە زۆر ناوچە تێکەڵی شەڕ دەبون و ئەوانیش زۆر یا کەم قوربانییان دەدا(٦) .

زۆر بەسەر شەڕدا تێنەپەڕی سەربازە کوردەکانی لەشکری عوسمانی بە تاکە و بەکۆمەڵ کەوتنە راکردن و بەجێ هێشتنی ریزەکانی لەشکر . بە وێنە هەمۆی چەند مانگێکی نەخایاند لە ١٨ هەزار سوارەی کوردی لەشکری سێهەم نزیکەی ٢٨٠٠ کەسێکیان لێ

---

(٥) محمد أمين زكي ، خلاصة تأريخ الكرد و كردستان ، القاهرة ، ١٩٣٦ ، ص ٢٧٤ . گومان لە راستی ئەم زانیاریانە ناکرێ بە تایبەتی لەبەر ئەوەی مامۆستا ئەمین زەکی خۆی یەکێك بووە لە ئەفسەرە شارەزاکانی لەشکری عوسمانی .

(٦) وشەی « سەفەر بەرلك » ( لە هەندێك ناوچەدا بۆتە سەفەربەلك ) کە مانای نەفیری گشتی دەگرێتەوە لەو رۆژانەوە تێکەڵی زمانی کوردی بووە و تا ئێستا بە مانای نەهامەت و چۆنی بێ گەڕانەوە بەکاری دەهێنن .

مایەوە[7] . لە ناوچەکانی قەفقاسدا زۆر جار لە گەرمەی شەڕدا سەرباز و سەرداری کورد بە خۆیان و چەکیانەوە دەچوونە پاڵ هێزە شەڕکەرەکانی ڕوس و لە زۆر ناوچەش هەندێك سەرداری دەسەڵاتدار هــەر لە سەرەتاوە ڕازی نەبوون شەڕ بۆ عوسمانییەکان بکەن و ئەمانەش هەمـوو بێگومان بەڵـگەی بێ بڕوایی کورد بوون بە ڕژێمی عوسمانی .

لەشکری عوسمانی لە مەیـــدانی قەفقاس و ئازەربایجان و کوردستاندا هەمـــوو ڕۆژێك تووشی نوشوستییەك و ژێرکەوتنێـك دەهات و لە زۆر ناوچە بە شکاوی یا خۆیان دەدا بە دەسـتەوە یـا دەکشانەوە . لە تەشرینی دووەمی ساڵی ١٩١٤دا هــێزە چەکدارەکانی ڕوس لە ناوچەی ئەرزڕۆم و واندا میقدارێکی باش چوونە پێشەوە و بەرامبەر بـــەوە ســەرکردایەتی لەشکری عوسمانی ویسـتی هێرشێکی گەورە لە ناو قەفقاس خۆیدا (واتە لە ناو سنووری ڕوسـیادا) بکاتە سەر هێزەکانی ڕوس و بەو جۆرە گەمارۆیان بدا و پشتیان بشکێنێ و لە ئەنجامدا ناچاریان بکا ئەو شوێنانەی داگیریان کردوون بەجێیان بهێڵن و بەو جۆرە ناوچەکانی سەر سنووری ڕوسیا بە کوردستانەوە لە مەترســی داگیر کردن ڕزگار بن . کاربەدەستانی تورکیا بایەخێکی

---

(٧) بڕوانە :

Н.Г.Короун, Сарыкамышская операция на Кавказском фронте мировой войны в I9I4-I9I5гг., Москва, I937, стр.30.

ن . گ کارسون ، شەڕی ساریقامیش لە بەرەی قەفقاسی شـەڕی جیهاندا ١٩١٤ ــ ١٩١٥ ، مۆسکۆ ، ١٩٣٧ ، ل ٣٠ .

یەکجار گەورەیان بەم پلانەیان دا و هەمو لەشکری سێیان بۆ تەرخان
کرد کە لە ١٢٧ بەتەلیۆن و ٢٢ تیپی سوارەی میری و چەند تیپێکی
سوارەی لەشکری حەمیدی و ٢٧١ تۆپ پێکهاتبو . لە کۆتایی
مانگی کانونی یەکەی سالّی ١٩١٤دا شەڕێکی قورس لە نێوان
هەردو لادا لە دەوروبەری شاری ساریقامیش روّیدا و تا سەرەتای
مانگی کانونی دوەهەی سالّی ١٩١٥ لەشکری روس توانی بەرامبەر
نزیکەی بیست هەزار کوژراو و بریندارو خۆی هێزەکانی تورك
تەفروتونا بکا و لە ٩٠ هەزار کەس ٧٠ هەزاریان لێ بکوژێ یا بە
دیل بگرێ(٨). ئەم شکانە گەورەیەی تورك(٩) رێگەی پێشکەوتنی
لەشکری روسی بەرەو وان خۆش کرد و لە هاوینی سالّی ١٩١٥وە
هێزە چەکدارەکانی روس رویان کردە ئەو ناوچەیە . بەم جۆرە
لەشکری روس لە شوباتی سالّی ١٩١٦دا توانی ئەرزروم و دوای
ئەوە بە چەند مانگێك ( لە هاوینی هەمان سالّدا ) موش و بتلیس
داگیر بکا و ئەمە ئەرکی لێدانی لەشکری تورکی لە ئێراندا بۆ
ئاسانتر کرد .

---

(٨) بڕوانە :

Н.Г.Корсун, Первая мировая война на Кавказском фронте, Москва, 1946, стр.36-39.

ن . گ . کارسون ، شەڕی یەکەی جیهان لە بەرەی قەفقاسدا ،
مۆسکۆ ، ١٩٤٦ ، ل ٣٦ – ٣٩ .

(٩) لە راستیدا شەڕی ساریقامیش پشتی لەشکری تورکی وەها شکاند کە
تەنانەت کاری کردە سەر هێزەکانیان چ لە باشوری عیراق و چ لە
ناوچەی کەنالی سوێسیشدا و ئەرکی پێشکەوتنی لەشکری ئینگلیزی لەو
ناوچانەدا ئاسان کرد .

هەرچەندە دەوڵەتی ئێران[10] لە شەڕی یەکەمی جیهاندا بەشدار نەبوو وە بە شێوەیەکی رەسمی رۆژی ٢ی تەشرینی دوەمی ساڵی ١٩١٤ بێ لایەنی خۆی بڵاوکردەوە بەڵام ئاگری ئەم شەڕە زۆر ناوچەی ئێرانیشی گرتەوە و ئازەربایجان و کوردستانی ئێران هەر بوون بە بەشێك لە مەیدانەکانی شەڕ لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا . کاربەدەستانی تورکیا و ئەڵمانیا لە پــلانی ساڵانی شەڕیاندا بایەخێکی تەواویان دابــوو بە کوردستانی ئێران چونکە یەکەمیان دەیویست کەڵك لە هەلی شــەڕ وەربگرێ بۆ ئەوەی بیخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە و دوەمیشیان ـ واتە ئەڵمانیا ـ دەیویست لە رێــگەی ئازەربایجان و کوردســتانەوە جێ پێی خۆی لە هەموو ئێراندا قایم بکا . بــۆ ئەم مەبەستەیان چ پیاو و بە کرێ گیراوی تورك و چ پیاو و بە کرێ گیراوی ئەڵمان هەوڵیان دەدا هەســتی کوردی ئێران بجزوێــنن و لەو رێــگەیەوە توانایان دژی ئینگلیز و بە تایبەتی رووس ئاراســـتە بکەن و ئەمەش بەنیسبەت هەردوو لایانەوە زۆر گرنگ بوو چونــکە هەر بەر لە شــەڕ ئینگلیز و رووس ناوچەکانی باکووری ـ رۆژئاوا و باشووری ـ رۆژئاوای

---

(١٠) زوربەی دەوڵەتە شــەڕکەرەکان ( بەریتــانیا و رووســیا و ئــەڵمانیا و تورکیا ) دەمێ ساڵ بوو چاویان بڕیبوە خاکی ئێران ، لەبــەر ئــەوە جێگەیەکی تایبەتییان لە پلانەکانی شەڕیاندا بۆ تەرخان کردبوو ، تەنانــەت رووسیا و ئینگلتەرە لە مانــگی مارتی ساڵی ١٩١٥دا بەیانێــکی نهێنییان لە بارەی دابەش کردنی ئێرانەوە لە نێوان خۆیاندا مۆر کرد .

ئێرانیان داگیر کردبوو[11] . بەڵام لە هەمان کاتدا ڕوسەکانیش هەوڵیان دەدا هۆزە گەورەکانی کوردستانی ئێران ڕاکێشنە پاڵ خۆیان و هەردوو لاشیان ، چ ڕوس و چ تورك و ئەڵمان ، توانییان لایەنگر لە ناو سەردارانی هەندێك لەو هۆزانەدا بۆ خۆیان پەیدا بکەن .

بەڵام لە کوردستانی ئێرانیشدا کار تەنها بەوەوە نەوەستا ، بەڵکو چەند شەڕێکی قورسیشی تێدا قەوما بەتایبەتی لە ئەنجامی ئەوەدا کە هەر دوای دەست پێ کردنی شەڕ یەکسەر بەشێك لە لەشکری تورك چەند ناوچەیەکی کوردستانی داگیر کرد چونکە لەگەڵ ئەڵمەنەکاندا دەیانویست بەو جۆرە کۆسپ بخەنە بەردەی پەیوەندی نێوان ڕوس و ئینگلیزە هاوپەیمانەکانیانەوە لە خوارووی عیراقدا . تورکەکان بۆ جێ بەجێ کردنی ئەم مەبەستەیان بەر لە هەموو شتێك ویستیان ڕوس لە ناوچەی ورمێ دوور بخەنەوە و ئەو ناوە بکەنە بنکەیەکی جەنگی بەهێز بۆ خۆیان . لە سەرەتای شەڕدا هێزەکانی تورك توانییان بگەنە ورمێ و دەوروبەری و ئەو ڕوسانەی لەو ناوەدان دەریان بکەن و چەند هۆزێکی کوردی وەك شکاکیش ڕابکێشنە لای خۆیان . گرتنی

---

(11) بەریتانیا و ڕوسیا دامرکاندنەوەی شۆڕشی مەشروتە ( 1905 – 1911 )یان بۆ داگیرکردنی هەندێك لە ناوچەکانی باکوور و باشووری ئێران بە هەل زانی و هێزەکانیان تا دەست پێ کردنی شەڕی یەکەم هەر لەو ناوچانەدا بوون و تەنانەت لەشکری ڕوس تا شاری خۆی مابوو .

ورمێ و چەند ناوچەیەکی تر[12] زیاتر ڕێگەی بۆ کار کردنی تورك و ئەڵەمان لە ناوچەکانی تری کوردستانی ئێراندا خـۆش کرد . بە هاندانی پیاوەکانیان ژمارەیەك دەرەبەگی کرمانشا حکومەتێکیان بـە ناوی « حکومەتی میللی »یەوە لەو ناوەدا دامەزراند و نیزامولسەلتەنەی دەرەبەگی ناوداریان کردە سەرۆکی[13] .

کاربەدەســتانی تورك بــە یارمەتی و راوێژی ئەڵەمانــە هاوپەیمانەکانیان بەرە بەرە لە سەرەتای شەڕدا توانییان دەسەڵاتی خۆیان لە زوربەی ناوچەکانی ئازەربایجان و کوردســتانی ئێران و هەندێك مەڵبەندی تری ئەو وڵاتەدا داسەپێنن و لەشــکری تورك بەو جۆرە ناوەکتو ئەولای هەمەدان رۆی . بێ گومان ئەمە بووە کۆسـپێکی گەورە لەبەر دەمی پلان وپیلانی وڵاتە سوێندخۆرەکاندا بە نیسـبەت رۆژهەڵاتی نزیك و ناوەڕاستەوە بۆیەکا رووسیا لە باکور و بەریتانیا لە باشوری ئێرانەوە بە خێرایی کەوتنــە خۆ و تەنگیان بە لەشکر و دەســەڵاتی تورك لە ئێراندا هەڵچنی ؛ رووســەکان لە ماوەی چەند مانگێکی کەمدا توانییان هەمو ناوچە داگیرکراوەکانی ئازەربایجان و

(١٢) لە هەمان کاتدا هێزە چەکدارەکانی تورك توانییــان تەورێز و چەند ناوچەیەکی تــری ئازەربایجانیش بگــرن و ئەمــەش زیاتــر رێگەی داگیرکردنی کوردستانی ئێرانی بۆ خۆش کردن .

(١٣) بڕوانــە :

M.C.Иванов, Очарк истории Ирана, Москва, 1952, стр.257.

م. س. ئیڤانۆف ، دیراسەی مێژوی ئێران ، مۆسکۆ ، ١٩٥٢ ، ل ٢٥٧.

کوردستان له تورك بسێننەوه . بەشێك له لەشکری رۆس دوا به دوای دەرکردنی تورك له تەورێز و دەوروبەری (کانونی دوەـەمی سالّی ١٩١٥ ) بەرەو رۆخەکانی باشوری دەریاچەی ورمێ کشان و پاش شــەرێکی بچوك لەگەڵ چەکدارانی شکاکدا لـەولای خۆیەوه توانییان رۆژی ٢٥ی مایسی سالّی ١٩١٥ شاری ورمێ و دەوروبەری له لەشکری عوسمانی بسێننەوه و بەو جۆره کۆتایی به دەســەلاّتی پێنج مانگەی تورك لەو ناوچەیەدا بهێنن[14] .

دوا به دوای داگیر کردنی ورمێ لەشکری رۆس توانی بچێته ئوشنۆ و مەهابادیشەوه ، بەلاّم لەم ناوچانەدا توشی بەرهەلّستییەکی توندی هۆزه چەکدارەکانی کورد هات . له شــوباتی سالّی ١٩٦١ دا رۆسەکان توانییان کرمانشاش داگیر بکەن و دوای ئەوه گەیشتنه سەر سنوری تورکیا و ئێران . بەلاّم پاش چەند مانگێك تورکەکان توانییان بێنەوه ناو کرمانشا و هەمەدان و دوباره پیاو و لایەنگرانی ئەوان و ئەلّمانەکان له رۆژئاوای ئێراندا دژی ولاّته سوێندخۆرەکان کەوتنەوه کار . لەگەڵ ئەوەشدا ئەمه زۆری نەخایاند چونکه لەشکری رۆس توانی جارێکی تر به توندی له هێزەکانی تورکیا بدا و تا ســەرەتای سالّی ١٩١٧ کار گەیشت بەوەی ئێران له راستیدا کەوته ژێر دەستی رۆسیا و بەریتانیاوه که یەکەمیان تا ئەصفەهان و دوەمیان زوربەی باشوری داگیر کرد و تەنانەت چەند هێزێکی رۆس به نیازی ئاســان کردنی پێشکەوتنی ئینـگلیز له باشوری عیراقـدا تاوەکـو ناوچەی

---

(١٤) W. Eagleton, The Kurdish Republic of 1946', London, 1963, P. 9 .

رمواندز و خانەقین و پێنجوین ڕۆیشتن .

ئەوەی لێرەدا پێویستە بە تایبەتی سەرنجی بۆ رابکێشین ئەوەتە کە چ رۆس و چ ئینگلیز و چ تورك حکومەتی ئێرانیان بە هیچ نەدەزانی و بایەخیان نەئەدا بەوەی کە ئەو بەنیسبەت هەردوو بەرەی شەڕەوە بێ لایەن بوو و هەمتویان زۆر بە رەقی وەك داگیرکەر لەگەڵ دانیشتوانی ئەو ناوچانەی دەیانگرتن دەجولانەوە . بە وێنە سەربازی لەشکری تورك و پیاوی چەند هۆزێکی کوردی تورکخواه لە سەرەتای شەڕدا کە ورمێیان داگیر کرد زۆر دڕندانە کەوتنە گیانی فەلەکانی ئەو شارە و دەوروبەری و بە بیانووی ئەوەوە گوایە کاتی خۆی داویانەتە پاڵ لەشکری رۆس نزیکەی صەد گوندیان سوتاندن و ژمارەیەکی زۆریان لێ کوشتن و ئەوانی تریان ئاوارە کردن[15] . لە زۆر ناوچەی تریشدا جەندرمەکانی تورك بێ‌رەحمانە بەردەبوونە گیانی ناحەزەکانیان ؛ بە وێنە تەنها لە یەکێك لە ناوچەکانی کوردستانی ئێراندا دوو سەرداری ناحەزی خۆیان ( محەمەد حسەین خان و سەیفەددین خانی سەقز )یان لە سێدارە دا و بۆ چەند رۆژێك تەنها بە نیازی چاوترساندنی خەڵکی ئەو ناوە لاشەکانیان بە هەڵواسراوی هێشتنەوە . رۆسیش لەوان کەمتریان نەکرد

---

(١٥) علي سيدو الكوراني ، من عمان الى العمادية ... ، ص ٢٠٥ ـ ٢٠٩ .

و وشەی ( مسقۆف ) [١٦] « دیارتی » ئەو سـەردەمەیە لە زمانی کوردیدا ماوەتەوە کە تا ئێستەش بە مانای ( کافر و زندیق ) بەکار دەهێنرێ [١٧] .

زوڵم و زۆری داگیرکەران خەڵکی زۆر ناوچەی کوردستانی ئێرانی جوولاند و پاڵی پێوەنان بە توندی بەرهەڵستییان بکەن . فەلەکانی ناوچـەی ورمێ لە رقی تورك ئەوەندەی تر لە رۆس و دوای ئەوان لە ئینگلیز نزیك کەوتنەوە . خەڵکی ناوچەی سابڵاغ

---

(١٦) لە ( مۆسکۆفی ) واتـە ( مۆسکویتی )یـەوە وەرگیراوە . تا ئێستەش پڕوپیرێژنی زۆر ناوچەی کوردستان باسی ئەوە دەکەن چۆن رۆسـەکان کانی خۆی بە حەوت ماڵ چەقۆیەکیان داوەتێ . ئارنۆڵد ویلسن لە بەرگی یەکەمی کتێبەکەیدا ئەوەی تۆمار کردوە کە چۆن دانیشتوانی هەر شوێنێکی کوردستانی عیراق لەشکری رۆسی تێچوبێ لێیان داخ لەدڵ بوون ، بـە تایبەتی خانەقینیکان کە دوو جار ( ساڵی ١٩١٦ و ساڵی ١٩١٧ ) ئازارێکی زۆریان بە دەستەوە چێشتبوو ( بڕوانە :

A. T. Wilson, Loyalities Mesopotamia, 1914 - 1917. A personal and historical record, London, 1930, P. 162 ).

(١٧) وەك خوا لێخۆشبوو مامۆستا حسەین حوزنی موکریانی باسی دەکا لەشکری رۆس تەنها چەند خانوییەکی کەمی رەواندز نەبێ کە ئەویش بۆ خۆیان پێویست بوون ، ئەوانی تریان هەمو بە جارێك سـووتاندووە ( بڕوانە : حسـین حزنی موکریانی ، مێژووی میرانی سـۆران ، چاپی دووهـەم ، هەولێر ١٩٦٢ ، ل ١١٣ ) .

(مەهاباد) یش بە سەرکردایەتی قازی فەتاحی بەناوبانگ[١٨] بەگەری کەوتنە بەرهەڵستی کردنی هێزی تورك و دوای ئەوانیش رۆس . هەروەها خرابەکاری سەربازی لەشکری رۆس و ئەو ئەرمەنە چەکدارانەی لەگەڵیاندا بوون بەرامبەر بە دانیشتوانی رەواندز خێڵاتی ئەو ناوچەیە و کۆیە و هەولێری دژیان جوڵاند و لە ئەنجامدا ناچاریان کردن ئەو ناوە بەجێ بهێڵن ، لە قوڵی پێنجوینیشەوە شێخ مەحمود بە خۆی و پیاوەکانیەوە هێرشی کردنە سەر . کوردی عەلی ئاوای ناوچەی خانەقین و چەند شوێنێکی تری ئەم مەڵبەندەش پیاوانە بەرهەڵستی پێشکەوتنی لەشکری رۆسیان کرد .

---

(١٨) میرزا فەتاحی قازی (قازی فەتاح) (١٨٣٢ – ١٩١٦ – ؟ –) برا بچوکی باپیری قازی محەمەدە و یەکێکە لە گەورە پیاوە ناودارە هەرە ئازاکانی موکریان کە تەمەنی لاوی و پیری خۆی لە رێگەی خزمەتی خەڵکی ئەو ناوچەیەدا بردۆتە سەر و هەر لەبەر ئەوەش دوژمنانی کورد بە خوێنی سەری تینو بون . لە ساڵەکانی شەڕی یەکەمی جیهاندا بەرگری لە ناوچەی سابلاغ دژی لەشکری تورك و رۆس کردوە و خۆی و کوڕێکی بە دەستی سەربازی رۆس شەهید کراون و وەك دەگێڕنەوە تا دوا گوللە شەڕی کردوە و ئینجا لە سەنگەر هاتۆتە دەرێ و رۆی تێ کردون و وتویە : « مەلعونینە ئیتر دەتوانن بەسەر کەلاکی کوڕەکەم و خۆمدا تێپەڕن و شارەکەم داگیر بکەن . ئیتر بشم کوژن دڵم خۆشە چونکە لە رێگەی نەتەوەکەمدا کوڕێکم فیدا کردووە و ئەوا خۆشم فیدا ئەکەم . . . » ، سنگی قازی فەتاح حەقدە گوللەی پێوە بووە ( بڕوانە : د. رەحیمی قازی ، قازی محەمەد ( دەستنوسێکی ئامادە کراوە بۆ چاپ ) ، ل ٣١ – ٣٤ ) .

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا تەنها شۆڕشی ئۆکتۆبەر رادەی بۆکارە خراپەکانی لەشکری رۆس دانا و بە یەکجاری لە ناوچە داگیرکراوەکانی کوردستانی ئێران و تورکیای دوورخستنەوە[19] کە ئەمەش رێگەی خۆش کرد بۆ ئەوەی دوبارە لەشکری عوسمانی تێ بچێتەوە . لە لایەکی ترەوە سەرکەوتنی شۆڕشی ئۆکتۆبەر تەرازوی هێزی نێوان دەوڵەتان و تاکتیك و ستراتیژی دەوڵەتە گەورەکانی تێکدا و ئەمەش لە زۆر روەوە کوردستانی وەك زوربەی ناوچەکانی تری رۆژهەڵاتی ناوەڕاست گرتەوە و یەکێك لە ئەنجامەکانی لەم بارەیەوە بریتی بو لە گۆڕانی سیاسەتی ئینگلیز بەرامبەر بە کوردستان کە ویستی ، بە پێچەوانەی ساڵەکانی بەر لە سەرکەوتنی شۆڕشی ئۆکتۆبەرەوە ، دەسەڵاتی یەکسەری خۆی تێدا دابمەزرێنی[20] و

---

(١٩) رۆسیا دوای روخانی رژێمی چار و سەرکەوتنی شۆڕشی بۆرجوازی شوباتی ساڵی ١٩١٧ لە شەڕ نەکشابەوە و هەر وەك جاران لەشکرەکانی لە هەمو مەیدانەکاندا ، بە کوردستانەوە ، لە جەنگدا بون . شایانی باسە کاربەدەستانی نوێی رۆسیا لەسەر سیاسەتی چارەکان بەرامبەر بە کوردستان رۆیشتن و هەر وەك سەردەمی ئەوان بێ جیاوازی هەوڵیان دەدا سەرداره کوردەکان راکێشنە پاڵ خۆیان .

(٢٠) هەر وەك لە دوایشدا بە درێژی باسی دەکەین بەریتانیا بەر لە سەرکەوتنی شۆڕشی ئۆکتۆبەر حەزی نە دەکرد لە ولاتە ژێردەستەکانیدا ببێتە دراوسێی رۆسیا کە بە پێی پەیمانی ( سایکس ـ پیکۆ ) بەشێکی گەورەی کوردستانی بۆ دانرا بو بۆیەکا بەریتانیا بەوە قایل بو هەر بە پێی ئەو پەیمانە کوردستانی باشور بدرێ بە فەرەنسە نەك خۆی .

ئەمەش بووە هۆی ئەوەی ئاگری شـــەڕی یەکەمی جیهـــان لە دوا ساڵیدا کوردستانی باشووریش بگرێتەوە کە تا ئەو کاتە تەنها لەشکری ڕوس چەند جارێکی کەم توانیبوی بگاتە هەندێک ناوچەی بچوک هەرچەندە داگیر کردنی بەشێك بۆ لە پلانی گشتی لەشکری ئینگلیزدا لە بارەی گرتنی عیراقەوە کە بەر لە دەست پێ کردنی شەڕ خۆیان بۆ ئامادە کردبو . شایانی باســـە لە ناو ئەو چەك و جبەخانە زۆرەی ئینگلیزەکان بەر لە شـــەڕ لە هەنـدێك ناوچەی کەنداوی عەرەبدا بە نیازی داگیر کردنی عیراق لە شـەڕی چاوەنواڕ کراودا ئامادەیان کردبۆن دوو بەتەلیۆنی تۆپی شاخیشیان تێدا بو[21] کە زۆر لەوانەیە لەبەر ناوچە شـــاخاوێکانی کوردســـتان لەتەك چەکەکانی تریانـدا هێنابێتیان .

زیاتر لە تاکە ڕۆژێك بەســـەر تێکەڵ بونی ڕەسمی دەوڵەتی عوسمـانی لە شـەڕی یەکەمی جیهاندا تێنەپەڕیبو کە هێزە چەکدارەکانی ئینگلیز پەلاماری باشوری میسۆپۆتامیایان دا و فاوی تاکە بەندەریان گرت و دوابەدوای ئەوە بە چەنـد ڕۆژێـکی کەم توانیان بەصرەش بگرن . لەو لاشەوە کاربەدەستە تورکەکانی عیراق بە هەر چوارلادا بە ناوی غەزاوە کەوتنـــە هاندانی هۆزی عەرەب و کورد دژی «کافران» و توانیبان لە و ڕێـکەیەوە هەستی زۆر کەس بجوڵێنن کە بە گەرمی دایانە پاڵ هێزە شەڕکەرەکانی تورك بە نیـازی وەستاندنی

(٢١) عبدالرزاق الحسني ، تأريخ العراق السياسي الحديث ، الجزء الاول ، صيدا ١٩٥٧ ، ص ٥٣ - ٥٤ .

هێرشی لەشکری ئینگلیز و بەو جۆرە زۆر بەسەر داگیر کردنی بەسرەدا تێنەپەڕی کاتێك دەوروبەری ده هەزار جەنگاوەر کە پتر له هەزاریان سوارەی چەکداری کورد بون[٢٢] ، له نزیك شاری ناصریەوە بۆ کۆمەکی تورك کۆبونەوە ، بەلام له و شەڕە سێ ڕۆژییەدا کە له نیسانی سالی ١٩١٥دا له شوعەیبە لەگەل لەشکری تورکدا قەوما پیس شکێنران ، بەرەی عوسمانی لەو شەڕەدا پتر له دوو هەزار و پێنج صەد کەسیان لێ کوژران و بریندار کران و ٨٠٠یشیان لێ به دیل گیران جگە لە هەندێك چەك و جبەخانەش کە دایان بە دەستەوە ؛ زیانی ئینگلیزیش دەگەیشتە دەوروبەری ١٢٥٠ کەسێك[٢٣]. ئەمە و هەلوێستی رەق و پڕ لە گومانی بێ جێی ئەفسەرانی تورك جەنگاوەرانی عەرەب و کوردیان ناچار کرد مەیدان بەجێ بهێلن و بگەڕێنەوە مەلبەندەکانی خۆیان هەرچەندە لە کاتی شەڕی شوعەیبەدا درێغییان لە گیان فیداکاری نەکرد .

دوای شەڕی شوعەیبە لەشکری ئینگلیز بەرەو بەغدا کشا و لەمەدا هاندانی سەرمایەدارە گەورەکانی بەریتانیا دەورێکی گەورە و دیاری

(٢٢) بڕوانە : رفیق حلمي ، یادداشت ، بەشی ـ ١ ـ ، بەغدا ، ١٩٥٦ ، ل ٤٩ ـ ٥٠ . ئەو هەزار سوارەی کورد له ژێر سەرکردایەتی شێخ مەحمودا له و شەڕەدا بەشدار بون .

(٢٣) A. T. Wilson, Loyalities Mesoptamia, 1914 - 1917, P. 35.

هەندێك سەرچاوە کوژراو و برینداری لەشکری عوسمانی بە زیاتر لە قەلەم دەدەن ( بە وێنە بڕوانە : محمد طاهر العمری ، تأریخ مقدرات العراق السیاسیة ، الجزء الاول ، موصل ١٩٢٤ ، ص ١٠٥ ) .

بینی[٢٤] . پێشکەوتنی ئینگلیز تا کوت هیچ تەگەرەو قۆرتێکی نەهاتە رێ ، بەڵام لێرە هێزە چەکدارەکانی تورك توانییـــان ئابلۆقەیەکی وەهایان بدەن کە ناچار بن لە کۆتایی نیسانی ١٩١٦دا خۆیان بدەن بە دەستەوە . ئەمە هەرچەندە بووە کۆســپێکی گەورە لە رێگەی داگیر کردنی بەغـدادا بۆ ئینگلیز بەڵام ورەیان بەر نەدا و لە ســەر پلانی خۆیان رۆیشتن و لە مارتی ســاڵی ١٩١٧دا توانییان بەغداش بگرن و بەو جۆرە بەشی زۆر ی گرنگی میســۆپۆتامیا کەوتە ژێر دەسەڵاتیانەوە .

بەڵام زۆر بە ســەر داگیر کردنی بەغـدادا تێنەپەڕی کاتێك شۆڕشی ئۆکتۆبەر لە رووسیادا سەرکەوت و هــەر وەك وتمان بووە هۆی روودانی ئاڵوگۆڕێکی گەورە لە هەموو تاکتیك و ســتراتیژی دەوڵەتە ئیمپریالیستەکاندا کە یەکێکیان بریتی بوو لەوەی بەریتانیا بــە خێرایی کەوتە خۆ بۆ داگیر کردنی کوردســتانی باشوور و چاویشی بڕییە کوردســتانی باکووری کۆنە مــیراتی چارەکانی رووســیا کە بە پێی پەیمانی نهێنیی ســایکس ـ پیکۆ بۆیان تەرخان کرابوو. یەکێك لە نیشانە دیارەکانی ئەم گۆڕانە لە ســیاسەتی ئینگلیزدا بەرامبەر بە کوردستان لەوەدا بەدی دەکرێ کە وا ئینگلیزەکان نزیکەی سێ ساڵیان ویست بۆ داگیر کردنی بەشــی خوارووی عـیراق تاوەکو

---

(٢٤) الدكتور زكي صالح ، مقدمة في دراســة العراق المعاصــر ، بغــداد ، ١٩٥٣ ، ص ١١ .

بەغدا ، کەچی دوای سەرکەوتنی شۆڕشی ئۆکتۆبەر (٧ی تەشرینی دوەهەی ساڵی ١٩١٧) وا خێرا کەوتنــەـە خۆیان بە رادەیەك بەر لە وەستاندنی شەڕ توانیبیان لەشکر و کاربەدەســتانی تورك لە زوربەی ناوچەکانی تری عیراقدا دەربکەن و دەسەڵاتی خۆیانیان تیا دابمەزرێنن. بەڵگەیەکی پڕ مانای ئەمەش ئەو شــەڕە قورسە بۆ کە لەشــکری ئینگلیز لە خوارۆی متوسلدا بەر لە مۆر کرنی هودنەی مۆدرۆس بە دوازدە رۆژ کردی ، واتە لە کاتێکدا کە هەمو لا دەیانزانی تورکیا و هاوپەیمانەکانی ئەمڕۆ نا سبەی بە ناچاری خۆیان دەدەن بەدەستەوە ، کەچی ئینگلیزەکان دەوروبەری دو هەزار سەربازی خۆیان کردە قوچی قوربانی[٢٥] تەنها بۆ ئەوەی پێش تەواوبونی شەڕ کەمێك زیاتر بچنە پێشــەوە[٢٦] . بەر لەوەش بە ماوەیەك لەشکری ئینگلیز لە قوڵی باکوری - رۆژهەڵاتی بەغداوە میقدارێکی باش پێشکەوت و رۆژی ٢٨ی نیسانی ساڵی ١٩١٨ توانی بچێتە ناو شــاری کفری‌یەوە و دوای ئەوە بە رۆژێك توزخورماتوشی داگیر کرد. لەم ناوچانەشدا چەند شــەڕێك لە نێوان هێزی چەکداری تورك و ئینگلیزدا قــەوما

---

(٢٥) شایانی باسە لە ماوەی چوار ساڵی شەڕدا لەشکری ئینگـلیز لە هەمو عیراقدا بەسەر یەکەوە دەوروبەری ٣١ هەزار کەسی لێ کوژرا .

(٢٦) لە هەمان شەڕدا تورکەکان نزیکەی یازدە هەزار دیـل و ٥١ توپ و گەلێك جبەخانەی تریان دا بەدەستەوە . ( بڕوانە :

A. T. Wilson, Mesopotamia, 1917 - 1920 . A clash of loyalities . A personal and historical record, London, 1931, PP. 16 - 17 )

که له ئه‌نجامیاندا پتر له ۲۰۰ سه‌ربازی تورك كوژران و ۱۳۰۰ كه‌سێك و ۲۰ تۆپێكیشیان لێ به دیل گیرا و له ئینگلیزیش نزیكه‌ی ۲۰۰ كه‌س كوژران یان برینـدار كران[۲۷] . دوا به دوای ئـه‌وه ئینگلیزه‌كان به شـه‌ڕێكی بچوك توانییان رۆژی حه‌وتی مایس كه‌ركوكیش بگرن به‌ڵام دوای نزیكه‌ی سـێ حه‌فته ( رۆژی ۲٤ی مایس ) لێی كشانه‌وه و له‌شكری توركی تێ هاته‌وه كه دوای ماوه‌یه‌كی كه‌م دوباره ناچار بو به‌جێی بهێڵی و ئه‌مجاره‌یان له‌شكری ئینگلیز تا ده‌وروبه‌ری ئاڵتون كۆپری دوای كه‌وت .

لێره‌دا پێویسته سه‌رنجیش بۆ ئه‌وه رابكێشین كه وا ئینگلیزه‌كان هه‌ر دوای داگیر كردنی به‌غدا كه‌وتنه ناردنی ژماره‌یه‌ك له ئه‌فسـه‌ره ئه‌ره شاره‌زا و به تواناكانیان ـ به تایبـه‌تی له‌وانه‌یان كه كاتی خۆی به باشی له هیندسـتان ده‌رس درابون یا پێش شـه‌ڕ هاتبونه ناو كورده‌وه ـ به‌ره‌و شاره‌كانی كوردسـتان بۆ خۆش كردنی رێگه‌ی هاتنی هێزه‌كانیان و دامه‌زراندنی ده‌سه‌ڵاتی سیاسییان له‌و ناوچانه‌دا . به وێنه چه‌ند جارێك مێجـه‌ر سۆنی به‌ناوبانگیان نارده هه‌ندێك ناوچه‌ی كوردستان و زۆری نه‌خایاند دوای داگیر كردنی به‌غدا كه به نهێنی ناردیانه خانه‌قین و ئه‌و ده‌وروبه‌ره[۲۸] . ئینگلیزه‌كان له‌گه‌ڵ

---

(۲۷) Op. Cit., P. 8

(۲۸) ئارنۆلد ویلسنی یه‌كه‌م حاكمی سیاسی ئینگلیز له عیراق به شـێوه‌یه‌كی تایبه‌تی باسی خزمه‌ته‌كانی سۆنی له خانه‌قین و سـلێمانی كردوه و دانـی به‌وه‌دا ناوه كه بـۆ كاری له‌شكری ئینگلیز له سـاڵه‌كانی شـه‌ڕدا زۆر به‌كه‌ڵك بون . ویلسن به ئه‌وپه‌ڕی شانازییه‌وه باسی سۆنی له كتێبه‌كه‌ی=

گرتنی کنفریشدا له ڕێگەی نامە و ئەفسەرە سیاسییەکانیانەوە له نزیکەوە پەیوەندییان لەگەڵ پیاوە ناودارەکانی کەرکوك و سلێمانیدا دامەزراند[٢٩] و بە تایبەتی کاپتان نۆئێلیان[٣٠] نارده لای شێخ مەحمود له سلێمانی کە له ڕۆژی کشانەوەی کاربەدەست و سەربازانی تورکەوە دەسەڵاتی ئەو مەڵبەندەی گرتبووە دەست خۆی .

---

= خۆیدا کردوه و دەڵێ : « سۆن یەکێك بۆ لەو کەسە هەرە دیارانەی کە بەختەوەر بوم بە ناسینیان ... سۆن زمانزانێکی بێ هاوتا بۆ و تاکە کەس بۆ کە له ژیانمدا دیبێتم بتوانێ وا بە سەرکەوتویی له ناو فارسدا بە خۆشاراوەیی وەك فارس بژی »
( A. T. Wilson, Loyalities Mesopotamia, pp. 162, 169 )
سۆن له سەرەتاوە تا کۆتایی شەڕ لەگەڵ لەشکری ئینگلیزدا له عیراق بوه و دەورێکی گەورەی له دەرکردنی « بەصرە تایمس » و « بەغداد تایمس »دا هەبووە کە ئینگلیز له ڕۆژی داگیرکردنی ئەو دۆ شارەوە دەستیان کرد بە دەرکردنیان .

( ٢٩ ) بڕوانە :

C. J. Edmonds, Kurds, Turks and Arabs. Politics travel and research in North - Eastern Iraq, London, 1957 , P. 29 .

(٣٠) کاپتان ( دوایی مێجەر ) نۆئێل ئەفسەرێکی زۆر شارەزا و گورج و گۆڵ و هێمن بۆ ، زمانی فارسی باش دەزانی و له نەفسیەتی هۆز و سەرەك هۆزەکانی ڕۆژهەلات باش گەیشتبۆ . نۆئێل له سەرەتادا له ناو بەختیارییەکاند کاری دەکرد و توانی خەڵکی ئەو ناوە دژی ئەڵمانەکان بجوڵێنێ و خزمەتێکی زۆر بە کۆمپانیای نەوتی ئینگلیزی له ئێراند بکەیێنێ . له دوا ساڵەکانی شەڕدا نۆئێل توانی له نزیکەوە پەیوەندی لەگەڵ=

بەم جۆرە تا رۆژی مۆر کردنی هودنەی « مۆدرۆس » لە ٣٠ی تەشرینی یەکەمی ساڵی ١٩١٨دا لە نێوان وڵاتە سوێندخۆرەکان و تورکیادا هێزەکانی ئینگلیز توانییان دەسەڵاتیان لە بەشێکی زۆری کوردستانی باشووریشدا دابمەزرێنن وە لە قـۆڵی موسڵیشەوە تەنها دوازدە میلیان مابوو بگەنە ناو شار ، بـەڵام ئینگلیزەکان گوێیان نەدایە وەستاندنی شەڕ و بە بیانووی بەندی حەوتەمی « مۆدرۆس »ەوە کە رێگەی دەدانێ لە کاتی پێویستدا « هەموو شوێنێکی ستراتیژی

---

= ژمارەیەکی زۆر لە سەرەك هۆز و دەسەڵاتدارانی کوردستاندا دابمەزرێنێ و تەنانەت دەستیشی کرد بە فێربوونی زمانی کوردی . شایانی باسە نۆئێل زۆر لایەنگری دامەزراندنی دەوڵەتێك بوو لە کوردستاندا و لە راپۆرتە نهێنیکانی خۆیدا بە گەرمی کاربەدەستانی بەریتانیای بۆ ئەمە هان دەدا ( بڕوانە :

« Documents on British Foreign Policy, 1919 - 1939 », First series, Vol. IV, London, 1952, pp. 678, 693, 742 , 782 ) .

نۆئێل هەرچەندە چەند ساڵێکی کەم لە ناو کوردا کاری کرد بەڵام بە خێرایی توانی هەستی ژمارەیەکی زۆر لە پیاوانی ناسراوی کوردستان بۆ لای خۆی رابکێشێ بە رادەیەك مامۆستا رەفیق حیلمی لە بارەیەوە نووسیویێتی دەڵێ : « زەمان بە دڵی نۆئێل بجوایە بەڕێوە شکم لەوەدا نیە کە بناغەی (کوردستانی گەورە)ی دائەمەزراند » ( رەفیق حیلمی ، سەرچاوەی ناوبراو ، ل ٦٩ ) . نۆئێل زۆر لە کوردستان نەمایەوە ، ئەوەبوو کاربەدەستانی ئینگلیز بۆ کاری « نایەتی » خۆیان ناردیانە ناوچەی قەفقاس و لەکاتی گەڕانەوەیدا لە لایەن شۆڕشگێڕە جونگەڵیکانەوە بە دیل گیرا .

بگرن » وه بەندی شازدەهەی کە مەرجی خۆبەدەستەوه دانی هەمـوو هێزەکانی دەوڵەتی عوسمانی « له میسۆپۆتامیادا » کـردبوو بـە مـاڵ بەسەر تورکەوه[٣١] ـ چوونە ناو شاری موسڵەوه و تورکیان لەو ناوەش دوور خستەوه و دوای ئەوه هـەر ناوچەیەکی کوردستانی باشوور مابوو داگیریان کردن بەو نیازەی لە دوارۆژێـکی نزیکدا بیانکەنە بەشێك لەو دەوڵەتـەی دەیانویست بـە ناوی ئینتیدابـەوه لە عیراقـــدا دایبمەزرێنن[٣٢] .

ئەوەی لێرەدا پێویستە بە تایبەتی سـەرنجی بـۆ رابکێشین ئەوەتە کە ئینـگلیزەکان هەرچۆنێك بوایـە و بە هەر نرخێك بوایـە «ویلایەتی موسڵ»یان هەر داگیر دەکرد بۆیەکا ئامادە بوون بە شەڕیش بێ هێز و کاربەدەستانی تورك لە موسڵ دەربەرێنن[٣٣] چونکە ، هەر

(٣١) بڕوانە :

Ю.В.Ключников и Андрей Сабанин, Международная политика новейшего времени в договорах, нотах и декларациях, ч.II, Москва, 1926, стр.188-189.

یو . ف . کلیوچنیکۆف و ئەندرێیەی سەبانین ، سـیاسەتی نـێوان دەوڵەتانی سەردەمی هەرە نوێ لەپەیان و یادداشت و « تصریح »دا ، بەشی دووەم ، مۆسکۆ ، ١٩٢٦ ، ل ١٨٨ ـ ١٨٩ .

(٣٢) بڕوانە :

« Documents on British Foreign Policy », Vol. IV, PP. 679, 594, 743.

(٣٣) بڕوانە :

H. St. J. Philby, Arabian days, London, 1948, PP. 173 - 174.

وەك كاتی خـــۆی لۆرد کیرزن وتــبوی ، لایان وابو ســـنوری ڕۆژئاوای هیندستان بە فـــوراتدا تێدەپەڕێ کە تەنها لە ڕێـگەی « موسڵەوە »[٣٤] دەتوانرێ بگیرێتە دەست[٣٥] .

بەم جۆرە لە ســـالآنی ١٩١٤ — ١٩١٨ دا هـــەمو لایەکی کوردستان ببوە بەشێـکی گرنگ لە مەیدانەکانی ڕۆژهەڵاتی نزیك و ناوەڕاستی شـــەڕی یەکەمی جیهـــان و لەشـکری ئینگلیز و ڕوس و تورك و هێزی چەکداری کورد و سوارەی حەمیدی و پیـــاوانی ئەڵەمان لەو ســـالآنەدا هەریەکە بە جۆرێ لەسەر خاکی کوردستان دەوری خۆی دەبینی وە ئەگەر ســـەرکەوتنی شۆڕشی ئۆکتۆبەر و کشانەوەی لەشـکری ڕوس نەبوایە تا کۆتایی شەڕ هیچ بەشێـکی کوردستان بە دەســـت داگیرکەرە کۆنەکانیەوە نەدەما ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشـــدا ئەم شـــەڕە و ئەنجامەکانی بونە هۆی ڕوودانی گەلێك ئاڵوگۆڕی گرنـــگی سیاسی و ئابوری لە زوربەی کوردستاندا وە بە تایبەتی لە کوردستانی باشوردا کە کەوتە ژێر دەسەڵاتی یەکسەری ئینگلیزەوە . لە هەمان کاتدا ڕوداوەکانی شەڕی یەکەم هەر لە ساڵەکانی شەڕدا کارێـکی زۆریان کردە ســـەر باری سیاســـی کوردستان و بونە هۆی ماڵ وێرانی و سەرگەردانی و زیانێـکی زۆر بۆ گـەلی کورد .

---

(٣٤) مەبەستی هەمو ویلایەتی موسڵە .

(٣٥) بڕوانە :

Н.Г.Корсун, Арабский Восток-Ирак, Москва, 1928, стр.35.

ن . گ کارسون ، ڕۆژهەلاتی عەرەب ـ عیراق ، مۆسکۆ ، ١٩٢٨، ل ٣٥ .

# بەشی چوارەم

# خەباتی گەلی کورد لە ساڵەکانی شەڕدا و ئەو زیانانەی لەو ساڵانەدا لە کورد کەوتن

هەروەك لە بەشی دوەمی ئەم باسەدا وتمان بێ گومان شەڕی یەکەمی جیهـان و روداوەکانی بونە کۆسپێـکی گەورە لەبەر دەمی پێشکەوتن و پەرەسـەندن و قوڵ بونەوەی ناوەرۆکی بزوتنـەوەی ئازادی ـ نەتەوەیی گەلی کوردا ، بەڵام ئەمـە وەها ناگەیێنێ کە وا گەلی کورد لەو سـاڵانەدا ئیتر بە یەکجاری دەسـتی لە خەبات هەڵگرتوە[1] چونـکە هیچ نەبێ هۆ جوڵێنەرەکانی ئەو خەباتە تا رادەیەکی زۆر هەر وەك جاران لە ئارادا بون ، بەڵـکو هێندێـکیان قوڵتریش بونەوە . بەر لە هـەمو شتێك کاربەدەستانی دەوڵەتی

---

(١) هەنـدێك مێژونوس لەوەدا بە هەڵەدا چون کە گوایە گەلی کورد لە ساڵەکانی شەڕدا دەستی لە خەباتی رزگاری خۆی هەڵـگرتوە .

عوسمانی نەك تەنها دەستیان لە سیاسەتی شۆڤێنی جارانیان هەڵنەگرت بەڵکو لە ئەنجامی بە یەکجاری زەحمەت بوونی ژیانی ئابووری هەموو وڵاتــدا بە هۆی شەڕەوە ئەوەندەی تر ئەو سیاســەتە نالەبارە بە کاروباری رۆژانەیانەوە دیاری دا و لەم مەیدانەدا زۆر ناشییانە هاتنە پێشەوە چونکە وا دیارە فەرمانڕەوایانی تورکیا دەست پێ کردنی شەڕیان بۆ لێدانی بزووتنەوەی رزگاری گەلی کورد بە هەل زانی ، ئەوەبوو لە ریتی دڵدانەوە و رازی کردنی سەرۆکەکانی بۆ ئەوەی لە و رێگەیەوە بتوانن گەلی کورد لەو کاتە ناسکەدا رابکێشنە پاڵ خۆیان یەکسەر کەوتنە گیانیان . لە مووسڵ رۆژی یەکی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩١٤ شێخ عەبدولسەلام و دوان لە پیاوەکانیان لە سێدارە دان[٢] و بەم کردەوەیەیان بە جارێك رقی دانیشتوانی زوربەی ناوچەی بادینانیان لە خۆیان هەڵساند .

کاربەدەستانی بتلیسیش دەست پێ کردنی شەڕی یەکەمیان بە هەل زانی بۆ ئەوەی بدەن بەسەر کونسولخانەی رووسیادا و مەلا سەلیمی خێزانی و هاوەڵەکانی بگرن و دەس بەجێ بە نیــازی تۆقانــدنی خەڵکی ئەو مەڵبەندە لەســەر شەقامەکانی شار هەڵیانواسین و لاشەکانیان بۆ چەند رۆژێك بە و جۆرە هێشتنەوە[٣] .

---

(٢) عبدالمنعم الغلامي ، الضحايا الثلاث ، الموصل ، ١٩٥٢ ، ص ٥٠ ـ ٥١ .
تورکەکان لە رێگەی خیانەتکاری هەندێك کوردەوە بە هۆی صوفی عەبدوڵلا شکاکی فەنەکییەوە لە پاییزی ساڵی ١٩١٤دا توانییان شێخ عەبدولسەلام بگرن .

(٣) بلەچ شیرکوە ، سەرچاوەی ناوبراو ، ل ٥٠ .

بەڵام نە ئەم کارە ناهەموارانەی چینە کاربەدەستەکانی تورکیا وە نە ئەو رژێمە دیکتاتۆرییەی بە بیاتۆی شەڕەوە بە سەر خەڵکیانا داسەپاند نەیانتوانی کۆتایی بە خەباتی گەلی کورد بهێنن و رۆڵەکانی دەمکوت بکەن . راستە لە زرۆفی شەڕدا — لە کاتێکدا زوربەی رۆشنبیرانی کورد بە بەرگی سەربازییەوە نێررابوونە مەیدانەکانی شەڕ و هەموو رێکخراو و کۆمەڵە سیاسێکانی بەر لە شەڕ دایانمەزراندبوون لەکار کەوتبوون — نەدەتوانرا کڵپەی ئاگری بزوتنەوەی رزگاری کۆمەڵانی خەڵك وەك جاران خۆش بکرێ ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ناڕەزایی و رقی دانیشتوانی زۆر ناوچەی کوردستان لە ساڵەکانی شەڕدا لە شێوەی راپەڕیندا دەتەقییەوە . بە وێنە لە بەهاری ساڵی ١٩١٥دا خەڵکی بۆتان بە ئاشکرا دژی دەسەڵاتی میری پەلاماری چەکیان دا و بەرهەڵستی هێزەکانیان کرد . هەر لەو سەردەمەشدا خەڵکی دەرسیم بۆ ماوەی پتر لە ساڵێك توانییان کاربەدەست و سەربازی تورك لە هەموو ناوچەکەیان وەدرخەن و دەسەڵاتی تەواوی ئەو مەڵبەندە بگرنە دەست خۆیان[٤] . عەلی شێری شاعیری بەناوبانگی ئەم ناوچەیە دەورێکی دیاری لە بزواندنی هەستی نەتەوەیی خەڵکەکەیدا بینی و بە هەموو توانایەوە کەوتە هاندانی هۆزەکانی دەرسیم و قۆچگیری بۆ ئەوەی لە پێناوی ئازادیی نیشتمانەکەیاندا یەك بگرن و رێگەی گەڕانەوەی دەسەڵاتی عوسمانی نەدەن ، بەڵام هەندێك لە سەرەك هۆزە تورکخواکان لەبەر دەمی

---

(٤) م . س . لازەرێف ، سەرچاوەی ناوبراو ، ل ٣١١ .

پەرەسەندنی ئەم بزوتنەوەیەدا بوونە کۆسپێکی گەورە[٥] .

لە دواساڵەکانی شەڕدا لە ئەنجامی ژێرکەوتنی یەك لە دوای یەکی لەشکری عوسمانی لە هەموو مەیدانەکاندا و بە تەئسیری پەرەسەندنی بزوتنەوەی رزگاری زوربەی گەلە ژێردەستەکانی ئیمپراتۆری عوسمانی ، خەباتی گەلی کوردیش توند و تیژتر بوو و ئەمجارەیان کوردستانی باشووریشی گرتەوە و خەڵکی ئامێدی و سلێمانی و هەندێك ناوچەی تر چەند جارێك دژی دەسەڵاتی عوسمانی یاخی بوون شێخ مەحموود هەر لە کاتی کوشتنی شێخ سەعیدی باوکیەوە بەر لە شەڕ[٦] بە هاندانی کاربەدەستانی موسڵ ، دڵی لە دەوڵەتی عوسمانی کرمێ بوو و بۆ هەلێك دەگەڕا تۆڵەی باوکی بسێنێ و ئەنانەت چوونی شوعەیبەشی بە هاندانی پیاوە ئاینیەکان و فەتواکانیان بوو و گەڕانەوەشی لە رقی ئەفسەرانی تورك بوو . جا شێخ مەحموود باری نالەباری دەوڵەتی عوسمانی لە دواساڵەکانی شەڕدا بە هەل زانی و بە ئاشکرا کەوتە خەبات کردن بە نیازی لەناو بردنی

---

(٥) لە بارەی زیان و خەباتی عەلی شێرەوە لە ساڵەکانی شەڕی یەکەمدا بڕوانە :

Nuri Dersimi , Kürdistan Tarihinde Dersim , Halep , 1952 , C. 112 - 113 .

(٦) دوای سەرکەوتنی شۆڕشی تورکە لاوەکان شێخ سەعیدی باوکی شێخ مەحموود دوور خرایەوە موسڵ و لەوێ هەر لەو ساڵەدا ( ١٩٠٨ ) خۆی و چەند پیاوێکی و شێخ ئەحمەدی کوڕی بە دەسیسەی کاربەدەستانی تورك کوژران .

دەسەڵاتی بەلای کەمەوە لەکوردستانی باشووردا کە لەشکری ئینگلیزی لێ نزیك ببووبۆوە . هەر بۆ ئەم مەبەستەش شێخ مەحموود کەوتە دامەزراندنی پەیوەندی لەگەڵ هەموو ناحەزەکانی دەوڵەتی عوسمانیدا و بە نامەی تایبەتی بەر لە هەموان داوای یارمەتی لە رووس کرد و ئینجا کەوتە نامە نووسین بۆ شەریفی مەککە حسەینی کوڕی عەلی و داوای لێ کرد شان بە شانی یەك دژی دەسەڵاتی عوسمانی بکەونە خەبات و دوای ئەوەش هەر بۆ ئەو نیازە پەیوەندی لەگەڵ ئینگلیزەکاندا دامەزراند و هەر وەك لە شوێنێکی تری ئەم باسەدا گوتمان بەر لەوەی شەڕ کۆتایی بێ شێخ مەحموود توانی ببێتە تاکە دەسەڵاتداری هەموو ناوچەی سلێمانی .

کۆمەڵانی خەڵکی کوردستانی تورکیاش تا دەهات زیاتر لەسەر خەبات سوور دەبوون . هاوینی ساڵی ١٩١٧ دانیشتوانی دەرسیم و بۆتان دووبارە و خەڵکی خەرپووت بۆ یەکەم جار دژی حوکمی عوسمانی هەڵسان و لە سەرەتای ئابیشدا خەڵکی ماردین و ئامەد (دیاربەکر) راپەڕینێکی گەورەیان بەرپا کرد و عەرەبی ئەو ناوەش بە گەرمی پشتگیرییان کردن . ئەم راپەڕینە کاربەدەستانی تورکیای ناچار کرد هێزێکی زۆر بۆ دامرکاندنەوەی تەرخان بکەن[7] بە تایبەتی لە ترسی ئەوەش کە سەرۆکەکانی پەیوەندییەکی نزیکیان لەگەڵ ئەو هێزانەی رووسدا دامەزراندبوو کە لەو ناوچانەدا شەڕیان دەکرد و تەنانەت مەعلوماتیشیان

(٧) کاربەدەستانی تورکیا سەرتاپای تیپی چل و حەوتەمی لەشکر و چەند هێزێکی تریان بۆ دامرکاندنەوەی راپەڕینی دیاربەکر و ماردین تەرخان کرد ( بڕوانە : م . س. لازەرێف ، سەرچاوەی ناوبراو ، ل ٣٤٩ ) .

لە بارەی لەشکری تورك و جوڵانەوەکانییەوە دەدانێ . لـــە پایزی هەمان ساڵدا خەڵـکی بتلیس دوبارە راپەڕینەوە و ژمارەی چەکدارانی ئەجارەیان خۆی لە دەوروبەری ٣٠ هەزار کەسێك دەدا[٨] .

لەو ساڵانەدا کوردی ئێرانیش بە گەرمی چونـــە ناو کۆڕی خەباتەوە و لە زۆر ناوچەدا بە ئاشکرا چەکیان دژی کاربەدەستانی ئێران هەڵگرت و تەنانەت بەشێك لە دانیشتوانی کوردستانی ئێران کێکەڵی ئەو راپەڕینە گەورەیەش بون کە لە ســـەرەتای شـــەڕی یەکەمەوە جەنگەڵیـکان لە ژێر سەرکردایەتی میرزا کوچك خاندا لە باشوری ئێران ، بە تایبەتی لە ناوچەی گەیلاندا دژی داگیرکەران و فەرمانڕەوایانی ئێران بەرپایان کرد ؛ خاڵۆ قوربانی کورد بووە یەکێك لە یاریدەرە نزیکەکانی کوچك خان[٩] . لە هەمان کاتدا رێکخراوە سیاسی نهێنیـکانی ناو لەشکری روس پەیوەندییان لەگەڵ هەندێك شۆڕشگێڕی رۆشنبیری کوردا دامەزراند و تەنانەت لە ناوچەی کرمانشادا

---

(٨) شایانی باسە پیاوە سـیاسی و عەسـکەرێکانی روس و بەکرێ لیزاو و لایەنگرەکانیان بایەخێکی زۆریان بەم راپەڕینانەی کورد دەدا و لە هـەر شوێنێك بۆیان بکرایە ئاگریان خـۆش دەکرد و لە لایەکی تریشـەوە هەنـگاو بە هەنـگاوی رووداوەکانیـان دەکردە راپۆرتی تایبـەتی و دەیاننارده بارەگای جەنـگی روس لە ناوچەی قەفقاسدا و بەشێکیشیان دەگەیشـتە وەزارەتی دەرەوی روسیا لە پیترۆگراد . ئـەو راپۆرتە گرنـگانە کە ســەرچاوەیەکی یەکجار بایەخدار و رەسەنن بۆ مێژونوس لە ئارشیفەکانی سۆڤێتدا هەڵـگیراون و گەلێك لەکوردناسانی ئەو وڵاتە لە کارە زانستیـکانیاندا کەڵـکێکی یەکجار زۆریان لێ وەرگرتوە .

(٩) بڕوانە : م . س . ئیڤانۆف ، سەرچاوەی ناوبراو ، ل ٢٦٠ .

کۆمیتەیەکی هاوبەشیان لە نوێنەرانی هەردوو لایان پێك هێنا[10].

سەرەڕای هەموو ئەمانە خەباتی شۆڕشگێڕانەی گەلی کورد لە دواساڵەکانی شەڕی یەکەمی جیهاندا لە سنووری کوردستانیش چووە دەرێ و رۆشنبیرانی کورد لە هەر شوێنێك بوون دووبارە هاتنەوە ناو کۆڕی خەبات و کەوتنە هەوڵدان بۆ ئەوەی بە هەموو جۆرێك مەسەلەی کورد بێننەوە ناوەوە ، بە تایبەتی دوای ئەوەی وای لێ هات کۆتایی دەوڵەتی عوسمانی لە ئاسۆدا بە روونی ببینرێ . سورەیا بەدرخان بەر لە کۆتایی شەڕ بە ماوەیەکی کەم بە گورج و گۆڵی لە قاهیرە کەوتە خۆ و توانی کۆمەڵێکی سیاسی بۆ روون کردنەوەی مەسەلەی کورد دابمەزرێنێ و پەیوەندی لەگەڵ ئەو رۆشنبیرە کوردانەدا ببەستێ کە لە کاتی شەڕدا لە لایەن لەشکری ئینگلیزەوە بە دیل گیرابوون و نێررابوونە میسر و هیندستان[11] . سورەیا بەدرخان و هاوەڵەکانی نیازیان وابوو لە یەکێك لە شارەکانی ئەورووپادا کۆنگرەیەکی تایبەتی بۆ پیاوە سیاسیەکانی کورد ببەستن بۆ لێکۆڵینەوەی باری سیاسی نیشتمان و دوارۆژی لەبەر رۆشنایی ئەو رووداوانەدا کە هەموو

---

(10) بڕوانە :

"Всемирная история", т.VIII, Москва, 1961, стр.574.

« مێژووی هەموو جیهان» ، بەرگی ـ ٨ ـ ، مۆسکۆ ، ١٩٦١ ، ل ٥٧٤ .

(11) بەپێی ئەو زانیاریانەی مامۆستا ئیسماعیل حەقی شاوەیس بلاوی کردوونەتەوە رۆشنبیرە گیراوەکانی کورد لە هەندەران نیمچە رێکخراوێکی نەتەوەیی نهێنیان بۆ خۆیان دامەزراندبوو ( بڕوانە : « رۆژی نوێ » ، ژمارە ـ ٩ ـ ، کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٦٠ ، ل ٢٤ ـ ٢٦ ) .

ڕۆژهەڵاتی نزیك و ناوەڕاستیان لە قۆناغێکی مێژوویی نوێی نزیك خستبۆوە .

بەم جۆرە وەك دەبینین ڕوداو و کارەساتەکانی شەڕ و سیاسەتی دیکتاتۆری کاربەدەستانی تورکیا نەبونە هۆی وەستاندنی خەباتی گەلی کورد لە ساڵەکانی شەڕدا ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەم خەباتە بە هیچ کامێك لە ئامانجە گەورەکانی نەگەیشت و سەرەڕای باری سیاسی نێوان دەوڵەتان چەند هۆیەکی تریش بوبونە کۆسپی ئەو کارە کە هەموشیان لە ڕاستیدا ئەنجامی دواکەوتویی و نزمی ڕادەی تێگەیشتنی خەڵکی ئەو سەردەمەی کوردستان بون . بەر لـە هەمو شتێك ڕاپەڕینەکانی ئەو ساڵانەی کورد لە ڕێچکەیەکی تایبەتی یەکگرتودا کۆنەبونەوە تا بتوانن خۆیان لە بەردەمی هێزی دوژمندا بگرن و بەو جۆرە ئەنجامی گەورە بەدەست بهێنن . شایانی باسە لەگەڵ ئەوەشدا کە هەندێك لەو ڕاپەڕینانە لە یەك کاتـدا لە شـوێنی جیاوازی کوردستاندا دەقەومان کەچی سەردارەکانیان بیریان لە دامەزراندنی پەیوەندی و یەکگرتن نەدەکردەوە . سەرەڕای ئەوە سەرکردایەتی هیچ یەکێك لە ڕاپەڕینەکانی ئەو سەردەمەی کوردستان تاکتیك و ستراتیژێکی دیاریان نەبو ، بە وێنە بە نیسبەت شێخ مەحمودەوە هەستی ئایینی بەس بو بۆ ئەوەی لە سەرەتای شەڕدا دژی ئینگلیز چەك بۆ دوژمنـەکانی خۆی هەڵبگرێ ، ئەمە جگە لەوەی لـە کاتێکدا بە نامە و نامەکاری داوای یارمەتی لە ڕوس دەکرد لە هەمان کاتدا بە چەك هێرشی دەبردە سەر هێزەکانیان .

بەڵام لەگەڵ هەمو ئەمانەشدا پێویستـە دان بە بایەخ و گرنگی

خەباتی گەلی کورد لە ساڵەکانی شەڕدا بنێین کە بووە یەکێك لە هۆ یاریدەرەکانی هەرەس هێنانی بناغەی رژێمی عوسمانی و پەرە سەندن و پێشکەوتنی هەستی نەتەوەیی خەڵکی کوردستان و زیاتر جێگیر بوونی دروشمی ئۆتۆنۆمی و تەنانەت سەربەخۆیی کوردستان کە ئەمانەش هەموو رێگەیان بۆ قۆناغی نوێی دوای شەڕی خەباتی رزگاریخوازی گەلی کورد خۆش کرد .

لە هەمان کاتدا بەردەوام بوون و پەرەسەندنی خەباتی کورد لە ساڵەکانی شەڕی یەکەمی جیهاندا ئەوەندەی تر رقی فەرمانڕەوایانی تورکیایان لێ هەڵساندن و زیاتر رەگی رەگەزپەرستی بزواندن بە تایبەتی دوای ئەوەی لەوە دڵنیا بوون کە وا گەلی کورد بە دڵ شەڕیان بۆ ناکات و رۆڵەکانی پۆل پۆل ریزەکانی لەشکری عوسمانی بەجێ ئەهێڵن(١٢) و زۆر جار بە چەکەکانیانەوە دەدەنە پاڵ شۆڕشگێڕانی گەلەکەیان ، وە ئەوەی لە هەموو شتێك زیاتر رقی عوسمانیەکانی لە کورد هەڵساند ئەوەبوو ، وەك بە درێژی لە شوێنێکی تری ئەم باسەدا دەیبینن ، کە وا نەیانتوانی رۆڵەکانی بکەنە داردەستی خۆیان دژی کەمینە ئاینیەکانی دەوڵەتی عوسمانی وە بە تایبەتی گەلی ئەرمەنی دراوسێیان . بەم جۆرە چینە کاربەدەستەکانی تورکیا لەوە دڵنیا بوون کە وا گەلی کوردیان لە کیس چووە بۆیەکا لە دوا ساڵەکانی شەڕدا دووبارە بە نیازی تواندنەوەیان بە رەقی کەوتنەوە گیانیان و وایان

(١٢) تا کۆتایی شەڕ کار بەوە گەیشت لە ناو ریزەکانی لەشکری عوسمانیدا زۆر بە دەگمەن سەربازێکی کورد دەبینرا .

دەزانی ئەمە باشترین ڕێگەیە بـــۆ نەدۆزاندنی کوردستان ؛ شایانی بلـە لەمەدا ئەڵەمانەکانی دۆستیشیان هاوبیریان بوّن . کاربەدەســتانی تورکیا بۆ جێ بەجێ کردنی ئـــەم نیازەیان لە نزیـك کۆتایی شەڕدا چەند یاسا و فەرمانێــکیان دەرکرد بۆ پـــەرژ کردنـەوەی گەلی کورد بە ناو گوندە تورکەکاندا بە مەرجێك نیسبەتیان لە هیچ شوێنێك لە ٥٪ تا لە ١٠٪ی دانیشتوانی ناوچــــەکە تێپـەڕ نەکا و بڕیاریشیان وابوو سەرەك هۆز و پیاوماقوڵانی کورد بە دەستبەسەری بنێرنە شـــارەکانی ڕۆژئاوای ئەنادۆل و نەهێڵن بە هیـچ جۆرێك پەیوەندی لەگەڵ پیاوەکانیاندا ببەستن[١٣] . عوسمانیـکان بێ دواخستن بەر لە کۆتایی شەڕ کەوتنە جێ بەجێ کردنی فەرمان و یاساکانیان لەم لەرەیەوە و بەر لە هەموان کەوتنە گیانی ئەو هۆز و ســـەرەك هۆزانەی بە لایانەوە « لاســـار » بوّن و بۆیان دابـین نەدەکران و توانییان بە زۆری چەك بە هەزارەهایان لێ دوور بخەنەوە بۆ ناوچە هەرەکەلا و دوورەکانی ڕۆژئاوای ئەنادۆل . بەم جۆرە فەرمانڕەوایانی تورکیا لە ساڵەکانی شەڕدا توانییان دەوروبەری ٧٠٠ هەزار کەس لە کوردستان دوور بخەنەوە کە پتر لە نیوەیان لە ڕێدا لە برسانا مردن یان لە ســەرمانا ڕەق هەڵهاتن یان بە نەخۆشی لەناو چـوّن[١٤] و تەنها

---

(١٣) بلەچ شێرکوە ، سەرچاوەی ناوبراو ، ل ٦٠ .

(١٤) بڕوانە :
« Memorandum sur la situation des Kurdes.. », P.11;
=A. Safrastian, Op. Cit, pp. 76, 81; D. A. Shmidt,

ژمارەیەکی کەمیان ، ئەویش دوای شــەڕ ، توانییان بگەڕێنەوە مەڵبەندەکانی خۆیان ، ئەوانەشیان کە لەوێ جێگیر بوون ژیانێکی سەختی پڕ لە نەخۆشی و بێ کارییان دەبردە ســەر و لە ئەنجامی ئەوەشدا گەلێکی تریان لێ مردن[15] .

ســەرەڕای ئەوە لەشکری عوسمانی زوربەی هەرە زۆری دانیشتوانی دیاربەکر و مۆش و بتلیسی بە ناوی پێداویستی جەنگەوە دەربەدەر و ئاوارە کرد و ئەمانە بەشێکیان تەنانەت ناچار بوون پەنا بەرنە بەر شارانی وەك حەڵەب و مۆسڵ و بە سەرمای زستان و گەرمای هاوین لەسەر شەقامەکانیان بژین و لە برسانا لاشەی کەس و کاری مردوی خۆیان و کەلاکی ئاژەڵی لە برســا تۆپیوی ئــەو

---

Journey among brave men, Toronto, 1946, p. 52. =

بە پێی هەندێك سەرچاوە ئــەم ژمارەی ٧٠٠ هــەزارە لە فایــلەکانی « مهاجرە إدارەسی»ی ئەستەنبوڵدا هەیە ( بە وێنە بڕوانە لاپەڕە ٦٢ی کتێبەکەی بلەچ شێرکوە ) . هەرچۆنێك بێ رۆژنامەی « ســربستی » کە لە ئەستەنبوڵ دەردەچــو لە ژمارە ٣٠ی نیسانی ساڵی ١٩١٩یدا باســی چەند هەزار کوردێکی بڵاوکردبۆوە کە لە ساڵەکانی شــەڕدا بە زۆر دوور خرابونەوە بۆ هەندێك ناوچەی رۆژئاوای ئەنادۆل .

(١٥) ئەم بارە قورسەی ژیانیان زیاتر هانی دەدان هەرچۆنێك بێ بگەڕێنەوە کوردستان و ئەوەبــو دوای تەواو بونی شــەڕ بەکۆمەڵ داوایان لە کاربەدەستانی تورکیا کرد رێگەی گەڕانەوەیان بدەن و زۆریشیان بــۆ ئەوەی گوێ بدەنە بڕیاری قەدەغە کردنی گەڕانەوەیان بە دزییەوە دوای شــەڕ گــەرانەوە خاکی باووباپیرانیان ( بــڕوانە : عبدالعزیز یاملکی ، کوردستان و کرد إختلال لری ، جلد ١ ــ ، تهران ، ١٩٤٦ ، ص ٧١) .

ناوە بخۆن[١٦] .

کار بەوەشەوە نەوەستا ، هەزارەها رۆڵەی ناوچەکانی تری کوردستان بوونە قوربانی برسێتی و نەخۆشی و ماڵ وێرانی . بە وێنە دەوروبەری هەشت هەزار کەس لە نزیکەی دوازدە هەزار دانیشتوی تەنها بیست گوندی یەکێك لە ناوچەکانی کوردستانی تورکیا لە ماوەی شەش حەوت مانگی یەکەمی شەڕدا بە نەخۆشی مردن[١٧] . تەنانەت شوێنێکی وەك کوردستانی عیراقیش کە لە هەمو پارچەکانی تری کوردستان لە ئاگری شەڕ و کارەساتەکانی دورتر بو لەگەڵ ئەوەشدا بە هۆی شەڕەوە توشی مەینەتی و نەهامەتیێکی زۆر هات کە ئەمانە تەنها چەند نمونەیەکی کەمینی : ژمارەی دانیشتوانی شاری سلێمانی تاکوتایی شەڕ گەیشتە سێ یەکی ژمارەی پێش شەڕی و هەر بەو نیسبەتە و خراپتریش ژمارەی دانیشتوانی گوندەکانی دەوروبەری کەم بونەوە[١٨] . پتر لە نیوەی خەڵکی خانەقین هەر لەو ماوەیەدا لە تاو برسێتی و نەخۆشی و زۆرداری داگیرکەران ناچار بون شار بەجێ بهێڵن[١٩] ؛ وەزعی رەواندزیش

---

(١٦) گەلێك مێژونوس باسی زۆر روی ئەو دەرد و ئازارە بێ شومارەیان کردوە کە لە ساڵەکانی شەڕدا توشی گەلی کورد هاتوە ، مامۆستا ئەمین زەکی بەگی خۆشمان کە هەندێکی بە چاوی خۆی دیوە ، بە درێژی باسی کردووە ( بڕوانە : محمد أمین زکی ، سەرچاوەی ناوبراو ، ل ٢٨٠ - ٢٨٣ ) .

(١٧) م . س . لازەرێف ، سەرچاوەی ناوبراو ، ل ٣١٤ .

(١٨) C.J. Edmonds, Op. Cit, P. 81

(١٩) A. T. Wilson, Loyalites Mesopotamia, P. 266

زۆر لەوە باشتر نەبو[20] .

بەم جۆرە بە هەزارەها و بە سەدەها هەزار رۆڵەی کورد بونە قوچی قوربانی شەڕی یەکەمی جیهان ، مامۆستا ئەمین زەکی ژمارەی ئەو کەسانە بە دەوروبەری نیو ملیۆن لە قەڵەم دەدا[21] کە هیچ دوورنییە لەوەش زیاتر بوبێ [ بە پێی زانیارێکانی ناوکتێبەکەی دوکتۆر لازەرێف کە لە دەکومێنتە دیپلۆماسیکانی زەمانی چاری دەرهێناون ، خێزانی ٢٠ ـ ٣٠ کەسی زۆر ناوچە ژمارەیان لە ساڵەکانی شەڕدا هاتۆتە سەر سێ چوار کەس[22] ] . جگە لەوە کوردستان بە هۆی شەڕەوە ژیانی ئابوریشی لە بنەڕەتەوە هەڵتەکا کە یەکێك لە هۆ گرنگەکانی ئەوەش بریتی بو لە کز بونی هێزی کار لە کوردستاندا بەوەی لە لایەکەوە هەرچی رۆڵەی بەکاری هەبو نێررانە مەیدانەکانی شەڕ یا یاخی بون و دایانە کێو و لە لایەکی تریشەوە لەشکری عوسمانی دەستی بەسەر زوربەی وڵاغی ئەو ناوچانەدا گرت کە بەشێکی زۆری لەکاری کشتوکاڵدا بەکار دەهێنرا بۆیەکا تەنها پیاوی پیر و ئافرەت و منداڵ لە وەرزەکاندا کاریان دەکرد ، تەنانەت بەشێکی زۆر لەو پیاوانەش کە هێشتا بە بەریانەوە مابو ، لەبەر کەمێك داهاتی زیاتر گوندیان بەجێ دەهێشت و دەچونە شارە گەورەکان یا بنکە سەربازێکان و ئەو رێگەو بانانەی بۆ مەبەستی

---

(٢٠) بڕوانە : حسین حوزنی موکریانی ، سەرچاوەی ناوبراو ، ل ١١٤ .

(٢١) محمد أمین زکی ، سەرچاوەی ناوبراو ، ل ٣٨٠ .

(٢٢) م. س. لازەرێف ، سەرچاوەی ناوبراو ، ل ٣١٤ .

شەڕ دروست دەکران . لە ئەنجامی هەمو ئەم هۆیانەدا لە ساڵەکانی شـەڕدا زەوی و زارێـکی زۆر بەرەڵا کرا ـ تەنها لە کوردسـتانی عیراق نزیکەی لە صەدا پەنجای ئەو زەوی‌وزارەی بەر لە شەڕ دەچێنرا هەر وا بە نەکێڵراوی مایەوە . بەم جۆرە داهاتی کوردستان بە جارێك هاتە خوارێ و ئەو دەغڵ و دانە کەمەش کە بە هـــەزار کوێرەوەری و ئەمســەر و ئەو سەر دەهێزایە بەرهەم تا لەشکری عوسمانی بوەستایە بە خەڵـکی‌تر حەرام بو ، لەشـکریش یا زەوتی دەکرد یا بە نرخێـکی زۆر هەرزان و بە پارەی بێ « رصیـــد » دەیکڕی[٢٣] . وەزعی مەڕوماڵاتیش لەوە باشـــتر نەبو ، ئەویش یا لە ناو چو یا سەرباز و جەندرمەی تورك قڕی تێ خست ؛ تەنانەت مەڕوماڵاتی ئـــەو هۆزانەی کوردستانی تورکیاش کـــە پەنایان بردە بەر لەوەڕگاکانی ناوچەی هەولێر و موسڵ بەرگەی نەگرت و زۆری فەوتا[٢٤] و لە ئەنجامدا گرانییەکی بێ وێنە ڕوی کردە هەمو ماڵێك و هەمـو گوندێك و بازاری هەمو شـارێك کە خەڵـکەکەی زۆر جار ناچار دەبون بە گژوگیای دەشتودەر خۆیان بژێنن . نرخی حۆقەی گەنم لە شارێـکی وەك سـلێمانیدا کە بـە نیسبەت زوربەی

(٢٣) هەنـدێك لە دەوڵەتە شـەڕکەرەکان لە ژێر زەبری باری قورسی ئابوریاندا کەوتنە لێدانی دراوی بێ « رصید » .

(٢٤) بڕوانە :

« League of Nations . Question of the frontier between Turkey and Iraq », Geneva, 1924, P. 42.

شارەکانی تری کوردستانەوە لە ئاگری شەڕ دوور بوو و ژمارەیەکی کەم سەرباز و ئەفسەری تورکی تێدا بوو، گەیشتە لیرەیەکی زێڕ بۆیەکا وەك مامۆستا رەفیق حیلمی دەیگێڕێتەوە « نانی وشك و پاقلەی کوڵاویش بوو بە دەرمان و تەنیا خواپێداوەکان ـ ئەویش بە دەگمەن ـ دەستیان ئەکەوت ... » و « شاردنەوەی تەرمەی مردووەکان لە تەوانای بەلەدیەدا نەما » و هەندێك ئافرەت « بە فرۆتنی لەشیان» ماوەیەك بە کولەمەرگتی دەژیان[٢٥] .

بەم جۆرە چوار ساڵی شەڕی یەکەمی جیهان تەنها برسێتی و نەخۆشی و مردن و ماڵوێرانی و سەرگەردانتی بۆ کورد و کوردستان هێنا و وابزانم لە راستی دوور ناکەومەوە ئەگەر بڵێم هیچ گەلێکی تری رۆژهەڵاتی نزیك و ناوەڕاست بە رادەی ئەرمەن و ئاسووری و کورد بە هۆی شەڕەوە تووشی نەگبەتی و نەهامەت نەهات و لە هەمووشی سەیرتر ئەوەیە کە وا کاربەدەستانی تورکیا بە هەموو جۆرێك هەوڵیان دەدا دەستی بە خوێنی ئەرمەن سووربوویان بەسەر گەلی کوردی شەتەك دراو و زیندوی مردوودا بسوون ، وەك لە بەشی داهاتووی ئەم باسەدا بە درێژی دەیخەینە بەر چاو .

* * * * * *

---

(٢٥) رەفیق حیلمی ، سەرچاوەی ناوبراو ، بەرگی یەکەم ، ل ٣٠ ـ ٣٣ .

# بەشی پێنجەم

# کوردو کوشتاری ئەرمەن

ئەرمەن یەکێکە لە گەلە هەرە کۆنەکانی نـاوچەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست . وڵاتی ئەرمەن ، ئەرمینیا ـ ئەرمەنستان ، کەوتۆتە سەرۆ سەرچاوەکانی فوراتەوە ، لای گۆلی وانەوە ، واتە لەگەڵ کوردستاندا دراوسێیە . گەلی ئەرمەن هەر لە سەردەمی زووەوە خاوەنی دەوڵـەتی سەربەخۆ و زیاری تایبەتی پێشکەوتوی خـۆی بووە[1] . لـــایینی

(۱) یەکەم دەوڵەتی سەربەخۆی ئەرمەن سەدەی شەشەمی بەر لە دایك بوونی مەسیح دامەزراوە . لە سەردەمی کۆن و سـەدەکانی ناوەندا ئەرمەن خاوەنی زیاری گەشەداری خۆیان بوون کە جێگەیەکی دیاری لە زیانی زیاری رۆژهەلاتی ناوەڕاستدا هەیە .

مەسیحی لە سەدەی چوارەمەوە بە ناو ئەرمەندا بڵاو بۆتەوە .
ئەرمەنی یەکێکە لە زمانە هیندۆ ـ ئەورووپی بە سەربەخۆ دێرینەکان .

مێژوو و بەسەرهاتی کورد و ئەرمەن لە زۆر رووەوە لە یەك دەکەن . سەربەخۆیی وڵاتەکەیان زۆری نەخایاند ، دوای درێژاندنی کەوتنە ژێر دەستی بێگانەوە و خاکی نیشتمانیان بووە بەشێك لە وڵاتی رۆمان و چەند جارێك کەوتنە ژێر دەستی ئێرانییەکانەوە و ساڵی ٣٨٧ لە نێوان دەوڵەتی ساسانی ئێران و دەوڵەتی بیزەنتیدا دابەش کرا . لە سەرەتای سەدەی هەشتەمەوە ئەرمینیا بووە بەشێك لە دەوڵەتی عەرەبی ـ ئیسلامی . لە ناوەندی سەدەی یازدەوە دیسان کەوتەوە ژێر دەستی بیزەنتییەکان و ئینجا سەلجوقییەکان کە بوونە هۆی کەلێك مەینەتی بۆی . تەتەر و مەغۆلەکانیش لە ناوەندی سەدەی سیازدەدا کەلێك سەرگەردانی و کاولکارییان بۆی هێنا . لە نێوان سەدەی شازدە و هەژدەدا ئەرمینیا بووە یەکێك لە مەڵبەندە گرنگەکانی ناکۆکی و هەڵای داگیرکەرانەی نێوان تورکیای عوسمانی و ئێرانی سەفەوی و ئەمەش ئەوەندەی تر بووە هۆی دواکەوتنی ئەرمەن .
تەنها شا عەباسی سەفەوی بە دەیان هەزار ئەرمەنی لە خاکی دێرینی خۆیان دەربەدەر کرد[٢] . ساڵی ١٦٣٩ش ئەرمینیا بە یەکجاری دابەش کرا : ئەرمینیای رۆژهەڵات خرایە سەر دەوڵەتی سەفەوی و

---

(٢) هەر هەمان شا عەباس کەلێك هۆزی کوردی ئاوارە کرد .

ئەرمینیای رۆژئاواش درایە دەوڵەتی عوسمانی[٣] . لە ئەنجامی ژێرکەوتنی ئێرانا لە شەڕی ساڵی ١٨٢٦ ـ ١٨٢٨یدا لەگەڵ رۆسیا و بە پێی پەیمانی تورکمانچای ( ساڵی ١٨٢٨ ) ئەرمینیای رۆژهەڵات بوو بە بەشێك لە رۆسیا[٤] .

وەك دوو گەل و دوو نیشتمانی دراوسێ پەیوەندی نێوان کورد و ئەرمەن دەگەڕێتەوە سەردەمێکی زوو ـ سەردەمی میدێکان . بەڵام لە سەردەمی پەیـــدا بوونی ئاینی ئیسلامەوە و بە تایبەتی دوای ئەوەی ئەرمینیا وەك کوردستان بووە بەشـێك لە ئێـران و تورکیا ، ئـەو پەیوەندییە بە لایەنی چاك و خراپییەوە پەرەی سەند .

هەندێك هۆ هەبوون کورد و ئەرمەن ، یا چەند چینێکی ئەم دوو گەلەیان لە یەك دوور دەخستەوە ، هەندێکیش هەبـــوون لە یەکی نزیك دەخستنەوە . ئاینی یەکێك بوو لەو هۆیانەی لە یەکی دوور دەخستنەوە یا بە لای کەمەوە لە یەکی جیا دەکردنەوە . بەڵام لە سەرەتادا و تا ماوەیەکی زۆر ـ راستەکەی تاوەکو هاندەر پەیدا نەبوو ـ جیـاوازی ئاین نەبووە هۆی ناکۆکی و دووبەرەکی لە نێـوان ئەرمەن و

(٣) کوردستان هەر لەوە بە دوورووبەری سەدەیەك ، واتە لە ساڵی ١٥١٤دا بە سەر ئێرانی سەفەوی و تورکیای عوسمانیدا دابەش کرا .

(٤) هەر لەو سەردەمەشدا بەشێك لە میللەتی کورد کەوتە پاڵ رۆسیا و بەشی زۆری کوردەکانی ئیستەی سۆڤیەت نەوەی کوردەکانی ئەوسان .

کوردا یا لە نێوان ئەمان و گەلە گاورەکانی تری ناوچەکەدا[٥] .

هۆیەکی تری جیاکەرەوە لە پێشکەوتوتری ئەرمەنـەوە هاتبـوو . ئەم گەلە هەر زوو بە قۆناغی کۆیلایەتیدا تێپەڕی و بناغەی ژیاری و سەربەخۆیی تێدا دامەزراند . زۆر بەر لە کورد قۆناغی دەرەبەگیی بڕی و چەند جارێك لە سەدەکانی ناوەندا مۆڵەتی سەربەخـۆیی بـۆ هەڵکەوت . ئەدەبی پێشکەوتوو و نوسینی سەربەخۆی خۆی هەبوو[٦]. بەشێك لە نیشتمانەکەی لە بریتی دەوڵەتێکی ئاسیایی زۆر دواکەوتـوو ، کەوتە ژێر دەستی دەوڵەتێکی ئەورووپایی گەلێك پێشـــکەوتوتر . لەبـەر چەنـد هــۆیـەك ئەرمینیا زووتــر لە کوردستان تێکەڵی بازاڕی سەرمایەداری بوو و بـــەم هۆیەوە پەیوەندی نوێی لە

(٥) زۆر لەو نوسـەرانەی هەندەران کە باسی کوردیان کردووە ئەوەشیان بە تایبەتی تۆمار کردووە کە کورد گەلێکی دڵ فراوانی بێ تەعەسوبە و بە لایانەوە ئەمە کارێـکی وای کردووە ئاسوورێکان بتـوانن لە ماوەی صەدان ساڵدا ئایین و نەریتی خـۆیان لە ناوجەرگەی کوردەواریدا بپارێزن .

(٦) ئەرمەنەکان دوای ئەوەش کە فێری تورکی بوون و بە تورکی دەیاننوسـی ، هەر ئەلفبای خۆیان بۆ ئەو نوسـینەش بەکار دەهێنا . وەك دوکتۆر ئەســتارجیان باسـی دەکا بە دەرچـوونی یەکەم رۆژنامەی ئەرمەنـی لە ســاڵی ١٧٩٤دا ئەرمـەن بوونە دەیەمین میللەتی خاوەن رۆژنامە و لەمەدا تەنانەت پێش ئەمەریکا و تورکیاش کەوتن ( بڕوانە : الدکتور ك. اسـتارجیان ، تـأریخ الثقافة و الأدب الأرمني ، موصل ١٩٥٤ ، ص ١٣١ ) .

کۆمەڵگای ئەرمەندا بەر لە کۆمەڵگای کورد سەری دەر هێنا و بووە هۆی ئاڵوگۆڕی گەورە . هەر لە زۆرشەوە ، بە هۆی نیعمەتەجێ بوونی زۆری ئەرمەنەوە و داخستنی دەرگای کەمتوکاڵی لە بەردەمیدا تا رادەیەك ، جگە لە بازرگانی کاری پیشەسازی خۆماڵی « حرفي » لە کوردستاندا تا رادەیەکی زۆر کەوتە دەست وەستا ورد و شارەزاکانی ئەرمەن[7] ، بەشی زۆری دەرەبەگ و خاوەن زەوی و جوتیاری کورد بۆ ئامرازی بەرهەم هێنان و جووت و کەلوپەلی تری پێویست پەنایان دەبردە بەر ئەو وەستایانە . دوای ئەوەش کە کوردستان تێکەڵ بە بازاڕی سەرمایەداری بوو و پارە بووە هۆی هەرە گەورەی رێکخستنی پەیوەندی ، ئەرمەنی خاوەن پارە بوونە بلەترین سەرچاوەی قەرز دان ( سوو و سەلەم ) . چ دەرەبەگ و چ رەش و رووتی کوردستان کە پارەیان پێویست دەبوو دەچوونە لای ئەو خاوەن پارانە . بە دەگمەنیش رێك ناکەوێ قەرزاری وا خاوەن قەرزی لەو جۆرەی خۆش بوێ ، ئەو وەستا کوردەش کە بەرهەمەکەی

---

(٧) بە وێنە لە شارێکی وەك سیواسدا کە بەر لە کوشتارەکان ژمارەی ئەرمەن نزیکەی ٣٠٪ ی دانیشتوانی پێك دەهێنا لە ١٦٦ بازرگانی گەورە کە لە دەرەوە شتیان دەهێنا ١٢٥یان ئەرمەن بوون ، لە ٩٨٠٠ بازرگانی بچووك ٦٨٠٠یان ئەرمەن و لە ١٥٣ دووکانی پیشەسازی خۆماڵی ١٣٠یان هی ئەرمەن بوون . لە شارێکی وەك واندا ئەو نیسبەتە گەلێك لەوەش بەرزتر بوو ( بڕوانە : م. س. لازەرێف ، سەرچاوەی ناوبراو ، ل ٣٦ ) .

لەوانە نەبوو خۆی لە شانی بەرھەمی وەستایەکی ئەرمەنی بدا قەت نەیدەتوانی بە چاوی حەزەوە سەیری بکا. گەلێك جاریش بۆ ئەوەی نەکەونە ژێر باری قەرزەوە ئاغا کوردەکان لە رێگەی چەتەیی و تالانییەوە پارە و کەلوپەلی ئەرمەنەکانیان زەوت دەکرد.

جگە لەمانە بزووتنەوەی ئازادیخوازی رەوای گەلی ئەرمەن لەبەر چەند هۆیەك - وەك دوایی بە درێژی باسی لێ دەکەین - بۆ ماوەیەك بووە هۆی دروست بوونی مەترسی لە ناو کوردا.

بەڵام بەرامبەر بەمانە گەلێك هۆی تری کاریگەر لە ئارادا بوون کورد و ئەرمەن و بە تایبەتی کۆمەڵانی خەڵکی ئەم دوو گەلەیان لە یەك نزیك دەخستەوە. گەورەترین و گرنگترین هۆ لێرەدا بریتی بوو لەوەی داگیرکەر و چەوسێنەری هەردوو لا یەك بوون. چ کورد و چ ئەرمەن تا رادەیەکی زۆر وەك یەك لەو لاوە بە دەست شا سەفەوییەکان[٨] و لەم لاوە بە دەست سوڵتانە عوسمانییەکانەوە دەیانناڵاند. هەر ئەو شا عەباسەی بە هەزاران ئەرمەنی لە نیشتمانی خۆیان بێ بەری کرد، هەر ئەویش بوو لەوە زیاتری لە کورد ئاوارە کرد (پەراوێزی دوو). ئەو سوڵتانانەی دەرگای هەموو پێشکەوتنێکیان لە بەر دەمی کوردا داخستبوو هەر ئەوانیش بوون رەوڕەوەی پێشکەوتنی ئەرمەنیان ئەوەستاند. بێ گومان ئەمە هەست و ئاواتی ئەرمەن و کوردی یەك دەخست، هەرچەندە بە داخەوە لە سەرەتادا

---

(٨) بەر لەوەی ئەرمینیای رۆژهەڵات بێتە بەشێك لە رووسیا.

کورتبینتی کارێکی وای کرد سەردارەکانی ئەم دوو گەلە لە بایەخ و نرخی ئەو زروفە مێژوویی‌یە نەگەن ، بەڵام بەرە بەرە ـ وەك دوایی بلسی لێ دەکەین ـ ئەو راستی‌یە دەوری خۆی لە نزیك خستنەوەی ئەرمەن و کوردا بینی .

هەر بۆ ئەم مەسەلەیە هۆیەکی تری گرنگ کاری خۆی دەکرد ، کۆمەڵانی خەڵکی ئەرمینیا و کوردستانی لە یەك نزیك دەخستەوە . جوتیار و وەرزێری هەردوو گەل باج و سەرانەیان بە یەك خەزنە دەدا و فشاری ئەمە وەك یەك تا دەهات زیاتر دەکەوت لە سەریان . لێرەدا جێی خۆیەتی بە تایبەتی سەرنج بۆ چەند دێڕێکی بەڵگەیەکی مێژوویی کاتی خۆی رابکێشین . لە نامەیەکی نهێنی یەکێك لە سەردارە ئایینی‌یەکانی ئەرمەن کە لە مووشەوە رۆژی ١٣ی تەشرینی یەکەمی ساڵی ١٩١٢ لە بارەی وەزعی ئەرمەنەوە ناردوویە بۆ قەشەی گەورەی ئەرمەنە کاتۆلیکەکان باسی ئەوەشی کردووە چۆن وەرزێری ئەرمەن و کورد گیرۆدەی دەستی باج و باجگر بوون . لەو نامەیەدا دەڵێ : « لەگەڵ ئەو هەموو سەرگەردانی‌یەی تیایدان مەسەلەی زۆرداری مولتەزیمەکان زۆر بێ تاقەتی کردوین ، ئەوانەی بە بیاتوی دە یەکەوە « ضريبة العشر »[9] وەرزێری ئەرمەن و کورد تاڵان

---

(٩) هەر بە ناو دە یەك بوو ، ئەگینا بە رەسمی ٦٣ و ١٢./ی بەرهەم بوو و لە راستیدا زۆر لەوەش زیاتر بوو . بەشێکی زۆری ئەو مولتەزیمانەی دە یەکیان لە ئەرمینیا و کوردستاندا کۆ دەکردەوە دەسەلاتداری کورد بوون .

دەکەن[10] . ئەمانە کە بۆ چەند حەفتەیەك دەڕژێنە ناو زەوی و زاری (وەرزێرە ئەرمەن و کوردەکانەوە ـ ك. م.) ئەو گەنمەی پاك کراوە تایێون و داوای باجی زیاد دەکەن تا بەشی خۆیان وەردەگرن »[11] .

سەرەڕای ئەوە لەم سەدانەی دوایدا کار گەیشتە رادەیەك یەك ئاغا و یەك دەرەبەگ وەرزێری کورد و ئەرمەن بچەوسێنێتەوە . لە ژێر سایەی دەسەڵاتی عوسمانیـکاندا و بە تایبەتی بە هۆی سیاسەتی ناڕەوا و چەوتی سوڵتان عەبدولحەمیـــدی دووەمەوە رۆژ بە رۆژ دەســـەڵاتی ئاغا کوردەکان لە ناو گوندەکانی ئەرمـەندا زیاتر پەرەی دەسـەند و باج و سەرانەیان لە وەرزێرەکانیان دەسەند و هەر وا بە

---

(١٠) ئـەم نامەیە نهێنی و بە ئەرمەنی بووە و زیاتر بۆ باسی باری قورسی ژیانی ئەرمەن تەرخان کراوە ، بەلاّم لەگەڵ ئەوەشـدا خاوەنەکەی لەو شوێنەی نامەکەیدا نەیتوانیوە وەرزێری کورد و ئەرمەن لە یەك جیـا بکاتەوە .

(١١) بڕوانە :

"Геноцид Армян в Османской Империи",(Сборник документов и материалов под редакцией Проф. М.Г.Нерсисяна), Ереван, 1966, стр. 209-210.

« قەلاچۆی ئەرمەن لە ئیمپراتۆری عوسمانیدا . کۆکراوەی بەڵـگە و مەتریاڵ لە ژێر چاودێری پرۆفیسۆر م. گ. نێرسیسیان » ، یەریڤان ١٩٦٦ ، ل ٢٠٩ ـ ٢١٠ . (لەمەو دوا : « قەلاچۆی ئەرمەن لە ئیمپراتۆری عوسمانیدا ») .

گـــانی ، یا راستییەکەی « پڕ بە پێستی خـۆی » ناویان لێ نابوو « کافرانە » ! ! . زوربەی وەرزێرە ئەرمـەنەکانی ئەرمینیای رۆژئاوا ناچـار بوون جگە لە باجی زۆری میری ئەم سەرانەیەش بدەنە ئاغا کوردەکان و کار بەوە گەیی تەنانەت قەشـــە و پیاوە ئایینییەکانیش مەجبوور بوون بیـدەن . چەوساندنەوە و زۆرداری ئاغا کوردەکان بە نیسبەت وەرزێرە ئەرمەنەکانەوە تەنها بەوەوە نەوەستا ، جگە لە « کافرانە » گەلێك باج و ســـەرانەی دەرەبەگی تریان بە سەردا دلسەپاندبوون . تەنانەت هەندێك سەرچاوە باسی ئەوەیان کردووە چۆن لە هەندێك ناوچەدا شەوی بووکێنی کچە ئەرمەن بۆ ... ئاغای کورد بووە (!!)[12] .

لە راستیدا ئەوەی ئاغای کورد بە ســـەر وەرزێری ئەرمەندا فەرزی کردبوو تەنانەت زۆر لەوەش زیاتر بوو کە بە ســـەر وەرزێری کوردەوە بوو بوو بە بار . لەم بارەیەوە زرۆفیش یاریدەیەکی زۆری ئاغا کوردەکانی دەدا ، بە تایبەتی ئەوەی کە سوڵتان عەبدولحەمید بە ئاشکرا هانی دەدان و چاوی لە زوڵم و زۆریان دەپۆشی و تەنانەت یاریدەی مادی و مەعنەویشی دەدان بۆ ئەوەی زەوی و زاری ئەرمەنەکان زەوت بکەن[13] . جیاوازی ئایینیش ، واتە « کافرێتی » ئەرمەنەکان ،

---

(١٢) بڕوانە : م . س . لازەرێف ، سەرچاوەی ناوبراو ، ل ٣٣ .

(١٣) کوردی دەسەڵاتدار هەبوون کە سوو و سەلەمیان دەدا و لەو رێگەیەوە زەوی و زاری ئەرمەنەکانیان زەوت دەکرد .

ئەوەندەی تر دەستی زوڵمی ئەوانی درێژ کردبوو . لە هەندێ ناوچەدا کۆیلایەتی راستەقینە هەبوو ، وەرزێرە ئەرمەنەکان بە ناوی ئاغاکانەوە نووسرابوون ، وەك کۆیلە دەکڕران و دەفرۆشران . ئەکادێمی ف. گەردلێقسکی[14] کە جارەهای جار بەر لە شەڕی یەکەم و لە ساڵەکانی شەڕدا بە زۆر ناوچەی ئەرمینیا و کوردستاندا گەڕاوە و بە چاوی خۆی باری قورسی ژیانی ئەرمەن و زۆرداری بێ ئەندازەی دەرەبەگی کوردی دیوە ـ نووسیویەتی دەڵێ : « ئەرمەنی لە زەوی کوردا دەژیا ، وەك کۆیلە دەکڕدرا و دەفرۆشرا ؛ دەبوو کار بۆ دەرەبەگی کورد بکات و قەت بە بیریا نەدەهات ئازادی لە شوێنێکدا هەبێ ، هەرچی کۆیلایەتی و ژێردەستەیی بوو بە لایەوە ببوە ژیانێکی ئاسایی »[15] .

دیارە ئەم هەموو زوڵم و زۆرداری‌یە ، کۆیلایەتی ، زەوت کردنی زەوی و زار بووبوونە هۆی دروست بوونی رقێکی گەورە و رەوا لە

---

(14) ئەکادیمی ف. ا. گەردلێقسکی (1876-1956) یەکێکە لە تورکناس و رۆژهەڵاتناسە هەرە گەورەکانی سۆڤێت و جیهان ، خاوەنی نزیکەی 300 کاری زانستی‌یە لە بارەی تورکیاوە و هەموو ژیانی بایەخی خۆی هەیە .

(15) Академик В.А.Гордлевский, Избранные Сочинения, том III, (История и Культура), М., 1962, стр. 127.

ف. ا. گەردلێقسکی ، کارە هەڵبژاردەکانی ، بەرگی سێیەم ، مۆسکۆ 1962 ، ل 127 .

دلی کۆمەڵانی خەڵـــکی ئەرمەنستاندا بەرامبــەر دەرەبەگ و دەرەبەگایەتی کورد و ڕێبەکی ئاگری ئەو رقە جار و بار بە هۆی هاندەرەوە تەنانەت پەیوەندی نێوان هەردوو گەلیشی دەگرتەوە . هەر هەمان گەردلێفسکی لەم بارەیەوە دەڵێ : « کاربەدەسـتانی دەرەبەگە کوردەکانیان فێر دەکرد بە چاوی مانگای دۆشەنی « بقرة حلوب » سەیری ئەرمەن بکەن . هەرچی مێرێتیش بۆ لەودیو پەردەوە سەیری ئەمەی دەکرد چونکە دوژمنایەتی کورد و ئەرمەن لە مەسلەحەتی بۆ » ، بۆیەکا ـ وەك دەڵێ ـ هەمیشە پەیڕەوی سیاسەتی « فرق تسد »ی لەگەڵ دەکردن[16] .

بێ گومان هەموو لێکۆڵینەوەیەکی زانستییانەی پەیوەندی نێوان کورد و ئەرمەن لە سەردەمی نوێ و هەرە نوێدا پێویستی بە ڕەچاو کردنی ئەم دوو لایەنە هەیە ، واتە ئەو هۆیانەی ئەرمەن و کوردیان لێك نزیك و ئەوانەی لێك دوور دەخستنەوە . ڕەچاو کردنی ئەمەش لە هەموو شتێکی تر بۆ کاتی لێکۆڵینەوەی دەوری کورد لە کوشتاری ئەرمەنەکاندا پێویستە ، چونکە لە ڕاستیدا چەند هۆیەك ـ وەك لە دواییدا باسی دەکەین ـ کارێکی وایان کرد کوردیش تا ڕادەیەك تێکەڵی ئەو کوشتارانە بین . ئەم مەسەلەیەش کە لە ساڵەکانی شەڕی یەکەمی جیهاندا گەیشتە بەرزترین پلەی ، بایەخێکی مێژوویی گەورەی هەیە هیچ نەبێ چونکە کورد زیاد لە پێویست و واقیع تاوانبار

---

(16) هەمان سەرچاوە ، ل ١٢٦ ــ ١٢٧ .

کراوە و ئەو کوشتارانە تا رادەیەك بونەتە هۆی زڕاندنی ناوی لە ئەوروپادا . زوربەی ئەو نوسەرە رۆژئاواییانەی باسی « خوێنڕێژی » و « چەتەگەری » و « دڕندەیی » کوردیان کردووە ئەم مەسەلەیە کاری تێ کردون ، ئەویش چونکە تاوەکو ئیستە بە تەواوی نەخراوەتە ناو چوارچێوەی راستەقینەی خۆیەوە ، بۆیەکا وا لێرەدا بە پێی توانا بایەخی پێ دەدەین .



ئەرمینیای رۆژهەڵات هەر کە بو بە بەشێك لە روسیا ، لە ئەرمینیای رۆژئاوا و بەڵکو لە هەمو بەشەکانی تری دەوڵەتی عوسمانی زیاتر کەوتە پێشکەوتن و گەشە کردن . ئەمەش کارێکی زۆر ئاسایی بو ـ مەودای گەشە کردن و پێشکەوتن لە ژێر سایەی دەوڵەتێکی ئەوروپاییدا زیاتر بو وەك لە ژێر سایەی دەوڵەتێکی ئاسیایی دواکەوتودا . ژیانی رۆناکبیری ئەو بەشەی ئەرمینیا خێراتر کەوتە سەر باری پێشکەوتن[17] . هەر ئەم بەشە زۆر خێراتر لە ئەرمینیای رۆژئاوا تێکەڵی بازاڕی سەرمایەداری بو و لە بناغەی کۆمەڵگاکەیدا پەیوەندی وچین و دەستەی نوێی سەریان هەڵدا ، بە تایبەتی چونکە کشتوکاڵ و پیشەسازیش هەر لە ئەنجامی ئەوەدا خێراتر کەوتنە گەشە کردن . بۆ نمونە لە ماوەی دە ساڵدا

(١٧) بناغەی زۆر لە ئۆپێرا و شانۆ و مۆزەخانە و کتێبخانەکانی ئەرمینیا و ئازەربایجانی سۆڤییەتی هەر لە سەرکەوتنی شۆڕشی ئۆکتۆبەر دانراوە .

(له ساڵی ۱۸۸۰ەوە تا ساڵی ۱۸۹۰) بەرهەمی مس لە ئەرمینیای رۆژهەڵاتدا پێنج جار و نیو زیادی کردو لە ماوەی شازدە ساڵی داهاتودا شەش جاری تر زیادی کرد . بەرهەمی کۆنیاك لە ماوەیەکی کەمدا دەور و بەری چل ئەوەندە زیادی کرد و لەگەڵ شەرابی ئەرمەنیدا رۆی کردە گەلێك بازاڕی دەرەوە. پیشەسازی قوماشی لۆکەش زۆر بە خێرایی پێش‌کەوت[۱۸] . لە ڕوی کارگێڕیشەوە دوای ئەوەی لە حوزەیرانی ساڵی ۱۸٤۹دا حاکیەتی یەریڤان دامەزرا باری زمان و دەوری ئەرمەن گەلێك لە جاران باشتر بو .

بەم جۆرە جگە لە ئاینی لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەوە هۆیەکی بزوێنەری گرنگی تر هاتە کایەوە بۆ ئەوەی ئەرمەنەکان چاو بېڕنە روسیا و زیاتر لە جاران بە رق و کینەوە سەیری سیاسەتی سوڵتانە عوسمانیەکان بکەن . ساڵێك زیاتر بە سەر ئەوەدا تێنەپەڕی کە ئەرمینیای رۆژهەڵات بووە بەشێك لە روسیا کاتێك دەوروبەری ۹۰ هەزار ئەرمەن سنوری دەوڵەتی عوسمانیان بڕی و چونە ئەودیو . گەلێك لە سەردارەکانی ئەرمەن بەر لەوە و دوای ئەوەش بە نامە و لە زۆر رێگەی ترەوە داوایان لە چارەکانی روسیا دەکرد دەستی یارمەتی

(۱۸) دیارە ئەمە وا ناگەیێنێ کە وا باری زمانی ئەرمەن لە ژێر سایەی چارەکانی روسدا باش بووە ، بەلام هەرچۆنێك بێت زۆر لە باری زمانی ئەرمەنەکانی ناو دەوڵەتی عوسمانی باشتر بووە و ئەم بەڵگانەش تەنها بۆ رۆن کردنەوەی ئەو راستیەن کە بۆ خۆی دەوری لە دروست کردنی کوشتاری ئەرمەندا بینیبوە .

هەمەجۆر بۆ ئەرمەنەکان درێژ بکەن . لە کاتی ئەو شەڕانەشدا کە لە نێوان ڕوسیا و دەوڵەتی عوسمانیدا ڕویان دەدا ئەرمەنەکان هەمیشە لایەنی لەشکری ڕوسیان دەگرت[19] . لە کاتی شەڕی سالی ١٨٧٧ ـ ١٨٧٨دا گەلێک ئەرمەنی بە چەکەوە دایانە پاڵ لەشکری ڕوس و زۆر یارمەتی بەکەڵکیان پێشکەش کرد .

ڕوسیاش لە لایەنی خۆیەوە درێغی نەدەکرد ، چاوی تەماعی بڕیبووە ئەم بەشەی تری ئەرمینیا و بە هەمو جۆر دەیویست هەستی خەڵکەکەی زیاتر بە لای خۆیدا رابکێشێ . لە کاتی شەڕی سالی ١٨٢٨ ـ ١٨٢٩ی نێوان تورکیا و ڕوسیادا لەشکری ئەمیان بەشێکی زۆری لە ئەرمینیای ڕۆژئاوا بە قارص و ئەرزرۆمەوە داگیر کرد ، بەلام بە پێی پەیمانی ئەدریانۆپڵی سالی ١٨٢٩ ناچار بو بیانگێڕێتەوە بۆ دەوڵەتی عوسمانی . زۆری نەخایاند دیسان هەمان هەل بۆ ڕوسیا هەڵکەوتەوە ، دوای شەڕی سالی ١٨٧٧ ـ ١٨٧٨ قارص و چەند ناوچەیەکی تری ئەرمینیای ڕۆژهەلاتی پێ درا . بە پێی پەیمانی نهێنی سایکس ـ پیکۆش (١٩١٦) هەمو ئەرمینیای ڕۆژئاوا بۆ ڕوسیا تەرخان کرابو .

ئەمە ، واتە مەیلی ئەرمەنی بە لای ڕوسیادا و هەوڵ و کۆششی

---

(١٩) زۆر جاریش هۆزی چەکداری کورد داویانەتە پاڵ لەشکری ڕوس و گەلێک جاریش سەردارە کوردەکان دژی دەوڵەتی عوسمانی پەنایان بردۆتە بەر ڕوسیا و داوای یارمەتیان لێ کردووە .

رووسیا بۆ داگیرکردنی ئەرمینیا ، رقی فەرمانڕەوایانی دەوڵەتی عوسمانی بە جارێك لە ئەرمەن هەڵساندبوو ؛ لە بریتی ئەوەی کارێکی وا بکەن بە یەخستنی ئەرمینیا دڵی ئەرمەنەکان بەلای خۆیاندا رابکێشن بۆ هەڵێك دەگەڕان پەل و پۆیان بکەن . پەیدا بوون و پەرە سەندنی بزووتنەوەی رزگاریخوازی ئەرمەن ئەوەندەی تر بووە هۆی قووڵ بوونەوەی ئەو رقە .

لە هەردوو پارچەی ئەرمینیادا هۆی دروست بوون و بەهێز بوونی بزووتنەوەی رزگاریخوازی گەل لە ئارادا بوو . لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەدا ئەم بزووتنەوەیە لە ئەرمینیای رۆژئاوادا زۆر بەهێز بوو و لە چەند راپەڕینێکی چەکدارانەدا خۆی نواند . ساڵی ١٨٦٢ جوتیارەکانی ناوچەی زەیتون راپەڕینێکیان دژی جەور و ستەمی عوسمانێکان بەرپا کرد . ساڵانی ١٨٧٨ و ١٨٨٤ خەڵکی هەر ئەم ناوچەیە دوو جاری تر راپەڕینەوە . ساڵی ١٨٨٦یش خەڵکی وان راپەڕین . عوسمانێکان زۆر بە توندی ئەم راپەڕینانە و هەموو بزووتنەوەیەکی تری ئەرمەنیان وەك گەلەکانی تری ژێر دەستیان دادەمرکاندەوە .

یەکێك لەو هۆیانەی ئەرکی دامرکاندنەوەی ئەو راپەڕینانەیان ئاسان دەکرد لاوازییان بوو لە رووی رێکخستنەوە . ئەوە پاڵی بە رووناکبیرە دووربینەکانی ئەرمەنەوە نا بکەونە سەر بیری دامەزراندنی رێکخراوی تایبەتی خۆیان و لەمەشدا تا رادەیەك رێبازی گەلانی

تر کاری تێکردن . بەم جۆرە ساڵی ١٨٨٧ حیزبی « هنچاك »
(زەنگی کڵێسە « ناقوس ») و دوای ئەوەش بە سێ ساڵ حیزبی
« داشناق » (یەکیەتی) دامەزرێنران کە وەك دواتر باسی دەکەین
دەورێکی دیاریان لە مێژووی نوێی ئەرمینیادا بینی .

خەبات و راپەڕینەکانی گەلی ئەرمەن هەر وا بێ ئەنجام نەبوون .
لە لایەکەوە بوونە هۆی بەرز بوونەوەی هەستی نەتەوەیی کۆمەڵانی
خەڵکی ئەرمینیا ، لە لایەکی تریشەوە مەسەلەی ئەرمەن بووە یەکێك
لەو مەســـەلانەی دەوڵەتە گەورەکان بایەخیان پێ دەدان ، ئەویش
بەتایبەتی چونکە دەیانزانی لەو رێگەیەوە دەتوانن زیاتر دەست بخەنە ناو
کاروباری دەوڵەتی عوسمانی یەوە . بەم جۆرە مەسەلەی ئەرمـەن وای
لێ هات لە کۆنگرە و پەیمانە دەوڵەتیەکاندا باس دەکرا . بەندی
شازدەی پەیمانی « سان ستێفانۆ » (شوباتی ١٨٧٨) کە کۆتـایی بـە
شەڕی نێوان رووسیا و تورکیا هێنـا ، بۆ مەسەلەی ئەرمەن تەرخان
کراوە . لەو بەندەدا بە تایبەتی باسی چاك کردنی کاروباری کارگێڕی
ئەو پارچەیەی دەوڵەتی عوسمانی کراوە . دوا بە دوای ئـەوە کاتـێ
لە حوزەیران - تەمووزی هەمان ساڵـــدا[٢٠] کۆنگرەی بەرلـین

---

(٢٠) پەیمانی « سان ستێفانۆ » تەنها لە نێوان رووسیای سەرکەوتوو و تورکیای
ژێرکەوتوودا مۆر کرا و بووە هۆی هەرا و هۆریای دەسەڵاتی یەکەمیان
بە تـایبەتی لە ناوچـەی بەلکاندا . بێ گـومان دەوڵەتـە گەورەکانی
تر بەمە نیگەران بـوون و رووسـیایان ناچـار کرد لە کۆنگرەی
بەرلیندا بەشدار بێت و بەو جۆرە توانییان تا رادەیـەك لە دەسکەوتە=

کیرا و ژمارەیەکی زۆر لە دەوڵەتە ئەورووپاییەیە گەورەکان ( بەریتانیا و ڕوسیا و ئەڵەمانیا و فەرەنسا و نەمسا ) و تورکیا و نوێنەری ژمارەیەك لە دەوڵەت و گەلانی بەڵقان تێیدا بەشدار بوون ، گەورەی هەموو کڵێسەکانی ئەرمەنیش بە تایبەتی هاتە بەرلین بۆ بەشداری کردن لەو کۆنگرەیەدا . هەرچەندیش ڕێگەی ئەو نوێنەرە نەدرا لە کۆبوونەوەکانی کۆنگرەکەدا ئامادە بێت[21] بەڵام بەندی ٦١ی ئەو ڕێککەوتننامەیەی لە ئەنجامیدا مۆر کرا دیسان بۆ مەسەلەی ئەرمەن تەرخان کرا و بە پێی ئەو بەندە دەبوو تورکیا ئیسلاحاتی کارگێڕی لە ئەرمینیادا بکات و زیاتر ڕێگەی ئەرمەنەکان بدات کە خۆیان ئەرکی بەڕێوەبردنی کاروباری ناوچەکەیان بگرنە ئەستۆ و جیاوازی لە نێوان ئەوان و موسڵمانەکاندا نەمێنێ . هەرچەندە ڕێککەوتننامەی بەرلین تا ساڵی ١٩١٢ لانەبرا بەڵام بەندی ٦١ی یەکێك بوو لەو بەندانەی کە جێبەجێ نەکران . دوای « سان ستێفانۆ » و « بەرلین » چەند جارێکی تر دەوڵەتە گەورەکان مەسەلەی ئەرمەنیان هێنایە ناوەوە و دەیانویست ـ هەر وەك و تیان ـ

---

= زۆرەکانی « سان ستێفانۆ »ی کەم بکەنەوە . بۆ ئەم باسەی ئێمە گرنگە ئەوەیە کە مەسەلەی ئەرمەن لە هەردووکیاندا باس کرا .

(٢١) جگە لە نوێنەری ئەرمەن ڕێگە بە چەند نوێنەرێکی تریش نەدرا لە کۆبوونەوەکانی ئەو کۆنگرەیەدا بەشداری بکەن ، بەڵام هاتنی ئەو نوێنەرە و ئەو پەیوەندییانەی لە بەرلین کردنی بۆ خۆی دەسکەوتێکی باش بوو بۆ ئەرمەنەکان .

لە ڕێگەیەوە زیاتر دەست بخەنە ناو کاروباری دەوڵەتی عوسمانییەوە. ئەمەش بۆ خۆی زیاتر ئەرمەنەکانی هان دەدا دژی سیاسەتی چەوتی ئەو دەوڵەتە بوەستن و بۆ سەربەخۆیی هەوڵ بدەن و پەیوەندی لەگەڵ زۆر لایەندا ببەستن.

بەم جۆرە مەترسی جیابونەوە و لە کیس چونی ئەرمینیای ڕۆژئاواش پەیدا بو. فەرمانڕەوایانی دەوڵەتی عوسمانی زۆر بەمە نیگەران بون، بە تایبەتی دوای ئەوەی کەلە گاورەکانی تری ژێر دەستیان یەك لە دوای یەك لە ئەنجامی خەباتی خۆیان و بە هۆی یاریدەی دەوڵەتە گەورەکانەوە توانییان خۆیان لە حوکمی دواکەوتویان ڕزگار بکەن. بەڵام ئەوان دەرسیان لە مێژو وەرنەگرت و لە ڕاستیشدا ئامادەی وەرگرتنی ئەو دەرسە نەبون. بۆیەکا لە بریتی چاك کردنی باری ژیانی ئەرمەن و نەهێشتنی چەوساندنەوە و زوڵم و زۆری نەتەوەیی و ئایینی بە سەریانەوە کەوتنە پەیڕەوی کردنی سیاسەتێکی توند و تیژتر لە جاران بەرامبەریان. ئەم سیاسەتە لە سەردەمی فەرمانڕەوایی سوڵتان عەبدولحەمیدی دوەمدا (١٨٧٦ - ١٩٠٩) بە جارێك ڕوَن و ئاشکرا بو. خولیای قەلاچۆ کردنی ئەرمەن کەوتبوە کەلەی سوڵتان عەبدولحەمیدەوە، بە تایبەتی دوای ئەوەی پان ئیسلامیزمی بۆ مەبەستی تایبەتی خۆی و دەستە و دایرەکەی کردبوە دروشمی سەرەکی سیاسەتی دەوڵەت. هەر لەبەر ئەوە و چەند هۆیەکی تر بو سوڵتان عەبدولحەمید دەیویست ناوچە

ئەرمەنییەکانی سەر سنووری ڕووسیا بە موسڵمان بتەقێ[٢٢] .

زۆری نەخایاند سـولتان کەوتە قەلاچۆ کردنی ئەرمەنی بێ تاوان . یەکەم کوشتاری دڕندانە لە ئاب و ئەیلوولی ساڵی ١٨٩٤ دا لە ناوچەی ساسۆن ڕووی دا کاتێك سەرباز و جاندرمـە و دەسـتەیەك چەتە کەوتنە گیانی گەورە و بچووك و ژن و پیاوی ئەم ناوچەیە و لە ماوەیەکی کەمدا ٤٠ گوندیان کاول کرد و دەوروبەری دە هـەزار کەسـیشیان کوشت[٢٣] . دوا بـە دوای ئەمـە بـە سـاڵێك کوشتارێکی تر دەستی پێ کرد ، بەڵام کوشتاری ئەمجارەیان گشتی بوو . لە ئەیلوولی ساڵی ١٨٩٥دا لە پایتەخت ، لە شاری ئەستەنبوڵدا پیاوەکانی سولتان کەوتنە گیانی ئەرمەن و ژمارەیەکی زۆریان لێ کوشـتن و گەلێکیان لێ لە بەندیخانە توند کردن . ئینجا کوشتار کەوتە ناو شارەکانی ئەرمینیای ڕۆژئاواوە و ئەو شارانەی ئەرمەنیان تیا دەژیا ـ تەرابزۆن و ئەرزرۆم و مەرعەش و وان و دیاربەکر و گەلێکی تر . وا لێرەشدا تەنها چەند نموونەیەکی کەم دەهێنینـەوە بۆ ئەوەی ڕووی ڕەش و دڕندەیی بێ ئەندازەی ئەو کوشـتارانە بخەینە بەر چاو تا

(٢٢) هەر لە سـەردەمی سولتان عەبدولحەمیدا هەوڵی جێ بە جێ کردنی ئەمـە درا . کۆنسۆلی گشتی ڕووسیا لە بێرووت لە نامەیەکی نهێنیدا کە ڕۆژی ١٢ی ئەیلوولی ساڵی ١٨٩٨ بۆ باڵیۆزی ڕووسیای لە ئەستەنبوڵ ناردووە باسی ئەمەی کردووە ( بڕوانـە : « قەلاچۆی ئەرمەن لە ئیمپراتۆری عوسمانیدا » ، ل ١٤٠ ) .

(٢٣) بڕوانە : « قەلاچۆی ئەرمەن لە ئیمپراتۆری عوسمانیدا » ، ل VII .

## باشتر لە چوارچێوەی مەسەلەکە بگەین

لە شاری ئەســـتەنبۆل و لە ماوەی تەنها دوو رۆژدا نزیکەی ٥٠٠٠ ئەرمەنی کوژران[٢٤] و تەنانەت گەلێك گاوری تریشـــیان هەر بە ناوی ئەرمەنەوە لەناو برد . وەك لە « کتێبی زەرد »ی[٢٥] فەرەنساییدا باسی دەکات کوشتاری ئەرمەن لە دیاربەکردا سێ رۆژی رەبەقی خایاند ( لە رۆژی یەکی تەشـــرینی دووەمی ١٨٩٥ەوە ) . لەم شارەدا بە دەم « سەڵەوات دان »ەوە دەوری ســـێ هـەزار کەس کوژران و نزیکەی ١١٩ گوند کاول کران و تەنها لە ناو شـــاردا دەس‌درێژی کرایە ســـەر ناموسی پەنجا ئافرەت و لە دەرەوەی شار کار بە پەنجاشەوە نەوەستا . پیاوکوژ و جەردەکان یەکێك لەو سێ رۆژەیان تەرخان کرد بۆ دوکان و بازاڕەکانی ئەرمـەن و بە ئارەزوی خۆیان کەوتنە کوشتن و بڕین و تالانی . هەر هەمان « کتێبی زەرد » خەسارەتی ئەرمەنەکان بە ٢ ملیۆن لیرەی تورکی لە قەڵەم دەدا . لەو کتێبەدا باسی کوشـتاری شاری سێواسیش کراوە کە ژمارەی کوژراوەکانی تا ١٢ای تەشرینی دووەم خۆی داوە لە دەوروبەری هەزار کەس و لاشەی دوو سەد سێ سەدێکیان هەر وا لە یەکێك لە خانەکانی شاردا فڕێ درابوون . وەك یەکێـکی ئاگادار گێڕاویێتەوە زوربەی

---

(٢٤) هەندێ سەرچاوە کوژراوەکانی ئەستەنبۆل بە ١٥ هەزار لە قەڵەم دەدەن ( بە وێنە بڕوانە : قاتر النصين ، للذابح في أرمينيا ، الطبعة الثانية ، بيروت ، ص ١٠ ) .

(٢٥) « الكتاب الاصفر » .

کوژراوەکانی سیواس بە قیمەکێش و دار و ئاسن و خەنجەر و ئەو جۆرە شتانە کوژراون . وا دیارە بیاوکوژەکان دڵیان نەهاتووە گوللە بە خەسارە بدەن (!!) . هەمان کوشتار و تاڵانی و کلولکاری دڕندانە زۆر ناوچەی تری گرتەوە و بۆ ساڵی داهاتوش دووبارە بووەوە . بە پێی نامەیەکی نهێنی باڵیوزی رووسیا لە ئەستەنبوڵ کە بۆ وەزیری هەندەرانی رووسیای ناردووە لە ئەنجامی ئەو کوشتارانەدا تەنها هەتیوی ژمارەیان گەیشتۆتە ٥٠ هەزار منداڵ[٢٦] .

ئەم کارانە کە لە مێژوودا وێنەیان کەم دەبینرێ بە جارێک دڵی ئەرمەنیان لە رژێمی عوسمانی بە گشتی و لە حوکمی سوڵتان عەبدولحەمید بە تایبەتی کرمی کرد . نیشتمانپەروەرەکانی ئەرمەن بە دڵ کەوتنە پشتگیری کردنی هێزە سیاسیبە ناحەزەکانی رژێمی عەبدولحەمید و زۆریان کەوتنە یارمەتی دانی بزووتنەوەی تورکە لاوەکان کە « حورییەت و عەدالەت و مساوات »ی کردبووە دروشمی خۆی و گەورەکانی باسی برایەتی و یەکسانییان دەکرد[٢٧] جاری وا بووە

---

(٢٦) بڕوانە : « قەلاچۆی ئەرمەن لە ئیمپراتۆری عوسمانیدا » ، ل ٩٥ ، ١٠٧ ، ١١٥ ـ ١٢٢ ، ١٣٧ ، ١٣٩ و گەلێکی تر .

(٢٧) ریتشارد رۆبنسن بە کورتی و بە وردی چوارچێوەی ئەم مەسەلەیەی دیار کردووە کە دەڵێ : « تورکە لاوەکان لە لایەن کۆمەڵە شۆرشگێرەکانی ئەرمەن و کورد و هی ترەوە پشتگیری کران و یارمەتی دران چونکە بە یەک رادە ( واتە وەک تورکە لاوەکان ـ ک. م. ) گەونی سوڵتانی تورکیان مەبەست بوو هەرچەندە لەوانەیە هۆی هاندەریان

ئەو گەورانە لە ترسی پیاوەکانی سوڵتان عەبدولحەمید لە نــاو ئەرمەنەکاندا خۆیان شاردۆتەوە . گەلی ئەرمەن ، وەك هەمــوو گەلەکانی دەوڵەتی عوسمانی ، زۆر بە گەرمی پێشوازی سەرکەوتنی شــۆڕشی تــورکە لاوەکانی کرد ( تەموزی ١٩٠٨ ) . بەڵام زۆری نەخایاند کە رووی راستەقینەی رژێمی نوێش کەوتە روو و ئەرمەن دیسان بوونەوە بە یەکەم قوربانی . هەمــووی ســاڵێك بە ســەر دامەزراندنیدا وەرنەچەرخا کاتێك بە جۆرێــکی خراپتر پەنــای بردەوە بەو سیاسەتەکەی سوڵتان عەبدولحەمید و لە نیسانی ساڵی ١٩٠٩دا کوشتارێــکی نوێی لە شاری ئەدەنە رێــکخســت و بووە هــۆی لە ناو بردنی . . . تەنها ٣٠ هەزار کەسی بێ تاوان .

سەیر ئەوەیە کاربەدەستان بە ناوی سزا دانی تاوانبارانی ئـەم کوشتارەوە و گوایە بۆ ئەوەی « عەدالەت »ی درۆشمیان کوێر نەبێتەوە کەوتنە گرتن و پرسینەوە کە ئەنجامەکەی بەم جۆرە بوو : لە شاری ئەدەنە ١٥ کەس گران بە سێدارەدا ، بەڵام شەشیان ئەرمەنی بوون . نۆ کەسی تر درانە دادگە ، بەڵام تەنها .. یەکێکیان موسڵمان و ئەو هەشتەکەی تریان ئەرمەنی بوون (١١) . لەوەش ســەیرتر : موسڵمانەکە تەنها هەش مانگ حوکم درا و ئەرمەنەکانیش یەکی لــە پێنجەوە بۆ دە ساڵ . دوای ئەوە ٣٦٢ کەسی تر گیران کە تەنها . .

---

( Richard D. Robinson, The first Turkish « جیا بوو بێت = Republic. A case study in national development, Cambridge, 1963, p. 6 ) .

دو صەد و سیازدە کەسیان گاور بوون (١١١)[٢٨].

ئەمانە هەموو سەرەتای کار و نیشانەی نیازی خراپی رژێمی نوێی بوون بەرامبەر گەلەکانی ئیمپراتۆری عوسمانی . بەڵام ئەم نیازە دیسان لەبەر چەند هۆیەك بەرامبەر بە ئەرمەنەکان توند و تیژتر خۆی نواند . ئەرمەنەکان ، وەك هەموو گەلانی تری ناو دەوڵەتی عوسمانی ، هەڵگیرسانی شەڕی یەکەمی جیهانیان بە هەل زانی بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانیان و چالاکانە ، بەڵام وەك داخ لە دڵی چلومژوانی تۆڵە ، بۆ ئەم مەبەستە کەوتنە کار . لە زۆر ناوچەی ئەرمینیا لاوی خوێن گەرم کەوتنە رێکخستنی ریزەکانیان و بەشێکی زۆریان چەکیان هەڵگرت و دایانە پاڵ هێزە شەڕکەرەکانی رووس لە ناوچەکانی قەفقاس و تورکیا و ئێراندا . ئەوە بوو لە زۆر لاوە لەشکری تورك شکێنرا . ئەنوەر پاشای سەرلەشکر و طەلعەت پاشای هاوەڵی دەبوو « تاوانباری » ئەم ژێرکەوتنانە « بدۆزنەوە » و کەسیش لەو رۆژانەدا وەك ئەرمەن بۆ ئەم کارە دەستی نەدەدا . بەم جۆرە قۆناغێکی نوێی یەکجار رەش و ترسناکی بێ هاوتا لە کوشتاری ئەرمەنەدا دەستی پێکرد . کوشتاری ئەم جارە لە بەهاری ساڵی ١٩١٥دا دەستی پێ کرد و ساڵی داهاتو کۆتایی هات . ئەمەش چەند نموونەیەکی زۆر کەمی کارەساتەکانی دوا قۆناغی کوشتاری ئەرمەنە .

---

(٢٨) بڕوانە : « قەلاچۆی ئەرمەن لە ئیمپراتۆری عوسمانیدا » ، ل VIII ، ١٧٢ ـ ١٧٣ ، ٢٢١ .

نوسـەری عەرەب فائز الغصین کە لەو کاتەدا لە تورکیا بووە نوسیویەتی دەڵێ : « ... میری قەصابی بە کرێی گرتبو ، رۆژی یەک لیرەیەکی عوسمانی دەدانێ . دوکتۆرێک کە ناوی عەزیز بەگ بو باسی ئەوەی بۆ گێڕامەوە چۆن کاتێک لە قەزای مەرزیفونی سەر بە سیواس بووە زانیویەتی قافلەیەکی ئەرمەن بۆ کوشـتن دەنێررێ و چۆتە لای قایمقام ... » ، دوای ئەوەی قایمقام رێـگەی داوە بچێت بۆ سـەیر وتویەتی : « چوار قەصابم دی ، هەر یەکەیان تەورێـکی درێژیان بە دەستەوە بو ، دەرەکەکانیش دە دە ئەرمەنەکانیان جیا دەکردەوە و یەک لە دوای یەک دەیاننادرنە لای قەصابەکان . قەصابەکە بە ئەرمەنییەکەی دەگوت : ملت درێژ کە ، دوای ئەوەی ملی درێژ دەکرد وەک مەڕ سەری دەبڕی »(۲۹) .

رۆژنامەنوسێک لە سـەرەتای ئەیلولی سـاڵی ۱۹۱۵دا باسی کوشتاری ناو شاری وانی کردووە و چۆن ئەو بەشانەی لەشکری روس کە هاتبون بۆ داگیرکردنی لە تاو بۆنی لاشـە و کەلاک نەیانتوانیبو بچنە ناو شـارەکەوە . هەروەها دەقی ئەو بروسکەیەی بڵاوکردۆتەوە کە سـەرکردەی ئـەو هێزانە ناردبوی و تێیدا دەڵێ : « سەرتاپای شـاری وان کاول کراوە . خانووە باشەکانی سوتێنراون ، خانووە قوڕەکانی روخێنراون . شەقام و حەوشەکانی بە لاشەی ئەرمەن و کەلاکی ئاژەڵ تەنراون . کەلوپەلیش تالان کراون و براون » .

---

(۲۹) فائز الغصین ، سەرچاوەی ناوبراو ، ل ۲۸ .

له بتلیس له ١٨ هەزار ئەرمەنی ٣٠٠-٤٠٠ ئافرەت و منداڵ به زیندوێتی مابوون. له ٢٥ هەزار ئەرمەنی ئەرزرۆم دەوروبەری ٢٠٠ کەسێك نەکوژرابوون. له ٢٥ هەزار ئەرمەنی موش و هەزارەهای تری ئەو سێ سەد گوندەی دەوروبەری، دوای کوشتارەکە تاقە پیاوێکی ئەرمەنی‌یان بۆ دەرمان تێــدا نەدەدۆزرایەوە[٣٠]. له زۆر لوچەشدا ئەو ئافرەت و منداڵانەی نەکوژرابوون له ترســی گیانی خۆیان بوو بوونە موسڵمان. ماڵــه هــەژاری واش هەبوو «خوا بۆی ناردبوون» و بە سێ و چوار کارەکەری کچە ئەرمەنیان راگرتبوو[٣١].

---

(٣٠) بڕوانه: «قەلاچۆی ئەرمەن له ئیمپراتۆری عوسمانیدا» ل ٢٢٠-٢٢١، ٢٨٠-٢٨١، ٢٨٥، ٣١٥، ٣١٦، ٣٥٢، ٣٨٧، ٤١٠ و گەلێکی تر.

دەتوانین به دەیان و بەڵکو به سەدان نموونەی تــری لەو بابەتانە بهێنینەوە، بەڵام وابزانین ئەم چەند نموونەیەی سەرەوە بەسن بۆ دانی فیکرەیەکی روون له بارەی چەند و چۆنیەتی ئەو کوشتارانەوە. کە دێینە سەر باسی دەوری کوردیش چەند نموونەیەکی تر پیشان دەدەین.

(٣١) کتێبی «قەلاچۆی ئەرمەن ...» چەند نموونەیەکی تێدایە. فائز الغصین لەم بارەیەوە دەڵێت: «ناچێتــه هیچ ماڵێك له دیاربەکــر له پێنج کچە ئەرمەنی کارکەری کەمتر تێدا بێت. لای بێ بایەخترین فرۆشیار کارەکەری ئەرمەنیت دەدی ... وەك دەڵێن دەوروبەری ٥ هــەزار ئافرەتی ئەرمەنی بوونەتە کارەکەر له دیاربەکر و زووربەیان له ئەرزرۆم و خەرپوت و ویلایەتەکانی ترەوە هاتوون» (فائز الغصین، هەمان سەرچاوە، ل ٣٧-٣٨)

ئەکادیمی ف . تارلێ دوای لێکۆڵینەوە و بەراوردێکی ورد و هەڵبژاردنی لایەنی کەم دوا ژمارەی خەسارەتی ئەرمەن بەم جۆرە لە قەڵەم دەدا : ١٨٢ هەزار کەسیان رایانکردۆتە ناوچەکانی قەفقاسی ژێر سنووری رووسیا، ٤٢٠٠یان پەنایان بردۆتە بەر میسر[٣٢] ، ٢٥٠ هەزاریان هاتوونەتە سەر ئاینی ئیسلام و دەوروبەری ملیۆنێکیشیان لێ کوژراوە[٣٣] . ئەم ژمارانە وەک وتمان بە لایەنی کەمەوە وەرگیراون ،

---

(٣٢) ئێستە دەوروبەری ٣ ملیۆن ئەرمەن لە یەکیەتی سۆڤیێت دەژین . جگە لەوە ئەرمەن لە پتر لە ٦٠ وڵاتی تردا دەژین . لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا ٤٠٠ هەزار و لە فەرەنسە ٢٠٠ هەزار و لە ئێران ٢٠٠ هەزار و لە لوبنان ١٨٠ هەزار و لە سووریا ١٥٠ هەزار و لە ئەرجەنتین ٦٠ هەزار و لە عیراق و میسر و بەرازیل و کەنەدا و یۆنان و بەلغاریا و هیندستان و دەیان وڵاتی تر بە هەزاران ئەرمەن دەژین . بەشێکی زۆری ئەم ئەرمەنانە لە دەست زوڵم و زۆر و کوشتار بەرەوازە و دەربەدەر بوون ، بەڵام رۆڵەی هوشیاری ئەم گەلە لە هەموو شوێنێک جەوهەری رەسەن و توانای گەورەی خۆی نیشان داوە . ناوی زانا و هونەرمەندانی ئەرمەن لە زۆر لاوە دەنگی داوەتەوە . ئەرمینیای سۆڤیێت ئێستە یەکێکە لە وڵاتە هەرە پێشکەوتووەکانی رۆژهەڵات . یەکێک لە نووسەرە ئەرمەنەکان ئەم راستیەی وەستایانە داڕشتووە کە دەڵێ : «گەلی ئەرمەن لە ژێر فشاردا هێند بچووک بۆوە تا وەک ئەڵماسی لێ هات» .

(٣٣) بڕوانە :

Академик Е.В.Тарле, Европа в эпоху империализма, 1871-1919гг., М.-Л., 1928, стр. 388-393.

ئەوروپا لە چەرخی ئیمپریالیزمدا ، مۆسکۆ ـ لێنینگراد ١٩٢٣ . ل ٣٨٨ ـ ٣٩٣ .

زوربەی هەرە زۆری سەرچاوەکانی تر زۆر لەو ژمارەیە زیاتر دەدەن . پرۆفیسۆر تیرسیسیان لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەی سەدان بەڵگە و دەکومێنتی مێژوویی گرنگەوە ئەم ژمارانە دەدات : کوژراوی کوشتارەکانی سوڵتان عەبدولحەمید - ۳۰۰ هەزار ، کوژراوی کوشتارەکانی تورکە لاوەکان - ملیۆن و نیوێــــک ، راکردوو بــــۆ قەفقاس و ولاتە عەرەبییەکان - ۸۰۰ هەزار(۳٤) . هەرچۆنێك بێت ئەو سەرگەردانییەی بە ســەر ئەرمەندا هات ، ئەو زەرەر و زیانەی لە ئەرمەن کەوت لە مێژوودا کەم هاوتان و یەکێك لە لاپەڕە هەرە رەشـــەکانی مێژووی هەمتو مرۆڤایەتی پێك دەهێنن .

زۆر بە داخەوە کوردیش زۆر یا کەم ، بە ئاگا یا بێ ئاگا ، بە هاندان یا بە ئەنقەست دەستی لەم کوشتارانەی ئەرمەندا هەبوو . بەلام جارێــکا بەر لەوەی بگەینە هەڵســەنگاندن و نرخاندنی ئەم مەسەلەیە با چەند نموونەیەکی کەم لەو بەشدارییە بخەینە بەر چاو .

لە کوشتاری یەکەمدا لە شـــاری ئورفە مەلا سەعید ئەحمەد ئلوێك کە شێخی دەروێشان بووە بە دەســتی خــۆی رۆژی ۲۸ی کانوونی یەکەمی ساڵی ۱۸۹٥ « إفتتاحی » کوشتاری ئەرمەنی لەم شارەدا کردووە : فەرمانی داوە ئەرمەنی‌یەکی بێ تاوانیان لەبـــەر دەمەدا بۆ راخســـتووە و بە چەقۆ لەبەر چاوی خەڵکەکە سەری

(۳٤) « ئەلاچۆی ئەرمەن لە ئیمپراتۆریی عوسمانیدا » ، ل XII - XI .

بڕیوه[٣٥] . بەر لەوەش بە چەند ڕۆژێك ناودارانی شاری کۆکردۆتەوە و بۆ کوشتنی ئەرمەن هانی داون چونکە « سەر بۆ دەسەڵاتی سوڵتان شۆڕ نا کەن » .

هەر لە کوشتاری یەکەمدا دوو برا لە ناوچەی واندا بە ناوی عەبدولحەمید و عەبدولغەفوورەوە بە جووتە ٢٠٠ کەسیان کوشتووە . هاوڕێی ئەم دوو « براله‌یە » لە خەرپووت زۆر بوون : لەوێش جووتی برا پتر لە ٣٠٠ کەسیان کوشتووە ، حاجی بەگۆ ناوێکیش بە تەنیا سەدی کوشتووە . نانەوایەکیش شانازی بەوەوە کردووە کە ٩٧ ی کوشتووە و بڕیاری داوە قوربانیەکانی بگەیێنێتە تەنها .... سەد دانە !![٣٦] .

ئاغای کورد بووە قافڵە ئەرمەنی لە جاندرمەکان کڕیوەتەوە و دوای ئەوەی هەموو شتێکی لێ زەوت کردوون ئینجا کوشتوونی ( بەو مەرجە جاندرمەکان پێیان دەفرۆشتنەوە ) ، دوای کوشتن سکیان هەڵدڕیون بە دوای لیرە و زێڕدا گەڕاون . قوڕ بە سەر ئەوەی دانی ئاڵتونی بووە ، بەر لە کوشتنی چەند جارێك مردن و ئەوە دنیای دیوە[٣٧] .

---

(٣٥) شایانی باسە کۆنسولی پورتوغال لە حەڵەب ئەمەی بە تایبەتی بۆ باڵیۆزی ئیتالیا لە ئەستەنبوڵ نووسیوە .

(٣٦) بڕوانە : « قەلاچۆی ئەرمەن لە ئیمپراتۆری عوسمانیدا » . ل ٣١ ، ٩٩ ــ ١٠٠ ، ١٠٥ ، ١٣٠ و هی تر .

(٣٧) فائز الغصين ، سەرچاوەی ناوبراو ، ل ٢٩ ــ ٣٠ .

ف. کەردلێفسکیش لەم بارەیەوە توسیویە دەڵێ : « بە چاوی خۆم دیتم چۆن کوردەکان لە هاوینی ساڵی ١٩١٩دا بە دەستە ئەرمەنیان بەرەو بتلیس خستبووە رێ ، وا دیارە حەیرانی ئەو خەڵاتی پارەیە بوبوون کە کۆمیتەی پەنابەران[٣٨] دەیدا . کوردەکان ئەرمەنەکانیان لای خۆیان لە تورك دەشاردەوە ، بەڵام وەك بۆ بازاڕی کۆیلە بەرە و بتلیس دەیانبردن . لەوەی دەکرد ئەرمەنە قوربوەکان گیرادەیان نەمابێ ، یا بێ کورد رێگەی بتلیس نەدۆزنەوە . بە راستی ئەرمەنە جل شڕە هیلاکەکان جێی بەزەیی بوون . لە دەمۆچاویاندا ئەو کوێرەوەرییە دەبینرا کە هەموی نەختێك بۆ لەودیو شاخەکانەوە دیبۆیان »[٣٩] .

لێرەشدا دەتوانین گەلێك نمونەی تر بهێنینەوە ، بەڵام کورد واتەنی « مشتێك نمونەی خەروارێکە » .

• • •

ئەمە بۆ بە کورتی باسی کوشتارەکانی ئەرمەن ، هەر ئەمەش بۆ بە کورتی نمونەی بەشداری کورد لەو کوشتارانەدا . مەسەلەی

---

(٣٨) لە شاری بتلیس « کۆمیتەی پەنابەران » دانرابۆ . وا دیارە ئاغاکان ئەرمەنیان بە « دیاری » بۆ ئەو کۆمیتەیە دەبرد و بەرامبەر بەوە پارەیان وەردەگرت چونکە ئەو کۆمیتەیە پارەی بەرامبەر بەوە دادە ، بەڵام لەبەر ئەوەی ژمارەی ئەرمەنەکان یەکجار زۆر بۆ پارەکەش کەم کرایەوە .

(٣٩) ف. ا. کەردلێفسکی ، کارە هەڵبژاردەکانی ، بەرگی سێیەم ، ل ١٢٩ – ١٣٠ .

دووەمیان ، واتە بەشداری کورد ، پێویستی بە لێکۆڵینەوەی قووڵتر هەیە تا بتوانین هەموو رووەکانی و رادەی و هۆ بزوێنەرەکانی دەستنیشان بکەین . ئەم مەسەلەیە لە رۆیەکی تریشەوە بایەخی مێژوویی خۆی هەیە چونکە کاربەدەستان - بە تایبەتی لە سەردەمی فەرمانڕەوایی سوڵتان عەبدولحەمیدا - دەیانویست تاوانی هەموو ئەو کوشتارانە بخەنە ئەستۆی کورد و بیبەستن بە دواکەوتوویی و هەستی ئاینی کوێرانەی ئەوەوە . جا بەر لە هەموو شتێك با لەم مەسەلەیە بکۆڵینەوە .

هەر لە سەرەتاوە پێویستە دان بەوەدا بنێین کە هەستی ئاینی کوێرانە و دواکەوتوویی دوو هۆی گەورە بوون پاڵیان بە کەلێك کوردەوە نا لە کاتی ئەو کوشتارانەدا ئەوانیش هەوڵ بدەن دەستی خۆیان بە کوشتنی کافران سەوز بکەن (١١) . وەك باسمان کرد کورد هەبوون بە دەم سەڵاواتەوە ئەرمەنیان سەردەبڕی . لێرەدا بەنموونە یا نەمانەوێ پرسیارێکی رەوا خۆی بە سەر ملدا دەدا : چ کورد و چ تورك و چ نەتەوەکانی تری ئەم ناوچەیە بەر لەو کوشتارانە دواکەوتوتر بوون و هەستی ئاینیشیان زۆر کوێرانەتر بوو ، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا لە ماوەی سەدان ساڵدا لە نێوان کورد و ئەرمەن یا لە نێوان کورد و ئاسووریدا کارەساتێکی دڵگیر نەك کوشتارێکی وەها رووی نەدا[٤٠] ، بۆ ؟ . نەك هەر ئەوە ، بەڵکو زۆر ترسەری

---

(٤٠) گەورەترین شتێك رووی دابێ و سەرنجی راکێشا بێ لێدانی ئاسوورییەکان=

ینگانە بە تایبەتی سەرنجیان بۆ باشی پەیوەندی نێوان کورد و گاورانی کوردستان ڕاکێشاوە و بە باشترین نموونەی ڕۆژهەڵاتی ئومەزاستیان لە قەڵەم داوە . مێجەر ك . ماسۆن لە وتارێکی خۆیدا کە لە بارەی کوردستانەوە لە بەر دەمی کۆمەڵی جوگرافیایی مەلەکی لەندەندا خوێندویەتەوە لەم بارەیەوە وتویە « لەوانەیە زوربەمان بیرێکی شێواومان[41] هەبێ کە گوایە کورد مەسئولی کوشتارەکانی ئەرمەن ، بەڵام کەمان ئەوە دەزانین کە بەشێکی یەکجار زۆری گاورەکان لە ڕۆژانی پێش شەڕدا ( مەبەستی شەڕی یەکەمی جیهانە ـ ك. م ) زۆر بە بەختیاری لە کوردستاندا دەژیان »[42] . ئەو لیژنەیش کە لە لایەن « کۆمەڵی نەتەوەکان »ەوە بۆ لێکۆڵینەوەی کێشەی مووسڵ دانرا بوو بە تایبەتی دانی بەم ڕاستییەدا ناوە . لەوەش زیاتر ، ف. کەردلێفسکی دەڵێ قەت « جیاوازی ئایین لە نێوان کوردە موسڵمان و ئەرمەنە گاورەکاندا دەوری نەبینیوە » و تەنانەت باسی ئەوەش دەکات کە چۆن هاتوچۆی ئەرمەن بۆ مزگەوت و حق

---

= بۆ لە لایەن بەدرخانەوە ، ئەویش لە سەر ئەوەی بە هاندانی لایەنی تر باجیان نەئەدا بەو دەزگایانەی دامەزراندبوون .

(41) لە دەقی ئینگلیزییەکەیدا « vague » واتە لێڵ ، « غامض » .

(42) Major Kenneth Mason, Central Kurdistan, - « The Geographical Journal » , Vol. LIV , No 6 , December 1919 , p. 329.

کورد بۆ کڵێسە شتێکی ئاسایی بووە[٤٣] .

کەواتە هەر وەك زۆ وتمان هۆی هاندەر پەردەی رەشی کوێرانەی بە سەر هەستی ئایینی کوردا لە ماستی ئەرمەندا هێنا . بۆ ئەمەش بەڵگەی تەواو بە دەستەوە هەیە . لە زۆر ناوچە بە فەرمانی مێری موفتی و مەلا و پیاوە ئایینێکانی تر هەستی کۆمەڵانی خەڵکیان دەبزواند و بە ئاشکرا بۆ کوشتنی « کافران » هانیان دەدان . لە کوشتاری یەکەمدا موفتی پالۆ خەڵکەکەی بۆ کوشتن هان دەدا و داوای لێ دەکردن جارێکا خۆیان بە تالانییەوە خەریك نەکەن . کاربەدەستانی شاری ئەرزرۆمیش بە ئاشکرا هاواریان دەکرد : « کاور بکوژن ، لە هیچ مەترسن » (١١) . « مردن بۆ کاوران ـ ژیان بۆ موسڵمانان » ـ ئەمە بۆ دروشمی مەلا و دەروێشانی سیواس و ئورفە . لە ئەرەبکیر وایان بڕدبووە مێشکی خەڵکی ساکارەوە گوایە کوشتنی ئەرمەن « ئەرکی سەر شانی رۆڵەکانی محەممەدە » (١١) .

---

(٤٣) ف. أ. گەردلێفسکی ، کارە هەڵبژاردەکانی ، بەرگی سێیەم ، ل ١٢٦ ـ ١٢٧ .

رۆناکبیرەکانی ئەرمەن دەورێکی باشیان لەوەدا بووە کە هەستی ئایینی نێوان ئەوان و موسڵمانان تێك نەچێ چونکە زۆریان دوورینانە نەك کوێرانە سەیری ئەو مەسەلەیەیان کردووە و زانیویشیانە کە مەسڵەحەتیان لەوەدایە . تەنانەت لە رووسیاش پەیوەندی نێوان ئەرمەن و موسڵمان باش بووە و ئەوەی لە نێوان ئەوان و ئازەرەکاندا بەر لە شۆڕشی ئۆکتۆبەر رووی دەدا زیاتر ئەنجامی مەسەلەی نەتەوەیی بوو .

هەر ئەو هاندانەش وای لە زۆر کەس کردبۆ کوێرانە بکەونە گیانی پیاوە ئاینییەکانی ئەرمەن و کڵێسە دێرینەکانیان[44] .

زۆر کوردی ساکار کوشتاری ئەرمەنیان بە « غەزا » دادەنا و هەر لەبەر ئەوەش هەر کامێکیان دەبووە موسڵمان ئەمان دەستیان لێ هەڵدەگرت . بەم جۆرە هەستی کوێرانەی تۆستۆی رەش و رۆنی کورد بە زۆر و بە ئەنقەست و بە پێی پیلانێکی ئاشکرا خەبەر کرایەوە ، تۆباڵی ئەمەش بەر لە هەمۆ لایەنێکی تر دەکەوێتە ئەستۆی ئەوانەی ئەمەیان مەبەست بۆ .

لێرەدا پێویستە بە تایبەتی سەرنجیش بۆ ئەوە رابکێشین کە زوربەی ئەو کوردانەی لە کوشتارەکانی ئەرمەندا بەشدار بۆن لە سوارەی حەمیدیێ بۆن کە خۆی هەر لە بنەڕەتدا بۆ جێ بەجێ کردنی کاری وا و بۆ خەریك کردنی کورد دامەزرێنرا بۆ[45] . بۆ نمونە زوربەی

---

(44) بڕوانە : « قەلاچۆی ئەرمەن لە ئیمپراتۆریێ عوسمانیدا » ، ل ۱۲٦ ، ۱۳۱ ، ۱٤۳ ، ۲۲٥ ، ۲٤۱ ـ ۲٤۲ ، ۲٥۷ ، ۳۱٥ و هێ تر .

(45) « سوارەی حەمیدیێ» بە شێوەیەکی رەسمیێ لە ناوەندی تەشرینی یەکەمی سالی ۱۸۹۰دا دامەزرێنرا . هەر لە سەرەتاوە دامەزراندنی ئەم دەزگایە بۆ پاراستنی دەسەلاتی سولتان عەبدولحەمید و لێدانی ناحەزەکانیێ و بۆ خەریك کردنی کورد و بۆ ئەوە بۆ لەو رێگەیەوە هۆزە «سەرکەشەکانی» کوردستان بهێنرێتە ژێر رکێفی میری ، هەر لەبەر ئەوەش بۆ زوربەی هەرە زۆری هۆزە کوردەکان تێیدا بەشدار نەبۆن و هەر لە سەرەتاشەوە وەك داردەستێکی بێزراوی سولتان هاتە بەر چاو . نەك ئەرمەن بەڵکو کوردیش زەلالەتیان بۆ بە دەست سوارەی حەمیدییەوە ( هەروەها بڕوانە ل ۳۱ ـ ۳۲ی بەشی دووەمی ئەم کتێبە ) .

کوشتارەکانی دیاربەکر لە جاری یەکەمدا کرداری دەستی ئەو سوارانە بوو کە بە تایبەتی بۆ ئەو مەبەستە هێنرانە ناو شارەوە . لە کوشتاری دووەمدا کاربەدەستان بە ئاشکرا و لەبەر چاوی ئەرمەنەکان خۆیان هانی ئەو سوارانەیان دەدا بکەونە گیـــانی ئەرمـــەنەکانی ئەرزرۆم [٤٦] . دیارە بەرهەمی ئەم جۆرە هاندانانە کەم نەبوو . بەڵام پێویستە بەشـداری سوارەی حەمیدی وەك دەزگایەکی میری سەیربکرێ ، وەك بەشداری لەشکر و جاندرمەکان لە قەڵەم بدرێ نەك وەك بەشـداری کورد ، ئەگەر چی کۆنەپەرســـتی و دواکەوتوویی ژمارەیـەك دەرەبەگیش دەوری خۆی لەمەدا دیبێ . شایانی باسە سەردارانی سوارەی حەمیدی و ژمارەیەك ئاغا و دەرەبەگی تر کوشتارەکانی ئەرمەنیان بە هەل دەزانی بۆ پڕ کردنی گیرفانی خۆیان و زەوت کردنی زەوی و زاری تورکی . بە وێنە خاوەنی گوندی سەکرات لە پالوئیبراهیم بەگ نـــاوێك بە بیانووی رزگارکردنەوە ژمارەیەکی زۆر ئەرمەنی لای خۆی شاردۆتەوە و دوای ئەوەی کەلوپەل و مەڕ و ماڵانی لێ زەوت کردوون ئینجـــا بەری داونەتە دەشت و دەر . لە زۆر ناوچەی تر ئاغاکان دەستیان بە سەر زەوی ئەرمەنە کوژراو و راکردووەکاندا دەگرت و میریش زیاتر بۆ ئەمەی هان دەدان و جاری واش بووە یاریدەی داون .

ئینجا با بێینە ســـەر باسێکی زۆر گرنگ ، باسی بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد و ئەرمەنی کە دەبوو لە زرووفی دەوڵەتی عوسمـــانیدا

---

(٤٦) بڕوانە : « قەلاچۆی ئەرمەنی لە ئیمپراتۆریی عوسمانیدا » ، ل ٩٣ ، ٢٢٧ .

بێجگە هۆی یەکیەتی و نزیك کەوتنەوەی هەردوو گەل نەك دوورکەوتنەوەیان لە یەك . بە داخەوە هەندێك هەڵە و هۆ و کرادەیەك کورتبینیی پیاوە سیاسی‌یەکانی هەردوو لا و دەست تێ وەردانی کۆلۆنیاڵیستان کارێکی وایان کرد تۆوی دووبەرەکیی نەتەوەیی لە نێوان ئەرمەن و کوردی دراوسێدا زوو بەر بدات بە دوژمنی هەردوو لایان .

لە شوێنێکی تری ئەم بەشەدا بە کورتی باسی پەیدا بوونی بزووتنەوەی نەتەوەیی ئەرمەن و دامەزراندنی پارتی « گنچاك » (١٨٨٧) و پارتی « داشناق » (١٨٩٠) مان کردووە . « گنچاك » لە لایەن دەستەیەك قوتابیی ئەرمەنەوە لە جنێف دامەزرێنرا و هەر بە ناوی خۆیەوە ئۆرگانێکی تایبەتی دەردەکرد . « گنچاك » حیزبی بۆرجوازی‌یە بچووکەکانی ئەرمینیا بوو کە ئازادی و یەکیەتی ئەرمینیا و دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆی لە رێگەی خەباتی چەکدارانەوە کردبووە دروشمی سەرەکیی خۆی . « داشناق »ی ناوداریش حیزبێکی بۆرجوازیی نەتەوەیی بوو کە بۆ رزگاریی ئەرمەن لە دەست زوڵم و زۆری دەوڵەتی عوسمانی هەوڵی دەدا و دەیویست لە رێگەی خەباتی چەکدارانەوە ئۆتۆنۆمی بۆ ئەرمینیا لە چوارچێوەی ئەو دەوڵەتەدا مسۆگەر بکا و لەو باوەڕەدا بوو گەلی ئەرمەن دەتوانێ لە رێگەی یارمەتیی دەوڵەتە ئەوروپاییە گەورەکانەوە بەم مەبەستەی بگات .

بەڵام نە « گنچاك » (هەرچەندە خۆشی بە حیزبێکی مارکسی دادەنا) و نە « داشناق » نەیانتوانی راست پەیوەندی و بەرژەوەندی

نێوان گەلە دراوسێکانی ناوچەکە و بە تایبەتی پەیوەندی نێوان کورد و ئەرمەن ، هەڵسەنگێنن و کارێکی وا بکەن هەست و خەباتیان یەك بخەن . م. س. لازەریێف لەم بارەیەوە دەڵێت : « لەو ڕۆژانەدا ( مەبەستی ڕۆژانی کوشتارەکانی ئەرمەنە ـ ك. م. ) داشناقەکان خزمەتێکی خراپیان پێشکەش گەلی ئەرمەن کرد بەوەی باڵیان پێوە دەنا بۆ ڕاپەڕینی ناوەخت و بەوەی ئاگری ڕقی ئەرمەنیان دژی هەمو کورد و هەمو تورك خۆش دەکرد »[47] .

سەرەڕای ئەوە چ « هنچاك » و « داشناق » و ، چ پیاوە سیاسی و ڕوناکبیرەکانی ئەرمەن بەر لە دروست بون و دوای دروست بونی ئەو دو حیزبە کە باسی « ئەرمینیای گەورە » یا ئۆتۆنۆمی و سەربەخۆیی ئەرمینیایان دەکرد مەبەستیان هەمو ئەو ناوچانە بو کە ڕۆژێ لە ڕۆژانی زو زۆرینەی دانیشتوانیان ئەرمەن بون یا لە ژێر دەستی ئەو دەوڵەتانەدا بون کە ئەرمەنەکان کاتی خۆی دایانمەزراندبون . هەر بۆ وێنە شاری دیاربەکر و دەوروبەری بە لای ئەوانەوە ناوجەرگەی ئەرمینیایە . ئەم جۆرە بیرە لە چاپەمەنی و ئەدەب و

(47) م. س. لازەریێف ، سەرچاوەی ناوبراو ، ل 57 .

شایانی باسە «داشناق» هەر لە سەرەتاوە کوێرانە کاری دەکرد و ئەرمەنی بە هەڵەدا دەبرد . « داشناق » لە ئەرمینیای ڕۆژهەڵات دژی خەباتی شۆڕشگێڕانەی هاوبەش لەگەڵ گەلانی تری ناوچەکەدا وەستا ، لە بەرپابونی کوشتاری نێوان ئەرمەن و تەتەردا بەر لە شەڕی یەکەم لە ناوچەی قەفقاسدا دەوری هەبو .

خەباتی ڕۆژانەی ئەرمەندا زۆر زەق و بە جۆرێـکی سەرنج ڕاکێشەر ڕەنـگی دابۆوە[٤٨] .

بێ گومان ئەمە مەترسی یەکی ڕەوای خستبووە ناو دڵی کوردەوە بە تایبەتی چونکە هەستیشیان دەکرد چۆن دەوڵەتـە گەورەکان هەرچۆنێك بێت پشتی ئەرمەنە هاو ئایینەکانیان دەگرن بۆ گەیشـتن بە ئامانجەکانیان یا بە لای کەمەوە بۆ ڕزگار کردنیان لە دەست زوڵم و زۆری عوسمانی . ئەگەر ئەم مەسـەلەیە بخەینە قاڵبێـکی ترەوە وا دەردەچێ : ڕوناکبیری کورد لە پچڕوك کردنەوەی خاکی نیشـتمانی دەترسا ، وەرزێری کورد لە مەترسـی دۆڕاندنی زەوی و زاری نیگەران بوو ، ئاغا و دەرەبەگیش دەسەڵاتی خۆیان لا مەبەست بوو . دیارە هەر ئەمەشە وای لە شاعیرێـکی ڕوناکبیر و دوربینی وەك حاجی قادری کۆیی کردووە بەر لە کوشتاری یەکەم بە چەند سـاڵێك بە گەری هاوار بکات :

خاکی جزیر و بۆتان ، یانی وڵاتی کوردان
سەد حەیف و سەد مخابن دەیکەن بە ئەرمەنستان[٤٩]

---

(٤٨) بە پێچەوانەی ئەمەوە زوربەی پیاوە سیاسی یە کوردەکانیش هەموو ئەرمینیای ڕۆژئاوایان بە کوردستان لە قەڵەم دەدا ، بەڵام لەبەر لاوازی بزوتنەوەی کورد بە نیسبەت بزوتنەوەی ئەرمەنەوە ئەمیان زۆر دەنـگی نەدابۆوە و هێشتا قەوارەی تەواوی خۆی وەك هی ئەرمەنەکان وەرنەگرتبوو ، بۆیەکا زۆر کاریگەر نەبوو .

(٤٩) بڕوانە : « کۆمەڵە شیعری حاجی قادری کۆیی » ، بغداد ١٩٢٥ ، ل ٥١ .
ئـەم شیعرەی حاجی قادر کە بە یەکێك لە بەرهەمە هەرە بایەخدارەکانی=

هـــەر ئەو جۆرە دروشمانە و ڕێبـازی خەبات و تاکتیك و ستراتیجی هێز و پیاوە ســیاسی‌یەکانی ئەرمەن دیسان وایان لە حاجی کردووە بڵێ :

---

= دادەنرێ و لە راستیشدا پڕی‌یە لە باسی گرنگی سـەردەمی خۆی ، سـەرنجی ژمارەیەك لە نوسـەرانی کوردی را کێشاوە ، بە تایبەتی مامۆستایان مەسعود محەمەد و جەلال تاڵەبانی و دوکتۆر ئیحسان فوئاد و دوکتۆر عیزەددین مستەفا رەسوڵ و محەمەدی مەلا کەریم . دوکتۆر ئیحسان فوئاد کە نامەی دوکتۆرێکەی لـە بارەی زبان وهونەری حاجی قادرەوەیە دەڵێت گوایە حاجی لە « خاکی جزیـر و بۆتان »دا بە هەستێـکی « زۆر قوڵەوە » پشتی « خەباتی ... وئەرمەنی » گرتووە ( ئیحسـان فوئاد ، بەرهەمی حاجی کـۆیی و جێـگـەی لە ئەدەبی کوردیدا ، ( کورتەی نامەی دوکـتۆرێـکەی بە زمانی رۆسی ) ، مۆسکۆ ١٩٦٦ ، ل ١٢ ) . دوکتۆر عیزەددینیش زۆر بـە کورتی ـ لە چەنـد دێڕێکی کەمدا ـ ئەو شـیعرەی وا داوەتــە قەڵەم کە گوایە حاجی لە ناو پیلانی نێوان ئیمپریالیزم و بزوتنەوەی ئەرمەن بۆ زەوت کردنی خاکی کوردســتان رو دەکاتە کورد و وریایان دەکاتەوە ( بڕوانە : الدکتور عزالدین مصطفی رسول ، الواقعیة فی الادب الـکردي ، بیروت ، ص ٧٦ ) . مامۆستا محەمەدی مەلا کەریمیش تەنها دیوێکی مەسەلەکەی دیوە و لە سەر ئەو ئەساسە بە توندی رەخنەی لە حاجی گرتووە کە گوایە « لە روی تێکۆشانی خەڵـکی ئەرمەنستانا » راست بۆتەوە و « بە هەموو هێزێـکی » بانگی نەتەوەی کوردی کردووە بۆ « بەرهەڵستی دانی مافی سەربەخۆیی ئەو نەتەوەیە » ( بڕوانە : محەمەدی مـەلا کەریم ، حاجی قادری کۆیی شاعیری قۆناغێـکی نوێیە لە ژیانی نەتەوەی کورد ، بەغدا ، ل ٦٢ـ ٦٦ ) . هەرچی مامۆستا جەلال تاڵەبانیشە کە بە ناوی « بیرۆت » ەوە وەڵامی مامۆستا محەمەدی مەلا کەریمی داوەتــەوە ( بڕوانە : « خەبات » ، ٢٦ تموز ١٩٦٠ ) دیوەکەی تری مەســەلەکەی بینیوە و ئەویش وای داناوە گوایــە دەوڵەتە ئیمپریالیستی‌یەکان ( بە تایبەتی روسیا و بەریتانیا ) ویستویانە دەوڵەتێـکی =

هیچ غیرەتێک نەماوە صـــەد جار قەسەم بە قورئان
پەیدا بێ ئەرمەنسـتان ، نامێنێ یەک لە کوردان[٥٠]

وەک وتمان ئەوەی زیاتر ئەم مەترسـی‌یەی لەبەر چاوی کورد

---

= کۆنەپەرست بۆ ئەرمەن دابەزرێنن و بەشێک لە خاکی کوردستانی بخەنە سەر ، هەرچەندە لە راستیدا تا پەیمانی « سیڤەر » قەت ناوی سەربەخۆیی ئەرمەنستان لە پەیمانە دەولەتیەکانـدا نەهاتـۆتە ناوەوە . بەنـدی شازدەی پەیمـانی « سان ستیفانۆ » و بەندی شەست و یەکی « بەرلین » کە تا « سیڤەر » بە بەرزترین پلەی بایەخ پێدانی دەولەتە گەورەکان بە ئەرمەن دادەنرێن تەنانەت ناوی ئۆتۆنۆمیشـیان تێـدا نییە و تەنها باسی « ئیسلاحات » و « پاراستنی ئەرمەن لە چەرکەس و کورد » دەکەن . وا دیارە هەر لەبەر ئەوەشە نوێنەری ئەرمەن دوای گەڕانەوەی لە بەرلین وتویە : « سەرپەستی لە بەرلین لێنرا ، بەلاَم ئێمە نەمانتوانی بە کەوچکێکی کاغەز بیخۆین . رۆلەکانم ( مەبەستی ئەرمەنەـ ک. م. ) هیچ هیوایەک بە بێگانە مەبەستن و خۆتان کاری خۆتان ساز کەن » .

مامۆستا مەسعود محەمەد لە بەرگی یەکەم و دووەمی کتێبەکەیدا لە بارەی حاجی‌یەوە نەکەیشتۆتە بەرهەمەکانی ئەستەنبوڵی کە وا دیارە بەرگی سێیەمیانی بۆ تەرخان دەکات . بەلاَم بە بیری مامۆستا مەسعود ، وەک لە گفتوگۆیەکی تایبەتیاندا لێی حالی بوم ، ئەوەیە حاجی ئەو شیعرەی لە وەلاَمی رێککەوتننامەی بەرلینی ساڵی ١٨٧٨ دا داناوە . دیارە ، هەر وەک لە ناوەرۆکی ئەم باسەشدا دەردەکەوێ ، ئەو رێککەوتنـامەیە ( خۆی بە تەنهـا نا ) لەگەڵ « سـان ستیفانۆ » و بایەخ پێدانی دەولەتە گەورەکان بە ئەرمەن یەکێک و تەنها یەکێک بووە لەو مەرجە پێویستانەی مەناخی لە دایک بونی ئەو شـیعرەی حاجی‌یان دروست کردووە . هەر شیعرەکە بۆ خۆیشی بەلـگەیەکی گرنگی تێـدایە بە ئاشکرا دەری دەخا کە لـە تەمـەندا بە لای کەمـەوە چـەند سـاڵێک لـە رێککەوتننامەکەی بەرلین ساوانترە . ئەو شیعرە یا لە ناوەندی ساڵەکانی هەشتای=

گەورە کردبێ ئەوە بوو کە دەوڵەتە ئەوروپاییەکان بایەخیان بە مەسەلەی ئەرمەن دابوو . راستە زوربەی ئەو بایەخ پێدانە ـ وەک دوایی باسی دەکەین ـ لە بەرژەوەندی تایبەتی دەوڵەتە گەورەکان

---

=سەدەی رابوردوودا یا چەند ساڵێکی کەم بەر لە کوشتاری یەکەی ئەرمەن دانراوە ، چونکە حاجی تێیدا دەڵێ :

هەر دوێنێ ئەهلی سوودان هەستانە پێ وەکوو شێر
ئیستێکە موستەقیللن مەحسوودی کوللی ئەدیان

دیارە کاتی دانانی ئەم شیعرە دەبێ رووداوێکی گەورەی سوودان سەرنجی حاجی و هاوبیرەکانی راکێشابێ ، بۆ ئەو سەردەمەش لە راپەڕینەکەی مەهدی بەولاوە هیچ شک نابەین . ئەم راپەڕینەش ساڵی ١٨٨١ دەستی پێ کرد ، بەڵام چەند ساڵی رەبەقی خایاند و تەنها لە ناوەندی ساڵەکانی هەشتای سەدەی رابوردوودا گەیشتە پلەیەک سەرنجی گەلانی تر رابکێشێت ، بە تایبەتی دوای ئەوەی لە تەشرینی دووەمی ساڵی ١٨٨٣دا شۆڕشگێڕانی سوودان توانیان لەشکرێکی دە هەزار کەسی ئینگلیز بشکێنن کە بۆ ئەو سەردەمە رووداوێکی ئاسایی نەبوو . دوای ئەوەش لە کانوونی دووەمی ساڵی ١٨٨٥دا توانیان شاری خەرتوم ئازاد بکەن و حاکمی ئینگلیزی سوودان بکوژن و بانگی سەربەخۆیی وڵات بدەن . حاجیش باسی راپەڕینی « دوێنێ »ی سوودان و سەربەخۆیی « ئیستێکە »ی دەکات .

هەر بەم بۆنەیەوە پێ زیانی دەبینم ئەگەر سەرنجی پسپۆرانی ئەدەبمان بۆ راستییەکی تری گرنگ لە ناو ئەو شیعرەی حاجیدا رابکێشم . حاجی دڵسۆز داوا لە کورد دەکات :

جۆشێک بدەن وەکو هەنگ ، تەدبیر بکەن بە بێ دەنگ
ئەسبابی شەڕ پەیدا کەن ، تۆپ و تفەنگ و هاوان

لێرەدا ( هاوان ) سەرنج رادەکێشێت . راستە تۆپی هاوان « Mortar » بە شێوەیەکی زۆر ساکار لە سەدەکانی ناوەندا دۆزرابەوە و بۆ جاری یەکەم=

خۆیانەوە هەڵقوڵا بوو ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نەك هەر دەسەڵاتدارانی دەوڵەت بەڵکو کوردیشی ترساندبوو کە لە ناویاندا وا باو بوو گوایە بە یارمەتی رووسیا و بەریتانیا و فەرەنسە دەوڵەت بۆ ئەرمەنی دادەمەزرێ و کوردیش دەکەوێتە ژێر دەستی ئەو دەوڵەتەوە. راستەکەشی بەشێکی زۆر لە ئەرمەن و بە تایبەتی داشناقەکان بە تەمای ئەوە بوون و لە زۆرەملی زوڵم و زۆری نەتەوەیی وئاینی عوسمانییەکاندا کۆڵێك دڵیان پێی خۆش بوو . هەر لەبەر ئەوەش بوو رۆناکبیران و پیاوانی ئاینی ئەرمەن و هێزە سیاسییەکانیان زۆ زۆ پەنایان دەبردە بەر دەوڵەتە گەورەکان . ئەمایش ـ زیاتر لەبەر نیازی خۆیان ـ کەم

= عوسمانییەکان لە ناوەندی سەدەی بازدەدا بە کاریان هێنا . بەڵام بە هۆی دواکەوتوویی تەکنیکەوە ئەم توپە زۆر جار زیانی لە قازانجی زیاتر بوو بۆیەکا هەر زوو وازی لێ هێنرا و ناوی لە ناو ناواندا نەما تا لە سەرەتای سەدەی بیستدا ، دوای وەفاتی حاجی ( ١٨٩٧ ) بە دەوروبەری ١٠ ساڵێك دەست کرایەوە بە دروست کردنی و ئەم کەرەتەیان بۆ جاری یەکەم لە شەڕی نێوان رووسیا و ژاپۆندا ( ١٩٠٤ ـ ١٩٠٥ ) بەکار هێنرا و ئەو شەڕەش بە سەرکەوتنی ژاپۆن سەرنجی هەموو میللەتانی رۆژهەلاتی راکێشا و لە هەموشیان زیاتر سەرنجی میللەتانی ناو دەوڵەتی عوسمانی راکێشا . دوای ئەو شەڕە ئەڵمانەکان لە ساڵی ١٩٠٨ەوە کەوتنە دروست کردنی نۆعی هاوەنی بلش و لەوساوە کەوتە بلاوبوونەوە . جا لێرەدا پرسیارێك دێتە پێشەوە : تۆ بڵێی ئەو شیعرەی حاجی دوای وەفاتی لە لایەن خەڵکی ترەوە دەستکاری نەکرابێ ؟ . ئاشکراشە کە زۆر جار شتی وا رووی داوە ، بەڵام هەرچۆنێك بێت مەسەلەکە پێویستی بە لێکۆڵینەوەی شارەزایانە .

(٥٠) بڕوانە : « کۆمەڵە شیعری حاجی قادری کۆیی » ، ل ٥١ .

بە دەنگیانەوە نەدەهاتن . ئەمەش بۆ خۆی تا رادەیەك كوردی تۆقاندبوو بە تایبەتی چونكە هەندێ جار دەست تێ وەردانی دەوڵەتە گەورەكان لە مەسەلەی ئەرمەندا ژیان و نانی ئەوانیشی دەگرتەوە . هەر بۆ نموونە چەند جارێك بەر لە كوشتاری یەكەم باڵیۆزانی دەوڵەتە گەورەكان لە بارەی باری ژیانی ئەرمەنەوە فەرمانڕەوایانی دەوڵەتی عوسمانیان بینیوە و لە ئەنجامدا میری پەیمانی داوە چەند هەنگاوێك بە نیسبەت ئەرمەن و ئەرمینیاوە بنێ كە هەندێكیان پەیوەندییان تەنها بە كورد و كوردستانەوە بووە ، وەك ئەوەی كە بڕیار دراوە دەست بە سەر هاتو چۆی هۆزە كۆچەرە كوردەكاندا بگیرێ و نەهێڵرێ بێ رێكادانی تایبەتی سوارەی حەمیدی چەك هەڵگرن[٥١] و وەك خەڵكی تر بدرێنە بە دادگەكانی میری[٥٢] . ئەم جۆرە باس و خواسە تا رادەیەك زۆ بە ناو خەڵكدا بڵاو دەبوونەوە و لەگەڵ

---

(٥١) ئەو سەردەمە چەك بۆ كورد و ئەوانەی لە زرۆفی كوردا دەژیان وەك نان و ئاو وابوو .

(٥٢) بڕوانە : م س لازەریێف ، سەرچاوەی ناوبراو ، ل ٦٢ .
ئەرمەن نیشتەجێ بوون ، بەڵام بەشێك لە كورد ئەو سەردەمە هێشتا كۆچەر بوون و لە كاتی هاتو چۆی گەرمیان و كوێستانیاندا هۆزی وایان هەبوو دەگەیشتنە ناوچەكانی ئەرمینیا و قەرەباغ . كۆچەریش هەمیشە سەرچاوەی بەلاّ و دەرد و ئازار بووە بۆ نیشتەجێكان ، لەبەر ئەوە نەك هەر ئەرمەن بەڵكو كوردە نیشتەجێكانیش لە كۆچەرە كوردەكان بێزار بوون ، بەڵام بێزاری ئەرمەن تا رادەیەك شێوەیەكی تری وەرگرتبوو و زۆر جار سكالاّیان لە دەست دەكرد و داوای بەربەست كردنیان دەكرد .

ئەوەشدا زوربەیان جێ بەجێ نەدەکران بەڵام هەر مەترسی‌یان دەخستە دڵەوە ، بە تایبەتی مەسەلەیەکی گرنگی وەك هاتوچۆی هۆزە کۆچەرەکان کە بە راستی مەسەلەی ژیان و مردن بۆ بۆیان . دیارە هەر ئەوەش دیسان وای لە یەکێکی ئاگاداری وەك حاجی قادری کۆیی کردووە بە پەرۆشەوە بڵێ :

وا رێگەتان دەبەسرێ هێلاتی جاف و بلباس
گەر مردوون لە گەرمان مەمنوعە بچنە کوێستان[53]

پشت بەستنی ئەرمەن بە دەوڵەتە گەورەکان لە ئەنجامی کورتبینی عوسمانێیەکاندا تا دەهات رۆی لە زیادی دەکرد و هەر بەو جۆرەش زیاتر ترسی دەخستە دڵی کاربەدەستان و تا رادەیەك کوردیشەوە . گەردلیڤسکی بەر لە دەست پێ کردنی شەڕی یەکەم و دوا کوشتاری ئەرمەن بە ماوەیەکی کەم باسی ئەوە دەکات چۆن « سیاسەتی شۆڤێنی تورکە لاوەکان زۆری نەخایاند ئەرمەنی تووشی نائومێدی کرد .. وایان لێ هات هیوایان تەنها بە دەست تێ ومردانی دەرەوە بێت . کاتێك لە ساڵی ١٩١٣دا بە ناوچەکانی ئاسیای بچوکدا دەگەڕام خەڵکەکە سەیری منی گەڕیدەی رۆسیان وەك نوێنەرێك دەکرد کە بۆ لێکۆڵینەوە لە باری ناوخۆی (ئەو ناوچەیە ـ ك. م.) نێردرابێ » و هەر لەبەر ئەوەش ئەرمەنەکان بە گەرمی پێشوازی‌یان لێ‌کردووە و بۆ زۆر شوێنیان بردووە[54] .

---

(٥٣) « کۆمەڵە شیعری حاجی قادری کۆیی » ، ل ٥١ .

(٥٤) ف.ا. گەردلیڤسکی ، کارە هەڵبژاردەکانی ، بەرگی سێیەم ، ل ٨٣ .

کاربەدەستانی دەوڵەتی عوسمانی دەستێکی باڵایان هەبوو لە بڵاوکردنەوەی مەترسی لە ناو کوردا و لە تێکدانی پەیوەندی‌یان لەگەڵ ئەرمەنیدا . لەبەر ئەوەی لە بەرژەوەندی خۆیان بوو ، لە هەزار و یەك ڕێگەوە ئاگری ناکۆکی و دووبەرەکی‌یان لە نێوان کورد و ئەرمەنیدا خۆش دەکرد و هەر کوێك بای نزیك کەوتنەوەی ئەم دوو گەلەی لێ بهاتایە خێرا دەیانگرت چونکە لە زۆر شت زیاتر لەو جۆرە نزیك کەوتنەوەیە دەترسان ، بە تایبەتی لەبەر ئەوەی دەیانزانی پیاوانی دووربین و هەست دیموکراسی هەردوو گەل هەرچەندە کەمن بەڵام راست بایەخی ئەو جۆرە نزیك کەوتنەوەیە دەنرخێنن . وەك دەگێڕنەوە هەر زوو شێخ عوبەیدوڵلای نەهری سەرداری راپەڕینی ساڵی ۱۸۸۰ گوێی نەداوەتە هاندانی میری کە ویستوویەتی لە ڕێگەی ئەوەوە کوشتاری گاورەکانی ناوچەی ورمێ ڕێك بخات[٥٥] . وەك دوکتۆر أ. ئەستارجیانیش نووسیویە سەرۆکی « داشناق » لە ناوەندی ساڵەکانی نەوەتی سەدەی رابووردوودا عەبدورڕەزاق بەدرخانی لە جنێف دیوە و گفتوگۆی لە بارەی یەکخستنی کورد و ئەرمەنەوە لەگەڵ کردووە و گوایە عەبدورڕەزاق بەدرخان نووسینی تایبەتی بە کوردی و بە پیتی عەرەبی لە « ترۆشاك » ( ئاڵا )ی ئۆرگانی داشناقەکاندا بڵاو کردۆتەوە[٥٦] . دوای ئەوە چەند جارێکی تریش ـ وەك دواتر

(٥٥) بڕوانە : B. Nikitine , Op. Cit., p. 189

(٥٦) الدکتور ك. استارجیان ، تاریخ الامة الارمنیة ، موصل ۱۹٥۱ ، ص ۳۱٥ . شایانی باسە هەر ئەم « ترۆشاك »ە هەندێك نامە و وتاری گرنگی مامۆستا ئیسماعیل حەقی شاوەیسی لە کاتی خۆیدا بڵاو کردۆتەوە .

مستی دەکەین ـ هەوڵی بۆ نزیك خستنەوەی کورد و ئەرمەنی دراوە .

دیارە کاربەدەستانی دەوڵەتی عوسمانی بۆ ئەوەی ئەو تاوە گرنگە بەر ئەحات چالاکانە کەوتنە نانەوەی ناکۆکی و دووبەرەکی لە نێوان کورد و ئەرمەندا و بە هەر چوار لاشدا ئاگری ئەو ناکۆکیەیان خۆش دەکرد . لە هەمان کاتدا کاربەدستان لەوەش زۆر دەسڵەمینەوە کە خەباتی سەخت و رەوای ئەرمەنی کوردیش زیاتر هان بدات بۆ خەبات لە پێناوی مافەکانی خۆیدا . ئەمەش وەك راستی‌یەکی مێژوویی بۆ خۆی لە ئارادا بوو ، حاجی قادری کۆیی لەگەڵ ئەو هەمــوو مەترسی‌یەیدا کە لەو شیعرانەیــدا باسی کردوون و کوردیان پێ وریا دەکاتەوە ، لەگەڵ ئەوەشدا هەر لەوێدا راستی‌یەکی گرنــگ دەبینێ و حەز ئەکات ببێتە نموونە بۆ کوردیش :

هـــەم حەقیانە ئەرمەنی غیرەتکێشن یـــەك و دوو
وەك ئێمە نین لەگەڵ یەك دەعوا بکەن بە شیران[٥٧]

ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە زۆر یا کەم لە ئارادا بــوو[٥٨]، بۆیەکا پاڵی بە کاربەدەستانەوە دەنا زیاتر هەوڵ بدەن ناوی ئەرمەنی لە بەر چاوی کورد رەش بکەن ، بزووتنەوەی نەتەوەیی رەوایان بزڕێنن تاوەکوو نەبێتە نموونە بۆ کوردیش . سەرەڕای ئەوە عوسمانیەکان دەیانزانی دەتوانن بەو جۆرە بە تیرێك دوو نیشان بشکێنن : جگە لە لێدانی

---

(٥٧) « کۆمەڵە شیعری حاجی قادری کۆیی » ، ل ٥٤ .

(٥٨) مستەفا پاشا یاموڵکی کە یەکێك بوو لە ئەفسەرە گەورەکانی دەوڵەتی عوسمانی دوای تەواو بوونی شەڕی یەکەم و گەڕانەوەی بۆ سلێمانی لە نووسینەکانیدا هانی کوردی دەدا لە خەبات و یەکیەتیدا چاو لە ئەرمەنی بکەن ( بە وێنە بڕوانە : « بانگی کردستان » ، ژمارە ٣ ، ٢١ ئاغستۆس ١٩٢٢ ) .

ئەرمەن بزۆتنەوەی رزگاریخوازی کوردیش بە رێگەیەکی هەڵەدا بەرن و بەو جۆرە لاوازی بکەن . لێرەدا بەڵگەیەکی مێژوویی گرنگ دەهێنینەوە کە زۆر شتی لەم بارەیەوە روون کردۆتەوە . ئادامۆڤی کۆنسوڵی گشتی رووسیا لە ئەرزرۆم لە نامەیەکی رەسمیی هێنێدا لە بارەی ئەرمەنەوە کە بۆ باڵیۆزی رووسیای لە ئەستەنبۆل ناردووە لە زمان گەورەیەکی ئەرمەنەکانەوە باسی پەیوەندیی نێوان کورد و ئەرمەنی کردووە . ئادامۆڤ نووسیویە دەڵێت :

« بەتریارکم بۆ بەرچایی بانگ کردە لای خۆم و هەوڵم دا باس بێنمە سەر پەیوەندیی نێوان کورد و ئەرمەن . بیری بەڕێزیان بەم جۆرە بوو : ئەگەر لە ناو هۆزە کوردەکاندا ، بە تایبەتی لە ویلایەتی بەتلیس ، هەق وا هەبن بە دوژمنی ئەرمەن دابنرێن ، ئەوا ئەوانی تر بە چاوی هاوڕێی سەیری ئەرمەن دەکەن و ئامادەن دەست بخەنە ناو دەستیانەوە . حکومەتی تورکیا کە لە دەمێکەوە بە چاوی گومانەوە دەڕوانێتە هاوڕێیەتی ئەرمەن و کورد و کە بەردەوام هەوڵی داوە دژی یەك هانیان بدات ، ئێستا لەبەر ئەوەی بزۆتنەوە لە ناو کوردا کەوتۆتە رۆ هەوڵێکی تایبەتی دەدا بۆ ئەوەی نوکی تیژی ئەو بزۆتنەوەیە ئاراستەی ئەرمەن بکات »[٥٩] .

بەم جۆرە کورتبینیی بزۆتنەوەی نەتەوەیی چ ئەرمەن و چ

---

(٥٩) بڕوانە : « قەلاچۆی ئەرمەن لە ئیمپراتۆریی عوسمانیدا » ، ل ٢٣٦ ـ ٢٣٧ .

کورد و دەست تێ وەردانی دەوڵەتە گەورەکان و هەوڵ و کۆششی
میری بۆ تێکدانی پەیوەندی نێوان کورد و ئەرمەن و هەوڵدانی
بۆ خەریك کردن و چەواشە کردنی کورد ، دەوری خۆیان بینی لە
بزواندنی بەشێك لە میللەتی کورد دژی ئەرمەن . دیارە دیسان
لەمەشدا تۆبالی گەورە دەکەوێتە سەر ئەو لایەنەی بێ وچان تۆوی
دووبەرەکی دەچاند . هەموو هەڵسانگاندن و نرخاندنێکی قوڵ بۆ
دەوری کورد لە کوشتارەکانی ئەرمەندا دەبێ و پێویستە ئەم راستی‌یە
مێژوویە گرنگەش رەچاو بکات .



بەم جۆرە هەموو کوشتارەکانی ئەرمەن بێ جیاوازی زۆر لەوە
قوڵتر بوون کە بە ئەنجامی هەستی کوێرانە و دواکەوتوویی کورد لە قەڵەم
بدرێن . مەسەلەکە بریتی بوو لە کارێکی رێکخراوی ورد کە زۆر
لایەن دەستیان تێیدا بوو . کاربەدەستانی دەوڵەتی عوسمانی توانای
چارەسەرکردنی کێشەی ئەرمەنیان نەبوو ، لە هەمان کاتیشدا لە دۆڕاندنی
ئەرمینیا وەك ناوچەکانی بەڵقان دەترسان . ئەمە بۆ خۆی هەوێنی
گەورەی ئەو کوشتارانە بوو کە بەشێکی کەم لە میللەتی کورد بووە
یەکێك لە داردەستەکانی جێ بەجێ کردنیان .

تەنانەت لە بارەی قۆناغی یەکەمی ئەم کوشتارانەوە کە سوڵتان
عەبدولحەمید و پیاوەکانی هەوڵێکی زۆریان دا بۆ ئەوەی گوناهی
بخەنە ئەستۆی گەلی کورد ، گەلێك بەڵگەی مێژوویی هەیە نیشانی
دەدەن چۆن میری و تەنها میری رێکخەری یەکەم و تاوانباری هەرە
گەورە بووە . لە زوربەی ناوچەکاندا لەشکر و جاندرمەکانی میری

کوشتاریان دەست پێ دەکرد و دەیانبژاندەوە . بە وێنە ئەرکی لە ناو بردنی ئەرمەن لە ئورفە بە ۳ هەزار سەرباز و لە ئەرەبکیر بە ۱٦۰۰ سەرباز و جاندرمە سپێردرا[٦۰] .

لە کوشتارەکانی شەڕی یەکەمدا ئەم راستی‌یە گەلێک لەوەش روونتر بوو . ئەمەش لەوەوە هاتبوو کە لەو ساڵانەدا دەستی هەموو لایەک کەوتبووە روو و دەوڵەتی عوسمانی کە بە تەمای سەرکەوتن بوو حیسابێکی ئەوتۆی بۆ رای گشتی ئەوروپایی نەدەکرد . راستە بەشێک لە کاربەدەستان لەگەڵ ئەوەشدا هەوڵی شاردنەوەی تاوانەکانی میری‌یان دەدا[٦۱] ، بەڵام زوربەیان بە ئاشکرا شانازی‌یان پێوە دەکرد . جگە لەوە گەلێک بەڵگەی رەسمی کرنگ ( نهێنی و ئاشکرا ) بە دەستەوەیە لە هەموو روویەکەوە تاوان و بەرپرسی میری نیشان دەدەن . جا با لێرەدا کەمێکیش لەم باسانە بکۆڵینەوە تا لە ئەنجامدا باشتر بتوانین دەوری کورد دیار کەین .

بەر لە هەموو شتێک با ناوەرۆکی بروسکەیەکی طەلعەت پاشای

---

(٦۰) هەمان سەرچاوە ، ل ۱۲۹ .

(٦۱) بە وێنە لە هەندێک ناوچە وێنە گرتنی کارەساتەکان قەدەغە بوو . زۆر جار ، بە تایبەتی لە سەرەتادا ، هەر ئەو کارەساتانە لە رای گشتی دەرەوە دەشاردرانەوە . فائز الغصین باسی ئەوە دەکات گوایە لە هەندێک ناوچە کاربەدەستان جلی کوردی‌یان کردۆتە بەری ئەرمەنە کوژراوەکان و بەو جۆرە وێنەیان گرتوون تاوەکوو ئەرمەن بە تاوانبار نیشان دەن ( بڕوانە : فائز الغصین ، سەرچاوەی ناوبراو ، ل ۳۸ ــ ۳۹ . هەروەها بڕوانە « قەلاچۆی ئەرمەن لە ئیمپراتۆری عوسمانیدا » ، ل ۲۸۷ ، ۳۲۳ ) .

وەزیری ناوخۆ بهێنینەوە کە بە تایبەتی ناردوێیە بۆ حاکمی حەڵەب .
طلعەت پاشا لەو بروسکەیەیدا بێ پێچ و پەنا دەڵێ :

« بەر لە ئیستا پێتان راگەیێنراوە کە وا بە پێی فەرمانی جەمعیەت بڕیار دراوە بە یەکجاری ئەو ئەرمەنانە لە ناو ببرێن کە لە تورکیادا دەژین . ئەوانەی دژی ئەم بڕیارە دەوەستن (مەبەستی لە کاربەدەستانە ـ ك. م.) ناتوانن لە سەر کارەکانی خۆیان بمێننەوە . هەر چەند ئەو هەنگاوانەی دەنرێن توند و تیژ بن دەبێت کۆتایی بۆ ئەرمەن دابنرێت . بە هیچ جۆرێك گوێ مەدەنە تەمەن و پیاو و ئافرەت و وێژدان » (III)[٦٢] .

طەلعەت پاشا دەیزانی چیی مەبەستە و ئەوی دەشیکوت دەیکرد . وا لێرەدا وێنەی دوو بروسکەی تری دەهێنینەوەکە هەر بۆ حاکمی حەڵەبی ناردوون[٦٣] :

« زانیومانە گوا ژمارەیەك لە فەرمانبەران دراون بە دادگەی سەربازی بە تاوانی تالان و توند و تیژی لەگەڵ میللەتە ناسراوەکەدا (دیارە مەبەستی ئەرمەنە ـ ك. م ) . ئەمە تەنانەت گەر بۆ رواڵەتیش بێت لەوانەیە ببێتە هۆی سارد کردنەوەی فەرمانبەرەکانی تر . لەبەر ئەوە فەرمان دەدەم رێگەی ئەو جۆرە موحاکەمانە نەدرێ » .

---

(٦٢) بڕوانە : « The Memories of Naim Bey. Turkish official documents relating to the deportations and massacres of Armenians, London, 1921, p. 64.

(٦٣) ئەو ئەرمەنانەی دوور دەخرانەوە لە رێگەی حەڵەبەوە دەنێررانە سوریە و عیراق .

لە برۆسکەی دووەمیدا دەڵێت :

« ئەگەر گوێ بدرێتە ئەو سکاڵایانەی ئەو کەسانە ( مەبەستی ئەرمەنە ـ ک. م.) لە بارەی هەمەجۆر کاری تایبەتی خۆیانەوە دەیدەن گەوا نەک هەر ناردنیان بۆ بیابان دوادەکەوێ بەڵکو لەوانەشە ببێتە هۆی دروست بوونی زنجیرەیەک کرداری ئەوتۆ کە دوور نییە لە دوارۆژدا ببێتە هۆی پەیدا بوونی کێشەی سیاسی . دەبێ لەبەر رۆشنایی ئەمەدا فەرمانی پێویست بە فەرمانبەران بدرێت »[٦٤] .

شایانی باسە مەولان زادە رەفعەت کە یەکێک بووە لە گەورەکانی تورکە لاوەکان لە هەندێک لە یادداشتەکانی خۆیدا کە ساڵی ١٩٢٩ لە حەڵەب بە زمانی تورکی چاپی کردوون دانی بەم راستییانەدا ناوەو

---

(٦٤) دڕندەیی طەلعەت پاشا بەرامبەر بە ئەرمەن لە رادە بەدەر بوو . بە پێی وتارێکی « تایمس »ی لەندەنی ( ٢٩ی ئەیلوولی ١٩١٥ ) طەلعەت پاشا شکاندنی ئەنوەر پاشای هاوەڵی لە قەفقاسدا بە هەل زانی بۆ لێدانی ئەرمەن کە دەیویست تاوانی ئەو شکاندنەیان بخاتە ئەستۆ . شایانی باسە طەلعەت پاشا و دوو هاوەڵەکەی تری ئەنوەر و جەمال پاشا کە بە سێ قۆڵی حوکمی وڵاتیان دەکرد بە هەمان چاو سەیری عەرەب و کوردیشیان دەکرد . دوای دۆڕاندنی شەڕ و رووخانی دەوڵەتی عوسمانی طەلعەت پاشا لە تورکیا رای کرد ، بەڵام تالێریان کە قوتابییەکی ئەرمەنی بوو خۆی بۆ دۆزینەوەی تەرخان کرد تا رۆژی ١٥ی مارتی ساڵی ١٩٢١ لە سەر یەکێک لە شەقامەکانی بەرلین دەستە و یەخە بەرەنگاری هات و بە کوشتنی تۆڵەی ئەرمەنی بێ تاوانی لێ سەندەوە .

پێی ئەوەی کردووە چۆن دوای کۆبوونەوە و لێکۆڵینەوەی تایبەتی لە لایەن سەردارانی تورکە لاوەکانەوە بڕیاری لە ناو بردنی ئەرمەن دراوە .

ئا لەم قوژبنەوە دەبێ سەیری کارەساتەکانی ئەرمەن لە ساڵەکانی شەڕی یەکەمدا بکرێ . نیاز و فەرمانی میری ڕوون و ئاشکرا بوو ، بە پێی ئەو فەرمانانە کاربەدەستان و لەشکر ئەوەی « پێویست » بوو جیاتکرد . دیارە بێ بەشداری سەرەکی تۆپ و جبەخانەی لەشکر ملیۆن و نیوێک بەشەر هەر وا بە ئاسانی نەدەهاتنە کوشتن . هەر بۆ نموونە ئەمە دێنینەوە : لە سەرەتای مانگی تەمووزی ساڵی ١٩٥١دا ٢٠ هەزار سەربازی پڕ چەک بە ١١ تۆپەوە لە ئەستەنبوڵەوە بەرەو شاری مووش کەوتنە ڕێ . ڕۆژی ١٠ی هەر ئەو مانگە ئەو تۆپانە بۆ ماوەی چەند سەعاتێک بێ وچان گەڕەک و ناوچەی ئەرمەنەکانیان لەو شارەدا بۆمباباران کرد[٦٥] . هەندێک لە کاربەدەستان ، وەک موتەسەریفی مووش ، بە ئاشکرا و بێ پێچ و پەنا شانازییان بەوەوە دەکرد کە چەند بە ڕەقی و توند و تیژی و بێ هیچ بەزەییەک لە کوشتارەکاندا بەشدار بوون[٦٦] .

دیسان ئەگەر هەر لەم قوژبنەوە سەیری مەسەلەکە بکەین ئەوا بە ئاسانی تێ دەگەین و بڕوا دەکەین کە بەشێک لە کوردە بەشدارەکانی

(٦٥) بڕوانە : « قەلاچۆی ئەرمەن لە ئیمپراتۆریی عوسمانیدا » ، ل ٢٨٠ ــ ٢٨٢ . هەروەها بڕوانە ل ٢٥٥ .

(٦٦) هەمان سەرچاوە ، ل ٢٧٩ ، ٢٨٢ .

ئەو کوشتارانە بە زۆری کاربەدەستان پاڵیان بۆ ئەو کارە پێوە نراوە. لێرەدا دەتوانین گەلێك بەڵگە و نمونە لە سەرچاوەی زۆر جیاوازەوە بۆ رۆن کردنەوەی ئەم مەسەلەیە بهێنینەوە. راستە کوردی ساکار و هەژار هەبون لە ناو برسێتی و لەبەر دواکەوتویی خۆیان حەزیان دەکرد لە تالانی ئەرمەندا بەشدار بن، بەڵام کاربەدەستان بەوە رازی نەبون، چونکە ئەوان کوشتنیان لەو جۆرە کوردانە دەویست ئینجا تالان. «ئێمە فەرمانمان دانی (بە کوردەکان ـ ك.م.) ئەرمەن لە ناو بەرن، کەچی خێراتر کەوتنە تالان وەك لە کوشتن» ـ ئەمە قسەی یەکێکە لە کاربەدەستە گەورەکانی شاری موش لە کاتی کوشتاری یەکەمدا[٦٧]. زۆر کوردی ساکار دەیانزانی کە ئەوان فەرمانی سوڵتانی[illegible] میری جێ بەجێ ئەکەن و جار و بار ئەمەیان بە ئەرمەنەکان خۆیان رادەگەیاند. زۆر جاریش سوارەی حەمیدی یا هۆزەکانی سەر بە میری بێ یاریدەی تۆپ و لەشکر هیچیان پێ نەدەکرا. لە هەموی خراپتر ئەوە بو کە کاربەدەستان لە زۆر ناوچە حەپسە کوردەکانیان بەر دەدا کە چەتەو پیاوکوژیشیان تێدا بو و کوشتن و تالانی ئەرمەنیان بۆ دەکردنە نرخی «ئازاد» کردنیان. ئەم کارە بێ رەوشتییە لە هەمو قۆناغەکانی کوشتاری ئەرمەندا روی داوە[٦٨]. وەك مامۆستا عەبدولعەزیز یامولکی باسی دەکا لە زۆر ناوچەی تریشەوە حەپسیان

---

(٦٧) هەمان سەرچاوە، ل ٨٨ ـ ٨٩، ١٢٦.

(٦٨) هەمان سەرچاوە، ل ١٢٢ ـ ١٢٣، ١٢٦، ١٨٤ ـ ١٨٥، ٢١٠، ٢٢٢، ٣٠٦، ٣٠٩، ٣٢١، ٤٨٨.

دەهێنا و دوای ئەوەی جل و بەرگی کوردییان پێ لەبەر دەکردن دەستە دەستە دەیانناردنە شاری وەك ئەرزروّم و دیاربەکر[٦٩]. لە کاتی کوشتاری یەکەمدا لە هەندێك ناوچە میری سەربازیـی بە جلی کوردییەوە دەنارد[٧٠].

دوای ئەوەی حەپس و پیاو خراپ و سوارەی حەمیدی کۆدەکرانەوە ئینجا کاربەدەستان بە گەرمی دەکەوتنە هاندانیان و یارییان بە عەقڵ و هەستیان دەکرد و ئەوسا بەریان دەدانە گیانی ئەرمەن. ژمارەیەك لەو ئەرمەنانەی ئەمەیان بە چاوی خۆیان دیوە لە نامەیەکیاندا نووسیویانە دەڵێن: « بـۆ ئەوەی هیچ نەبێت کەمێك بیانوو بـۆ کوشتارەکان بدۆزنەوە و هەر بەو رادەیەش خەڵکەکە زیاتر دژی ئەرمەن هان بدەن کاربەدەستان بەر وە لە کات و دوای کوشتارەکان گەلێك تاوانیان بۆ ئەرمەنەکان دروست دەکرد و ... لە هەمووی زیاتر بە یاخی بوویان لە قەڵەم دەدان »[٧١].

بەڵگەیەکی تری گرنگ کە کوشتاری ئەرمەن زۆر لەوە قووڵتر بوو ئەنجامی هەستی کوێرانە و دواکەوتوویی کورد بێ ئەوەیە کە وا ئەڵمانە هاوپەیمانەکانی تورك دەستیان تێکەڵی مەسەلەکە بـوو. ئەڵمانەکان ئەرمەنە هاوئایینە زۆرلێکراوەکانیان لەبەر خاتری عوسمانییە زۆردارە هاوپەیمانەکانیان خستە پشتگوێ. دیارە ئەڵمانەکان لەمەدا بەر لە

---

(٦٩) عەبدولعەزیز یاموڵکی، سەرچاوەی ناوبراو، ل ٦٢.

(٧٠) بڕوانە: « قەلاچۆی ئەرمەن لە ئیمپراتۆری عوسمانیدا »، ل ٣٨.

(٧١) هەمان سەرچاوە، ل ١٢٦.

هەمو شتێك بەرژەوەندی خۆیان لێك دەدایەوە . دەیانزانی ئەرمەنەکان پشت بە رۆسیا و بەریتانیای دوژمنی ئەڵمانیا زیاتر دەبەستن وەك لەوان و دەشیانزانی هەردو لایان لەگەڵ فەرەنسەدا دەیانەوێ لە رێگەی مەسەلەی ئەرمەنەوە زیاتر دەست بخەنە کاری دەوڵەتی عوسمانییەوە کە لە راستیدا ببووە نیمچە موستەعمەرەیەکی ئەڵمانیا .

بە پێی گەلێك سەرچاوە ئەڵمانەکان دەستیان لە کوشتارەکانی سالآنی شەڕی یەکەمی ئەرمەندا هەبووە . « تایمس »ی لەندەنی لە هەمان ژمارەی پێشتریدا کە باسمان کرد دەڵێ گوایە ژمارەیەك لە کۆنسوڵە ئەڵمانەکان دەستیان بووە لە هاندانی کاربەدەستە عوسمانییەکاندا دژی ئەرمەن و بە تایبەتی لەمەدا ناوی کۆنسوڵی ئەڵمانی لە حەلەب دێنێ . وا دیارە ئەفسەری ئەڵمانی لە هەندێك ناوچەدا ، وەك لە ئورفە ، لەگەڵ ئەو هێزانەی لەشکری عوسمانیدا بون کە بێ بەزەییانە لە ئەرمەنیان داوە . لە هەندێك ناوچەی تر سەربازەکان وتویانە گوایە فەرمانی سوڵتان و ئیمپراتۆری ئەڵمانیا جێبەجێ دەکەن . ئەرمەنەکان خۆیشیان لەو باوەڕەدا بون کە ئەڵمانیا بە چاوی ناحەز سەیریان دەکات و دەستی لە رێکخستنی کوشتار و ئاوارەکردنیاندا هەیە[٧٢] .

(٧٢) هەمان سەرچاوە ، ل ٣١٦ ، ٣٢٥ ، ٣٤٠ ، ٣٩٥ . هەروەها بڕوانە : فائز الغصین ، سەرچاوەی ناوبراو ، ل ٣٩ ـ ٤٠ ؛
E. H. Keeling, Op. Cit., PP. 213-214.

شایانی باسه لە كاتی موحاكەمەی تالێریاندا لە بەردەمی یەكێك لە دادگاكانی بەرلین بە بۆنەی كوشتنی طەلعەت پاشاوە (بڕوانە پەراوێزی ٦٤) باسی دەوری ئەڵمانیاش لە كوشتارەكانی ئەرمەندا هاتە پێشەوە. دادگەی ناوبراو نەك هەر دانی بەوەدا نا كە تالێریان حەقی خۆی بوو طەلعەت پاشای كوشت و لە سەر ئەو ئەساسە بەرەڵای كرد بەڵكو لە هەمان كاتدا ئەو راستیانەی خرانە بەر دەمی ئەو دادگەیە دەنگێكی گەورەیان لە رۆژنامەكانی ئەو سەردەمەی ئەڵمانیادا دایەوە و لە ئەنجامی ئەوەدا ئەو رۆژنامانە داوایان دەكرد رادەی بەرپرسی مەعنەوی ئیمپراتۆری ئەڵمانیاش لە كوشتارەكانی ئەرمەندا دەستنیشان بكرێ[٧٣].

هەر بەم بۆنەیەشەوە جێی خۆیەتی لێرەدا بە كورتی باسی هەڵوەستی رای گشتی جیهان و دەوڵەتە گەورەكان بەرامبەر كوشتارەكانی ئەرمەن بكەین. تا ئێستە چەند جارێك لە جێگەی خۆیدا باسی ئەوەمان كرد چۆن ئەرمەنەكان لە ژێر سایەی زوڵم و زۆری بێ ئەندازەی عوسمانێیەكاندا ناچار بوون رۆژ بە رۆژ زیاتر پشت بە دەوڵەتە گەورەكان ببەستن و پەنایان بەرنە بەر[٧٤].

---

(٧٣) بڕوانە : ئەكادیمی نارلێ ، سەرچاوەی ناوبراو ، ل ٣٩٢ ـ ٣٩٣ .

(٧٤) یەكێك لە ئەرمەنە كۆنەكان بۆی گێڕامەوە چۆن هەمو هیوایەكیان هاتبووە سەر رەحمەتی رۆژئاواییەكان . دەیگوت ئەنانەت كاتێك پاپۆڕی پەسكێك لە دەوڵەتە گەورەكان دەهاتە ناو بەندەرێكی عوسمانییەوە ئەرمەنەكان یەكسەر لە خۆشیاندا بەمەلە دەچوون بۆ پێشوازی ئەو پاپۆڕە ، بەڵام زۆر جار كەشتیەوانەكان گاڵتەیان پێ دەكردن و ئاوی گەرمیان بە سەردا دەڕشتن .

بەڵام ئەم دەوڵەتانە بەر لە هەمو شتێك لە قوژبنی مەسڵەحەتی
خۆیانەوە سەیری ئەرمەن و مەسەلەی نەتەوەیی ئەرمەنیان دەکرد .
کەی بە پێویستیان بزانیایە پشتیان دەگرت و لە سەریان هەڵدەدایی ،
کەلێك جاریش خۆیان لە عاستیدا گێل دەکرد یا لە ژێر فشاری رای
گشتیدا بە ناو لە سەری دەهاتنە دەنگ .

بەم جۆرە تێ دەگەین بۆ لە کاتی کوشتارەکانی سەردەمی
سوڵتان عەبدولحەمیدا دەوڵەتە ئەوروپاییەکان بە زۆر کەوتنە جوڵە .
لە وڵاتێکی وەك فەرەنسەدا تەنها ژمارەیەك لە هەرە پێشکەوتنخوازە
ناحەزەکانی دەوڵەت دەنگی ناڕەزایی خۆیان دەربڕی . بەڵام لە
هەمان کاتدا زۆر کەس هەوڵیان دەدا تەفسیر بۆ وسکت بوون و
هەڵوەستی هەلپەرستی خۆیان بدۆزنەوە . باشترین وەسف بۆ ئەمە
نوسەری گەورەی فەرەنسە ئەناتۆل فرانس داویتی کە دەڵێت :
« دیارە لەبەر ئەوەی زوربەی خەڵك روی خۆیان لە لێ قەوماوان
وەردەچەرخێنن ، زۆر کەس توانی‌یان ئەساس بۆ گوناهبارکردنی
قوربانییەکان بدۆزنەوە .. » .

لە ساڵەکانی شەڕیشدا کاتێك ئەوروپا و ئەمەریکا بە خەبەر هاتن
کار لە کار ترازا بو ، راستییەکەی ئەو بە خەبەر هاتنەشیان زیاتر
بۆ ئەوە بو هێرش بەرنە سەر ئەڵمانیای دوژمنیان . راستە ڕای گشتی
لە ئەمەریکا و بە تایبەتی لە ئەوروپا لە سەر ئەرمەن هەڵیان دایی ،
بەڵام ئەو لە سەر هەڵدانە یەکجار لە خوێنی ملیون و نیوێك

بەشەری بێ تاوان و لە ئاوارە کردنی سەدان هەزار منداڵ و پیر و پیرێژن کەمتر بێ ـ قەترەیەك پیاوەتی بێ لە دەریایەکی خوێندا !!(٧٥) .



لە بەر رۆشنایی ئەو راستییانەی تا ئیستە باسمان کردن و ئەو بەراورد و لێکۆڵینەوانەی پێشکەشمان کردن دەتوانین بە دڵنیاییەوە دیسان دووبارەی بکەینەوە کە وا مەسەلەی کوشتاری ئەرمەنی زۆر لەوە گەورەتر و قووڵتر بێ ئەنجامی هەستی کوێرانە و دواکەوتوویی کورد بێت . مێژووتوسی بەناوبانگ ئارنۆڵد تۆینبی لەم بارەیەوە قسەیەکی رەوای لۆرد جێمس برایسی هێناوەتەوە کە لە وتارێکی لە ئەنجومەنی لۆرداندا کاتی خۆی پێشکەشی کردووە و تێیدا وتوویە : « ئەمە (واتە کوشتارەکان ـ ك. م.) ئەنجامی هەڵچوونی رقی موسڵمانان دژی ئەرمەنە گاورەکان نەبێ . هەمووی بە تەواوەتی لەگەڵ ئیرادەی میریدا دەگونجا ، ئەنجامی هەستی ئایینی کوێرانە نەبێ ، بەڵکو ئەنجامی هۆی سیاسی بێ : میری دەیویست خۆی لە دەست گەلە ناموسوڵمانەکان قوتار کات چونکە یەك پابەندی ئیمپراتۆرییەتیان دەشێواند و هونسورێکیان پێك دەهێنا کە هەمیشە ئامادە نەبێ

(٧٥) مامۆستا عەمەدی مەلا کەریم لەومدا بە هەڵەدا چووە کە دەڵێ خەباتی نەتەوەی ئەرمەنی « لە هەمتوو ئازادی خوازانی گیتییەوە پشتیوانییەکی گەرمی (؟!) لێ ئەکرا » (عەمەدی مەلا کەریم ، سەرچاوەی ناوبراو ، ل ٦٣ ) .

سەر بۆ زۆرداری دانەوێنێ »[٧٦] .

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کە تەنها بەشێك لە میللەتی کورد ـ نەك میللەتی کورد خۆی ـ یەکێك بوون لە داردەستەکانی جێ بەجێ کردنی ئەم کارە رەشە[٧٧] ، لەگەڵ ئەوەشدا کوشتارەکان دەورێکی خراپیان لە ئاڵۆز کردنی پەیوەندی و برایەتی نێوان کورد و ئەرمەندا بینی و دوژمنی هەر دوو لایان لەمەدا قازانجی کرد و تەنانەت دوای تەواو بوونی کوشتارەکانیش ئاگری ئەو دوو بەرەکی یەی هەر خۆش دەکرد . دەوڵەتە گەورەکانیش تا رادەیەکی هەست پێ کراو ئەمەیان بە دڵ بوو .

قووڵ بوونەوەی ئەم ناکۆکی و دووبەرەکی یە زۆ لە چەند رووداوێکدا رەنگی دایەوە . لە هەموو رووداوێك زیاتر سەرچاوە

---

(٧٦) بڕوانە : « قەلاچۆی ئەرمەن لە ئیمپراتۆری عوسمانیدا » ، ل ٢٩٥ .

(٧٧) لە چەند سەرچاوەیەکدا باسی ئەوە کراوە چۆن ژمارەیەك ئەفسەری عەرەب ساڵی ١٩١٢ بەڵگەیەکی گرنگیان دۆزیوەتەوە کە بریتی بووە لە نامەی یەکێك لە سەردارانی تورك لاوەکان بۆ ئەفسەرێ-کی گەورە کە ئەمەی تێدا بووە : « عەرەبەکان بدەنە بەر گوللەی دوژمن و هەوڵ بدەن خۆتانیان لە دەست رزگار بکەن چونکە لە ناو بردنیان گەلێک ئێمەی تێدایە . بەڵام ئاگاداری کوردەکان بکەن لەبەر ئەوەی بۆ ولاتی ئەرمەن کارمان پێیان دەبێ » هەر ئەو سەرچاوانە دەڵێن کە وا زورەی رۆژنامە عەرەبی یەکانی ئەو سەردەمە ئەم نامەیان بڵاو کردۆتەوە ( بڕوانە : « ثورة العرب . مقدماتها ، اسبابها ، نتائجها » ، بقلم احد اعضاء الجمعيات العربيه ، القاهرة ١٩١٦ ، ص ١٤٦ . هەروەها : « مؤتمر الشهداء » ، بيروت ، ص ٤٥ .

ڕەنگاوانێکان سەرنجیان بۆ کاولکاری و کوشتاری شاری ڕەواندوز لە ساڵەکانی شەڕدا ڕاکێشاوە . ئەوە بوو کە هێزەکانی ڕوس لە سەرەتای مایسی ساڵی ١٩١٦دا لە ژێر سەرکردایەتی جەنەراڵ چێرنەزوبەفدا بەرەو ڕەواندوز هاتن چوار فەوجی « فیداکار »ی ئەرمەن و نەستوری‌یان لەگەڵدا بوو[٧٨]. ڕۆژی ١٣ی مایس ئەم هێزانە توانی‌یان شاری ڕەواندوز بگرن . ئەرمەنە داخ لە دڵەکان ویستویانە تۆڵە بسێنن و بە بەر چاوی ڕوسەکانەوە کەوتونەتە گیانی دانیشتوانی ڕەواندوز . بە پێی زۆر سەرچاوە لە کاتی ئەم کوشتارەدا دەوروبەری ٥ هەزار پیاو و ئافرەت و منداڵی کورد بونەتە قوربانی و گوایە زوربەی هەرە زۆریان بە گولە نەکوژراون ، بەڵکو فڕێ دراونەتە گەلی ڕەواندوزەوە ، لە نزیکەی دوو هەزار خانوبەرەی ناو شاریش تەنها ٢٠ ماڵی بە سەلامەتی دەرچون[٧٩] .

---

(٧٨) بڕوانە : شكری محمود نديم ، الجيش الروسي في حرب العراق ، الطبعة الثانية ، بغداد ١٩٦٧ ، ص ١٨ ، ٤٤ ـ ٤٦ ، ٥١ ، ٦٣ .

(٧٩) بڕوانە : K. Mason, Op. Cit, pp. 331, 335; « League of Nations. Question of the frontier between Turkey and Iraq » p. 42 .

ئەم ژمارەیە لەوە دەکات زۆر بێت . نە مامۆستا ئەمین زەکی کە باسی زیانەکانی شەڕی یەکەمی کردووە و نە مامۆستا حسێن حوزنی موکریانی کە بۆ خۆی دوای شەڕی یەکەم لە ڕەواندوز ژیاوە و لە سەری نوسیوە ، باسی ژمارەیەکی وا گەورەیان نەکردووە . ئەوەی لە ناو کوردەواریدا بلاوە ئەوەتە کە گوایە زۆر ئافرەتی کورد لە ناو ناموسیان خۆیان لە گەلی‌یەوە فڕێ داوەتە خوارێ . مامۆستا حسێن حوزنی باسی کاولکاری=

جگە لە ڕەواندوزیش ، هەر لە کاتی کوشتارەکان خۆیاندا ، زیانی کەم لە کورد نەکەوت . لە کاتی کوشتاری یەکەمدا تەنها لە یەك ناوچە نزیکەی صەد کورد لە ئەنجامی بەرهەڵستی پیاوانەی ئەرمەن لە ژیان خۆیان ، کوژران . لە ناوچەی دیاربەکریشدا لە موسڵمانەکان بە کوردەوە ١٩٥ کەس کوژران ، بەڵام لێرە نزیکەی حەفتایان بە دەستی خۆیان کوژران لە کاتی دابەش کردنی تاڵانیدا[٨٠] . ساڵی ١٨٩٧یش ئەرمەنە چەکدارەکان هێرشێکی گەورەیان بۆ سەر هۆزێکی کورد ڕێکخست و زیانی زۆر گەورەیان پێ گەیاند[٨١] . لە کاتی کوشتاری دووەمیشدا زیانی لەو جۆر و بابەتە لە کورد کەوت .

بەر لەوەی کۆتایی بەم باسە بهێنین زۆر گرنگ و پێویستە سەیری دیوی ئەودیوی مەسەلەکە بکەین ، ئەو دیوەی بە داخەوە بایەخی زۆری پێ نەدراوە هەرچەندە بۆ ڕوون کردنەوەی ناتوانرێ بە تەواوەتی و بێ لایەنی دەوری کورد لە کوشتارەکانی ئەرمەندا دیار بکرێ . ڕاستە و بێ شاردنەوە و پێچ و پەنا باسی ئەوەمان کرد

---

= ڕەواندوزی کردووە ، بەڵام بە کرداری لە شکری ڕۆسی داوەتە قەڵەم ( حسین حزنی موکریانی ، سەرچاوەی ناوبراو ، ل ١١٣ ) .

(٨٠) بڕوانە : « قەلاچۆی ئەرمەن لە ئیمپراتۆری عوسمانیدا » ، ل ٣١ ، ١٢٠ و هی تر .

(٨١) بڕوانە : البروفیسور پول أمیل ، تاریخ أرمینیا ، ترجمة شکري علاوي ، بیروت ، ص ٤٩ .

چۆن ئەو کوشتارانە پڕن لە لاپەڕەی ڕەشی هەندێک دەستە و دایەرەی کورد ، بەڵام لە هەمان کاتیشدا لاپەڕەی پڕ شانازی کەمیان بۆ کورد تیا نییە .

چ لە کوشتاری یەکەم و چ لە کوشتاری دووەمدا زوربەی هەرە زۆری کورد بێ لایەن وەستان . هۆیەکی گەورەی ئەم بێ لایەنییە لە هەڕەشە و گوڕەشەی بێ وچانی کاربەدەستانەوە هاتبوو کە بە هەر چوار لادا بڵاویان دەکردەوە چۆن توندترین سزا چاوەڕوانی ئەو کەسانە دەکات کە کەمترین یارمەتی پێشکەش بە ئەرمەنە لێ قەوماوەکان دەکەن . لە ڕۆژانی کوشتاری دووەمدا (واتە لە ساڵەکانی شەڕی یەکەمی جیهاندا) میری بە زۆر ناوچەدا بڵاوی دەکردەوە کە « هەر کەسێک بوێرێ منداڵ ، ئافرەت یا کچە ئەرمەنی لە ماڵی خۆیدا بشارێتەوە و لای بدۆزرێتەوە ئەو کەسە بە ئەرمەنی دادەنرێ و لە پای ئەوە سەری دادەنێ » . لە گەلێک شوێن لای هەر کوردێک ئەرمەنێک بدۆزرایەتەوە خێرا جاندرمە دەهاتن و هەر ئەو کوردەیان ناچار دەکرد بە دەستی خۆی بیکوژێ[82] .

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا خەڵکی زۆر ناوچە ناڕەزایی خۆیانیان بەرامبەر بە کوشتارەکانی ئەرمەن دەردەبڕی ، لە گەلێک ناوچەش دەستی یارمەتیدەی برایانەیان بۆ ئەرمەنە لێقەوماوەکان درێژ دەکرد ، بە

(٨٢) بڕوانە : « قەلاچۆی ئەرمەن لە ئیمپراتۆری عوسمانیدا » ، ل ٢٠٣ ، ٢٠٩ .

سەدان و بە هەزارانیان لە مردن و برسێتی لێ رزگار دەکردن .
ئەکادیمی گەردلێفسکی لەم بارەیەوە نووسیویە دەڵێ :

« لە هەموو شوێنێك لە ناو کوردا ئەرمەنەکان هاوڕێیان هەبوو کە لە کاتی تەنگانەدا لە دەست تورك رزگاریان دەکردن . ئەمە لە کاتی کوشتارەکانی ئەرمەنی کۆتایی سەدەی نۆزدەدا وابوو ، ئێستەش ( واتە لە ساڵەکانی شەڕی یەکەمدا ـ ك. م. ) هەر وایە ... زۆر جار کوردی وایان نیشان دەدام کە ئەرمەنیان لە مردن رزگار کردبوو »[83] .

بەڵگە و نموونە بۆ ئەم قسەیە زۆرە و دیارە هەر ئەوەش وای لە کوردێکی وەك مامۆستا عەبدولعەزیز یامولکی کردووە بڵێ : « گەر ئەرمەنییەك لە ئەنادۆڵدا مابێت ئەوانەن کە لە شمشێری تورك رزگاریان بووە ، لەمانەش بێ گومان کردن سێ لە چواریان بە هۆی یاریدەی کوردەوە رزگار بوون »[84] . جا با لێرەدا چەند نموونەیەك بۆ ئەم مەسەلە گرنگەش بخەینە بەر چاو .

لە کاتی کوشتاری ئورفەدا ( دوا دوو رۆژی ساڵی ١٨٩٤ ) نزیکەی ٢٫٥٠٠ کەس ، کە زوربەیان منداڵ و ئافرەت بوون ، پەنایان

---

(٨٣) ف. ا. گەردلێفسکی ، کارە هەڵبژاردەکانی ، بەرگی سێیەم ، ل ١٢٢ .
هەر هەمان نووسەر باسی ئەوەش دەکات چۆن ئەرمەنەکان لە زۆر ناوچەدا کە لەشکری رووسیان تێ هاتبوو یاریدەی کوردیان داوە و رێگەی لای رووسیان نیشان داون ( هەمان سەرچاوە ، ل ١٢٣ ) .
(٨٤) عەبدولعەزیز یامولکی ، سەرچاوەی ناوبراو ، ل ٦٢ .

ردە بەر کڵێسەی ئەرمەنەکان ، بەڵام زۆری نەخایاند نەوت کرا بە کڵێسەکەدا و ئاگری تێ بەردرا . لەمانە تەنها پەنجا کەسێکیان لێ رزگار بوو ئەویش بە هۆی یاریدەی مستەفا ئاغای رەجەب و حەیدەر و خەلیل رەجەبەوە . جگە لەوە ئەم سێ کەسە هەموو ئەرمەنەکانی گەڕەکی خۆیان و گەلێکی تریان لە مردن رزگار کردووە[85].

لە کتێبێکی رۆسیدا کە ساڵی ١٨٩٧ لە مۆسکۆ بە ناوی « یاریدەی رایانە بۆ لێقەوماوە ئەرمەنەکانی تورکیا »وە چاپ کراوە بە تایبەتی سەرنج بۆ چاکە و پیاوەتی کورد لەگەڵ ئەرمەندا راکێشراوە . کتێبی ناوبراو دەڵێت : « گەلێك بەگی کوردی وا بووە کە زۆر ئەرمەنیان رزگار کردووە . مەحمود زادە بەیتوڵلا بەگ کە بە رۆشنایەتی و پیاوەتی ناسرابوو ، هەموو ناوچەی مۆکسی لە کوشتار قوتار کرد ... لە کاتی کوشتارەکەدا لە ناوچەکەی خۆی نەبوو ، بەڵام لەبەر ئەوەی دەیزانی پیاوخراپانی کورد نەبوونی ئەو بە هەل دەزانن و دەکونە گیانی ئەرمەنەکان بە پەلە لە وان گەڕایەوە و ٤٠٠ کوردی ئازای کۆکردەوە و ئەو عەشیرەتە کوردانەی ( مەبەست سوارەی حەمیدییەیە ـ ك. م ) راو نا کە بەرەو ناوچەی مۆکس بۆ کوشتار دەچوون . هەر ئەم بەگە ، جگە لە گەلێك یاریدەی تر کە پێشکەشی ئەرمەنی کردوون ، ساڵی رابوردوو ( واتە ساڵی ١٨٩٥ ـ ك. م.) ٣٠٠ لیرە باربووی بە ئەرمەنەکان دا »[86] .

---

(٨٥) بڕوانە : « قەلاچۆی ئەرمەن لە ئیمپراتۆریی عوسمانیدا » ، ل ١٠٠ ـ ١٠١ .

(٨٦) لە هەمان سەرچاوە وەرگیراوە ، ل ١٠٥ ـ ١٠٦ .

له زۆر ناوچــه کوردەکان یاریدەی ئەرمەنەکانیـان دەدا کە رابکەن و خۆیان بشارنەوە . له شوێنی تر کار بەوەوە نەوەستا ، زۆر کورد بە چەکەوە دایانە پاڵ ئەرمەنەکان و کەوتنــه بەرهەڵستی پیاوەکانی میری بە نیازی دانانی رادەیەك بۆ کوشتاری ئەرمەن . کوردی دەرسیم لەمەدا له هەموان پیاوانەتر هاتنە دەست . ئەوان هەر بەر لە دەست پێ کردنی کوشتارەکان چەند جارێك شان بە شانی ئەرمەن پێکەوە راپەڕیون ، له کاتی هــەمو قۆناغەکانی ئەو کوشتارانەشدا له هیچ یاریدەیەکی پێویست دریغییان نەدەکرد و له بەستنی پەیوەندی لەگەڵ سەردارانی ئەرمەندا سڵیان نەدەکردەوە . تەنانەت له ئەنجامی ئەو جۆرە پەیوەندییەدا بــۆ ئەفسەرێکی کورد بە ناوی مستەفا وەناوە لەگەڵ هێزەکانی ژێر دەستیدا دژی عوسمانیێکان دایە پاڵ رۆسەکان(٨٧) . هەر بەو جۆرەش کوردی دەرسیم داڵدەی پتر له ٥ هەزار ئەرمەنی ئاوارەیان دا و لە دەست کوشتن رزگاریان کردن . ئەرمەنەکان خۆیشیان زۆر جار دانیان بە هەڵوەستی پیاوانە و چاکەی کوردی دەرسیمدا ناوە(٨٨) .

کوردە یەزیدێکانیش کە بۆ خۆیان کەمتریان له ئەرمەن بە دەست زوڵم و زۆری عوسمــانیێکانەوە نەدیبوو بە هەستەوە پشتی ئەرمەنەکانیـان گرت و بە پێی توانا یاریدەیان پێشکەش کردن . بە

---

(٨٧) بڕوانە : Nuri Dersimi, Kürdistan tarihinde Dersim, S. 112 - 114 .

(٨٨) بڕوانە : م س. لازەرێف ، سەرچاوەی ناوبراو ، ل ٥٧ ، ٦٨ ، ٢١٥ .

وێنه له کاتی کوشتارەکانی شەڕی یەکەمدا بە سەدان ئەرمەن لە رێگەی دێرەزۆرەوە پەنایان بردە بەر کوردە یەزیدیەکان کە پیاوانە دڵنیان دان و لەگەڵ ئەو هەموو زەحمەتەی خرایە سەریان تەسلیمیان نەکردنەوە[٨٩] .

جگە لەوە لەشکری رووس بهاتایەتە هەر ناوچەیەکی ئەرمینیا یا کوردستان ژمارەیەکی زۆر لە پەنابەرانی ئەرمەنیان لای کوردەکان دەبینێ . لە نامەیەکی تایبەتیدا ئەرمەنەکانی گوندی خانسۆر باسی ئەوەیان کردووە چۆن کوردەکانی هۆزی محەمەد ئاغا بەچەکەوە بەرەنگاری سەرباز و جاندرمەکانی میری هاتوون و رێگەیان نەداون ئەرمەنەکان بکوژنەوە . هەر لەو نامەیەدا نوسراوە « خۆیان ( واتە کوردەکانی هۆزی محەمەد ئاغا ـ ك. م. ) لەگەڵ ئەوەشدا کە بە دەست برسێتییەوە دەیانناڵاند ، دوا پارچە نانیان لەگەڵ ئەرمەنەکاندا دەکرد بە دوو بەشەوە و کەلوپەلی خۆیان بۆ دەفرۆشتن »[٩٠] .

دوای تەواو بوونی شەڕیش لە زۆر ناوچەی کوردستان پەنابەری ئەرمەن دۆزراوەتەوە . هەر دوای بەستنی هودنەی « مۆدرۆس » بە ماوەیەکی کەم چەند نوێنەرێکی کورد چوونەتە لای ئینگلیزەکان لە حەلەب و نامەیەکی تایبەتییان بۆ بردون لە بارەی ئەو ئەرمەنانەوە کە داڵدەیان

(٨٩) بڕوانە : Harry Charles Luke, Mosul and its Minorities, London, 1925, P. 129.

(٩٠) بڕوانە : م . س . لازەرێف ، سەرچاوەی ناوبراو ، ل ٢١٥ .

دابڕێن . لەو نامەیەدا دەڵێن : « لە گونـد و خێوەتەکانماندا ٦٥٠ ئەرمەنی هـەن زۆربەیان ئافرەت و منداڵن . هاوڕێکانی دراوسێمان پتر لە ٣٨٠٠ کەسیان لایە ... ئێمە بۆ ماوەی چوار ساڵ ئەمانەمان ژیاندووە و حەز ناکەین ئەو نانەی پێمان داون بە فیـڕۆ بڕوات ... هەروەها ئاگاداریشین کە ٦٨٠٠ ئەرمەنی تر لە ناو خێوەتـی هۆزە دۆستەکانماندا هەن کە لە ڕۆژهەڵاتن و زۆر لێمانەوە دوورن ، بۆیەکا پەیوەندی کردن پێیانەوە زەحمەتە »[٩١] . هەر لەو نامەیەدا ئەوکوردانە ئامادەیی تەواوی خۆیان نیشان داوە بۆ هەموو جـــۆرە یارمەتیەکی پێویست بۆ دۆزینەوە و کۆکردنەوەی ئەرمەنە ئاوارەکان. بە سەدان ئەرمەنی لەو جۆرە ، ناوچەکانی کوردستانی عیراق و ئێرانیان کردبووە پەناگە و بە باشی ژیان و دوازۆژی خۆیان تیا مسۆگەر کردبو .

شایانی باسە جگە لە کورد گەلانی تری ناوچەکە هـەر یەکەیان بە پێی زروف و توانا یارمەتی ئەرمەنیان داوە لە چەند بەڵگەیەکدا لەم بارەیەوە ناوی چەرکەس هاتووە . هەروەها زۆر تـورکی واش هەبوون یارمەتی برایانەی ئەرمەنەکانیان دەدا . تەنانەت کاربەدەسـتی واش هەڵدەکەوت کە بە ئاشکرا فەرمانەکانی میرییان لە بارەی قەلاچۆ کردنی ئەرمەنەوە جێ بەجێ نەدەکرد یا فێڵیان دەدۆزیەوە بۆ ڕزگار کردنی بەشێکیان . لە هەندێک ناوچەش فەرمانبەر و هۆزی عەرەب یارمەتی هەمەجۆریان پێشکەش بە ئەرمەنـە لێقەومـاوەکان دەکرد.

---

(٩١) بڕوانە : E. H. Keeling, Op. Cit., P. 209 .

سفر جاریش چ کورد و چ ئەوانی تر لەسەر رزگار کردنی ئەرمەنەکان یا یاریدە دانیان تووشی سزای قورس دەهاتن ؛ خۆ بە هەر کوردێك بزانرایە کە لایەنگری نزیك‌کەوتنەوە و یەکگرتنی کورد و ئەرمەنە ئەوا بێ سێ و دوو سەرەونگوم دەکرا و هۆز و پیاوەکانی تووشی سەرگەردانی دەهاتن[92] .

ئەم جۆرە یاریدە و هاریکاری‌یانە جگە لەوەی لایەرەی پڕ شانازین دەوری دیاری خۆیشیان لە نزیك کەوتنەوەی دوازۆزی کورد و ئەرمەندا بینی کە لەگەڵ تەواو بوونی شەڕی یەکەمی جیهاندا سەرەتای دەرکەوت ، بە تایبەتی لەو رێك‌کەوتننامەیەدا کە لە نێوان بۆغوز نووبار پاشای نوێنەری ئەرمەن و شەریف پاشای نوێنەری کوردا لە کۆنگرەی ئاشتی مۆر کرا . گارشاك سافراستیان قسەیەکی جوان و بەجێی لە بارەی ئەم رێك‌کەوتننامەیەوە بۆ هاتووە شایانی ئەوەیە کۆتایی ئەم بەشەی پێ بهێنین . سافراستیان دەڵێت :

« پیاوە دیپلۆماسی و شارەزاکان و دوایی رۆژنامەنووسە ئەوروپایی‌یە جیاوازەکان سەریان لەم رێك‌کەوتنەی ئەرمەن و کورد سوڕما چونکە بۆ ماوەی نیو سەدە وایان دادەنا و

---

(92) بڕوانە : ك. ا. استارجیان ، سەرچاوەی ناوبراو ، ل ٣١٥ - ٣١٦ ؛ ئاثر النصیبی ، سەرچاوەی ناوبراو ، ل ٤٠ ، ٤٣ ؛ « قەلاچۆی ئەرمەن لە ئیمپراتۆری عوسمانیدا » ، ل ١٧٦ - ١٧٧ ، ٤٤٨ و هی تر .

وایان ئیدیعا دەکرد گوایە ئەم دوَ گەلە دراوسێیە « دوژمنی باوەکوشتەی یەکن » و « هەرگیز پێکەوە کار ناکەن »[٩٣] .

• • •

(٩٣) A. Safrastian, Op. Cit., p. 77

# بەشی شەشەم

# دوارۆژی کورد

## لە پلانی دەوڵەتە گەورەکاندا

وەك لە سەرەتادا باسمان کرد هۆی هەرە گەورەی شەڕی یەکەمی جیهان تەماعی دەوڵەتە گەورەکان بوو بۆ دابەش کردنەوەی جیهان . سەرتاپای ئەو دەوڵەتانەش چاویان بڕیبووە خاکی ئیمپراتۆریی عوسمانی و بە پەرۆشەوە چاوەڕوانی میراتەکەی بوون . تەنانەت ئەڵمانیای هاوپەیمانی تورکیا خۆیشی کەمتر لە دەوڵەتەکانی تر بۆ ئەو میراتە بە پەرۆش نەبوو . لەبەر ئەوە دەوڵەتە گەورەکان لە ساڵەکانی شەڕی یەکەمدا بە تاك و بە کۆمەڵ خەریکی پلان دانان و پیلان گێڕان بوون بۆ جێبەجێ کردنی ئەو مەبەستانەیان کە بوونە هۆی شەڕ . دیارە کوردستانیش وەك بەشێك لە دەوڵەتی عوسمانی جێگەیەکی دیاری لەو پلانانەدا هەبوو .

ئەڵمانیا بە تەنها بە تەمای هەموو خاکی دەوڵەتی عوسمانی بوو . دوژمنەکانی کە لە بەرەیەکدا کۆبووبوونەوە هەر یەکەیان پلانی خۆی هەبوو کە دیارە لەگەڵ بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی هەر یەکەیاندا بە جۆرێکی جیاواز دەگونجا . بەریتانیا ویلایەتی موسڵی دەویست ،

بەلاّم لە دراوسێیەتی رۆسیا دەترسا . رۆسیاش بیتوانیایە هەموو کوردستانی ناو دەوڵەتی عوسمانی بۆ خۆی دەویست . هەرچی فەرەنسەش بوو جگە لە سوریا چاوی بڕیبووە ویلایەتی مووسڵیش . ئەمە دیارە ناکۆکییەکی شاراوەی توندی لە نێوان دەوڵەتە هاوپەیمانەکاندا دروست کردبوو کە بە لایانەوە پێویست و مەبەست بوو چارەسەرێکی بکرێ . لێرەوە تێ دەگەین بۆچی پیاوە دیپلۆماسییەکانی بەریتانیا و رۆسیا و فەرەنسە لە ساڵەکانی شەڕدا لە هێزە شەڕکەرەکانیان کەمتر خەریك نەبوون . هەر زۆش لە سەرەتای شەڕدا ناکۆکی نێوان ئەو دەوڵەتانە لەسەر ئەستەنبوول و رێگە ئاوێکانی نێوان دەریای رەش و دەریای سپی ناوەڕاست ، گەیشتە رادەیەك پێویستی دەکرد زوو بە زوو چارەیەکی بۆ بدۆزرێتەوە . ئەمە رێگەی بۆ چارەسەر کردنی کێشە و ناکۆکییەکانی تری نێوانیان خۆش کرد .

پاش گفتوگۆیەکی زۆر و بێنە و بەرەیەکی زیاتر دەوڵەتە هاوپەیمانەکان بە شێوەیەکی نهێنی لە سەر دابەش کردنی ناوچەکانی ئاسیای ئیمپراتۆری عوسمانی رێككەوتن . دیارە ئەو رێككەوتنە نەك هەر بێ ئاگاداری تەواوی گەلانی ئەو ناوچانە بوو ، بەڵکو لە سەر حسابی دواڕۆژیشیان بوو .

رێككەوتنی نوێی دەوڵەتە هاوپەیمانەکان کە لە مێژوودا بە پەیمانی « سایکس ـ پیکۆ »[1] ناسراوە بە چەند قۆناغێك تەواو بوو ،

---

(١) « سایکس ـ پیکۆ » لە نازناوی مارك سایکسی ئینگلیز و جۆرج

ئەوەش بۆ خۆی ئاڵۆزیی مەسەلەکەو قوڵیی تەماعی لایەنە بەشدارەکانیان دەدات . ڕۆژی ٩ی مارتی ساڵی ١٩١٦ گفتوگۆ لە نێـوان بریتانیا و فەرەنسەدا دەستی پێ کرد . نوێنەری یەکەمیان مـــارک سایکس و نوێنەری دووەمیان جۆرج پیکۆ بو . هەمو ئەنجامەکانی گفتوگۆی ئەم دوو لایەنە دواییی خرانە بەر دەمی ڕوسیا .

کوردستـان ، هــەر وەک وتمان ، جێـگەیەکی دیاری لەو گفتوگۆیانەدا هەبو کە ئەوەش بۆ خۆی نیشانەیەکی گەورەیـە بۆ بایەخ پێدان و تەماعی دەوڵەتە گەورەکان لەو بەشـــەی دەوڵـەتی عوسمانیدا . لە نامەیەکی نهێنیی سازانۆفی وەزیری هەندەرانی ڕوسیادا کە لە نیسانی ١٩١٦دا ناردویە بۆ باڵیوزی فەرەنسە لە پیترۆگراد ، بەم جۆرە باسی دواڕۆژی کوردستان کراوە :

« ... ١ـ ڕوســـیا ناوچەی ئەرزڕۆم و تەرابزون و وان و بەدلیس تا ئەو شوێنەی دواییی لە ڕۆژئاوای تەرابزوندا لە سەر ڕۆخی دەریای ڕەش دیار دەکرێت ، دەبات بـۆ خـۆی و ٢ـ دەبێت ناوچەی کوردستان لە باشوری وان و بەدلیسدا ، لە نێوان موش و سعرد و ڕوباری دیجلە و جەزیرەی ئیبن

= پیکۆی فەرەنسەییەوە داناشراوە . مارک سـایکس و جۆرج پیکۆ زۆر شارەزای گەلان و وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بون . یەکەمیان لە نزیکەوە کوردی دەناسی و پەیوەندیی لەگەڵ زۆر سەرەک هۆزی کوردا هەبو و زۆر ناوچەی کوردستان گەڕا بو ( بڕوانە ل ١٨ ـ ١٩ ) . مارک ســایکس لەو بڕوایەدا بو کە کورد و ئەرمەن دەتوانن پێکەوە بژین و هاریکاری بکەن .

عومەر و خەتی ئەو لوتکە شاخانەی بە سەر عەمادیەدا دەڕوانن لەگەڵ مەرگەوەردا بۆ روسیا بەجێ بهێڵرێ . ئەویش (واتە روسیا - ک. م.) بەرامبەر بەوە دان بۆ فەرەنسە دەنێ بەو ناوچانەدا کە کەوتوونەتە نێوان ئالەداخ و قەیسەری و ... خەرپوتەوە »[٢] .

روسیا زۆر بە توندی دژی ئەوە وەستا هیچ بەشێک لە کوردستان (بە تایبەتی کوردستانی تورکیا) بدرێت بە فەرەنسە . لە راستیشدا دوای بینە و بەرە و رازی کردن و مساومەیەکی زۆر روسیا قایل بوو پەیمانی « سایکس - پیکو » مۆر بکات . رۆژی ٢٦ی نیسانی ١٩١٦ فەرەنسە و روسیا رێککەوتنێکی تایبەتی‌یان لە بارەی دابەش کردنی ناوچە ئاسیاییەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی‌یەوە مۆر کرد . پاش ماوەیەکی کەم بەریتانیاش رەزامەندیی خۆی بەرامبەر بەو رێککەوتنەی هاوپەیمانەکانی پیشان دا . لە رۆژانی ٩ و ١٦ای مایسی هەمانساڵدا رێککەوتنێکی تری لەو جۆرە لە نێوان بەریتانیا و فەرەنسەشدا مۆر کرا و بەم جۆرە پەیمانی نهێنی « سایکس - پیکۆ » لە دایک بوو[٣] .

بە پێی پەیمانی « سایکس - پیکۆ » هەموو کوردستانی تورکیای ئیمڕۆ بۆ روسیا دانرا . هەرچی ویلایەتی موسڵیشە بەر فەرەنسە کەوت . بەڵام دیارە لەو بەریتانیایەی لە زوووەوە چاوی بڕیبووە

---

(٢) بڕوانە : کلیوچنیکۆف و ئەندرییەی سەبانین ، سەرچاوەی ناوبراو ، بەرگی دووەم ، ل ٣٨ - ٣٩ .

(٣) بەشی هەرە زۆری پەیمانی « سایکس - پیکۆ » بۆ مەسەلەی دابەش کردنی وڵاتە عەرەبەکانی ناو دەوڵەتی عوسمانی تەرخان کرابوو .

ویلایەتی مووسڵ و بە هەموو جۆر جێ پێی خۆی تیا قایم دەکرد ، هەر وا بە ئاسانی دەستی لەو ناوچە گرنگە هەڵنەدەگرت . وەك وتمان بەریتانیا نەیدەویست لە وڵاتە ژێردەستەکانیدا دراوسێی رووسیا بێت ، بەڵام لە هەمان کاتیشدا سوور بوو لە سەر پاراستنی تەواوی سەرتاپای بەرژەوەندەکانی لەو ناوچە دەوڵەمەندەدا . بەریتانیا دەیەویست هەموو کانە نەوتەکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و رێگەی گواستنەوەی لە دەست خۆیدا بێ و هەر لەبەر ئەوە هەوڵی دەدا تەنانەت بەشێك لە کوردستانی ئێرانیش بگرێتە دەست خۆی چونکە ئەو بەشەی کوردستانی ئێران لەو رووەوە بایەخێکی تایبەتی هەبوو . بەریتانیا ئەم مەسەلەیەی هێند بە لاوە گرنگ بوو ئامادە بوو لە پێناویدا هیچ گوێی نەداتە تێکەڵ نەبوونی ئێران لە شەڕدا . کەواتە دەست هەڵگرتن لە کوردستانی عیراق بە هیچ جۆرێك بە بیری ئینگلیزەکاندا نەدەهات . ئەوەندە بوو دەیانویست مەبەستی خۆیان بە دەستی فەرەنسە جێ بەجێ بکەن . دوای تەواو بوونی شەڕ ئینگلیزەکان چەند جارێك ئەمەیان بە ئاشکرا دەربڕیبوو[٤] .

---

(٤) لە دوا کۆبوونەوەی کۆنفرانسی ئەستەنبوڵدا کە بۆ کێشەی مووسڵ تەرخان کرابوو نوێنەری تورکیا باسی ئەوەی کرد چۆن بەریتانیا بەوەی « دژی جیابوونەوەی مووسڵ لە عیراق دەوەستێ ، خۆی لە پەیمانی « سایکس – پیکۆ » دوور دەخاتەوە کە مووسڵی دابوو بە فەرەنسە » . لە وەڵامدا پێرسی کۆکسی نوێنەری ئینگلیز بێ پێچ و پەنا وتی : « ئەو پەیمانە لە نێوان بەریتانیا و فەرەنسەدا کاتێك مۆر کرا کە رووسیا هاوپەیمانیان بوو و بەریتانیا نەیدەویست بێتە دراوسێی رووسیا » .

بەریتانیا هەمتو بەرژەوەنـدە ئابوریـکانی خۆی لە ویـلایەتی متوسلدا مسۆگەرکرد. دوای مۆر کردنی پەیانی « سایکس - پیکۆ » و هەر لە کاتی گفتوگۆی ئەویشدا سـێر ئەدوارد گرێیەیق وەزیری هەندەرانی بەریتانیا چەند جارێك بۆ ئەو باسە بە نامە پەیوەنـدیی لەگەل پۆل کامبۆنی بالیۆزی فەرەنسەدا کرد. لە ئەنجامدا فەرەنسە دانی نا بە هەمتو « ماف »ەکانی بەریتانیادا لە ویلایەتی متوسلدا[٥]، کە دیارە لە سەروو هەمتوشیانەوە نەوت بتو. پ. کامبۆن بۆی پێچ و پەنا و هەر زۆ بـلاوی کردەوە کە وا « فەرەنسە ئامادەیە دانی بە هەمـتو ئیمتیازەکانی پێش شەڕی بەریتانیا ( لە متوسلدا - ك. م. ) بنێ »[٦].

بەم جۆرە دەولەتە گەورەکان لە پەیمانی « سایکس - پیکۆ » و ئەو بەلـگانەدا کە پەیوەندییان پێوەی هەبـتو بە ئارەزوی خویان کەوتبتونە یاری کردن بە دوارۆژی میللەتی کورد وەك هتی عەرەب و ئەرمەن .

بەلام سەرکەوتنی شۆڕشی ئۆکتۆبەر لە روسـیادا کارێکی گەورەی کردە سەر پلانە نهێنیـکانی دەولەتە گەورەکان لە سالەکانی

---

(٥) بڕوانە : کلیوچنیکەف و ئەندرییەی سـەبانین ، سـەرچاوەی ناوبراو ، بەرگی دووەم ، ل ٤٢ .

(٦) بڕوانە :

К.Гофман, Нефтяня политика и англо-саксонский империализм, Москва, 1930.

ك. گۆفمن ، سیاسەتی نەوت و ئیمپریالیزی ئەنگلۆ - سەکسۆنی ، مۆسکۆ ١٩٣٠ ، ل ٨١ .

مەڕدا . بەر لە هەمو شتێك ڕوسیای سۆڤیەتی لەو پلانانە کشایەوە و دەستی لە هەمو پەیمانە نهێنی و ئاشکراکانی چارەکانی ڕوسیا هەڵگرت . لە هەمان کاتدا هێزەکانی خۆی لە مەیدانەکانی شەڕ گێڕایەوە و هەر شوێنێکی تێی چوبون بەجێیان هێشت . ئەمانە بونە هۆی ڕودانی ئاڵوگۆڕێکی گەورە لە تەرازوی هێزدا . بەریتانیا مەترسی کۆنی دراوسێیەتی ڕوسیای نەما ، بەڵکو بە پێچەوانەوە دەیویست خۆی بگەیەنێتە نزیکترین ناوچە لە سنورەکانی یەکیەتی سۆڤیەتەوە . دیارە هەر بەو جۆرەش بایەخی کوردستان لە لای ئینگلیزەکان زیادی کرد . ئەوە بو ، وەك لە شوێنی خۆیدا باسمان کرد ، هێزە شەڕکەرەکانی ئینگلیز لە باشوری عیراقەوە کوتوپڕ کەوتنە خۆ و هەوڵیان دەدا بەر لە تەواو بونی شەڕ بستێك زیاتر لە خاکی کوردستان داگیر بکەن[7] . هاو بە شانی ئەوە دەستەیەکیش لە پیاوە هەرە چالاکەکانی خۆیان ناردە کوردستان و ئەرمینیا .

دیارە ئەم ئاڵوگۆڕە کارێکی گەورەی کردە سەر پلانی دەوڵەتە گەورەکان ( بە تایبەتی فەرەنسە و بەریتانیا ) بە نیسبەت دوا ڕۆژی ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستەوە . ئەوە بو لە کانونی یەکەمی ساڵی ١٩١٨دا کلیمەنسۆی سەرەك وەزیرانی فەرەنسە لە لەندەن داوای لە لوید جۆرجی سەرەك وەزیرانی بەریتانیا کرد کە بە جوتە دیسان دان بە پەیمانی « سایکس ـ پیکۆ » دا بنێنەوە ، بەڵام لوید جۆرج

(٧) بڕوانە : بەشی سێیەم ، ل ٦٧ ـ ٦٩ .

هەمو تەقەلای کەلیمەنسۆی خستە پشت‌گوێ و جێبەجێ کردنی ئەو داوایەی بەست بە چەند ئاڵوگۆڕێکی گەورەوە لە بەندەکانی ئەو پەیمانەدا کە بۆ ویلایەتی مۆسڵ و فەلەستین تەرخان کرابون. سەرەک وەزیرانی فەرەنسە ناچار بو واز لە ویلایەتی موسڵ بهێنێت بۆ بەریتانیا و ئینگلیزەکانیش بەرامبەر بەوە بڕیاریان دا بەشێک لە نەوتی موسڵ بدەن بە فەرەنسە. شایانی باسە هەر زو کەلیمانسۆ دانی بەوەدا نا کە هەڵەیەکی گەورەی کرد دەست بەرداری ویلایەتی موسڵ بو بۆ بەریتانیا[8]، بەڵام تازە کار لە کار ترازابو و هەر دەشبو وا بێت چونکە بەریتانیا سور بو لە سەر داگیر کردنی ئەو ناوچانە کە دەیویست لەگەڵ هیندستاندا بیانکاتە بڕبڕەی ئەو ئیمپراتۆریە فراوانەی بەر لە هەمو و لە ساڵەکانی شەڕدا پلانی هەزار سەرەی بۆ دامەزراندنی دارشتبو.

ئەم جۆرە پلانانەی دەوڵەتە گەورەکان لە ساڵەکانی شەڕی یەکەمی جیهاندا دایاننا تا رادەیەکی زۆر کاریان کردە سەر دوارۆژی گەلانی ناو ئیمپراتۆری عوسمانی کە کوردیش یەکێکیان بو. وەک دوکتۆر لازەرێف دەڵێت پەیمانی «سایکس ـ پیکۆ» و پلانەکانی تری دەوڵەتە گەورەکان کارێکی زۆریان کردە سەر «... پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی ـ ئابوری و سیاسی و رۆناکبیری کورد»[9]. ئەمە بە تایبەتی لە دوای شەڕدا خۆی نواند.

---

(٨) بڕوانە : الدکتور فاضل حسین، مشکلة الموصل. دراسة في الدبلوماسية التركية ـ العراقية ـ الانکلیزیة وفي الرأي العام، بغداد ١٩٥٥، ص ٩

(٩) م. س. لازەرێف، سەرچاوەی ناوبراو، ل ٣٤٦ .

شایانی باسه هەر لە ساڵەکانی شەڕی یەکەمدا ناوی کورد لە هەندێك پلانی تردا هاتووە . سەردارەکانی ئەرمەن لەوە گەیشتبوّن کە لە زروفی ناوچەکەمدا چارەسەرکردنی کێشەی میللەتەکەی خۆیان تا رادەیەکی زۆر بەستەیە بە چارەسەر کردنی کێشەی گەلی کوردی دراوسێیانەوە . دەوڵەتە گەورەکانیش تا رادەیەك لەم راستیە گەیشتبوّن . ئەمە کارێکی وای کرد مەسەلەی دوارۆژی کورد لە پلانی هێزە سیاسیەکانی ئەرمەنیشدا رەنگ بداتەوە . بۆ نموونە باسی کورد لەو پلانەدا هاتبوّ کە بۆغوّز نوّبار پاشای سەرداری ئەرمەنەکان لە حوزەیرانی ساڵی ١٩١٥ دا پێشکەشی وەزیری هەندەرانی فەرەنسەی کردبوّ . لەو پلانەدا نوّبار پاشا پێشنیاری ئوّتوّنوّمی بۆ کورد کردبوّ ، بە مەرجێك بخرێتە ژێر چاودێری یەکێك لە دەوڵەتە هاوپەیمانەکانەوە . بەڵام دەوڵەتە گەورەکان لەو سەردەمەدا بایەخیان بەو جۆرە پلانانە نەدەدا ، بە لای ئەوانەوە یەك ئامانج مەبەست بوّ ـ داگیرکردن و دابەش کردنی هەموّ خاکی دەوڵەتی عوسمانی !! . لە راستیشدا هەموّ پیلان و پلانەکانیان بۆ ئەوە تەرخان کردبوّ ، هەر ئەوەش بۆ خۆی بووە هەوێنی سیاسەتی دوای شەڕیان .

● ● ● ●

# ئەنجام

ئەو راستی و بەراورد و لێکۆڵینەوانەی لە پێشەکی و هەر شەش بەشەکەی ئەم کتێبەدا باسیان هاتووە ، رێگەمان دەدەن لە بارەی مێژوی گەلی کوردەوە لە ساڵەکانی شەڕی یەکەمی جیهاندا ، بگەینە چەند ئەنجامێک .

وەک زوربەی گەلانی تری جیهان ، دیارە بە رادەی گەلانی ئەوروپا یا گەلی تورک نا ، بەڵام بە رادەی بەشی زۆری گەلانی رۆژهەڵاتی نزیک و ناوەڕاست ، شەڕی یەکەمی جیهان بە خۆی و رووداو و ئاڵوگۆڕەکانیەوە قۆناغێکی گرنگ و دیار لە مێژوی گەلی کوردا پێک دەهێنێ . کوردستان بە هۆی شوێنی ستراتیژی گرنگ و دەوڵەمەندی زۆریەوە لە هیچ روویەکەوە نەیدەتوانی لە هۆکانی دەست پێ کردنی شەڕ و لە کڵپەی ئاگری شەڕ و لە ئەنجامەکانی شەڕ بە دوور بێت . وەک بەشێک لە دەوڵەتی عوسمانی کە هەمو دەوڵەتە گەورەکان چاویان تێ بڕیبو و بە تەمای میراتی زۆری بون ، کوردستان شوێنی دیاری خۆی لەو هۆیانەدا هەبو کە ئاگری شەڕیان هەڵگیرساند .

بەر لە شەڕ کورد و کوردستان سەرنجی زوربەی دەوڵەتە گەورەکانیان راکێشابو کە هەر یەکەیان لە لایەنی خۆیەوە هەوڵی

بدا جێگەیەکی باشتر لە خاك و دڵی کوردا بۆ خۆی بکاتەوە .
بەریتانیا و رووسیا و ئەڵمانیا و فەرەنسە بۆ جێ بەجێ کردنی ئەم
مەبەستە لە کاردا بوون و هەر یەکەیان رێبازی تایبەتی خۆی هەبوو کە
بە تەواوەتی لەگەڵ زرووف وپلانەکانیاندا دەگونجا . بەلام لەگەڵ
ئەوەشدا بایەخ پێدانی یەکەم و دووەمیان ، واتە بایەخ پێدانی بەریتانیا و
رووسیا بە کوردستان ، زیاتر لە بایەخ پێدانی دەوڵەتانی تر دەنگی
دابۆوە و زوو زوو لە رووداوەکانی پێش شەڕ و کاتی شەڕدا خۆی
دەنواند . رووسیا لە ساڵەکانی شەڕ و پێش شەڕدا پتر بایەخی بە
بە ئەرمینیا و کوردستان دەدا وەك لە ناوچەکانی تری ئیمپراتۆری
عوسمانی . ئەم بایەخ پێدانە ـ دوای رزگار بوونی ناوچەکانی بەڵقان ـ
یەکێك لە جێگە هەرە دیارەکانی لە سیاسەتی دەرەوەی چارەکانی
رووسیادا گرتبۆوە بە تایبەتی چونکە چ ئەرمینیا و چ کوردستان
کەوتبوونە سەر سنووری وڵاتە فراوانەکەیان و لە زۆر رووەوە
دەیانتوانی کار بکەنە سەر ناوچەکانی قەفقاس . هەرچی بەریتانیاش
بوو بایەخی زۆری بە کوردستانی عیراق دەدا و دەیەویست لەگەڵ
بەشەکانی تری ئەم وڵاتەدا بیکاتە بنکەیەکی ستراتیژی و ئابووری
گرنگی خۆی لە هەموو رۆژهەڵاتی نزیك و ناوەڕاستدا . بەلام هەر
کە شۆڕشی ئۆکتۆبەر سەرکەوت و پەیمانی نهێنی « سایکس ـ
پیکۆ »[1] کەوتە روو و مەترسی دراوسێیەتی رووسیای کۆن نەما و

(١) وەك باسمان کرد پەیمانی نهێنی « سایکس ـ پیکۆ » بە ئاگاداری و رەزامەندی
رووسیا لە مایسی ساڵی ١٩١٦دا لە نێوان بەریتانیا و فەرەنسەدا مۆر کرا .
بە پێی ئەم پەیمانە هەموو وڵاتە عەرەبەکان و کوردستانی تورکیا و ==

مەترسی‌یەکی نوێی پەیدا بوو[٢] ئینگلیزەکان لە جاران زیاتر کەوتنە بایەخدان بە هەموو بەشەکانی کوردستان.

ڕوداوەکانی شەڕ و پەیمانە نهێنیەکانی دەوڵەتە گەورەکان و بە درۆ دەرچوونی ئەو هەموو گفت و بەڵێنانەی دەیاندا بە ڕادەیەکی هەست پێ کراو باوەڕی گەلانی ڕۆژهەڵاتی نزیک و ناوەڕاستیان بەو دەوڵەتانە لەق کرد. ڕاستە لەبەر دواکەوتویی و زوڵم و زۆری بێ ئەندازەی عوسمانیەکان و چەند هۆیەکی تر ئەمە لە ناو کوردا کەمتر هەستی پێ دەکرا، بەڵام سەرەتاکەی هەر ئەو کاتە دروست بوو. دوای شەڕیش زیاتر - بە تایبەتی لە کوردستانی عیراقدا - جێگیر بوو[٣]. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەوڵەتە گەورەکان - بە ڕادەی یەکەم بەریتانیا و ڕوسیا - بۆ بەهێز کردنی جێ پێی خۆیان لە هەموو بەشەکانی کوردستاندا کەڵکیان لە باری شەڕ وەرگرت، بە تایبەتی

= ئەرمینیای ڕۆژئاوا لە نێوان ئەو سێ دەوڵەتەدا دابەش دەکران. دوای سەرکەوتنی شۆڕشی ئۆکتۆبەر دەوڵەتی نوێی سۆڤیەت لە تشرینی دووەمی ساڵی ١٩١٧دا پەردەی لە ڕووی ئەم پەیمانە و هەندێك بەڵگەی تری نهێنی هەڵماڵی و بووە هۆی دروست بوونی ناڕەزاییەکی زۆر بەتایبەتی لە ناو عەرەبدا.

(٢) مەبەست شۆڕشی ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩١٧ و سەرکەوتنی ڕژێمی سۆشیالیزمە لە ڕوسیادا.

(٣) ئەم کارە لە کوردستانی عیراقدا لەبەر ئەوەی یەکسەر کەوتە ژێر دەستی یەکێك لەو دەوڵەتە گەورانەوە زوو ڕەنگی دایەوە. بزوتنەوەکانی شێخ مەحمود و هەوڵی زۆری لە سەرەتای بیستەکاندا بۆ ڕێككەوتن لەگەڵ کەمالیەکاندا نمونەیەکی ئاشکرای ئەمەن.

نه تلو سەردار و دەسەڵاتدارانی کوردا . ئەمەش بۆ خۆی کارێکی بەخەدار بو بۆ ئەو دەوڵەتانە چونکە ڕوداوەکانی شەڕ زیاتر سەرنجی بۆ کرنگتی کوردستان ڕاکیشان . لە دەوروبەری کۆتایی شەڕدا و یەکسەر دوای تەواو بونی ، پۆل پۆل پیاو و شـــارەزایانی ئینـگلیز ڕۆیان کردە ناوچە جیاوازەکانی کوردســـتان[٤] . ئەمە زۆ بەروبومی خۆی دا بە ئینـگلیز .

ئەنجامەکانی شـەڕ بونە هۆی دابەش کردنی نوێی کوردستان . بەشی ڕۆژهەڵاتی ئـەم وڵاتە لە چوارچێوەی ئێراندا مایەوە چونـکە ئێران بە ڕەسمی تێکەڵی شەڕ نەبوبو . ئەو بەشەکەی تری کرا بە دوو پارچـەوە ـ کوردستانی باکور دوای بێنـــە و بەرەیەکی کەم و لە ئەنجامی ســـەرکەوتنی بزوتنەوەی کەمالیـکاندا لە ناو دەوڵەتی نوێی تورکیادا مایەوە ، کوردستانی باشوریش پاش بێنـە و بەرەیەکی زۆر لەگەڵ ناوچەکانی تری عیراقدا کەوتە ژێر دەستی ئینـگلیزەوە . بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ڕوداو و ئەنجامەکانی شەڕی یەکەم و چەند هۆیەکی تر کارێـکی وایان کرد مەسەلەی کورد لە شانۆی دەوڵەتیـــدا زیاتر دەرکەوێ . دیارە سێ بەندەکەی پەیمانی « سێڤەر » ( ١٠ی ئابی ١٩٢٠ ) بلندترین بەڵـگەی ئەم ڕاستیەن . هـــەر ئەو بەندانە بە جۆرێـکی تایبەتی پلان و پیلانی دەوڵەتە گەورەکان بەرامبەر دواڕۆژی کورد و

---

(٤) بەر لە تەواو بونی شـەڕ بە ماوەیەك و لەگـەڵ تەواو بونیدا یەکسەر کۆمەڵێ ئەفـەری شـارەزا و بە دەسەلاتی وەك سۆن و نۆئێل و ماسۆن و کـەلێـکی تر کەوتنە ناو کوردەوە .

ولاٌته‌كانیان ده‌خه‌نه‌ ڕوو[٥] .

دابه‌ش كردنی نوێی كوردستان و دامه‌زراندنی ده‌سه‌ڵاتی مه‌ركه‌زیی دوای شه‌ڕ به‌ ماوه‌یه‌كی كه‌م جگه‌ له‌ باری سیاسی كاری كرده‌ سه‌ر زۆر ڕووی ژیانی ئابووری و كۆمه‌ڵایه‌تی كورد كه‌ له‌ هه‌مووان گرنگتر وه‌ستانی دروست بوونی یه‌ك بازاڕی بوو له‌ كوردستاندا . هه‌روه‌ها هاتوچۆی هێلاتی كورد له‌ نێوان هاوین و زستانه‌ هه‌واره‌كانیاندا زۆر له‌ جاران زه‌حمه‌تتر بوو و ئه‌مه‌ش بۆ خۆی بووه‌ هۆی خێرا كردنی نیشته‌جێ بوونی كۆچه‌ره‌كان كه‌ ده‌وریان له‌ كۆمه‌ڵگای كوردا زۆر به‌ خێرایی به‌ره‌و نه‌مان ده‌چوو .

جگه‌ له‌وه‌ كاره‌سات و ئه‌نجامه‌كانی شه‌ڕ بوونه‌ كۆسپێكی گه‌وره‌ له‌به‌ر ده‌م ئاڵوگۆڕ و پێشكه‌وتنی گشتی ژیانی ئابووری و كۆمه‌ڵایه‌تی كورددا وه‌ك گه‌لانی تری ناوچه‌كه‌ . له‌ گه‌لێك ناوچه‌ی كورده‌وارێدا به‌شی هه‌ره‌ زۆری زه‌وی و زار به‌ره‌ڵلا كران ، كه‌س نه‌بوو بیانكێڵێ . ئاژه‌ڵی گه‌وره‌ و ورده‌ش به‌ ڕاده‌یه‌ك فه‌وتان كه‌ بووه‌ هۆیه‌كی یاریده‌ری نوێی بۆ خێراتر كردنی نیشته‌جێ بوونی هۆزه‌ كۆچه‌ره‌كانی كوردستان . پێویسته‌ سه‌رنجیش بۆ ئه‌وه‌ ڕابكێشین كه‌ وا یه‌ككه‌وتنی

---

(٥) بیری خۆمان له‌ باره‌ی ئه‌و به‌ندانه‌ی په‌یمانی « سیڤه‌ر »ه‌وه‌ له‌ وتارێكی تایبه‌تیدا بلاٌو كردۆته‌وه‌ ( بڕوانه‌ : « سه‌رنجێكی نوێ به‌رامبه‌ر په‌یمانی سیڤه‌ر و مه‌سه‌له‌ی كورد » ـ « برایه‌تی » ، ژماره‌ ٧ ، ته‌شرینی یه‌كه‌می ١٩٧٠ ، ل ١٥ ـ ١٩ ) . یاخود « نظرة جديدة إزاء معاهدة سيفر والمسألة الكردية » ، ترجمة محمد الملا عبدالكريم ، « الثقافة الجديدة » ، ايلول ١٩٧٣ ، ص ١٢٥ ـ ١٣٤ ) .

گەشتوکاڵ و بەخێوکردنی ئاژەڵ لە کاتێکدا بوو کە کوردستان بە خێرایی تێکەڵی بازاڕی سەرمایەداری دەبوو ، لە کاتێکدا کە پارە زیاتر بایەخی پەیدا دەکرد و دیارتر دەوری دەدی . کۆبوونەوەی پارە دەستی پێ کردبوو ، هەر بۆیەش زیانی شەڕ کاریگەرتر بوو . شایانی باسە کورد لەبەر هەندێ هۆی ئاشکرا درەنگتر لە گەلانی تر خۆی لە پاشماوەکانی شەڕ پێ ڕزگار کرا .

برسێتی و باری خراپی ژیان بوونە هۆی پەرەسەندنی دەسەڵاتی دەرەبەگەکانی کوردستان کە جگە لەوەش زەوی و زاری زیاتریان کەوتە دەست . ئەم کارە ، واتە زەوت کردنی زەوی نوێ ، لەو شوێنانەی کەرمەنیـــان تیـــا دەژیان خێـــراتر و فراوانـــتر ڕەنـــگی دایەوە . پەرەسەندنی دەسەڵاتی دەرەبەگایەتی لە کوردستانی عیراق و لە ژێـــر سایەی ئینگلیزدا بەردەوام بوو ، بەڵام لە بەشەکانی تری کوردستاندا لە ئەنجامی سەرکەوتنی بۆرجوازییەتدا لە ئێران و بە تایبەتی لە تورکیادا تا رادەیەکی زۆر لەو دەسەڵاتە درا .

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا ئەنجامەکانی شەڕی یەکەمی جیهان بوونـــە هۆی زیاتر تێکەڵ بوونی کوردستان بە بازاڕی سەرمایەداری و ئەمەش بۆ خۆی بووە هۆی گەلێك ئاڵوگۆڕی نوێ لەکۆمەڵـگای کوردا .

هەڵـگیرسانی ئاگری شەڕی یەکەم بووە کۆسپێکی زۆر گەورە لە بەردەم گەشەکردن و بەرەوپێش چوونی خەباتی نەتەوەیی ـ ڕزگاری گەلی کورددا کە بەر لە دەست پێ کردنی شەڕ خەریك بوو بچێتە قۆناغێکی گرنگی نوێوە ، بەڵام ئەو خەباتە لە ســاڵەکانی شەڕدا هەرچەنـدە

لاوازیش بوو ـ نەوەستا . لەمەشدا سیاسەتی دەوڵەتی عوسمانی دەورێکی باڵای بینی ، واتە لەبەر ئەوەی عوسمانیێکان نەیانتوانی گەلی کورد بۆ لای خۆیان راکیشن هێزی بزوێنەر و بەردەوام بوونی ئـەو خەباتە هەر لە ئارادا بوو . زنجیرەیەك راپەڕینی نوێی لە هەندێ ناوچەی جیـــاوازی کوردستاندا روی دا ، بەڵام زوربەیان عەفەوی بوون و هەموویان لە روی رێـکخستنەوە ناتەواو بوون . پچڕ پچڕ بـوون و لە یـەك بزووتنەوەدا یەکیان نەگرت کە ئەمەیش ئەنجامی دووبەرەکایەتی هۆزایەتی و تەئسیری جیاوازیی دەوڵەتان بوو لە ناوچە جیاجیاکانی کوردستاندا . لە کاتی شەڕدا چەند هەوڵێـکی زۆر کەم بۆ یەکـگرتن درا ، بەڵام نەبوونە رووداوێکی سیاسی کاریگەر و لە سەرەتایەکی بێ ئەنجام بـەولاوە هیچی تریان پێك نەهێنا .

بەم جــۆرە خەباتی گەلی کـورد لە ساڵەکانی شــەڕدا لە چوارچێوەیەکی تەسك و پلەیەکی نزمــــدا مایەوە و نەیتوانی بگاتە ئاست و رادەی خەباتی گەلانی تری ناوچەکە . بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەو خەباتە بایەخی مێژوویی خۆی هەیە چونکە بەر لە هەموو شتێك نارەزایی کۆمەڵانی خەڵکی کوردســـتانی بەرامبەر ســـیاسەتی دواکەوتووی عوسمانیێکان نیشان دەدا .

کاربەدەستان هەر وەك جاران هیچ حیسابێکیان بۆ خەباتی کورد و گەلانی تری وڵاتەکەیان نەدەکرد و تـەنانەت باری ناســکی شەڕیشیان نەگرتە بەر چاو و نە زۆر و نە کەم بیریان لە چارەســەر کردنی کێشـەی نەتەوەکانی ژێر دەستیان نەکردەوە . جگە لەوە لە

ـفەکانی شەڕدا زۆر بە توندی لە ئەرمەن و ئاسووری و کوردیان
د ، بەڵام بۆ ئەوەی ئــەو لێدانە هیچ جۆرە یاریدەیەکیان بۆ
پەرستی فەوارەی دەوڵەتی عوسمانی بدات ، بەڵـکو بە پێچەوانەوە
سوری خۆی لە هەرەس پێ هێنانی زۆرتری ئـەو دەوڵەتەدا بینی و
طی ئەو سێ گەلەی بە جارێك کرمێ کرد و ئەمەش یەکسەر دوای
شەڕ لە گەلێك ڕووداودا خۆی نواند ، هەر بۆ نموونەش کێشــەی
موسڵ دەهێنینەوە کە کورد و ئاسووری بە هــەمو جۆرێك دژی
تورکیا وەستان تیادا .

گەلی کورد گەلێك مەینەت و برسێتی بە دەست شــەڕی
یەکەمەوە چێشت . خێزان نەبوو کوڕی لە جەنگەی شەڕدا نەبێ یا لە
ئاو سەربازی نەیدابێتە شاخ و کێو . بە دەیان هەزار کورد بـوونە
قوچی قوربانی کارەساتەکانی شەڕ . ئەمانە دیارە هەستی خەڵـکیان
دەبزواند ، وایان لێ دەکردن زۆر زیاتر لە جاران سڵ لە شەڕ بکەنەوە
کە باس و خواسی بەسەرهاتە سامناکەکانی تا ئیستەش لە ناو خەڵـکی
ساکاردا هەر ماوە و هێندێـکیان وا دیارە هەر دەمێنن . هەرچەندە
رادەی دواکەوتووی گەلی کورد مەودای ئەوەی نەدەدا ئەم ڕاستی‌یە وەك
پێویستە لە فیکردا ڕەنگ بداتەوە ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەوری
خــۆی هەر بینی . دیارە هــەر ئەوەیە وای لە شاعیرێـکی وەك
مەلا حەمدوونی بۆ چاو کردووە بە قووڵی باسی کارەساتەکانی شــەڕی
یەکەم بکا کە ئەڵێ هەر « شەش جیهەتی گرتووە » و کەس نەماوە تێیدا
« جگەری قیمــە » نەکرابێ ، بـڵایەکا لە خوا دەپاڕێتەوە ڕەحمێ بـکا

« بەو باقی ئیسلامە کە ماوە »[٦] .

کوشتاری ئەرمەن لە ساڵەکانی شەڕی یەکەمدا گەیشتە بەرزترین پلەی ، دوای ئەوەی بە پێی نەخشەیەکی دیار کراو لە کۆتایی سەدەی نۆزدەوە ، لە سەردەمی فەرمانڕەوایی سوڵتان عەبدولحەمیدا دەستی پێکرد . ئەو کوشتارانە یەکێک لە کارەساتە هەرە گەورەکانی نەک تەنها شەڕی یەکەم بەڵکو هەموو مێژووی جیهان پێک دەهێنن . لێدانی ئەرمەن هێندە توند و تیژ و بێ بەزەییانە بوو لەگەڵ کوشتاری گاورانی تری ئیمپراتۆریی عوسمانییدا[٧] کاریان کردە سەر چالاکییان لە زۆر مەیدانی ژیاندا کە دەوریان تیا دەبینی . گاورەکان بە ئەرمەنەوە وایان لێ هات بە چاوی رق و هەستی پڕ لە مەترسییەوە سەیری ڕژێمی عوسمانی بکەن و چاوەڕوانی کوتی ڕۆژێک زۆرتری بن .

چەند تاقم و دەستە و دایرەیەکی کورد تێکەڵی ئەم کوشتارە بوون بەڵام دەستیان لە ڕێکخستنیدا نەبوو . بەڵکو تەنانەت زوربەی هەرە زۆری ئەمانیش بە هاندان یا بە زۆری میری دەستی خۆیان خوێناوی کرد . تەنها چەند ئاغا و دەرەبەگێکی کەمی کورد کەڵکیان لە کوشتارەکانی ئەرمەن وەرگرت بەوەی زەوی و زاری کوژراو و ڕاکردووکانیان بە یاریدەی هەمەجۆری میری بۆ خۆیان زەوت کرد ، هەرچەندە لە

---

(٦) بڕوانە : حدون ، شەڕی پێشوو ، ـ « گەلاوێژ » ، ژمارە ٤ ، ساڵی ٧ ، نیسانی ١٩٤٦ ، ل ٣٥ ـ ٣٧ .

(٧) وەک کوشتاری گاورەکانی دیمەشق لە ساڵی ١٨٦٠دا .

حەقی کاندا کەلێك ئاغا و دەرەبەگی کورد دۆرەوپەرێز وەستان و ئەمەت ژمارەیەکیان یاریدەی باش و زۆریشیان پێشکەش بە لێقەوماوانی ئەرمەنی کرد . جگە لەوە هەستی نەتەوەیی هەڵە[8] و هەستی ئاینیی کوێرانە تا رادەیەك دەوری خۆیان بینی . بەڵام لە هەمو حاڵەتێکدا ئەو کوردانەی لە کوشتارەکاندا بەشداری‌یان کردووە لە داردەستێك بەولاوە هیچی تر نەبوون . برایان ویکرام ئەو جۆرە کوردانە بە «داردەستی بێ تاوان» ناو دەبەن[9] . کورد وەك میللەتێك لە کوشتاری ئەرمەندا بەشدار نەبووە و نەیدەتوانی بەشدار بێت . سەرەڕای ئەوە گەلی کورد لە زۆر رووەوە یاریدەی برایانەی پێشکەش بە ئەرمەنە لێقەوماو و ئاوارەکان کردووە . ئەمە و زیاتر دەرکەوتنی رۆی دوژمنانەی ناحەزی هەردوو گەل رێگەیان بۆ نزیك‌کەوتنەوە و هاریکاری‌یان خۆش کرد . سەرەتای هەردووکیشیان ، واتە نزیك‌کەوتنەوە و هاریکاری‌یان ، یەکسەر دوای تەواو بوونی شەڕ بووە کارێکی سیاسی هەست پێ کراو[10] کە تەنانەت داهــناقە

(٨) تەنانەت بە لای یەکێکی وەك عەبدورەززاق بەدرخانەوە کوشتاری ئەرمەنی بۆ کورد باش بووە و وای داناوە لەوانەیە ئەو کوشتارە ببێتە هۆی بزواندنی رووسیا بۆ لێدانێکی تری دەوڵەتی عوسمانی ؛ عەبدوررەززاق بەدرخان وای دەزانی بەو جۆرە هەلی سیاسی باش بۆ کورد هەڵدەکەوێ .

(٩) دبليو . أي . ويكرام و أدكار تي . أي ويـگرام ، مهد البشرية ( الحياة في شرق كوردستان ) ، ترجمة جرجيس فتح‌الله ، بغداد ١٩٧١ ، ص ٤٠ .

(١٠) رێك کەوتنی شەریف پاشای نوێنەری کورد و نۆبار بۆغۆز پاشای نوێنەری ئەرمەنی لە کاتی کۆنگرەی ئاشتی لە پاریس و هاریکاری=

نەتەوەپەرستەکانیش نەیانتوانی سەرنج و بایەخی نەدەتی ئەگەرچی ئەوانیش لەوەدا تا رادەیەك هەڵی شاردراوەی خۆیان هەبێت ؛ لە هەموو شت زیاتر « ئاتی تورکیزم » بزواندبێ[11] .

بەم جۆرە و لەبەر رۆشنایی ئەو راستییانەی لە بەشی پێنجەمی ئەم کتێبەدا تۆمار کراون دەڵێین : لە کاتی حوکم دان بە سەر دەوری کورد لە کوشتاری ئەرمەندا پێویستە ـ بۆ ئەوەی مەوزوعی بین ـ هۆ جیاکەرەوە و نزیکخەرەوەکانی نێوان کورد و ئەرمەن رەچاو بکەین ، رادەی دەور و هێزیان دیار بکەین چونکە بەو جۆرە بە ئاسانی تێ دەگەین چۆن هێندێکیان پاڵیان بە کوردەوە کورتبێتەوە تا ببنە یەکێك لە داردەستەکانی کوشتاری ئەرمەن و چۆن ئەوانی تریشیان کارێکی وایان کرد کوردی دوربێن لەو رۆژە تاریکانەدا لایەنی ئەرمەن بگرن و دەستی یارمەتی و برایەتی بۆ درێژ بکەن . زۆر نووسەر لە هەڵسەنگاندنیاندا ئەم راستییە گرنگەیان خستۆتە پشت گوێ . نووسەری تری واش هەیە نموونەی گرنگیان لە بارەی یارمەتیی کوردەوە بۆ ئەرمەن هێناوەتەوە کەچی لەگەڵ ئەوەشدا هەر بەدڕندە و تاوانباریان داناون[12] .

---

= ئەرمەنەکان لەگەڵ مێژوو نیشتمانپەروەرەکانی کوردا نیشانە و بەڵگەی ئەم راستییەن .

(۱۱) داشناقەکان وایان لێ هات لەسەر بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد هەڵیان دەدایێ و لە چاپەمەنییەکانی خۆیاندا باسیان دەکرد .

(۱۲) بە نموونە وەك ە. کیلینگ ( بڕوانە : E. H. Keeling, Op. Cit., pp. 228 - 229 . هەروەها بڕوانە پێشەکیی ئەم کتێبە ) .

هەموو قۆناغەکانی کوشتاری ئەرمەن یەک زنجیرە پێک دەهێنن و هیچ جیاوازییەک لە نێوان ئەو هۆیانەدا نییە کە دروستیان کردن ، جیاوازی تەنها لە رادەی فراوانی و ئەنجامەکانیاندا دەبینرێ . ئەو کوشتارانە بێ جیاوازی زۆر لەوە گەورەتر و قووڵتر بوون کە مەبەستی دواکەوتوویی و هەستی کوێرانەی کورد بن . کارێکی کەمێنیی نەبوون[۱۳] ، کارێکی رێکخراوی مەبەستداری سیاسی بوون ، مەبەستی بەرزبوونەوەی هەست و بزووتنەوەی نەتەوەیی ئەرمەن و سەرکوتی میری بەرامبەر بەو بزووتنەوەیە و کورتبینیی کاربەدەستان بوون لە چارەسەرکردنیدا . ئەو سیاسەت و هەستەی پاڵی بە کاربەدەستانەوە نا بکەونە گیانی بەلگار[۱٤] و کورد و عەرەب (ئاوارە کردنی کورد و کوشتارە رەشەکەی جەمال سەففاح لە سوریا و گەلێکی تر) هەر ئەویش بوو پاڵی پێوە نان بکەونە قەلاچۆی ئەرمەن ، بەڵام لەبەر چەند هۆیەکی تایبەتی لەمیاندا توند و تیژتر هاتنە دەست .

---

(۱۳) لە کتێبی « قەلاچۆی ئەرمەن لە ئیمپراتۆری عوسمانیدا » بە دەیان بەڵگەی مێژوویی بۆ ساغ کردنەوەی ئەم مەسەلەیە هەیە ، هەروەها زۆر نووسەریش سەرنجیان بۆی راکێشاوە و ئەوەیان دەستنیشان کردووە کە ئەگەر مەسەلە ئایین بوایە دەبوو هەموو گاورەکان ، نەک تەنها ئەرمەن ، قەلاچۆ بکرێن .

(۱٤) ئەوەی عوسمانییەکان لەگەڵ بەڵگارەکاندا کردیان بە تایبەتی دوای راپەڕینی نیسانی ۱۸۷٦ ، زۆر لەوەی دەکرد کە دواتر لەگەڵ ئەرمەندا کردیان . هەردووکیان یەک هۆیان هەبوو و فەرمانڕەوایانی عوسمانیش یەک هەڵوێستیان بەرامبەریان هەبوو . دەتوانین بڵێین مێژوو تا رادەیەکی زۆر « خۆی دووبارە کردەوە » .

هیچ گومان لەوەشدا نی‌یە ئەگەر ئەنجامی شەڕی یەکەمی جیهان سەرکەوتنی بۆ بهێنانایە پاش ماوەیەك هەر ئەو کاربەدەستانە بە هەمان چلۆن و شێواز دەکەوتنە گیانی کورد و عەرەب و لاز و چەرکەس و نەتەوە و کەمینەکانی تری ناو دەوڵەتی عوسمانی . لێرەدا جێگەی خۆیەتی قسەیەکی لۆرانسی ناسراو و شارەزا لەم بارەیەوە بهێنینەوە . لۆرانس دەڵێت :

« ئیتیحادیەکان ئەرمەنیان لەبەر ئەوە لە ناو نەبرد کە گاور بوون ، بەڵکو لەبەر ئەوەی ئەرمەن بوون . هەر لەبەر ئەو هۆیەشە دەیانبینین چلۆن بەندیخانەکان بە عەرەبی موسڵمان و گاور پڕ دەکەن و بە تەنیشت یەکەوە بە سێدارەدا هەڵیاندەواسن . جەمال پاشا لە سوریا هەموو چین و هەموو دەستە و هەموو مەزهەبێکی ئازار دا ... » .

دوا بە دوای ئەمە لۆرانس دەڵێ :

« ئەوان ( مەبەستی ئیتیحادیەکان ، واتە تورکە لاوەکانە ـ ك. م.) بە تەما بوون بۆ پەرش و بڵاوکردنەوەیان ( مەبەستی پەرش و بڵاوکردنەوەی عەرەبە ـ ك. م.) هەمان ڕێباز بگرنە بەر کە لەگەڵ ئەرمەندا پەیڕەویان کرد »[١٥] .

هاوتای باسە سەرئەنجامی ئەرمەن لە ساڵەکانی شەڕی یەکەمدا کاری کردە سەرئەنجامی گەلی کوردیش . لە لایەکەوە « سەرکەوتنی »

---

(١٥) ت. لورانس ، أعمدة الحكمة السبعة ، الجزء الاول ، ترجمة الدكتور سليم النعيمي ، بغداد ١٩٤٧ ، ص ٣٥ ـ ٣٦ .

ی ـکە لاوەکان لە کوشتاری ئەرمەندا پاڵی پێوە نان بۆ گەلەکانی
ترەوە بۆ لە هەمان ڕێباز بکەنەوە ، لە لایەکی تریشەوە لەوە دڵگیر
بوون کە نەیانتوانی وەك دەیانویست هەموو گەلی کورد دژی ئەرمەن
هەڵبستە بکەن . لەمەدا نیشانەیەکی خراپیان ـ دیارە بۆ خۆیان ـ
دیوە و لە ڕاستیشدا وا بوو ، بە تایبەتی ئەگەر بزانین بەشداری
کورد لە کوشتاری ساڵەکانی شەڕدا کەمتر بوو لە بەشدارییان لە
کوشتارەکانی سەردەمی فەرمانڕەوایی سوڵتان عەبدولحەمیدا ، هەرچەندە
ئەمجارە بۆ خۆی گەلێك لەمیان فراوانتر بوو . ئەمە ڕقی کاربەدەستانی
تری کورد زیاتر هەڵساند و ئەوە بوو ، وەك لە بەشی چوارەمی ئەم
کتێبەدا باسمان کرد ، زۆری نەخایاند کەوتنە گیانی کوردیش .

لە کۆتاییدا دووبارەی دەکەینەوە ساڵەکانی شەڕی یەکەمی جیهان
بە کارەسات و ئەنجام و دەرسەکانییەوە قۆناغێکی گرنگ لە مێژووی
گەلی کورددا پێك دەهێنن ، قۆناغێك کە شایانی بایەخ پێدانە !! .



# سەرچاوە

## سەرچاوە بە زمانی کوردی


حسین حزنی موکریانی ، مێژووی میرانی سۆران ، چاپی دووەم ، هەولێر ١٩٦٧ .

حەمدون ، شەڕی پێشوو ، _ « گەلاوێژ » ، ژمارە _ ٤ _ ، سالی _ ٧ _ ، نیسانی ١٩٤٦ .

دوکتۆر رەحیمی قازی ، قازی محەمەد ، دەستنوس .

رەفیق حلمی ، یادداشت ، بەشی _ ١ _ ، بەغدا ١٩٥٦ .

« کۆمەڵە شیعری حاجی قادری کۆیی » ، چاپ و بلاوکەر عبدالرحمن سعید ، سلێمانی ١٩٣٥ .

محمد امین زکی ، خلاصەیەکی تأریخی کورد و کوردستان ، جلدی اول ( جزء دوەم ) ، بەغدا ١٩٣١ .

محمدی مەلا کریم ، حاجی قادری کۆیی شاعیری قۆناغێکی نوێیە لە ژیانی نەتەوەی کورد ، بەغدا ( بێ )* .


## سەرچاوە بە زمانی عەرەبی


الدکتور أستارجیان ك. أ. ، تاریخ الأمة الارمنیة . وقائع من الشرقین الادنى والأوسط في أدوار الامبراطوریات الرومانیة والبیزنطیة والفارسیة والشمانیة والروسیة من القرن السابع قبل المیلاد الى نهایة الربع الأول من القرن العشرین ، الموصل ١٩٥١ .

الدکتور أستارجیان ك. أ. ، تأریخ الثقافة والأدب الأرمني ، الموصل ١٩٥٤ .


---

* مەبەست بێ سالی چاپە .

سـعيل جول ، اليزيدية قديماً وحديثاً ، بيروت ١٩٣٧ .
الدكتور بلەج شيرکوه ، القضيـة الـكردية . ماضى الـكرد وحاضرهم ، القاهرة ١٩٣٠ .
البروفيسور بول أميل ، تأريخ أرمينيا ، ترجمة شكري علاوي ، بيروت ، بلا .
جيوت ( جلال الطالباني ) ، دفاعاً عن « حاجى قادرى كويى » ، ـ « خەبات ـ النضال » ، بغداد ٢٦ تموز ١٩٦٠ .
« ثورة العرب . مقدماتها ، اسبابها ، نتائجها » ، بقلم احد اعضاء الجمعيات العربية « القاهرة ١٩١٦ .
حكت سـامي سليمان ، النفط في العراق . دراسة سياسـية واقتصادية ، بغداد ١٩٥٨ .
الدكتور زكى صالح ، مقدمة في دراسة العراق المعاصر ، بغداد ١٩٥٣ .
شـكري محمود نديم ، الجيش الروسي في حرب العراق ، الطبعة الثانيـة ، بغداد ١٩٦٧ .
صديق الدملوجي ، إمارة بهدينان الـكردية أو إمارة العمادية ، الموصل ١٩٥٢ .
عبدالرزاق الحسني ، تأريخ العراق السياسي الحديث ، الجزء الأول ، صيدا ١٩٥٧ .
عبدالمنعم الغلامي ، الضحايا الثلاث ، الموصل ١٩٥٢ .
الدكتور عزالدين مصطفى رسول ، الواقعية في الأدب الـكردي ، بيروت ، بلا .
علي سيدو الـكوراني ، من عمان الى العمادية أو جولة في كردستان الجنوبية ، القاهرة ١٩٣٩ .
فائز الغصين ، المذابح في أرمينيا ، الطبعة الثانية ، بيروت ، بلا .
الدكتور فاضل حسين ، مشكلة الموصل . دراسة في الدبلوماسية التركيه ـ العراقية ـ الانـكليزية وفي الرأي العام ، بغداد ١٩٥٥ .
الدكتور لؤي بحري ، سكة حديد بغداد ، بغداد ١٩٦٧ .
لورانس ت. ، أعمدة الحـكمة السبعة ، الجزء الأول ، ترجـمة الدكتور سليم التعيمي ، بغداد ١٩٤٧ .
لوقا زودو ، المسألة الـكردية والقوميات العنصرية في العراق ، بيروت ١٩٦٩ .

محمد أمين زكي ، خلاصة تأريخ الكرد وكردستان ، القاهرة ١٩٣٦ .
محمد طاهر العمري ، تأريخ مقدرات العراق السياسية ، الجزء الاول ، الموصل ١٩٢٤ .
« مؤتمر الشهداء » ، بيروت ، بلا .
ويكرام دبليو. أي. ، ويكرام تي. أي ، مهد البشرية ( الحياة في شرق كردستان ) ، ترجمة جرجيس فتح الله ، بغداد ١٩٧١ .
يوسف إبراهيم يزبك ، النفط مستعبد الشعوب ، الجزء الأول ، بيروت ١٩٣٤ .

## سەرچاوە بە زمانی رووسی

А.Адамов, Ирак Арабский. Бассорский вилайэт в его прошлом и настоящем, Петербург, 1912.

ئادامۆف أ. ، عیراقی عەرەبی . ویلایەتی بەسرە لە دوێنێ و ئەمڕۆیدا ، پیتەربورگ ١٩١٢ .

А.С.Аветян, Германский империализм на Ближнем Востоке, Москва, 1966.

ئاڤێتیان أ. س. ، ئیمپریالیزمی ئەڵمانی لە رۆژهەڵاتی نزیکدا ، مۆسکۆ ١٩٦٦ .

"Всемирная история", т.VIII, Москва, 1961.

« مێژووی هەموو جیهان » ، بەرگی – ٨ – ، مۆسکۆ ١٩٦١ .

"Геноцид Армян в Османской Империи",(Сборник документов и материалов под редакцией Проф. М.Г.Нерсисяна), Ереван, 1966.

« قەلاچۆی ئەرمەن لە ئیمپراتۆری عوسمانیدا . کۆکراوەی بەڵگە و مەتریاڵ =

= ئه زێر چاودێری پرۆفیسۆر م. گ. ئێرسبیان » ، یەریڤان ١٩٦٦ .

Академик В.А.Гордлевский, Избранные Сочинения,том III, (История и Культура), М., 1962.

گۆردلێقسکی ف. أ. ، کاره هەڵبژاردەکانی ، بەرگی سێیەم ( مێژوو و روناکبیری ) ، مۆسکۆ ١٩٦٢ .

К.Гофман, Нефтяная политика и англосаксонский империализм, Москва, 1930.

ك. گۆفمن ، سیاسەتی نەوت و ئیمپریالیزمی ئەنگلۆ ـ سەکسۆنی ، مۆسکۆ ١٩٣٠ .

Б.М.Данциг, Ирак в прошлом и настоящем, Москва, 1960.

دانتسیگ ب. م ، عیراق دوێنێ و ئەمڕۆ ، مۆسکۆ ١٩٦٠ .

М.С.Иванов, Очерк истории Ирана, Москва, 1952.

ئیڤانۆف أ. س. ، دیراسەی مێژووی ئێران ، مۆسکۆ ١٩٥٢ .

Ихсан Фуад, Творчество Хаджи Койи и его место в курдской литературе, Автореферат, Москва, 1966.

ئیحسان فوئاد ، بەرهەمی حاجی کۆیی و جێگەی لە ئەدەبی کوردیدا ، (کورتەی نامەی دوکتۆراکەی) ، مۆسکۆ ١٩٦٦ .

Ю.В.Ключников и Андрей Сабанин, Международная политика новейшего времени в договорах, нотах и декларациях, ч.II, Москва, 1926.

کلیۆچنیکۆف ی. ف. و ئەندرێیەی سەبانین، سیاسەتی نێوان دەوڵەتانی سەردەمی هەرە نوێ لە پەیمان و یادداشت و «تصریح»دا، بەشی دووەم، مۆسکۆ ١٩٢٦.

Н.Г.Корсун, Арабский Восток-Ирак, Москва, 1928.

کارسون ن.گ.، رۆژهەلاتی عەرەب ـ عیراق، مۆسکۆ ١٩٢٨.

Н.Г.Корсун, Первая мировая война на Кавказском фронте, Москва, 1946.

کارسون ن.گ.، شەڕی یەکەمی جیهان لە بەرەی قەفقاسدا، مۆسکۆ ١٩٤٩.

Н.Г.Корсун, Сарыкамышская операция на Кавказском фронте мировой войны в 1914-1915гг., Москва, 1937.

کارسون ن. گ.، شەڕی ساریقامیش]لە بەرەی قەفقاسی[ شەڕی جیهانا ١٩١٤ ـ ١٩١٥، مۆسکۆ ١٩٣٧.

Л.Н.Котлов, Становление национально-освободительного движения на Арабском Востоке, Москва, 1975.

کاتلۆف ل. ن.، پەیدا بوونی بزوتنەوەی نەتەوەیی ـ ئازادی لە رۆژهەلاتی عەرەبدا، مۆسکۆ ١٩٧٥.

Курд-Оглу, Курды и империализм,-"Бюллетень прессы Среднего Востока", Ташкит, № 13-14, 1932.

کوردئۆغلو، کورد و ئیمپریالیزم، گۆڤاری «بلوتینی چاپەمەنی رۆژهەلاتی ناوەڕاست»، تاشکەند، ژمارە ١٣ـ١٤، ١٩٣٢.

М.С.Лазарев, Курдистан и курдская проблема (90 годы XIX века - 1917 г.), Москва, 1964.

لازەرێڤ م. س. ، کوردستان و کێشەی کورد ( ساڵەکانی نەوەدی سەدەی نۆزدە ـ ١٩١٧ ) ، مۆسکۆ ١٩٦٤ .

Инженер Ю.Лебедев, Багдадская железная дорога и современное состояние её строительства, Петербург, 1908.

لێبێدێڤ یو. ، هێڵی شەمەندەفەری بەغدا و باری دروست کردنی ئەمڕۆی ، پیتەربورگ ١٩٠٨ .

"Советская Историческая Энциклопедия", т.1, Москва, 1961, т.10, Москва, 1967.

« ئەنسیکلۆپیدیای مێژوویی سۆڤیێتی » ، بەرگی ـ ١ ـ ، مۆسکۆ ١٩٦١ ؛ بەرگی ـ ١٠ ـ ، مۆسکۆ ١٩٦٧ .

Академик Е.В.Тарле, Европа в эпоху империализма, 1871-1919гг., М.-Л., 1928.

تارلێ ف. ، ئەورووپا لە چەرخی ئیمپریالیزمدا ، مۆسکۆ ـ لێنینگراد ١٩٢٨ .

И.О.Фаризов, Место национально-освободительного движения курдов в борьбе народов Ближнего и Среднего Востока против империализма, Канд.дисс. (реферат), Москва, 1953.

فەریزۆف ئی. و. ، شوێنی بزووتنەوەی ئازادی ـ نەتەوەیی کورد لە خەباتی گەلانی ڕۆژهەڵاتی نزیك و ناوەڕاستدا دژی ئیمپریالیزم ، (کورتەی نامەی دوکتۆرێکەی) ، مۆسکۆ ١٩٥٣ .

## سەرچاوە بە زمانی ئینگلیزی و فەرەنسەیی

Curzon G. N., Persia and the Persian question, Vol. II, London, 1892.

Dagobert von Mikusch, Mustapha Kemal between Europe and Asia, ( translated by John Linton ), London, 1931.

« Documents on British Foreign policy, 1919 - 1939 », First series, Vol. IV, London, 1952.

Eagleton W., The Kurdish Republic of 1946, London, 1963.

Edmonds C. J., Kurds, Turks and Arabs. Politics travel and research in North - Eastern Iraq, London, 1957.

Ireland P. W., Iraq. A Study in political development, London, 1937.

Keeling E. H., Adventures in Turkey and Russia, London, 1924.

Kinner J. M., A geographical memoir of thc Persian Empire, London, 1813.

Kinner J. M., Journey through Asia Minor, Armenia and Koordistan in the years 1813 and 1814, London, 1818.

« League of Nations. Question of the frontier between Turkey and Iraq », Geneva, 1924.

Longrigg S. H., Four Centuries of Modern Iraq, London, 1925.

Luke H. Ch., Mosul and its minorities, London, 1925.

Main E., Iraq from Mandate to Independence, London, 1935.

Mason K., Central Kurdistan, - « The Geographical Journal », Vol. LIV, No. 6, December 1919.

« Memorandum sur la situation des Kurdes et leurs revendications », Paris, 1948.

Millingen F., The wild life among the Koords, London, 1870.

Morier J., A second journey through Persia, Armenia and Asia Minor to Constantinople between the years 1810 and 1816, London, 1818.

Morier J., Journey through Persia, Armenia and Asia Minor to Constantinople in the years 1808 and 1809, London, 1812.

Nikitine B., Les Kurdes. Etude sociologique et historique, Paris, 1956.

Philby H., Arbian days, London, 1948.

Rawlinson H. C., Notes on a journey from Tebriz, throuqh Persian Kurdistan ..., - « The Journal of the Royal Geographical Society », London, Vol. X, 1840.

Richard D. Robinson, The first Turkish Republic. A case study in national development, Cambridge, 1963.

Rich Cl. J., Narrative of a Residence in Kurdistan, Vol. I - II, London, 1836.

Safrastian A., Kurds and Kurdistan, London, 1948.

Shmidt D. A., Journey among brave men, Toronto, 1964.

Soane E. B., To Mesopotamia and Kurdistan in disguise, second edition, London, 1926.

Sykes M., The Kurdish tribes of the Ottoman Empire,- « The Journal of the Royal Anthropological Institute of Gerat Britain and Ireland », Vol. XXXVIII, 1908 (July to December).

« The memories of Naim Bey. Turkish official documents relating to the deportations and massacres of Armenians », London, 1921.

Wilson A. T., Loyalities Mesopotamia, 1914 - 1917. A personal and historical record, London, 1930.

Wilson A.T., Mesopotamia, 1917 - 1920. A clash of loyalities. A personal and historical record, London, 1931.

Zaki Saleh, Mesopotamia. Iraq 1600 - 1914, Baghdad, 1950.

• • •

## سەرچاوە بە زمانی تورکی

Nuri Dersimi, Kürdistan Tarihinde Dersim, Halep, 1952.

عبدالعزیز یاملکی ، کوردستان و کرد إختلال لری ، جلد ـ ۱ ـ ، تهران ۱۹٤٦ .

## گۆڤار و ڕۆژنامە

« بانگی کرد » ، بەغدا ، ژمارە ـ ۱ ـ ، ۱۲ « ربیع الاول »ی ساڵی ۱۳۳۲ ؛ ژمارە ـ ۲ ـ ، ۱۳۳۲ .

« بانگی کوردستان » ، سلێمانی ، ژمارە ـ ۲ ـ ، ۲۱ ئاغستۆسی ۱۹۲۲ .

« برایەتی » ، بەغدا ، ژمارە ـ ۷ ـ ، تەشرینی یەکەمی ۱۹۷۰ .

« ژیانی نوێ » ، سلێمانی ، ژماره ـ ٩ ـ ، کانوونی یەکەمی ١٩٦٠ .
« کردستان » ، عـدد ـ ٦ ـ ، جنیف ، ٢٥ جمادی الاول ١٣١٦ ، ٢٨ أيلول ١٣١٤ .

● ● ●

« الثقافة الجديدة » ، بغداد ، أيلول ١٩٧٣ .
« العالم العربي » ، بغداد ، تشرين الاول ١٩٣١ .

● ● ●

# ناو (*)



---

(*) بە پێویستمان نەزانی ئەو ناو و شوێنانەی لە ناومرۆکی کتێبەکەدا زۆر دووبارە دەبنەوە ( وەك کورد و کوردستان ) لێرەدا بیاننووسین . هەرچی ناوی هۆز و گەلانە لێرەدا ، واتە لە لیستەی ناوەکاندا تۆمار کراون .

# شوێن

• • • •

# سەرنج

بە داخەوە هەندێک هەڵەی چاپ کەوتوونەتە چەند شوێنێکی ئەم کتێبەوە . بە پێویستمان زانی سەرنج بۆ ئەمانەیان رابکێشین :

ل ١٧ : یەکەم وشەی دێڕی یەکەی پەراوێزی ٢٤ دەبێت بە : نووسەر .

ل ٤٣ : وشەی ( تبلیس ) لە دوا دێڕدا دەبێت بە : بتلیس .

ل ٥٤ : دوا وشەی دێڕی سێیەم ( قۆچی ) دەبێتە : قۆچی .

ل ٨٤ : یەکەم دێڕی پەراوێز 1946 دەکرێت بە : 1964 .

ل ١٢٣ : پەرەگرافی دوو ، دێڕی دوو و سێ لە بریتی ( گنجاک ) ( هنجاک ) دەخوێندرێتەوە .

ل ١٧٠ : پەرەگرافی دوو دێڕی سێیەم لە بریتی ( کوردەوارێدا ) ( کوردەواریدا ) دەخوێندرێتەوە .

• • •

# پێڕست

A PUBLICATION OF THE KURDISH ACADEMY

Dr. Kamal Madhhar Ahmad

# KURDISTAN

## DURING THE YEARS OF THE FIRST WORLD WAR

Kurdish Academy Press
Baghdad - 1975

نەخشەی بەرگەکە هونەرمەند (ولید مهدي) کێشاویەتی

نرخی (٣٠٠) فلس

لە کتێبخانەی نیشتمانیدا

ژمارە ٦٢١ی ساڵی ١٩٧٥ی دراوەتێ

# مێژوو

دوکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد



## کورتە باسێکی زانستی مێژوو و کوردو مێژوو

بە یاریدەی ئەمینداریێتی گشتی ی ڕۆشنبیری و لاوان چاپ کراوە

دوکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد

# مێژوو

## کورتە باسێکی زانستی مێژوو و کوردو مێژوو

بەغدا ١٩٨٣

بە یاریدەی ئەمینداریێتی گشتیی رۆشنبیری و لاوان چاپ کراوە

# پێشکەشە

به یادی پیرۆزی

شەرەفخانی بیدلیسی

مەلا مەحموودی بایەزیدی

موحەممەد ئەمین زەکی

# پێشەکی

دەمێکە پێوەم بەرهەمێکی سەربەخۆ دەربارەی مێژوو پێشکەش بە خوێندەواری کورد بکەم ، لەبەرئەوە چەند ساڵێکە هەر زانیاری‌یەکی بەکەڵکم بەردەست کەوتبێ ، یا هەر تاقی‌کردنەوەیەکی تایبەتیی خۆمم لا پەسەند بووبێ یەکسەر تۆمارم‌کردوونو وا لێرەدا پوختەیان پێشکەش ئەکەم •

سەرچاوەکانی ئەم کتێبە زۆرو پەرش‌وبڵاون • بەوێنە جارێک ناوی تالێرانی تێدا هاتووە ، بەڵام ئەو چەند دێڕەی دەربارەی ئەو نووسیومن بەرهەمی خوێندنەوەی ژمارەیەک سەرچاوەن کە یەکێکیان کتێبێکی ۲۲۰ لاپەڕەیی نایابی تارلێی مێژوونووسە •

ساڵی ۱۹۷۸ زۆربەی بەشی یەکەمی ئەم کتێبەم ، کە سەرنجە تایبەتی‌یەکانی خۆمی تێدایە ، پێشکەشی وەرزی ڕووناکبیری‌ی ساڵانەی زانکۆی بەسرەم کرد ، ئەو مامۆستاو قوتابی‌یانەی گوێیان لێی‌گرت پێیان پەسند بوو •

مەبەستی سەرەکیم لەباسەکانی بەشی سێیەم تەنها ڕوون‌کردنەوەی لاپەڕەکانی مێژوونووسی‌ی کوردی‌ی نی‌یە ، بەڵکو دەشەوێ بە ڕووناکبیرانمان بڵێم ونبوون بۆ خزمەتو چاکەی کەس نی‌یە • دەمویست لەوبەشەدا هەرکەس دەنکە جۆیەکی ماڵی پاشای خواردووە ناوی بهێنمەوە ، بەڵام ترسام ئەوە کاربکاتە سەر ناوەرۆکی گشتی‌ی کتێبەکە • ئەوەندە هەیە ناوی کەسم بەئەنقەست نەخستۆتە پشت گوێ •

وەك ئاشكرایە ڕێنووسی كوردی هێشتا دوا دەقی خۆی وەرنەگرتووە بۆیەكا لەوانەیە جیاوازیی لە ڕێنووسی باسەكانی كتێبەكەدا بەرچاو بكەوێ. جۆری داڕشتنی ناوە عەرەبییەكانیش وێك ناچن ، بەڵام تەنانەت زمانە ئەورووپایییەكانیش هێشتا بەتەواوەتی لەوجۆرە جیاوازییە قوتاریان نەبووە. بۆ هەندێك مەبەست وشەی جیاوازم بەكارهێناوەو چەندم تواتیی هەوڵمداوە بەپێی بۆچوونی خۆم ژمارەیەك زاراوی مێژوویی نوێ دابڕێژم كە هیوادارم باشەكانیان جێگەی خۆیان بگرن . مەبەستم لە زاراوی ( مێژوونووسی ) كە لە هەموو بەشەكاندا گەلێك جار دووپات دەبێتەوە هیستۆریۆگرافییە (Historiography) .

دەبوو ئەم بەرهەمە ناوبنێم « دەربارەی زانستی مێژوو » ، بەڵام وابزانم ، دەنگی مێژوو بەتەنها خۆشتر دێتە گوێ . دیارە سەرگوزشتەی مێژوو بە دەیان كتێبی وەك ئەمەی من تەواو نابێ ، ئەم هەنگاوی یەكەمە پێویستی بە گەلێك هەنگاوی ترە .

هیوادارم « مێژوو » یەكێك لە كەلێنە زۆرەكانی كتێبخانەی كوردیی پڕبكاتەوە .

## بەشی یەکەم

# چەند تێبینییەك دەربارەی مێژوو

**مێژوو چییە. دووپاتکردنەوە لە مێژوودا. ڕەوڕەوەی مێژوو . کێ خاوەنی مێژووە ؟. دەوری سەرۆك لە مێژوودا . ناپلیۆنو محەمەد عەلیی گەورە . سەرنجی جەمالەددینی ئەفغانی . فۆنافەکانی مێژوو . حوکمی مێژوو . تالیڕانو میرابۆ . ستیفان زیفایگو ماری ئەنتوانێت . کریستۆف کۆلۆمبس . دیسان کوردو کوشتاری ئەرمەن . سلاوێك بۆ عەلی کەمال . لویسی چواردە . مۆزەخانەی لوفەر .**

هیچ گومان لەوەدا نەماوە کە مێژوو زانستێکی گەورەو بەکەلکە ، بەلکو بێ سێو دوو دەتوانین ناوی بنێین « زانستی زانستەکان » . ڕاستەکەشی مێژوو زانستی زانستەکانە ، وەك خوێنی چێشت وایە بۆیان چونکە هیچ زانیارییەکی گرنگ نییە مێژووی تایبەتیی خۆی نەبێت ، وەك مێژووی سروشتو مێژووی پزشکیو مێژووی ئابووریو مێژووی زوبانو مێژووی ئەدەبو مێژووی ئاسانکەریو مێژووی سەربازیو مێژووی وەرزشو مێژووی کیمیاو فیزیاو مێژووی هونەرو گەلێکیتر . بەلام لە هەموان گرنگتر مێژووی ژیانە کە گشت زانستەکانو ڕووداوەکانی ڕۆژانەو ئالوگۆڕەکانی کۆمەل دەگرێتەوە . بڕوا ناکەم ڕووناکبیرێکی ڕەسەن یا فەرمانبەرێکی سەرکەوتوو توانیبێتی بێ مێژوو بەڕێوەبچێت . بۆ هەرکەسێك بیەوێت دەرسەکانی مێژوو گەورەن ، یەکجار گەورەن . ئەمریی ڕاستەقینە لای مێژووە .

نزیکەی ٤٠٠ سال لەمەوبەر مێژوونووسی گەورەی کورد شەرەفخانی

بدلیسی لە سەرەتای « شەرەفنامە »ی هێژاو بەنرخـــدا دەربـــارەی مێژوو نووسیوی‌یە دەڵێت :

« لەلای ئەوانەی کە زۆر زرینگو ژیرنو وردەکارنو دوور دەبینن‌و بە ڕاو بیرن » لەگەڵ « هەموو نووســـەرێکی لە زەبرو هەموو زانایەکی زۆرزانو دەمڕاستو هـــەموو ئاگادارێك لە بەسەرهاتی ڕابوردووان » مێژوو « لە ســـەرووی هـــەموو هونەرانەوەیە »[1] .

مێژووش ، وەك هەموو زانستەکانی‌تر ، مێژووی تایبەتی‌ی خۆی هەیە کە لەگەڵ پەیدابوونی ئادەمیزادا دەست پێ دەکات ، بۆیەکا مێژووی مێژوو لە مێژووی گشت زانستەکانی تر دوورو درێژترە . بەڵام بەرلەوەی بێینە سەر گێڕانەوەی کورتەی ئەو مێژووە لەم بەشەدا چـــەند تێبینی‌یەکی گشتی‌و پێویست دەربارەی‌مێژوو پێشکەش دەکەین .

● ئەرکی گەورەی مێژوو بریتی‌یە لە دیارکردنی بەسەرهاتی هەمەجۆری ژیانی ئادەمیزاد پێکڕا یا جیـــاواز ، بەپێی قۆناغ یـــا بەشـــێك لـــە قۆناغ ، وێڕای دەســـت‌نیشان کردنی هێـــزی بزوێنی‌و تایبەتی‌یەکـــانی‌ هەڵسەنگاندنی ئەو ئاڵو گۆڕانەی بەسەریدا هاتون لەگەڵ ڕوونکردنەوەی دەرسەکانی بەپێی سەنگو قەوارەیان . کەواتە بـــەکورتی دەتوانین بڵێـــین مێژوو بریتی‌یە لە « تۆماری هەموو ئاڵو گۆڕێکی سروشتو کۆمەڵ » . بریتی‌یە لە « باسی ڕابوردووی ئادەمیزادو ئاڵو گۆڕەکانی ناو کۆمەڵگاکانی‌ لایەنی جیاوازی ژیانی ئەو کۆمەڵگایانە پێکڕاو بەجیا بە نیازی تێگەیشتـــنی ئیمڕۆی‌و دیارکردنی ڕێبازی گشتی‌ی دواڕۆژی » .

---

١ ــ بڕوانـــە : شەرەف خانی بدلیسی ، شـــەرەفنامە ، وەرگێڕانی هەژار لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد ، نەجەف ، ١٩٧٢ . ل ٩ .

لە زوبانە ئەوروپاییەکاندا زاراوی مێژوو لە وشەی (historia) ی
یۆنانیی کۆنەوە وەرگیراوە کە دەقاو دمق واتـــای چیرۆكو لێکۆڵینەوەو
گێڕانەوەی ڕوداوی پێزانراو دەگەیێنێت ، کەواتە لە سەرەتاوە ناوی مێژوو
موجۆرە تا ڕادەیەکی باش لەگەڵ مەبەستەکانیدا دەگونجا •

● تاقیکردنەوەکانی مێژووی سەدان هەزار ساڵەی ئادەمیزاد ئــــەوە
دەسەلێنن کە کۆمەڵ بەپێی یاسایەکی تایبـەتی دەگۆڕدرێتو بــەرەوپێش
دەچێت،ئەو یاسایەش بۆ خۆی کەوتۆتە ژێر کاری ژمارەیەك دیاردەی گرنگی
پێکەوە بەستراوی خودی ژیانەوە ، وەك باری ئابووری ( پێوەندیو هۆکانی
بەرهەمهێنان)و دەوروبەرو شوێنی جوگرافیو دابو نەریتی کۆمەڵایەتیو
ئاستی تێگەیشتنو دامو دەزگاکانی میریو زۆرو کەمی ژمارەی دانیشتوانو
ڕادەی پەرەسەندنیانو پێوەندییان لەگەڵ دەرو دراوسێداو ئــەو جۆرە
بابەتانە •

هەریەك لەم دیاردانە بایەخی تایبەتیی خۆی هەیە • بەوێنــە بــاری
جوگرافیی شوێن بەدرێژایی بوونی ئادەمیزاد کاری کردۆتە سەر ڕەفتاری
ئەندامانی کۆمەڵو مەودای بڵاوبوونەوەیانو خێرایی بەرەوپێش چونیان •
کەمی ژمارەی دانیشتوانو نزمی ڕادەی پەرەسەندنی بوبونە کۆســـــپێکی
گەورە لە بەردەم بەرەوپێش چونی ڕەوڕەوەی شارستانەتی لە ئەمەریکا تــا
سەدەی شازدەو[2] لە ئوستراليا تا سەدەی حەڤدەو هەژدە[3] •

---

٢ ـ ساڵی ١٤٩٢ لەلایەن ئیسپانییەکانەوە بە ڕەهبەریی دەریاوانی ئیتالیایی
بەناوبانگ کریستۆف کۆلۆمبس دۆزرایەوە •

٣ ـ هۆڵەندییەکان لە سەرەتای سەدەی حەڤدەوە کەوتنــــە دۆزینـــەوەی
کیشوەری ئوسترالیا ، هەر لەبەر ئەوەش یەکەمجار ناونــرا هۆڵەندەی
نوێ . ئوستراليا وشەیەکی لاتینی کۆنە مانای باشوور دەگــەیێنێت ،
مەبەستی ئەو ناوە تازەیەی ئەوەیە کە ئەوکیشوەرە کــەوتۆتە بەشــی
خوارووی زەمین •

● هەمەجۆر لێکۆڵینەوەی مێژوویی هەیە . جاری وا هەیە مێژوونووس زنجیرەڕوداوو بەسەرهاتەکان لێك دادابڕێتو لە قەوارەیەکی گشتیدا لێی دەکۆڵێتەوە ، وەك مێژووی جیهان . قووڵبوونەوە لە عەلقە جیاوازەکانی ئەو زنجیرەیە کارناکاتە سەر یەکیەتی مێژووی مرۆڤ ، بەڵکو بەپێچەوانەوە یاریدەی باشتر تێگەیشتنی لایەنی تایبەتیی ئەو مێژووە دەدات و سەرئەنجامیش هەموو ڕێچکەکان دەڕژێنەوە سەر یەك ڕۆباری گشتی . مێژووی قۆناغی دەرەبەگی بەجیاو بەگشتیو مێژووی بزوتنەوەی کرێکارانو جوتیارانو مێژووی بزوتنەوەی ئازادیخوای گەلانو مێژووی ڕۆژنامەگەریو دەیان مێژووی تر هەر لە قەوارەی گشتیی مێژوودا دەمێننەوەو هیچکامیان نابنە زانستێکی سەربەخۆ .

● بەداخەوە تا ئێمڕۆش هی وا هەن بە چاوی گومانەوە سەیری مێژوو دەکەن ، پێیانوایە خاوەن هێزو دەسەڵات مێژوو دەنووسێتەوە . لە هەموو ڕۆژگارێکدا کەسانی وا هەبوون . ئەوانە لە قوژبنێکی تەسکی سەردەمی خۆیانەوە سەیردەکەن ، قسەو کرداری دەسەڵاتدارانو پیاهەڵدانی مەراییکەران بەهەڵەیانا دەبەن ، وایان لێ دەکەن ئەو ڕاستییە لەیادبکەن کە مێژووی ڕاستەقینە هەرگیز درۆ ناگرێتە خۆ . جارێکیان ناپلیۆن بۆناپارت لە خێوەتەکەی خۆیدا دەبێت کە هەواڵی کوشتنی یەکێك لە جەنەراڵە ناودارەکانی پێڕادەگەیێنن . ناپلیۆن لە پیاوەکانی پرسی : دوا قسەی جەنەراڵ چی بوو ؟ لە وەڵامدا پێیان گوت : « جەناب لەتاو ئازاری گیانی تا دوا هەناسە هەر دەیناڵاند » . ناپلیۆن یەکسەر ڕووی دەمی کردە یەکێك لە یاریدەرەکانیو پێی گوت بنووسە « جەنەراڵ بەر لە مردنی هاواری کرد : بژی فەرماندەی لەشکر ناپلیۆنی گەورە ! » . ناپلیۆن توانی ئەم قسانە بە سکرتێرەکانی بنووسێتەوە ، بەڵام نەیتوانی بیانکاتە ڕاستییەکی مێژوویی

ـهـێـرلو • مێژوونووس دەتوانێت لە ڕێگەی بەڵگەی واوە وێنەی ناوەوەی ـهرۆن بکێشێت •

هۆیەکی‌تری دوودڵی بەرامبەر مێژوو لە جیاوازیی نرخاندنەوە هاتووە• هەرێـە مێژوونووسان دەزگای ســـوارچاکیی[4] ئەوروپای ســـەدە نـاوجیەکانیان بە دوو جۆر هەڵسەنگاندووە ، هی‌وایان هەیە بـەرز بـەرز گەیاندوویەتە ئاسمان‌و هی‌واشیان هەیە بە ناخی زەویدا بردویەتە خوارێ • هەڵـسـتیشدا سوارچاکی ئەمیشیانەو ئەویشیانە • ئەو سەردەمەی سوارچاکان ـنـسـتی پاریدەیان بۆ هەژارو بێوەژن‌و هەتیو درێژدەکرد باش بوون ، ئـەو سەردەمەش کە کەوتنە سەندنی سەرانەو زەوت‌کردنی ماڵ‌و موڵك بوونـە ـهـر بەسەر شانی خەڵکەوە • بۆیەکا هەر دیاردەیەکی مێژوویمان نرخانـــد ـێویسـتە کات‌و شوێن لەیادنەکەین •

● وەك وتمـــان مێژوو یەکێکە لە زانستە هـــەرە گرنگەکانی ژیان • فەیلەسوفە گەورەکانی ڕێبازی مادیی سەدەی نۆزدە دەیانگوت تەنها یــەك زانست هەیە ئەویش زانستی مێژووە کـــە بریتی‌یە لە دوو بەش : مێژووی ئادەمیزادو مێژووی سروشت • مەبەستیان لە یەکەمیان ئەو لقانەی زانـسـتە کە ئادەمیزاد بۆ خۆی کەرەستەیانە ( مێژوو ، ئـابووری ، کۆمـەڵایەتی‌و ئەوانی‌تر ) ، هەرچی دووەمیانە بریتی‌یە لەو زانستانەی کەرەســـتەیان لەناو خودی سروشت خۆیدایە ( کیمیاو فیزیاو بایۆلۆجیاو ئەوانی‌تر ) •

لێرەدا پرسیارێك خۆی قوت‌دەکاتەوە : گەر مێژوو زانست بێت ئەوساکە دەبێت ڕوداوەکانی خۆیان دووبارە بکەنەوە ، ئەو تایبەتی‌یەی هەمیشە وا بە کۆڵی زانستەوە • لە هەر شوێنێك‌و هەر کاتێك دوو هایدرۆجین‌و یـــەك ئۆکسجین لێك‌بدەیت ئاو دروستدەبێت • دیارە بەوجۆرە ناتوانین سەیری

---

٤ ــ دەزگای سوارچاکی « نظام الفروسیة » .

مێژوو بکەین چونکە کەرەستەی ئەو گیاندارە ، خاوەن هەستو هۆشـــە .
گەلێك هۆ کاری تێدەکەن ، بە ڕاستو چەپدا دەیبەن یا لە عاستی خۆیـــدا
دەیوەستێنن . با ئەوەش بڵێین کە تەنانەت زانستە ڕووتەکانیش هەموو کات
سەد دەرسەد دەقاودەق خۆیان دووپات ناکەنەوە . گەرمایی یا ڕادەی خاوێنی
ئەو تنۆکە ئاوەی لە ناوچە گەرمەکانی ئەفەریقادا دروستیدەکەین جیـــان لە
گەرمایی‌و ڕادەی خاوێنی ئەو تنۆکەی لە ناوچەیەکی ساردو پاکدا دروســـتی
دەکەین .

لەگەڵئەوەش ڕوداوی مێژوویی لە ســـــنوورێکی تایبەتیدا خۆی
دووپاتدەکاتەوە . لە هەموو شوێنێك‌و هەموو کاتێك فشاری زۆر بۆتـــە
هۆی تەقینەوەو نارەزایی . شـــۆڕشە بۆرجوازی‌یەکانی ئـــەوروپای نێوان
سەدەی شازدەو نۆزدە لە زۆر ڕووەوە لەیەكدەچن . چ لە هۆڵەندەو چ لـــە
ئینگیلتەرە ، چ لە فەرەنسەو وڵاتانیتری ئەوروپای ئەو قۆناغە زۆرداری‌و
هەرەسهێنانی پێوەندی‌ی دەرەبەگی‌و پەیدابوونی چین‌و دەســـتەی نوێ‌و
بەرزبوونەوەی ڕادەی تێگەیشتنی کۆمەڵانی خەڵك‌و باری قورسی ژیـــانی
ئابووری‌و چەند هۆیەکی لەیەکچویتر ئەو شۆڕشانەیان دروستکرد کە بە
هەمان دەســـتوور بوونە هۆی ژمـــارەیەك ئـــاڵوگۆڕی لەیەکچوی وەك
دامەزراندنی ڕژێمی بۆرجوازی‌و ئازادکردنیجوتیاران لـــە چەوساندنەوەو
کۆت‌و زنجیری دەرەبەگی‌و پەرەپێدانی مەرجی پێشکەوتنی پیشەســـازی‌و
چەسپبوونی دامودەزگای دیموکراسی نوێ‌و ئاڵوگۆڕیتری لـــەو جۆرو
بابەتە .

گەر کەمێك نزیکتر بکەوینەوە جیـــاوازی‌یەکی ئەوتۆ لەنێوان هۆی
بەرپابوون‌و شێوازو ئەنجامەکانی شۆڕشی ساڵی ١٩٥٢ی میسرو شۆڕشی
ساڵی ١٩٥٨ی عیراقدا بەدی ناکەین . ڕاستە لە عیراق فەیسەڵ‌و خالی‌و نوری

سعید کوژران ، کەچی لە میسر فاروق‌و خزمەکانی ولآت‌بەدەر کران ، بەلآم ئەم جیاوازی‌یە هیچی لە ئەنجامەکانی شۆڕشی میسرو عیراق نەگۆڕی .

جاری‌وا هەیە مێژوو لە کات‌و شوێنی جیاوازدا خۆی دووپات‌دەکاتەوە. هەرتە هیچ جیاوازی‌یەك لەنێوان هەلوەستی کاربەدەستانی ئەوروپای سەدەی بیستەمو کاربەدەستانی ئیمپراتۆریی عوسمانیی سەدەی شازدەو حەڤدەدا بەرامبەر چاپی نوێ نەبوو ، چ لەوێ‌و چ لێرە وەك سەگی هار پەلاماری ئەم دەسکەوتە هەرە گەورەیەی زانستی مرۆڤیان داو بە کاری شەیتانیان لەقەلەمدا ، چ لەوێش‌و چ لێرەش هەردوولا وەك یەك سەریان دای‌لەبەرد .

یەکێك لە تایبەتی‌یە گرنگەکانی زانست ئەوەیە کە وەستانی بۆ نی‌یە ، هەمیشە بەرەوپێش دەڕوات . کیمیاو فیزیای سەد ساڵ لەمەوبەر بەزەحمەت دەگاتە قولەپێی کیمیاو فیزیای ئیمڕۆکە ، ئەمیشیان دەبێت بە دوورین ڕوانینە کیمیاو فیزیای پاش سەد ساڵی‌تر . ئەم یاسایە مێژووش دەگرێتەوە . ڕەوڕەوەی مێژوو هەمیشە بەرەوپێش دەڕوات ، لەوانەیە بۆ ماوەیەك بوەستێت ، بەلآم هەرگیز بەرەوپاش ناگەڕێتەوە . هەموو زەبرو زۆری هۆلاکۆ نەیتوانی کاری مزگەری‌و زەرەنگەری‌و ئاسەنگەری یا پلەی خوێندەواری‌و ڕوناکبیریی عیراقی‌یەکان بگێڕێتەوە سەر دۆخی ڕۆژگاری سۆمەرو ئەکەد . ئەسکەندەری گەورەو شارلەمان‌و هارونە ڕەشید وەك هەموو گەورە پیاوانی ڕابوردوو گەر ئیمڕۆ زیندو بینەوە دەبێت لەگەڵ کۆپەرنیکۆس‌و گالیلۆو ئەدیسۆن‌و هەموو زانایانی ڕابوردوودا پێکرا ڕوو بکەنە یەکێك لە شێتخانەکانی ئەم جیهانە پان‌و بەرینە .

● مێژوو ، وەك هەر زانستێکی‌تر ، تەنها بەرەوپێش ناچێت ، بەڵکو هەمان کات‌و دیسان وەك ئەوان ڕوداوەکانی لەگەڵ یەکتردا تەفاعول دەکەن.

تەفاعولی ڕوداوی مێژوویی دوو جۆرە : ستونیو ئاسۆیی[٥] . ستونی ئەوەیانە کە لەناو خودی کۆمەڵ خۆیدا ڕوودەدات ، ئاسۆییش ئەو تەفاعولەیە کە لەنێوان ڕوداوی مێژوویی کۆمەڵی جیاوازدا ڕوودەدات . بۆ یەکەمیان دەتوانین شۆڕشی چواردەی گەلاوێژ بکەینە نمونە.ئەو شۆڕشە لقەپۆپەیەکی مێژوویی گرنگ بوو ، بەڵام هەمانکات کورپەو بەرهەمی ڕوداوەکانی پێش خۆی بوو ، شۆڕشی بیستو بزوتنەوەو ڕاپەڕینەکانی سیو چلو پەنجاکان ڕێگەی تەقینەوەو سەرکەوتنیان بۆ خۆشکرد .

شۆڕشی گەورەی فەرەنسەش نمونەیەکی لەبارە بۆ ڕوون کردنەوەی تەفاعولی ئاسۆیی . شوورەی گەورەی چینو هەموو قەڵا سەختەکانی جیهان نەیانئەتوانی بەر لە تیشکی شۆڕشی فەرەنسە بگرن کە ، وەك ئاشکرایە . کاری دیاری کردە سەر زۆربەی هەرەزۆری گەلانی جیهان .

دیارە تەفاعولی ستونی لە ئاسۆیی گرنگترە ، بێئەویان زەحمەتە ئەمیان کاربکات . هەر لەبەرئەوەشە کە زانستی مێژوو دان بە هەناردنو هاوردنی شۆڕشدا نانێت . گەر لەناو کۆمەڵ خۆیدا پوشو نەبێت ئاگری دەرەوە بەتەنها ناتوانێت سوتمان دروستبکات .

● ڕەوڕەوەی مێژوو یەکجار گەورەو زەلامە ، بەرەوپێش بردنی هەرگیز لە وزەی تاکە کەسێکدا نەبووەو نییە . بێگومان خاوەنی مێژوو گەلە . بە چاكو بە خراپ ئەرکی گەورەی هەموو بەسەرهاتو ڕوداوێك دەکەوێتە ئەستۆی کۆمەڵانی خەڵك . ڕاستە یەکێكیا دەستەو دایەرەو تاقمێك لە بارێکی تایبەتیدا شەڕ هەڵدەگیرسێنن ، بەڵام جوتیارو پاڵەو وەرزێرو کرێکار بەر لە هەموانو زیاتر لە هەموان دەبنە خۆراكو سوتەمەنی ئاگری ئەو شەڕە . سەردار بێ کۆمەڵانی خەڵك هیچی بۆ ناکرێت . کەس نییە

---

٥ ــ عمودي وافقي .

...ی لەوە هەیێت کە ناپلیۆن پیاوێکی گەورەو فەرماندەیەکی ئازا بوو ، یا ...ر بەوەدا نەیێت کە محەمەد عەلیی گەورە فەرمانڕەوایەکی چاپوکو لێهاتوو ...و . بەڵام ئاخۆ ناپلیۆن‌و محەمەد عەلی بە هەموو تواناو دەســەڵاتیانەوە تەنها لە بیابانی گەورەی ئەفەریقا یا لەسەر لوتکەی ئێڤرستی هیمالایا چی‌یان ...ۆ دەکرا . لەمیان یا لەویان کێ کەشــتی‌و پاپۆڕی وای بۆ حـــەمەعەلی دروستدەکرد کە بتوانێت ١١٠٠ کەشتی‌یەوانو ١٣٩ تۆپی بەئاســانی پێ بگوێزێتەوە .

ڕاستە ڕادەی تێگەیشتن‌و وریایی دەوری لە دیارکردنی شـــێوازی بزووتنەوەی کۆمەڵانی خەڵکدا کەم نی‌یە . بەڵام زۆر هێزی بزوێنەر هەیە کە دەرك‌کردنیان ئاتاجی زیرەکی یا وردبینی نی‌یە . کەس‌نی‌یە برسێتی یـــا زۆرداری‌و بێ‌مافی یا جیاوازکاریی نەیێتە مایەی پەژارە بوونی . زۆر جار ئەو ناڕەزایی‌و پەژارەیی‌یە لە شێوەی تەقینەوەی ڕێکخراو یا بەرەڵادا خۆ دەنوێنێت ، جاری واش‌هەیە لە ناخ‌و دەروندا دەیێتە ڕق‌و کینەو هەر ڕۆژە بە جۆرو شێوازێك لە ڕەفتاری ئـــەم یـــا ئەودا خۆدەردەخات . وانەبوایە دەوروبەری دووهەزارو پەنجا ساڵ لەمەوبەر بە دەیان هەزار کۆیلەی ڕۆمانی دووی سپارتاك نەدەکەوتن . بۆنی ئازادی زۆربەیانی لەوپـــەڕی وڵاتەوە ڕاکێشایە ناو کۆڕی خەباتەوە بەرلەوەی ناوی سپارتاك بەر پەردەی گوێیان بکەوێت . فشاری کەم وێنەی دەرەبەگانی ئەڵەمانیا سەدان هەزار جوتیاری ناچارکرد ساڵی ١٥٢٤ ــ ١٥٢٥ پەلاماری چەك بـدەن بێ‌ئەوەی یـــەك سەرکردەیان هەیێت ، لە زۆر شوێن جوتیاران بەرلەوەی کەسێك یا دەستەو تاقمێك ببنە ڕابەریان هێرشیان دەبردە سەر قەڵای زۆرداران . لەتاو نـــانو برسێتی ، لە ڕقی قامچی‌و کوتەك، نزیکەی سەدهەزاریان لە ماوەیەکی کەمدا گیانی ئازیزیان بەخت‌کرد .

ڕاسته کلیلدارانی مزگەوتو سەرەك هۆزانی فورات ئالآی شـۆڕشی بیستیان هەلکرد ، بەلآم نه لەمانو نه لەوان کەسێك خوێن له پەنجەی نەهات ئەو ۸٥٥٠ کەسەی لەو شۆڕشەدا کوژران سەرتاپایان جوتیـــارو وەرزێرو سەپانی بێتاوانی لادێو گوندەکان بوون . ئەوانە تەنها لەسەر فەرمـــانی ئاغاکانیان خۆیان بەکوشتنەدا . بێ گومان ئەو فەرمانە چەکی بێ هەلگرتن . بەلآم دیسان بێ گومان خۆشیان بۆ هەلگرتنی ئەو چەکە ئامادەبوون.جەورو ستەمو باجو سەرانەی زۆری ئینگلیز که بۆ خۆیان جارەهای جار له بەلگە تایبەتیو نهێنیيەکانیاندا باسیانکردووە ، بوونه هۆی ناڕەزایی زۆرینـەی گەلی عیراق . دیارە وەڕسو ناڕەزا زیاتر ئامادەی خەباتو شەڕە .

ئەم بۆچوونه واناگەیێنێت تاك دەوری له مێژوودا نیيە . ســــەردلێو سەرۆکی داناو چاونەترسو دووربین دەتوانێت دەوری زۆر گەورە ببینێت ئەوەی بەر له هەموو شت لەسەر ڕادەی تێگەیشتنی ئەرکـــەکانی ڕۆژگەر وەستاوە . ئەو سەردارەی بزانێت چی پێویستەو مەرجی ســـەرکەوتن لــە چیدایە هەلبەت دەتوانێت دەوری چاكو دیار ببینێت . هــەر ئەوانەش بۆ خۆیان سەرداری سەرکەوتوو دروستدەکەن . باوەڕناکەم بەر له ناپلیۆن له لەشکری فەرەنسەدا ئەفسەری لێهاتووی وەك ئەو هەلنەکەوتبێت ، بــەلآم ئەوسا فەرەنسە پێویستی به پیاوێکی وەك ناپلیۆن نەبوو . کۆتای سەدەی هەژدەو سەرەتای سەدەی نۆزدە ناپلیۆنیش نەبوایە دەبوو یەکێکی وەك ئەو بێتە مەیدانەوە.محەمەد عەلیی گەورە له ئەلبانیا بمایایەوە زیرەکیيەکەی لــە توتنفرۆشیدا[٦] خۆی دەنواند .

شایانی باسه تەنها زانایانی ڕۆژئاوا دەرکی ئەم ڕاستیيەیان نەکردووە . بەلکو له ڕۆژهەلآتیش ڕووناکبیری ئەوتۆ هەن دەمێکه هەســـتیان پێی

---

٦ ـ محەمەد عەلی بەرلەوەی له ئەلبانیاوە بێتە میسر به بازرگانیی توتنـــەوە خەریكبوو .

کردووه . جەمالەددینی ئەفغانی ( ١٨٣٧ ــ ١٨٩٧ ) لە « العـروة الوثقى »و گۆڤاری « ضیاء الخافقین »و بەتایبەتی کتێبی « خاطرات »دا بیروپێچوپەنا ئەو دەمی تۆمارکردووه[٧] . ئەفغانی لە « خاطرات »دا نوسیویە دەڵێت :

« گەر جوتیاری‌و شوانکاری نەبونایە تەختشان‌و پەخشان‌و ڕابواردنی دەوڵەمەندان نەدەبوون . جێگەی جوتیارو صەنعەتکار لە شارستانەتیدا لــە جێگەی میران بەکەڵکترە . دیومانە گەلێك بێ پاشا بژیت ، بەڵام نەماندیوە پشایەك بێ گەل بژیت » .

بە هەمان دەستوور ئەفغانی لە یەکێك لە نامە ئاگرینەکانیدا ئازایانـــە ڕووی دەمی کردۆتە ناصرەددین شاو پێی‌گوتووە :

« خاوەن‌شکۆ : جوتیارو کرێکارو صەنعەتکار لە وڵاتدا کەڵکیان لــە جەنابتان‌و میرەکانتان زیاترە .. بێ‌گومان ، جەنابی سوڵتان ، بە چاوی خۆت دیوتە یا خوێندوتەوە نەتەوەیەك توانیبێتی بێ‌پاشا بژی ، بەڵام ئایا پاشایەکت دیوە بێ نەتەوەو ڕەعیەت توانیبێتی بژی ؟ » .

● زانایان دەمێکە بۆیان ساغ‌بۆتەوە کە مێژوو یەك قۆناغ نیە[٨] . بەڵام تائێستەش مێژوونووســـان وەك یــەك قۆناغـــەکانی مێژوو لێك جیاناکەنەوە . هی‌وایان هەیە ڕوداوی گەورە دەکەنە ســـنووری نێوان دوو قۆناغ ، هی‌واشیان هەیە لە قوژبنی ســـــروشتی کۆمەڵ‌و پێوەندی‌یەکانی ناوەوەیەوە سەیری قۆناغی مێژوویی دەکەن ، بەلایانەوە ڕۆژگاری کۆیلەیی قۆناغی کۆنی مێژووەو ڕژێمی دەرەبەگی سەدە ناونجی‌یەکانەو سەرمایەداری

---

٧ ــ ئەفغـــانی ســـــرەتا وای بیرنەدەکردەوە . لە « رســـائل في الرد علی الدهریین »دا سەرنجی جۆرێکی‌تر بوو ، ئەوەش بۆ خۆی ئەو ئاڵ‌وگۆڕو بەرەوپێش‌چوونە نیشان‌دەدات کە بەسەر بیروڕای جەمالەددینی ئەفغانیدا هاتوون .

٨ ــ دوایی دێینەوە سەر ئەم باسە .

قۆناغی نوێو سۆشیالیزم قۆناغی هەرە نوێ یا هاوچەرخە • ئەوانەشیان کە ڕوداوی گەورە دەکەنە ڕۆخی دوو قۆناغی جیا سالی ٤٧٦یان بۆ کۆتـــای قۆناغی کۆنو سەرەتای سەدە ناونجی‌یەکان هەلبژاردووە ، واتە ئەو ســالەی بەربەرەکانی باکوور ڕۆمایان گرت • بەلام لە دیارکردنی کۆتای ســـەدە ناونجی‌یەکانو سەرەتای قۆناغی نوێدا یەك‌ناگرنەوە • هی‌وایان هەیە ســالی ١٤٥٣ هەلدەبژێرن،واتە ئەو سالەی محەمەد الفاتح شاری قوستەنتەنی‌یەی[٩] گرت کە تا ئەو سەردەمە پایتەختی ئیمپراتۆریی بیزەنتی بوو • کەچی هی‌وایان هەیە ئەو ڕوداوەیان لا پەسند نی‌یە چونکە ژێرکەوتنی گاوران دەگەیێنێت . ئەوانە سالی ١٤٩٢یان بەلاوە باشترە چونکە دوو ڕوداوی گەورەی لەگەل خۆی هانی ، یەکەمیان دۆزینەوەی ئەمەریکاو دووەمیان گرتنەوەی گرانادا ( غرناطە ) بوو کە تا ئەو سالە بەدەست موسلمانانەوە بوو • مێژوونوســی ئەوتۆش هەیە ڕەمەکی هەموو ئەو ڕوداوانە لە سالی ١٥٠٠دا کۆدەکاتەوەو دەیکاتە ناوەندی دوو قۆناغ • بە هەمان دەستوور مێژوونوسانی ئەم ڕێبازە سالی ١٨٧٠ یا شەڕی یەکەمی جیهان دەکەنە کۆتای قۆناغی نوێ لە مێژووی ئادەمیزاددا •

لەگەل ئەوەش مێژوونوسی ئەوتۆ هەیە پەیڕەویی ئەو دابەش‌کردنــە ناکات • بەوێنە بە لای أ• ج• گراتەوە پێ‌ناسینی ئایینی عیسایی لەلایــەن قوستەنتینی یەکەمی ئیمپراتۆری ڕۆمانی‌یەوە لە سەرەتای ســەدەی چواردا کۆتای مێژووی کۆنو دەست‌پێ‌کردنی سەدە ناونجی‌یەکانە • گرانت دیسان پەنا دەباتەوە بەر ئایینو بزوتنەوەی چاك‌کردنی کلێســە[١٠]و داهــاتی پروتستانت دەکاتە کۆتای سەدە ناونجی‌یەکانو سەرەتای مێژووی نوێ •

---

٩ ــ ئەستەمولی ئیمرۆ •

١٠ــ حركة الاصلاح الديني •

وایزانم بۆچوونی یەکەم لە دابەش‌کردنی قۆناغی مێژوویـــدا بەپێی ـ ـڕێتی کۆمەڵ دروستو زانستانەترە • لێرەدا وەك بەڵگـە نمونەیـەك ـهێـنەوە • بەرەبەیانی ڕۆژی دوازدەی تەشرینی یەکـەمی سـاڵی ١٤٩٢ ـ ـستۆف کۆلۆمبس بەڕێکەوت دوورگەیەکی بچوکی لە ڕۆژهەڵاتی کوبای ـ ـڕۆدا دۆزیەوە • ئەو کارەی کۆلۆمبس کە بۆ خۆی تا مـرد نەیدەزانی ـ ـیە بێ‌گومان گرنگو بایەخدار بوو چونکە ڕێگەی بۆ دۆزینەوەی هەموو ـ ـمەریکا خۆش‌کرد کە بووە هێزێکی بزوێنەری یەکجار گەورەی ڕەوڕەوەی ـ ـەی مرۆڤ • لەگـەڵ ئـەوەش پرسیارێکی ڕەوا لـە بـەردەماندا ـ ـستەدێتەوە : ئاخۆ چ جیـاوازی‌یەك لـەنێوانی ڕۆژی یازدەو دوازدەی ـ ـشرینی یەکەمی سـاڵی ١٤٩٢دا هەیێت تا ئەویان بەشێك لـە سـەدە ـ ـەنجی‌یەکانو ئەمیان بەشێك لە قۆناغی نوێ بێت ؟

هەر بەوجۆرەش کەوتنی ڕۆمای مەڵبەندی شارستانەتی کۆن ڕوداوێکی ـ ـورەی مێژوو بوو ، بەتایبەتی بۆ ئەورووپای ڕۆژئاوا ، بەڵام بۆچ سـاڵی ـ ـوخانی ڕۆما بۆ منیش ببێتە کۆتای قۆناغی کۆن لەکاتێکدا باوو باپیرانم نە ـ ـەر ناومو نە باسی ئەو بەسەرهاتەیان نەبیستبوو •

ئیمڕۆکە مێژوونووسە بۆرجوازی‌یەکانیش تێکەڵیی نێوان کۆتـاو ـ ـەرەتای قۆناغەکانی مێژوو دەسەلمێننو کەمو زۆر بەلای ڕێبازی زانستیی ـ ـبەش‌کردنی مێژوودا دەشکێننەوە • هێربەرت فیشـەری مێژوونووسـی ـ ـینگلیزیی بەناوبانگ لەم‌بارەیەوە نووسیویە دەڵێت : « دیارکردنی سنووری ـ ـێوان چەرخی ناوەندو نوێ کارێکی ئاسان نی‌یە • مرۆ لەسـەرخۆو جیاواز ـ ـەربانەوە پێی نایە ئەمیان • خێرایی ئەو ئاڵوگۆڕە لە هەموو شـوێن وەك ـ ـەك نەبوو ، وێڕای ئەوەی پاشماوەی ڕەگو ڕیشەی سەدە ناونجی‌یەکان لە هەموو جیهاندا بنکێش نەکرا ••• » •

● حوکمی مێژوو دەبێت گەورەترین دەرسی بێت ، ئەو حوکمە دەقاودەق ڕاو بڕیاری گەلە • کەس بۆی نیە تاسەر بتوانێت مێژوو هەڵخەڵەتێنێت • بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم مەبەستە پەنادەبەمە بەر ژینامەی دوو ناوداری ئەورووپای سەدەی هەژدەو نۆزدە ، میرابۆ یەکەمیانەو تالیرانیش دووەم •

فەرەنسە بەجارێك خرۆشابوو • پاشاو دەستوپێوەندی کەوتبونە خۆ بۆئەوەی نەهێڵن ناڕەزایی گەل بگاتە عاستی تەقینەوە • دوای هەڵبژاردنی پەرلەمانی نوێ لویسی شازدە وتاری تەختی خوێندەوەو یەکسەر ھۆڵی کۆبونەوەی بەجێهێشت • نوێنەری لویس بە ناوی پاشاوە داوای لە ئەندامانی پەرلەمان کرد بڵاوەی لێ بکەن • لەناو هەمواندا میرابۆ ڕاست بۆوەو بە دەنگێکی زوڵاڵ پێی گوت :

« بڕۆ بە جەنابی ئاغات بڵێ ئێمە لێرە بە فەرمانی گەل کۆبونەتەوە . لەسەر نوکی ڕم نەبێت جێگەی خۆمان بەجێ ناهێڵین ! » •

ئەم قسانەی میرابۆ بۆ ڕۆژگاری ئەوسای فەرەنسە شایستەی ئەوە بە ئاوی زێڕ بنووسرێنەوە • بەڵام جارێکا میرابۆ کێیە ؟•

میرابۆ (Mirabeau) ساڵی ١٧٤٩ لەناو خێزانێکی ئەرستۆکراسی دەوڵەمەندا چاوی هەڵهانی • زیرەك و وریا ، دەنگ زوڵاڵ و گوتەبێژی وەك خۆی نەبوو • لە هەرەتی لاویدا میرابۆ خۆی دایە دەست شەوانی پاریس • تەخشان و پەخشانی بێ ئەندازەی خستیە ژێر باری قەرزەوە • میرابۆ هەر ئەوسا لەسەر قەرزو بەرەڵلایی چەند جارێك بووە میوانی زیندانەکانی پاریس• ساڵی ١٧٧٦ ژنی مارکیز دی مۆنیەی ناوداری هەڵگرت و نیشتمانی بەجێهێشت • دادگەی باڵای فەرەنسە لەسەر ئەوکارەی بڕیاری خنکاندنی میرابۆی دەرکرد •

میرابۆ لە دووروڵاتیش دەستی هەڵنەگرت ، زینـدانەکانی ئەویشـی تەی‌کردەوە . لەگـــەڵ ئەوەش ڕۆژبەڕۆژ زیـــاتر توانای قایل‌کردنو خۆزلکخستنەوەو دەسەڵاتی نووسینو گوتەبێژیی میرابۆ خۆی دەنواند . هەر زینداتیکی تیی دەچوو دەبووە هاوڕێی نزیکی کارگێڕانی ، زۆر جـار دەبووە میوانی ئازیزی دانیشتنو ئاهەنگە تایبەتی‌یەکانی بەڕێوەبەرانی ئـەو زینداتانە . نووسینەکانی سەرنجی هەموانی ڕاکێشا . زۆری نەخایاند کـە پەلری لێ‌خۆش‌بوونی بۆ دەرچو . میرابۆ گەڕایەوە نیشتمان .

لە نووسینەکانیدا میرابۆ زۆر بە توندی هێرشی دەبردە سەر زۆرداریو چەوساندنەوەی دەرەبەگی . لە هەر شوێنێك دەمی‌بکرایـەوە هـــاتوانی دەمەپەساند ، هەستو هۆشی هەموانی دەبزواند . کە خۆی بۆ ئەنجومەنی نیشتمانی پاڵاوت کەسـێك نەما دەنگی بۆ نـەدات ، تەنانەت جوتیـارو کرێکارانیش لە هەموان زیاتر میرابۆیان دەناسی . لەکـاتی کۆبونەوەکانی پەرلەماندا کاتێك دەکەوتە دوان دارو بەرد ورتەی لێ دەبڕا ، تەختی لویس دەهاتە لەرزین . خەڵك نازناوی « گوتەبێژی شۆڕش »یان پێ‌بەخشی .

دەوروبەری کۆتای مانگی مارتی ساڵی ١٧٩١ میرابۆ لەپڕ نەخۆش‌کەوت. کەس نەما بەپەرۆشەوە گوێ‌قوڵاغی هەواڵی تەندروستیی « دڵی گەورە »و « دەنگی زوڵاڵ »ی شۆڕش نەبێت . کە ڕۆژی دووی نیسان گیـــانی دا بەدەستەوە بە دەیان هەزار بە ئەوپەڕی ماتـــەمینیو ڕێزەوە تەرمەکـــەیان بەڕێ‌کرد . « پانتیۆن »ی گۆڕستانی گـــەورە پیـاوان[11] بۆ یەکەم‌جار دەروازەکانی بۆ خستە سەر پشـــت . گۆڕی میرابۆ بووە مەزارگـــەی نیشتمانپەروەران .

---

١١ـ بەپێی بڕیارێکی تایبـەتی ئەنجومەنی نیشـتمانی « پانتیۆن »ی کـردە گۆڕستانی گەورە پیاوانی فەرەنسـە . دوای میرابۆ پاشماوەی تەرمی جان جاك ڕۆسۆو ڤیکتۆر هیگۆو ئەوجۆرە ناودارانە گوێزرانەوە «پانتیۆن» .

ڕۆژی ١٠ی ئابی ساڵی ١٧٩٢ خەڵکی داخ لـە دڵی فەرەنسە ڕژێمی پاشایەتی‌یان ڕوخاند • دەستی شۆڕشگێڕان گەیشتە قاسـە قایمـەکانی کۆشکی ڤێرسای‌و گشت بەڵگە نهێنی‌یەکانی پاشایان خوێندەوە• یەکێک لەو بەڵگانە هەموانی حەپەساند • تومەس لویسی شازدە توانیویتی لەڕێگەوە میرابۆ بکڕێت• لە نیسانی ساڵی ١٧٩٠وە میرابۆ بۆتە یەکێك لە کرێ‌گرتەکانی لویس بەرامبەر بەڵێنی دانەوەی قەرزەکانی‌و پادداشتی چـەوری‌تر •• کـە دانیشتوانی پاریس بەمەیان زانی دیسـان دەیان‌هەزاریان ڕوویان‌کـردەوە « پانتیۆن »و بە ئەوپەڕی ڕقەوە گۆڕی میرابۆیان هەڵتەکاندو پاشـاوەی لاشەکەیان هەر لەوێدا سووتاندو سووتووەکەیان بردە گۆڕسـتـانی دزو جەردەو خۆفرۆشان لەسان‌مارسۆی نزیك پاریس •

ئەو میرابۆیەی سەرتاپای گەلێکی خەڵەتاند[١٢] تالێرانی هـاوتەمەنو بیری لووس‌و باریك فریوی‌دا • «زۆلە، چاوبرسی‌یە ، پیلانگێڕێکی نزمە•• پارە پەرستە ، لەتاو پارە شەرەف‌و هاوڕێی خۆی فرۆشت ، هەر بۆ پارەش ئامادەیە گیانی بخاتە بازاڕەوە •• » • ئەمە پیاهەڵدانی میرابۆیە بەسـەر تالێراندا[١٣] • جا ئاخۆ کێ بێت فیرعەون پێی بڵێت زالم !•

با یەکسەر بچینە ناو باسەوە • «بـاوکی درۆ» یەکێکە لـە تازەترە زۆرەکانی شارل مۆریس تالێران (١٧٥٧ ــ ١٨٣٦) • «بەر لە هەموو شتێك هەڵێ «بەرلـە هەموو شتێك هەژار نەبیت» ــ ئـەمیشیان یەکێکە لـە قـە زۆرەکانی • « چ‌دەسەڵات‌و چ‌ئافرەت لە هەر شت زیاتر بۆ پێکەوەنانی سامان پێویستن» • «پارە ، پارە ، هەر ئەمیانت هەبێت کار نی‌یە مەیسەر نەبێت بە

---

١٢ــ تەنها ڕۆبسپیرو ماراو هاوڕێ چەپڕەوەکانیان بۆنی شتێکیان کردبوو بەڵام ئافەرین بۆ میرابۆ کە توانی خۆی لە دەستیان قوتاربکات .

١٣ــ ساڵی ١٧٨٧ ، واتـە دوو ساڵ بەر لە شـۆڕش میرابۆ ئـەم قـسەیەی کردووە .

«ئەوی ئەیۆ بوو بیخەرە ژێردەستی خۆتو بیچەوسێنەوە،زیرەكو بەهێزیش
ی كێنە ، بەڵام قەت لەبیرت نەچێت ، گەر لەوان وریاتری ، هەموویان بكەیتە
ژێردەستی خۆت . هەمیشە لەگەڵ ڕاوكەر بە نەك نێچیر ، قێزت لە ژێركەوتوو
بێتو كڕنووش بۆ سەركەوتوو بەرە » .

تالێران قسەو ڕاوێژی تری لەمبابەتانەی یەكجار زۆرە . لەبەرئەوە هیچ
سەیر نی یە بۆ خۆی دەڵێت چوارده سوێندی دڵسۆزیی درۆم خواردووە .
مێژوونووس دەربارەی تالێران نووسیویە دەڵێت « ڕۆژ نەبوو بەرتیل
لە میرو فەرمانڕەوا گەورەو پچوكە زۆرەكانی ئەڵەمانیاو شوێنی تر ، لە خاوەن
ئەو كاردیناڵەكان ، لە بەڵێندەرو سەرۆكەكان وەرنەگرێت .. لە بازاڕی
ئاڵوگۆڕدا سەرەتا كڵێسەی كاتۆلیكیی گۆڕی یەوە بە شۆڕش ،
ئیجا شۆڕشی گۆڕی یەوە بە ناپلیۆن و دوای ئەوە ناپلیۆنی گۆڕی یەوە بە
بنەماڵەی بۆربۆن و كۆتاش بەر لە مردن ئەمانی گۆڕی یەوە بە بنەماڵەی
ئۆرلیان ... » .

با كەمێك قسەكانی تارلێ ڕوون بكەینەوە . تالێران سەرەتا كاربەدەستی
كڵێسە بوو ، هەر لە ڕێگەی ئەویشەوە بۆوە ئەندامی ئەنجومەنی نیشتمانی .
كەچی كە ئاگری شۆڕش هەڵگیرسا تالێران یەكەم كەس بوو داوای
كەمكردنەوەی دەسەڵاتی كڵێسەو دابەش كردنی زەوی‌وزاری فراوانی كرد ، ئەو
كارەی پاپای لێ ڕەنجاندو دڵی شۆڕشگێڕانی بۆ ڕاكێشا . كە شۆڕش
گلۆلەی كەوتە لێژی‌و ناپلیۆن بووە تاكە فەرمانڕەوا تالێران بووە ڕاوێژكەری
نزیكو وەزیری بەدەسەڵاتی ئیمپراتۆر ، كە خۆری ناپلیۆن بەرەو ئاوابوون
ڕۆشت دەستی خستە ناو دەستی بنەماڵەی بۆربۆنی پاشایانی سەردەمی پێش
شۆڕش ، كە تەختی ئەمانیش جارێكی تر لێژ بوو تالێران بووە پیاوی بنەماڵەی
ئۆرلیان كە جێگەی بۆربۆنی گرتەوە ، دوای ئەوەش ئیتر مەرگ مۆڵەتی نەدا
كەس بە كەس بفرۆشێتەوە .

ئەمانە کاری لەڕووی تالیران بوون • لە ژێریشەوە پەتی پێوەندیی لەگەل لویسی شازدە ئەپچڕی ئەبا شۆڕش ژێربکەوێت ، کە لە ڕۆژانی سەرکەوتە هەرەگەورەکانی ناپلیۆندا بۆنی ژێرکەوتنی کرد بە نهێنی پێوەندیی لەگەڵ ئەسکەندەری چاری ڕووسیاو میتەرنیخی سەرەك وەزیرانی ئەمسادا بەست[14] کە هەردووکیان بە خوێنی سەری ناپلیۆنی ئاغای تینو بوون • کە هەستی‌کرد لویسی هەژدە بۆ ئەو تەختی پاشایی‌یەی خۆی پێشکەشی‌کرد دەست نادات کەوتە پشی پشی بۆ بنەماڵەی ئۆرلیان • لەبەرئەوە هیچ سەیر نی‌یە تالیران کاربەدەستی گەورەی کلێسەو ئەندامی پەرلەمانو وەزیری شۆڕش‌و وەزیرو ڕاوێژکاری ناپلیۆنو سەرۆکی دوو حکومەتی مووەقەتی دوای ناپلیۆن بوو، ئەو ڕژێمو دەزگایانەی دوژمنی باوەکوشتەی یەك بوون• دوای ئەوە تالیران بە ئارەزووی خۆی بۆ ماوەیەك دەستی لە کاری میری هەلگرتو کەوتە نووسینەوەی یادداشتەکانی • دیارە یادداشتی پیاوێکی وا لەبن‌نایەت ، پێنج بەرگی گەورەی پڕکردۆتەوە •

ئەمەش لیستەی بەشێکە لەوبەرتیلە گەورانەی تالیران وەری‌گرتوون• پتر لە دوو ملیۆن فرەنکی زێڕی لە ئەمەریکایی‌یەکان وەرگرت بەرامبەر بەوەی فەرەنسە لویزیانای خۆیانی پێ فرۆشتنەوە • لە سالی ١٧٩٧وە تا سالی ١٧٩٩ ، وا تە لە ماوەی دوو سالدا ئەو بەرتیلانەی تالیران وەری‌گرتن بەسەر یەکەوە خۆیان دا لە سیازدە ملیۆنو ٦٥٠ هەزار فرەنکی زێڕ • تالیران سالی ١٨٠١ تەنها لە نەمسا ١٥ ملیۆن فرەنکی زێڕی وەرگرت • کە دوای کەوتنی ناپلیۆن سالی ١٨١٤ کۆنگرەی ڤیەنا بەسترا تالیران سەرۆکی وەفدی فەرەنسەی بەزێنراو بوو ، کەچی بە ئارەزووی خۆی تەختو بەختی دەبەخشی • سێ ملیۆن فرەنکی زێڕی تەنها لە پاشای سەکسۆنیا سەنە

---

١٤ــ سالی ١٨٠٨ لەگەل ئەسکەندەرو دوای ئەو بە ماوەیەکی کەم لەگەڵ میتەرنیخ ڕێك‌کەوت •

ـه سەر بەوەی کارێکی وا بکات کەس توخنی تەختی پاشــــایەتی ئـەو ـەگەڕێت • ئەو پارەیەی زێڕ نەبوایە تالیران دەســـــتی بۆ نەدەگـرتەوە • ـتـی بەرتیلەکانی تالیران لەوەدا زیاتر خۆ دەنوێنێت گەر هێزی پارەی ئەو ـێ گرە بێنینەوە یاد خۆمان ، ئەو کاتەی فرەنکێك لە سەد فرەنکی ئیــستە کەمتر نەبوو •

لەگەڵ هەموو ئەوانەی باسمان کردن ئینجا تالیران کەمی بۆ فەرەنســە ـەکرد ، تایبەت لەو ڕۆژگارە تاریکەی لەگەڵ ڕوخانی ناپلیۆندا دووچاری ـەت • کاتێك هەموو دەولەتە گەورەکانی ئـەوروپا لە کۆنگرەی قیــەنا ـەیانویست داخی زۆری شۆڕش و ناپلیۆن بە فەرەنسە بڕێژن • کەچی تالیران ـە زیرەکی و پەتپەتێن توانی کارێکی ئەوتۆ بکات پاشایانی ئەوروپا زۆر لەوە کەمتر بکەن کە نیازیان بوو ، هەمووی چەند ساڵێکی نەبرد فەرەنسە چۆوە ـڕی پێشەوەی دەوڵەتە گەورەکانی جیهان • ئەم کارە بایەخدارەی تالیران ـووە یەکێك لە دەرسەکانی دیپلۆماسیەتی دەولەتان • کار گەیشت بـەوەی ـڕادیکالیەکانی فەرەنسە لەگەڵ هەلگیرسانی ئاگری شەڕی دووەمی جیهاندا ـێ بەدەم هاوار بکەن « ئەرێ شەرم نیە بۆ جۆرج بۆنییە[١٥] کە لە جێگەی تالیرانی گەورە دانیشتووە هیتلەر وا سووك و باریك خەڵەتاندی ؟ » •

هەرچــەندە تالیران بۆ خۆی زۆر گوێڕایەڵی ڕای گشتی و بڕیاری دوارۆژ نەبوو ، بەڵام مێژوو ئەوی لەسەری یەو ئەوی لەگەڵی یە بۆی تۆمار کردووە • تەنانەت زوبانی فەرەنسیش زنجیرەیەك قـەی بەپێـزو توانجی ـاندداری بۆ پاراستووە کە لەسەر زاری خەڵك بوونەتە پەندی پێشنیان • با ئەومش بلێم کە ژینامەی تالیران تا ڕادەیەکی زۆر ژینامەی نوری سەعیدمان

---

١٥ــ جۆرج بۆنییە وەزیری هەندەرانی فەرەنســە بوو لە وەزارەتی ئــەدوارد دالادییدا کە بەر لە شـەڕی دووەمی جیهان ئاشکرا ، بەڵام بێ سوود ، پشـی پشتی بۆ هیتلەر دەکرد .

له بەرگێکی ڕۆژهەڵاتیدا دێنێتەوە یاد . تەنها ئەوەندە هەیە نوری سەعید وەك تالێران پەرۆشی پارە نەبوو ، تالێرانیش وەك نوری سەعید پەرۆشی دەسەڵات و کورسیی وەزارەت نەبوو .

هەر لەم باسەدا دەتوانین کەمێکیش نزیك خۆمان بکەوینەوە . ئەوی تۆماری لێکۆڵینەوەو وتووێژەکانی ئەنجومەنی نوێنەرانی سەردەمی پاشایەتی[16] لە ساڵەکانی ئینتیدابدا دەخوێنێتەوە سڵاوی ڕێز بۆ ژمارەیەکی زۆر کەم ، تایبەت عەلی کەمال،و تفی لەعنەتی بۆ ژمارەیەکی زۆر زۆر لە نوێنەرانی کورد لەو ئەنجومەنەدا دەنێرێت ، ئەوانەی خۆڵی مردووی بەسەردا کرابوو ، نە دەنگیان هەبوو نە ڕەنگ . وادیارە ئەو نوێنەرانە ئەرکی خۆیان لە دوو شتدا دەبینی : وەرگرتنی مووچەی مانگانەو مۆرکردنی هەموو ئەو پەیمان و یاساو بڕیارانەی زیاتر وڵاتیان بە ئینگلیزەوە دەبەستەوە بەجارێك مافی گەلیان پێشێل دەکرد .

● مێژوونووس چەند دەتوانێت زیاتر دەبێت لە نووسین و نرخاندنەکانیدا بێلایەن بێت بۆئەوەی ڕاستی بۆ خۆی چۆنە وەها بیپێکێت ، یا بە لای کەمەوە چەند دەتوانێت هێند لە ڕاستی نزیك بکەوێتەوە . لایەنگری مێژوونووس بە هەزار پەردەی ئەستوورو ڕازاوە ناشاردرێتەوە ، ئەم لایەنگرییە زیانی هەیە قازانجی نییە . ڕاستە مێژوونووسیش ئادەمیزادە . لە هەستی نیشتمانی و نەتەوەیی و ئایینی و تەنانەت ناوچەییش بێبەش نییە و ناتوانێت بەجارێك خۆی لە داویان قوتار بکات ، بەڵام بۆی هەیە لەپێناویاندا ڕاستی پێشێل نەکات ، کە کردی ڕەنجی بەفیڕۆ دەچێت . مێژوو پڕییە لە بەڵگەی سەلمێنەری ئەم قسەیە .

---

16ــ مەبەستم « محاضر مجلس النواب »ە کە هەر ساڵەی بەرگێکی لێ چاپ دەکرا .

کس لاری له گەورەیی شاعیرو نووسـەری ئەڵەمانیی بەناوبانگ ستیفان زیڤایغ ( ۱۸۸۱ ــ ۱۹٤۲ ) نی یە . نووسینەکانی دەربارەی ژیاننامەی ژمارەیەك ناوداری مێژوو ( ئێرازمۆس‌و ماجەلان‌و ڕۆمان ڕۆلان‌و چەندجۆرە کەسانە) ناویان له مەیدانی ئەدەب‌و مێژوودا گەیاندە پایەیەکی بلند. لە ساڵی ۱۹۳۲ زیڤایغ « ماری ئەنتوانێت »ی بڵاوکردەوە کـە یەکسەر وەرگێڕدرایە سەر چەند زمانێکی‌تر .

به ئەوپەڕی داخەوە ستیفان زیڤایغ لەم بەرهەمەیدا سەری کردووە ، هەموو ڕقی کۆنەپەرستانی ئەڵەمانیاو نەمسە بەرامبەر شـۆڕشی گەورەی فەرەنسەی بۆ خستوینەتە چوارچێوەیەکی ڕازاوەی ئەوتۆوە که بۆی هەیه کار بکاتە سەر بیروڕای بێ‌خەبەران بەرامبەر یەکێك لـە ڕوداوە هـەرە گەورەکانی مێژووی ئادەمیزاد . بێ‌گومان نابێت چـارەنووسی تراجیدیایی شاژنی فەرەنسەو شازادەی نەمسە دیوی ئـەودیوی تەنراوی ژیـانی بەربەرنەوە.ڕاستە بەرەبەیانی ڕۆژی شازدەی تەشرینی یەکەمی ساڵی ۱۷۹۳ سەری ماری ئەنتوانێتی ناسکۆلە بە دەستی دێوزمەیەك پەڕێنرا ، خۆزگا وا نەبوایە ، بەڵام ڕاستیشە گەر یەکێك له پیلانە زۆرەکانی مـاری ئەنتوانێت سەری بگرتایە لەوانەبوو هەزاران ئافرەت بێوەژن‌و زاڕۆڵە هەتیو بن . هەر ئەو ماری ئەنتوانێتە لە ژیانیدا بە ئەوپەڕی فیزو لووت‌بەرزی‌یەوە دەیڕوانی‌یە ملیۆنەها کەسی فەرەنسەو ئەورووپا کە بێ‌گومان هیی وایان تێدابوو زۆر لەو قەشەنگ‌و شۆخ‌و ژیرو وریاتر بوو . قوڕەی سکی دەیان هـەزار منداڵی زەردو سوور ڕۆژێك له ڕۆژان هەستی شاژنی نەبزواند ، وای‌لێ‌نـەکرد بۆ ژیانی هیچ کامێکیان دەست له جوتێك پێڵاوی گرانبەهای خۆی هەڵبگرێت!، هەرچەندە بیست‌و سێ ساڵی ڕەبەق بە ئارەزووی خۆی یاریی بـە پارەی دەوڵەت دەکرد بێ‌ئەوەی کەسێك زات بکات بڵێت لەل ، تایەت دوای ئەوەی دوو وەزیری لێهاتووی ئەو ڕۆژگارەی فەرەنسە ( تیۆرگۆو نێکەر ) لەسەر

لەلێکی وا لە کار دوور خرانەوە . هەر کە شۆڕش سەرکەوتو پاشایانی ئەوروپا لە هەموو لاوە لە ترسی دوارۆژی خۆیان کەوتنە پەلاماردانی فەرەنسە ماری ئەنتوانێت یەکسەر لە ژێرەوە دەستی لەگەڵ دوژمن تێکەڵ کردو پەیتا پەیتا پلانو نەخشە نهێنییەکانی لەشکری شۆڕشی پێ دەگەیاند

نمونەیەکیتر . مێژوونووسی ئیتالیایی وا هەن دۆزینەوەی ئەمەریکا دەکەنە بەرهەمی ئیتالیاییەکان تەنها لەبەرئەوەی کریستۆف کۆلۆمبس خەڵکی شاری جەنەوە بوو . بەرامبەر بەوان مێژوونووسی ئیسپانیاییوا هەن چەند بتوانن هێند لە دەوری کۆلۆمبس کەمدەکەنەوەو لە سەنگی یاریدەرەکانی کە زوربەیان ئیسپانیایی بوون ، زۆر دەکەن . بەڵام نە ئەویان لە نرخیکۆلۆمبس زیادو نە ئەمیان لێی کەمدەکاتەوە .

با لێرەشدا نمونەیەکی نزیك خۆمان بهێنینەوە . زوربەی مێژوونووسو رۆژهەڵاتناسو گەڕیدە ئەوروپاییەکانی کۆتای سەدەی نۆزدەو سەرەتای سەدەی بیست کە هاتونەتە سەر باسی کوردو کوردستان هەریەکەیان بەجۆرێك پەنجەیان بۆ بەشداریی کورد لە کوشتارەکانی ئەرمەندا ڕاکێشاوەو بەشی هەرە زۆریان بە چاوی رەخنەوە سەیری ئەو هەڵوەستەیان کردووە . هیوایان هەیە بێسێو دوو کوردیان خستۆتە ڕیزی درندەو کێوی . کە چووم بۆ خوێندن ئەم باسە بووە کێچو کەوتە کەولم . منیش کەوتمە دووی هەواڵەکانی . ئەنجامی ئەو ڕەنجە بەشی پێنجەمی کتێبی « کوردستان لە سالەکانی شەڕی یەکەمی جیهاندا » بوو کە بە ناوی « کوردو کوشتاری ئەرمەن »ەوە بلاوم کردەوە[17] . تەقەللایەکی زۆرم دا بۆ ئەوەی چەند بتوانم هێند وەك بێلایەنێك ئەو داستانە یەکالا بکەمەوە ، ئەو کارەی ، وابزانم . گەیاندمییە چەند ئەنجامێکی دروست :

---

١٧ـ لە وەرگێرانی عەرەبیی کتێبەکەدا ناوی ئەو بەشەم کردە « کوردو خوێنی رژێنراوی ئەرمەن » .

١ ــ بەداخەوە بەشێك لە كورد ، نەك گەلی كورد ، تێكەڵ بە كوشتاری ئەرمەن بوون ، دەستیان بە خوێنی منداڵو ئافرەتی بێتاوانی ئــەرمەن ڕەش بوو •

٢ ــ كوشتاری ئەرمەن ئەنجامی هەستی ئایینی كوێرانەی كورد نەبوو، وەكو بەرهەمی پیلانێكی ڕێكخراوی تاقمێك فەرمانڕەوای شۆڤێنی عوسمانی بوو كە توانییان بەشێك لە كورد بكەنە یەكێك ، بەڵێ تەنهــا یەكێك لــە دەستە نەزانەكانیان •

٣ ــ زوربەی گەلی كورد بێلایەن وەستان ، بەڵام زۆربشیان دەســتی یارمەتی برایانەیان بۆ لێقەوماوانی ئەرمەن درێژ كرد •

ئەم ئەنجامانەم بە پشتیوانی گەلێك بەڵگەو ســەرچاوەی مێژوویی ئەرمەنو دەگمەن ڕوونكردەوە كە پێموایە پاكانەیەكی زانستییە بۆ ئــەو لاپەرەیەی مێژووی نوێی كورد •

كەچی بــە لای ژمارەیەك برادەرەوە ، با ئەوەش بڵێم هــەموویان بێمەبەســت نەبوون ، نەدەبوو من بــە هیچ كلۆجێك توخنی باســی بەشداریكردنی كورد لە كوشتاری ئەرمەندا بكەوم • بەڵام ئەو بەشــەی كتێبەكەم لە هەموو بەشەكانیتری زیاتر ســەرنجی خوێندەواری كوردو شارەزایانی دەرەوەی ڕاكێشا • لەم بارەیەوە تەنها دوا ڕاســتی دەخەمە بەرچاو • « كوردو كوشتاری ئەرمەن » سەرنجی كاك سیامەند عوسمانی قوتابیی بەشی دوكتورای لە پاریس وا ڕاكێشا بیكاتە باسی نامەی ( D. E. A.) كە بەرامبەر ماجستێری لای خۆمانە • كاك سیامەند لەو نامەیەیدا كــە بــە فەرەنسی ١٥٣ لاپــەڕەیە ، دەیان بەڵگەی گرنگی ئارشــیڤەكانی پاریسو لەندەنی هێناوەتەوەو لە لێدوانەكانیدا زۆر ڕاستییتری دەربارەی هەمان باس ڕوونكردۆتەوە كە بێگومان خزمەتێكی بایەخــدارە بۆ مێژووی كورد •

بێلایەنیی لێکدانەوەی مێژوویی بووە بەردی بناغەی وەدی هێنـــانی ئـەو ئەنجامانە کە وابزانم دەچنە خانەی دەسکەوتەوە .

● مێژوو زانستێکی وشك‌و برنگ نییە ، بەرهەمەکانی وەك ئەدەب بۆ هەموانە نەك بۆ شارەزایان بەتەنها.لەبەر ئەوە پێویستە شێوازی نووسینەوەی ڕوداوەکانی ڕەوان‌و دلگیر ، ئاودارو نازدار بێت تاوەکو بەئاسانی بڕژێتە نێو هەست‌و دەروونی خوێنەرەوە . بۆ ڕازاندنەوەی بەرهەمەکانی مێژوونووس بەئاسانی دەتوانێت پەنا بەرێتە بەر شیعرو ئەدەب‌و داستان‌و ئەفسانەو پەندی پێشنیان‌و قسەی نەستەقی باوو باپیران‌و گاڵتەوگەپ‌و فولکلۆرو بەسەرهاتی دانسقەو خۆش‌و ناخۆشی کۆمەڵانی خەڵك .

بڕوا ناکەم لە ئەوروپا کەسێك هەبێت بە لای کەمەوە کورتەی ژینامەی لویسی چواردەی پاشای فەرەنسە نەزانێت ، ئاگاداری شەڕە زۆرەکانی دەسەڵاتی بێهاوتای نەبێت . « خۆم دەولەت‌و دەولەت خۆمم » ، « لەسەر زەمین پاشا سێبەری خواوەندە » ، ئەمانە نمونەی ئەو قسانەی لویسن کە زوو زوو دەیدانەوە بەگوێی وەزیرو ڕاوێژکارو قەشەو کاردینال‌و کاربەدەستە گەورەکانی فەرەنسەدا کە هەموویانی کردبوونە داشی دامە .

مێژوونووس‌و مامۆستای مێژوو دەتوانن گـەلێك هەواڵی ســەیری تێکهەڵکێشی سەرگوزەشتەی ژیانی سیاسیی فەرەنسەی سەردەمی لویسی چواردە بکەن‌و لەو ڕێگەوە هەستی خوێنەرو گوێگر زیاتر ڕابکێشن. لێرەدا چەند نمونەیەکی کەم دەخەمە بەر چاو کە گێڕانەوەیان بێسوود نییە .

١ ــ لە مێژوودا ڕۆژگاری پاشایەتی کەس بەقەدەر هی لویسی چواردە درێژ نەبووە . لویس ٧٢ ساڵی ڕەبەق پاشایەتیی کرد . کوڕو کوڕەزاکانی هەموویان بە داخی تەختی پاشایییەوە سەریان نایەوە . کـــە ڕۆژی یەکی ئەیلولی ساڵی ١٧١٥ لویسی چواردە گیانی بە خاك سپارد نزیکترین کەســی یەکێك لە کوڕەزازاکانی بوو کە بە ناوی لویسی پازدەوە جێگەی گرتەوە .

• ـ سەرتاپای ئاغاو میرانی فەرەنسە بوبونە پیاوی عەلقـــە لەگوێی ...ـ . خوا خوایان بوو دڵی پاشا گەردی لێ نەنیشێت • هیوایان هەبوو ... دەهاتە کۆشك تەنها بۆئەوەی کە پاشا لە ژووری نووستن هاتەدەر ... هەڵگرتنی سوچێك لە ڕۆبەکەی سەرشانی بێت • لەگەڵ ئـەو ...نەکەنین ، لەگەڵ ئەو مۆن دەبوون . شەرمیان نەکردایە لەگەڵی نەخۆشیش ...کەوتن • ئەو ڕۆژەی لویس بچوایە کڵێسە هەموو دەکەوتنە زیکرو تەهلیلە! • ... بە « پاشای خۆر » یا « پاشای بزورگ » ناویان دەبرد • هەموویان لـە ...کردنو نانخواردنو ڕاوو شکارو بلیاردو جلو بەرگیاندا لاسایی ئەوو خۆشەویستەکانی ئەویان دەکردەوە •

لویسی چواردە بۆ خۆی بڕیاری مۆدەی پۆشاکی گەورە پیاوو ژنانی ...دا • شەوێکیان لە کۆشکی پاشا ئاهەنگ دەبێت ، هۆڵ جمەی دێت،هەموو ...بەڕۆشەوە چاوەڕوانی تەشریف هێنانی « پاشای خۆر » دەکەن . دەیانەوێت ...ن چیی لەبەردایە • ئەوکاتەی دەبوو لویس لە بەشی خێزانی کۆشکەوە ...و باخێکدا بێتە هۆڵی ئاهەنگ دادەکاتە باران • مەراییکەران دەکەونە ...لەکەسبما نەبا خوانەکردە خاوەن شکۆ نێك بارانی بەرکەوێت • یەکێك ...لاماری چەتر دەدات‌و یەکێك خاولی‌و یەکێك گوڵاو ، ژمـارەیەکیشیان ...پانتۆلەکەی بە ڕێکی بۆ هەڵدەکەن • کە دەگەنەجێ ئەوانەی پانتۆلەکەیان بۆ هەڵکرد بیریان دەچێت یا شەرم دەیانگرێت لە بەرچاوی ئەو عەشاماتە دیسان داکەوێنەوەو وەك خۆی بۆ لێبکەنەوە • دانیشتوان دەکەونە مقۆ مقۆ ، بـە ...نی « دوا مۆدەی » پانتۆلی « پاشای بزورگ » پەسند دەکەن • بۆ ڕۆژی داهاتو هەریەکەیان ڕوو دەکاتە بەرگدرووی خۆی تا دەستوبرد پانتۆلێکی ...راغداری وەك پانتۆلەکەی دوێ شەوی لویسی بۆ ببڕێت ، ئەو مۆدەیەی ...ـێتەر بە هەموو زەبرو زەنگی خۆیەوە بۆی لەناونەبرا •

به هه‌مان ده‌ستوور له سه‌رده‌می لویسی چوارده‌دا پێڵاوی پاژنه‌به‌رز داهات ٠ یه‌کێك له یاره خۆشه‌ویسته‌کانی لویس له‌گه‌ڵ مانگی چوارده شه‌ڕی ده‌کرد ٠ ته‌نها بالاّی نه‌یده‌هێنا ٠ له‌پڕ بالاّی یار « گه‌زێك » درێژ بوو ٠ تومه‌سی لێپرسراوانی مۆده‌ی کۆشك جوتێك پێڵاوی پاژنه‌به‌رزیان بۆ دروستکردووه‌ ئه‌وساش کراسی ئاوداماں مۆده بوو ، ئافره‌تانی کۆمه‌ڵ دیقیانکرد تا هۆی درێژبوونی یاری پاشایان زانی‌و ده‌ستوبرد وه‌ك ئه‌و شتێکیان خسته سه‌ر بالاّیان‌و به‌وجۆره پێڵاوی پاژنه‌عانه‌یان کرده یه‌کێك له مۆده نه‌مره‌کانی ژنان

٣ ــ له‌گه‌ڵ باسی لویسی چوارده‌دا مێژوونووس‌و مامۆستای مێژوو ده‌توانن بێنه سه‌ر باسی لوڤه‌ر که ئیمڕۆکه یه‌کێکه له موزه‌خانه هه‌ره به‌ناوبانگه‌کانی جیهان ٠ ئه‌وی بچێته پاریس‌و لوڤه‌ر نه‌بینێت خوێنده‌وار نیه‌

لوڤه‌ر یه‌کێك بوو له کۆشکه ڕازاوه‌کانی پاشایانی فه‌ره‌نسه ، کۆتایی سه‌ده‌ی چوارده له سه‌رده‌می فه‌رمانڕه‌وایی شارلی پێنجه‌مدا دروستکراوه ٠ لویسی چوارده زۆری خسته سه‌ر کۆشکی لوڤه‌رو هه‌ر ئه‌ویش دوای ئه‌وه‌ی باره‌گای پاشایی گواسته‌وه کۆشکی ڤێرسای لوڤه‌ری کرده عه‌مباری هه‌ڵگرتنی کۆنینه به‌نرخه‌کانی پاشایانی فه‌ره‌نسه ٠ سێ ساڵ دوای سه‌رکه‌وتنی شۆڕش لوڤه‌ر کرایه موزه‌خانه‌ی میللی‌و له ڕۆژی ٨ی ته‌شرینی دووه‌می ساڵی ١٧٩٣وه ده‌رگای بۆ ته‌ماشاکه‌ران کرایه‌وه ٠

لوڤه‌ر له ٦ به‌شی سه‌ره‌کی پێکهاتووه : هونه‌ری کۆن‌و میسری کۆن‌و ڕۆژهه‌ڵاتی کۆن‌و به‌شی په‌یکه‌رو کۆته‌ڵ‌و به‌شی تابلۆو نیگارو به‌شی هونه‌ری ڕاهێنان[١٨] ٠ سامانی هیچ‌کامێك له‌م به‌شانه‌ی لوڤه‌ر له نرخاندن نایه‌ت ٠ مومیاکانی لوڤه‌ر بێ‌وێنه‌ن ٠ مه‌گه‌ر ته‌نها موزه‌خانه‌ی به‌ریتانیا شان له شانی به‌شی ڕۆژهه‌ڵاتی کۆنی لوڤه‌ر بدات که کۆنینه ئاشووری‌و فینیقیه‌کانی

---

١٨ــ الفن التطبيقي ٠

ﻪ‌ڕستی کەمهاوتان . کۆتای شـــەستەکان بەتەنها ژمـــارەی نیگارو پەیکەرەکانی لوڤەر خۆی دەدا لە ٢٠ هەزار دانە کە زوربەیان شابەرهەمی ـگەنی هونەرمەندە هەرە بەناوبانگەکانی جیهانن . وابزانم لێرەدا ئەوەندە مە بڵێیت پەیکەری ئەفرۆدیتی گریکەکانو پەیکەری کۆیلەکانی میخائیل ـنجیلۆ ( میکلانجیلۆ )و تابلۆی مۆنالیزای لیۆنـــاردو دافنیشـــی ھۆڵەکانی لوڤەر دەڕازێننەوە . گەر بتەوێت بە وردی هەموو بەشـــەکانی وڤەر ببینیت دەبێت بە لای کەمەوە سێ ڕۆژی ژیانی پاریستی بۆ تەرخـــان بکەیت ، ئەوەی هێشتاکە لە ئێمەوە دوورە .

٤ ــ هەر ئەو کاتەی خاوەن کۆشكو تەلارەکان خۆیان بـــە دەوری ـەری لویسی چواردەدا دەگێڕا هەزارانی فەرەنسە ســـەرو فەســـالیان کردبووە شەوچەرەی گوێ ئاگردانەکانیان ، هەر ڕۆژەی ناوو ناتۆرەیەکی پڕ بەپێستی خۆیان بۆ دادەنا ، گاڵتەیان بە تڕو فیزی دەکرد ، نوکتەو قسەی خۆشیان بۆ دروستدەکردو یەك بۆ یەکیـــان دەگێڕاوە . لویس بیووە گاڵتەجاڕی پەخشە نهێنیەیە چاپکراوەکانی ئەو ڕۆژگارە کە دەستاودەست دەگەیشتنە قوژبنـــە هەرە کەلاو دوورەکانی وڵات . هەموو هەڕەشـــەو گوڕەشەو جەورو ستەمی دەستو پێوەندی لویس نەیانتوانی ســـەر بە گەل شۆڕ بکەن . فەرەنسەی سەردەمی « پاشای ڕۆژ » گـــەلێك ڕاپەڕینی شۆڕشگێڕانەی بەهێزی بەخۆیەوە بینی . کونە مشکەکانی ناوچـــەی لانگیدۆك لە پیاوانی پاشا ببونە قەیسەری .

کەی مێژوونوس یا مامۆستای مێژوو هاتە سەر باسی ژیانو کرداری پاشایانی سەدە ناوەنجیەکانی ئینگیلتەرەی وەك هێنری پێنجـــەمو هێنری شەشەمو ڕیتشاردی دووەمو ڕیتشاردی سێیەمو زۆری‌تریان ، بەئاســـانی دەتوانێت پەنا بەرێتە بەر بەرهەمەکانی شکسپیری گەورەو وەســـتایانە ئەدەبو مێژوو تێکەڵ بە یەك بکات . وابزانم ئەو کارە بۆ خۆی دەبێت

یەکێك بێت لە ئەرکەکانی ئەوانەی لە مێژووی ئەو قۆناغە دەکۆڵنەوە ،
تایبەت گەر ئەوەش لە یاد نەکەین کە کەس وەك شکسپیر نەیتوانیوە لە
قوڵایی دەرونو دیوی نەبینراوی ناوەوەی قارەمانەکانی تێبگات •

ئەوانەی لە باسی ڕوداوەکانی فەرەنسەی نیوەی یەکەمی سەدەی
نۆزدە دەکۆڵنەوە دەتوانن کەڵکی زۆر لە بەرهەمەکانی بەلزاکی
چیرۆکنووسی ئەو قۆناغە وەربگرن کە زۆر هونەرمەندانە وێنەی ژیانی
کۆمەڵایەتیی ئەوسای فەرەنسەی بۆکێشاوین • کەس وەك ئەلیکسێی ، نەك
لێف ، تۆلستۆی باسی پەتروسی یەکەمی چاری ناوداری ڕووسیای
نەکردووە • تۆلستۆی لە ڕۆمانێکی سێ بەرگیی گەورەدا هەموو
ڕووەگرنگەکانی ژیانی ڕووسیای کۆتای سەدەی حەڤدەو سەرەتای
سەدەی هەژدەی بۆ تۆمار کردوین •

کەواتە دەتوانینو پێویستە مێژوو لە بەرگێکی قەشەنگو ڕازاوەی
دڵگیردا پێشکەش بە خوێنەر بکەین • دەبێت مێژوونووس ئەو ڕاستیە
لەیادنەکات کە زۆر دەمێکە مێژوو سەرنجی ڕووناکبیرە هەرە گەورەکانی
جیهانی ڕاکێشاوە • بەسەرهاتی ڕابوردوو یا شانازیی ڕۆژگار بوونەتە
هەوێنی بەرهەمی زوربەیان • چیرۆکنووسو نیگارکێشو کۆڵەرەوەو شاعیرو
مۆسیقارو نووسەران هەمیشە عەودالی ڕوداویمێژوویی گرنگی
سەردەمی خۆیانو بەر لە خۆیان بوونو بەپێی هەستو نەستی کۆمەڵانی
خەڵك خستویانەتە چوارچێوەی ڕازاوەی هونەرەوە • سپارتاكو
ئەسکەندەرو جاندارکو پاشایانی وڵاتانو کوڕە ئازای گەلانو زەبروزەنگی
زۆردارانو دووربینی دانایانو خۆشەویستیو ڕقو کینەی کۆمەڵانی خەڵكو
بەسەرهاتی کوشندەی شەڕە گەورەکانی مێژوو لە دێرزمانەوە چوونەتە ناو
کتێبو تابلۆوەو هاتونەتە سەر شانۆ • بەرهەمە نازدارەکانی هۆمیرۆسو

...و دلفنشی‌و میکلا ئەنجیلۆو هەردووك تۆلستۆی‌و دی‌لاکروا[19]و
هە... ئەنتیکـەندەر دوماو ریود[20]و سەدان لێهاتووی‌تر هەریەکەیان بە
... گوازێك سەرگوزەشتەو داستانی ڕابوردوو بۆ نەوەی ئیمڕۆو
... دەگێڕنەوەو پەندی بەرزی ژیانیان بۆ لێك دەدەنەوە . ئەو جۆرە
...ە لەلایەکەوە گرنگی‌و بایەخی مێژوو دەردەخەن‌و لە لایەکی‌تریشەوە
... خۆیان دەستدەدەن بینە سەرچاوەی لێکۆڵینەوەو ڕوون‌کردنەوەی
...ەکانی مێژوو .

ئەمەی تائیستە باسمان کردن لایەکن لە زانستی مێژوو کە بۆ خۆی
...یەکی سەربەخۆی هەیە . بەهۆی ڕوون کردنەوەی ئەو مێژووەوە
...ین لەو ئاڵوگۆڕە زۆرانە بگەین کە بەسەر زانستی مێژوودا هاتوون
... گەیشتوتە ئەم بەرگەی ئیستەی .

---

١٩ـ تایبەت لە تابلۆی بەناوبانگی « ئازادی لەسەر سەنگەرەکان »دا کە ساڵی ١٨٣٠ دروستی‌کردووە ئیستە یەکێك لە سووچەکانی موزەخانەی لوڤر دەڕازێنێتەوە .

٢٠ـ تایبەت لە نەقشی بەناوبانگی « مارسیلێز »دا کە سێ ساڵی ڕەبەق بە هەڵکەندنی‌یەوە خەریك بوو ، « مارسیلێز » ئیستە یەکێك لە مەیدانەکانی پاریس دەڕازێنێتەوە .

# بەشی دووەم

# مێژووی مێژوو

لە سەرەتای بەشی یەکەمدا وتمان مێژوو وەك هەموو زانستەکانی‌تر مێژووی تایبەتیی خۆی هەیە کە لەگەڵ پەیدابوونی ئادەمیزادا دەست‌پێ‌دەکات ، بۆیەکا مێژووی مێژوو لە مێژووی گشت زانستەکانی‌تر دوورو درێژترە . لێرەدا هەوڵدەدەین بەکورتی‌و بەپێی قۆناغ ڕووە گرنگەکانی ئەو مێژووە بخەینە بەرچاو .

**سەرەتای مێژوو**

**ئێپۆس . گیلگامێش . ئەلیادەو ئۆدیسای هۆمیرۆس . ڕامایانەو مەهابەهاراتی هندۆسەکان . دۆزگەی ئەتلانتیس . گۆرانیی فۆلکلۆری . کۆنفۆشیۆس . نارام‌سین لە ئەرمداغ . هیرۆدۆت . ثوکیدیت . زەینەفۆن . پلوتارخ . دەوری ڕۆمانو چینییەکان .**

بەر لە دۆزینەوەی نووسین مێژوو بەهرەیەکی گشتیی زۆر ساکار بوو، بریتی بوو لە گێڕانەوەی پشتاوپشتی بەسەرهاتی ڕابوردوو لە شێوەی داستانو چیرۆکی کرچ‌وکاڵدا . هەموو گەلانی ئەوسای جیهان مێژوویەکی ساکاریان بۆ خۆیان لە بەرگی « ئێپۆس »[1] ، ئەفسانەو داستاندا دانا کە

---

١ ــ ئێپۆس "Epose" لە زوبانی گریکە کۆنەکاندا واتای وشە یا گێڕانەوە یا چیرۆك دەبەخشێت . ئێستە بۆ واتای « ادب روائي » یا « ادب ملحمي شعبي » بەکاردەهێنرێت .

پشتاوپشت بۆ نەوەی داهاتوو دەمانەوەو هەر ڕۆژەی خەیاڵی فراوانی ئادەمیزاد شتێکی نوێی دەخستنە سەر .

گیلگامێش یەکێکە لە ئێپۆسە هەرە کۆن و گرنگەکانی مێژوو کە دەوروبەری کۆتای سێیەم هەزار ــ سەرەتای دووەم هەزاری پێش عیسا . واتە نزیکەی چوار هەزار ساڵ لەمەوبەر بە زوبانی ئەکەدی ( بابلی ) بە شیعر نووسراوەتەوە.دیارە گیلگامێش زۆر بەر لەوە لەسەر زاری دانیشتوانی باشووری عیراق بووە .

ئەو داستانە باسی هاوڕێیەتی بەهێزی گیلگامێشی پاشای سۆمەری لەگەڵ پاڵەوانێکی نیمچە دڕندە بە ناوی ئێنکیدۆوە دەکات . دوای مردنی ئێنکیدۆ گیلگامێش دەکەوێتە دووی نهێنی ژیان ، شارەو شار ، کوناوکون بەدوای نەمریدا دەگەڕێت . لەوێدا گیلگامێش زۆر ڕووی ژیانی ئەو سەردەمەمان بۆ باس دەکات ، وەك خواو پەرستگەکان ، ژیانی کۆمەڵایەتی . پێوەندەی نێوان خەڵك ، شارو بیابانی ئەوساکەو گەلێك شتی تر کە نیگاری شارستانەتیی دێرینی عیراقیان گەیاندۆتە نەوەی ئێمڕۆکە . ئێپۆسی گیلگامێش بەناو حیسی و حۆری و گەلانی فەلەستینی کۆنیشدا بڵاوبۆتەوە.

یەکێك لە ئێپۆسە هەرە بەناوبانگەکان « ئیلیادە »یە کە بە بەرهەمی هۆمیرۆسی[2] شاعیری گریکی کۆن دادەنرێت . ئیلیادە ، کە وای دەچێت نزیکەی ۲۸۰۰ ــ ۲۹۰۰ ساڵ لەمەوبەر دانرابێت ، باسی بەسەرهاتەکانی

---

۲ ــ هۆمیرۆس بە شاعیرێکی کۆنی گریك دادەنرێت ، تائێستە نە ساڵی لەدایكبوونی و نە ساڵی مردنی و نە ژینامەی بەگشتی ساغ نەبوونەتەوە . قسەکانی هیرۆدۆتی و پلۆتارك دەربارەی هۆمیرۆس لە زۆر شتدا یەك ناگرنەوە. هی وا هەیە ژیانی هۆمیرۆس دەباتە دوازدە سەدەی پێش عیسا ، هی واش هەیە ۵۰۰ ساڵ لەوە نزیکتری دەخاتەوە . گەلێك زانا « ئەلیادە »و « ئۆدیسا » بە بەرهەمی هۆمیرۆس دادەنێن .

نوسالی شەڕی تەروادە دەکات کە دەوروبەری ٣٢٠٠ ســـاڵ لەمەوبەر نوسراوە ، واتە ئەوکاتەی لەشکری گریك بە سەرکردایەتیی ئاگامـەمنون گەمارۆی شاری تەروادەی ئاسیای پچووکی دا . زانایان گەلێك بەڵگەیان دۆزیوەتەوە کە بەشی زۆری ناوەرۆکی مێژوویی « ئەلیادە » دەسەلمێنن . سومی چەند سەدەیەك « ئەلیادە » دەماودەم دەکەوتەوە تا لە سەدەی چوارەم ی سێیەمی پێش عیسادا نووسرایەوە .

« ئۆدیسا »ش ئێپۆسێکی‌تری گریکی‌یە کـــە دیسان بـــە ناوی هۆمیرۆسەوە ناسراوە . وادیارە دەوروبەری ناوەندی سەدەی حـەوتەمی پێش عیسا دانراوە . « ئۆدیسا » پڕی‌یە لە زانیاری دەربارەی ژیانی سیاسی‌و کۆمەڵایەتی‌و ئابووریی ئەو سەردەمە کۆنـەی مێژوو . زانایان بـەهۆی ناوەرۆکی « ئەلیادە »و « ئۆدیسا »وە گەیشتونەتە ئەو بڕوایە کـە لـە سەردەمی بلاوبوونەوەیاندا دامودەزگای میری لەو ناوچانەی ئەوروپـادا هێشتا دروست‌نەبوبو .

« ڕامایانا »ی هندی ئێپۆسێکی تری بەناوبانگـە کـــە لەوانەیە ٢٣٠٠ ـ ٢٤٠٠ ساڵ لەمەوبەر بە زوبانی سانسکریتی دانرابێت . کورتەی ناوەرۆکی ئەم ئێپۆسە دەڵێت : ڕامای کوڕە گەورەی پاشـای کاشالا کـە کەوتۆتە باکووری هندستانەوە سیتای شازادەی خواست . باوەژنی کە دەیویست بەهاراتی کوڕی بچێتە سەر تەختی پاشایەتی ڕامای بە پاشـــای مێردی دەربەدەرکرد . ڕاماو سیتای هاوسەری‌و لاکشمانی ژنبرای پێکەوە چەند ساڵێکیان لە دارستانە چڕەکاندا بردەسەر تا ڕۆژێکیان لەپڕ ڕاڤانای پاشای دێوەنەکان سیتای فڕاندو بردی‌یە دۆرگەی لانکە[٣] لە باشوور .

ڕاما دەستی لــە سیتای خۆشەویستی هەڵنەگـرت ، پەنای بردە بەر

٣ ـ سەری لانکەی نیستە .

مەیمونو ورچی دارستانەکانو قایلی کردن لەتەکیا بچنە سەر لانکەو داگیری بکەن • ڕاما بە دەستی خۆی ڕاقاقای کوشتو سیتای ڕزگارکرد • پاشان ڕاما توانی بگەڕێتەوە سەر تەختو بەختیخۆی ، سالەهای سال بە ئەویەری دادپەروەرییەوە فەرمانڕەوایی ولاتی کرد ، بەوڕادەیەی ناوی لە زمانی هندیدا بووە مانای فەرمانڕەوای دادگەر •

دیسان هەر لە هندستان ئێپۆسی « مەهابەهارات » ( داستانی گەورەی نەوەی بەهارات[٤] ) باوە • ناوەرۆکی ئەمیان باسی ڕوداوەکانی ناوچەی بەهاراتی باکووری دەلهی دەکات کە هیوایان تێدایە بەر لە نزیکەی ٥٠٠٨ سال قەوماوە • زوربەی ناوەرۆکی « مەهابەهارات » بۆ باسی ئەو شەڕە تەرخانکراوە کە لەنێوانی پێنج براو سەد ئامۆزای نەوەی پاشای بەهارتە لەسەر تەختو تاجی پاشایەتی ڕوویداوەو زوربەی هۆزەکانی هندستانی تێدا بەشدار بوونو ١٨ ڕۆژی خایاندووە • « مەهابەهارات » چەند سەدەیەك دەماودەم بلاوبۆتەوەو هەر نەوەی چنگێکی خستۆتە سەر تا نە سەدەکانی یەکەمی پاش عیسادا لە ٨٥ هەزار جوتبەندا بە سانسکریتی تۆمار کرا • « مەهابەهارات » زۆر لایەنی ژیانی کۆنی هندستانی گرتۆتەوە • هەرچەندە بەڕادەی « ڕامایانا » لە « مەهابەهارات » نەکۆلراوەتەوە ، بەلا گومان لە نرخی مێژوویی ناکرێت •

مێژوونووسان « ڕامایانا » بە سەرچاوەیەکی ڕەسەنو گرنگ دادەنێ

---

٤ ــ بەهارات ناوی ناوچەیەکە کەوتۆتە باکووری دەلهییەوە . ئەم ناوە هێند بلاوە کە زۆر جار بە هەموو هندستانی دەلێن ، تەنانەت ناوی ڕەسمیی هندستان بە زمانی هندی بەهاراتە . دیارە بەهاراتەکەی ئێمەش لەوەوە هاتووە ، کاتی خۆی ئالەتو زمردەچەوەو زیرەمان لەوێوە بۆ هاتووە ، دەقاودەق چەشنی وارشاوی پایتەختی پۆلونیا کە لە کوردیدا بۆتە ولاتای کانێکی بریقەدار ، زوو باوو باپیران لەوێوە سەماوەری ولارشاویان هێناوە .

بۆ ساغکردنەوەی گەلێك ڕووی مێژووی کۆنی هندستان . لە هندستان
مرگای تایەتی تا ئیستەش بە لێکۆلینەوەی « ڕامایانا »وە خەریکن‌و بە
منزلان ڕونووسی جیاوازیان لێی کۆکردۆتەوە . « ڕامایانا »
ومرگێڕدراوەتە سەر گەلێك زمانی‌ترو مێژوونووسانی جیهان کەلکی زۆریان
تێ ومرگرتووە .

شایانی باسە بەدەگمەن هەوالی کۆنی وا هەلدەکەوێت کە تەواو بێ
ڕەگو ڕیشە بێت ، بەلام جاری‌وا هەیە هێندەی خراوەتە سەر کە بۆتە
ئەفسانە . تائیستەش زانایان عەودالی بنەچەی ئەو ئەفسانانەن‌و هەر ماوە نا
سوەیەك دەگەنە ئەنجامێکی مێژوویی نوێ . بە وێنە سالی ١٨٧٠ «ئەلیادە»
هینرشی مێژوونووسی ئەلەمانیی گەیاندە شاری تەروادە .

بۆ ڕوونکردنەوەی هەمان مەبەست پەنا دەبەمە بەر نمونەیەکی تری
زۆر نوێ کە پێوەندی بە باسی « ئەتلاتیس »ی ئەفلاتونەوە هەیە .

بەر لە نزیکەی ٢٣٠٠ سال ئەفلاتونی حەکیم لە دوو نووسراویدا باسی
دۆرگەی لەناوچووی « ئەتلاتیس » (Atlantis) ی کردووە کە دیارە
دماودەم هەوالی بیستبۆوە . گوایە دەوروبەری دە دوازدە هەزار سال
ممەوبەر لە ڕۆژئاوای کێوی تاریق[٥] لەناو ئۆقیانوسی ئەتلەسیدا دۆرگەیەکی
یەکجار گەورە بە ناوی « ئەتلاتیس »ەوە هەبووە ، ڕوپێوی ، وەك دەلێت،
لە هەموو ئاسیاو لیبیا بەسەر یەکەوە زیاتر بووەو گەلێکی زۆر پێشکەوتوی
بە هەمان ناوەوە تێدا ژیاوە .

بە پێی گێڕانەوەی ئەفلاتون گەلی ئەتلاتیسی بەهێز بێ پەروا
پەلاماری گەلانی ئەوروپاو ئەفەریقای داوەو هەموویانی بەزاندووە تا
خەلکی ئەسینای یۆنانستان توانیویانە ڕادەی بۆ دابنێن . گوایە پاش

---

٥ ـ جبل طارق .

ماوەیەك بوومەلەرزەیەكی زۆر توند بۆتە هۆی لەناوچونی « ئەتلانتیس »و نقوم‌بوونی لە ناخی ئۆقیانوسی ئەتلەسیدا .

دیارە ئەم قسانەی فەیلەسوفێكی گەورەی وەك ئەفلاتون دەبوو سەرنجی زانایان ڕابكێشن ، ئەوانەی دەمێك ساڵە بە پەرۆشەوە عەودالی « ئەتلانتیس »ن ، دەیانەوێت بزانن دوورگەیەكی‌وا هەبووە یا نا . گەر هەبووە كەوتۆتە كوێوەو چیی بەسەرهاتووە . هەروەها «ئەتلانتیس» بووە هەوێنی بەرهەمی ژمارەیەك نووسەرو شاعیری ناوداری جیهان . فرانسیس بێكۆن[٦] نزیكەی چوار سەدە لەمەوبەر كتێبێكی نازداری بە ناوی « ئەتلانتیسی نوێ »وە نووسی[٧] كە بەدەم شەپۆلی خەیاڵەوە مرۆڤی تێدە گەیاندە لقەپۆپەی بەختیاری .

ماوەیەكی كەم لەمەوبەر دیسان هەواڵی « ئەتلانتیس » دەنگی‌دایەوە . زانای یۆنانی مارینانۆس دوای لێكۆڵینەوەیەكی وردو قووڵ لە قسەكانی ئەفلاتون‌و زۆر بەڵگەی مێژوویی كۆنی‌تر گەیشتە ئەو ئەنجامەی كە مەبەست لە « ئەتلانتیس » دوورگەی سانتۆرینە كە كەوتۆتە ناو دەریای ئیجەی نێوان یۆنان‌و توركیاوە . دێر زەمان سانتۆرین بەر شالاوی ئاگری بوركانێكی گەورە كەوتووە . پاش حەوت ساڵ كاری بێ‌وچان مارینانۆس ساڵی ١٩٧٤ توانی لەژێر سووتووی ئەو بوركانەدا پاشماوەی ژیاری‌یەكی پێشكەوتووی كۆن بدۆزێتەوە كە تەمەنی خۆی لە ٣٥٠٠ ساڵ دەدات . ئەوساكە دانیشتوانی سانتۆرین لە خانوبەرەی سێ نهۆمیدا ژیاون . بەپێی قسەی شارەزایان تەنها ڕێكخستنەوەی پاشماوەی نیگارو وێنە هەڵكەندراوەكانی سەر دیوارەكانی سانتۆرین بە لای كەمەوە سەد ساڵی پێ دەوێت .

---

٦ ــ دوایی باسی دێت .
٧ ــ فریا نەكەوت تەواوی بكات .

ـدتورین ئەتلاتتیس بێت یا نا گرنگ لێرەدا ئەوەیە کە دەنگوباوی
ـەـ ـڕی خەڵك چووە ناو بەرگەی بەرهەمی ئەفلاتونەوەو ئەمیشـــیان
ـکەی بو دوزینەوەی شارستانەتی‌یەکی گەورە خوش‌کرد • بێ سو ڕوژگاری
ـ ـەتو دوزینەوەی‌تری لەم بابەتەی بەدەمەوە دەبێت ، تایبەت گــەر ئەوەش
ـەـەکەین کەوا زانایانی بەتواناو دەسەڵات خویان بو ئەم کارە تەرخــان
ـ ـوە • بە وێنە تا ئیمڕوش لە باشووری ئیسپانیا مێژوونووسان بەدوای
ـرنـەواری شارو دەوڵەتی تارتێسدا[٨] دەگەڕێن کە لە ئەفسانە کونەکاندا
ـ ـی هاتووەو ستراپون بە دەستووری ئەفلاتون باسی کردووە • وایێ‌دەچێت
ـ ـ ـە سێ هەزار ساڵ شاری تارتێست دروست کرابێت کە هەر لەئیستەوە
ـەمێك زانیاری سەبارەت بە ژیانی ســیاسی‌و ئابووری‌و کومـــەڵایەتی
ـ ـتوانی ساغ‌بوتەوە • تارتیستی‌یەکان زیویان بەکارهێناوە ، کشتوکاڵیان
ـ ـوە ، ئاژەڵیان بەخێوکردووە ، چنین لەناویاندا بــاوبووە ، بازرگانی‌یان
ـەرمودا بووەو تەنانەت ناوی ژمارەیەك لە پاشاکانیشیان زانراوە • هیـــچ
ـوور نی‌یە ئەو لاپەڕە ونەی مێژوو وەك زور لاپەڕەی‌تری خوی چونە ئاوا
ـوزرێتەوە •

زانایان بویان ساغ‌بوتەوە کە لە ســـەردەمێکی زور کونەوە گورانی
فولکلوری گەلێك هوز باسی ڕوداوی مێژوویی تێدا بووە • لە چین‌و ماچین
سێ هەزار ساڵ لەمەوبەر گورانی مێژوویی باو بووە • کونفوشیوسی زاناو
فەیلەسوفی بەناوبانگ ( ٥٥١ ــ ٤٧٩ پ • ع• ) کاتی خوی ٣٠٥ گورانیی
ئەو بابەتەی لە کتێبێکی سەربەخودا بە ناوی « شی تسزین » واتــە ( کتێبی
گورانی )ەوە کوکردوتەوە • ئەو گورانی‌یانە باسی ڕابوردووی دێرینی چین
دەکەن ، بە شان‌و باهوی پاڵــەوانان‌و دانــایی ســـەرداران‌و دڵسوزی
فەرمانڕەوایاندا هەڵدەدەن ، باری ژیان‌و کاری جوتیاران دەگێڕنەوە • کتێبی

---

٨ ــ بە لاتینی تارتێسەس "Tartessus" .

« شی تسزین » ئیمڕۆکە بە سەرچاوەیەکی ڕەسەنی زۆر بەنرخ دەژمێردرێت.
بەر لە چینی‌یەکان لاوانەوە لەناو سۆمەری‌یەکاندا باو بووە .
لاوانەوەکانی ڕۆژگاری سۆمەرو ئەکەد پڕن لە باسی خواکانی ئەوساو پەرستگای شارە گەورەکان‌و ئەو مەلبەندانەی لە شەڕدا کاول‌دەکران ، هی‌وایان تێدایە بریتی‌یە لە ٤٠٠ دێڕ .

بایەخی ئەو جۆرە گۆرانی‌یانە لە سەدە ناونجی‌یەکاندا وا زۆر بوو کە شارلەمانی پاشای ناودار کۆتای سەدەی هەشتەم فەرمانی کۆکردنەوەیانی دا . پاشماوەی ئەو گۆرانی‌یانە بوونەتە سەرچاوەی مێژوویی ، شارەزایان دەزانن چۆن کەلکیان بۆ ڕوونکردنەوەی هەندێك لایەنی مێژووی ڕابوردوو لێ‌وەردەگرن . شایانی باسە ئەو گۆرانی‌یانە تائێستەش لەناو کوردا باون . ئەو گۆرانی‌یانەی کاتی خۆی « کۆڕی زانیاری کورد » کۆی‌کردنەوە پڕن لە باسی بەسەرهاتی مێژوویی گرنگ کە دەستدەدەن ببنە سەرچاوەی بەکەڵك بۆ مێژوونووسان .

پەیدابوونی دەسەڵات‌و داهاتنی دامودەزگای میری بایەخی مێژوویان لە جاران زیاتر کرد . دۆزینەوەی نووسینیش بووە هۆی دروست‌بوونی توانای کۆکردنەوەی بەسەرهاتی ڕابوردوو . بەوجۆرە چەند هەزار ساڵێك لەمەوبەر سەرچاوەی مێژوویی پەیدابوو کە سەرەتا بریتی‌بوو لەو نووسینە ساکارانەی لەسەر کێلی گۆڕی پاشایان‌و دەروازەی پەرستگایان‌و تاشە بەردی ناو ئەشکەوتان هەڵدەکەندران . ئەو نووسینانە ژینامەی گەورە پیاوان‌و پاڕانەوەی فەرمانڕەوایان‌و تۆماری شەڕی پاشایان‌و کردارو کردەوەیان دەگێڕنەوە کە ئیمڕۆ بوونەتە سەرچاوەیەکی ڕەسەنی یەکجار گرنگ ، بێ‌ئەوان شتێکی ئەوتۆمان دەربارەی مێژووی کۆنی ئادەمیزاد نەدەزانی . بەوێنە لەوحەکەی نارام سینی پاشای ئەکەدی کە ئەدمۆندس کاتی خۆی لە دەربەندی گاوری شاخی قەرەداغدا دۆزی‌یەوە باسی شەڕێکی

کۆنی کوردستانی بو پاراستوین که دەوروبەری ٤٧٠٠ سـال لەمەوبەر لەنێوان لەشکری ئەکەدیو لەشکری لۆلۆدا لەو ناوچەیەی نزیك سلیمانیدا ڕوویدا .

نمونەیەکیتر . تۆماری دارای یەکەم که له قەد کێوی بێستونی نزیك هەمەدان هەلکەندراوە یەکێکە له پێشینه مێژووییەیه هــەرە گرنگەکانی ڕۆژهەلاتی کۆن که تەمەنی خۆی دەدات له ٢٥٠٠ سالْ . بەشی زۆری ئــەو تۆمارە بە سێ زوبان ـ فارسیی کۆنو عیلامیو بابلی نووسراوەتەوە . زانایان له ناوەندی سەدەی نۆزدەدا توانییان ناوەرۆکی بخوێننەوە که بۆ باسی ئەو هەراو بگرە زۆرە تەرخانکراوە که دوای مردنی کۆرشی دووەم لــە ئێران قەومانو چۆن لەگەلْ دامرکاندنەوەیاندا دارای یەکەم هاتە سەر تەختو چۆن ئەمیش توانی ئاگری ئەو ڕاپەڕینانه دابمرکێنێتەوە که له ڕۆژگاری خۆیــدا بەرپابوون . هەروەها باسی هێرشی دارا بۆ سەر ئاسیای ناوەند دەگێڕێتەوە. بەمجۆرە تۆماری کێوی بێستون ڕوداوە سیاسییەکانی ناوچەیەکی گرنگو فراوانی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستی له سەدەی شــەشــەمی پێش عیساوە بۆ پاراستوین که نرخی مێژووییان له ئەندازە بەدەرن.تەنانەت زمانەوانەکانیش کەلکی چاکیان له نووسراوەکانی کێوی بێستون وەرگرتووە .

دوای داهاتنی نووسین دانیشتوانی عیراقی کۆن کەوتنە تۆمارکردنی گەلێك ڕووی گرنگی ژیان ( کاروباری دەزگاکانی مــیری ، پێوەندیی ئابووری ، شەڕو بەسەرهاتو گەلێکیتر ) لەسەر لوولەمۆر[٩]و لەوحیقوڕو تاشەبەرد . تائێستە بە سەدان هەزار لوولەمۆرو لەوح دۆزراونەتەوەو زانایان بەهۆی ناوەرۆکیانەوە توانیویانه زۆر لاپەڕەی مێژووی کۆنی عــیراقو گەلێك ناوچەیتری ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست ڕوونبکەنەوە . شایانی باسـه

---

٩ ـ الختم الاسطواني .

هەر ئەو سەردەمە کتێبخانەو ئەرشیف داهاتن کە بە دەیان هەزار بەڵگەو تۆماری تایبەتی یان تێدا هەڵدەگیرا . دەوروبەری ٢٦٠٠ ساڵ لەمەوبەر ئاشور بانیبال لە نەینەوای نزیك شاری موسڵەوە کتێبخانەیەکی گەورەی هەبوو کە گواستنەوەی هەر تۆمارێکی پێویستی بە ژمارەیەك عەرەبانە بوو .

دوای دامەزراندنی میریو دۆزینەوەی نووسین دیاردەی کاریگەری داهاتو بۆ مێژوو پەیدابوونی ئاین بوو . لەگەڵ ئایندا بۆ یەکەمجار لێکدانەوەی ڕووداوی مێژوویی پەیدابوو ، خوا هەڵبژاردەو دەستکردەکانی مرۆڤ ( ڕۆژو مانگو ئاوو ئاگرو گامێشو بتو ئەو جۆرانە ) بوونە دروستکەری هەموو بەسەرهاتو ڕوداوێکی وەك هەڵگیرسانی شەڕو سەرکەوتن یا ژێرکەوتنو ئەو جۆرە باسانە . دوایی کتێبی پیرۆزی وەك تەوراتو ئینجیلیش بوونە سەرچاوەی مێژووی ڕابوردوو .

مێژوونووس ، واتە ئەوەی نووسینەوەی مێژوو بووە پیشەی سەرەکیی ژیانی ، یا بەلای کەمەوە ئەوەی مێژوو لە هەموو ڕوویەکی ڕووناکبیری زیاتر سەرنجی ڕادەکێشا ، لە ڕۆژگاری گرێکەکان ( یۆنانە کۆنەکان )دا پەیدابوو . یەکێك لە مێژوونووسە هەرە کۆنەکانی جیهان هیرۆدۆتی ناودارە کە لە دێرزەمانەوە نازناوی « باوکی مێژوو »ی پێدراوە. هیرۆدۆت لە نێوانی ٤٩٠ یا ٤٨٠و ٤٣٠ یا ٤٢٤ی پێش عیسادا ژیاوە . دوای خۆی کتێبێکی یەکجار بەنرخی بە ناوی « مێژوو »ەوە بەجێ هێشتووە کە یەکەم سەرچاوەی نووسراوەی مێژوویییە دەربارەی شەڕەکانی نێوان ئێرانو یۆنان ، ئەو شەڕانەی گەورەترین ڕوداوی سەردەمی خۆیانن. جگە لەوە هیرۆدۆت گەلێك زانیاریی بەکەڵکی دەربارەی ڕۆژهەلات بڵاوکردۆتەوە کە بۆ خۆی زۆر ناوچەی دیون . شایانی باسە بە درێژی باسی میدییەکانی باپیرە گەورەی کوردیشی کردووە .

له بەرهەمەکانی هیرۆدۆتدا هەست بە سەرەتایەکی ساکاری ڕەخنەی مێژوویی دەکرێت . هیرۆدۆت بەپێی بۆچونی خۆیو ئەودای لێکدانەوەی ئەو ڕۆژگارە هەوڵیداوە ئەو هەواڵانەی بڕوای تەواوی پێیانە لەوانەیان جیابکاتەوە کە لێیان دوودڵە . دەبێت ئەو گوتەیەشی بە ناوی زێـــڕ ـوسرێتەوە کە تێیدا دەڵێ گریکەکان شەڕکەری چاکن ، بە گیانو بە چەک شەڕ دەکەن چونکە تامی ئازادییان چێشتووە . بۆ پەروەردەی دروستی گەلێ هیرۆدۆت خانەی یەکەمی داوەتە سەربەستی . واشە ، بێ سەربەستی ڕاستەقینە هیچ فەرمانڕەوایەك تاسەر نیشانی بۆنەپێکراوە !

فوکیدیتی هاوتەمەنی هیرۆدۆت[١٠] هیچی لەو کەمتر نەبوو ، بەڵکو لە ڕووی شێوازی زانیاریی لێکۆڵینەوەیەوە بۆڕی ئەوی دابوو . ئـــەو بەرهەمەی ئەمیش دوای خۆی لە هەشت بەرگدا بەجێیهێشـــتووە دیسان ناوی « مێژوو »ە کە بە دەســـتووری کتێبەکەی هیرۆدۆت باســـی شـــەڕە گەورەکانی سەردەمی دانەری دەکات . «گەڕان بەدوای ڕاستیدا» دروشمی فوکیدیت بوو لە نووسیندا ، بۆیەکا ڕەمەکی ســـەرچاوەی باســـەکانی وەرنەگرتووە ، هەڵیســـەنگاندوون ، باش تەتەڵەو بـــەراوردیکردوونو بەدوای هۆ سەرەکییەکانی ڕوداودا گەڕاوەو لە کـــاری خوای دوور خستونەوە . لەبەرئەوە فوکیدیت بە دانەری یەکەم بەردی بنـــاغەی لێکۆڵینەوەی زانستییانەی مێژوو دادەنرێت .

هەمانکات فوکیدیت هەوڵی دەدا دیوی ناوەوەی ڕوداوەکان ببینێتو تایبەتییەکانیان بدۆزێتەوەو ڕووی لەیەکچووی مێژووی گەلان دیاربکات .

---

١٠- فوکیدیت لەنێوانی ٤٦٠ ـ ٤٠٠ی پێش عیسادا ژیاوە .

لە کتێبی «مێژووی شەڕی پێلۆپۆن»دا [11] فوکیدیت لە هەموو شت زیاتر بایەخی بە ڕوداوە سیاسیەکانی ئەو سەردەمە داوە ، تایبەت شەڕو شۆڕی نێوان دەوڵەتانی گریك ، بەڵام دیسان یەکەم مێژوونووسە کە دەستی بۆ ناکۆکیەکانی نێوان دەستەو چینەکانی ئەو ڕۆژگارەو پێوەندی کۆمەڵایەتیو ئابوریـیـان بردووە • بەوجۆرە فوکیدیت نەك هەر گـەیشتە لقەپۆپەی لێکۆڵینەوەی مێژوویی قۆناغی کۆن ، بەڵکو هەمان کات کاریشی کردە سەر مێژوونووسانی قۆناغی نوێ •

هەنگاوی داهاتووی گرنگ لە مەیدانی لێکۆڵینەوەی مێژوودا دیسان گریکەکان نایان ، پۆلیبی ( ۲۰۰ ـ ۱۲۰ پ• ع• ) یەکەم مێژوونووسە کە لە بەرهەمە چل بەرگیەکەی [12] خۆیـــدا یەکەم بەردی گرنگی بنـــاغەی لێکۆڵینەوەی مێژووی جیهانی دانـاوە بەوەی بەســـەرهاتەکانی یۆنانو مەکەدۆنیاو ئاسیای پچووکو سوریەو میـرو چەند ناوچەو مەڵبەندێکی تری لە چوارچێوەیەکی گشتیدا پێکەوە بەستووە • جگە لەوە پۆلیبی هەوڵی داوە دیاردە مێژووییەکانی ئەو قۆناغە لێك بداتەوە، هۆکانیان دەست نیشان بکات، بەوێنە لەوە وردبۆتەوە کە بۆچی ڕۆمانەکانی دراوسێیان لە ماوەیەکی کەمدا توانیویانە گشت دەریای سپیی ناوەڕاست بخەنە ژێر دەسەڵاتی خۆیانەوە • پۆلیبی بۆ خۆی دەیگوت گرنگ لە نووسینی مێژووییدا گێڕانەوە نیە • بەڵکو لێکۆڵینەوەو لێکدانەوەیە •

کـسـەنەفون یا زەینەفون ( ٤٣٠ ـ ٣٥٥ یـا ٣٥٤ پ• ع• ) کە یەکـەم مێژوونووســـە بـە ڕوونی دوای بینیـــان باسی کوردو کوردسـتـانی

---

١١ـ پێلۆپۆن گەورەترین شەڕی یۆنانستانی کۆنە کە نزیکەی ۲۷ ساڵی خایاند ( ٤٣١ ـ ٤٠٤ پ • ع ) ، کۆتای بە سەرکەوتنی ئەسـپارتەو کەوتنی ئەسینا هات .

١٢ـ تەنها پێنج بەرگی یەکەمیانو چەند بەشو لاپـــەڕەیەکی بەرگەکانی تـری گەیشتونەتە ئێمە .

ردووه هەمانکات یەکێکە لە پێشڕەوەکانی دەستەی یەکەمی مێژوونووسە خودلرەکانی جیهان • پلوتارخیش [١٣] (٤٥ ــ ١٢٧ی دوای عیسا) یەکەم کەسە ژینامەی گەورە پیاوانی کــردە ناوەڕۆکی باسە مێژووییەکانی • پلوتارخ لە خۆڕاو بــێ‌ئامانج ئــەم ڕێبازەی هەڵنەبژارد ، ئەو دەیگوت مێژوو دەقاو دەق ئاوێنــەیە ، خوێنــەر دەیەوێت لاسایی ئەوانە بکاتــەوە کە مێژوونووس ڕەفتاری بەرزیانی بۆ تۆمار کردووە •

ســەدەی دووەم ئاپیانۆسی (Appianos) مێژوونووسی گــــرێکی هەنگاوێکی‌تری بەرەو پێشەوە نا•ئاپیانۆس لە بریتی گێڕانەوەی تێکەڵی یەك لەدوای یەکی بەسەرهاتەکان کە ئەوساکە باو بوو ڕوداوەکانی بەپێی ناوچە دەگێڕایەوە ، واتە باسی مێژووی هەر یەکە لە گەلانی نــاو ئیمپراتۆریی ڕۆمانیی بەجیا دەکرد•ئینگلس دەڵێت کەس وەك ئاپیانۆس بەوردی‌و ڕوونی باسی هۆی ناکۆکییەکانی ناو ئیمپراتۆریی ڕۆمانیی نەکردووە •

ڕۆمــانەکانیش بەشــی خۆیــان خزمــەتی زانســتی مێژوویان کرد • سالیوستیۆس (Sallustius) (٨٦ــ٣٥پ•ع)بەوردی‌و بەشێوازێکی ڕازاوەی بەپێزی هونەرمەندانە باسی ڕوداوەکانی ڕۆمای دوا سەدەی پێش عیسای بۆ تۆمار کردوین ، تایبەت هەرەس هێنانی زۆر ڕووی ژیانی سیاسی ئەو دەوڵەتە گەورەیەی سەردەمی کۆن • ســالیوستیۆس وەك پلوتارخی پێش خۆی‌و تاسیتۆسی دوای خۆی [١٤] هۆی ڕوداوی مێژوویی دەبەست بە لایەنی ڕەوشت‌و دەرونی دەسەڵاتدارانەوە کە بە هێزی بزوێنەری سەرەکیی

---

١٣ــ پلوتارخ ، پلوتارخۆس ، پلوتارکۆس (Plutarchos) .

١٤ــ مێژوونووسی ڕۆمانی تاسیتۆس (Tacitus) کۆتای سەدەی یەکەم‌و سەرەتای سەدەی دووەم ژیاوە . لە بەرهەمەکانیــدا باسی ڕوداوەکانی ئیمپراتۆریی ڕۆمانی کردووە .

بەسەرهاتەکانی دادەنان • هەرسێکیان دەوری گەورەیان لە بەرەوپێشبردنی لێکۆڵینەوەی مێژوویدا بینی •

لە سەردەمی کۆندا چینییەکانیش دەوری خۆیان لە پێشخستنی رەورەوەی زانستی مێژوودا بینی • سیما تسیان (١٤٥ یا ١٣٥ – ٨٦ پ•ع•) یەکەم کتێبی دەربارەی مێژووی چین دانا کە بە باسی داستانو ئەفسانە کۆنەکان دەست پێدەکاتو بە سەردەمی خۆی تەواو دەبێت • کتێبەکەی سیما تسیان تەنها بە روخسارو بە ناوەرۆك دەوڵەمەند نییە ، وێڕای ئەوە سیما تسیان بۆ خۆی یەکەم مێژوونووسە کە خۆی بە چوارچێوەی گێڕانەوەی رووداوی سیاسییەوە نەبەستۆتەوە ، بەڵکو باسی لایەنەکانیتری ژیانیشی کردووە •

بۆئەوەی تێبگەین ئەم هەنگاوانە چەند گەورە بوون بۆ مەیدانی خۆیان دەبێت بە تەرازووی رۆژگاری خۆیان بیانکێشین ، ئەوکاتەی مێژوو وەك بەشێکی گرنگی ژیانی رووناکبیریی ئادەمیزاد تازە سەری دەرهێنابوو •

# مێژوو لە قۆناغی دەرەبەگیو

## سەردەمی ڕێنیسانسدا

**کلێسەو مێژوو . ئیبن‌خەلدون . ڕێنیسانس ( بووژانەوە )و مێژوو . مەکیافیللیو گویجاردینی . لۆرێنزۆ ڤالاو « بەخشی قوستەنتین » .**

لە قۆناغی دەرەبەگیدا مێژوو[10] وەك زۆر لایەنی گرنگیتری ژیانی ڕووناکبیریی مرۆڤ بەگشتی هەنگاوی باشی بەرەو دواوە نا . لای زوربەی هەرە زۆری مێژوونووسانی ئەوروپا نە خەڵكو نە كۆمەڵو نە ئاڵوگۆڕەکانی زەمەن هیچ دەورێکیان لە دروستکردنی ڕوداودا نەما ، بەپێی لێکدانەوەی کڵێسە کە ئەوسا لە ئەوروپا هەر بۆ خۆی لە مەیداندا بوو ، بڕیاری سەرهاتەکانی مێژوو لەپشت ئاسمانەوە دەدرا . چ سەرکەوتنو ژێرکەوتن، چ بەرەوپێشچونو دواکەوتن وەك باران دەڕژانە سەر زەمین . لەو سەردەمە تاریکەدا لە ڕۆژهەڵات دەنگی ڕوناکی ئیبن‌خەلدون ( ١٣٣٢ ــ ١٤٠٦ ) بەرزبۆوە کە ئەو بەرگە دەستکردە داسەپێنراوەی داماڵیو ڕوداوەکانی گێڕانەوە هەوارگەی خۆیان لەم سەرزەمینەدا بۆ ناو خودی خەڵك کە دەیگوت گۆڕانی بێوچانی دابو نەریتیانو دامەزرانو کەوتنی دەوڵەتەکانیانو باری دەوروبەری جوگرافییان مێژوو دروستدەکات .

لەگەڵ ئەوەش لە ئەوروپای سەدە ناوەنجییەکاندا ژمارەیەك مێژوونووسی لێهاتوو زۆر ڕووی بەسەرهاتەکانی ئەو ڕۆژگارەیان وەستایانە بۆ تۆمار

---

١٠ــ لەم جۆرە شوێنانەدا مەبەستمان لێکۆڵینەوەی مێژووییو زانستی مێژووە نەك مێژوو بە گشتی .

کـردوین • تەنانـەت ئۆگەسـتین ( ئۆگەسـتینۆس Augustinus)
( ٣٥٤ ــ ٤٣٠ دەع•) کە بە گەورەترین دانەری ڕێبـازی تەسـکینی لێکۆلینەوەی مێژوویی سەدە ناونجی‌یەکان دادەنرێت ، ئـەو ئۆگەستینەی پێی‌وابوو « لەعاستی ئیماندا هەموو بەرهەمێکی عەقڵ پوچ‌دەبێتەوە » ، دوای خۆی ٩٣ بەرهەمی لە ٢٣٢ کتێبدا بۆ بەجێ‌هێشتین • مێژوونووسی ئەڵمانی ئۆتۆ ڤۆن فرێیزینگ (Otto Von Freising) کە لە نیوەی یەکەمی سـەدەی دوازدەدا ژیاوە[١٦] کەم‌و زۆر لە ڕێبازی باوی سەدە ناونجی‌یەکان لای‌نەداوە بەڵام بە شێوازێکی ئەدەبیی بەرز گەلێك ڕوداوی گرنگی جیهـان‌و تایبەت ئەڵەمانیاو ئیتالیای بۆ بەجێ‌هێشتوین • هەمان‌کات فرێیزینگ زۆر بەڵگەی ڕەسەنی دەربارەی هێرشی دووەمی خاچداران بۆ سـەر جیهانی موسڵمانان تۆمار کردووە کە نرخی مێژوویی‌یان گەلێك بەرزە ، تایبەت بۆ خۆشی یەکێك لە بەشدارانی ئەو هێرشە بوو •

جاروبار مێژوونووسی واش هەڵدەکەوت کە ملی بۆ لێکدانەوەی کلێسە نەدەدا • یـەکێك لـەوانە قـەشەی ئیتالیایی چـواچیمۆس فـلۆرێنسێس ( Joachimus Florensis) (١١٣٢ ــ ١٢٠٢) بوو کە سوور بوو لەسەر ئەوەی مێژووی ئادەمیزاد ڕاوەستاو نی‌یە ، لـە کۆیلەیی‌یەوە بەرەو ئازادی هاتووە • لەسەر ئەو جۆرە بیرانەی جواچیمۆس چەند جارێك دراوەتە دەست دادگە کوێرەکانی کلێسە •

سەدەی پازدەو شازدە ، واتە لە سەردەمی ڕێنیسانس «نهضە»دا مێژوو وەك هەموو لقەکانی‌تری زانسـت ، هەنگاوی زۆر گـەورەی بەرەوپێشەوە نـا • مێژوونووسە کەڵەکانی ئـەو ڕۆژگارە (مـەکیاڤێللی ، لۆرێنزۆ ڤالا ، گویجاردینی ، برونی ، بۆدین ) خەبات‌و دووبەرەکی‌و بەیەکدا دانی پارتی‌و

---

١٦ــ سالی لەدایك‌بوونی بەتەواوەتی نەزانراوە ، سالی ١١٥٨ مردووە .

ـــەکانی کۆمەڵیان کردە داردەستی لێکدانەوەی بەسەرهاتو ڕوداوەکانی ـڕەر ٠ جگە لەوە دیسان هەر ئەوان بۆ یەکەمجار وەك ڕێبازی لێکـدانەوە ـمـتە سۆراخی یاسای ئاڵوگۆڕی مێژوویی‌و دیارکـــردنی کاری بـاری ـرگرانی بۆسەر ڕوداوو بەسەرهات ٠

لە سەردەمی ڕێنیسانسدا مێژوونوسان بە چاوی ڕەخنەوە کەوتنـــە ـــەنگاندنی سەرچاوەی لێکۆڵینەوەکانیانو لەو ڕێگەوە گەیشتنە گەلێك ـجەمی گرنگی ئەوتۆ کە لە ڕاستیدا وەك تەقینەوەی گەورە وابوون،کلپەیان ـقـ بڕوای بێ‌مانای لەگەڵ خۆیدا سوتاند ٠

لێرەدا وەك نمونە تەنهـــا باسی یەکێك لە کارەکانی لۆرێنزو ڤـالا (Lorenzo Valla) (١٤٠٧ ــ ١٤٥٧) دەکەم کە بۆ لێکدانەوەی « بەخشی ـوستەنتین »ی[١٧] تەرخانکردووە ٠ گوایە ئیمپراتوری ڕۆمانی قوستەنتین ـمـەلاتی ڕۆژئاوای وڵاتە فراوانەکەی بە شـــاری ڕۆماوە بەخشیوە بـە ـپـا ٠ سەردارانی کلێسە کە سەدان ساڵ بوو لەســـەر دەسەڵات لەگـەڵ ـشاکاندا کەوتبوونە بێنــەو بــەرە ئەو « بەڵگـە »یەیان کردبووە بنێشتە ـخۆشەی ژێر دانیان ، لە هەموو شوێن هەر دەیانجۆوە ٠ لۆرێنزۆ ڤالا وەك مێژوونوسێکی وردبین کەوتە لێکۆڵینەوەی « بەخشی قوســـتەنتین »و ـەئەنجامدا بە کوێریشی سەلماند کە ئەو « بەڵگە »یە دەستکردی قەشەکانی کلێسەیەو قوستەنتین نە زۆرو نە کەم ئاگای لێی نییە ٠ ڤالا دوو کەلێنی زۆر گــەورەی لـە « بەخشی قوســتەنتین »دا دۆزی‌یەوە ٠ یەکەمیـان ئــەو لاتینی‌یەی پێی نووسرابۆوە لە زۆر ڕووەوە لە لاتینیی ســـەدەی هەشتەمی دەکرد نەك سەدەی چوارەم ٠ دووەمیشیان ناوی مەڵبەندو شــاری ئەوتۆ لەناو «بەڵگە»کەدا هاتووە گوایە قوستەنتین بەخشیونی بە پاپا کە ڕاستەکەی

---

١٧ ــ « هبة قسطنطين » "Donation of Constantine"

له سەردەمی فەرمانڕەوایی ئەودا ، واتە لە سەرەتای سەدەی چوارەمدا ناوی نەبوو چونکە هێشتا دروست نەکرابوون . ئینجا لەگەڵ ئەوەش لورێنزۆ ڤالا لە کۆتایی لێکۆڵینەوەکەیدا ئەم پرسیارە ڕەوایەی کردووە :

ئایا ڕێی تێدەچێت کەس سەری خۆی بەخشێت ؟ . مەبەستی ڤالا شاری ڕۆمایە کە چەشنی سەر بوو بۆ ئیمپراتۆریی ڕۆما .

ئەم کارە گەورەیەی لۆرێنزۆ ڤالا کە بە سەرەتای دامەزراندنی لێکۆڵینەوەی ڕەخنەیی نوێ لە مەیدانی مێژوودا دادەنرێت کڵێسەو قەشەکانی بەجارێك ڕیسوا کرد ، ئەوانەی ڤالا زاتی‌کرد ناوی « چەتەو گورگ »یان لێ بنێت .

لە سەردەمی ڕێنیسانسدا مێژوونووسان بۆ یەکەمجار مێژوویان بەپێی قۆناغ دابەش‌کرد[١٨]و هەر ئەوان یەکەم کەس بوون کە زاراوی « سەدە ناونجی‌یەکان »یان بەکارهێناو لێکۆڵینەوەی کۆنینە دێرینەکانیان داهێنا[١٩]. دیسان لەو ڕۆژگارەدا نووسینی مێژوویی نەتەوەیی داهات.بەر لەو سەردەمە زوربەی هەرە زۆری مێژوونووسان بەرهەمەکانیان بۆ سەردارێك یا ڕوداوێك یا ناوچەیەك یا شارێکی نیشتمان تەرخان دەکرد . بەڵام مێژوونووسانی ڕێنیسانس کەوتنە باسی نیشتمانو ڕابوردووی بە شێوازێکی هەست بزوێن .

دەسکەوتەکانی مێژوو لەژێر سایەی ڕێنیسانسداو بە هۆی داهاتنی چاپەوە کە یەکێك بوو لە شاکارەکانی ئەو قۆناغە[٢٠] ، کۆتایان بە

---

١٨ــ مێژووی ئادەمیزادیان بەسەر سێ قۆناغدا دابەش‌کرد : کۆنو سەدە ناونجی‌یەکانو نوێ . ئەم دابەش‌کردنە لە سەدەی هەژدەوە بە تەواوەتی جێگەی خۆی گرت .

١٩ــ واتە "Epigraphy" ( دراسة الآثار القديمة ) .

٢٠ــ لە ناوەندی سەدەی پازدەدا ئەڵمانەکان چاپیان نوێیان دۆزی‌یەوە .

ـ ـ ـ ءكردني مێژوو لەلایەن کلێسەوه هێنا ۰ تا ئەو ڕۆژگاره تەنها پیاوانی کێبە بە نووسینەوەی مێژووەوە خەریك بوون ، لە خۆیان‌و میرو ـ ـگان بەولاوه کەس بەرهەمەکانیانی نەدەبینی ، بشیانبینیبایه کەلکیان ی ـمرنەدەگرتن چونکە هەموویان بە زوبانی لاتینی نەك ـ ـانی نەتەوەیی دەنووسرانەوه ، یەکەمیان زوبانی گفتوگۆی ـ ـەی هەلبژاردەو دووەمیشیان زوبانی کۆمەلانی خەلك بوو ۰ ـ ـ بەشی هەرەزۆری مێژوونووسانی سەردەمی ڕێنیسانس لەوانەبوون که ـ هیچ جۆر دانویان لەگەل کلێسەدا نەدەکولا ، بەلکو هیوایان هەبوو ، ـ مەکیاڤیللی ( ١٤٦٩ ــ ١٥٢٧ ) ڕقی دونیایان لێی دەبۆوه چونکە بە ـ ـەی مەینەتیی گەل‌و نیشتمانیان دادەناو بۆخۆشی وا بووەئەمان بۆ ڕەمەکی ـ ـکیان دەنووسی‌و دەیانویست له ڕێگەی مێژووەوه وریایان بکەنەوه ، هەر نەبەرئەوەش جارێکیتر توخنی زوبانی لاتینی نەکەوتنەوەو گەلێك بیری ـ ـیان دەربارەی مێژوو هێنایە کایەوه که بە هیچ کلۆجێك لەگەل بیروڕای ـ ـەدا نەدەگونجان ۰ مێژوونووسی ئیتالیایی‌لیۆناردۆ برونی (Bruni) ١٣٧٠ یا ١٣٧٤ ــ ١٤٤٤ ) دژی هەموو جۆره ستەمێك وەستا ، کۆمارو ـ ـتمانپەروەریی بەلایەوه دەرسی یەکەمی مێژوو بوون‌و هەر لەبەرئەوەش ـ ـدای مێژووی ڕۆمای کۆن بوو ۰ مێژوونووسی فەرەنسەیی جان ـ ـدین (Bodin) ( ١٥٣٠ ــ ١٥٩٦ ) دەیگوت کۆمەل بەرەوپێش دەچێت‌و زانستی مێژووش ئەو بەرەوپێش چوونە دەخاته ڕوو ۰ بە لای بۆدینەوه مێژوو باشترین ڕێگەی سیاسەته ۰ فرانچێسکۆ گویجاردینی (Guicciardini) ( ١٤٨٣ ــ ١٥٤٠ ) یەکەم کەس بوو مێژووی هەموو ئیتالیای نیشتمانی بەسەر یەکەوه له چوار بەرگدا بلاو کردەوه ۰

دەسکەوته گەورەکانی مێژوو له سەردەمی ڕێنیسانسدا واناگەیێنن که ئەو زانیاری‌یە دوا بەرگی زانستی پۆشی ۰ مێژوونووسانی ئەو ڕۆژگاره

نەیانتوانی دەرکی هەموو شتێك بکەن ، بۆ سەردەمی خۆی ئەوە کارێکی هە-
وا ئاسان نەبوو • زوربەی هەرە زۆریان تەنها ڕووی سیاسی مێژووجە-
بەدی‌کردو زۆر دەگمەن توخنی لایەنەکانی‌تری کەوتن • کەسیان نە زۆرو •
کەم هەستیان بە دەوری کۆمەڵانی خەڵك لە دروست‌کردنی ڕوداودا نەکرد-
سەردار بەلایانەوە پاڵەوانی ناقانەی مەیدان بوو • فەیلەسوفێکی گەورەی
وەك فرانسیس بێکۆن (Bacon) ( ١٥٦١ ــ ١٦٢٦ ) دەیگوت خەڵکی
ساکار سەرچاوەی گۆبەندن بۆیەکا دەبێت هەمیشە دابین‌بکرێن •

شایانی باسە مێژوونووسانی کلێسە بۆئەوەی خۆ لە بەردەم شەپۆلی
گەورەی ئاڵوگۆڕەکانی ڕێنیسانسدا ڕابگرن ناچار قەڵا قایمەکانیـ-
بەجێ‌هێشت‌و تێکەڵی خەڵك بوون نەبا پاپاو کاردیناڵەکان دوا تنۆکی سـ-
هەیبەتیان بدۆڕێنن•بەونیازە کەوتنە کۆکردنەوەو ڕێکخستن‌و لێکۆڵینەوەی
سەرچاوەو بەڵگە کۆنەکان • زۆری نەبرد بۆ هەمان مەبەست پەناشیان بۆ
بەر چاپ پاش‌ئەوەی دەیان ساڵ بەرگی غەزایان دژی پۆشی‌و بە کەرە-
نەگریسی شەیتانیان لەقەڵەمدا • وێڕای ئەوە سەردارانی کلێسە بە ڕاست
چەپدا کەوتنە گیانی مێژوونووسە بەناوبانگەکانی ئەو سەردەمە • گەلێ
هەوڵیاندا بۆئەوەی ناوی بەرزی مەکیاڤێللی بزڕێنن‌و زۆریشیان بۆ چوە-
سەر • ژمارەیەك دەسەڵاتداری ڕووناکبیر نەبونایە لۆرێنزۆ ڤالا دوای
لێکۆڵینەوەکەی دەربارەی « بەخششی قوستەنتین » جارێکی‌تر چاوی بە
فلۆرەنسەی ڕازاوە نەدەکەوتەوە • چ کاتۆلیکەکان‌و چ پرۆتستانتەکان
دوژمنیان کونە مشکیان لە مێژوونووسی ئەڵەمانی سیاستیان فرانك
(Franck) ( ١٤٩٩ ــ ١٥٤٢ ) کردە قەیسەری‌و ناچاریان کرد بۆ سوید
هەڵبێ •

# مێژوو لە سەردەمی شۆڕشە
## بۆرجوازی‌یە گەورەکاندا

**تۆماس هۆبس ـ ڤیکۆ ـ قۆناغەکانی شـــارستانەتی ـ مێژوو لای زانیاری‌پەروەرانی سەدەی هەژدە ـ جان جاك ڕۆسۆو ڤۆلتێرو کانتو مۆنتسکیۆ ـ زانیاری‌پەروەرانی سەدەی نۆزدە ـ**

وەك دیمان ڕێنیسانس دەروازەیەکی پانو بەرینی لـە بەردەم زانستی مێژوودا خستە سەر گازی پشت ـ لەو ڕۆژگارەوە لێکۆڵینەوەی مێژوویی گوڕی خۆی بەستەوەو هەر ڕۆژە تا ڕۆژێك هەنگاوێکی نوێی بۆپێشەوە دەنا تا لە سەردەمی شۆڕشە بۆرجوازی‌یە گەورەکاندا[21] قاڵبی زانستیی تەواوی خۆی وەرگرت ـ تا ئەوساکە مێژوو نەیتوانی بەتەواوەتی ڕیشەی هـەموو پێوەندی‌یەکانی خۆی بە کلێسەو دەزگا ئایینی یەکانەوە بپچڕێت ـ

سەدەی حەڤدە ژمارەیەك لە زانایانی ئەوروپا هەوڵیاندا ئاڵوگۆڕەکانی ناو کۆمەڵ بە یاساکانی سروشتەوە ببەستنەوە ـ سکرتێری بێکۆنو هاوڕێی گالیلۆ گالیلی فەیلەســوفی بەناوبانگی ئینگلیز تۆمـــاس هۆبس (Hobbs) ( ١٥٨٨ ـ ١٦٧٩ ) دەیگوت دەوڵەت دەســتکردی ئادەمیزاد خۆیەتی نەك هێزێکی‌تری نەبینراو وەك پاشایانو دەستوپێوەندەکانیان دەیانویـــست بیسەلمێنن ـ هۆبس دامەزراندنی دامو دەزگای میری‌و ڕوداوە گـەورەکانی ژیانی بەم‌جۆرە لێك‌دەدایەوە :

---

٢١ـ تایبەت شۆڕشی سالی ١٦٤٠ی ئینگلیزو لەویش زیاتر شۆڕشی گەورەی فەرەنسـە کە مێـژوو دەوری گەورەی لـــە خۆش کـــردنی ڕێگـــەی سەرکەوتنیدا بینی ـ

سروشت هەموو شتێکی داوە بە هەموو کەس . لەبەرئەوەش کە خەڵك لە بەردەم سروشتدا یەکسانن‌و هەمان کات بە بێ‌بەرهەمی سروشت ناتوانن بژین لە یەکتر بوونە گورگ‌و بەربوونە گیانی یەك . پێویستیی چارەسەرکردنی ئەم خۆکوژییە خەڵکی ناچارکرد لەناو خۆیاندا ڕێك‌بکەون‌و دەست لە مافە سروشتییەکانی خۆیان هەڵبگرن‌و دەزگای میری بۆ پاراستنی ئاسایش‌و ڕێکخستنی پێوەندیی نێوانیان دابمەزرێنن . بەم‌جۆرە ، وەك هۆبس دەڵێت ، بەڕەڵڵایی نەماو خاوەنێتی شتومەك‌و کەلوپەل پەیدابوو .

بێ‌گومان ئەم بۆچوونەی هۆبس لە کەلێن‌و کەموکورتیی گەورە بێ‌بەش نییە ، بەڵام گرنگ تێیدا ئەوەیە کە « بە چاوی مرۆڤ » سەیری میری دەکات‌و بێ‌پێچ‌و پەنا جڵەوی دامەزراندن‌و بەڕێوەبردنی دەزگاکانی دەداتە دەست ئادەمیزاد نەك لایەنێکی‌تر .

هەر ئەو دەوروبەرەش بە هەمان دەستوور زانای هۆڵەندی گرۆتیوس (Grotius) (١٥٨٣ ــ ١٦٤٥)سوور بوو لەسەر ئەوەی کۆمەڵ بەرهەمی ڕێك‌کەوتنی خەڵکە لەسەر بنچینەی بەرژەوەندیی گشتی کە ڕێگەی بۆ دامەزراندنی دامودەزگای میری خۆش‌کرد .

گەر دەوری گەورەی دامودەزگاکانی میری لە دروست‌کردنی ڕوداوی مێژوویدا بهێنینەوە یاد ئەوساکە باشتر لەوە تێدەگەین چۆن ئەم جۆرە سەرنج‌و لێکدانەوانە مێژوویان زیاتر لە زانست نزیك خستەوە ، تایبەت لە ڕێگەی دیارکردنی یەکێك لە هێزە بزوێنەرە گەورە ڕاستەقینەکانی .

کۆتای سەدەی حەڤدەو نیوەی یەکەمی سەدەی هەژدە ڤیکۆ (Vico)ی زانای ئیتالیایی ( ١٦٦٨ ــ ١٧٤٤ ) پاڵێکی‌تری بەرەوڕوومێ زانستی مێژووەوە نا . فەیلەسوفی کۆمەڵایەتی‌و مێژوو ڤیکۆ لەوبڕوایەدا

وە کە دەتوانرێت مێژووی ئادەمیزاد بخرێتە بەر پێوانەو لێکـــدانەوەی
نت . لەگەڵ ئەوەش کە سلی زۆری لە کلێسە دەکردەوە بۆ خۆی گەلێك
ی نوێی دەربڕی‌و هەوڵی‌دا یاسا بزوێنەرەکانی ڕوداوی مێژوویی لەبـەر
ڕۆشنایی لێکۆڵینەوەی بەراوردی ئایین‌و داب‌و نەریت‌و ڕژێمی ســیاسی‌و
کۆمەڵایەتیی گەلانی کۆن‌و سەدە ناونجی‌یەکاندا دەست‌نیشان بکات . یەکێك
لە ئەنجامە ســەرەکی‌یانەی ڤیکۆ پێیان گەیشت ئەوەبوو کــە مێژووی
ئادەمیزاد دەقاودەق چەشنی سروشت بە زەبری ژمارەیەکی زۆر یاســای
چەسپاو دەبزوێت‌و دەگۆڕێت .

ڤیکۆ هیچ جیاوازی‌یەکی لەنێوان گەلاندا نەدەبینی. دەیگوت هەموویان
وەك یەك قۆناغەکانی مێژوو دەبڕن ئەگەرچی جیاوازیش لەنێوان مەڵبەندی
جوگرافی‌و ڕەگەزیاندا هەبێت . بەلای ئـەوەوە پەیـــدابوونی خێزان‌و
ئاڵوگۆڕەکانی ، دروســتبوونی زوبـــان‌و بەرەوپێش چوونی ، جۆری
بیرکردنەوەو گۆڕانی، دامەزراندنی دامودەزگای سیاسی‌و پتەو یا لاوازبوونی
لای گشت گەلانی جیهان یەك ڕێبازیان بڕیوە یا دەیبڕن .

ئەم بۆچوونە ڤیکۆی خستە سەر بیری دەورەی مێژوو کە تائیمڕۆش
بەشێکی زۆر لە مێژوونووسانی ڕۆژئاوا بڕوایان پێیەتی‌و لە نووسینەکانیاندا
هەریەکەیان بە جۆرو شێوازێك پەیڕەویی دەکـەن . بەلای ڤیکۆوە مێژوو
بریتی‌یە لە چوار قۆناغ ، یەکەمیانی ناوناوە « باری دڕندەیی » کە گوایـە
هێشتا مێژووی تێدا دروست نەبووبوو . دووەمیان « چەرخی خواکان »ە
کە گوایە خێزان‌و زوبان‌و ئایین‌و سەرتوێژێکی یاســـای تێدا پەیدابووە .
سێیەمیان « چەرخی پاڵەوانان »ە کە گوایە ئەریســتۆکراتەکان دەسەڵاتیان
تێدا گرتۆتە دەست‌و ڕژێمی دەرەبەگی پەیدابووەو خەباتی خوێناویی هەژاران
دژی دەرەبەگان دەستی‌پێ‌کردووە . دوا قۆناغیشی نـاو نـاوە « چەرخی
ئادەمی » کە گوایە لەو قۆناغەدا بیری ئادەمیزاد بۆ دامەزراندنی کۆمـــارو

« ڕژێمی پاشایەتی مرۆڤانە » دەچێت کە شار لە سایەیاندا پەرەدەسێنێتو بە گەشەدەکات . دوای بڕینی ئەم قۆناغانە گوایە کۆمەڵ دەکەوێتە هەرەس‌هێنانو ئینجا دەڕوخێتو دیسان لەسەرەوە دەست‌پێ‌دەکاتەوە . بەپێی ڤیکۆ ئادەمیزاد هێزی بزوێنەری سەرەکیی ئاڵوگۆڕی گشت قۆناغەکانە .

ئەم تیۆرییەی ڤیکۆ لای مێژوونووسانی دوای خۆی گوایە دەورەی شارستانەتی کە بەپێی لێکدانەوەی لایەنگرانی هەموو ژیانێکی ژیاری ، وەک ئادەمیزاد ، دەبێت بەرەو نەمان سێ قۆناغ ببڕێت : منداڵی ، لاوی ، پیری .

دەسکەوتی گەورەی ئەمجۆرە بیروباوەڕانە ئەوەیە کە شارمزایەر مێژوویان داوەتە دەست ئادەمیزاد خۆیو بە پەرۆشەوە ویستویانە هێزە بزوێنەرەکانی لە ڕێچکەی خودی ژیانو دیاردەکانیدا بەدی‌بکەن .

زانیاریپەروەرانی سەدەی هەژدە پایەی ئادەمیزادیان لە دروست‌کردنی ڕوداوی مێژوویدا ئەوەندەی‌تر بەرزکردەوە . کەس تا ئەو سەردەمە وەک ئەوان بە پەرۆشەوە بەدوای یاسا بزوێنەرەکانی مێژوودا نەگەڕا .

هەرچەندە ڕێبازی فەلسەفی زانیاریپەروەری لە فەرەنسە لە هەموو شوێن زیاتر دەنگی‌دایەوەو پەرەی‌سەند[٣٢] بەڵام ڕەگو ڕیشەی سەرەتایی لەو دوو وڵاتەدا سەریان دەرهێنا کە یەکەمو دووەم شۆڕشی بۆرجوازی‌یان تێدا بەرپا بوو ، واتە لە هۆڵەندەو ئینگیلتەرە[٣٣] . بەوێنە مێژوونووسی فەیلەسوفی هۆڵەندی ، داهێنەری زانیاریی یاسای نێوان دەوڵەتان گرۆتیۆسی

---

٣٢ـ سەدەی هەژدە زانیاریپەروەری گشت ئەوروپای ڕۆژئاوای گرتەوەو دوای ئەوێ پرشکی گەیشتە زۆر جێگەی‌تر . سەدەی نۆزدەو سەرەتای سەدەی بیست لە ڕۆژهەڵاتیش بەتوندی دەنگی دایەوە .

٣٣ـ یەکەم شۆڕشی بۆرجوازی لە جیهاندا ناوەندی سەدەی شازدە لە هۆڵەندە بەرپا بوو ، بەڵام کەم دەنگی دایەوە . دووەم شۆڕشی بۆرجوازی ساڵی ١٦٤٠ لە ئینگیلتەرە دەستی‌پێ‌کردو زیاتر دەنگی دایەوە .

خورِلو[٢٤] بەر لە زۆربـــەی ڕوناکبیرانی ئەورووپا کەوتە باســـی مافـــە سروشتی‌یەکانی ئادەمیزاد . بە لای گرۆتیۆسەوە دروســـت بوونی کۆمەڵ هەمی ڕێك‌کەوتنی خەڵکە لەناو خۆیاندا بەهیوای پاراستن‌و بەڕێوەبردنی ستری بەرژەوەندی هەریەکەیان . بۆیەکا بە هیـــچ جۆر ناشـــێت کەس دەستدرێژی بکاتە سەر ئازادی‌و ماڵ‌و موڵکی یەکێك یا دەســـتەیەکی‌تر . گرۆتیۆس بە هەمان دەستوور سەیری دامەزراندنی دەوڵەتی دەکرد کـــە بۆ کەی خۆی سەرکێشی‌یەکی گەورە بوو لە عاستی کلێـــسەدا .

وەك بەر لە ئێستە باسمان‌کرد فەیلەسوفی بەناوبانگی ئینگلیز تۆمـــاس هۆبس[٢٥] لە هەمان قوژبنەوە دەڕوانی‌یە دیاردەکانی ژیان .

ئەم چرۆیە لە ســـــەدەی هەژدەدا بەتەواوەتی کرایەوە . ڕووناکبیرە پێشکەوتووەکانی ئەو سەردەمە ( جان جاك ڕوســـۆو ڤۆلتێرو کانت[٢٦] و گەلێکی‌تر ) دەرویشانە لەوبڕوایەدا بوون کە لە مێشك‌و عەقڵ‌و هۆش بەولاوە هیچی‌تر نی‌یە بتوانێت پێوەندی نێوان شت‌و ڕوداو لێك‌بداتەوە . پێیان‌وابوو کار نی‌یە جڵەوی بەدەست عەقڵەوە نەبێت[٢٧] ، عەقڵیش گەر باش پەروەردە بکرێت هەمیشە بەلای چاکەدا خۆدەشکێنێتەوە . ئا لێرەدا بەرەوپێش‌چوونی ڕەوڕەوەی مێژوو لە بیری زانیاری‌پەروەرانی سەدەی هەژدەدا خۆ دەنوێنێت. ئەوان سووربوون لەسەر ئەوەی مێژوو ڕاناوەستێت ، هەمیشە بـــە زەبری «یاسای سروشت»و هێزی تەلیسماوی عەقڵ بەرەوپێش دەڕوات . لەخۆوە نەبوو کە زانای فەرەنسەیی جان ئەنتوان کۆندەرسی(١٧٤٣ـ١٧٩٧)یەکێك لە

---

٢٤ و ٢٥ ـ دەربارەی گرۆتیۆس‌و هۆبس بڕوانە لاپەڕە ٥٧ ـ ٥٨ .

٢٦ـ ژمارەیەك لە ڕوناکبیرانی سەدەی هەژدە لە نووسینەکانیاندا وشـــەی « زانیاری‌پەروەر »یان بەکارهێناوە کە ڤۆلتێر یەکێکیانە ، بەلام وەك زاراو دوای وتارێکی فەیلەسوفی ئەڵمانی کانت بە ناوی « زانیاری‌پەروەری چی‌یە »وە وەك زاراو جێگەی خۆی گرت .

٢٧ـ بۆیەکا زۆر جار بە سەدەی هەژدە دەگوترێت « چەرخی عەقڵ » .

بەرهەمەکانی خۆی ناونا « وێنەی نیگارە مێژوویی‌یەکانی بەرەوپێش‌چوونی عەقلی ئادەمیزاد » .

لایەنگرانی رێبازی زانیاری‌پەروەری دەیانگوت عەلقە جیاوازەکانی مێژوو یەك زنجیرەی گشتی پێك‌دەهێنن کە ئەویش مێژووی سەرتاپای ئادەمیزادو جیهانە . فەیلەسوفی فەرەنسەیی بەناوبانگ ، خاوەنی ژمارەیەك بەرهەمی مێژوویی[٢٨] فرانسوا ماری ڤۆلتێر ( ١٦٩٤ ــ ١٧٧٨ ) سوور بوو لەسەر پێویستیی دانانی مێژووی گشتیی ئادەمیزاد کە بەلایەوە یەکیەتی چارەنووس هەموویان لە بەرەیەکدا کۆدەکاتەوە . هەر ئەوەش پالی بە ڤۆلتێرەوە نا وێڕای ئەوروپا بایەخ بە مێژووی ئاسیاو ئەمەریکاو ئەفریقاش‌بدات .

زانیاری‌پەروەرانو بەر لە هەموان ڤۆلتێر بە چاوی زانست سەیری مێژوویان دەکرد ، بایەخی زۆریان بە سەرچاوە دەدا . جگە لە ژینامەی میرو پاشایان ئالوگۆڕو پێوەندی کۆمەلایەتی‌و باری ئابووری‌و دەسکەوتی زانیاری‌و گەلێك ڕووی تری ژیان سەرنجیانی ڕاکێشا . هەمان‌کات زانیاری‌پەروەران بایەخی زۆریان دا بە کاری شوێنی جوگرافی بۆ سەر ڕودوای مێژوویی . ڕوناکبیری بەناوبانگی فەرەنسەیی شارل لوی مۆتتسکیۆ ( ١٦٨٩ ــ ١٧٥٥ ) دەیگوت خاكو خۆلو ئاوو هەوا کاری زۆر دەکەنە سەر شێوازی ڕژێمی سیاسی .

زانیاری پەروەران کە دوژمنی باوەکوشتەی ڕژێمی دەرەبەگی بوون مێژوویان کردە یەکێك لە داردەستە کاریگەرەکانیان بۆ ڕیسوا کردنو هەلتەکاندنی دامودەزگای ئەو ڕژێمە . دیارە هەر بەو جۆرەش ، وەك

---

٢٨ــ وەك « فەلسەفەی مێژوو » ، « مێژووی فەرمانڕەوایی لویسی چواردەو لویسی پازدە » ، « مێژووی ڕوسیا لە ڕۆژگاری پەتروسی گەورەدا »و چەند بەرهەمێکی‌تر .

دەیانگوت ، مێژوو دەتوانێت دەوری گەورە لە پەروەردە کردنی عــەقڵو دامەزراندنی ڕژێمی بێقسوردا ببینێت ، چونکە ، وەك دەیانگوت ، مێژوو « قوتابخانەی ڕەوشتو سیاسەتە » • زانیاریپەروەران دەیانویست دوا موی پێوەندی نێوان کلێسەو مێژوو بپچڕێنن ، بە چاوی نزم ســەیری ســەدە ناونجییەکانیان دەکرد چونکە ڕۆژگاری برەوی کلێـسەو ڕژێمی دەرەبەگی بوون کە بەپێی قسەی ئەوان لە کۆتو زنجیرو خوێن بەولاوە شـتێکیتری ئەوتۆیان بە خۆیانەوە نەبینیوە • مێژوونووسی ئینگلیزی ئــەدوارد گیبۆن (١٧٣٧ ــ ١٧٩٧) کە تا ئیمرۆش قیبلەنومای گەلێك مێژوونووسی ڕۆژهەڵاتە دەیگوت کلێسە هەستی نیشتمانپەروەری لە گیانی مرۆڤدا ڕیشەکێش دەکات•

ڕێبازی زانیاریپەروەری لە سەدەی ڕابوردووشدا لە بەرهەمی ژمارەیەك مێژوونووسی بەناوبانگدا ڕەنگی دایەوە ، وەك زانــای ئەڵەمانی فەردریك کریستۆف شلۆسەر ( ١٧٧٦ ــ ١٨٦١ ) کە نووسینەکانی ئاشــکرا شــەقلی یەکیەتی مێژوویان پێوە دیارە ، وەك کتێبی « مێژووی سەدەی هەژدە » کە سالی ١٨٢٣ یەکەم دوو بەرگی لێ بلاوکردەوەو کتێبی « مێژووی جیهان » کە ١٩ بەرگەو لەنێوان ١٨٤٤و ١٨٥٧دا بلاویکردنەوە • لە نووسینەکانیدا شلۆسەر زۆر بەتوندی بەرپەرچی ئەو هێرشە فراوانەی دایەوە کــە تاقمێك نوسەری کۆنەپەرستی سەدەی نۆزدە کردیانە ســــەر زانیاریپەروەریو دەسکەوتەکانی شۆڕشە بۆرجوازییە گەورەکانی ئەوروپا •

جۆرج گۆتفرید گیرڤینوس ( ١٨٠٥ ــ ١٨٧١ ) کــە یەکێك بوو لــە قوتابیانی شلۆسەر تەنها بە نووسین پالی بە ڕەوڕەوەی مێژووەوە نەنا ، بەلکو بە کرداریش • لەسەر بیروباوەڕی لە زانکۆ دوورخرایەوە ، ســالی ١٨٤٧ دەســـتیکردە بلاوکردنــەوەی ڕۆژنامــــەی بەنــاوبانگی ئــەڵەمانی "Deutsche Zeitung" کــە دروشـــمی ســەرەکیی دامــەزراندنی ڕژێمی

یەکگرتووی نەتەوەیی پەرلەمانی بوو • مێژوو لای گێرڤینوس بۆپێشـــەوە بەرەو چەسپاندنی ئازادیو سەربەستی دەڕوات •

زانیاریپەروەری کە بۆ قۆناغی خۆی هەنگاوێکی گـــەورە بوو بۆ پێشەوە دەبوو تووشی کۆسپو ناحەزی زۆر بێت • ڕۆمانسییەکانی سەدەی نۆزدە لە هەموان زیاتر بەرهەڵستیی ئەو ڕێبازەیان کرد •



# ڕێبازی ڕۆمانسی

## له مێژوودا

**دوو ڕێبازی ڕۆمانسی • ئاشتی لای مایستەر • شاتۆبریان • دەسکەوتەکانی ڕێبازی ڕۆمانسی • بیۆکو نیبور • قوتابخانەی ڕانکه • هیلێنیزم •**

ئاحەزانی زانیاری پەرەوری کە بە ڕۆمانسی ناویان دەرکردووە[٢٩] سەدەی نۆزدە بە هەموو توانایانەوە کەوتنە پەلاماردانی بیروڕای زانایانی ئەو ڕێبازە • ئەمان ، بەپێچەوانەی ئەوانەوە ، داب‌و نەریتی ڕابوردوو کەوتە خولیایانەوە ، شەیدای سەدە ناونجی‌یەکان‌و دوژمنی باوەکوشتەی شۆڕشی فەرەنسی بوون[٣٠] • بەڵام لەو سەرنجەیاندا ڕۆمانسی‌یەکان دوو جۆر بوون، جۆرێکیان لە دەستەکانی سەرەوەی کۆمەڵ بوون ، ئەوانەی شۆڕشی فەرەنسی‌و ڕێبازی زانیاری پەروەری زۆری لێ سەندنەوە ، بەشەکەی تریشیان لە چین‌و دەستەکانی خوارەوەی کۆمەڵ بوون ، ئەوانەی شۆڕشی فەرەنسی شتێکی ئەوتۆی بۆ نەکردن •

دیارە ڕۆمانسی‌یەکان دەبوو دەست لە کاری زانستی مێژووش بدەن • لەمەدا دیسان سەرنجی ڕۆمانسی‌یەکان وەك یەك نەبوو ، لیبرالی‌یەکانیان پاڵیان بە ڕەوڕەوەی مێژووەوە نا ، کەچی کۆنەپەرستەکانیان ویستیان بەرەو دواوەی بگێڕنەوە •

---

٢٩ـ ئەو ڕێبازە ناوی « ڕۆمانتیزم » (Romantism)ە •
٣٠ـ بەشێکی زۆر لە ڕۆمانسی‌یەکان ، ئەوانە بوون کە کاتی خۆی لەناو شۆڕشی فەرەنسە هەڵهاتبوونە وڵاتانی تر •

ڕۆمانسی‌یە کۆنەپەرستەکان دەنگیان زوڵاڵ بوو • نووسەری فەرەنسی جوزێف دی مایستەر (Maistre) (١٧٥٣ ـ ١٨٢١) هەست و هۆش و قەڵەمی بۆ خزمەتی ڕژێمی دەرەبەگی و پاشا زۆردارەکانی ئەو سەردەمەی ئەوروپا تەرخان‌کرد • کۆنەپەرستیی مایستەر گەیشتبووە ڕادەی پشتگیری لێ کردنی دادگەکانی پشکنین[٣١] کە پەڵەیەکی ڕەشی یەکجار گەورەن لە مێژوودا • لە سەرەتای سەدەی ڕابوردوودا ، دوای ئەوەی زوربەی خەڵك وایان لێ‌هاتبو قێزیان لە کرداری پاپاکان و هەڵپەیان لەپێناوی دەسەڵاتی سیاسیدا دەهاتەوە ئەو داوای دامەزراندنی ڕژێمی فیدرالی پاشا کاتۆلیکەکانی ئەوروپای بە سەرکردایەتی پاپا دەکرد • لە کتێبی « شەوانی پەترسبورگ »دا مایستەر ئاشکرا چەپلەی بۆ شەڕی نێوان دەوڵەتان لێ دەدا ، بەلای ئەوەوە ئاشتی سەراوێکی دووری بیاباتێکی پان و بەرینە •

نووسەری فەرەنسی فرانسوا شاتۆبریان (Chateaubriand) (١٧٦٨ ـ ١٨٤٨) لە ڕۆژی یەکەمەوە دژی شۆڕشی گەورەی فەرەنسە وەستاو ناچار پەنای بردە بەر ئینگیلتەرە • لە بەرهەمەکانیدا بەپێچەوانەی زانیاری‌پەروەرانەوە سەیری شوێنی مرۆڤی لە ژیانی کۆمەڵدا دەکرد •

سیاسیی چالاکی ئینگلیز ئەدمۆند بورك (Burke) (١٧٢٩ ـ ١٧٩٧) هەرچەندە دژی بەهێزبوونی دەسەڵاتی پاشا بوو ، نووسینی دژی جۆرجی سێیەم و وەزیرەکانی هەبوو ، لایەنگری ڕێك‌کەوتن‌بوو لەگەڵ شۆڕشگێڕانی ئەمەریکادا ، کەچی لەگەڵ ئەوەش دژی شۆڕشی فەرەنسە بوو • بورك چەند کتێبێکی بۆ ئەو باسە تەرخان‌کردووە •

لەگەڵ هەموو هەڵەکانیاندا ئینجا ڕۆمانسی‌یەکان دەوریان لە دۆزینەوەی چەند یاسایەکی زانستی مێژوودا بینی • بەپێی بیروڕای ئەوان ڕوونکردنەوەی

---

٣١ـ محاكم التفتيش .

ـێژوو پێویستە لە ڕێگەی لێکۆڵینەوەی بەسەرهاتی گەل‌و نەتەوەوە بێت نەك
ـێکدانەوەی کردارو چالاکیی سەردارێك یا فەرمانڕەوایەکی ناودار • هەروەها
ـەتی بۆچوونی ئەوان هەر گەلە مێژووی تایبەتیی خۆی هەیە ، لەبەرئـەوە
ـێویستە مێژوونووس تەنها لە مێژووی نەتەوەیی وردبێتـەوە • بەلایانەوە
ـەڵقەکانی قۆناغی جیاوازی ئەو مێژووە پێکەوە بەســـتراون‌و دوا قۆناغ
ـەمیشە بەرهەمی بەرەوپێش‌چوونی قۆناغەکانی پێش خۆین • ڕۆمانسی‌یەکان
ـەو قوژبنەوە ڕەخنەی بەجێیان لە هەڵوەستی زانیاری‌پەروەران بەرامبـەر
ـە مێژووی سەدە ناونجی‌یەکان دەگرت • بێ‌گومان سەدە ناونجی‌یەکان تەنها
ـاریکستان نەبوون ، لاپەڕەو لایەنی ڕوناکیشیان هەبوو ، وانەبوایە ئادەمیزاد
ـەیدەتوانی پێ بنێتە قۆناغێکی پێشکەوتوترەوە • ڕۆمانسی‌یەکان دەیانگوت
ـێرۆی هەر گەلێك بەرهەمی ئاڵوگۆڕێکی دوورو درێژی لەســـەرخۆی
ڕابوردووە •

ڕۆمانسی‌یەکان بایەخی زۆریان بە مێژووی یاســاو دامودەزگای میری‌و
فۆلکلۆرو ســەرچاوەی کۆن داو بــەو کارەیان کەرەســەی باشــیان بۆ
لێکۆڵینەوەی قووڵی مێژوویی پێکەوەنا • گەڕانەوە بۆ بەرهــەمی ئەدەبیی
کۆن بەنیازی ڕوونکردنەوەی تۆماری مێژووی ڕابوردوو دەســکەوتێکی
گەورەی‌تر بوو کە ڕۆمانسی‌یەکان پێشکەش بە زانســتی مێژوویان کرد •
بەرهەمەکانی بیۆك‌و نیبورو ڕانکەو ژمارەیەك مێژوونووسی‌تری ئەڵەمانیا زۆر
کەلێنی ئەو مەیدانەیان پڕکردەوە • ئەدەب‌و مێژووی کۆنی گرێکی لە هەموو
شت زیاتر سەرنجی أ•بیۆکیان (Böckh) ( ١٧٨٥ – ١٨٦٧ ) ڕاکێشــا •
بیۆك گەلێك دەسکەوتی نوێی لە مەیدانی هەردوکیاندا پێشکەش بە زانستی
مێژوو کرد •

بارتۆلد نیبور (Niebuhr) ( ١٧٧٦ – ١٨٣١ ) کوڕی گەڕیدەو
ڕۆژهەڵاتناسی بەناوبانگی دانیمارکی کارستێن نیبورە کە سەدەی هــەژدە

هاتوته گەلێك مەڵبەندی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست • بارتۆلد نیبور کــە لــە ئەڵەمانیا ژیاوە لە چەند بەرگێکی گــەورەدا بەدرێژی باسی ئیمپراتۆریی ڕۆمانیی کردووەو گرێی زۆر لایەنی نەزانراوی مێژووی دورودرێژی ئــەو وڵاتە فراوانەی کردۆتەوە • بەرهەمەکانی نیبورو سەرنجەکانی خستویانەتە ڕیزی دامەزرێنەرانی لێکۆڵینەوەی ڕەخنەیی نوێی زانستی مێژوو •

قوتابخانەی بەناوبانگی ڕانکە یەکێکە لە بەرهەمەکانی ڕێبازی ڕۆمانسیی ئەڵەمانی • لیۆپۆلد فۆن ڕانکە (Ranke) ( ١٧٩٥ ــ ١٨٨٦ ) هەرچەندە تــا مۆخی ئێسقانی کۆنەپەرست بوو بەڵام لە ڕێبــــازی لێکۆڵینــەوەی مێژوویدا ، لە هەڵبژاردنی ئەمرازی ئەو لێکۆڵینەوەیەدا گەلێك پێشڕەوی زانستیانەی کرد • بەر لە هەموو شت ڕانکە بایەخێکی یەکجار زۆری بــە بەڵگە کۆنەکانی ناو ئەرشیفەکان دا • ڕانکە گەیشتبووە ئــەو باوەڕە کــە مێژوونووس دەتوانێت لەناو ئەو بەڵگانەدا ڕاستی بدۆزێتەوە بە مەرجێك بە چاوی ڕەخنەی وردەوە سەیریان بکات• قسەو دەنگوباوی خەڵك لای ڕانکە بایەخیان نەبوو چونکە ، وەك دەیگوت ، درۆ ، خۆهەڵکێشان ، پێوەنان . شاردنەوەو شتی تری وایان لێ دەوەشێتەوە •

زۆربەی مێژوونووسانی ئەڵەمانیا بوونە دەروێشی قوتابخانەی ڕانکە کە لە هەمووشت زیاتر بایەخی بە مێژووی سیاسیو یاسا دەدا • هەرچەندە ڕانکە بۆ خۆی تێکەڵکردنی سیاسەتو زانستی مێژووی لا بەجێنەبوو ، کــەچی قوتابییەکانی ئەو تێکەڵکردنەیان بەلاوە پەسندو پێویست بوو • گوستاف درۆیزێن (Droysen) ( ١٨٠٨ ــ ١٨٨٤ ) کتێبێکی پێنج بەرگیی تەنها بۆ باسی « مێژووی سیاسەتی پروســیا » تەرخانکرد • درۆیزێن تەنانەت لەو بەرهەمانەشیدا کە لە ڕوداوەکانی یۆنانی کۆن دەدوێن بایەخی تەنها بە مێژووی سیاسی داوە • چ ئەوو چ هاوەڵەکانی کوێرانە سەیری هەستی نەتەوەیییان دەکردو دەسەڵاتی میرییان بە هێزی بزوێنــەری بەرودوای مێژوو دادەناو

ـتـێری مەیدان بەلایانەوە تەنها دەوڵەتی پروسی بوو ، لـە فەرهەنگی ئەواندا ـێـوی داناو دانسقە لە فەرەدریکی گەورەو بسمارکو ئـەوانەی وەك ئەوان ـ بوون بەولاوە کەسێکی‌تر نەبوو •

لەگەڵ ئەو تەسك‌بینی‌یەشیاندا مێژوونووسانی قوتابخانەی ڕانکە ، وەك ڕانکـە خۆی دەوریـان لـە پێشخستنی مێـــژوودا کـەم نـەبوو • درۆیزێن یەکەم کەسـە زاراوی هێلێنیی[٣٢] بەکارهێنـــاوەو کەلێنێکی گەورەی مێژووی یۆنانی کۆنی پڕ کردۆتەوە ، تایبەت لەو کتێبەیدا کە لـە دوو بەرگدا بە ناوی « مێژووی هێلێنیزم »ەوە بلاوی‌کردۆتەوە •

سەدەی نۆزدە جگە لە ڕێبازی ڕۆمانسی گەلێك ڕێبازی ڕوناکبیریی کاریگەری‌تری بەخۆیەوە بینی کە هەر یەکەیان بەجۆرێك پەلی بۆ زانستی مێژوو هاویشت •

---

٣٢ـ مەبەســـت لە هێلێنی ( هێلێنیزم (Hellenism مێژووی ڕۆژهەڵاتی دەریای سپیی ناوەڕاستە لە ڕۆژگاری دەسەڵاتی ئەسکەندەرەوە لـــەو ناوچەیەدا تا داگیرکردنی میسر لەلایەن ڕۆمانەکانەوە ، واتە لە دەوروبەری کۆتای سـەدەی چوارەمی پێش عیساوە تاوەکو سالی ٣٠ی پێش عیسا . مەبەست لە هێلێنی‌یەکان یۆنانو مەکەدۆنی‌یە کۆنەکانە .

# مێژوو لە تەرازووی سۆشیالیزمی

## یۆتۆپیو ڕێبازی لیبرالیدا

**سان سیمۆن . هێزە بزوێنەرەکانی مێژوو . خەباتی چینایەتی .**

لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەدا بیروباوەڕی سۆشیالیزمی یۆتۆپی[٣٢] کە ئەوساکە لەبرەودا بوو ، مێژوویشی گرتەوە . بایەخدانی سان سیمۆن ( ١٧٦٠ ــ ١٨٢٥ )و شارل فۆریە ( ١٧٧٢ ــ ١٨٣٧ )و ڕۆبەرت ئۆوین ( ١٧٧١ ــ ١٨٥٨ )و سۆشیالیستە یۆتۆپییەکانیتر بە چینو دەستەکانی خوارەوەی کۆمەڵ سەرنجی مێژوونووسانی زیاتر بۆ ڕاکێشان . هەرچی سانسیمۆنە لە باسی خەباتی چینایەتی وەك هێزی بزوێنەری مێژوو زۆر نزیككەوتەوەو بە پێوانەی ئەو خەباتە گەلێك لایەنی مێژووی ئینگیلتەرەو فەرەنسەی لێكدایەوە . دوای لێکۆلینەوەو بەراورد زانایانی ڕێبازی سۆشیالیزمی یۆتۆپی هاتنە سەر ئەو بڕوایەی کە ئادەمیزاد قۆناغی جیاوازی مێژوویی بڕیوەو دەیبڕێتو بەگشتی هەر قۆناغە لەگەڵ دەزگاکانیدا لە قۆناغی پێش خۆی پێشکەوتوترە ، کە ئاڵوگۆڕی مێژووییو بەرەوپێشچوونی بەپێی کاتو شوێن دەگۆڕێتو ئەو گۆڕانەش دەبێتە هۆی لەدایكبوونی هەمەجۆر دامودەزگای نوێ ، کە باری ئابووریو ناکۆکیی چینایەتیو بیرو

---

٣٢ــ سۆشیالیزمی یۆتۆپی ( الاشتراكية الطوباوية ، الاشتراكية المثالية ) یەکێکە لە ڕێبازەکانی سۆشیالیزم کە لە سەدەی شازدەوە پەیدا بووە ، بە ناوی کتێبی « یۆتۆپیا »ی تۆماس مۆرەوە ناونراوە . ڕابەرانی ئەم ڕێبازە لە ئاسمانی بەرزی خەیاڵدا بەهەشتیان بۆ مرۆڤ دامەزراندووە .

هۆشی ئادەمیزادو فەلسەفە هێزی بزوێنەری بنەڕەتیی ڕوداوی مێژووین ، کە دوارۆژ بۆ سۆشیالیزمە .

وەك وتمان سان‌سیمۆن لە هەموان زیاتر باسی خەبات‌و ناکوکیی نێوان چینەکانی کۆمەلی دەکرد . سان سیمۆن دوای لێکدانەوەو یەکالاکردنەوەی ڕوداوەکانی شـۆڕشی گەورەی فەرەنســە لـە بایـەخی مێژوویی ئـەو خەباتە تێگەیشت .

شایانی باسە بۆچوونەکانی سان سیمۆن کاریان‌کردە سەرژمـــارەیەك مێژوونووسی لیبرالیی ئەو سەردەمەی ئەوروپا.ئۆگۆستین تیێری (Thierry) ( ١٧٩٥ ــ ١٨٥٦ ) خۆی بە کوڕی هەلبژاردەی سان سیمۆن دادەنا ، بـۆ ماوەیەکیش سکرتێری بوو . تیێری دەیگوت پێویستە مێژوو « ژینامـــەی کۆمەلانی خەلك » نەك « ژینامەی میری » بێت ، دەیگوت گـەل هــەوێنی ڕوداوی مێژووی‌یە ، خەباتی بۆرجوازی‌و جوتیار دژی دەرەبەگ‌و کلێـسە ناوەڕۆکی ئالۆگۆڕی‌یە . تیێری لەڕادەبەدەر بایەخی بە شێوازی نووسینی مێژوویی دەدا . گێڕانەوەی ڕابوردوو بە زوبانێکی ڕازاوەی شیرین‌و پتەو لای تیێری ئەرکی یەکەمی مێژوونووسە . بایەخ‌دانی زۆری بـــە خەباتی چینایەتی وای لە یەکێکی وەك مارکس کرد ناوی بنێت « باوکی خـەباتی چینایەتی لە زانستی مێژووی فەرەنسیدا » .

فرانسوا پیێر گیزۆی (Guizot) ( ١٧٨٧ ــ ١٨٧٤ ) مێژوونووسی فەرەنسەیی هەرچەندە لایەنگری ڕژێمی پاشایەتی بوو بەلام لە نووسینەکانیدا بەئاشکرا پەنجەی بۆ خەباتی چینایەتی وەك هێـــزێکی بزوێنـــەری ڕوداو ڕادەکێشا.بەوێنە شۆڕشی فەرەنسە بەلایەوە ئەنجامی ناکۆکی‌و خەباتی نێوان « ئەشراف‌و چینی سێیەم » بوو . لە کتێبی « مێژووی ژیاری‌ی فەرەنسە»دا بەدرێژی باسی دەوری گەورەی چینی بۆرجوازیی لـــە ڕوخاندنی ڕژێمی دەرەبەگیی ئەو ولاتەدا کردووە . گیزۆ بە داهێنەری تیۆری‌ی « خەبـات

ھێوان سەرکەوتوو و ژێرکەوتو »دا دادەنرێت کە سەدەی نۆزدە گەلێك کاری کردە سەر مێژوونووسانی ئەوروپا ٠

ئەدۆلف تیێر (Thiers) (١٧٩٧ ــ ١٨٧٧) لەگەڵ ئەوەش کە دەستی بە خوێنی لایەنگرانی « کۆمۆنەی پاریس » سوور بوو[٣٤] بەڵام مێژوونوسێکی گەورەی سەردەمی خۆی بوو ٠ « مێژووی شۆڕشی فەرەنسە »ی تیێر ١٠ بەرگە ٠ لەو بەرھەمەیدا تیێر خەباتی چینایەتیی کردۆتە بەردی بناغەی ڕوداوەکانی شۆڕش ٠

بێگومان ئەم زانایانەو ھاوەڵەکانیان دەوریان لە بەرەوپیش بردنی زانستی مێژوودا بینی ، بەڵام بەرامبەر بەوە ھەڵەشیان زۆر بوو ٠ ھیوایان ھەبوو زوو ھەلوەستی خۆی دەگۆڕی ٠ گیزۆ لە بەرگی یەکەمی « مێژووی شۆڕشی ئینگلیزی »دا ڕوداوە شۆڕشگێڕییەکانی سالی ١٦٤٠ی بەرز نرخاندووە ، ھەڵواسینی شارلی یەکەمی پاشای ئەو سەردەمەی ئینگیلتەرەی بە کارێکی ڕەوا لەقەڵەمداوە ، کەچی لەدوا بەرگەکانی ھەمان بەرھەمیدا پاشگەزبۆتەوەو ھەڵواسینی شارلی بە کارێکی بێجێو نالەبار داناوە ٠ ئەدۆلف تیێر بەر لە مردنی زۆر شوێنی « مێژووی شۆڕشی فەرەنسە »کەی گۆڕی ٠ وێڕای ئەوە تیێر ھەمیشە لەگەڵ سەرکەوتو بوو، ئەوەی خستیە گێژاوی ھەڵسەنگاندنی لەیەك نەچوو ٠ ئۆگەستین تیێری بەپێچەوانەی ھاوبیرەکانیەوە سەیری مێژووی سەدە ناوەنجییەکانی دەکرد، واتە بە دەستووری زانیاریپەروەران تەنھا زۆرداری و خوێنڕێژیی لەو مێژووەدا دەبینی ٠

گەلێك مێژوونووسی سەدەی نۆزدە زۆر یا کەم کەوتنە ژێر کاری بیروڕای ھیگڵ و مارکسەوە ، تایبەت مێژوونوسە لیبرالییەکان کە جارێکی‌تر دێینەوە سەرباسیان ٠

---

٣٤ــ سالی ١٨٧١ کە « کۆمۆنەی پاریس » دامەزرا ئەدۆلف تیێر سەرەك دەوڵەت بوو ، لەشکری فەرەنسە بە فەرمانی ئەو کۆمۆنەی لە خوێندا نقوم کرد ٠

# مێژوو لای هیگڵو مارکس

**یۆنانی کۆن لای هیگل . ناکۆکی‌یەکانی نـاو کۆمـەڵ . گیانی گەل . دیسان خەباتی چینایەتی .**

سەدەی نۆزدە کەس نەیتوانی بەڕادەی فەیلەسوفی بەناوبانگی ئەڵەمانی جۆرج ولهێلم فەرەدریك هیگل ( ١٧٧٠ ــ ١٨٣١ ) کـار بکاتە سـەر مێژوونووسانی ئەوروپا . هیگل ، وەك ئینگلس دەڵێت ، یەکەم کەسـە هەوڵی‌داوە ئاڵوگۆڕە ناوخۆکانی مێژوو دەستنیشان بکات . هیگل زۆر زوو کەوتە بایەخ‌دان بە مێژوو کە بە لای ئەوەوە لە سەردەمی گرێکەکان ( یۆنانە کۆنەکان )ەوە دەست‌پێ‌دەکات . سەرەتا هیگل بە چاوی لانـەی ئازادیو دیموکراسی سەیری یۆنانستانی دێرینی دەکرد . قۆناغی دووەمی زۆرداریو بێ‌بەشـانی لەگـەڵ نەمـانی شـارستانەتیی گرێکەکاندا دەست‌پێ‌دەکاتو بە سەردەمی خۆی ( هیگل ) کۆتایی دێت . لـە قۆناغی سێیەمدا دەبێت ئازادیو سەربەستیی ئادەمیزاد بگەڕێتـەوە دۆخەکەی جارانی ، واتە ڕۆژگاری گرێکەکان .

زۆری نەبرد هیگل دەرکی بەوە کرد کە تەنانەت ئـەو ڕۆژگارەش ئازادیی ڕاستەقینە لەئارادا نەبوو ، هەزاران کۆیلە لەژێر سایەی گرێکەکاندا گیرۆدەی دەستی زوڵمو زۆرو چەوساندنەوە بوون . کەواتە دەبوو خۆری شارستانەتی یۆنانستانی کۆن ئاوا بێت ، ئاوابوونیشی بۆپێشـەوە چوونی بەدەمەوە بوو . بە هەمان دەستوور هیگل ڕژێمی دەرەبەگیو هەموو سەدە ناونجی‌یەکانی نرخاند . هـەر ئەوەش بۆ خۆی وای‌لێ‌کرد بەگـەرمی پێشوازیی شۆڕشی گەورەی فەرەنسە بکاتو تەنانەت پێی خۆش بێت کە

لەشکری ناپلیۆن هاتە ناو خاکی ئەڵەمانیای نیشتمانی‌یەوە چونکە لەو وابوو هەتی ناپلیۆن دەبێتە هۆی هەرەس هێنانی تەواوەتی ڕژێمی دەرەبەگی .

هەمان‌کات هیگل هەستی بە ناکۆکی‌یەکانی ناو کۆمەڵ کردو بە هێزی بزوێنەری بەرەوپێش‌چوونی مێژووی لەقەڵەم دان ، تایبەت بە چاوی خۆی دەیبینی چۆن لەژێر سایەی بۆرجوازی‌یەکانیشدا سەروەت‌و سامان لەلایەك‌و برسێتی‌و هەژاریش لە لایەکی‌تر کۆدەبنەوە . ئەم ڕاستی‌یە کاردەکاتە سەر ڕەفتاری ئادەمیزاد کە هەمیشە عەودالی بەختیاری‌یە ، ئەنجام گۆڕین دروست‌دەبێت . لەم‌بارەیەوە هیگل نووسیویە دەڵێت : « مێژووی جیهان گۆڕەپانی بەختەوەری نی‌یە . دەورانی بەختەوەری لەو مێژووەدا لاپەڕەی نەنووسراوەن چونکە ... لەودەورانەدا ناکۆکی نەبووە». کەواتە ناکۆکی‌و گەڕان بەدوای سەرفرازیدا هێزی بزوێنەری ڕوداوی مێژوویین .

هیگل لەوەش گەیشت کە کەس نی‌یە بتوانێت ڕەوڕەوەی مێژوو بەرەوپاش بگێڕێتەوە ، ئەوەی بۆ سەردەمی خۆی بۆچوونێکی ورد بوو . بەوچاوە هیگل سەیری کەوتنی ناپلیۆن‌و سەرکەوتنی پاشا زۆردارەکانی ئەوروپای دەکرد . کەوتنی ناپلیۆنی بە دڵ پێ ناخۆش بوو ، بەڵام لەوەش دڵنیا بوو کە « گەڕانەوە بۆ کۆن نی‌یەو نابێت » .

لەگەڵ ئەو هەموو بۆچوونەیدا لە مەیدانی مێژوودا ئینجا لە چەند لێکدانەوەیەکیدا هیگل نیشانی نەپێکاوە . لە نووسینەکانیدا باسی «گیانی گەل » دەکات کە گوایە یەکیەتی یاساو دامودەزگای میری‌و ئایین‌و هونەرو فەلسەفە مسۆگەر دەکات‌و لە چواردەوری خۆی کۆیان‌دەکاتەوە . هەر لەو قوژبنەشەوە سەیری دەوری گەل لە پێشخستنی مێژوودا دەکات‌و دەڵێت گوایە لە هەر قۆناغ‌و سەردەمێکدا یەکێك لە گەلانی جیهان ئەرکی ئەو پێشخستنەی دەکەوێتە ئەستۆ ، بەوجۆرە گیانی هەموو جیهان لەو گەلەدا کۆدەبێتەوە . هەرچی گەلانی‌ترە یا دەوریان لە مێژوودا تەواو بووە یا

هێشتا نۆرەیان نەهاتووە • کە دێتە سەر شیکردنەوەی ئەم ڕایەی هیگل سەرتاپای گەلانی ڕۆژهەڵات لە مەیدان دووردەخاتەوە چونکە ئەوان ، وەك دەڵێت،دان بە مافی تاکە کەسێکدا دەنێن کە بەسەر لوتکەی دەسەڵاتەوەیە، یۆنان‌و ڕۆمانەکانیش مافیاندەدا بە دەستەو تاقمێکی کەم • کەواتە لە ئەڵەمانەکان بەولاوە کەس لە مەیداندا نامێنێت شایەنی ئەوە بێت جڵەوی جیهان بگرێتە دەست • ئەوان ، واتە ئەڵەمانەکان ، بەهۆی ئایینی عیسایی‌یەوە گەیشتونەتە ئەو بڕوایەی مرۆڤ بۆ خۆی چۆنە دەبێت وەها ئازاد بێت • هەمان‌کات هیگل ڕژێمی پاشایی دەستووربەندی پەسندکردو فەرەدریکی دووەمی پاشای پروسیا بۆی بووە نمونە • لە هەمووشی خراپتر ئەوەیە کە شەڕ بە لای هیگلەوە دیاردەیەکی پێویستی ژیانی کۆمەڵە •

مارکس‌و ئێنگلس زۆر لایەنی بیری هیگلیان دەربارەی فەلسەفەو مێژوو وەرگرت ، دیوە ئاوەژووەکانیشیان هەڵگێڕایەوە • ئەمان سەرتاپای ئاڵوگۆڕی ژیانی مرۆڤ‌و بەرەوپێش‌چوونی مێژوویان بەست بە بەرهەم‌هێنان‌و هۆکانی‌یەوە کە جۆری جیاوازیان لە قۆناغی جیاوازدا لێ پەیدا دەبێت ، گەشە دەکەن‌و ئینجا دەمرن تا ڕێگە بۆ لە هی خۆیان باشتر خۆش بکەن • یەك ڕێبازی بەرەوپێش‌چوونی مێژوو هەیە بـا شێوازو ڕووکەشیش جیاوازو ڕەنگاوڕەنگ بن • جیاوازی لەنێوان گەلاندا نی‌یە، هەریەکەیان دەتوانێت لە یەك جۆر باری ژیاندا بەگشتی یەك دەور ببینێت، خەباتی چینایەتی لایان بڕبڕەی ئاڵوگۆڕی ڕوداوی مێژوویی‌یە ، ئەنجامیشی وەرچەرخانی باری ئابووری‌و دەسەڵاتی سیاسی‌یە کە لە چینێکی پاشکەوتووەوە دەچێتە دەست چینێکی پێشکەوتوتر : لە خاوەن کۆیلەوە بۆ دەرەبەگ‌و لە دەرەبەگەوە بۆ بۆرجوازی‌و لەمیشەوە بۆ پرۆلیتاریا •

لەبەر ڕوشـــنایی ئەم بۆچوونەیاندا مارکس‌و ئێنگلس زۆر ڕووی مێژووی ئەوروپای پێش سەرمایەداری‌و تایبەت پاش ســـەرمایەداری‌یان نی‌کردەوە ، وەك لە کتێبی « خەباتی چینـــایەتی لە فەرەنسە »ی مارکس‌و « شەڕی جوتیاران لە ئەڵەمانیا »ی ئێنگلس‌و گـــەلێك بەرهـــەمی‌تریاندا بەدی‌دەکرێت ٠

بیروباوەڕی فەلسـەفیی هیگل‌و مارکس‌و ئێنگلس ڕێگەیان بۆ پێشکەوتنی زانستی مێژوو لە جاران خۆشتر کرد ، ئەوەی لە بەرهەمی مێژوونووسانی نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەدا ڕەنگی دایەوە ٠



# زانستی مێژوو لە نیوەی
## دووەمی سەدەی نۆزدەدا

**گۆڤارو ڕێکخراوی مێژوویی . پێتی هیرۆگلیفو مێخی. مێژوونووسانی ئەڵمان . دووەم شۆڕشی ئەمریکا . بورکخاردت . مۆرگانو ماوریر .**

لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەدا زانستی مێژوو هەنگاوی گەورەی بەرەوپێشەوە نا . لێکۆڵینەوەی مێژوویی زیاتر بەرگی زانستیی پۆشـــی ، باسەکانی لە جاران بە ژمارە زۆرو بە ناونیشـــان فراوانو بـــە ناوەرۆك دەوڵەمەندتر بوون . مێژوونووسان زیاتر کەوتنە بایەخ دان بە سەرچاوەو کۆکردنەوەی بەڵگەی مێژوویی‌و بڵاو کردنەوەیانو بەکارهێنانیـــان بـــۆ ڕوونکردنەوەی لایەنی جیاوازی مێژووی گەلان . مێژوو سەرنجی هەموو دەزگا زانستی‌یەکانی وڵاتە پێشکەوتووەکانی ڕاکێشاو یەك لەدوای یەك بەشی تایبەتی‌یان بۆ خوێندنو لێکۆڵینەوەی دامەزراند .

هەرچەندە سەرەتای دامەزراندنی کۆمـــەڵو ڕێکخراوی تایبەتیی مێژوونووسان بەر پێش سەدەی نۆزدە دەکەوێت[٣٥] ، بـــەڵام لە نیوەی دووەمی ئەو سەدەیەوە ژمارەو سەنگیان زیاتر بوو ، کەوتنـــە کۆکردنەوەو چاپکردنی سەرچاوەی مێژوویی‌و بەستنی کۆنگرەی ساڵانەو بڵاوکردنەوەی

---

٣٥- ساڵی ١٦٣٠ لە بەلچیکا یەکەم کۆمەڵی مێژوونووسانو دوای ئەو لـــە دانیمارك ساڵی ١٧٤٥و ئینجا لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا ســـاڵی ١٧٩١و دوابەدوای ئەوان لە وڵاتانی ئەورووپا ژمارەیەك کۆمەڵی لەوجۆرە دامەزرێنران .

ئۆرگانی تایبەتیو ئەو جۆرە چالاکییانە کــە بێگومان بوونە هۆی خێرا کردنی بەرەوپێشچوونی زانستی مێژوو •

هەر ئەو دەوروبەرەش لە ولاتە پێشکەوتووەکان ژمارەیەك گۆڤاری مێژوویی کەوتنە دەرچوون ، وەك « گۆڤاری مێژوویی » کــە لە دانیمارك سالی ١٨٤٠و لە ئەلەمانیا سالی ١٨٥٩و لە نەرویج سالی ١٨٧١و لە فەرەنسە سالی ١٨٧٦و لە سوید سالی ١٨٨١ دەستکرا بە بلاوکردنەوەیان • سالی ١٨٦٣ « ئەرشیفی ڕووسی »و سالی ١٨٧٠ « دێرینی ڕووسیا »و سالی ١٨٧٥ « کۆنو نوێی ڕووسیا »و سالی ١٨٨٤ « گۆڤاری مێژوویی ئیتالیایی »و سالی ١٨٨٦ « گۆڤاری مێژوویی ئینگلیزی »و ســالی ١٨٩٥ « گۆڤاری مێژوویی ئەمەریکایی »و بەرودوای ئەوان لە پۆلۆنیاو هەنگاریاو چەنــد ولاتێکیتر ژمارەیەك گۆڤاری مێژوویی سەربەخۆ هەریەکەیان بەناوێکەوە هاتنە چاپکردن •

پێوەندی نێوان مێژوونووسانی ولاتانی جیهان زۆر لە جاران بەهێزتر بوو • لە هەموو لاوە مێژوونووسان کەوتنە ئالوگۆڕی نامەو سەرچاوەو دەسنووسی دەگمەن ، ئەو کارەی بووە هۆی لەدایكبوونی گەلێك بەرهەمی نایاب • بەرە بەرە پێوەندی نێوان مێژوونووسانی جیهان شێوەی ڕێکخراوی وەرگرت • بەوێنە ڕۆژهەلاتناسانی ئەوروپا سالی ١٨٧٣ یەکەم کۆنگرەی خۆیان لە پاریس بەست کە هەنگاوێکی گەورەونوێ بوو لە مەیدانی زانستی مێژوودا • وەك دوایی باسی دەکەین زۆری نەبرد بە هەمــان دەستوور مێژوونووسانی جیهانیش کەوتنە بەستنی کۆنگرەی تایبەتیی خۆیان •

هەموو ئەمانە بەسەریەکەوە شانبەشانی چەند هۆیەکی یاریدەریتــر بەجارێك ڕێگەیان بۆ پێشخستنی زانستی مێژوو خۆشکرد • دەسکەوتی مێژوونووسانی نیوەی دووەمی ســەدەی نۆزدە زۆرو جۆراو جۆر بوو • بەوێنە ئارکیۆلۆجیستەکانی ئەو سەردەمە گەیشتنە گەلێك ئەنجامی گرنگ•

ـسته زانایان سەرەتای سەدەی نۆزدە توانی‌یان پیتـــەکانی نووســینی هیرۆگلیفی[36]و نووسینی مێخی‌ی[37] کۆن بخوێننەوە ، بەڵام تەنها لـە یوەی دووەمی ئەو سەدەیەداو بەدواوە هـەرچی پێوەندی‌دار بوو بـەو مەسەلەیەوە بەتەواوەتی ساغ کرایەوە .

بەوێنە بازرگانی ئیتالیایی پیترۆ دیلا ڤالا یەکەم کەس بوو کە سەدەی حەڤدە هەستی کرد ئەو مێخ نیگارانەی لەســەر پاشــــاوە کۆنینەکان هەڵکەندراون نەقشی ڕازاندنەوە نین وەك دەڵێن ، بەڵکو پیتی نووسینن . ساڵی ١٨٠٢ زانای ئەڵەمانی جورج فەرەدریك گرۆتفێنـد (Grotefend) ( ١٧٧٥ ـ ١٨٥٣ ) لە ٣٢ تەنها ٩ پیتی نووسینی مێخیی خوێندەوە . بەڵام ئەو کارە گرنگەی زانای ئەڵەمانی تـا نیوەی دووەمی ســـەدەی نۆزدە دەنگی‌نەدایەوە ، ئەو کاتەی زانایان توانی‌یان پیتەکانی‌تری نووسینی مێخی بەدروستی بخوێننەوە . ساڵی ١٨٥٧ چەند زانایەکی ئینگلیزو فەرەنسەیی لە یەك‌کاتدا بێ‌ئەوەی کەسیان ئاگای لەوانی‌تریان بێت توانی‌یان یەك پارچە نووسراوی ئاشووری وەك یەك بخوێننەوەو وەری‌بگێڕنە سەر فەرەنسی‌و ئینگلیزی . دوای ئەوە ئیتر گومـــان لە ڕاستیی خوێندنەوەی‌نووسینی

---

٣٦ـ هیرۆگلیفی لە دوو وشەی یۆنانی پێکهاتووە : (hierós) کە مانای پیرۆزەو (glyphe) کە مانای هەڵکەندراوە ، بە لێکدراوی مانـــای نووسینی هەڵکەندراوی پیرۆز لەسەر بەرد دەگەیێنێ . کۆنترین نووسینی هیرۆگلیفی میسری‌یەکان دەوروبەری ٥ هەزارو ٢٠٠ ســـاڵ لەمەوبەر بەکاریان هێناوە . زانای فەرەنسەیی شامپلیۆن بیستەکانی ســـەدەی نۆزدە پیتەکانی خوێندنەوە . هیرۆگلیفی بـە نووســـینی کۆنی تـریش دەگوترێت ، وەك نووسینی کریتی‌و حیثی‌یەکان . ئائیستەش بە نووسینی چینی‌و ژاپۆنی‌و زۆربەی گەلانی‌تری ڕۆژهەڵاتی دوور دەگوترێت نووسینی هیرۆگلیفی .

٣٧ـ سۆمەری‌یەکان یەکەم کەسن کە پتر لە ٥ هەزار ساڵ لەمەوبەر نووســینی مێخی‌یان بەکارهێناوەو لەوانەوە بۆ زۆربەی گەلانی ڕۆژهەڵاتی نزیك‌و ناوەڕاست ماوەتەوە .

مێخیدا نەما ، ئەو کارەی بەتەواوەتی ڕێگـــەی بـۆ ڕوونکـردنەوەی شارستانەتی‌یە دێرینەکانی ڕۆژهەلآت خۆش‌کرد •

لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەدا ئەڵەمانیـــا ببووە پێشـەنگی لێکۆڵینەوەی مێژوویی • لەوێ « قوتابخانەی مێژوویی لـــە ئـابووری سیاسی»دا پەیدابوو کە کاری کردە سەر لێکۆڵینەوەی ژمارەیەك لە زانایانی مێژووش ، ئەوانەی کەوتنە بایەخدانی تایبەتی بەو باسانەی پێوەندیان بـە ژیانی ئابووری‌و کۆمەلآیەتی‌یەوە هەیە • گەلێکیان بەوردی لـە مێژووی شارو پیشەسازی‌و بزوتنەوەی کرێکاران‌و ئەو جۆرە باسانەی ســـەدە ناونجی‌یەکان‌و سەردەمی نوێ کۆڵینەوە• گوستاف شمولێر (Schmoller) ( ١٨٣٨ ــ ١٩١٧ ) کە لە هەرە بەناوبانگەکانی ئەو ڕێبازە بوو گەلێك لایەنی ژیانی کۆمەلآیەتی‌و ئابووریی ئەوروپای ڕۆژئاوای ســـەدە ناونجی‌یەکان‌و سەردەمی نوێی بۆ خستوینەتە چوارچێوەی مێژووەوە • کارل تیۆدۆر فۆن ئینامە ــ شتێرنێگی (Inama - Sternegg) ( ١٨٤٣ ــ ١٩٠٨ ) هـاوەڵ‌و هاوبیری شمۆلێر توانی چەند لایەنێکی گرنگی مێژووی ئەو ئاڵوگۆڕانـە ڕوون‌بکاتەوە کە بەسەر خاوەنی‌یەتی زەوی‌وزاری ئەڵەمانیادا هاتوون • کارل بیوخەر (Bücher) ( ١٨٤٧ ــ ١٩٣٠ ) بەوردی باری ژیانی شارەکانی ئەوروپای سەدە ناونجی‌یەکانی ڕوون کردەوە• بیوخەر سەلماندی کە ژمارەی دانیشتوانی شارە گەورەکانی ئەو سەردەمە بەدەگمـــەن لـە ٢٥ هەزار تێدەپەڕی •

ئەم جۆرە باسانە لە دەرەوەی ئەڵەمانیاش سەریان دەرهێنا • خاوەنی یەکەم گۆڤاری مێژوویی لە فەرەنسەو دامەزرێنەری « کۆمەڵەی مێژووی پاریس » و ئەندامی کۆڕی زانیاری گوســـتاف فانییـــز (Fagniez) ( ١٨٤٧ ــ ١٩٢٧ ) چەند بەرهەمێکی دەربارەی ژیانی کۆمەلآیەتی‌و ئابووریی فەرەنسەی نێوانی سەدەی سیازدەو حەڤدە داناو گەلێك بەڵگەی بایەخداری

سەرەت بە پێوەندی بازرگانیو بەرهەمی پیشەسازیی ئـەو ڕۆژگارەی
هەرنسە بڵاوکردەوە.بە لای مێژوونووسی ئەمەریکایی فەرەدریك جاکسۆن
تورنێرموە (Turner) ( ١٨٦١ ـــ ١٩٣٢ ) ئاوەدان کردنەوەی ڕۆژئاوای
ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا هەوێنی زوربەی هـەرە زۆری ئاڵوگۆڕە
مێژوویی‌یەکانی ئـەو وڵاتە بـوو • ئـەو دەیگوت ڕێبازی دیموکراسیی
ئەمەریکایی لە دەرەوە نەهاتووە ، لە «دارستانەکانی خودی وڵات» خۆیەوە
سەری دەرهێناوە •

لە هەمـان قوژبنەوە چارلس ئۆسـتین بـیرد (Beard) (١٨٧٤ ـــ
١٩٤٨) سەیری ڕابوردووی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکای دەکرد •بیرد
خۆی یەكلایەنیی لێکدانەوەو ڕەگەزپەرستیی بوو ، یەکەم مێژوونووسە کە
شەڕی براکوژیی ١٨٦١ ـــ ١٨٦٥ی ناوناوە «دووەم شۆڕشی ئەمەریکا» [٣٨]
بیردو تورنێرو هاوبیرەکانیان بـەر لـە کەسانیتر کەوتنە سۆراخی هۆی
ئابووریی ڕوداوە گەورەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا •

وێڕای ئەوانەی باسمانکردن مێژوونووسـە لیبرالی‌یەکانی نیوەی
دووەمی سەدەی نۆزدە لەڕادەبەدەر دیموکراسیی سیاسیی گریکەکانیان بەرز
دەنرخاند • لەو کتێبەیدا کە بە ناوی « مێژووی یۆنان »ەوە لە ١٢ بەرگدا
بڵاویکردۆتەوە ئەو دیموکراسی‌یە سەرنجی مێژوونووسی ڕادیکالی ئینگلیز
جۆرج گرۆتی (Grote) ( ١٧٩٤ ـــ ١٨٧١ ) وەها ڕاکێشاوە کـە زۆر
لایەنی ژیانی کۆیلەیی ئەو قۆناغەی لەبیر بردۆتەوە ، بەڵام هەمانکات گرۆت
گەلێك ڕووی گرنگی مێژووی سیاسیی یۆنانی کۆنی بەوردی شیکردۆتەوەو
چەند بیرێکی نوێی دەربارەی هێناوەتە کایەوە •

---

٣٨ـ یەکەمیان شۆڕشی سەربەخۆیی سالی ( ١٧٧٥ ـــ ١٧٨٣ )یە •

مێژووی ڕوناکبیریی سەرنجی ژمارەیەك لە مێژوونووسانی ڕێبازی لیبرالیی نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەی ڕاکێشا . لەم مەیدانەدا مێژوونووسی سویسری بورکخاردت لە هەموان زیاتر خۆی نواند . قوتابی ڕانکەو درۆیزێن بورکخاردت (Burckhardt) ( ١٨١٨ ـ ١٨٩٧ ) چەند بەرهەمێکی بەنرخی دەربارەی ژیانی ڕوناکبیریی یۆنانی کۆنو تایبەت دەربارەی ڕێنیسانس‌و زانا ناودارەکانی ئیتالیای ئەو سەردەمە بلاوکردەوە. ئەو کتیبەی کە بە ناوی « ڕوناکبیریی ڕێنیسانسی ئیتالیا »وە سالی ١٨٦٠ بۆ یەکەمجار بلاوی کردەوە چەند جارێك لەسەریەك چاپ‌کرایەوەو وەرگێڕرایە سەر زۆر زوبانی‌تر . لەوەیدا کە زۆری بەسەر دەوری قارەماند هەلدەدا بورکخاردت کاری کردە سەر بیری فەیلەسوفی بەناوبانگی ئەلەمانی نیتشە (Nietzsche) ( ١٨٤٤ ـ ١٩٠٠ )و گەلێك مێژوونووسی وەك شپینگلەر[٣٩] .

بەمجۆرە دەتوانین بلێین مێژوونووسانی ڕێبازی لیبرالی دەروازەیەکی نوێ‌یان بۆ زانستی مێژوو خستە سەر پشت هەرچەندە ، بێ‌گومان . بەرهەمەکانی ئەوانیش لە هەلەو کەلێن بەدوورنەبوو . بەوێنە زوربەی مێژوونووسە لیبرالی‌یەکان بە چاوی نزم سەیری بزوتنەوەی کۆمەلانی خەلکیان دەکرد . مێژوونووسی فەرەنسەیی ئەلێکسیی دی تۆکفێل (Tocqueville) ( ١٨٠٥ ـ ١٨٥٩ ) وای لێ‌هاتبوو شۆڕش بە پێویستی مێژوویی لە قەلەم نەدات . بەلای تۆکفێلەوە فەرەنسە دەیتوانی بێ‌شۆڕشی گەورەی سالی ١٧٨٩ش بەخێرایی بەرەوپێش بڕوات . لەو کتیبەیدا کە بە ناوی « ڕژێمی کۆنو شۆڕش »ەوە سالی ١٨٥٦ بلاوی‌کردەوە تۆکفێل دەلێت بێ‌شۆڕش پێوەندی دەرەبەگی بۆ خۆی هەرەسی دەهێنا ، تایبەت دوای ئەوەی زوربەی جوتیارانی فەرەنسە بەر لە شۆڕش گوایە بوبونە

---

٣٩ـ دوایی باسی دێت .

حوض زموبی ئـــازاد • ئیپۆلیت تێنی (Taine) ( ١٨٢٨ ــ ١٨٩٣ ) حونیشتمانی تۆکفیل لەو خراپتر سەیری بزوتنەوە شۆڕشگێڕی‌یە گەورەکانی سەدەی هەژدەو نۆزدەی دەکرد •

بەڵام زۆر زەحمەت بوو ئـــەمجۆرە بۆچوونانە لە زانستی مێژووی نوێدا جێگیر بن • ژمارەیەك مێژوونووسی ڕێبازی لیبرالی خۆی وەستایانە ڕوبەڕووتیان کردن • بەوێنە فرانسوا ڤیکتۆر ئەلفۆنس ئۆلار (Aulard) ( ١٨٤٩ ــ ١٩٢٨ ) بەپشتیوانیی ژمارەیەکی یەکجار زۆر بەڵگەی مێژوویی بەشی زۆری ڕاکانی تێنی بەدرۆخستەوەو ئەوەشی ئیسپاتکرد کە تێن لە بەکارهێنانی سەرچاوەکانیدا زۆر دەستپاك نەبووە ، تەنها لەو زانیاری‌یانە کۆلیوەتەوە کە بە دلی خۆی بوونو چاوی لە زۆر بەڵگەو ڕاستیی مێژوویی گرنگ پۆشیوەو کردوونی بەژێر لێوەوە •

بەرلەوەی بێینە سەر کۆتای باسی زانستی مێژوو لـــە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەدا بە پێویستی دەزانین چاوێك بـــە نوێکاریی دوو زانای تری ئەو سەردەمەدا بخشێنین ، یەکەمیان مۆرگانو دووەمیان ماورێرە •

زانای ئەمەریکایی لویس هێنری مۆرگان (١٨١٨ــ١٨٨١)(Morgan) توانی پەردە لەسەر ئەو ڕێگە پێچاوپێچە لابدات کە ئادەمیزادی لە بـــاری درندەیی‌یەوە گەیاندە سەرەتای شارستانەتی ، تیشکی هاویشتە سەر جۆری دروستبوونی خێزانو یەکەم توێژی عێلو تیرە • هەمانکات مۆرگان توانی لەبەر ڕۆشنایی جۆری بەکارهێنانی ئەمرازی کاردا دوو قۆناغی سەرەکیی لە مێژووی هەرە کۆنی ئادەمیزاددا دیاربکات ، یەکەمیانی ناونا قۆنـــاغی درندەیی‌و ئەوی‌تریان قۆناغی بەربەری‌و هەریەکەشیانی دابەشکرد بەســـەر سێ نیمچە قۆناغی‌تردا کە بە دەستکاری‌یەکی کەمەوە تائێستەش پەیڕەوی دەکرێن •

هەر ئەو دەوروبەرەش بوو کە زانای ئەڵەمانی جۆرج لودڤیگ فۆن ماورێر (Maurer) ( ١٧٩٠ ــ ١٨٧٢ ) لە ڕێبازی کلاسیکی لێکۆڵینەوەی مێژووی ئەڵەمانیا لایداو گەیشتە ئەو بڕوایەی مێژوونووس دەتوانێت لە قوژبنی هەڵسەنگاندنی باری ژیانی کۆمەڵایەتیی کۆنەوە گرێکوێرەکانی ڕابودوو بکاتەوە • بەپێی بۆچوونی ئەو سەرەتا لە ئەڵەمانیا نــە موڵکایەتی زەوی‌و نە دامودەزگای میری نەبوون ، هــــەموو یەکسان دەژیان‌و پێکرا کاریاندەکرد • بـــــە هەمان دەستوور ماورێر بەدوای هۆی پەیدابوونی جیاوازیی کۆمەڵایەتی‌و داهاتنی موڵکایــەتی‌و کاریــان بۆ ســەر ژیـــانی ئەڵەمانەکاندا گەڕاو لە چوارچێوەیاندا بەسەرهات‌و ئاڵوگۆڕی مێژوویی ئەڵەمانیای هەڵسەنگاند •

بێ‌سۆ نە مۆرگان‌و ماورێرو نە هاوەڵ‌و هاوبیرەکانیــــان نەیانتوانی‌و نەشدەکرا بتوانن هەموو نیشانەکان بپێکن ، بەڵام گرنگ ئــەوەیە گەلێك نوێکاری‌یان کردو بە زۆر ئەنجامی ورد گەیشتن‌و بوونە هۆی پەرەسەندنی ڕەخنەو بەراوردی مێژوویی کە ڕێگەیان بۆ ساغکردنەوەی زۆر باس‌و ڕ خۆش کرد • بەشی زۆری بەرهەمی ئەو زانایانە تا ئیمڕۆش بایەخی زانستیی خۆیانیان نەدۆڕاندووە • نەك هەر ئەوە ، بەڵکو چالاکیی ئــەوان گۆمی مێژووی وا قووڵکرد کە مەلەی بەجارێك بۆ نەوەی داهاتوو خۆش‌بوو • زانای ئەڵەمانی تیۆدۆر مۆمسن (Mommsen) ( ١٨١٧ ــ ١٩٠٣ ) بەتەنێ ١٥١٣ کاری زانستیی دەربارەی مێژووی ئیمپراتۆریی ڕۆمانی دوای خۆی بەجێ‌هێشت • کاری گەورەی وەك « مێژووی کیمبریج » لە ئینگیلتەرەو «مێژووی جیهان» لە فەرەنسە دەرچوون کە بەرهەمی بایەخداری هاریکاریی دەستەیەك مێژوونووسی بەناوبانگی ئەو سەردەمەن •

هەموو ئەمانە بەسەریەکەوە تەواو ڕێگەیان بۆ پێشکەوتنی داهاتووی زانستی مێژوو خۆشکرد ، تایبەت دوای شەڕی یەکەمی جیهان •

# زانستی مێژوو

## دوای شەڕی یەکەمی جیهان

**یەکیەتیی مێژوونووسان . موزەخانەو موزەخانەی بەریتانیا . کۆنگرەی مێژوونووسان . بلۆلەو فیڤر . کۆمەڵەی ڕۆبسپێر . شپێنگلەر . ئارنۆلد تۆینبی. تارلێو بارتۆلدو کراچکۆفسکی . گەردلێڤسکیو کورد .**

دوای شەڕی یەکەمی جیهان زانستی مێژوو بەجارێك پەلیهاویشتو پەرەیسەند ، پێش برکێی ڕێبازە جیاوازەکانی لێکدانەوەی مێژوو هێندەیتر گوڕی سەند ، دەسکەوتە زۆرەکانی مێژوونووسان گەیشتە لقەپۆپە . بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم باسە چەند ژمارەو نمونەیەکی کەم دەهێنینەوە .

ژمارەی ئەو گۆڤارانەی بۆ باسی مێژوویی تەرخانکراون لە حەفتاکانی سەدەی بیستدا خۆی دا لە چەند هەزار گۆڤارێك کە بە دەیانو زیاتر زوبانی گەلانی جیهان دەردەچن . بەشی زۆری ئەو گۆڤارانە ئۆرگانی کۆڕو زانکۆو موزەخانەو دەزگای زانستییتری ناوداری وڵاتانن.لە ساڵی١٩٦٠وە لە هۆڵەندە گۆڤاری « مێژوو و تیۆری » (History and Theory) ی جیهانی دەردەچێت . ئیمڕۆکە دەگمەن زانکۆیەکی ناودار هەیە ئامۆژگا یا کولێجی[٤٠] لێکۆڵینەوەی مێژووی سەربەخۆی نەبێت ، هیوایان هەیە پتر لە دەزگایەکی بۆ خوێندنی مێژوو تەرخان کردووە . لە زانکۆی پاریس کۆلێجی مێژووی نوێو هەرە نوێو کۆلێجی مێژووی شۆڕشی فەرەنسەو

---

٤٠ــ ئامۆژگا ( معهد institute) ، کۆلێج ( کلیة college)

کۆلێجی مێژووی ئابووری‌و کۆمەڵایەتی هەیە . کۆڕی زانیاری یەکیەتی سـۆڤێت بـە تەنهـا ٩ ئامۆژگای سـەربەخۆی بۆ لێکۆلینـەوەی مێژووی یەکیەتیی سـۆڤێت‌و وڵاتانی دەرەوە تەرخـانکردووە ، وەك « ئامۆژگای مێژووی یەکیەتیی سۆڤێت »و « ئامۆژگای مێژووی گشتی»و « ئامۆژگای سلاڤ‌و بەلکاناسی »و « ئامۆژگای ئەمەریکای لاتینی » و « ئامۆژگای ئەفەریقا » و « ئامۆژگای رۆژهەڵاتنـاسی » . ناوەندی حەفتاکان لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا ١٩١ دەزگای زانکۆیی تەنها بە لێکۆلینەوەی پێوەندی نێوان دەوڵەتانەوە خەریك‌بوون .

وەك لە شوێنی خۆیدا باسـمانکرد پتر لە ٣٥٠ سـاڵ لەمەوبەر مێژوونووسانی وڵاتە پێشکەوتووەکان کەوتنە دامەزراندنی ڕێکخراوی تایبەتیی خۆیان . بەلام ئـەو جۆرە ڕێکخراوانە هیـچ کاتێك وەك دوای شەڕی یەکەمی جیهان جێگیرو بەکار نەبوون . ئیمڕۆکە تەنها لە ئینگیلتەرە دەیان کۆمەڵ‌و ڕێکخراوی مێژوویی هەن ، لە هەموویان گەورەتر یەکیەتیی مێژوونووسانە کە ژمارەی ئەندامانی چەند هەزارێکن ، ئۆرگانی مانگانەی خۆی بە ناوی « مێژوو »ەوە لەگـەڵ بیبلیۆگرافیایەکی سـاڵانە بـە نـاوی "Annual Bulletin of Historical Literature" وە بڵاودەکاتەوە . یەکیەتیی مێژوونووسانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا نزیکەی ١٢٠ لقی هەیە ، ژمارەی ئەندامانی لە ١٠ هەزار کەس تێپەڕ دەکات .

سەدەی بیستەم موزەخانەو کتێبخانەی مێژوویی‌و ئـەو جۆرە دامو دەزگایانەی کاری مێژوونووس ئاسان دەکەن بە جارێك پەرەیان سەند . سەرەتای دامەزراندنی موزەخانە دەگەڕێتەوە سەردەمی ڕێنیسانس[41] . بەلام بایەخی زانستیی ئێستەی موزەخانە لەگەڵ جارانیدا بەراورد ناکرێت .

---

٤١ــ یەکەم موزەخانەی ڕیکوپێك لە ئۆکسفۆردی ئینگیلتەرە سـالی ١٦٨٣ دامەزرێنرا .

سەرەتای حەفتاکان کتێبخانەی موزەخانەی بەریتانیا (British Museum) سەرمەیەداوبانگ کە ساڵی ١٧٥٣ لە لەندەن دامەزرێنرا بەتەنها پتر لە ٧ ملیۆن کتێبی چاپکراوو ٢٠٠ هەزار دەستنووسی بە زوبانە ئەوروپاییەکانو ٢٥٠ هەزار کتێبی چاپکراوو ٣٨ هەزار دەستنووسی بە زوبانە ڕۆژهەڵاتییەکانو ٥٠٠ هەزار نەخشەی جوگرافیاییو بە سەدان هەزار بەڵگەی هەمەجۆری تێدا بوو • هەر ساڵەی بەلای کەمەوە ملیۆنێك کتێبو دەستنووسو گۆڤارو ڕۆژنامەو بەڵگەو نەخشەو نیشانو بەرهەمیتر دەچێتە سەر سامانی بێشوماری موزەخانەی بەریتانیا کە بە حەق بۆتە زیارەتگەی گشت مێژوونووسانی جیهان •

پێوەندی نێوان مێژوونووسانی جیهانو هاریکارییان ڕۆژبەڕۆژ پەتر دەبێت • لە ساڵی ١٩٠٠وە دەستکرا بە بەستنی کۆنگرەی تایبەتی مێژوونووسانی جیهان کە هەر جارەی بە سەدانیان لە شارێك کۆدەبنەوەو گەلێك باسی گرنگی مێژوویی شیدەکەنەوە • یەکەم کۆنگرە لە پاریس بەسترا ، دووەم لە ڕۆمای پایتەختی ئیتالیا • لەمیاندا کە بەر ساڵی ١٩٠٣ کەوت نزیکەی ٢٥٠٠ مێژوونووس بەشداربوون • سێیەم کۆنگرە ساڵی ١٩٠٨ لە بەرلین بەسترا ، ١٤٠٥ نوێنەر بەشدارییان لە کارەکانیدا کرد • چوارەم کۆنگرە ساڵی ١٩١٣ بەر لەندەن کەوت کە ژمارەی بەشدارانی گەیشتە هەزار کەس • کۆنگرەی پێنجەم ساڵی ١٩٢٣ لە برۆکسێلی پایتەختی بەلجیكو کۆنگرەی شەشەم ساڵی ١٩٢٩ لە ئۆسلۆی پایتەختی نەرویجو کۆنگرەی حەوتەم ساڵی ١٩٣٣ لە وارشاوی پایتەختی پۆلۆنیا بەسترا • مێژوونووسانی ٤٠ وڵات لە کۆنگرەی وارشاودا بەشدارییان کرد، ژمارەیان گەیشتە ١١٠٠ کەس • پاش پێنج ساڵ کۆنگرەی هەشتەم لە زوێریخ بەسترا•

شەڕی دووەمی جیهان بووە هۆی ئەوەی مێژوونووسانی جیهان بۆ ماوەی دوازدە ساڵی ڕەبەق نەتوانن جارێکیتر کۆبینەوە تا لە ناوەندی

۱۹۵۰دا نۆیەم کۆنگرەیان لە پاریس بەست • لەوساوە یۆنسکۆ ڕێکخستنی کۆنگرەی مێژوونووسانی جیهانی گرتە ئەستۆی خۆی • کۆنگرەی دەیەم سالی ۱۹۵۵ لە ڕۆما بەسترا ، پتر لە دووهەزار مێژوونووسی ۳٤ ولات تییدا بەشدار بوون • کۆنگرەی یازدەیەم سالی ۱۹٦۰ بەر ستۆکهۆلمی پایتەختی سوید کەوت،پتر لە دوو هەزار مێژوونووسی ٤۹ ولات تییدا بەشداربوون• سالی ۱۹٦٥ کۆنگرەی دوازدەیەم لە ڤیەنای پایتەختی نەمسا گیرا ، نزیکەی ۲٤۰۰ مێژوونووسی ٤۲ ولات تییدا بەشداربوون • کۆنگرەی داهاتو سالی ۱۹۷۰ لە مۆسکۆ گیرا ، ژمارەی بەشدارانی گەیشتە ۳۳۰۷ کەس کە نوێنەری ٥۰ ولات بوون •

دیارە هەموو ئەمانە بەسەریەکەوە کارێکی ئەوتۆیان کرد لێکۆلینەوەی مێژوویی نوێ هەنگاوی گەورە گەورە بەرەوپێش بنێت • لێرەدا وەك نمونە تەنها دوو ژمارە دەخەمە بەرچاو • « مێژووی جیهان » بە زوبانی ڕووسی بریتییە لە ۱۱ بەرگ کە بەسەر یەکەوە ۸٥٦۳ لاپەڕەی گەورەن • « ئەنسکلۆپیدیای مێژوویی سۆڤێت »یش ۱٦ بەرگە کە بەسەریەکەوە بریتین لە ۸۱۳٤ لاپەڕەو ۱٦۲٦۸ ستوونی پیت وردو پڕ •

لێدوان لە قوتابخانە جیاوازەکانی مێژوو لەگەل دەسکەوتی هەریەکەیان بەجیا ئاو زۆر دەکێشێت ، بۆیەکا بە کورتی باسی چالاکیی ژمارەیەکی کەم مێژوونووسی بەناوبانگی سەدەی بیستەمو بیروڕایانو ئالوگۆڕە هەرە دیارەکانی زانستی مێژوو دەکەم تەنها بۆئەوەی خوێنەر باشتر لە ڕادەی پێشکەوتنی نوێی لێکۆلینەوەی مێژوویی تێبگات •

سەدەی بیستەم ڕێبازی زانستیی لێکۆلینەوەی مێژوو جێپێی خۆی قایمتر کرد ، سەرچاوەی ڕەسەنو ژمارەو سەرژمێر بوونە شیرازەی لێکۆلینەوە ، مێژوونووسان زیاتر کەوتنە سۆراخی هۆ بزوێنەرە نەبینراوەکانی ڕوداو ، پاشایانو سەرداران جێگەی شیاوی خۆیان وەرگرت،

ـە زۆریان پێ دراو نە لێشیان کەم کرایەوە ، باسی نوێ هاتە کایەوە ، وەك
ـزوتنەوەی کرێکاران‌و جوتیاران‌و ڕوناکبیران‌و ناکۆکی‌یەکانی نـاو چین‌و
ـدەستەکانی کۆمەڵ‌و ئەو جۆرە باسانە •

مێژوونووسانی سەردەمی نوێ زۆر لە جاران زیاتر کەوتنە بایەخ دان
بە ژیانی کۆمەڵایەتی وەك ئاوێنەی ڕاستەو خۆی ڕوداوی مێژوویی کە لایەنی
سیاسی تەنها یەکێکە لە ڕووە هەرە گرنگەکانی نەك زیاتر • مێژوونووسـی
ـفەرەنسەیی لیوسێن فێڤر (Febvre) ( ۱۸۷۸ ــ ۱۹۵٦ ) سوور بوو لەسەر
ئەوەی « ڕێگەی تێگەیشتنی مێژوو بە تێگەیشتنی کۆمەڵدا تێدەپەڕێت » •
فێڤر بۆ خۆی ئەو ڕێگەیەی گرتەبەرو بـەوردی لـــە دیاردەکانی ژیانی
کۆمەڵایەتی ( پێوەندی‌بەرهەم‌هێنان لە لادێ ، بازرگانی ، زوبان ، ئایین ،
ژیانی ڕوناکبیری‌و ئەوجۆرە باسانە ) دەکۆڵی‌یەوە بەونیازەی بگاتــە بنج‌و
بناوانی بەسەرهاتەکان کە لێکی‌دانەدەبڕین ، بەڵکو بەدوای پێوەندی‌یەکانیاندا
دەگەڕا •

هاوەڵ‌و هاوبیری فێڤر مارك بلۆك (Bloch) ( ۱۸۸٦ ــ ۱۹٤٤ ) ئەو
ڕێبازەی لە کتێبی « بەرگری لە مێژوو »دا بەدرێژی ڕوون کردۆتەوە • لــە
نووسینەکانیدا بلۆك دەیویست بزوتنەوەی کۆمەڵ بەپێی یاســـای تایبەتی
بـەلێنێت • دەیگوت گەر بمانەوێت لە ڕوداوی مێژوویی چۆن پێویـــــتە
وەها تێ‌بگەین دەبێت تەنها کرداری ئەم یا ڕەفتاری ئەو لێك‌نەدەینــــەوە ،
پێویستە بە ناخی باری ژیانی ئابووری‌و سروشت‌و کۆمەڵدا بچینە خوارێ ،
بەوردی لە دیاردەکانیان بکۆڵینەوە • بلۆك‌و فێڤر لە ساڵی ۱۹۲۹وە لە پاریس
دەستیان‌کرد بە بڵاوکردنەوەی گۆڤارێکی زانســـتی کـــە تائێستەش
دەردەچێت[٤٢] •

---

٤٢ــ گۆڤاری : "Annales . Economies, Societes, Civilisations"

مێژوونووسان زۆر لە جاران زیاتر کەوتنە بایەخدان بەو ڕووداوە گەورانەی ئەنجامەکانیـان کاریان‌کردە سـەر ڕەوڕەوەی مێژووی هـەموو جیهـان • وەك لە شوێنی خۆیدا باسمان‌کردمێژوونووسی فەرەنسەیی بەناوبانگ فرانسو ئۆلار سەرەتای سەدەی بیست کتێبێکی گەورەی بـە نـاوی « مێژووی سیاسیی‌شۆڕشی فەرەنسە »وە بڵاوکردەوە کە زۆر لاپەڕەی نەزانراوی ئەو شۆڕشەی تێدا ڕوون‌کردەوەو گەلێك هەڵەی مێژوونووسانی پێش خۆی ڕاست‌کردەوە • لەگەڵ دەرچونیدا ئەو کتێبەی ئۆلار وەرگێڕرانە سەر گەلێك زمانی‌ترو چەند جارێك لەسەر یەك چاپ‌کرایەوە •

زۆری نەبرد دەستەیەك مێژوونووسی ناوداری‌تری فەرەنسە « کۆمەڵەی ڕۆبسپێر »یان دامەزراند کە ئەرکی لێکۆڵینەوەی وردی هەموو بەسەرهاتەکانی شۆڕشی گەورەی فەرەنسەی گرتە ئەســـتۆ • ئەلبێر ماتیێز (Mathiez) ( ١٨٧٤ ــ ١٩٣٢ ) کە یەکێك بوو لە ئەندامە چالاکـــەکانی « کۆمەڵەی ڕوبسپێر » ، سێ بەرگی سەربەخۆو دەیان بەرهەمی‌تری دەربارەی شۆڕشی سالی ١٧٨٩ بڵاوکردەوە کە هی‌وایان تێدایە تەنها بۆ باسی بازاڕو گرانیی ئەو ڕۆژگارەی فەرەنسە تەرخـــان‌کراوە • جۆرج لیفێڤـــر (Lefebvre) ( ١٨٧٤ ــ ١٩٥٩ ) کە ئەندامێکی‌تری هەمان کۆمەڵە بوو بە قوولی ئـەوی پێوەندی بە جوتیاری فەرەنسەوە بوو لە سەردەمی شۆڕشدا شیی‌کردنەوە • « جوتیارانی باشووری فەرەنسە لە ڕۆژگاری شۆڕشدا » ناونیشانی نامەی دوکتۆراکەیەتی •

بە هەمان دەستوور مێژوونووسان کەوتنە لێکۆڵینـــەوەی هـەموو لایەنەکانی شۆڕشی پیشەسازیی سـەدەی نۆزدە کــە ڕووداوەکانی کاری گەورەیان کردە سەر مێژووی گشت جیهان • شارەزایان گەلێك بەرهەمی قووڵیان دەربارەی ئەم باسە بڵاوکردەوە •

ڕێبازی کلاسیکیی لێکۆڵینەوەی مێژووش لە بەرگێکی نوێدا خۆی نواند. یەکێك لە مێژوونووسە بەناوبانگەکانی ئەم ڕێبازە شپێنگلەرە. فەیلەسوف و مێژوونووسی بەناوبانگی ئەڵەمانی ئۆزوالد شـــپێنگلەر (Spengler) (١٨٨٠ ـــ ١٩٣٦) بە دەیان بەرهـــەمی زانستیی دوای خۆی بەجێهێشت و کاری کردە سەر گەلێك مێژوونووسی ئەوروپایی و ڕێبازی «فەلسەفەی ژیان» کە لایەنگرانی لەوباوەڕەدان هەموو دیاردەیەك بەرهـــەمی ژیان خۆیەتی بێ ئەوەی گیان (ڕۆح) یا مایە (مادە) بتوانێت کاری تێبکات. ڕوداوەکانی شەڕی یەکەمی جیهـــان و بەســـەرهاتە جەرگبڕەکانی ئەڵەمانیـــای نیشتمانی دوشەڕەدا شپێنگلەریان تاریکبین کرد، وایانلێکرد لە یەکەم چوار ساڵی دوای شەڕدا لە دوو بەرگدا «ئاوابوونی ئەوروپا» ببینێت. بەپێی بۆچوونی ئەو هیچ شارستانەتییەك نییە لەناونەچێت، ئەوانەش کە دەڵێن پێوەندی لەنێوانی شارستانەتییەکانی جیهاندا هەیە دووی کڵاوی بابردوو کەوتوون. شارستانەتی لای شپێنگلەر وەك زیندەور وایە، بۆخۆی پێدەگات و گەورە دەبێت و دەمرێت، ئەمیان دەڕوات ئەویان دێت. لە هەمان قوژبنەوە شپێنگلەر سەیری شارستانەتیی ڕۆژئاوای سەردەمی خۆی دەکرد، ئەو شارستانەتییە بەلایەوە بریتییە لە تراژیدیایەکی گەورە کە «بێگومان» کۆتایی بە کارەسات دێت.

مێژوونووسی بەناوبانگی ئینگلیز جوزێف ئارنۆلد تۆینبی (Toynbee) (١٨٨٩ ـــ ١٩٧٥) زۆر کاری کردۆتە سەر مێژوونووسانی ڕۆژئاوا[٤٣]. تۆینبی لە ڕۆژهەڵاتیش دەرونێشی زۆرە. گەورەترین بەرهەمی تۆینبی کە لە بەرهەمەکانیتری زیاتر دەنگی داوەتەوە کتێبی «لێکۆڵینەوەی مێـــژوو»ە (A study of history) کە ١٢ بەرگەو ٢٧ ساڵ پێوەی خەریك بووە (ساڵی

٤٣ـ ئارنۆلد تۆینبی مامیشی (١٨٥٢ ـ ١٨٨٣) یەکێك بوو لە مێژوونووســـە ناودارەکانی نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدە.

١٩٣٤ دەستی پێ‌کردو ساڵی ١٩٦١ تەواوی‌کرد ) • دوایی پوختـەی ئـەو ئەنجامانەی لەو بەرهەمەیدا پێیان گەیشت لە کتێبێکی سەربەخۆی‌تردا بەناوی « گۆڕانو نـەریت »ەوە (Changes and habits) سـاڵی ١٩٦٦ بڵاوی‌کردەوە •

لە نووسـینەکانیدا تۆینبی ژمارەیەکی یەکجار زۆر سـەرچاوەی بەکارهێناوەو هەوڵی‌داوە لە چوارچێوەی گێڕانەوەی ڕوداوەکاندا نەمێنێتەوە بەڵکو دیوی ئەودیویشیان ببینێت تا لە هێزی بزوێنەری ئاڵوگۆڕی مێژوویی تێبگات • ئەوە وای لە ئارنۆلد تۆینبی کرد پەرۆشی دواڕۆژی ئادەمیزادو دژی چەكو تفاقی شەڕی کوشندەی نوێ بێت ، تایبەت بە چاوی خۆیشـی ئاگری هەردوو شەڕی یەکەم‌و دووەمی جیهانی بینی • هەمـان‌کات تۆینبی لایەنگری بزوتنەوەی ئازادیخوای گەلان بوو ، لە بەرهەمەکانی خۆیدا یا ئەو بەرهەمانەی بە سەرپەرشتی ئەو دەردەچون[٤٤] زۆر جار زانیاریی بـەنرخی دەربارەی ئەو بزوتنەوەیە بڵاوکردۆتەوە کە کوردیش بەشی خۆی تێـدا هەیە •

تۆینبی هەرچەندە دەورەی ژیان‌و مردنی شـارستانەتیی شـپێنگلەر کاری‌تێ‌کردووە بەڵام بەپێچەوانەی ئەوەوە لەو بڕوایەدایە کە « هـەر ٣٤ شارستانەتی‌یەکە »ی ئادەمیزاد لقی « یەك درەختی مێژوو »ن ، چونکە ، وەك دەیگوت ، ئادەمیزاد لە بزوتنەوەی مێژوویی خۆیـدا بـەرەو یەکیەتی‌و نزیك‌کەوتنەوە دەچێت • بەپێی ئەو بۆچوونە ئەنجام هەموو شارستانەتی‌یەکان‌و پاشماوەیان دەڕژێنە قەوارەی یەك شارستانەتی گشتی‌یەوە •

بەڵام بـەلای تۆینبی‌یەوە تا ئیسـتە شـارستانەتی‌یەکی لەوجۆرە دروست‌نەبووە ، هۆی ئەوەش لە لاوازیی هـەموو شـارستانەتی‌یەکانی

---

٤٤ـ تایبەت "Survey cf International Affairs" کە ئامۆژگای پێوەندی نێوان دەوڵەتان ساڵی جارێك لە لەندەن دەری‌دەکرد .

ـ جوردوودا دەبینێت کە ، وەك دەڵێت ، گشتیان گۆشەگیر بوون • هەمان کات تۆینبی بیری ئەو مێژوونووسانە بەدرۆ دەخاتەوە کە شـــارستانەتیی ڕۆژئاوا نەکەنە بناغەی سەرەکیی ئاڵوگۆڕەکانی مێژوو •

بەپێی ئارنۆلد تۆینبی نە ڕەگەزو نە دەوروبەر ناتوانن شـــارستانەتی دروستبکەن • هەموو شارستانەتییەك لای ئەو ئەنجامی فشارێکی تایبەتیو جۆری بەرهەڵستیو وەڵامدانەوەیەتی[٤٥] ، واتە وەك دەنگو دەنگدانەوە• ژیانی بێفشارو ژێرسێبەر کۆمەڵ دەپوکێنێتەوە ، چونکە لە کۆمەڵێکیوادا کەس بەدوای مانو ژیاندا ڕاناکات • هەموو فشارێکیش مـــەرج نییـــە بەرهەمدار بێت • فشارەکانی مێژوو وەك یەك نین ، هیوایان هەیە نووزەی تێدا نییە، هیواشیان هەیە کەس نییە خۆی لەبەر شالاویدا بگرێت•باشترین فشار ئەوەیە کە نە لەمیانو نە لەویانە ، بەڵکو ،خۆی وتەنی ، لە «ناوەندی زێڕینە » • هەروەها جۆری ئەو فشارە لە ڕووکەشدا جیاوازە ، لەوانەیە لە سروشتەوە بێت یا لەناو کۆمەڵ خۆیەوە هەڵقوڵێت یا ئەنجامی کارێکی ئایینی بێت • فشار بۆ خۆی هەرچۆن بێت گرنگە ، بەڵام گرنگتر دەنگدانەوەیە ، گەر ئادەمیزاد ملی بۆ هەر فشارێك دا ئەوسا یا لە جێگەی خۆیدا دەوەستێت یا بەرەودواوە دەچێت ، خۆ گەر هاتو قۆستییەوەو ســـەریپێدانەواندو کردییە تۆکەری خۆی ئەوا بەرەوپێش دەچێت ، واتە شارستانەتی یا ژیاری دروستدەبێت •

بۆ ڕوونکردنەوەی ئـــەم بیرەی ئارنۆلد تۆینبی نمونەیەکی ســـاکار دەهێنمەوە • با بڵێین کۆمەڵگایەك دووچاری تۆفانو لافاو دێت • گەر هاتو کەسانی ئەو کۆمەڵگایە ملیانداو کەلوپەلی خۆیان بەکۆڵدا داو چوونـــە بەرزاییەکی ڕەقوتەقی دوور ئەوا هیچ ڕوونادات تـــەنها جێگۆڕکێیەکی

---

٤٥ـ التحدي والاستجابة .

پچوك نەبێت ، واتە مێژوو لەعاستی خۆی نابزوێت • خۆ ئەگەر هاتو ئەوکەسانە چاکیان لێ کردبەلاداو بەندو جۆگەیان هەلبەستو بە ئاوی کۆکراوەی لافاو کێلگەو بیستانیان دروستکرد ئەوا بەرەوپێش دەچنو رەورەوەی مێژوو دەبزوێنن • یا با بلێین کۆمەلگایەك ، حەزدەکەن ناوی دەنێن کۆمەلگای فەلەستین یا رەش پێستەکانی ئەمەریکا ، دووچاری چەوساندنەوەو تواندنەوە دێت ، گەر هاتو کەسانی ئەو کۆمەلگایە ملیاندا ئەوا بەر لێشاوی مێژوو دەکەونو بەرەبەرە ناویان لەناو ناواندا نامێنێت • بەلام ئەگەر هاتو خۆیان گرتو هۆی پاراستنیان دروستکرد ئەوا ببەو کارەیان لقێکی شارستانەتی نوێ دەهێننە کایەوە •

بەلام ئەوەندە هەیە تۆینبی بریاری داوەتە دەست تاقمی هەلبژاردەی کۆمەل ( واتە کەمینە ) ، نەك کۆمەل بەگشتی ( واتە زۆرینە ) • کەی ئەو دەستەیە ملیدا زۆرینە دویدەکەوێتو کەی خۆی راگرت ئەویش رادەوەستێت • کەواتە ، وەك تۆینبی دەلێت ، جلەوی شارستانەتی چ لە دروستبوونو چ لە کەوتندا بەدەست کەمینەوەیە ( لەمەدا تۆینبی بیری فەیلەسوفی فەرەنسەیی ئانری بێرگسۆن (Bergson) دووبارە دەکاتەوە)• جاریوا هەیە دەستەی هەلبژاردە وا لە خۆ باییدەبێت پشتێنی لێدەکاتەوەو بەرە بەرە هێزی جوانکاری ( ئیبداع ) دەدۆرێنێو ئەوساکە زۆرینەش بروای پێی نامێنێتو دەبێتە بێلی روخاندن نەك خشتی دروستکردن• کەواتە هۆکانی کەوتنی شارستانەتی لەناو کۆمەل خۆیدا دروستدەبن ، هەر ئەوانیش دەبنە هۆی راکێشانی هێزی دەرەوە ، یا بیانی ، چونکە ئەو هێزە گەر نەزانێت شیرازەی ناوەوە تێکچووە زات ناکات هێرش بهێنێت • مەغۆلەکان گەر نەیانزانیبایە گلولەی خەلیفە کەوتۆتە لێژی قەت هێرشیان نەدەهێنایە سەر بەغدا •

هەرچەندە ، وەك وتمان ، ئارنۆلد تۆینبی کاری زۆری کردۆتە سەر

مێژوونووسانی ڕۆژئاوا ، بەڵام هەمان‌کات هێرشی کەمیشی نەکراوەتە سەر . دابڕینی شارستانەتی‌یە کۆنەکان لە یەك‌و کەم‌کردنەوەی دەوری کۆمەڵانی خەڵك لە دروست‌کردنی ڕوداوی مێژوویی‌داو نەبینینی هێزە ڕاستەقینەکانی گاڵ‌و گۆڕو بەرەوپێش چوون لەلایەن تۆینبی‌یەوە جێگەی ڕەخنەن .

مێژوونووسانی ڕێبازی مەتریالیزمی لە سەدەی بیستەمداو تایبەت دوای شەڕی یەکەمی جیهان لەسەر هەمان ڕێ‌و شوێنی دامەزرێنەرانی ئەو ڕێبازە ڕۆیشتن ، بۆیەکا لێرەدا تەنها چالاکیی ژمارەیەکیان دەخەینە بەرچاو وەك بەڵگەو نیشانەیەکی‌تری بەرەوپێش‌چوونی لێکۆڵینەوەی مێژوویی .

نووسینەکانی تارلێ ( ١٨٧٥ ــ ١٩٥٥ ) دەربارەی مێژووی ئەوروپا دوازدە بەرگی گەورەیان پڕکردۆتەوە کە بەشێکیان وەرگێڕدراونەتە سەر گەلێك زمانی‌ترو چەند جارێك چاپ‌کراونەوە . پایە بەرزیی تارلێ لە مەیدانی مێژوودا وای لە ژمارەیەکی زۆر لە زانکۆ ناودارەکانی جیهان کرد دوکتۆرای ڕێزی پێشکەش بکەن ، وەك زانکۆیانی سۆربۆن‌و ئۆسلۆو پراگ‌و جەزائیرو گەلێکی‌تر . ژمارەیەکیش لە کۆڕە زانیاری‌یەکانی جیهان کردیانە ئەندامی شەرەف .

بارتۆلد ( ١٨٦٩ ــ ١٩٣٠ ) کە مرد پتر لە ٤٠٠ کاری زانستیی زیندووی دەربارەی مێژووی گەلانی ڕۆژهەڵات بەجێ‌هێشت . لە ژمارەیەك لە بەرهەمەکانیدا بارتۆلد بەدرێژی باسی پەیدابوونی ئیسلام‌و بڵاوبوونەوەی‌و شارستانەتیی ئەو قۆناغەی کردووە . ژمارەیەك لە باسە گرنگەکانی « ئەنسکلۆپیدیای ئیسلام »ی بەناوبانگ کە لە لیدن بە ئینگلیزی‌و ئەڵەمانی‌و فەرەنسی چاپ‌کرا بارتۆلد نووسیونی . هەموو بەرهەمەکانی بارتۆلد بەسەریەکەوە لە ٩ بەرگی گەورەدا چاپ‌کراون کە بەشێکیان وەرگێڕراونەتە سەر ئەڵەمانی‌و فەرەنسی‌و ئینگلیزی‌و عەرەبی‌و تورکی‌و هندی .

کراچکۆفسکی (١٨٨٣ ــ ١٩٥١) نزیکەی ٦٠٠ کاری زانستیی دوای خۆی بەجێهێشت،تەنها کارە هەڵبژاردەکانی لە ٦ بەرگی گەورەی سەربەخۆدا چاپکراون • جگە لەوە کراچکۆفسکی زۆر بەرهەمی قورسی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی ڕووسی ، وەك قورئانو « کلیلەو دمنە »و « الایام »ی تەها حسەینو گەلێکیتر ، کراچکۆفسکی ئەندامی کۆڕی زوبانی عەرەبی لە دیمەشقو کۆڕی زانیاری پۆڵۆنیاو کۆڕی زانیاری ئێرانو کۆڕی ڕۆژهەڵاتناسیی ئەڵەمانیاو کۆمەڵەی ئاسیایی شاهانەی بەریتانیا بوو •

گەردلێڤسکی (١٨٧٦ ــ ١٩٥٦) دەوروبەری ٣٠٠ کاری زانستیی هەیە ، بەتەنها هەڵبژاردەکانی لە چوار بەرگی سەربەخۆدا چاپکراون کە بەسەریەکەوە ٢٣٠٥ لاپەڕەی گەورەن • شایانی باسە گەردلێڤسکی زۆر جار باسی کوردیشی کردووە[٤٦] ، جاریوا هەیە وتاری تایبەتیی بۆ تەرخانکردوون[٤٧] ، بۆ خۆی چەند جارێك چۆتە ناویانەوەو گەلێك ڕاستیی بەنرخی دەربارەی پێوەندیی نێوان کوردو ئەرمەن بڵاوکردۆتەوە •

دەتوانین گەلێك نمونەی تری لەمجۆرە بهێنینەوە کە هەموویان ڕادەی پێشکەوتنی ئیمڕۆی زانستی مێژوو نیشاندەدەن • با ئەوەش بڵێین کە هەموو گەلانی جیهان کەمو زۆر دەوریان لە بەرەوپێشبردنی ڕەوڕەوەی مێژوودا بینیوە ، دیارە کوردیش یەکێکە لەو گەلانە •

---

٤٦ــ بڕوانە : ڤ . ا . گەردلێڤسکی ، کارە هەڵبژاردەکانی ، بەرگی یەکەم ، مۆسکۆ ، ١٩٦٠ ، ل ٥ ، ٧٣ ، ٩٦ ، ١٥٤ ، ١٧٩ ، ١٨٨ ، ٢٠٥، ٢٤١، ٢٥٨ ، ٢٦١ ، ٢٧٠، ٢٧٤، ٢٩٥، ٣٢٤، ٣٤٥و گەلێکیتر ، بەرگی دووەم، مۆسکۆ ، ١٩٦١ ، ل ٧٢ ، ٢٨٢ ، ٢٩٠ ، ٣٠٥ ، بەرگی سێیەم ، مۆسکۆ، ١٩٦٢ ، ل ٥ ، ١٦ ، ٢٢ ، ٣٢ ، ٤٣ ، ١٠٠ ، ١٠٧ ، ١٣٢، ٢١٢، ٢٣٥، ٣٩٦ ، ٤٠١ ، ٤١٩و گەلێکیتر ، بەرگی چوارەم ، مۆسکۆ ، ١٩٦٨ ، ل ٩٩ ، ١٢٤ ، ٢٦٢ ــ ٢٦٤و ٥٢٦ •

٤٧ــ وەك : « لە مێژووی کورد » ، بەرگی سێیەم ، ل ١١٣ ــ ١٢٣ ، « لەوێ ، لەو وڵاتەی ئەرمەنی تێدا دەژیا»، بەرگی سێیەم، ل ١٢٣ــ١٣٠، « لەناو کوردانی سوبحانداغدا » ، بەرگی سێیەم ، ل ٤٤٧ ــ ٤٥٧ ، « کرمانشاه » ، بەرگی چوارەم ، ل ٢٦٢ ــ ٢٦٤ •

# بەشی سێیەم

## کوردو مێژوو

### سەرەتا

**ابن الاثیر . ابن المستوفی . ابن خلکان . شەرەفنامەو شەرەفخان . مەلا مەحمودی بایەزیدی .**

شوێنی کوردستان لە ناوەندی شارستانەتیە کۆنەکانی ڕۆژهەڵاتو لە تاوجەرگەی مەلبەندی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا بۆتە هۆی ئەوەی گەلی کورد لە دێرزەمانەوە جێگەی دیاری لە مێژوودا هەبێت .کورد هەمیشە بەشی خۆی لە شەڕەکانی ڕۆژهەڵاتدا هەبووە ، هیچکاتێکیش ، وەك هەموو گەلانی‌تری ناوچەکە ، نەیتوانیوە دوورەپەرێز لە ژیانی ژیاریی ڕۆژهەڵات بووەستێت . لەبەرئەوە تا بەتەواوەتی لە مێژووی کۆنو نوێی کورد نەکۆڵرێتەوە کەلێنێك لە تۆماری گشتی مێژووی نووسراوەی ڕۆژهەڵاتدا دەمێنێتەوە .

باری سروشتی کوردستانو ژیانی سەختی زوربەی دانیشتوانیو پەرەسەندنی ژیانی کۆچەریو نیمچە کۆچەری لە ناویاندا لەگەڵ چەند دیاردەیەکی‌تری لەو بابەتە بوونە هۆی ئەوەی نووسینو خوێندنو خوێندەواری لەناو کوردا درەنگ پەیدا بێنوکە بووشن لەسەرخۆ پەرەبسێنن ، بۆیەکا نووسینەوەی مێژوو لەناو کوردا زۆر درەنگ سەری دەرهێنا . ڕاستە زوربەی گەلانی‌تری ڕۆژهەڵات لەوبارەیەوە وەك کورد بوون ، بەڵام لە ڕۆژگارێکی زۆر زوودا مێژوو بووە پیشەی ڕوناکبیرانی عەرەبو ئەرمەنی هاوسێی کورد . بەوجۆرە سەدان ساڵ تۆماری مێژوو لای

کورد بریتی‌بوو له گۆرانی‌و داستان‌و ئەفسانەی سەر زاری خەڵکی لەگەڵ نووسینی هەڵکەندراوی داگیرکەران لەسەر تاشەبەردی قەد شاخ‌و نـــــو ئەشکەوتەکان[1] .

وادیارە بـەهۆی ئایینی ئیســــلام‌و پێویستی‌یەکانی‌یەوە خوێندن‌و خوێندەواریی بەناو کوردا بڵاوبوونەوە . لەوە دەکات هەر ئەو سەردەمەش کوردستان مێژوونووسی بەخۆیەوە بینیبێت،بەڵام مێژوونووسەکانی بەڕاستی کەڵەو لێهاتوو بوون . ئەوانیش بە دەستووری زوربەی هــــەرە زۆری مێژوونووسانی جیهانی ئیسلامی ئـەو ڕۆژگارە لـە ســـنووری پێڕەوی ئیسلامەتی‌و زوبانی قورئان دەرنەچوون .

مێژوونووسانی ئەوسای کورد بە ژمارە زۆر بوون . کوردو کوردی‌و دیاربەکری‌و ئامەدی‌و ئامیدی‌و « العمــادي »و « اربيللي »و دینەوەری‌و گەڵاڵی‌و باڵەکی‌و ناوی گەلێك مەڵبەندی‌تری کوردەواری بوونەتە نازناو‌و جێگەی شیاوی خۆیان لەسەر بەرگی دەیان‌و بگـرە زیاتر دەســــنووسی مێژوویی بایەخداردا کردۆتەوە . لەوانە نی‌یە تۆمـــاری دەســــنووسی ڕۆژهەڵاتی‌ی هیچ‌کامێك لە کتێبخانەو موزەخانە ناودارەکانی جیهان لەوجۆرە ناوانەی تێدا نەبێت . لێرەدا وەك نموونە زۆر بەکورتی باســی ژینامەو بەرهەمی ژمارەیەکی کەم لــەو مێژوونووسە بەناوبانگانە دەکەین کە لەسەر خاکی کوردستان چاویان هەڵهێناوە .

أحمد کوڕی داود کە بە ابو الحنیفه الدینوری[2] ناسراوە لە دینەوەری

---

١ ـ لێرەدا ناتوانین توخنی باسی میدی‌یەکانی باپیرە گـــەورەی کورد بکەوین چونکە تاوەکو ئیستا شـــتێکی ئەوتۆ دەربارەی نووســــینی میــدی ساغ‌نەبۆتەوە .

٢ ـ وامان بە باش زانی ناوەکانیــان بێ‌دەستکاری وەك خۆیان بە ڕێنووسی عەرەبی بیانوووسینەوە .

ـرت سنەی کوردستانی ئێران لەدایكبووە ، سالی لەدایكبوونی تائیستە
ـ ع نەبۆتەوە ، سالی ۲۸۱ی کۆچی واتە ۸۹۵ی عیسایی وەفاتی کردووە .

دینەوەری شارەزای زوربەی زانستە باوەکانی سەردەمی خۆی بوو .
وەك دەلێن لە دینەوەر ڕوانگەی تایبەتیی خۆی هەبووە کە لە ڕێگەیەوە تاقیبی
ـرۆتەوەی ئەستێرەکانی ئاسمانی کردووە . « کتاب الاخبـــار الطوال »
گەورەترین بەرهەمی زانراوی مێژوویی‌یەتی کە وێڕای زانیاریی گشتیی پڕی‌یە
ـە باسی ڕوداوو بەسەرهاتە گرنگەکانی ئێران لە ڕۆژگاری ئەسکەندەرەوە
ـا تاوەندی سەدەی نۆ . پتر لە ســەدەیەك لەمەوبەر ڕۆژهەلاتناسی ڕووسی
ـف . ڕۆزن ( ۱۸٤۹ ــ ۱۹۰۸ ) دەسنووسی « الاخبار الطوال »ی دۆزی‌یەوەو
ڤلادیمێر گیرگاسی هاوەلی ( ۱۸۳۵ ــ ۱۸۸۷ ) کەوتە لێکۆلینەوەی‌و بەر لە
کۆچی دوایی بە ماوەیەکی کەم تەواوی‌کرد . دوای سالێك لە مردنی گیرگاس،
واتە سالی ۱۸۸۸ ، لە لیدن بۆ یەکەمجار بلاوکرایەوە .

ابو الحسن عزالدین علي کە بە ابن الاثیر ناسراوە سالی ۱۱۶۰ لە ناوچەی
جزیرو بۆتان لەدایكبووە ، سالی ۱۲۳۳ یا ۱۲۳٤ لە شاری موســل کۆچی
کردووە . گرنگترین بەرهەمی « الکامل في التأریخ »ە[۳] کە بریتی‌یە لە ۱۲
بــەرگ . « الـــکامل » باســی مێــژووی ئادەمیــزاد دەکــات لــە
ـە دروستبوونی دونیاوە » تا دواساڵەکانی ژیانی خاوەنی ، واتە تا نیوەی
یەکەمی سەدەی سیازدە .

ابن الاثیر بەشی زۆری باسەکانی « الکامل »ی بە دەستکاری‌یەوە لە
« تأریخ الطبري »ی وەرگرتوون ، بەلام گەلێکیشی خستۆتە سەریان . ئەو
بەشانەشی کە لە ڕوداوەکانی دوای سالی ۱۲۳۱ دەدوێن خۆی نووسیونی .
دەمێکە « الکامل » وەك سەرچاوەیەکی مێژوویی یەکجار گرنگ ســەرنجی

---

۳ ــ زۆرتر بە « الکامل » ناو دەبرێت .

مێژوونووسانی ڕاکێشاوە • لە ساڵی ١٨٥١ەوە ڕۆژهەڵاتناسی ئەوروپایی تۆرنبێرگ (C. J. Tornberg) دەستیکرد بە بڵاوکردنەوەی « الكامل » بە لێدوانی خۆیەوەو بە چارەکە سەدەیەك تەواوی کرد • ئەو چاپەی «الكامل» بە لێدەوانی تۆرنبێرگەوە ١٤ بەرگە •

أبو البركات المبارك کە بە شرف‌الدين ابن المستوفي الاربيلي ناسراوە ساڵی ١١٦٩ لە قەڵاتی هەولێرێ لەدایك بووە • ابن المستوفی لە بنەماڵەیەکی ناوداری ڕوناکبیری ئەو سەردەمەی کوردستانە • لە هەولێر خوێندنی تەواوکردووەو گەورەبووەو هەر لەوێش بۆتە یەکێك لە وەزیرە ناودارەکانی ئەتابەگەکان • دوا ساڵەکانی ژیانی گۆشەگیر لەگەڵ کتێبەکانیدا ژیا • کە مەغۆلەکان ساڵی ١٢٣٧ هێرشیان هێنایە سەر هەولێر ابن المستوفي لە قەڵاوە لەگەڵ خەڵکی شاردا بەرگریی‌کرد • دوای‌ئەوە فەرمانڕەوای موسڵ ناردی‌بە دوای‌و لەوێ دوا دوو ساڵی ژیانی بردەسەر •

بەناوبانگترین کتێبی ابن المستوفي « مێژووی هەولێر »ە[٤] • بەپێی قسەی مێژوونووسانی کۆن ئەم کتێبە بریتی‌یە لە چوار بەرگ ، بەڵام بەداخەوە تا ئێستە تەنها دەستنووسی بەرگی دووەمی دۆزراوەتەوە کە لە موزەخانەی بەریتانی‌یەو بریتی‌یە لە ٢٣٢ پەڕەوەادیارە ابن المستوفي کتێبەکەی بۆ باسی گەورە پیاوانی هەولێرو ئەو ناودارانەی هاتوونەتە شاری هەولێر • تەرخان‌کردووە • ناوی تەواوی کتێبەکە « نباهة البلد الخامل و من ورد عليه من الاماثل »لەگەڵ ناوەرۆکی بەرگی دووەمی دۆزراوەی ئەوە دەسەلمێنن •

ابن المستوفي هەمانکات یەکێك بوو لە شاسوارەکانی مەیدانی ئەدەبو زوبانیش • لە دە بەرگی سەربەخۆدا هۆنراوە قورسەکانی متنبی‌و أبوتمامی

---

٤ ــ « نباهة البلد الخامل و من ورد عليه من الاماثل » ناوی تەواوی کتێبەکەیە کە بەکورتی بە « تاريخ اربيل » ناسراوە .

ێکەوتەوە[٥] . نووسینەکانی ابن المستوفي هەر زوو سەرنجی زانایانیان ڕاکێشاوە . ژمارەیەکی زۆر لەو زانایانە باسی پایەبلندیی ابن المستوفی‌یان کردووە ، یەکێکیان ابن خلکانی هاوشاریە .

شمس‌الدین احمد کوڕی أبو عبدالله محمد بهاءالدین کوڕی ابراهیم کوڕی أبو بکر کوڕی خلکان الاربیلی کە بە ابن خلکان ناسراوە ڕۆژی سێی مانگی نۆی سالی ۱۲۱۱ لە هەولێر لەدایك‌بووە[٦] .. ابن خلکان بۆ خۆی لە « وفیات الاعیان »دا نووسیویە کە لە شاری هەولێر هاتۆتە دونیاوە.

ابن خلکان ژیانی مندالی‌و سەرەتای لاویی لە هەولێر بردە سەرو هەر لەوێش بەردی بناغەی پتەوی زانیاریی خۆی لەسەر دەستی زانایانی شارو ئەوانەی بۆ سەردانی دەهاتن ، داڕشت . لە تەمەنی هەژدە سالیدا ابن خلکان هەولێری بەجێهێشت‌و ڕووی کردە شاری حەلەب کە ئەوسا غیاسەددینی کوڕی صەلاحەددینی ئەیوبیی فەرمانڕەوای بوو . دوای هەشت نۆ سال خوێندن چووە قاهیرەو لەوێوە چەند جارێك هاتە دیمەشق تا ڕۆژی ۲۱ی مانگی دەی سالی ۱۲۸۲ لێرە کۆچی دوایی کردو لە گردی قاسیۆن نێژرا .

ابن خلکان چ لە دیمەشق‌و چ لە قاهیرە جێگەی بڕواو متمانە بوو ، چەند جارێك بووە قازی‌و مامۆستای قوتابخانە بەرزەکانی ئەو ڕۆژگارە . هەرچەندە ابن خلکان وەك مێژوونووس ناوی دەرکردووە ، بەلام لە ئەدەبیشدا دەستی هەبوو ، شیعرەکانی تەڕو پاراون .

گەورەترین بەرهەمی مێژوویی ابن خلکان « وفیات الاعیان وأنباء ابناء

---

٥ ـ ناوی تەواوی کتێبەکەی « النظام في شرح شعر المتنبي وابی تمام »ە.
٦ ـ لە ناوچەی هەولێردا تائێستە دوو گوند بە ناوی خەلەکانەوە ناونراوە ، یەکەمیان لە گەلیی عەلی بەگدا بووە کە نەماوە ، دووەمیان کەوتۆتە ڕۆژهەلاتی هەولێرەوە ، نزیك ڕانیەو گوندی چنارانە .

الزمان »ە[٧] کەوا پێدەچێت نزیکەی بیست ساڵێك پێوەی خەریك بووبێت (لە ساڵی ١٢٥٩ەوە تاوەکو ساڵی ١٢٧٤) • ابن خلکان بۆ دانانی ئەو شاکارەی کەڵکی لە گەلێك سەرچاوەی ڕەسەنی کۆن وەرگرتووە کـــە زووربەیان نەگەیشتوونەتە ئێمە،ئەوەی نرخی «وفیات الاعیان » هێندەی تر زۆر دەکات• زانایان بەهۆی ئەو بەرهەمەی ابن خلکانەوە توانیویانە لە زۆر ڕووی گرنگی ژیانی سیاسیو ئابووریو ڕوناکبیریی ڕۆژهەڵاتی نزیكو ناوەڕاست لە سەدە ناوەنجییەکاندا تێبگەن • شایانی باسە ئەو دانەیەی « وفیات الاعیـان » کە ابن خلکان بۆ خۆی نووسیویەتەوە ئێستە بە یەکێك لە سامانە گەورەکانی موزەخانەی بەریتانیا دەژمێردرێت •

دەتوانین گەلێك نمونەی تری وەك ئەو مێژوونووسانە بهێنینەوە • ئەوان بە گشتیو دەگمەن بەتایبەتی باسی کورد یا ناوچەیەکی کوردســـتانیان کردووە • ئەوەی تائێستە زانراوە کەس بەر لە شەرەفخانی بدلیسی تێکڕای بەرهەمی خۆی بۆ مێژووی کوردو کوردستان تەرخان نەکردووە • دیارە هەر لەبەرئەوەش پێویستە جێگەیەکی دیار لـــەم بەشەدا بۆ شـــەرەفخانو شەرەفنامە تەرخانبکەین[٨] •

---

٧ ــ زیاتر بە « وفیات الاعیان » ناودەبرێت .

٨ ــ بۆ ئەم بەشە کەڵك لەم سەرچاوانە وەرگیراوە : چاپـــە جیـــاوازەکانی هەردووك بەرگی « شەرەفنامە » ( بە کوردیو عەرەبیو ڕووسی ) ، ی . ڤاسیلێڤا ؛ پێشەکی بەرگی یەکەمی چاپی ڕووسیی « شـــەرەفنامە » . مۆسکۆ ، ١٩٦٧ ، ل ١٢ ــ ٦٨ ، ی. ڤاسیلێڤا ، پێشەکی بەرگی دووەمی چاپی ڕووسیی « شەرەفنامە » ، مۆسکۆ ، ١٩٧٦ ، ل ١٢ ــ ٣٦؛ دوکتۆر م . شەمسی ، شەرەفنامەی شەرەف خانی بدلیسی وەك ســـەرچاوەی مێژووی گەلی کورد ، بە زمانی ڕووسی ، باکۆ ، ١٩٦٧ ؛ د. کەمـــاڵ مەزهەر ، « شەرەفنامە » لە کوردناسیی سۆڤێتدا ؛ ــ « شـــرفنامەی شرفخانی بدلیسی هەژار کردویە بە کوردی » ، لە چاپکراوەکانی « کۆڕی زانیاری کورد » ، نەجەف ، ١٩٧٥ ، ل سەتو شێست ــ ســەتو حەفتاو شەش ، الدکتور کمال مظهر احمد ،حول الشرفنامە والطبعـة الکردیة لهذا الاثر الکردي الخالد ، جریدة « التآخی » ، ٢٠ تشرین الثانی ١٩٧٣ .

شەرەفخان ڕۆژی ٢٥ی شوباتی سالی ١٥٤٣ لەدایك‌بوو . میر شەمسەددینی باوکی لە هۆزی ڕۆزەکی ( ڕۆژەکی )یە . هەشت سال پیش لەدایك‌بوونی شەرەف خان عوسمانی‌یەکان میر شەمسەددینی باوکیان لەسەر تەختی میری لابرد ، ئەویش لە ڕقدا دایە پال سەفەوی‌یەکانی دوژمنیان . لەبەرئەوە شەرەفخان بەشی هەرە زۆری سەرەتاو ناوەندی ژیانی لەگەل گەورە پیاوانی ئێراندا بردە سەر.لە تەمەنی هەشت سالی‌یەوە باوکی ناردی‌یە پایتەخت ، لەوێ چەند سالێك لەگەل کوڕانی شا توهماسبی یەکەم‌و[9] میرزادەکانی خزمیدا خوێندی .

شەرەفخانی بدلیسی لە تەمەنی دوازدە سالی‌یەوە تێکەل بە کاری میری بوو . سالی ١٥٥٤ ، واتە لەو تەمەنەیدا ، کرایە میری سەلیان‌و محەمەدئاباد لە ناوچەی شیروان کە کەوتوونە باکووری ئازەربایجان . باوکی شێخ ئەمیری بلباسی لەگەل نارد کە جێگەی متمانەی بوو . پاش سێ سال شەرەفخان گوێزرایەوە هەمەدان کە محەمەد بەگی خالی فەرمانڕەوای بوو . زۆری نەبرد هەر لەوێ شەرەفخان‌یەکێك لە خالۆزاکانی خواست . لە هەمەدان تا دەوروبەری سەرەتای سالی ١٥٦٠ مایەوە . سالی ١٥٦٦ نازناوی میری هۆزی ڕۆزەکیی پێ بەخشراو لەوساوە ماوەی دوو سالی لە قەزوین لە کۆشکی شادا بردەسەر .

سالی ١٥٦٨ شەرەفخان بووە فەرماندەی ئەو لەشکرەی ڕاپەڕینی خان ئەحمەد خانی لە لاهیجانی ناوچەی گەیلان دامرکاندەوە . شەرەفخان لەشکری هەژدە هەزارەی سولتان هاشمی جێگری ئەحمەدخانی بەزاند ، ئەو کارەی کۆتای بە یاخی بوونی هۆزانی گەیلان هێنا . بەلام لەگەل ئەوەش تابەتەواوەتی ئێمنی نەگەڕایەوە ئەو ناوچەیە شا ڕێگەی نەدا شەرەفخان

---

٩ ـ شا تەهماسبی یەکەم .

بگەڕێتەوە پایتەخت ، کە گەڕاشەوە زۆری نەبرد دیسان ناردی‌یەوە باکووری ئازەربایجان .

سالی ١٥٧٦ کە شائیسماعیل هاتەسەر تەخت شەرەفخان کرایە میری میرانی هۆزانی کوردی ئێران . هەرچی کاری گەورەی کوردستانو لوڕستان هەبوو بەو سپێردرا . بەلاّم کە قزلباشەکان شا ئیسماعیلیان بە سونی دۆست تاوانبار کرد شەرەفخانی دوورخستەوە نەخچەوان . زۆری نەبرد کە سالی ١٥٧٨ شا ئیسماعیل کوژراو محەمەد خودابەند هاتە جێگەی‌و ئێران کەوتە گێژاوی ئاژاوەیەکی گەورەوە ، لەلایەکەوە قزلباشەکان یاخی‌بوونو لە لایەکی تریشەوە لەشکری عوسمانی کەوتە پەلامارداني ئازەربایجان . عوسمانی‌یەکان توانی‌یان هەستی شەرەفخانی داخ‌لەدڵ بە لای خۆیاندا ڕابکێشن ، تایبەت دوای ئەوەی توانی‌یان لە ڕێگەی خەسرەو پاشای میری میرانی وانەوە پێوەندی لەگەڵ دابمەزرێنن . بەوجۆرە لە سەرەتای مانگی کانونی یەکەمی سالی ١٥٧٨وە شەرەفخان دایە پاڵ عوسمانی‌یەکانو بە خۆی‌و ٤٠٠ چەکدارەوە لە نەخچەوانەوە ڕووی‌کردەوە کوردستان .

لەوساوە بۆ ماوەی دە ساڵ شەرەفخانی بدلیسی لەو شەڕانەی سولتان موڕادی سێیەمدا بەشداریی‌کرد کە بۆ داگیرکردنی ناوچەکانی قەفقاس دژی ئێرانی‌یەکان هەلگیرساندن ، ئەو کارەی بووە هۆی ڕەزامەندیی سولتان موراد کە بە نامەی تایبەتی سوپاسی خۆی پێ ڕاگەیاند . سولتان نازناوی خانو فەرمانڕەوایی ناوچەی بدلیسی بە خۆی‌و نەوەی بەخشی . شەرەفخان بۆ ماوەیەکی کورت کاری بدلیسی گرتە دەستو لە تەمەنی ٥٣ سالیدا خۆی بۆ مێژووی کورد تەرخان‌کردو ئەبولمەعالی شەمسەددین بەگی کوڕی لە جێگەی خۆی دانا . جا لێرەدا گەر توزێك ئەوە بهێنینەوە یاد کە بەدرێژایی مێژوو زۆر بەدەگمەن هی واهەلکەوتوون لەبەر خاتری هیچ شتێك ، تەنانەت

تەندروستی خۆشیان،دەست لە چمکێکی دەسەڵاتیان هەڵبگرن نەك هەمووی، ئموساکە باشتر لە پایەبڵندیی شەرەفخانی بدلیسی تێدەگەین.

بەوجۆرە شەرەفخان ٣٢ ساڵی ژیانی لە ناوجەرگەی ڕوداوە گەورەکانی ئێران‌و تورکیاو کوردستاندا بردەسەر . یازدە ساڵی دوا بەشی ژیانیشی بۆ خزمەتی مێژووی کورد تەرخانکرد .

تائێستە ساڵی وەفاتی شەرەفخانی بدلیسی بەتەواوەتی ساغ نەبۆتەوە. ضیاء شەرەفخان کە یەکێکە لە نەوەی مێژوونووسی گەورەمان‌و ئێستە وا نە لوبنان لەو نامە تایبەتی‌یەیدا کە لە وەڵامی مامۆستا هەژاردا نووسیویە دەڵێت شەرەفخانی باپیرە گەورەی ساڵی ١٦٠٣ یا ١٦٠٤ وەفاتی کردووە[١٠]. من پێم‌وایە شەرەفخان بەر لەو ساڵانە مردووە . هەرچۆن لێکی‌بدەیتەوە دەبێت شەرەفخان دوای تەواوکردنی « شەرەفنامە » ، واتە دوای هاوینی ساڵی ١٥٩٨ بە ماوەیەکی کورت کۆچی دوایی کردبێت ، چونکە ڕێگەی تێناچێت ئەو پیاوەی لەپێناوی زانستدا دەسەڵاتی خستە لاوە دوای « شەرەفنامە »قەڵەمیشی خستبێتە لاوە . وابزانم ئەم بۆچوونە هێندەی‌تر خۆ دادەسەپێنێت گەر ئەوە لەیادنەکەین کەوا شەرەفخان لە ساڵێك‌و تەنها چەند ڕۆژێك زیاتری نەویست بۆ دانانی بەرهەمێکی قووڵی وەك بەشی دووەمی « شەرەفنامە » کە بە دەستخەت ٣٠٨ لاپەڕەی گەورەی پڕکردۆتەوە. بێ‌گومان گەر ژیان مۆڵەتی بدایە ڕشتەیەکی مرواریی ڕەسەنی‌تری پێشکەش کوردو زانست دەکرد . کەوابێ دەبێت شەرەفخان دوای مانگی نۆی ساڵی ١٥٩٨ بە ماوەیەکی کەم کۆچی دوایی کردبێت ، یا لەتاو نەخۆشی یەکی‌کەوتبێت . نەخۆشی‌یەکیش زانایەکی وەك ئەو لە نووسین بخات دەگمەن مۆڵەتی زۆری ژیان‌و مان دەدات . مامۆستا ئەمین زەکی کە نەخۆشی زۆری بۆ هێناو پەنجەکانی پەکیان‌کەوت سانیحەی کچی کردە قەڵەم .

---

١٠- چاپی کوردیی « شەرەفنامە » ، ل ٧٩٠ - ٧٩١ .

شەرەفخانی بدلیسی لە هەرەتی لاوی‌یەوە حەزی لـە مێژوو دەکردو دەیویست خۆی بـە نووسـینی‌یەوە خەریکبکات • بۆ خۆی لەم‌بارەیەوە نووسیوەیە دەڵێت :

« من کە نووسەری ئـەم ڕوپەڕانەم[11] ••• لە هەرەتی جوانی‌و هەرەمەی بەهاری ژیانمدا ، لەدوای ئـەوە کە دەستی ڕاستو چەپی خۆم ناسی‌و لە خوێندەواریدا هێزو پێزم پەیداکردو هەزارەو دولایی زانستی‌یە ڕواڵەتی‌و نهێنی‌یەکانم یەکلا کردەوە هەرچی بۆ دونیاو دینم پێویست بوو لە هەر شتەی زۆر شتم زانی‌و بە سەرڕاستی‌و کارامەیی کەوتمە سـەر کاروباری دیوانی ، لەو سەروبەندەدا هەتا لافـاوی وەرەزی ڕووی تێدەکردم ، بـە خوێندنەوەی چیرۆکانو دیرۆکان بەرم‌دەگرت •

هەچەند جارێ تەموژی پەژارەو کەسـەرم بەسـەردا دەهات بە سروەی بیرەوەری ڕوداوی ڕابردوان دەمرەتاندو دەرم دەکرد • هەرچەندی کزەو سۆزەی ساردو سڕی ناهومێدی نیازی وابوایە بەلامدا تێپەڕێ ، بە پێداچوونەوەی سەرگوروشتەی میرو مەزنەکانی پێشوو خۆم سەرگەرم دەکرد ، تا وام‌لێ‌هـات لەو هونەرە جوانەدا بوومە بژاردەو لە لێ‌دوانی‌یەوە بوومـە دەموڕێ ڕەوانێکی وەها کە دنەی دامو هێنامی‌یە سـەر ئەو بڕواو بیرە کە بەپێی توانا منیش چەند گەوێك بخەمە ئەو زنجیرەوە •

ئەوسا ( واتە لە هەرەتی لاویدا ــ ك•م• ) مرخی خۆم وا لێ خۆش‌کردبو کە لەم زانستە بەمایەو هێژاو پڕبەهایەدا نووسراوێکی ئەوەندە بەنرخو سەربەخۆ بخەمەڕوو کە هەرگیز بەر لە من دەستی

---

١١ــ هەموو گوتەکانی شـەرەفـخان لە چاپەکەی مامۆستا هەژار وەرگیراون .

مێــژوونووسانی پێش خۆمی بێ ڕانەگەیشتبێو ئـــەوەی من دەیخەمە بەرچاو کەسی‌تر وەك خۆمی تێنەگەیشتبێ » ٠

ئەم‌قسانە تەنها ئەوە ڕاناگەیێنن کە شەرەفخان لە زووەوە خولیـــای ...وو کەوتۆتە سەری ، بەڵکو هەمان‌کات پلەی بەرزی خوێندەواریی ئــەو ...ەمو بڕوای زۆری بە تواناو دەسەڵاتی زانستیی خۆی نیشان‌دەدەن ٠ ئەو ...انە لەڕاستیدا یەکەم نرخاندنی ڕەوای « شەرەفنامە »ن ٠

شەرەفخان بۆ خۆی مەبەستی دانانی « شـــەرەفنامە »ی بەم‌جۆرە ...یر کردووە :

« منی بێ‌تین‌و توان‌و بێ‌دەست‌و زوان کەوتمە ســەر ئەو خەیاڵە کە بەئەندازەی وزەو توانای خۆم ئەوەندەی بۆم لوا لــە باس‌و خواسی گەورە پیاوان‌و خــاوەن ناوان‌و ســـەرداران‌و خونکارانی کوردو کوردستان کۆبکەمەوەو ئەوی لــە مێژووی عەجەماندا خۆم دیتومەو ئەوەی لە پیاوە پیرە ژیرەکانی ڕاســت‌و بێ‌درۆوە بیستومە بینوسمەوەو ناوی‌لێ‌بنێم «شـــەرەفنامە» ٠ هەموو نیازو ئاواتیشم هەر ئەمەیە کە خــانەدانە گــەورەکانی کوردستان ناویان لەناونەچن » ٠

ئاواتی بەرزی شەرەفخانی بدلیسی هاتەدی ، ئەو « شەرەفنامە»یەی گەوهەری لێ دەبارێ چاوی کوردو زانایانی ڕۆشن‌کردەوە ، بووە یەکێك لە سەرچاوە هەرەڕەسەن‌و بایەخدارەکانی کتێبخـــانەی مێژوویی گــەلانی ڕۆژهەڵات ٠

« شەرەفنامە » لە دوو بەش پێکهاتووە کەوا دیارە شەرەفخان لە ساڵی ١٥٨٨وە دەستی‌کردووە بە کۆکردنەوەی سەرچاوەو زانیاریی بۆیان٠ مانگی ئابی ساڵی ١٥٩٧ شەرەفخان لە بەشی یەکەمیـــان بۆوە ٠ خــــاوەنی

« شەرەفنامە » ئەوبەشەی بۆ مێژووی کوردو کوردستان ، یا خۆی گوتەنی بۆ « یەکالآ کردنەوەی بنچ‌و بناوانی کوردو ڕوونکردنەوەی باری ژیـــانو چۆنیەتی ئاکاریان بەدرێژایی مێژوو » تەرخانکرد • یەکەم چاپی ئەو بەشەی « شەرەفنامە » بریتی‌یە لە ٤٥٩ لاپەڕە •

بەشی یەکەمی «شەرەفنامە» لە بەشی دووەمی زیاتر سەرنجی ڕاکێشاوەو خوێنەران بەهۆی وەرگێڕانی‌یەوە بۆ سەر زوبانی کوردی زۆرتر ئاگادارین• لەبەرئەوە وای بە پێویست دەزانین بەرلەوەی بکەوینـــە هەڵسەنگاندنی « شەرەفنامە »و دیارکردنی بایەخ‌و نرخی مێژوویی سەرنج بۆ چەند لایەنێکی کەم‌زانراوی بەشی دووەمی ڕابکێشین •

شەرەفخان ڕۆژی ١٣ی ئابی سالی ١٥٩٧ دەستی‌کرد بە دانانی بەشی دووەمی « شەرەفنامە »و دەوروبەری کۆتایی ئاب یا سەرەتای ئەیلولی سالی ١٥٩٨ تەواوی‌کرد • زۆر جار ئەم بەشی دووەمەی «شەرەفنامە» بە «خاتیمە» ناودەبرێت •

« خاتیمە » بۆ باسی سولتانەکانی ئالی‌عوسمان‌و پادشـــاکانی ئێران‌و توران‌و بەسەرهاتەکانی کوردستان لەنێوانی سالآنی ١٢٨٧و ١٥٨٧دا ، واتە لە ماوەی سێ‌سەدەی ڕەبەقدا تەرخان کراوە[١٢]، کەوابێ ڕۆژگاری دامەزراندنی بنەماڵەی عوسمانی سەرەتاو ڕۆژگاری شەرەفخانی بدلیسی کۆتایی بەشی دووەمی « شەرەفنامە »یە • « خاتیمە » زۆرجار دێتە ســـەر گێڕانەوەی هەواڵەکانی سەردەمی هۆلاکوو چەنگیزو تەیمورو ئاق‌و قەرە قۆینللو •

هەرچەندە بە بارست « خاتیمە » شتێکی ئەوتۆی لــە بەشی یەکـەمی

---

١٢ـ شەرەفخان سەرەتای بەشـــی دووەمی « شـــەرەفنامە »ی وەهـــا دەستپێ‌کردووە: «خاتمە در بیان احوال سلاطین حشمت ایین آل عثمان‌و پادشاهان ایران‌و توران ... » •

« شەرەفنامە » کەمتر نی‌یەو[١٣] بە ناوەرۆکیش وەك ئەو ڕەسەن‌و دەوڵەمەندە
…کام ، وەك وتمان ، لەو کەمتر سەرنجی شارەزایانی ڕاکێشاوە[١٤] ٠ هۆی
ئەمەوە ئاشکرایە ٠ زوربەی باسەکانی بەشی یەکەمی « شەرەفنامە » کەس بەر لە
…ەری توخنیان نەکەوتووە ، لەبەرئەوە هەرکەس کەم‌و زۆر خۆی بە مێژووی
کوردستانی کۆنەوە خەریك کردبێت ناچار پەنای بردۆتەبەر ٠

بێ گومان ئەمە وا ناگەیێنێ باسەکانی بەشی دووەمی « شـەرەفنامە »
کەم بایەخن ٠ ئەو بەشەش پڕی‌یە لە باسی ڕوداوی دەگمەن‌و هەواڵی ڕەسەن‌و
بەڵگەی گرنگی وەك نامەو فەرمانی سوڵتان‌و شاکان کە هی‌وایان تێدایـــە
دوایی بۆ مەبەستی سیاسیی دەستکاری کراون‌و تێکدراون، «شەرەفنامە»و
ئەوانەی لە پایەی بەرزی « شەرەفنامە »دان ڕاســـتی‌یان وەك خۆی بۆ
پەراستوین ٠ جگە لەوە هەر ئەو بەرگە باسی گەلێك ڕوداوی ڕۆژهـەڵاتی
ناوەڕاستی سەدەی شازدەی تێدایە کە شەرەفخان یا بۆ خۆی تیایاندا بەشدار
بووە یا لە دەمی بەشدارانی بیستوونەوە ، ئـــەو باســـانەی لە مەیدانی
لێکۆلینەوەی مێژوویدا دەچنە خانەی سەرچاوەی ڕەسەنی باوەڕپێکراوەوە٠
لێرەدا وەك بەڵگە چەند نمونەیەك دەخەینە بەرچاو ٠

بەهۆی گەلێك ســـەرچاوەی کۆنەوە مێژوونووسان ئاگادارن چۆن
ڕۆکسلانەی بە ڕەگەز ڕووسی هاوســەری خۆشەویستی ســولتان سلێمانی
دادپەروەر ( ١٥٢٠ ـــ ١٥٦٦ ) توانی‌وا لە سولتان بکات مســـتەفای کوڕە

١٣ـــ یەکەم چاپی بەشی دووەمی « شەرەفنامە » ٣٠٨ لاپەڕەیە ٠
١٤ـــ زۆر جار دەقی فارسیی بەشی یەکەمی « شەرەفنامە » بەتەنها چاپ کراوە، وەك چاپی قاهیرەی ساڵی ١٩٣١ی‌و چاپی تارانی ساڵی ١٩٦٥ی ٠ ساڵی ١٩٦٢ بەرگی دووەمی چاپی عەرەبیی قاهیرەی بلاوکرایەوە ، واتـە پاش چوار ساڵ لە چاپی بەرگی یەکەمی ٠ مامۆستایان مەلا جەمیلی ڕۆژبەیانی‌و هەژاری شاعیر تەنها بەشی یەکـەمی « شــەرەفنامە »یان وەرگێڕاوە ، یەکەمیان بۆ عەرەبی‌و دووەمیان بۆ کوردی ٠

گەورەی کە لە یەکێك لە هەوێکانی بوو بیکوژێت بۆئەوەی تەختی پاشایی بۆ سەلیمی کوڕی خۆی بهێنێتەوە • بەڵام بەرگی دووەمی « شەرەفنامە » نەبوایە کەس نەیدەزانی سەی محەمەدی میری هەکاری دەستی لە ڕێکخستنی ئەو پیلانە گەورەیەی ناو کۆشکی بەدەسەڵاترین پاشای ئەو ڕۆژگارەدا هەبوو. ئەو پاشایەی ئەوروپاو ئەفەریقاو ئاسیای هێنابووە لەرزین • شەرەفخان لە بەرگی دووەمی « شەرەفنامە »دا ئەو ڕوداوەی بەمجۆرە تۆمار کردووە :

«سالی ٩٦٠[١٥] : سولتان سلێمانی غەزاکەر بۆ گرتنی ئێران ئەستەمونی پایتەختی بەجێهێشت • کە کەژاوەی سولتان گەشتە ناوچەی ئەرکەلی لەوێ دەوارو خێوەتی هەڵدا میر سولتان مستەفای کوڕی بە لەشکرێکی گەورەوە لە ئەماسیەوە هاتە دیدەنی •

ڕۆستەم پاشای وەزیری گەورە کە ترسی زەبرو دەسەڵاتی میری لێ نیشتبو بە یاریدەی سەی محەمەدی فەرمانڕەوای هەکاری نامەیەکی ساختەی بە ناوی شا توهماسبەوە ڕێکخستو گەیاندیە سولتان • کە سولتان چاوی بەو نامەیە کەوت غەزەب گرتی‌و یەکسەر فەرمانی گرتنی میری داو بەنهێنی خنکاندی »[١٦] •

نمونەیەکی‌تر : کە سالی ١٥٦٧ ئیسماعیلی دووەم هاتە سەر تەختی پاشایی گەنجینەی پڕ زێڕو گەوهەری شا توهماسبی باوکی خستە بەردەستی شەرەفخان بۆئەوەی تۆماری سامانی ئەو گەنجینەیەی بۆ بگرێت • دیارە

---

١٥ـ مەبەست ڕودلوەکانی سالی ٩٦٠ی کۆچی‌یە کە دەکاتە سالی ١٥٥٢ ـ ١٥٥٣ی عیسایی •

١٦ـ جلد دویم از کتاب شرفنامه تالیف شرفخان بن شمس‌الدین بدلیسی که باهتمام اقل عباد ولادیمیر ملقب ولیامینوف زرنوف در محروسه پطربورغ در دار الطباع اکادیمیه ایمپراطوریه سنه ١٨٦٢ عیسوی مطابق سنه ١٢٧٨ هجری مطبوع گردید ، ص ٢٠٦ ، چاپی عەرەبیی قاهیرە • ص ١٨١ ـ ١٨٢ •

هیچ سەرچاوەیەك ناگاتە ئەوەی شەرەفخان دەربارەی سامانی شا توهماسبی نووسیون ، ئەو بە ژمارەو بە سەنگ باسی زیوو زێڕو بەرگی ئاوریشم و چەکو جبەخانەو ولاغی کەحیلەی کۆشکەکانی شا توهماسبی کردووە . وەك دەڵێت ۳۸۰ هەزار تمەنی زیوو زێڕو ملیۆنێك و ۸۰۰ هەزار مسقاڵ زیوو زێڕو ۸۰۰ کڵاوی زیوو زێڕی دوای خۆی بەجێهێشتووە ، گوایە هیچ پشاو سولتانێك لە ڕۆژی هەڵهاتنی خۆری ئیسلامەتییەوە بەڕادەی ئەو کەلوپەلی گرانبەهای لێ بەجێنەماوە[17] .

ڕاپەڕینی گەیلانو دامرکاندنەوەیو لێدانی دانیشتوانی ئەو ناوچەیە لەو باسە مێژووییە گرنگانەن کە شەرەفخان بۆ خۆی لە دروستکردنیاندا بەشداربووە ، بۆیەکا ئەوی ئەو لەبارەیانەوە نووسیویە باشترین سەرچاوەیە بۆ تێگەیشتنو نرخاندنی ڕووداوەکانیان . بە هەمان دەستوور بایەخی مێژوویی ئەوی شەرەفخان دەربارەی شەڕی عوسمانییان بۆ داگیرکردنی ناوچەکانی قەفقاس لە ماوەی دە ساڵی نێوانی ۱۵۷۸و ۱۵۸۸دا دەیگێڕێتەوە یەکجار زۆرە چونکە خۆی یەکێك بووە لە سەردارە گەورەکانی ئەو لەشکرەی داگیرکردنی گورجستانی پێسپێردرا .

وێڕای هەموو ئەمانە « خاتیمە » سەرچاوەیەکی گرنگە بۆ ڕوونکردنەوەی گەلێك لایەنی مێژووی گەلی کورد ، تایبەت ئەوانەیان کە پێوەندییان بە ڕووداوەکانی سەدەی شازدەوە هەیە ، لە هەمووشیان زیاتر دەوری کورد لە شەڕە قورسەکانی ئەو قۆناغەداو باسی ئەو ناوچانەیتری کوردستان کە لەو ڕۆژگارەدا کەوتنە ژێردەستی عوسمانییەکانەوە . ئەوەی شەرەفخان دەربارەی ئازایی و نەبەردیی بوختییەکانی قەڵای ئەرجیش دەیگێڕێتەوە شتێکی ئەوتۆی لە داستانی قەڵای دمدم کەمتر نییە . شەرەفخان لە

---

۱۷ــ « شەرەفنامە » ، بەرگی دووەم، چاپی پیتەربورگ ، ل ۲۵۱ــ۲۵۲، چاپی قاهیرە ، ل ۲۱۹ ــ ۲۲۰ . .

« خاتیمە »دا دەربارەی بەسەرهاتەکانی سالی ۹۵۹ی کۆچی (۱۵۵۱ــ۱۵۵۲ی عیسایی ) نووسیویەیە دەلیت :

« ... رەمەزانی ئەو سالە لەشکری شا تەهماسب رووی‌کردە ویلایەتی وان‌و ئابلوقەی قەلای ئەخلاتی دا . لەبەرئەوە کە ئەو قەلایە کەوتبووە سەر بەردی ناڕەق‌و ناپتەو وەستاکان لە هەر چوار لاوە کەوتنە لیدانی زێراب . ئەوانەی ناو قەلاکە ناچار خۆیان دا بەدەستەوە ... دوای ئەوە شا رووی‌کردە ئەرجیش‌و فەرمانی‌دا بە توندی ئابلوقەی قەلاکەی بدەن . قزلباشەکان تەواو گەمارۆیان داو چۆن توانی‌یان کەوتنە شەڕ لەگەل ئەوانەی ناویدا . بەلام رۆژ هات‌و رۆژ رۆیی ، ئابلوقە لە چوار مانگان تێپەڕی ، زستان‌و سەرماو سۆلەو بەفرو باران لەگەل زریان دەستی‌پێ‌کرد ، شا تەهماسب کە بە خۆی‌و لەشکری‌یەوە لە چلەی زستاندا لەناو خێوەتان کەوتبووە بەر بەفرو باران دەستی هەلنەگرت ، فەرمانی دایە پیاوەکانی هیچ دەرفەتێك ( بۆ ئەوانەی ناو قەلاکە ــ ك . م . ) نەهێلنەوە .

بە ڕێکەوت ئەوساکە چەند دەستەیەك لە بوختی‌یەکانی وەك میر برایمی گورگیلی‌و پیاوەکانی لەناو قەلاکەدا بوون‌و بە هیچ‌جۆر ئامادە نەبوون خۆبدەن بەدەستەوە،بەپێچەوانەی ڕۆمەکانەوە کە پاش ئەو هەموو بەرگری‌یە دەیانویست تەسلیم بن . ئەوان لە ژێرەوە لەگەل قزلباشە ئابلوقەدەرەکاندا ڕێك‌کەوتن‌و گوریس‌و پەیژەیان بۆ شۆڕکردنەوەو دەستەیەکیان لێ گەیاندنە ناوەوەو پێکڕا بە تیرو تفەنگ هێرشیان بردە سەر بوختی‌یەکان کە نەیاندەویست دەست لە شەڕ هەلبگرن‌و قەلا بەدەستەوە بدەن ، پەسێوەیان دان‌و ناچاریان کردن بخزێنە لایەکەوەو ئەوجا بۆ خۆیان قەلایان دایە دەست پیاوانی شا تەهماسب کە یەکسەر فەرمانی کوشتنی بوختی‌یە پالەوانەکانی دا، هەر لەوێدا پێستی سەریان بە زیندوویی گورووتن »[18] .

---

۱۸ــ هەمان سەرچاوە ، چاپی پیتەربورگ ، ل ۲۰٤ ــ ۲۰٦ ، چاپی قاهیرە ، ل ۱۸۰ ــ ۱۸۱ ، چاپی ڕووسی ، ل ۱۹۷ ــ ۱۹۸ .

زۆر لایەنی‌تری « خاتیمە » شایانی پیاگوتن‌و پیاهەڵدانن ، جا خۆزیا حەی ڕەنگینی هەژاری شاعیری هێژا ئەویشی دەکردە دیاری‌یەکی بەهاداری ری بۆ خوێندەواری کوردو کتێبخانەی کوردی‌و گەنجینەی سەرچاوە مێژوویی‌یە دێرینەکانی ڕۆژهەڵات .

شەرەفخانی بدلیسی لە مەیدانی مێژووناسیدا ، بە سەنگ‌و تەرازووی یکانە بەر لە سەنگ‌و تەرازووی خۆمانە ، شۆڕەسواری مەیدان بوو ، ەیزانی چۆن دەنووسێ‌و چی دەنووسێ‌و لەکوێوە ناودڵی نیشان دەپێکێ . ۆخۆی دەیگوت مێژوو « لە سەروو هەموو هونەرانەوەیە » چونکە « پڕی‌یە ە ئامۆژگاری » ، «بەسەرهاتی ڕابردوانمان بیردەخاتەوەو دەوری کەونارامان ێ نزیك‌دەکاتەوەو ئاوڕی ئەمەگدارانە لە ڕابردوانمان دەداتەوە » .

شەرەفخان بۆ دانانی « شەرەفنامە » کەلکی لە گەلێك سەرچاوەی عەرەبی‌و فارسیی کۆن‌و ڕەسەن وەرگرت ، قسەو باسی پیران‌و بەرهەمی شاعیران‌و گۆرانی شایەران‌و تاقی‌کردنەوەکانی خۆشی کردنە سەرچاوەی بەکەلك . شەرەفخان وەستایانە ئەو کەرەستە دەولەمەندەی بەکاردەهێنا ، زۆر بەوردی سەرنجی لێ دەدان ، هەموولایەکی هەڵی‌دەسەنگاندن‌و تەتەڵەی دەکردن . ی . ڤاسیلیێڤا لەم‌بارەیەوە نووسیویە دەڵێت :

« وا پێ‌دەچێت نووسەر ( واتە شەرەفخان ـ ك . م . ) بە ئەوپەڕی دوودڵی‌یەوە دەیڕوانی‌یە ئەو هەواڵانەی ( لە خەڵکی دەبیستنەوە ـ ك . م . ) ، کەی گومانی لە ڕاستی‌و دروستی‌یان نەبوایە ئەوساکە بەکاری دەهێنان »[19] .

جا لێرەدا گەر بڵێین ئەم قسانەی ڤاسیلیێڤا ، وەك هەموو قسەکانی‌تری، بەرهەمی خەلوەتی پازدە شازدە ساڵەین لەگەڵ هەردوو بەرگی « شەرەفنامە »دا ئەوساکە ، بێ‌گومان ، زیاتر لە نرخ‌و بایەخیان تێ‌دەگەین .

---

١٩ـ « شەرەفنامە » ، بەرگی دووەم ، چاپی ڕووسی ، ل ١٦ .

بابەتەکی[٢٠]و بێلایەنی ، ئــــەو دوو مەرجــــە گرنگ‌و پێویستەی سەرکەوتنی مێژوونووس ، ئاشکرا بە نووسینەکانی شەرەفخانەوە دیارن • ئەو کاتەی شەرەفخان دەستی دایە نووسینی « شەرەفنامە » پێوەندی لەگەڵ شا سەفەوی‌یەکاندا خراپ‌و لەگەڵ سوڵتانە عوسمانی‌یەکاندا چاك بوو ، کەچی کە هاتۆتە سەر باسی هەر کامێکیان هەوڵی‌داوە بە هیچ جۆر چاو لە ئاستی ڕاستیدا نەنوقێنێت • بەوێنە شەرەفخان تا ڕادەیەکی زۆر وەك یەك بە شانۆ باهووی شا توهماسب‌و سوڵتان مورادیدا هەڵداوە ، خۆی لەوە کەڕ کردووە کە شاو سوڵتانەکان شێرو تیریان لە یەك دەسوو • بۆ ئەو ڕۆژگارە کەم نەبوو بە شا توهماسب بگوترێت « پادشایەکی دادپەروەرو کامڵ‌و ڕەعی‌یەت پەروەر بوو »[٢١] •

ئەوانەی باسمان‌کردن‌و چەند هۆیەکی‌تری وەك ئەوان وایان لە ی • ڤاسیلێڤا کردووە بڵێت « پێم‌وایە سەرچاوەیەك نی‌یە بەڕادەی ٠٠٠«خاتیمە» بابەتەکی‌و ڕاست‌گۆیانە وێنەی ژیانی ناوەوەی ئێرانی نیوەی دووەمی سەدەی شازدەی بۆ کێشابێن ، تایبەت لەو ڕۆژگارە تاریکەیدا کە ساڵی ١٥٧٦ بــــە مردنی شا توهماسب دەستی‌پێ‌کرد »[٢٢] •

دیارە لەخۆڕاش نی‌یــە زانایەکی گــەورەی وەك پ • پێتروشێڤسکی « شەرەفنامە » دەگەێنێتە پایەی سەرچاوە ئەرمەنی‌یە کۆنەکان کە کەس نی‌یە گومان لــە نرخی زانســتیی بەرزیان‌بکات[٢٣] • ڤلیامینۆڤ زێرنۆڤ بــە

---

٢٠ــ بابەتەکی‌ی = الموضوعية •

٢١ــ « شەرەفنامە » ، بەرگی دووەم ، چاپی پیتەربورگ ، ل ٢٥١ ، چــاپی قاهیرە ، ل ٢١٩ ــ ٢٢٠ •

٢٢ــ « شەرەفنامە » ، بەرگی دووەم ، چاپی ڕووسی، پێشەکیی ی. ڤاسیلێڤا، ل ٢٢ •

٢٣ــ ی . پ . پێتروشێڤسکی ، لێکۆڵینەوەی مێژووی پێوەندی‌ی دەرەبەگی لە ئازەربایجان‌و ئەرمینیا لە سەدەی شازدەوە تا سەرەتای سەدەی بیست، بە زوبانی ڕووسی ، لێنینگراد ، ١٩٤٩ ، ل ٣١ •

ڕستەیەکی زور کورت هیچی بۆ کەس نەهێشتۆتەوە دەربارەی «شەرەفنامە» بڵێت . ساڵی ١٨٦٠ زێرنۆف نووسیویە دەڵێت : « لـە ماوەی دەوروبەری ٣٠٠ ساڵدا لە ڕۆژهەڵات هیچ بەرهەمێك نەهاتۆتە گۆڕێ بتوانێت شـان لە شانی « شەرەفنامە » بدات »[٢٤] . وەك دوایش باسی دەکەین بایەخپێدانی بێئەندازەی زانایان بە « شەرەفنامە » بەڵگەیەکیتری پایەبڵندیی ئـەو سەرچاوەیەیە . دوکتۆر شەمسی[٢٥] سەبارەت بەمباسە نووسیویە دەڵێت :

---

٢٤- « شەرەفنامە » . بەرگی یەکەم . چاپی پیتەربورگ . ل ٩ .

٢٥- ساڵی ١٩٦٧ دوکتۆر م. شەمسی لە ئەنستیتوی مێژووی سەر بە کۆڕی زانیاری ئازەربایجانی سۆڤیەت بڕوانامەی دوکتورای لەسەر «شەرەفنامە» وەرگرت . نامەی دوکتوراکەی « شەرەفنامەی شەرەفخانی بدلیسی وەك سەرچاوەی مێژووی گەلی کورد» ساڵی ١٩٧٢ لە کتێبێکی سەدو چلوسێ لاپەڕەیدا بە زوبانی ئازەری چاپکرا ( مەمید ئەسـکەندەر ئۆغلی . شەرەفخان بدلیسینی « شەرەفنامە » ئەسەری کورد خەلگنن تاریخی منبعی کیمی ، باکی ، ١٩٧٢ ) . بەرلەوەش کورتـەی بـە ڕووسـی بڵاوکرایەوە . دوکتۆر شەمسی لەو بەرهەمەیدا گەلێك زانیاریی گرنگی دەربارەی « شەرەفنامە »و مێژووی کوردو کوردستان بڵاوکردۆتەوە کە شایانی نرخاندنی بەرزن . بەڵام لەگەڵ ئەوەش کەوتۆتە چەند هەڵەیەکی کەمەوە کە بۆ کاری زانستیی وەك ئەوەی ئەو ئاسایین . شایانی باسـە ی. ڤاسیلیێڤا وەستایانە وەڵامی ژمارەیەك لە هەڵەکانی دوکتۆر شەمسی داوەتەوە ( بڕوانە : « شەرەفنامە » ، بەرگی دووەم ، چـاپی ڕووسی . ل ١٩ ـ ٢٠ ) . من لێرەدا دەمەوێت سـەرنجی خوێنەوارانو دوکتۆر شەمسی بۆ تەنها یەك ڕاستیی بایەخدار ڕابکێشم. د. شەمسی نیوەی شەرەفخانی لێ زەوتکردوین بەوەی دەڵێت : « نووسـەری شەرەفنامە شەرەفخانی بدلیسی ساڵی ١٥٤٣ لە شارۆکەی گومی ناوچەی قەرەخرود لەدایك بووە . ئەمیر شەمسەددین بدلیسیی بلوکی کە لە هۆزی کوردی ڕۆژەکییە دوای ئەوەی دەوڵەتی عوسمانی میرنشینی بە میرات بۆ ماوەی لێ سەندەوە ساڵی ١٥٢٥ هاتە ئازەربایجان. کاتێك لەگەڵ سەفەوییەکاندا کاری دەکرد میر شەمسەددین کچی ئەمیرخان موسولوی خواست کـە بلوکی یەکێك لە سەردارانی قزلباشو چاودێری کەرانی شاتوهماسبی یەکەم بوو . لەبەرئەوە شەرەفخانی بدلیسی لە باوکەوە کوردو لە دایکـەوە ئازەربایجانییە » ( بڕوانە لاپەڕە پێنجی کورتەی نامەی دوکتۆراکەی بـە

←

« ئەم کارە بەهادارە ( واتە « شـەرەفنامە » ـ ك . م . ) سەرچاوەیەکی نایابە بۆ لێکۆڵینەوەی نەك تەنها مێژووی کورد . بەڵکو هی ئازەربایجانو ئێرانو تورکیاو وڵاتانی دراوسێیتری کوردســتان . لەخۆڕا نییە نووســەرانی چەرخـەکانی دوای ( شـــەرەفخان ـ ك. م. ) لە « شـــەرەفنامە » زیاتر کەڵکیان وەرگرتووە وەك لە سەرچاوەیتر »[٣٦] .

« شەرەفنامە » چەند بە ناوەرۆك دەولەمەندە هێندەش لە ڕووی زوبانەوە دەولەمەندو پتەوە . شەرەفخان بۆ خۆی لە ســـەرەتای بەشی یەکـەمی « شەرەفنامە »دا دەڵێت مێژوونووس پێویستە نووسەری « چاکی دەستو قەڵەم ڕەنگین » بێت . کەســێکی شــارەزا نییە دان بەوەدا نەنێت کـە شەرەفخانی بدلیسی بەڕاستی نووسەرێکی چاکی دەستو قەڵەم ڕەنگین بوو . با لێرەدا پەنا بەرینە بەر قسەی شارەزایانی خۆمان . هەژاری شاعیر کە بەشێکی تەمەنی لە میحرابی « شەرەفنامە »دا بردەسەرو بۆ خۆی شۆڕە سواری فارسیو کوردییە[٣٧] لەمبارەیەوە نووسیویە دەڵێت :

---

زوبانی ڕووسی ) . ئێمە هیچ لاریمان لەم قسانەی دوکتۆر شەمسی نییە بە مەرجێك بە هەمان گەز کوتاڵی ئێمەش بپێون . لێرەدا تەنها یەك نموونەی پچوك دەخەینە بەر چاو . شاعیری گەورەی ڕۆژهەڵاتو ئازەربایجـا ـ نیزامی گەنجەوی ( ١١٤١ ـ ١٢٠٩ ) کە تەنها بە زوبانی فارسی بەرهـەمی بڵاوکردۆتەوە بۆ خۆی بە شانازییەوە گرتوویە « دایکم لە نەشـرانی کوردانە » . جا ئاخۆ دوکتۆر شەمسی نیوەی نیزامیمان دەداتێ تا ئێمەش نیوەی شەرەفخانی لەسەر سینییەکی زێڕ پێشکەش بکەین .

٣٦ـ دوکتۆر م . شەمسی ، کورتەی نامەی دوکتۆراکەی بە زوبانی ڕووســی . ل ٧ ، ٢٣ ـ ٢٤ .

٣٧ـ بە لای مامۆستا مەسعود محەممەدەوە لە ڕووی « دارشتنو بەپێزییەوە » شەرەفنامە کوردییەکەی هەژار گەلێك لە فارسییەکەی شـــەرەفخان بەهێزترە . مامۆستا هێمنی شاعیر لەو بروایەدایە کە « شــــەرەفنامەی هەژار دەبێ بکرێتە بەردی بناغە بۆ کوردیی ئەدەبیو زمانی یەکگرتوومان » ( بڕوانە : « شەرەفنامە » ، چاپی کوردی ، ل پەنجاونۆ ، حەفتاودوو ) .

« ئەگەر ئەو نووسراوە فارسییانەی لەو چاخەدا ( واتە لە ڕۆژگاری شەرەفخاندا ــ ك ٠ م ٠ ) نووسراون دەگەڵ فارسییەکەی « شەرەفنامە »دا لەبەریەکیان ڕاگرین . گومان نامێنێ کە شەرەفخان سەرتۆپی هەموو نووسەرانی فارسی زمانی ئەو زەمانە بووەو بۆ کەرەستەی شەرەفنامەکەی هێناوی‌یە پوختەی فارسیی ئەوسای گوڵبژێر کردووەو چەپکی سەر سەوەتەی ئەدەبیاتی فارسیی ئەو سەردەمەی نیشانی خەڵکی دونیا داوە » ٠ با ئەوەش بڵێین کە فارسیی ئەو ڕۆژگارە « بەرگێکی زۆر فش‌و فۆڵ‌و ناقۆڵای » لە بەر خۆی کردبوو[٢٨] ٠

بە لای منەوە لە هەمووی گرنگتر ئەوەیە کە شەرەفخانی بدلیسی بەو هەموو تواناو دەسەڵاتەیەوە لە خۆی بایی نەبوو ، وەك هەموو زانایەکی ڕەسەن زۆر سادەو ساکار بوو ٠ با گوێی لێ بگرین بزانین بۆ خۆی چۆن « شەرەفنامە » هەڵدەسەنگێنێ :

« لە زانایانی پیاوچاك‌و دڵپاك‌و بەوەج دەپاڕێمەوە زۆر بەوردی لە نووسینەکەم وردبینەوەو ئەگەر پەشێوی‌یەکیان بەرچاو کەوت بە شێوەیەکی مەردانە بەراوردی بکەن ٠ خۆ ئەگەر هەڵەو لەبیرچوونێکم لەسەر دەدۆزنەوە هەر بە گاڵتە پێ‌کردن‌و تیزو تەشەر لێم نەقۆزنەوە ، پیاوەتیم لەگەڵ بکەن‌و بە پارچەیەکی چاکترو بە بزگوڕێکی تازەترو پاکتر بۆم پینە بکەن »[٢٩] ٠

خۆزگا ئەم قسە بەپێزانە دەبوونە دەرس بۆ نەوەی شەرەفخانی بدلیسی ٠

---

٢٨ــ « شەرەفنامە » ، چاپی کوردی ٠ ل چل ٠
٢٩ــ هەمان سەرچاوە ، ل ١٤ ٠

لێرەدا پێویستە ئەوەش بڵێین کەوا شەرەفخان هەرچەندە لە ڕێبازی مێژوونووسانی ڕۆژگاری خۆیو پێش خۆی لای نەداوەو وەك ئەوان خۆی خستۆتە « ڕیزی بێ ڕێزترینی دەرگەوانانو پاسەوانانی » پاشایان[٣٠] ، بەڵام لەگەڵ ئەوەش بەخۆنازینی ڕەواو بەجێی زۆر پێوە دیارە ، ئەوەی لە زۆر شوێنی « شەرەفنامە »دا بە هاسانی هەستی پێ دەکرێ . شەرەفخان دڵنیا بوو لەوەی « پرشنگی لاپەڕەکانی « شەرەفنامە » وەك تیشکی ڕۆژ » دەدرەوشێتەوەو « هەموو جیهان پڕدەکاتەوە »[٣١] .

واش بوو . « شەرەفنامە » هەر زوو سەرنجی زانایانی ڕاکێشا . لە ڕۆژگاری شەرەفخان خۆیەوە خوێنەدەواران کەوتنە نووسینەوەی ڕوونووسی‌تری بەرگی یەکەمو دووەمی . ساڵی ١٦٠٦ لە شاری کلس حەسەنی کوڕی نورەددین لە ٣٢٧ پەڕەدا بە بێ‌دەستکاری ڕوونووسی یەکەم ژمارەی « شەرەفنامە »ی کرد کە ئێستە لە کتێبخانەی بودلیانی ئۆکسفۆرد هەڵگیراوە . حەسەن بەگی یەزدی یەکێکە لەوانەی ساڵی ١٦٤٥ « شەرەفنامە »ی نووسیوەتەوە . ئێستە تەنها لە کتێبخانە ناودارەکاندا ٢٢ دەسنووسی « شەرەفنامە » هەیە . هیچ دوور نی‌یە تائێستەش ژمارەیەکی زۆر لە دەسنووسە کۆنەکانی «شەرەفنامە» لە کوردستان خۆی یا لە وڵاتانی‌تری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا هەبێت ، چونکە وادیارە دوای شەرەفخان بە ماوەیەکی زۆر هێشتا ڕووناکبیران هەر «شەرەفنامە»یان ڕوونووس کردووە . بەوێنە ئەو دەسنووسەی « شەرەفنامە » کە لە کتێبخانەی ماتێنەدەرانی یەرێڤان هەڵگیراوە لە سەدەی هەژدەدا نووسراوەتەوە .

---

٣٠ــ هەمان سەرچاوە ، ل ٨ .

٣١ــ زۆر سەیرە کە خوا لێخۆشبوو محەمەد عەلی عەونی بەشێکی ئەم ڕستەیەی بەڕاندووە گوایە لەبەوبەوەی لە خۆبایی بوونی پێوە دیارە ( بڕوانە : « شەرەفنامە » ، بەرگی دووەم ، چاپی قاهیرە ، ل ٤ ) .

کۆنترین و بەنرخترین و ڕاسترین دەستنووسی زانراوی « شەرەفنامە »
ـ ـ یە کە شەرەفخان بە دەستخەتی خۆی بە ناوی « شەرەفنامەی تاریخی
ـ ـ دستان »ەوە نووسیویەتەوەو ئێستە لە کتێبخانەی بۆدلیان لە ئۆکسفۆرد
ـ ـ گیراوە . ڕووسەکان دوای سەرکەوتنیان لەو شەڕەیاندا کە لەگەڵ
ـ ـ ـ ـ کان ساڵی ١٨٢٦ ـ ١٨٢٨ کردیان کتێبخانەی بەناوبانگی
ـ ـ ـ ـ یەکانیان لە ئەردەبیلەوە گواستەوە پێتەربورگ . یەکێك لە کتێبە
ـ ـ ـ کانی دەستنووسێکی «شەرەفنامە» بوو کە ساڵی ١٥٩٨ نووسراوەتەوەو
ـ ـ رەفخان بۆ خۆی پیاچۆتەوەو مۆری خۆی لەسەر داناوە . ئەو
ـ ـ ستنووسە ئێستە وا لە کتێبخانەی گشتیی لێنینگراد . ڕوونووسیتری
« شەرەفنامە » لە موزەخانەی بەریتانیاو کتێبخانەی ئەستەموڵ و شوێنیتر
هەڵگیراوە .

هەرزوو شارەزایان کەوتنە وەرگێڕانی «شەرەفنامە» بۆ سەر زوبانیترە
ـ ـ ی بەسەر دانانی « شەرەفنامە »دا تێنەپەڕی کە دووجار کرایە تورکی ،
جاری یەکەم محەممەد بەگی ئەحمەد بەگی میرزا ساڵی ١٠٧٨ی کۆچی
( ١٦٦٧ ـ ١٦٦٨ی عیسایی ) کورتەی « شەرەفنامە »ی وەرگێڕایە سەر
تورکی کە تائێستە دوو دەستنووسی لێ دۆزراوەتەوە . پاش دەوروبەری ٢٠
ساڵ سامی ناوێك هەموو « شەرەفنامە »ی کردووە بە تورکی . وەك لە
شوێنی خۆیدا باسی دەکەین « شەرەفنامە » وەرگێڕدرایە سەر ژمارەیەك
زوبانیتری ڕۆژهەڵاتی و ڕۆژئاوایی .

بە هەمان دەستوور زوو « شەرەفنامە » بووە سەرچاوەی گەڕیدەو
مێژوونووسانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا . حاجی خەلیفە کە بە کاتب چەلەبیش
ناسراوە چلەکانی سەدەی هەژدە بۆ دانانی « جیهاننوما » کەلکی زۆری لە
« شەرەفنامە » وەرگرت ، تایبەت بۆ ڕوونکردنەوەی باری جوگرافیایی
مەڵبەندەکانی کوردستان و ژیانی هۆزە کۆچەرو نیشتەجێکانی . دوابەدوای

ئەو دەروێش محەمەدی زیللی کە بە ئەولیا چەلەبی ناسراوە (١٦١١ـ١٦٧٩)
کەڵکی لە « شەرەفنامە » وەرگرتو چەند جارێك ناوی خۆیو خاوەنی
بەرگی چوارەمی « سیاحەتنامە » بەناوبانگەکەیدا هێناوە[٣٢] .

زۆری نەبرد ڕۆژئاواییەکانیش بە « شەرەفنامە »یان زانی . هێربێلۆ
یەکەم زانای ئەوروپاییە باسی « شەرەفنامە »ی کردووە کە لە ڕێگەی
« جیهان‌نوما »ی حاجی خەلیفەوە بە بوونی زانیوە . ساڵی ١٧٧٦ هێربێلۆ
لەو کتێبەیدا کە بە زمانی فەرەنسی بە ناوی « کتێبخانەی ڕۆژهەڵات ـ
فەرهەنگی گشتی »یەوە دایناوە چەند جارێك ناوی « شەرەفنامە »ی
هێناوە[٣٣] . کاربەدەستی دیپلۆماسیی ناسراوی بەریتانیایی جۆن ماڵکۆم
( ١٧٦٩ ـ ١٨٣٣ ) کە ماوەیەکی زۆری لە هندستانو ئێراں بردۆتەسەر
یەکەم ئەوروپاییە دەستنووسی « شەرەفنامە »ی دەسکەوتووەو کەڵکی لێ
وەرگرتووە بۆ دانانی بەرگی دووەمی ئەو کتێبەی کە بۆ مێژووی ئێران
تەرخان‌کراوە[٣٤]. دوای ماڵکۆلم بە دەوروبەری بیست ساڵێك مێژوونووسی
فەرەنسەیی کاترمێر کەڵکی زۆری لە « شەرەفنامە » وەرگرت بۆ دانانی
ئەو کتێبەی کە ساڵی ١٨٣٦ لە پاریس بە ناوی « مێژووی مەغۆلەکانی
ئێران »ەوە بڵاوی‌کردەوە .

« شەرەفنامە »ی شەرەفخانی بدلیسی زۆر زوو سەرنجی
ڕۆژهەڵاتناسانی ڕووسی ڕاکێشا . خ . دە فرێن یەکەمین زانای ڕووسی بوو

٣٢ـ بڕوانە : « کورد لە مێژووی دراوسێکانیدا . سیاحەتنامەی ئەولیا
چەلەبی » ، وەرگێڕانی سەعید ناکام ، کۆڕی زانیاری کورد . بەغدا .
١٩٧٩ ، ل ٧٤ ، ٩٧ ، ١٠٣ ، ١٤٣ ، ١٩١ ـ ١٩٢ ، ٢٣٢ ، ٢٣٤ ، ٢٧٨ـ
٢٨١ .
٣٣ـ بڕوانە : ژ . س . موسەیلیان : بیبلیۆگرافیای کوردناسیی . بە زمانی
ڕووسی ، مۆسکۆ ، ١٩٦٣ ، ل ٥٥ .
٣٤ـ J. Malcolm, The history of Persia from the most early period to the present time, Vol. 2, London 1815.

ئە سالی ١٨٢٦ لە یەکێك لە ڕۆژنامەکانی پێتەربورگدا باسی «شەرەفنامە»ی
ی کرد و سەرچاوەیەکی مێژوویی یەکجار گرنگ » کرد . هەر ئەو ساڵە م .
ۆنکۆڤیش بەدرێژی باسی « شەرەفنامە »ی کردووە[٣٥] . پاش سێ ساڵ
رنێ لە یەکێك لە نووسینەکانیدا دیسان هاتۆتەوە سەر باسی «شەرەفنامە»و
داوای کردووە بە زووترین کات دەقی فارسیەکەی بلاوبکرێتەوەو بێدواخستن
وەربگێڕدرێتە سەر زمانێکی ئەورووپایی . دوابەدوای فرێن ژمارەیەکی تر لە
ڕۆژهەلاتناسانی ڕووسیا داوای بلاوکردنەوەو وەرگێڕانی «شەرەفنامە»یان
کرد .

زاناو کاربەدەستی کۆڕی زانیاری ڕووسیا ڤلیامینۆف زێرنۆف
( ١٨٣٠ ـ ١٩٠٤ ) ئەرکی بلاوکردنەوەی « شەرەفنامە »ی بە فارسی گرتە
ئەستۆی خۆی و سالی ١٨٦٠ بەرگی یەکەمی بە پێشەکی یەکی بیست لاپەڕەیی
بەنرخەوە بە زمانی فەرەنسەیی بلاوکردەوە . دوو سالی پێنەچوو بەرگی
دووەمیشی لەگەل پێشەکی یەکی فەرەنسەیی حەوت لاپەڕەیدا
بلاوکردەوە[٣٦] . ئەم کارە هێند لە پایەی زانستیی ڤلیامینۆف زێرنۆفی
بەرزکردەوە کە نازناوی بەرزی ئەندامی کارای کۆڕی زانیاری ڕووسیای
لەسەری پێ درا .

لە ئەورووپا سەرەتای نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدە « شەرەفنامە » بۆ
یەکەمجار لەلایەن گ . أ . باربەوە وەرگێڕرایە سەر زمانی ئەلەمانی و بەرە
بەرە لەنێوانی سالانی ١٨٥٣و ١٨٥٩دا لەگەل پێشەکی یەکی وەرگێڕدا
بلاوکرایەوە . پرۆفیسۆر ف . ب . شارموا ٣٠ سال کاری بێوچانی بۆ

---

٣٥ـ ك . ك . کوردۆییڤ ، کوردناسی ، ـ « موزەخانەی ئاسیایی ـ لقی
لێنینگرادی دەزگای ڕۆژهەلاتناسیی کۆڕی زانیاری سۆڤێت» . مۆسکۆ ،
١٩٧٢ ، ل ٣٨٦ ـ ٣٨٧ .

٣٦ـ کاتی خۆی کۆڕی زانیاری کورد هەردووکیانی دەسکەوت .

وەرگێڕانی بەرگی یەکەمو دووەمی « شەرەفنامە » بۆ سەر زمانی فەرەنسی تەرخانکردو لە چوار بەرگی سەربەخۆدا بلاّوی کردنەوە . شارموا سالی ١٨٦٨ بەشی یەکەمی بەرگی یەکەمو سالی ١٨٧٠ بەشی دووەمی بەرگی یەکەمو سالی ١٨٧٣ بەشی یەکەمی بەرگی دووەمو سالی ١٨٧٥ بەشی دووەمی بەرگی دووەمی لە پیتەربورگ چاپکرد . وەك ی. ڤاسیلیێڤا دەلێت ئەو کارەی شارموا « تا ئیمڕۆش نرخی زانستیی خۆی لەدەستنەداوە »[٣٧] .

هیچکاتێك بایەخی « شەرەفنامە » وەك سەرچاوەیەکی گرنگو ڕەسەن کەم نابێتەوە . لێرەدا ئەوەندە بەسە کە ئامۆژگای ڕۆژهەلاّتناسیی کۆڕی زانیاری سۆڤێت ـ لقی لێنینگراد لە سەرەتای شەستەکانەوە ی.ڤاسیلیێڤای کاربەدەستی بۆ وەرگێڕانو لێکۆلینەوەی هەردوو بەرگی « شەرەفنامە » تەرخانکرد . ڤاسیلیێڤا سالی ١٩٦٧ بەرگی یەکەمو سالی ١٩٧٦ بەرگی دووەمی « شەرەفنامە »ی بە دوو پێشەکیی قوولەوە بلاّوکردەوە . ڕۆژهەلاّتناسانی سۆڤێتو دەرەوە ئەم کارە بەهادارەی ڤاسیلیێڤایان بەرز نرخاند[٣٨] .

هەرچی ئامۆژگای گەلانی ڕۆژهەلاّتی نزیكو ناوەڕاستی سەر بە کۆڕی زانیاری ئازەربایجانی سۆڤێتە « شەرەفنامە »ی کردە باسی نامەی دوکتۆرای م. شەمسی کە سالی ١٩٦٧ تەواویکرد[٣٩] . دوکتۆر شەمسی جگە لە نامەی دوکتۆراکەی زنجیرەیەك وتاری زانستیشی دەربارەی شەرەفخانو « شەرەفنامە » بلاّوکردۆتەوە ، وەك « مێژوونووسی کوردی

---

٣٧ـ « شەرەفنامە » ، چاپی ڕووسی ، بەرگی یەکەم . ل ٢٢ .

٣٨ـ بەوێنە بڕوانە گۆڤاری « گەلانی ئاسیاو ئەفریقا » ، بە زمانی ڕووسی . مۆسکۆ ، ژمارە شەش ، ١٩٦٨ ، ل ٢٠١ ـ ٢٠٢ .

٣٩ـ بڕوانە پەراوێزی ژمارە ٢٥ .

منوەنگ شەرەفخانی بدلیسی »[40]و « باسی ڕاپەڕینەکانی سەدەی شەرتەمینی هۆزە کوردەکان لە شەرەفنامەدا »[41] . بۆ ڕوونکردنەوەی سەکانی جگە لە « شەرەفنامە » دوکتور شەمسی ژمارەیەکی زۆر سەرچاوەی کۆنی وەك « نزهة القلوب »ی حمد الله القزوینیو بەرهەمی مێژوونووسانی سەردەمی شەرەفخانی وەك قازی ئەحمەدی غەفاریبەکارهێناوە .

دەقی فارسییەکەی « شەرەفنامە » لە قاهیرەو شوێنیتریش چاپکراوە ، هەروەها بەرگی یەکەمی تائیستە دووجار بە عەرەبی بڵاوکراوەتەوە . جاری یەکەمیان ساڵی ١٩٥٣ لە بەغداو جاری دووەمیان ساڵی ١٩٥٨ ( ؟ ) لە قاهیرە. بەرگی دووەمیشی یەکجار بە عەرەبی ساڵی ١٩٦٢ لە قاهیرە بڵاوکراوەتەوە[42] . .

بەداخەوە دوای هەموان « شەرەفنامە » سەرنجی خاوەنی ڕاستەقینەی خۆی ڕاکێشا . گەر کارەکانی مەلا مەحمودی بایەزیدیی لێ دەربکەین تا سەدەی بیستەم خوێندەوارانی کورد بایەخێکی ئەوتۆیان بە « شەرەفنامە » نەداوە . لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا دوو زانای کورد (خوالێخۆشبوو مامۆستا محەمەد عەلی عەونیو مامۆستا جەمیل بەندی ڕۆژبەیانی ) « شەرەفنامە »یان بە زوبانی عەرەبیی بڵاوکردەوە . ساڵی ١٩٧٣ هەژاری شاعیر بە یاریدەی « کۆڕی زانیاری کورد » کەلێنێکی زۆر گەورەی لە کتێبخانەی کوردیدا پڕکردەوە بەوەی بە زوبانی کوردی « شەرەفنامە »ی لە بەرگێکی قەشەنگدا بڵاوکردەوە . هەژار بەو کارە گەورەیەی قەرزی نیشتمانی بەسەرخۆیەوە نەهێشتو « کۆڕی زانیاری کورد »یش بە

---

٤٠- بڕوانە گۆڤاری « هەواڵەکانی کۆڕی زانیاری ئازەربایجانی سۆڤێت » باکۆ ، ژمارە یەك ، ١٩٦٧ ، ل ٦٧ – ٧٢ .

٤١- هەمان سەرچاوە ، ژمارە یەك ، ١٩٦٨ ، ل ٤٠ – ٤٦ .

٤٢- دوایی دێینەوە سەر ئەم باسە .

بلاوكردنەوەی ئەركێكی بایەخداری سەرشانی بەجێ‌گەیاند . شایانی باسە ئائیستەش چاپی كوردیی « شەرەفنامە » لەگەڵ پێشەكییەكانیدا ( ١٠١٦ لاپەڕە ) نەك تەنها گەورەترین كتێبی مێژوویی كوردییە ، بەڵكو هەمانكات گەورەترین كتێبێكە كە بە زوبانی كوردی هاتۆتە چاپكردن .

ئەوەی تائیستە زانراوە مەلا مەحمودی بایەزیدی یەكەم زانای كوردە كە شەرەفخانو « شەرەفنامە » لە هەموو ڕوویەكەوە سەرنجیان ڕاكێشاوە.

مەلا مەحمود كە دیارە خەڵكی بایەزیدی كوردستانی توركیایە دەوروبەری ساڵی ١٧٩٧ لەدایك‌بووە[٤٣] . جگە لە زمانی زگماكی خۆی بایەزیدی لە زمانو ئەدەبی عەرەبیو توركیو فارسیدا دەستێكی باڵای هەبووەو شارەزایەكی گەورەی قورئان بووەو بۆ ماوەیەكی درێژ مەلایەكی كەمهاوتای نەك بایەزید بەتەنها بەڵكو هەموو كوردستان بووە ، لەناو كوردەواریدا وەك زانایەكی ئایینیو مامۆستایەكی لێهاتوو ناوبانگی دەركردبوو . مەلا مەحمود گەلێك بەرهەمی شاعیرانی توركو عەجەمی وەرگێڕاوەتە سەر زوبانی كوردی . وێڕای ئەدەب لە مەیدانی لێكۆڵینەوەی زمانیشدا بەرهەمی زۆرە،

---

٤٣ــ دەربارەی مەلا مەحمودی بایەزیدیو ئەلێكسەندەر جابا ( ئەسكەندەر ژابا ) بڕوانە :

A. Jaba, Réceuil des notices et récits kourdes, St. - Pbg., 1860, pp. viii - x;

مەلا مەحمودی بایەزیدی ، عاداتو ڕسوماتنامەی اكرادیە ، وەرگێڕانو پێشەكیو تێبینی م . ب . ڕودێنكۆ ، بە زوبانی ڕووسی ، مۆسكۆ ، ١٩٦٣ ، ل ٣ ــ ٨ ، م . ب . ڕودێنكۆ ، وەسفی كۆمەڵە دەستنووسە كوردییەكانی لێنینگراد ، بە زوبانی ڕووسی ، مۆسكۆ ، ١٩٦١ ، ل ٨٤ ــ ٨٥ ، « شەرەفنامە » ، بەرگی یەكەم ، چاپی ڕووسی ، پێشەكیی ی. ڤاسیلیێڤا ، ل ٢٩ ، ٣٨ ، ٥٤ ، دوكتۆر ئەوڕەحمانی حاجی مارف ، لەبارەی كوردناسییەوە لە ڕووسیاو یەكیەتی سۆڤیێت ، ــ « گۆڤاری كۆڕی زانیاری كورد » ، ژمارە ٢ ــ ١ ، ١٩٧٤ ، ل ٥١١ ــ ٥١٤ .

..یمت دەربارەی ڕێزمان . هەروەها زۆر شارەزای دابو نەریتو مێژووی کوردان بوو .

بەختی کوردو ڕۆژهەڵاتناسی بەگشتیو ڕۆژهەڵاتناسیی ڕووسی هتیەتی شارەزایی مەلا مەحمودی بایەزیدیو بیرکردنەوەی زانستیانەی ئەلێکسەندەر جابای کۆنسولی ڕووسی لە ئەرزرۆم[٤٤] تێکەڵ بە یەك بوونو گەلێك بەرهەمی هێژایان کردە دیاریی بەهادار بۆ هەردوو لا ـ بۆ کوردو بۆ ڕۆژهەڵاتناسی . جابا کە لەسەر داوای ڕۆژهەڵاتناسانی پێتەربورگ کەوتە ەیەخدان بە کوردناسی پەنای بردە بەر مەلا مەحمودی بایەزیدیو بە یاریدەی ئەو توانیی گەلێك دەسنووسی نایابو کەرەستەی زانستی بۆ موزەخانەی ئاسیایی لە پێتەربورگ کۆبکاتەوە . هەمانکات بایەزیدی . لەسەر داوای جابا ، ژمارەیەك کتێبی دانا کە دەسنووسی هەموویان کەوتنە لای ئەو[٤٥] .

.. پ. ڕودێنکۆ دەربارەی بایەخی زۆری کارەکانی بایەزیدیی نووسیویە دەڵێ :

---

٤٤ـ ئەلێکسەندەر جابا ( ژابا ) کە بۆ ماوەی ٣٢ سـال . لە ١٨٣٦وە تاوەکو ١٨٦٩ . کۆنسولی ڕووسیا بوو لە شـاری ئەرزرۆمی عوسـمانی . کوردناسێکی گەورەی لێ دەرچوو . « جامع ی رسـالیانو حکایتان بزمانی کورمانجی » ( پێتەربورگ . ١٨٦٠ . ٢٥٠ ل. )و « فەرهەنگی کوردیی ـ فەرەنسی » ( پێتەربورگ . ١٨٧٨ . ٤٦٣ ل . ) لە بەرهەمە ڕەنگینەکانی جابان . فەرهەنگەکەی ١٥ هەزار وشـەی کوردیی بـە لێکۆڵینەوەو بەراوردەوە تێدایە . کاتی خۆی « کۆڕی زانیاری کورد » ئەو دوو کتێبە بەنرخەی دەستخست .

٤٥ـ بەشی هەرە زۆری ئەو دەسـنووسـو نووسراوانە لە دەزگا زانسـتییەکانی لێنینگراد هەڵگیراون . تایبەت لە کتێبخانەی سـەلتیکۆف شێدرین . خوالێخۆشبوو م . ب . رودێنکۆ لە کتێبی « وەسفی کۆمەڵە دەسنووسە کوردییەکانی لێنینگراد »و وتاری « مەجموعەی ا . د . جابا ( دەسنووسە کوردییەکان ) » ـ « کارەکانی کتێبخانەی گشتیی سەلتیکۆف شێدرین » ، لێنینگراد ، ١٩٥٧ ، بەرگی دووەم ، ل ١٦٤ ـ ١٨٤دا باسی کردوون .

« دەتوانم بە ئەوپەڕی دڵنیایی‌یەوە بڵێم گـەلی کورد لە پاراستنی گەلێك لایەنی بەنرخی سامانی ڕووناکبیریدا تا ڕادەیەکی زۆر قەرزاری مەحمودی بایەزیدی‌یە ، گەر هاریکاریی مەحمودی بایەزیدی‌و أ • د • جابا نەبوایە تا ئیستەش بە بەشێکی بەنرخ لـە گەنجینەی ئەدەبی کوردیی سەدە ناونجی‌یەکان نەدەزانرا »[٤٦] •

بێ‌گومان دەبوو شەرەفخان‌و « شەرەفنامە » سەرنجی مەلا مەحمودی بایەزیدی‌ی ڕابکێشن • وەك ئەو دەڵێت لە سەرتاپای کوردستاندا تەنهـا دوو بنەماڵەی‌تر هەبوون بتوانن شانلەشانی باوو باپیرانی شەرەفخان بدەن کە ئەوانیش بوختی‌و حەکاری‌یەکانن[٤٧] • بەپێی گێڕانەوەی مەلا مەحمود تا دەوروبەری کۆتایی سەدەی نۆزدە دانیشتوانی شـاری بدلیس گۆڕی شەرەفخانیان زانیوە • دەربارەی نەوەی بنەماڵەی شەرەفخان مەلا مەحمود نووسیویە دەڵێ « تائیستەش ئەو بنەماڵەیە ماون ، بەڵام هیچ دەسەڵاتێکیان نی‌یەو بەو داهاتە کەمە دەژین کە لە موڵکەکانیانەوە بۆیان دێت »[٤٨] •

مەحمودی بایەزیدی زۆر بەرز « شەرەفنامە »ی نرخاندووە ، بـە گرنگترین سەرچاوەی مێژووی کوردی داناوە • بەمجۆرەش باسی خاوەنی « شەرەفنامە »ی کردووە :

« بەڕاستی مێژووی کوردستان قەرزاری خامەی ئەو زاتا پایەبڵندەیە ( مەبەستی شەرەفخانە ــ ك • م • ) کە بەناوبانگترین کەسی سەردەمی خۆی بوو »[٤٩] •

---

٤٦ــ «عاداتو ڕسوماتنامەی اکرادی‌یە » ( پێشەکی ) ، ل ٤ •
٤٧ــ « شەرەفنامە » ، بەرگی یەکەم ، چاپی ڕووسی ( پێشەکی ) ، ل٢٢ــ٢٤ •
٤٨ــ هەمان سەرچاوە ، ل ٢٩ •
٤٩ــ هەمان سەرچاوە ، ل ٣٨ •

کەواتە هیچ سەیر نی‌یە کە مەلا مەحمودی بایەزیدی یەکەم ڕووناکبیری کوردە « شەرەفنامە »ی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی . مەلا مەحمود نەوروبەری سالی ١٨٥٨ یا سالی ١٨٥٩ لەوکارەی بۆتەوە کە جابا یەکسەر دوویە بۆ پێتەربوگ . ئەو کارە بەنرخە بە دەستو خەتی بایەزیدی خۆی ئێستە وا لە کتێبخانەی گشتیی سەلتیکۆڤ شێدرین لە شاری لێنینگراد .

مەلا مەحمودی بایەزیدی بەوانەوە نەوەستایەوە ، ویستی لاسایی شەرەفخان بکاتەوەو ڕێگەی ئەو بگرێتەبەرو بە دەستووری ئەو مێژووی کوردو کوردستان لەوشوێنەوە بنووسێتەوە کە « شەرەفنامە » تێیدا بڕاوەتەوە[٥٠] . بۆ جێبەجێ کردنی ئەو نیازە بەرزەی مەلا مەحمود سالی ١٢٧٤ی کۆچی ( ١٨٥٧ ــ ١٨٥٨ی عیسایی ) لە دانانی « کیتابی تاریخی جدیدی کوردستان » بۆوە کە نزیکەی هەزار لاپەڕە دەبوو ، لە پێشەکیو ١١ بەش پێکهاتبوو .

سالی ١٨٦٥ ئەلێکسەندەر جابا لە ئەرزرۆمەوە پێشەکیی « کیتابی تاریخی جدیدی کوردستان»ی بە زوبانی فەرەنسی ناردە کۆڕی زانیاریی ڕووسی بۆ نرخاندنی . بە قسەکانی جابادا وا دەردەکەوێ ئەو کتێبە یەك ڕوونوسی هەبووە.بەداخەوە تا ئێستە سەرئەنجامی ئەو دەسنووسە نەزانراوە. مەجموعەی دەسنووسەکانی جابا کە لە کتێبخانەی سەلتیکۆڤ شێدرین هەلگیراون ئەو کتێبەی تێدا نی‌یە .

بەلام بەونموونە کەمانەی لە بەردەستماندان وا دەردەکەوێ هەستی مێژوونووسیی مەلا مەحمودی بایەزیدی قووڵ بووە.دەمێکە ئەوە ساغ بۆتەوە کە سولتانە عوسمانی‌یەکان دەیانویست کوردو کوردستان بکەنە یەکێك لە

---

٥٠ــ مەلا مەحمود هەرچەندە بۆ خۆی سالی ١٢٠٠ی کۆچیی (١٧٨٥ــ١٧٨٦ی عیسایی ) کردە سەرەتای باسەکانی ناو « کیتابی تاریخی جدیدی کوردستان » بەلام زۆرجاریش ڕوداوی پێش ئەو ڕۆژگارەی گێڕاوەتەوە .

قەڵغانە گەورەکانی پاراستن و پەرەپێدانی دەسەڵاتیان لە هەموو ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا . لەم بارەیەوە مەلا مەحمود بە زوبانی سولتان سلێمانی دادپەروەرەوە ئەمەی لای خوارەوەمان بۆ دەگێڕێتەوە کە جۆری دارشتنی بەڵگەی دەستڕۆیشتنی بایەزیدی یە لە مەیدانی مێژوونوسیدا . بایەزیدی دەڵێ :

« کە سولتان سلێمانی دادپەروەر گەڕاوە ئەستەمول دایکی ڕووی تێکردو پێی گوت : « کوڕم وا تۆ گەڕایتەوە ، بەڵام ئاخۆ لەمەودوا گورج و قزلباشەکان هێرش ناهێننە سەر مەلبەندەکانت ؟ » . سولتان لە وەڵامدا گوتی : « دایکە : دیوارێکی پتەوم لەنێوان ئیمپراتۆریی عوسمانی و دەوڵەتانی گورج و عەجەمدا دروستکرد ، دوژمن ئیتر پێی ناکرێ هیچ زیانێکمان پێ بگەێنێ » . دایکی پرسی : « چۆن توانیت لەو مەودا درێژەدا دیوار دروستبکەیت ؟ » . سولتان لە وەڵامدا پێی گوت : « دایکە من ئەو دیوارەم لە گۆشت و خوێن دروستکردووە . بەڕێوەبردنی ئەو ناوچانەم بەرەوڕووی هۆزە کوردەکان کردۆتەوە ... دوژمن ناتوانێ زەفەریان پێ بەرێ و بگاتە ناو دەوڵەتی ئیسلام »[٥١] .

یەکێك لە بەرهەمە بەناوبانگەکانی تری مەلا مەحمودی بایەزیدی « عادات و رسوماتنامەی اکرادیە »[٥٢] . ئەم کتێبە هەرچەندە بێ هەڵە نی یە .

---

٥١ـ « شەرەفنامە » . بەرگی یەکەم ، چاپی ڕووسی ( پێشەکی ) ، ل ٥٤ .

٥٢ـ مەلا مەحمودی بایەزیدی ساڵی ١٢٧٤ی کۆچی ، ١٨٥٨ یا ١٨٥٩ی عیسایی لە دانانی ئەو کتێبە بۆتەوە کە ناوی تەواوی بەمجۆرەیە : « کتاب عادات و رسوماتنامە طوایفا اکرادیە و اصول و نظامات کورمانجی » . ئەو کتێبە ١٩٢ لاپەڕەیە و هەر لاپەڕەیەی ٧ تا ٩ دێری تێدایە . ساڵی ١٩٦٣ م . ب . ڕودێنکۆ لە مۆسکۆ دەقی کوردی یەکەی و وەرگێرانی بۆ سەر زمانی ڕووسی لەگەڵ پێشەکی یەکدا بڵاوکردەوە کە هەمووی بەسەریەکەوە ٢٠٢ لاپەڕەیە .

نیەت لە سەرەتادا کە دێتە سەر باسی ڕەگەزی کورد . بەڵام لەگەڵ ئەوەش سەرچاوەیەکی بەکەڵکە بۆ مێژوونووس چونکە گەلێك لایەنی ژیانی کۆمەڵایەتی‌و ئابووری‌و ڕووناکبیریی کوردی تورکیای ڕوونکردۆتەوە . وەك باسی ئۆبەو ژیانی کۆچەری‌و بازرگانی‌و باج‌و سەرانەو سوو سەلەم‌و دەسەڵاتی دەرەبەگان‌و خانووبەرەو چەك‌و تفاق‌و وڵاغ‌و بەرزەو شیربایی‌و ئافرەت‌و شێخ‌و مەلاو جەژن‌و شایی‌و ئەو جۆرە باسانەی هەمیشە کەرەستەی بەرخن بۆ مێژوونووس .

بەر لە تەواوبوونی سەدەی نۆزدە ژمارەیەکی‌تر لە ڕووناکبیرانی کورد بەرهەمی خۆیان بۆ باسی جیاوازیی مێژووی کوردو کوردستان تەرخان کردە سەرەتای سەدەی نۆزدە خەسرەوی کوڕی محەمەدی بەنی ئەردەلان «تاریخی بەنی‌ئەردەلان »ی نووسیوە . هەر ئەو دەوروبەرەش عەبدولڕەزاق بەگی کوڕی نەجەف قولی خانی دونبولی (سالی ۱۲٤۳ ی کۆچی ، ۱۸۲۷ــ۱۸۲۸ی عیسایی وەفاتی کردووە ) « تاریخی دەنابیلە »ی نووسیوە . ڕۆستەم‌خانی کوڕی ئەحمەد خانی دونبولی « اشارة المذاهب »و « اشارة الادیان »ی داناوە کە هەردووکیان باسی ئایین‌و مێژووی هۆزی دونبولی دەکەن . ماە شەرەف خانی شاعیرە کە سالی ۱۲۱۹ی کۆچی ( ۱۸۰٤ ــ ۱۸۰۵ی عیسایی ) لەدایك‌بووەو سالی ۱۲٦۳ی کۆچی ( ۱۸٤٦ ــ ۱۸٤۷ی عیسایی ) کۆچی دوایی کردووە دەستنووسی « تاریخی ئەردەلان »ی دوای خۆی بۆ بەجێ‌هێشتووین .

ئەم بەرهەمانەش هەریەکەیان بایەخی خۆی هەیە . بەوێنە « اشارة المذاهب »و « اشارة الادیان »ی ڕۆستەم خانی دونبولی‌و «تاریخی دەنابیلە»ی عەبدولڕەزاق بەگ کە هەرسێکیان بەسەریەکەوە لە دەستنووسێکی ۲۵۳ لاپەڕەییدا لە کتێبخانەی « ماتێنەدەران » هەڵگیراون باسی گەلێك بەسەرهاتی مێژوویی کەم زانراوی دونبولی‌یەکان دەکەن . نرخی مێژوویی ئەو باسانەیان

که بۆ ڕووداوەکانی کۆتایی سەدەی هەژدەو سەرەتای سەدەی نۆزدە تەرخانکراون زۆرە چونکە لەوێدا چ عەبدولڕەزاق بەگو چ ڕۆستەم خان ئەو ڕووداوانە دەگێڕنەوە کە بە چاوی خۆیان بینیویانن‌و تێیاندا بەشدار بوون[54] .

بێگومان ئەم بەرهەمانە . تەنانەت « شەرەفنامە »ش . لە کەم‌وکورتی ئاسایی بێبەش نین . هەموو مەرجە زانستی‌یەکانی نووسینی مێژوویی‌یان تێدا نی‌یە ، دانەرانیان هەر باسەکان دەگێڕنەوە بێ‌ئەوەی پێکیانەوە ببەستنەوە یا لێکیان بدەنەوە . ژمارەیەك لە نووسەرانیان بێ نیازی خراپ ، لەبەر هەستی ئایینی یا ئارەزووی بەرزکردنەوەی کورد بەپێی بۆچوونی خۆیان . کەوتوونە هەڵەی مێژوویی گەورەوە . بەوێنە بە لای ڕۆستەم خانەوە دونبولی‌یەکان دەچنەوە سەر بەرمەکی‌یەکان !.

دوای ئەم نووسەرانەو لەگەڵ پەیدابوونی ڕۆژنامەنووسیی کوردیدا ڕووناکبیرانی کورد بەجۆرێکی‌تر کەوتنە بایەخدان بە مێژوو بەگشتی‌و مێژووی گەلەکەیان بەتایبەتی .

---

٥٤ـ بڕوانە : ا . د . پابلزیان . سەرچاوەیەکی نوێ دەربارەی مێژووی گەلی کورد . ــ « گۆڤاری کۆڕی زانیاری ئەرمەنستانی سۆڤێت » . ژمارە ٨ . ١٩٦٧ ، د . کەمال مەزهەر . ماتێنەدەران یا گەوهەرێکی گەورەی ڕۆژهەڵات . « بەیان » . تەشرینی یەکەمی ١٩٧٥ ، ل ٧ ــ ١٠ .

# ڕۆژنامەنووسی‌ی کوردی‌و مێژوو

**مێژوو لای « کوردستان »و « کۆمەڵەی خوێندکاران » . « ڕۆژی کورد »و « ژین »و « تێگەیشتنی ڕاستی » . هەرەکول ئازیزان یا جەلادەت بەدرخان . گۆشەکانی « گەلاوێژ » . عوسمان صەبری‌و « ڕوناهی » . ڕۆژنامەنووسیی مەهاباد . صەلاحەددینی ئەیوبی . هەنگاوی گەورەی « ڕۆژی نوێ » . ڕۆژنامەی « زبان »و مینۆرسکی. صەلاحەددین لای ڕۆژنامەنووسیی کوردی. پێغەمبەرو کورد .**

زۆر دەگمەن ڕۆژنامە یا گۆڤارێکی کوردی هەڵدەکەوێ هیچ بایەخی بە مێژوو نەدابێ . خاوەنی «کوردستان»ی یەکەمین ڕۆژنامەی کوردی لە ژمارە هەشتەمینی ڕۆژنامەکەیدا نووسیویە دەڵێ :

« من دەزانم کورد دەربارەی مێژووی کوردستان هیچ شتێک نازانن . لەبەرئەوە من هەر جارە شتێکی کورت دەربارەی کوردستانو باووباپیرانی ئازیز دەنووسم »[٥٤] .

پاش شەست ساڵ خوێندکارانی کورد لە ئەوروپا کە ویستیان گۆڤاری « کوردستان » بە ناوی « کۆمەڵەی خوێندکاران »ەوە دەرکەن « سکرتێری کۆمیتەی دەرکردنی گۆڤار » عومەری قازی لە لەندەن بەیاننامەیەکی بە کوردی‌و عەرەبی بڵاوکردەوە کە بەمجۆرە دەستی‌پێ‌کردووە :

---

٥٤- دەقی نووسینەکە بەمجۆرەیە : « از زانم کرد ژ تاریخا کردستانی توتشتی نزانن لوما ازی هر جریدا خوەدە کورت بچك تاریخا کردستانی اوبا اجدادین عزیزان بنفسیم » ( « کردستان » ، ژمارە ٨ ، ٥ رجب ١٣١٦ ، ١٨ تشرین ثانی ١٣١٤ ) .

« ئەی خوێندکاری کوردی خۆشەویست :

هەمومان ئەزانین کە یەکێ لە ئامانجە پیرۆزەکانی کۆمەڵـە خۆشەویستەکەمان گەیاندنی مێژوو و وێژەو زانستی کوردە بە میللەتانی‌تر »[55] .

بەرلەوەش بە ماوەیەك گۆڤاری « کوردستان »ی مەهاباد لە دیوی ناوەوەی بەرگی یەکەمی ژمارە یەکیدا نووسیویە دەڵێ :

« کوردستان گۆوارێکی ئەدەبی ـ تاریخی ـ کۆمەڵایەتی ... مانگی کوردی‌یە ... بۆ ژیانەوەی ... ئاساری زانایانی کورد تەقـــەلا دەدا . لەبەرئەوە تکا لە خوێندەوارانی خۆشەویست دەکەین هـــەرکەس بەیتێ حیکایەت‌و سەرگوزشتەی پیاوێکی مەزن یا عەشیرەتێکی کوردی لەکن بێ‌و یان نووسراوێکی لەلا بێ یا لەبەر بێ . کوردی ، فارسی ، عەرەبی، مادامێك هی زانایانی کورد بێ‌و لەچاپ‌نەدرابێ بۆمان بنێرن کە بە یارمـــەتی خود لەچاپی‌بدەین کە بەسەرهاتی ڕۆژگار لە تێوی نەبا »[56] .

بەم‌جۆرە باسی مێژوو ئامانجی زوربەی ڕۆژنامەو گۆڤارە کوردی‌یەکان بوو . « کوردستان »ی یەکەمین ڕۆژنامە باسی صەلاحەددین‌و میرانی جزیرو بەدرخان پاشای گەورەی کردووە . هەروەها وتاری مێژوویی گشـتیشی بڵاوکردۆتەوە ، وەك باسی دۆزینەوەی ئەمەریکا لەلایـــەن کریستۆف

---

٥٥ـ ڕۆژی ٢٣ی کانونی دووەمی ساڵی ١٩٥٨ بە ڕۆنیۆ دیوێکی بە کوردی‌و دیوەکەی‌تری بە عەرەبی چاپ‌کراوە .

٥٦ـ « کوردستان » ، مەهاباد ، ژمارە یەك ، ٦ی دیسامبری ١٩٤٥ ، بەرگی ناوەوەی .

کۆلۆمبیەوە . لە چوار ژمارەیدا ( ٢٢ ــ ٢٥ ) « کوردستان » بەدرێژی باسی زمانو بیروکاری مەدحەت پاشای بەناوبانگی کردووە[٥٧] .

« کوردستان » بۆ خۆی سەرچاوەیەکی گرنگو ڕەسەنە بۆ تێگەیشتنی زۆر ڕووی ژیانی سیاسیو ڕووناکبیری کورد لە کۆتایی سەدەی نۆزدەو سەرەتای سەدەی بیستدا . زانیاری‌یەکانی ناو « کوردستان » یاریدەی مێژوونووس دەدەن باشتر لە پێوەندی نێوان کوردو ئەرمەنو چالاکی نیشتمانپەروەرانی کورد لە ڕیزی ئیتیحادی‌یەکانداو شوێنی سوارەی حەمیدی لە مێژووی نوێی کورداو ئەوجۆرە باسانە تێبگات .

« ڕۆژی کورد »ی یەکەمین گۆڤاری کوردی[٥٨] بەرگی هەر سێ ژمارەکەی بە وێنەی ناودارانی مێژوو ڕازاندۆتەوە ــ صەلاحەددینی ئەیوبیو کەریم‌خانی زەندو حەسەین کەنعان بەدرخان پاشا . « ژین »ی ئەستەموولیش[٥٩] یەکەمین گۆڤاری کوردی‌یە کە بایەخی زۆری بە مێژووی کورد داوە . لە ژمارە دەیدا « ژین » وتارێکی دەربارەی مەولانا خالید بلاوکردۆتەوە کە م . نەژاد تۆفیق نووسیویە[٦٠] . دیسان « ژین » یەکەمین گۆڤاری کوردی‌یە کە بە زنجیرە وتاری مێژوویی بلاوکردۆتەوەو گۆشەیەکی تایبەتی بۆ « مێژووی کورد » تەرخانکردووە . « ژین » زنجیرەیەك وتاری

---

٥٧ــ بڕوانە ئەو ژمارانەی « کوردستان » کە دوکتۆر کەمال فوئاد بە زەنکۆگراف بلاوی‌کردوونەوە ( « کوردستان ــ یەکەمین ڕۆژنامەی کوردی ١٨٩٨ ــ ١٩٠٢ » ، کۆکردنەوەو پێشەکەی د. کەمال فوئاد ، بەغدا ، ١٩٧٢ ) .

٥٨ــ ئۆرگانی کۆمەلەی « هیڤی کورد » بوو ، ڕۆژی ٦ی حوزەیرانی سالی ١٩١٣ لە ئەستەموولی یەکەم ژمارەی لێ چاپکرا .

٥٩ــ لەگەل تەواوبوونی شەڕی یەکەمی جیهاندا ڕووناکبیرانی کورد لە ئەستەموول دەستیان‌کرد بە بلاوکردنەوەی « ژین » کە یەکێکە لە گۆڤارە کوردی‌یە دەولەمەندەکان .

٦٠ــ « ژین » ، ژمارە ١٠ ، شوباتی ١٣٣٥ ، ل ١ ــ ٥ .

عەبدولعەزیز یامولکی دەربارەی مێژووی بنـــەماڵەی بابانو زنجیرەیـەك وتاری مێژوویی کوردی بدلیـــی دەربارەی کوردو کوردستان ، تایبـــەت گەلی کورد لە ئێران ، بلاوکردۆتەوە •

« ژین »ی ئەستەموول ، هەمانکات ، یەکەمین چاپەمەنیی کوردییە کە بەرهەمی زانایانی ئەوروپای دەربارەی مێژووی کورد بلاوکردۆتەوە . وەك ئەو زنجیرە وتارەی لە « ئەنسکلۆپیدیای بەریتانیایی »ی وەرگرتوون.

مێژووی کورد لە ڕۆژنامەی « تێگەیشتنی ڕاستی »دا باش ڕەنگی داوەتەوە[٦١] • لەمەدا شارەزایی مێجەر سۆن کە مامۆستا ئەمین زەکی بۆ باسی نەژادی کورد کەلکی لە نووسینەکانی وەرگرتووە ، دەوری دیاری بینیوە • « تێگەیشتنی ڕاستی» یەکەم سەرچاوەی کوردییە هەولیداوە باسی ڕەگەزی کورد بە شێوەیەکی زانستی بکاو چەند جارێك لەوێدا نـــاوی میدییەکانی هێناوەتەوەو مانی کورد بەرامبەر بە نەمانی گەلی دێرینی وەك ئاشوورو ئەکەدو کلدانو ئیلام بە بەلگەیەکی مێژوویی گرنگ دادەنێ •

« تێگەیشتنی ڕاستی » چەند وتارێکی بۆ باسی مێژووی کوردستانی سەدە ناوەنجییەکان تەرخانکردووە چونکە ، وەك خۆی دەلێ ، « تـاریخی قرونی وسطای کورد قیمەتێکی هەیە »[٦٢] • لە ژمارە بیـــتو ســـێیەوە « تێگەیشتنی ڕاستی » لە گۆشەی « تاریخو مەشاهیری کورد » ا بەدرێژی باسی چەند میرنشینێکی ئەو سەردەمەی کوردستانی کردووەو بـەمجۆرە هۆی دامەزراندنیانی لێك داوەتەوە :

---

٦١ـ لەمبارەیەوە بڕوانە : د . کـــەمال مەزهەر • « تێگەیشتنی ڕاستی »و شوێنی لە ڕۆژنامەنووسیی کوردیدا ، بەغدا ، ١٩٧٨ ، ل ٢٠٠ـ٢٠٩.

٦٢ـ بڕوانە : « تێگەیشتنی ڕاستی » ، ژمارە بیـستو سێ ، ٨ی نیسانی ١٩١٨ .

« ... ئەحواڵی خەلافەتی عەبباسی شـــێواو لە هەموولا حکوماتی
سەربەخۆ بە واسیطەی پیاوانی بەکار هاتەناو . قەومی کوردیش ... لـەم
حـە پەرێشـانە ئیستیفادەی کردو چونکی جێیان هەموو شاخو داخو سەختە
جەکتر هاتنە دەستو چەند حکومەتێکی موناسیبیان تەئسیس کرد »[٦٣] .
ە چەند ژمارەیەکیدا « تێگەیشتنی ڕاستی » باسی میرنشینە کوردییەکانی
سەدە ناونجییەکانو دەسەڵاتدارە ناودارەکانیانی کردووە .

گۆڤاری « هاوار »یش[٦٤] بەشـــی خۆی بایەخی بە مێژوو داوە .
هەرەکول ئازیزان کە نازناوی جەلادەت عالی بەدرخانە گـــەلێك وتاری
مێژوویی لە « هاوار »دا بڵاوکردۆتەوە ، وەك وتاری « کوردو کوردستـان
ە چاوی بیانییان» کە باسی مێژووی کوردی لە قۆناغی کۆنەوە تێدا دەکات .
ڕوتنەوەی بەدرخان پاشا لەو باسانەی ئەو وتارەیە کە هەرەکول ئازیزان
ەیەخی زۆری پێداوە[٦٥] . دیسان هەر ئەو وتارێکی گەورەی بـە نـاوی
« کاردۆخو وڵاتی کاردۆخان »ەوە بڵاوکردۆتەوە کە بە درێژی ئەو قسانەی
تێدا هێناوەتەوە کە زەینەفون ساڵی ٤٠١ی پێش عیسا لە « ئەناباسیس »دا
دەربارەی کاردۆخەکان نووسیونی[٦٦] .

بە ناوی «کلاسیکەکانمان»ەوە [٦٧] هـەرەکول ئـازیزان وتارێکی
گەورەی دەربارەی ژیانو کاری گەورە پیاوانی کوردی وەك عەلی جەریریو

---

٦٣ـ « تێگەیشتنی ڕاستی » . هەمان ژمارە .

٦٤ـ بەدرخانییەکان لە شام گۆڤاری « هاوار »یان بڵاوکردەوە بۆ مـــاوەی بازدە ساڵ ژیا . ژمـــارە یەکی ڕۆژی ١٥ی مایـــی ســـاڵی ١٩٣٢ چاپکراوە .

٦٥ـ « هاوار » . ژمارە ١٩ . ١٧ی نیـسانی ١٩٣٣ . ل ١ ـ ٢ . ژمارە ٢٣ . ٢٥ی تەمموزی ١٩٣٣ . ل ١ ـ ٣ . ژمارە ٢٤ . ١ی نیـسانی ١٩٣٤ . ل ١ ـ ٣ .

٦٦ـ « هاوار » . ژمارە ٣٢ . ١ی ئەیلولی ١٩٤١ . ل ٤ ـ ٧ .

٦٧ـ لە گۆڤارەکە خۆیدا وەها نووسراوە « کلاسیکەن مە » .

ئەفتی تەبران و ئەحمەدی خانی و سالی بایەزیدی و شەرەفخان و موراد خان و مەولانا خالیدو مەلا یەحیای مزوری و نالی و شێخ ڕەزاو حاجی قادری کۆیی بڵاوکردۆتەوە .

جگە لەوانەی باسکردن «هاوار» لە چەند ژمارەیەکیدا چیرۆکی مێژوویی بڵاوکردۆتەوە . وەك « کلیۆپاترا »و « سەلاحەددین و ڕیچاردی سێردڵ» [٦٨] .

« گەلاوێژ » لەم مەیدانەشدا . وەك زۆر مەیدانی‌تر . یەکەمی ڕۆژنامەنووسیی کوردی بوو[٦٩] . تائێستەش هیچ کام لە ڕۆژنامەو گۆڤارە کوردی‌یەکانی عیراق و دەرەوەی وەك « گەلاوێژ » بایەخیان بە مێژوو بەگشتی و مێژووی کورد بەتایبەتی نەداوە . « گەلاوێژ » چەند گۆشەیەکی بۆ باسی جیاوازی مێژوو تەرخانکرد . وەك « کوردی بەناوبانگ »و « لە کون و قوژبنی تاریخدا »و « سووچێك لە مێژوو »و « کورد لای بێگانە ». نووسەرە هەر بەناوبانگەکانی چلەکان ( ئەمین زەکی و تۆفیق وەهبی و حسێن حوزنی موکریانی و عەلائەددین سەجادی و ژمارەیەکی‌تر ) باسی مێژوویان لەسەر لاپەڕەکانی «گەلاوێژ» کردووە[٧٠]. جگە لەوان ژمارەیەك لە ڕووناکبیرانی کوردی دەرەوەی عیراقیش وتاری مێژووییان لە «گەلاوێژ»دا بڵاوکردۆتەوە ، وەك عوسمان صەبری و ن . ئازا سنەیی کە باسی هەڵۆخانی سەرداری ئەردەلانی بۆ کردوین [٧١] .

---

٦٨– « هاوار » ، ژمارە . ٥ ، ٥ی ئۆکتۆبەری ١٩٤٢ ، ل ٣ – ٤ ، ژمارە ٥١، ١٥ی تەشرینی دووەمی ١٩٤٢ ، ل ٣ – ٤ .

٦٩– « گەلاوێژ » دوای « هاوار » بەتەمەنترین گۆڤاری کوردی‌یە . دەوروبەری ١٠ ساڵ ژیا . ژمارە یەکی کانونی یەکەمی ساڵی ١٩٣٩ لە بەغدا چاپکرا.

٧٠– دوایی دێینەوە سەر باسی هەریەکەیان بەجیا .

٧١– « گەلاوێژ » ، ژمارە ٦ ، حوزەیرانی ١٩٤٥ ، ل ٢٥ – ٢٨ .

جاری‌وا هه‌یه «گه‌لاوێژ» نیوه‌ی سه‌رتاپای ژماره‌یه‌کی بۆ باسی مێژوویی ته‌رخانکردووه . به‌وێنه له ژماره ٥و ٦ی سالی سێیدا[٧٢] ئه‌م وتاره مێژوویيانه‌ی بلاوکردۆته‌وه : «کوردی به‌ناوبانگ»ی ئه‌مین زه‌کی (ل ١ ــ ٦)، « تطور ــ گۆڕینی ــ علمی اجتماع » وه‌رگێڕانی عه‌لائه‌ددین سه‌جادی (ل ١٠ ــ ١٤) . «لاپه‌ڕه‌ی تاریخ . نه‌زه‌رێیه‌ی په‌یابوونی ئه‌قوامی هندۆ ئه‌وروپایی یا ئاری‌و کۆچه‌ڕه‌وه‌کانیان»ی صالح قه‌فتان (ل ١٤ ــ ٢٠) ، «تۆرویج چۆن گیرا»ی ناجی عه‌بباس (ل ٥٦ ــ ٦٩)، «ژنه کوردی به‌ناوبانگ ــ مه‌ستووره »ی محه‌مه‌د ئه‌مین کاردۆخی ( ل ٧٧ ــ ٧٨ ) . « لینین »ی فائق هوشیار ( ل ٨١ ــ ٨٧ ) . وێنه‌ی مناره‌یه‌کی کۆنی عه‌مادی‌یه ( ل ٨٩ ) ، « پاشاوه‌ی ژیانی مه‌ولانا خالید »ی عه‌بدولحسین هوشیاری هه‌ورامانی ( ل ٩٣ ــ ٩٥ ) .

یه‌کێك له کاره بایه‌خداره‌کانی « گه‌لاوێژ » بلاوکردنه‌وه‌ی به‌رهه‌می ژماره‌یه‌ك له ڕۆژهه‌لاتناس‌و گه‌ڕیده ئه‌وروپایی‌یه‌کانه ده‌رباره‌ی کورد . له‌وێدا ده‌وری مامۆستا ناجی عه‌بباس گه‌وره‌و دیاره . له پێنج ژماره‌ی یه‌ك له‌دوای یه‌کی «گه‌لاوێژ »دا «گۆران »ه به‌ناوبانگه‌که‌ی ڤ.مینۆرسکیی[٧٣] بلاوکردۆته‌وه[٧٤] . پاش چه‌ند مانگێك به ناوی « گه‌شتێك له کوردستانا هه‌شتا سال له‌مه‌وبه‌ر » له کتێبه‌که‌ی فه‌ردریك میللینگن[٧٥] وه‌ك خۆی ده‌لێ

---

٧٢ــ « گه‌لاوێژ » . ژماره ٥ ــ ٦ . مایس‌و حوزه‌یرانی ١٩٤٢ ، ئه‌و ژماره‌یه‌ی « گه‌لاوێژ » هه‌مووی به‌سه‌ریه‌که‌وه ٩٦ لاپه‌ڕه‌یه .

٧٣ــ ده‌قی وتاره‌که‌ی مینۆرسکی به ئینگلیزی بڕوانه :
"Bulletin of the School of Oriental and African studies", London, Vol. XI, Part I, 1943.

٧٤ــ بڕوانه : « گه‌لاوێژ » ، ژماره ٥ ــ ١٠ ، مایس ــ ئه‌یلوولی ١٩٤٤ .

٧٥ــ F. Millingen, Wild life among the Koords, London, 1870.

ئەو پارچانەی بەکەلکسان بێو تامێکی بێ «[٧٦] کردوونی بە کوردیو نـه چەند ژمارەیەکی « گەلاوێژ »دا بلاوی کردوونەوە[٧٧] • زۆر بەسەر ئـەم کارەیدا تێنەپەڕی کاتێك مامۆستا ناجی عەبباس لە ژمارە هەشتی ســالی ١٩٤٧ی «گـەلاوێـژ»ەوە دەستی‌کردە بـلاو کردنەوەی کـورتەی کتێبە گرنگەکەی کلۆدیۆس جێمس ڕیچ[٧٨] کە یەکێکە لە سەرچاوە ڕەسەنەکان بۆ هەرکەسێ باسی کوردو کوردستان لـه سەدەی هـەژدەو تایبەت سەرەتای سەدەی نۆزدەدا بکا •

مامۆستا ناجی عەبباس وێڕای ئەو کـارە بەرخانەی بۆ خۆشی وتاری مێژوویی لە «گەلاوێژ»دا بلاوکردۆتەوە . وەك «لاپەڕەیەکی زێڕین لە تاریخی ئەربیل »[٧٩] • دوا دیاریی مامۆستامان « کچانی کورد »ە[٨٠] •

مامۆستایان قادر خەففاو مەجید ســـەعیدو بەکر دلێریش بەرهەمی بەکەلکیان لە زمانی ئینگلیزی‌یەوە وەرگێڕاوەو لاپەڕەکانی « گەلاوێژ »یان پێ ڕازاندۆتەوە • یەکەمیان لە چوار ژمارەی سالی ١٩٤٥ی « گەلاوێژ »دا

---

٧٦ـ بڕوانە : « گەلاوێژ » • ژمارە ٥ • مایسی ١٩٤٥ • ل ٦٦ •

٧٧ـ بەشی حەوتەمی ئەو وەرگێڕانە لە ژمـــارە یازدەی ســـالی ١٩٤٥دا بلاوکراوەتەوە ( ل ٥٩ ـ ٦٧ ) •

٧٨ـ C. J. Rich, Narrative of a Residence in Kurdistan, Vol. I - II, London, 1936.

٧٩ـ « گەلاوێژ » • ژمـــارە ١ و ٢ • کانوونی دووەمو شـــوباتی ١٩٤٢ • ل ١٠ ـ ١٧ •

٨٠ـ مامۆستا ناجی عەبباس بە ناوی « کچانی کورد »ەوە کتێبەکـەی هێنی هەرۆلد هەنسنی کردووە بە کوردیو سالی ١٩٨٠ لـــە کتێبێکی ٢٠٤ لاپەڕەییدا بلاوی‌کردۆتەوە . ناوی ئینگلیزی کتێبەکە بەم جۆرەیە :
H. H. Hansen, Daughters of Allah. Among Moslem Women in Kurdistan, London, 1960.

ەکورتی چەند بەشێکی کتێبەکەی مێجــەر ســۆنی[81] بڵاوکردۆتەوەو
ـو بەدوایان بۆ خۆشی وتارێکی بۆ هەڵــەنگاندنیان تەرخانکردووە[82] کە
ەداخەوە پەرۆشی زۆری بۆ کورد وای لێ کردووە بکەوێتــە چــەند
هەڵەیەکەوە . پاش ماوەیەك قادر خەفاف لە ژمارە پێنج تــا دەی ســـاڵی
ەوتەمی « گەلاوێژ »دا زنجیرەیەك وتاری دەربارەی ڕیـچو کتێبـەکەی
ڵاوکردەوە[83] . مەجید سەعیدیش لە سێ ژمارەدا « کوردی عـیراق »ی
ـ جۆنـسنی بڵاوکردۆتەوە[84] . « یەکەم فەرماندەی گوتی لــە بابل »و
. نەژادی کورد » بەکر دلێر لە ئینگلیزییەوە کردوونی بـە کوردیو لــە
گەلاوێژ »دا بڵاوی کردوونەوە[85] .

یەکێك لە بەرهەمــە مێــژووییە وەرگێڕدراوە هــەر بەکەڵکەکانی
. گەلاوێژ » ئەو وتارەیە کە باسی سەرەتای پەیدابوونی ڕۆژنامەنووســی
کوردیی و بەرەوپێشچوونی دەکــات[86] . وتــاری ناوبــراو یۆســف

---

٨١ـ E. B. Soane, To Mesopotamia and Kurdistan in diguise, second edition, London, 1926.

٨٢ـ بڕوانە : « گەلاوێژ » . ژمارە ٩ . ئەیلولی ١٩٤٥ . ل ٤١ ــ ٤٩ .

٨٣ـ بڕوانە : « گەلاوێژ » . ژمارە ٥ ــ ١٠ . مایس ــ تەشــرینی یەکەمی ساڵی ١٩٤٦ .

٨٤ـ دەقی ئەو وتارە بە ئینگلیزی لــە گۆڤاری "Geographical Magazine" ( گۆڤاری جوگرافی )دا بڵاوکراوەتەوە ( بڕوانە : « گەلاوێژ » . ژمارە ٧ . تەمموزی ١٩٤٥ . ل ٥٩ ــ ٦٧ . ژمارە ٨ . ئابی ١٩٤٥ ؛ ل ٥٩ــ٦١ . ژمارە ١٠ . تەشرینی یەکەمی ١٩٤٥ . ل ١ــ١١ ) .

٨٥ـ « گەلاوێژ » . ژمارە ٥ . مایسی ١٩٤٩ . ل ١ــ٨ . ٥٧ ــ ٦١ ؛ ژمــارە ٨ . ئابی ١٩٤٩ . ل ٢٣ــ ٢٨ .

٨٦ـ ئەو وتارە ساڵی ١٩٤٤ لە گۆڤاری کۆمــەڵەی ئاسیایی بەریتانیــدا بڵاوکراوەتەوە ( بڕوانە :

"Journal of the Royal Central Asian Association", London, 1944 September, pp. 313 - 314" ).

مەلەك[٨٧] لە ئینگلیزی‌یەوە کردوویە بە عەرەبی‌و مامۆستا عەبدولقادر قەزازیش وەریگێڕاوەتە سەر زوبانی کوردی[٨٨] .

هەروەها بۆ ناوی وەرگێڕ لە سێ ژمارەیدا « گەلاوێژ » ئەو بەشانەی کتێبی « کەمینەکانی جیهانی عەرەب »ی أ . حۆرانیی[٨٩] بڵاوکردۆتەوە کە پێوەندی‌یان بە کوردەوە هەیە[٩٠] .

خوالێخۆشبوو حەسەن فەهمی جاف چەند وتارێکی مێژوویی لە فارسی‌یەوە کردۆتە کوردی‌و لە « گەلاوێژ »داچاپی‌کردوون . وەك « شازادەی بدلیس » کە بریتی‌یە لە یادداشتی گەڕیدەیەکی فەرەنسی کە ناوەندی سەدەی حەڤدە ، لە ڕۆژگاری فەرمانڕەوایی یەکێك لە نەوەکانی شەرەفخاندا هاتۆتە بدلیس[٩١] . بەپێی قسەی ئەو گەڕیدەیە « شازادەی بدلیس » لە کاتی پێویستدا دەیتوانی دەستوبرد « ٢٠ هەتا ٢٥ هەزار سوارەو ژمارەیەکی زۆر پیادە » بەچەکەوە بنێرێتە هەر شەڕگەیەکی پێویستایە .

---

٨٧ـ یوسف مەلەك نووسەرێکی بەناوبانگی ئاسووری‌یە لە بەرهەمەکانیداو لەو ڕۆژنامانەیدا کە لە کاتی جیلوازدا لە بێروت بە عەرەبی دەری‌دەکردن گەلێك زانیاریی گرنگو دروستی دەربارەی مێژووی کورد بڵاوکردۆتەوە. لەوکتێبە بەناوبانگەیدا کە بە ناوی
"The British betrayal of the Assyrians". ەوە
لە ئەمەریکا سالی ١٩٣٦ لەچاپی‌داوە پاکانەیەکی زۆری بۆ کورد کردووەو بەبەلگەوە سەلماندوویە کە کورد دەستی لە کوشتاری ئاسووری‌یەکاندا نەبووە . « کردستان او بلاد الاکراد » ( بێروت ، ١٩٤٥ ) یەکێکە لە بەرهەمەکانی .

٨٨ـ بڕوانە : « گەلاوێژ » . ژمارە ٤ . نیسانی ١٩٤٥ . ل ٢١ـ٢٥ .

٨٩ـ A. H. Hourani, Minorities in the Arab World. London, 1947

٩٠ـ « گەلاوێژ » ، ژمارە ١ ، کانوونی دووەمی ١٩٤٨ ، ل ٤١ـ٤٨ ، ژمارە ٢ ، شوباتی ١٩٤٨ ، ل ١ ـ ٧ ، ژمارە ٣ ، مارتی ١٩٤٨ ، ل ٥ـ٢٩ .

٩١ـ « گەلاوێژ » ، ژمارە ٧ ، تەمموزی ١٩٤٣ ، ل ٤٧ ـ ٥٢ .

« کورد له ولاتی کەلاتدا » وەرگێڕاتێکی‌تری حەسەن فەهمی جافە کە لەژمارە شەشی سالی ١٩٤٨ی « گەلاوێژ »دا بلاوی‌کردۆتەوە ( ل ٢١ ـ ٤١ ) . هەمان‌کات حەسەن فەهمی جاف لاپەڕەکانی « گەلاوێژ »ی بە چەند بەرهەمێکی مێژوویی خۆیشی رازاندۆتەوە کە زوربەیانی بۆ ژینامەی سەردارانی زەند (کەریم‌خان‌و لطفعلي خان‌و عەلی مورادخان) تەرخان‌کردووە. « مێژووی خولمار »یش یەکێکە لە وتارە چاکەکانی حەسەن بەگ[٩٢] . وەك دەگێڕنەوە ئامینەخانی هاوسەری هەمیتە حەسەن بەگی بۆ خزمەتی کورد هان‌داوە .

« گەلاوێژ » دەیویست سەرنجی خوێندەواری کورد بۆ ئەو ڕاستی‌یە ڕابکێشێ کە ئەوانەی « لەپێناوی سیاسەتدا » مێژوو هەلدەگێڕنەوە کەم نین . بۆ ڕوون‌کردنەوەی ئەو مەبەستەی ، بەوێنە، «کورد لە ئەنسکلۆپیدیای تورکیدا »ی پشکۆی بلاوکردۆتەوە[٩٣] . شایانی باسە لەو وتارە ئەنسکلۆپیدی‌یەدا کورد بە تەنها لە نەژادی ڕەسەن بێ‌بەری نەکراوە ، بەلکو بە هەمان دەستوور سۆمەرو میدی‌و زۆری‌تر بە زۆر کراونەتە تورك نەژاد.

کەریم خانی زەندو مەولانا خالیدی شارەزووری ( نەقشبەندی )و ابن الصلاح‌و هەلۆخان‌و مەحمود خاوەرو زۆر ناوداری‌تری کورد جێگەی دیارو شیاویان لەسەر لاپەڕەکانی « گەلاوێژ » بۆ تەرخان کراوە . «چەنگیز خان »و « تەیموری لەنگی ترسێنەر »و « ژیانی ناپلیۆن »و « موحاکەمەی لویسی شازدەمین » نمونەی ئەو وتارە مێژوویی‌یە گشتی‌یانەن کە « گەلاوێژ » جاروبار بلاوی‌دەکردنەوە .

ئەمانەی تائێستە باسمان‌کردن گشتیان سەرباری ئەو دەورە گەورەیەن کە « گەلاوێژ » لە بوژاندنەوەی مێژووی ئەدەبی کوردیدا بینی . ژینامەو

---

٩٢ـ بروانە : « گەلاوێژ » ، ژمارە ١٢ ، کانوونی یەکەمی ١٩٤٤ ، ل ١ـ١٠.
٩٣ـ بروانە : « گەلاوێژ » ، ژمارە ٢ ، شوباتی ١٩٤٤ ، ل ١٥ ـ ١٩ .

گەلێك زیاتر بەرهەمی شاعیرانی کۆنو نوێی کورد بەشی زۆری ژمارەکانی « گەلاوێژ »یان پڕکردۆتەوە • زۆر شاعیر هەن کە خوێندەواری ڕەمەکی کورد لە ڕێگەی « گەلاوێژ »ەوە ناسیویانن .وەك ئەختەر کە نازناوی ئەمین ئاغای کوڕی حاجی بەکر ئاغای حەویزی بووەو سەدەی ڕابوردوو ژیاوە[94]و شاعیری کرماشانی سولتانی کە لە هۆزی کەلهوڕەو سالی ١٢٥٠ی کۆچی ( ١٨٣٤ ــ ١٨٣٥ی عیسایی ) لە شاری کرماشانی کوردستانی ئێران لەدایكبووە[95] •

لەبەر ئەمانەو گەلێك هۆیتر چ خۆو چ بێگانە « گەلاوێژ »یان بەرز نرخاندووە•لە ئەیلولی سالی ١٩٤٤دا م• لۆرانس ڕاین دەربارەی « گەلاوێژ » نووسیویە دەلێت « گەلاوێژ ئێستە یەکێکە لە گۆڤارە ئەدەبییە هەرە بەرزەکانی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست » •

« ڕوناهی »و « دەنگی گێتی تازە » کە لە سالەکانی شەڕی دووەمی جیهاندا ئۆرگانی کوردیی هاوپەیمانەکان بوون تا ڕادەیەکی باش بایەخیان بە بلاوکردنەوەی وتاری مێژوویی هەمەجۆر دەدا ، تایبەت لەبەرئەوەی بەڕیوەبەرانی هەردووکیان ، بەدرخانییەکانو مامۆستایان تۆفیق وەهبیو حسەین حوزنی موکریانی ، لەوانە بوون کە بۆخۆیان بە مێژووەوە خەریکبوون • عوسمان صەبری زنجیرەیەك وتاری مێژوویی بەکەلکی لە « ڕوناهی »دا بلاوکردۆتەوە کە بەشێکیان گشتیو ئەوانیتریان دەربارەی مێژووی کوردن • بە وێنە لە زنجیرەیەکی سیازدە وتاریدا بەدرێژی باسی ژیانو شەڕە گەورەکانی ناپلیۆن بۆناپارتی کردووە[96] • بە هەمان

---

٩٤ــ سالی ١٨٣٦ لەدایكبووە.( بڕوانە : « گەلاوێژ » ، ژمارە ٣ ، مارتی ١٩٤٤، ل ١ ــ ٤ ) •

٩٥ــ بڕوانە : « گەلاوێژ » ، ژمارە ٨ ، ئابی ١٩٤٥ ، ل ٤١ ــ ٤٧ .

٩٦ــ « ڕوناهی » ، شام ، ژمارە ١٦ ، تەمموزی ١٩٤٣ تا ژمارە ٢٨ ، مارتی ١٩٤٥ ) . « ڕوناهی » بە پیتی لاتینی چاپدەکرا .

دەستوور عوسمان صەبری زنجیرەیەك وتاری دەربارەی یەزیدی‌یەکان[٩٧]و ژمارەیەک هۆزو سەرەك هۆزو لاوی ڕووناکبیری کورد بلاوکردۆتەوە . «چیرۆکا تاریخی »ش یەکێکە لە گۆشەکانی دواژمارەکانی « ڕوناهی » .

دەبوو ڕۆژنامەنوسیی ڕۆژگاری مەهاباد بایەخی زۆر بدات بە مێژووە وەك لە شوێنی خۆیدا گوتمان «کوردستان»ی ئۆرگانی پارتی دیموکراتی کوردستان خۆی. بە گۆڤارێکی ئەدەبیو مێژوویی‌و کۆمەلایەتی دادەنا . بەلام لەبەر گەلێك هۆی ئاشکرا ڕۆژنامەنوسیی مەهاباد ئەو نیشانەی بە دلی کورد بۆ نەپێکرا .

لەگەل ئەوەش ڕۆژنامەو گۆڤارەکانی مەهاباد جاروبار ئاوڕیان لە مێژوو داوەتەوەو چەند بەرهەمێکی بایەخداریان بۆ بەجێ‌هێشتووین . سەید محەمەدی حەمیدی گەلێك وتاری دەربارەی ژینامەی گەورە پیاوی وەك ئیبن‌خەلەکان‌و ئیبن‌صەلاح‌و ئیبن‌شەدادو سەیفی قازی‌ی لەسەر لاپەڕەکانی گۆڤاری « کوردستان » بلاوکردۆتەوە[٩٨] .

بە هەمان دەستور گۆڤاری « نیشتمان »یش ژینامەی ژمارەیەك ناوداری کوردی نووسیوە، وەك شێخ یوسف شەمسەددینی بورهانی کە سەردارێکی بەناوبانگی ڕۆژگاری میری ڕەواندوز بوو[٩٩] ، یا مەلا عەلیی شتۆیی شێخانی‌کە زانایەکی بەناوبانگی سەدەی پازدەمین بوو[١٠٠] . « وتارێکی

---

(٩٧) بڕوانە : « ڕوناهی » . ژمارە ١٩ ، ١ی ئۆکتۆبەری ١٩٤٢،ل١٢ ــ ١٩ ، ژمارە ٢٠ ، ١ی تەشرینی دووەمی ١٩٤٢ . ل ٦،١ ، ژمارە ٢١، ١ی کانوونی یەکەمی ١٩٤٢ . ل ١٥ .

٩٨ــ دەربارەی سەیفی قازی بڕوانە : سید محمدی حەمیدی ، زانایانی کورد . شاعیری میللی بەناوبانگ حەزرەتی ئەبولحەسەنی سەیفی قازی ، ــ « کوردستان » ، مەهاباد ، ژمارە ٤ ، بانەمەڕ ــ مایسی ١٩٤٦، ل ١ــ٢ .

٩٩ــ « نیشتمان » ، مەهاباد ــ تەورێز ، ژمارە ٧ــ٩ ، خاکەلێوە ــ جۆزەردانی ١٣٢٣ ، ل ٦ ــ ٧ .

١٠٠ــ « نیشتمان » ، هەمان ژمارە ، ل ٣١ .

شێخ سەعید ـ پێشەوای ئینقیلابی میللیی کورد » بەڵـــگەیەکی مێژوویی گرنگ و دەگمەنە کە « نیشتمان » بڵاوی کردۆتەوە[١٠١] .

گۆڤاری « هەڵاڵە »ش کە لە شاری بۆکـــان چـاپ دەکرا ژینامەی ژمارەیەك سەرداری کوردی بڵاوکردۆتەوە . قازی محەممەد یەکێکیانە . یەکێك لە وتارە مێژوویی یە گرنگەکانی « هـــەڵاڵە » بۆ باسی مێژووی ڕێکخراوە سیاسی یەکانی کورد بـەر لـە شـــەڕی یەکەمی جیهـــان تەرخان کراوە[١٠٢] .

ئەگەر لە ڕۆژنامەنووسیی کوردیدا گۆڤارێك یا ڕۆژنامەیەك هـەبێ بەتەواوەتی لە ئۆرگانێکی مێژوویی نزیك کەوتبێتەوە یـا تـا ڕادەیەکی زۆر لێی بچێت ئەوە بێ گومان «ڕۆژی نوێ»یە هەرچەندە بەڕێوەبەرانی[١٠٣] وەك «گۆڤارێکی ئەدەبی ـ سیاسی ، کۆمەڵایەتی » پێشکەشی خوێندەوارانیان کردووە . « ڕۆژی نوێ » لە هەموو ڕوویەکەوە تایبـــەت لـە مەیدانی مێژوونووسیدا ، هەنگاوی گەورەی بەرەوپێشەوە نا . هیـــچ ژمارەیەکی « ڕۆژی نوێ »نی یە چەند وتاری مێژوویی بەسوودی تێدا بڵاو نەکرابێتەوە کە زوربەیان بۆ باسی ڕووی جیاوازی مێژووی کورد تەرخان کراون . بەوێنە

---

١٠١ « نیشتمان » ، هەمان ژمارە . ل ٤ ـ ٦ .

١٠٢ « هەڵاڵە » ئەو وتارەی بەم ناوەوە بڵاوکردۆتەوە « کۆمەڵ و ئەحـــزابی سیاسیی کورد دە ڕابردوودا . باسێکی مێژوویی » . ـ « هـــەڵاڵە » . بۆکان ، ژمارە ١ ، ڕەشەمێی ١٣٢٤ ، ل ١٤ ـ ١٥ .

١٠٣ خاوەن و لێپرسراوی « ڕۆژی نوێ » پارێزەر جەمالی حاجی ئەفەندیی شالی و دەستەی نووسەرانی کامەران ( سەرنووسەر )و محەڕەم محەممەد ئەمین و ئیحسان عبدالکریم و کەریم زەند و عەبـــدوڵلا ڕەزا ـ ئەندەر بوون . « ڕۆژی نوێ » گۆڤارێکی مانگانە بوو ، هەمووی بەسەریەکەوە ســـاڵ و نیوێك زیاتر ١٨ ژمارەی لێ دەرچوو ( مارتی ١٩٦٠ ـ ئەیلولی ١٩٦١ ) .

• «ڕۆژی نوێ» لە ژمارە حەوتی ساڵی یەکەمیدا [١٠٤] ئەم وتارانەی بڵاوکردۆتەوە :

«شێخ مەحمودی نەمر» (ل ١ – ٨) ، «شەڕی شعیبە» (ل٢٤) ، «داخوازی‌یەکانی کورد» (ل ٢٩)[١٠٥] ، «حەمدی‌و شێخ مەحمودی نەمر» نووسینی مەدهۆش (ل ٣٠ – ٣٤) ، «کۆمەڵی کوردستان» (ل٣٥) «بەیاننامەی شێخ سەعیدی پیران» (ل٣٦–٣٩)، «هێنانەوەی تەرمەکەی شێخ سەحمود» نووسینی شێخ نوریی شێخ صالح (ل ٤١ – ٤٤) ، «پیاوە مەزنەکانی گەلی کورد • میر عەبدولڕەزاق بەدرخان» نووسینی ئیسماعیل حەقی شاوەیس (ل ٥٠ – ٥٣) ، «کۆچی دوایی شێخ مەحمودی نەمر» (ل ٥٨ – ٥٩) ، «ئاوپاریك» (ل ٦٠ – ٦١)، «مەلا محەمەدی کۆیی» نووسینی دەرسیم (ل ٧٦ – ٨١) ، «اعلان رسمی» (ل ٩٢ – ٩٣)[١٠٦] .

ئەمانەو گەلێك وردە هەواڵی مێژوویی‌و سێ وێنەی سەردەمی بزوتنەوەی یەکەمی شێخ مەحمودو وێنەیەکی مەلای گەورەی کۆیە لەو ژمارەیەی «ڕۆژی نوێ»دا بڵاوکراونەوە • وتاری «مێژووی نەتەوەکەت»ی ژمارە دەی ساڵی یەکەمی «ڕۆژی نوێ» بەتەنها ١٤ لاپەڕەیە ، واتە پتر لە هەشت‌یەکی هەموو لاپەڕەکانی ئەو ژمارەیە[١٠٧] کە هەمان‌کات چوار وتاری

---

١٠٤– «ڕۆژی نوێ» ، ژمارە ٧ • تشرینی یەکەمی ١٩٦٠ . لەو ژمارەیەدا هەمووی بەسەریەکەوە سیازدە وتاری سەرەکیی تێدایە .

١٠٥– مەبەستی ئەو داخوازی‌یانەیە کە شێخ مەحمود سالی ١٩٣٠ دوای ڕاپەڕینی شەشی ڕەشی ئەیلول پێشکەشی کردن .

١٠٦– بەیاننامەیەکە ئینگلیزە داگیرکەرەکان ڕۆژی دووی مایسی سالی ١٩٢٣ بەسەر دانیشتوانی شاری سلێمانی‌یاندا بلاوکردۆتەوەو .پڕی‌یە لە هەڕەشە .

١٠٧ «ڕۆژی نوێ» ، ژمارە ١٠ ، کانوونی دووەمی ١٩٦٠ .

مێژوویی گرنگی تری تێدایە(١٠٨) .

وتارە نایابەکانی خوالێخۆشبوو ئیسماعیل حەقی شاوەیس دەربارەی بزوتنەوەی ئازادیخوای گەلی کورد لەنێوان شەڕی یەکەم و دووەمی جیهاندا کە لە « ڕۆژی نوێ »دا بڵاوی کردوونەوە کەلێنێکی باشیان پڕکردۆتەوە . وەك « کۆمەڵی کوردستان »(١٠٩)و « ناودارانی کورد . مەلا سەلیم ئەفەندی »(١١٠)و « کۆمیتەی ئیستیقلالی کوردستان »(١١١)و «شۆڕشی قۆچگیری »(١١٢)و گەلێك وتاری بەکەڵکی تر .

شایانی باسە ڕۆژنامەنوسیی کوردی لە هەموو ناودارانی مێژوو زیاتر بایەخی بە صەلاحەددینی ئەیوبی داوە . زوربەی ڕۆژنامەو گۆڤارە کوردی‌یەکان ،لە « کوردستان»ی یەکەمین ڕۆژنامەوە(١١٣) وتاری تایبەتی‌یان بۆ تەرخان کردووە . عوسمان صەبری زنجیرەیەك وتاری دەربارەی ژیانی صەلاحەددین لە گۆڤاری « ڕوناهی »دا بڵاوکردۆتەوە(١١٤) . «صەلاحەددین و

---

١٠٨ـ سیانیان دەربارەی مێژووی کوردن : « یادداشتی کۆمەڵەی ژ . ك .»و « ئەهمیەتی مێژوویی کۆماری کوردستان »و « سلێمانی لە ساڵی ١٨٢٠دا » .

١٠٩ـ « ڕۆژی نوێ » . ژمارە ٦ ، ئەیلوولی ١٩٦٠ ، ل ٤٢ ـ ٤٥ .

١١٠ـ « ڕۆژی نوێ » ، ژمارە ٨ . تەشرینی دووەمی ١٩٦٠، ل ٢١ ـ ٢٨ .

١١١ـ « ڕۆژی نوێ » ، ژمارە ١ ، مارتی ١٩٦١ . ل ٢٠ ـ ٢٤ .

١١٢ـ بەشی یەکەم : « ڕۆژی نوێ »، ژمارە ٣ . حوزەیرانی ١٩٦١ ،ل.٩٠ـ٩٨. بەشی دووەم : ژمارە ٤ . تەمموزی ١٩٦١ . ل ١ ـ ٧ ؛ بەشی سێیەم : ژمارە ٥ ، ئابی ١٩٦١ . ل ١٨ ـ ٢٨ .

١١٣ـ بڕوانە : « کوردستان » . ژمارە ١٥ ، ١٢ی موحەڕەمی ١٣١٧ ، ٢٢ی نیسانی ١٣١٥ .

١١٤ـ ئەو وتارە لە پێنج بەش پێکهاتووە لە ژمارە ٢٣و ٢٤و ٢٥و ٢٦و ٢٨ی « ڕوناهی »دا بڵاوکراوەتەوە .

نحی خاچ » وتاریکی گەورەی سێ ژمارەی « گەلاوێژ »ە[110] . زوربەی گۆڤارەکانی مەهابادیش باسی سەلاحەددینیان کردووە .

دیسان وێنەی کەس لە مەزنانی مێژوو بەرادەی سەلاحەددینی ئەیوبی جێگەی لە ڕۆژنامەی کوردیدا بۆ تەرخـان نەکراوە . « ڕۆژی کورد »ی یەکەمین گۆڤاری کوردی بـەرگی یـەکەمین ژمارەی خۆی بـە وێنـەی سەلاحەددین ڕازاندۆتەوە . گۆڤاری « گڕوگالی منداڵانی کورد » کە «بیری کارگەرانی چاپخانەی کوردستان » بوو لە مەهاباد . وێنەیەکی سەلاحەددینی لەسەر بەرگی سێیەمین ژمارەیدا چاپکردووەو لەملاو لەولایەوە ئەم دێـڕە شیعرەی نووسیوە :

« هەر بژی ئەی فەخری قەومی کوردو سولتانی عـــەرەب
تۆ نەمردووی ئەی سەلاحەددینی ئەیوبی نەسەب »[116] .

بەر لەوەی کۆتایی بە « ڕۆژنامەنووسیی کوردیو مێژوو » بهێنین بـە پێویستی دەزانین کەمێکیش دەربارەی ڕۆژنامەی « زبان » بدوێین . تایبەت لەبەرئەوە کە بە ڕۆژنامەیەکی مێژوویی ناوبانگی دەرکردووە[117] .

کە مەجید یەعقوبی بوو بە پارێزگاری سلێمانی کەوتە ڕقەبەری لەگەڵ ڕۆژنامەی « ژیان »ی پیرەمێرد ، وادیارە دەیویست ڕۆژنامەیەکی‌تر جێگەی

---

١١٥- بڕوانە : « گەلاوێژ » . ژمارە ٦ . حوزەیرانی ١٩٤٩ . ل ١-٨ ٥٧٠-٠٦١ .
ژمارە ٧ . تەمموزی ١٩٤٩ . ل ١ - ٢١ . ژمـــارە ٨ . ئابی ١٩٤٩ .
ل ١ - ١٥ .

١١٦- «گڕوگالی منداڵانی کورد » . مەهاباد . ژمارە ٣ . ١ی پوشپەڕی ١٣٢٥ .
لاپەڕەی بەرگی یەکەم .

١١٧- بەشی زۆری ئەو زانیاری‌یانەی لێرەدا باسیان‌کراوە لە برایان نوریی کاکەحەمەو کەریم زەندو ئەحمەد شوکری ( دوکتۆر شۆ )و محەمەد ئەمین سەعید ڕەباتیم وەرگرتوون . مامۆستا کەریم زەند گەلێك یارمەتی دام بۆ کۆکردنەوەی ئەو زانیاری‌یانە . سوپاس بۆ هەموویان .

بگرێتەوە • خوالێخۆشبوو صالح قەفتان کە یەکێك بوو لە ڕووناکبیرە دلسۆزەکانی ئەو سەردەمە ئەرکی دەرکردنی ڕۆژنامەیەکی نوێی گرتە ئەستۆ کە وەك « ژیان » لە چاپخانەی شارەوانیی سلێمانی چاپدەکرا[118] •
ڕۆژنامەی تازە لەدایك‌بوو ناوی « زبان »ی بۆ هەلبژێردرا کە بۆ ڕۆژنامەنووسیی کوردی تارادەیەکی زۆر ناوێکی چاوەڕوان نەکراو بوو • ڕاستەکەشی باری قورسی ڕۆژنامەنووسیی کوردی‌و دلسۆزیی ڕووناکبیرانی سلێمانی ئەوناوەیان داسەپاند•دەست‌کورتی‌و نەبونی زەنکۆگراف‌و ئارەزوی دەرکردنی ڕۆژنامەیەکی نوێ کە ناوی تارادەیەك لە « ژیان » بکات پالی بە صالح قەفتان‌و ئەحمەد شوکری‌یەوە نا دوو نوقتەی سەر پیتی ( ژ )و یەك نوقتەی سەر پیتی (ی )ی کلیشەیەکی کۆنی « ژیان » بکرێنن‌و بیکەنە « زبان »[119] •

« زبان » ڕۆژنامەیەکی حەفتەیی‌و زوربەی ژمارەکانی شەش لاپەڕەیی بوون ، هەرجارەی ٣٠٠ یا ئەوپەڕەکەی ٥٠٠ دانەیان لێ چاپدەکرا کە ٤٧یان بۆ ئابوونەداران دەنێردران • بەڕێوەبەرانی « زبان » هەرجارە دانەیەکیان لێ دەنارد بۆ شێخ مەحمود کە ئەوسا لە باشوور دەسبەسەر بوو ، دانەیەکیشیان بۆ تاهیر بەهجەت مەریوانی دەنارد کە لە ئەمەریکا دەژیا • جگە لەوە شەش دانەشیان لێ دەنارد بۆ ئەدمۆندس تاوەکو ئەو لە بەغداوە بیانێرێتە ئەورووپا• شایانی باسە مینۆرسکی کە سەرەتای سی‌یەکان هاتۆتە سلێمانی[120] یەکێك بوو لەوانەی ڕۆژنامەی «زبان»و بەر لەو ڕۆژنامەی « ژیان »ی بۆ دەنێردرا•

---

١١٨ـ ئەحمەد شوکری بەتەنها ژمارەکانی « زبان »ی چاپدەکردو نووسینی خۆشی تێدا بلاودەکردەوە •

١١٩ـ وادیارە هەر لەبەرئەوەش ڕۆژنامەکە ناوی « زبان » بوو نەك « زمان » کە لە ناوچەی سلێمانی باوە •

١٢٠ـ وادیارە مینۆرسکی دەوروبەری سالی ١٩٣٠ بەبۆنەی یادی نۆسەد سالەی کۆچی دوایی شاعیری گەورە ئەبولقاسم فیردەوسی‌یەوە لە ڕێگەی



صالح قەفتان و ئەحمەد شوکری و ئەحمەدی عەزیز ئاغا لە هەموان زیاتر وتووێنیان لە « زبان »دا بلاوکردۆتەوە . یەکەمیان زوربەی وتارەکانی بۆ دسی مێژوو بەگشتی و مێژووی کورد بەتایبەتی تەرخانکردبوو . بۆیەکا . زبان » لەناو ڕووناکبیراندا بە ڕۆژنامەیەکی مێژوویی ناوی دەرکرد . ئەگینا تەڕاستیدا لەسەر لاپەڕەکانی « زبان » خۆی هیچ شتێك دەربارەی ئەوە تەنووسراوە کە ئەو ڕۆژنامەیە مێژوویی یە . لەلای ڕاستی ناوی « زبان »ەوە تەنها ئەم ڕستەیە نووسراوە :

« زبان ڕۆژنامەیەکی کوردی یە هەموو یەك شەمموانێ دەردەچێ . پەیام: سلێمانی . بەلەدی یە . زبان . محرر : صالح قەفتان . سالیانە بۆ ناو شار ۲۰۰ فلس بۆ دەرەوە ۳۵۰ فلس » . ژمارەی ئەوتۆی « زبان » هەیە نە بەگشتی و نە بەتایبەتی توخنی مێژوو نەکەوتووە[۱۲۱] .

شایانی باسە مەجید یەعقوبی بۆ خۆی ڕەقیبی وتارەکانی « زبان » بوو، جاروبار ڕێگەی بلاوبوونەوەی وتارە مێژوویی یەکانی صالح قەفتانی نەدەدا .

بێ گومان بەرهەمە مێژوویی یەکانی ناو گۆڤارو ڕۆژنامە کوردی یەکان لە هەلەو کەموکورتی بێ بەش نین . نووسەرانی پێش پەنجاکان بایەخێکی ئەوتۆیان بە ڕێبازی زانستیی نووسینی مێژوویی نەدەدا . هی وایان هەبوو سەیر مێژووی دەنرخاند . ن. أ . لەو باوەڕەدایە هەر چەرخەی زۆردارێکی خۆی هەیە . دەربارەی هیتلەر ن . أ . نووسیویە دەلێ : « وادیارە دونیا

---

عیراقەوە چۆتە ئێران یا لەوێوە بە عیراقدا گەڕاوەتەوە . لە بەغدا لەگەل ملمۆستا تۆفیق وەهبی سەری لە چاپخانەی مەریوانی داوە ، لە سلێمانیش لەگەل پیرەمێرد چۆتە چاپخانەی شارەوانی و بارەگای ڕۆژنامەی « ژیان » .

۱۲۱- بە وێنە بڕوانە : « زبان » ، سلێمانی ، ژمارە ۹، ۱٤ی تەشرینی دووەمی ۱۹۳۷ . ناوەڕۆکی ئەو ژمارەیە دەقاو دەق لەگەل ناوی ڕۆژنامەکەدا بەلادەگرێتەوە چونکە وتارێکی گەورەی بە ناوی « چۆن بنووسین »ەوە بلاوکردۆتەوە .

بۆ چەنگیز خانو تەیموری لەنگ نابێت بۆیە خوا هیتلەری بۆ سەدەی بیستەم دروست کردووە »(١٢٢) .

هەرچی ڕۆژنامەی «پێشکەوتن»ە بەمجۆرە چارەنووسی گەلی کوردی لێك داوەتەوە :

« کە دەنگوبانگی پێغەمبەرێتی موحەممەدەلموستەفا ــ ڕووحم بەصەدەقەی بێ ــ گەیشت بە هەموو لایەکو غەلغەلەی خستە دونیاوە وای لێهات کە لەووەختەدا گەورەترین سەلاطینی تورکستان عەلقەی بەندەیەتی ئەو سەروەرە بخەنە گوێ . ئۆغۆز خان کە لەووەختەدا گەورەترینی سەلاطینی تورکستان بوو لە پیاوماقولی کورد بەغدوز ناوی سەروسەکوت ناشیرینی ناردە خزمەت پێغمبەر . پێغمبەر کە چاوی پێ کەوت لە سەرو گوێلاکی قێزی کردەوە . عەشایرو قەبایلی لێ پرسی . وتی لە ئەکرادم ، ئەو حەزرەتەش فەرمووی خوای تەبارەکەن تەعالا ئەم تایفەیە موەفەق بە ئیتیفاق نەکات ئەگینا عالەمێك لە دەست ئەوان بەتەنگدێن . ئیتر لەوڕۆژەوە دەولەتو سەلتەنەتی گەورە بۆ ئەمانە ڕێك نەکەوتووە »(١٢٣) .

بێگومان سەرتاپای ئەم قسانە هەلەن . لێرەدا ئەوەندە بەسە بڵێین ئاینی ئیسلام سالی ١٨ای کۆچی ، ٦٣٩ی عیسایی ، واتە دوای وەفاتی پێغەمبەر لە ڕۆژگاری فەرمانڕەوایی عومەردا گەیشتە خاکی کوردستانو دوای ئەوەش بە ماوەیەکی زۆر ئینجا گەیشتە تورکستان .

لەگەل ئەو کەموکوڕییانەشیدا ڕۆژنامەنووسیی کوردی دەوری لە پێشخستنی لێکۆلینەوەی مێژوویی کوردیدا کەم نەبوو ، ئەوەی تاڕادەیەکیش کاری کردە سەر دەستەی دووەمی مێژوونووسە گەورەکانمان .

---

١٢٢ــ بڕوانە : «گەلاوێژ » ، ژمارە ٥ ، مایسی ١٩٤٣ ، ل ٧ .
١٢٣ــ « پێشکەوتن » ، سلێمانی ، ٧ی ئۆکتوبەری ١٩٢٠ .

# دەستەی دووەمی مێژوونووسانی کورد

**ئەمین زەکی . حسەین حوزنیو زاراوە مێژوویی‌یەکان . صالح قەفتانو دەرسێکی گەورە . ڕەفیق حلمیو ئەحمەد تەقیو ئەحمەد خواجەو یادداشتنووسی . لاوی چیـا ئەنوەر مائی . سەجادیو ڕۆژبەیانی . ڕۆڵەی بەوەفای بنەماڵەی بەدرخان. ئەفسەری ون محەممەد عەلی عەونی. گەشتەکەی عەلی سیدۆ گۆرانی .**

دوای شەڕی یەکەمی جیهان، لەگەڵ وریابوونەوەو پەرەسەندنی هەستی نەتەوەییدا ، ڕووناکبیرانی کورد بەجۆرێکی قووڵتر لە جاران کەوتنـــە هەڵسەنگاندنی مێژوو ، ئەوەی ، وەك دیمان ، لە ڕۆژنامەنووسیی کوردیدا زوو ڕەنگی خۆی دایەوە . دیارە دەبوو مێژوونووسیی کوردی لەو قەوارە تەسکەدا نەمێنێتەوە، تایبەت دوای ئەوەی ژمارەی تینوانی زانینی ڕابوردووی گەل تا دەهات پەرەی دەسەند . بەمجۆرە ژمارەیەك ڕووناکبیری لێهـاتوو خولیای مێژووی نیشتمان کەوتە سەریان ، ئەوانەی مامۆستا ئەمین زەکی ، بێ هیچ گومانێك ، گوڵی گەشی سەردەستەیانە .

محەمەد ئەمین[١٢٤] کە لەبەر زیرەکی دوایی بە محـەمەد ئەمین زەکی

---

١٢٤ــ سەرچاوەی سەرەکیی ژینامەی مامۆســـتا ئـەمین زەکی لێرەدا دوو دیدەنی‌یە لەگەڵ سانیحە خانی کچی ، یەکەمیان مانگی یازدەی ســـاڵی ١٩٧٢و دووەمیان ڕۆژی ١٦ی تەشرینی یەکەمی ســاڵی ١٩٨١ بوو . هەروەها کەلکم لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکانو ئەو پاشەکی‌یەی محەمەد عەلی عەونی بۆ «خلاصة تاريخ الكرد وكردستان»ی نووسیوە (قاهیرە،١٩٣٩)و شەش بەرگی یەکەمی چاپی سێیەمی « تاريخ الوزارات العراقية »ی عەبدولرەزاق حەسەنیو نامیلکەی « محمد امين زكى » کە « لەســەر ئەرکی علاءالدين سجادی لەچاپدراوە » ( بەغدا ، ١٩٤٨ ) وەرگرتووە. هەوڵمداوە بەپێی توانـا بگـەمە ڕاستترینی زانیارێکانی ژینـامەی مێژوونووسی گەورەمان .

ناوبانگی دەرکرد ، کوڕی حاجی ئەوڕەحمانی کوڕی مەحمودە ، سالی ۱۸۸۰ لە گەڕەکی گۆیژەی شاری سلێمانی لەدایك بووە . چەند سالێك لای مـــەلا خوێندوویەو لە تەمەنی دوازدە سالیدا چۆتە قوتابخانەی سەرەتایی‌و ئینجا هەر لە سلێمانی ڕوشدی‌یەی سەربازیی تەواوکردووە . سالی ۱۸۹۶ هاتۆتە بەغداو لە فێرگەی ناوەندیی سەربازی وەرگیراوەو پاش سێ ســـال خوێندن چۆتە ئەستەموول‌و لەوێش سالی ۱۹۰۲ خوێندنی ســـەربازیی بـــەرزی تەواوکردووەو بۆتە ئەفسەری بارەگای ئۆردوگای ســـوپای شـــەشەمی عوسمانی لە بەغدا . سال وەرنەچەرخا کرایە ئەندازیار چونکە دەستی لـــە نەخشەکێشاندا ڕەنگین بووەدوای دەوروبەری پێنج سال گەڕایەوە لەشکرو ئەمجاریان چووە بارەگای سوپای دووەمی عوسمانی لە ئەدرنە .

بەر لە شەڕی یەکەمی جیهان ئەمین زەکی چەند جارێك بووە ئەندامی ئەو کۆمیتانەی بۆ دانانی سنووری دەولەتی عوسمانی یا کێشانی نەخشـــەی تایبـــەتی دادەنران . بەهۆی ئـــەو کارەیەوە توانی ماوەیەك لە فەرەنســـە بەرێتەسەرو بشچێتە ڕووسیاو چەند ولاتێکی‌تری ئەورووپا . بەلام بەشـــی زۆری سالەکانی شەڕی یەکەمی جیهانی بە ئەفسەری‌ی لە عیراق بردەســـەرو ماوەیەکیش بووە یاریدەری مستەفا کەمال کە ئەوسا فەرماندەی ســـوپای حەوتەمی عوسمانی بوو لە سووریە .

کە شەڕی یەکەمی جیهان بڕایەوە ئەمین زەکی کرایە ئەندامی لقی مێژووی شەڕ لە فەرماندەی لەشکری عوسمانیداو تا ناوەندی ســـالی ۱۹۲۳ لەوێ مایـــەوەو لـــەو مـــاوەیەدا گـــەلێك بەرهـــەمی مێژوویی دەربـــارەی ڕووداوەکانی بەرەی ڕۆژهەلاتی شەڕی یەکەم دانا کـــە بۆ ماوەیەکی زۆر بوونە سەرچاوەی خوێندن لە دەزگا سەربازی‌یە بەرزەکانی تورکیادا .

وەك زوربەی ئەفسەرە کۆنەکانی لەشکری عـــوسمانی مامۆستا ئەمین زەکیش دوای تەواو بوونی شەڕی یـــەکەمی جیهان بـــە ماوەیەك گەڕایەوە

ێستمان • دەوروبەری کۆتایی تەمموزی ساڵی ۱۹۲۳ گەیشتە بەغداو[۱۲۵]
حەتەی پێ نەچوو کرایە مامۆستای فێرگەی بەرزی سەربازیو ئینجا چووە
ڕێزی لەشکری عێراقییەوەو دوایی چەند جارێك بووە نوێنەری شاری
سلێمانی لە پەرلەماندا و لەبەرئەوەی «حیسابی پاك» بوو «لە موحاسەبە
بێباك»[۱۲٦] بووە بۆ یەکەم جار بەپێی فەرمانێکی تایبەتی ڕۆژی ۱٤ی تەشرینی
دووەمی ساڵی ۱۹۲٥ بووە وەزیر لە دووەم وەزارەتی عەبدولمحسین
سەعدوندا کە ۲٦ی حوزەیرانی هەر ئەو ساڵە دامەزرابوو •

---

۱۲٥ــ زوربەی ئەوانەی سەرگوزشتەی ژیانی ئەمین زەکییان گێڕاوەتەوە دەڵێن گوایە تەمموزی ساڵی ۱۹۲٤ گەڕاوەتەوە ، بەڵام سانیحە خان سوورە لەسەرئەوەی بلوکی دوای ئەوەی تەحسین عەسکری لە ئەستەموول داوای لێ کردووە بە خاوو خێزانەوە لە ناوەندی ساڵی ۱۹۲۳دا لە تورکیاوە یەکسەر گەڕاوەتەوە بەغدا ( دیدەنی لەگەڵ سانیحە ئەمین زەکی ، ۱٦ــ۱۰ــ۱۹۸۱ ) .

۱۲٦ــ ساڵی ۱۹۲۸ مامۆستا ئەمین زەکی نامیلکەیەکی ۳۱ لاپەڕەیی بە ناوی « محاسبەی نیابەت »ەوە بڵاوکردەوە کە لەسەر بەرگەکەیو لای ناوی خۆیەوە نووسیبووی « ئەوی حیسابی پاکە ، لە موحاسەبە بێباکە » . شایانی باسە ئەو نامیلکەیەش ئێستە بۆتە سەرچاوەیەکی ڕەسەن بۆ ڕوونکردنەوەی چەند ڕاستییەکی گرنگی مێژوویی لە بیستەکاندا . لە ڕێگەی قسەکانی خاوەنییەوە لەوە دەگەین کە ساڵی ۱۹۲٦ یەکەم دوکتۆرو یەکەم ئەجزاچی هاتوونەتە شاری سلێمانیو هەر ئەو دەوروبەرە « خەستەخانەی سەرەوە » دروستکراوە کە ئەوسا جێگەی نووستنی بیست نەخۆشی تێدا بووە . لەو ڕۆژانە لە هەموو درێژاییو پانایی عێراقدا یەکێك نەبووە بتوانێ هەندێ دەرسی زانستی پۆلی دووی ناوەندی بە کوردی بڵێتەوە . دیسان لە ناوەڕۆکی ئەو نامیلکەیەوە تێدەگەین کە لە ساڵی ۱۹۲٥ەوە تاوەکو ساڵی ۱۹۲۸ هەمووی بەسەریەکەوە ۳٦ هەزار ڕوپیێ بۆ کردنەوەی قوتابخانە لە سلێمانیو ناوچەکانیدا خەرج کراوە ، کەچی بەرامبەر بەوپارە کەمە ۸٤٥ هەزار ڕوپیێ بۆ دروستکردنی قشڵەو سەراکانی سلێمانیو قەرەداغو پێنجوێنو پۆلیسخانەکانی بازیانو دەربەندو تەیناڵو نۆدێو وەلیئاواو قزلجەو گڵەزەردەو پەیکوڵیو سەگرمە خەرج کراوە .

لەوساوە تا ڕۆژی نۆی شوباتی ساڵی ١٩٤٢ مامۆستا ئەمین زەکی یازدە جار بووە وەزیر .

ڕاستی‌یەك لێرەدا سەرنج ڕادەکێشێ . سەرەك وەزیرانی سەردەمی پاشایی دانویان پێکەوە نەدەکوڵا ، هەریەکەیان دەستەو دایەرەی خۆی هەبوو لەگەڵی دەبوونە وەزیرو لەگەڵیشی داموودەزگایان دەپێچایەوە . بەڵام وادیارە ئەمین زەکی تاکە کەس بوو کە هەموویان دەیانویستو ڕێزیان دەگرت ، بۆیەکا یەکێکیان نی‌یە جارو دوو جار لەگەڵ خۆی نەیکردبێتە وەزیر . عەبدولموحسین سەعدونو جەعفەر عەسکەری‌و تۆفیق سوێدی‌و ناجی سوێدی‌و نوری سەعیدو جەمیل مەدفەعی‌و یاسین هاشمی‌و ڕەشید عالی گەیلانی هەموویان کە بوونەتە سەرەك وەزیران بە لای کەمەوە جارێك ئەمین زەکی‌یان لەگەڵ خۆیان کردۆتە وەزیر .

ڕاستی‌یەکی‌تر : لە کۆتایی سی‌یەکانەوە نەخۆشی زۆری بۆ مامۆستا ئەمین زەکی هێنا ، لە جێگەدا بوو کە نوری سەعید ڕۆژی نۆی مانگی دەی ساڵی ١٩٤١ کردی‌یە ئەندامی شەشەم وەزارەتی خۆی . زۆری نەبرد ئەمین زەکی ڕۆژی ٣١ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٤٢ دەستی لە وەزارەت هەڵگرت . هۆی ئەو وازهێنانەی تەنها نەخۆشی نەبوو ، زیاتر لەسەر ئەوە بوو کە نوری سەعید بێ‌ئاگاو ڕەزامەندیی ئەو یەکێکی ناشی کردبووە کارگێڕی گشتیی پێوانە لە وەزارەتەکەی ئەودا ، ئەوکارەی ڕقی وا هەڵساند جارێکی‌تر توخنی وەزارەت نەکەوێتەوە ، بەڵام تا ڕۆژی مردنی وەك ئەندامی ئەنجومەنی پیران مایەوە هەرچەندە دەگمەن دەچووە کۆبوونەوەکانی[١٢٧] .

---

١٢٧ــ لەڕاستیدا وەك ڕێزلێنان کرابە ئەندامی ئەنجومەنی پیران .

زیرەکیو دڵسۆزیو بێلایەنیی ئەمین زەکی زۆر زوو دەنگی دایەوە، بەرزایی ژیانی ، کوردگوتەنی ، ئازاری مێرووڵەیەکی نەداوە ، ئەوی بۆی کرابێ لە خزمەت درێغیی نەکردووەو دەستی یاریدەی بۆ گەلێك لێقەوماوو دڵماو درێژکردووە . لە دوا ساڵەکانی ژیانیدا زۆر جـــار بۆ دامەزراندنی ڕووناکبیرێك یا جێبەجێکردنی کاری خوێندنی قوتابیەك دەچوونە ژێر باڵیو بە دەزگاکانی میریدا دەیانگێڕا . وەك سانیحەی کچی دەیگێڕێتەوە کە تەواو کەفتەکار بوو بە سەعات بە دەستە لەرزۆکەکەیەوە بە تەلەفوون پەنای دەبردە بەر کاربەدەستان بۆ جێبەجێکردنی کاری لێقەوماوێك . ســانیحە خان دەڵێ : « جاریوا هەبوو من لای خۆمەوە دڵم کەفی دەچەند » . هــەر ئەوبارەیەوە ڕەشید نەجیب بەهۆی کۆچی دوایی ئەمین زەکیەوە نووسیویە دەڵێ :

« دیوی هەرە جوانو هەرە بڵندو پەسندی ئەمین زەکی خزمەتگوزاری بوو . لەمەدا ، لاموایە ، هیچکەس ناتوانێ شان لە شانی بدا ... بە بێ ڕوو گرژ کردن ، بەڵکو بە ڕووخۆشیو دڵخۆشیەوە هەمیشــە ئامادەبوو بــۆ خزمەتکردنی هاوولاتیەکانی ... دەرگاکەی چ لە ماڵو چ لــە وەزارەت هەمیشە کراوەبوو بۆ تکاکەرو دادخواهان »[١٢٨] .

باوەڕ ناکەم هیچ هونەرمەندێك لە ڕوخســاری ئــەمین زەکی لەبارتری دەستبکەوێ بۆ داتاشینی پەیکەر یا کۆتەلێك ناوی لێ بنێ (بێوەی ) ! . هێمنو لــەسەرخۆ ، دڵنەرمو خاوێن ، هەستبەرزو ناسك ، دەمو لــەبز شیرینو ڕووخۆشی وەك خۆی نەبوو . بەڕاستی ، وەك دەڵێن ، « نوور لــە ناوچەوانی دەباری » .

هەموو ئەمانەو غەیری ئەمانە جێگەی تایبەتیان لەناو دەروونی کوردا بۆ ئەمین زەکی داتاشیو هەستی پڕ لە ڕێزی زانایانی ســــەرتاپای عیراقو

---

١٢٨ــ بڕوانە : «گەلاوێژ » ، ژمارە ٧ ، تەمموزی ١٩٤٨ ، ل ٥٢ .

شوێنیتریان بۆی ڕاکێشا ، کە بەرەبەیانی ڕۆژی هەینیی تۆی تـەمموزی ساڵی ١٩٤٨ دوا هەناسەی ژیانی لە سلێمانیدا لاوو پیرو میرو گـــەدای شار[١٢٩] بەرگی ماتەمیان پۆشیو تەرمی پیرۆزیان بە خاکی سەیوان سپاردو دواچەپکی زێڕینی ئەو زانا گەورەیەیان لەگەڵ خۆیان بۆ هێنایەوە :

« ئەگەر مردمو نەمدی قەومەکەم سەربەرزو ئازاد
بزانن دەناڵێ ڕۆحەکەم تا ڕۆژی میعاد
ئەبێ لاوانی کورد تێبکۆشن
گەر ویستیان ڕۆحی من بێ شاد »[١٣٠]

کۆچی دوایی ئەمین زەکی خورپەی لە دڵی هەموان هەڵساند ، تۆفیق وەهبیو پیرەمێردو بێخودو سەلامو بێکەسو هەوریو جیاووکو ڕەفیق حلمیو محەمەد عەلی عـەونیو قەدریجانو خاڵو عەلیکەمالو سەجادیو زۆریتر ڕۆژی چلەی بەکوڵ بۆ کورد لاوانەوە ، کەلهوڕ لـە موکریانەوە هاواریکرد «ئەوان نامرن » [١٣١] .

مێژوو وەك زانست زۆر زوو سـەرنجی ئەمین زەکیی ڕاکێشاء لـە سەرەتاوە زوربەی ئەو کتێبانەی دەیخوێندنەوە دەبارەی مێژوو بوون ، وەك یـەك عەودالی مێژووی کـۆنو نوێو مێژووی ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاواو مێژووی سیاسیو سـەربازی بـوو ، ڕۆژ بەڕۆژ زیاتر کـانیاوی نوێی خوێنـدنەوەو پشـکنین لـە ناخی دەروونیدا دەتەقینەوە ، کە گەڕایەوە

---

١٢٩ــ ئەو ڕۆژە تەنانەت منداڵانی شارو شاگردانی فێرگەکان بەدڵ بۆ ئـەمین زەکی دەگریان .

١٣٠ــ بەر لە وەفاتی مامۆستا ئەمین زەکی داوای کردووە ئەم دوو بەیتە لەسەر کێلی گۆڕەکەی هەڵکەنن .

١٣١ــ بڕوانە ئەو وتارەی کەلهوڕ بە بۆنەی کۆچی دوایی ئەمین زەکیبەوە لـە « گەلاوێژ »دا بە ناوی « ئەوان نامرن »ەوە بڵاوی کردۆتەوە ( «گەلاوێژ» ، ژمارە ٣ ، مارتی ١٩٤٩ ، ل ٦٤ ــ ٦٥ ) .

حتا لـە هەموو شوێن زیـاتر دەبووە میوانی کتێبخانەی «العصریە»ی حەوبانگ • وەك دەڵێن بەدرێژایی ژیانی لـە کتێب بەولاوە شتێکی‌تری حەرز نەکردووە •

هـەر ئـەو هەستو ئارەزووە ئەمین زەکی‌یان خستە سەر ڕێگەی نووسینی مێژوو • بێ‌گومان هەستو ئارەزوو لەگەڵ ئەوەش‌کە زۆر گرنگنو پێویستن بەلآم بەتەنها بۆ خۆیان ناتوانن کـــەس بکەنە مێژوونووس ، بەخوازەلا مێژوونوسێکی وەك ئەمین زەکیش • هەستو ئارەزووی ئـەو پێوە لە بۆتەی قووڵی زیرەکی‌و وردبینی‌و زمانزانی‌و سەبری ئەیوبیـــا تێك‌بوبون ، وانەبوایە ئەمین زەکیی مێژوونووس هەرگیز لەدایك‌نەدەبوو • وەك کوردی تورکی‌و فارسی‌و فەرەنسەیی دەزانی ، لە ئەڵەمانی‌و ڕووسی‌و ئینگلیزی‌یش تێ‌دەگەیشت • دوای گەڕانەوەی لە ئەستەمووڵ مامۆستای تایەتیی بۆ خوێندنی عەرەبی‌و ئینگلیزی ڕاگرتو لـە فێربوونی عەرەبیی قورئانا هەنگاوی بـاشی بەرەوپێش‌نا ، بەلآم تا ئەوڕۆژەی گیانی بە خاك سپارد بە دڵی خۆی فێری عەرەبیی گفتوگۆی بەغدایی نەبوو •

بەوجۆرە ئەمین زەکی هاتـــە مەیدانی مێژوونوسی‌یەوە • یەکەم تاقی‌کردنەوەی لەگەڵ مێژووی سەربازیدا بوو کە زۆر زوو وەك شـۆڕە ســـواری لێهاتوو هەموو بوارەکانی بڕی • بـە کتێبی « لەشـــکری عوسمانی »[۱۳۲] مامۆستا ئەمین زەکی سالی ۱۹۰٦ بە دڵنیایی قایم لە دەرگای زانستی مێژووی دا • تا سالی ۱۹۲۱ حەوت بەرهـــەمی‌تری کردە دیاریی دەســتی بۆ کتێبخانەی مێژووی ســەربازی ، کـە زوربەیانی بۆ باســی بەسەرهاتەکانی شەڕی یەکەمی جیهان تەرخان‌کردوون ، تایــەت لە ولآتی عیراقدا[۱۳۳] •

---

۱۳۲ــ بە زوبانی تورکی داینـاوە .

۱۳۳ــ « چۆن عیراقمان لەدەستچوو ؟ » و « شەڕەکانی عیراق‌و هەڵەکانمان»و ←

ئەی کەی مێژووی کورد سەرنجی ئەمین زەکیی ڕاکێشا ؟ خۆی لــە وەڵامدا دەڵێ ئەوکاتەی دەنگوباوی تۆرانی جێگەی عوسمانیی گرتەوەو نەتەوە ناتورکەکانی ناو ئیمپراتۆریی عوسمانی وریابوونەوە[١٣٤] ، واتە بەر لە شەڕی یەکەمی جیهان بە ماوەیەك . گومان لەوەدا نی‌یە ئەو ئاڵوگۆڕە گەورانەی دوابەدوای شۆڕشی ساڵی ١٩٠٨ی تورکیـا هاتنەکایەوە بــە دەستووری زوربەی هەرە زۆری ڕووناکبیرە وریاکانی‌تری سەرتاپای گەلانی ژێردەستەی عوسمانی کاری زۆریان کردە سەر هەستی نەتەوەیی ئــەمین زەکیش .

لە قسەکانی خۆیەوە ڕوون ئەوە دیارە کە لەدوای بەرپابوونی شۆڕشی ناوبراوەوە ئەم پرسیارە توند لە مێشکیـــــدا گیری خواردووەو دەروونی هەژاندووە : « قەومی کورد لە چ‌نەتەوەیەکەو چیی بەسەرهاتووە ؟ »[١٣٥]. کە کەس نەیتوانی وەڵامی ئەو پرسیارەی بداتەوە ئەوساکە لە ســـــاڵی ١٩١٠وە بۆ خۆی چاکی لێ کرد بەلاداو ڕووی‌کردە کتێبخانە گەورەکانی ئەستەموڵو لە ماوەی دوو ساڵدا ، وەك خۆی دەڵێ ، بە صەدان کتێبی خوێندەوەو گەلێك تێبینیو سەرنجی تایبەتیی لای خۆی تۆمارکرد . بەر لە دەست پێ‌کردنی شەڕی یەکەم بە ماوەیەك مامۆستا ئەمین زەکی بۆ کاری میری ڕێگەی کەوتە ئەوروپاو لە کتێبخانەکانی ئەلەمانیاو فەرەنسەش کەوتە پشکنینو گەلێك زانیاریی بەکەڵکی کۆکردەوەو ژمارەیەکی باشیش لــە بەرهەمی ڕۆژهەڵاتناسانی لەگەڵ خۆی هێنایەوە .

---

→

« شەڕی سەلمان‌پاکو پاشکۆیەك »و « بەغدلو بەسەرهاتی دوایین کەوتنی» لەو کتێبانەن کە هەموویانی بە تورکی نووسیونو لە ئەستەموڵ یا لــە بەغدا چاپی‌کردوون . « هێرش بۆسەر کوت‌و ئابلوقە دانی » کــە دوو بەرگە بە دەستنووسی پێشکەشی موزەخانەی بەریتـــانیی کــردووەو سوپاسنامەی تایبەتیی لەسەر وەرگرتووە .

١٣٤ــ بڕوانە پێشەکیی « خلاصەیەکی تاریخی کوردو کوردستان » .

١٣٥ــ بڕوانە هەمان سەرچاوەو شوێن .

بەمجۆرە مامۆستا ئەمین زەکی بەردی بناغەی بۆ نووسینەوەی مێژووی کورد دانا ، بەڵام ڕوداوەکانی شەڕی یەکەمی جیهانو ئەو ئەرکە زۆرەی لەو ساڵە سەختانەدا کەوتە ئەستۆی دەستیان گرتو بە ناچاری جێبەجێکردنی پرۆژەی ئەو کارەیان پێ دواخست ٠

لەگەڵ تەواوبوونی شەڕ ئەمین زەکی لە جاران بەپەرۆشتر هاتەوە دەستو زۆری نەبرد نزیکەی ٢٠٠ لاپەڕەی دەربارەی مێژووی کورد بۆ چاپ ئامادەکرد ٠ ئەمجاریان بەخت نەیهێنا ، دەوروبەری کۆتای ئابی ساڵی ١٩١٩ هەرچی نووسیبوو و هەرچی نووسیبۆوەو هەرچی کۆکردبۆوە بوونە خۆراکی کلپەی ئەو ئاگرەی بەربووە گەڕەکەکەیان لە شاری ئەستەموڵ ٠ ئەو بۆ خۆی دە ساڵو ئێمەیش بۆ خۆمان صەد ساڵی ڕەبەقمان لەکیس‌چوو ٠ تا ساڵی ١٩٢٩ ئەمین زەکی نەهاتەوە سەر خۆی ٠ لەو ساڵەدا بەرهەمە نایابەکەی مینۆرسکی کە دەربارەی کورد لە ئەنسکلۆپیدیای ئیسلامدا بڵاوی‌کردۆتەوە خۆشەویستە نازدارەکەی جارانی خستەوە ناو قوڵلایی دڵو دەروونی ئەمین زەکی‌یەوە ٠ زۆری‌نەبرد یەکەم کورپەی گەورەی مێژووی کورد بە زمانی کوردی‌ی لەدایك‌بوو کە خاوەنەکەی لە تێگەیشتنی ڕاستەوە ناوی‌لێ‌نا « خلاصەیەکی تاریخی کوردو کوردستان »[١٣٦] ٠

لە بەرگی یەکەمی ئەم شاکارەیدا مێژوونووسی گەورەمان پوختەی

---

١٣٦- ساڵی ١٩٣١ لە بەغدا چاپی‌کرد ، ٣٩٨ لاپەڕەیە . وەك دەگێڕنەوە هەر ئەو دەوروبەرەش حەمدی بابان داوای لە زانای مێژوا ئەنستاس ماری کەرمەلی کرد کتێبێك دەربارەی مێژووی کورد دابنێ‌و وادیارە بەگی بابان دوای تەواوبوونی نیشانی ئەمین زەکیی داوە . ئەمین زەکی پێی‌وابووە بەرهەمەکەی کەرمەلی ئەو کەلەبەرەی‌پێ پڕنابێتەوە کە ئەو دەیەوێ . بۆیەکە زیاتر پێی لەسەر کارەکانی خۆی داگرتووە.وادیارە دەستنووسی ئەو کتێبەی ئەنستاس کەرمەلی دەربارەی کورد دانراوە ئێستە لە کتێبخانەی موزەخانە لە بەغدا هەڵگیراوە .

ڕوداوه هەرە گرنگەکانی کوردستانمان لە دێرزەمانەوە بۆ دەگێڕێتـەوەو بیری زانایانو خۆیمان دەربارەی نەژادو زمانو ژمارەو نیشتمانی کورد بۆ شیدەکاتەوە • لەو بەرهەمەیدا ئەمین زەکی گەلێك نیشانی بە دروستی پێکاوە • هەر بۆنمونە ئەوەندە بەسە لێرەدا بڵێم ئەمین زەکی یەکەم کورد بوو پەنجەی خستە سەر مەبەستی ڕاستەقینەی پەیمانی سیڤەرو ئامانجـە نەبینراوەکانی ، ئەو پەیمانەی تا نووسینی ئەم چـەند دێڕەش گـــەلێك ڕووناکبیری ڕۆمانسیی لای خۆمان ئاوازی ناسك بۆ کڵاوی بابردووی دەڵێن • بێ‌گومان گرنگترین دەسکەوتی ئەو بەرهەمەی مامۆستـا ئەمین زەکی بریتی‌یە لە ڕوونکردنەوەو سەلماندنی بیروڕای مینۆرسکی دەربارەی نەژادی کورد ، ئەو بیرەی ڕۆژهەڵاتناسی بەناوبانگ ڕۆژبەڕۆژ زیاتر بڕوای پێی پتەوتر دەبوو(١٣٧) •

« خولاصە » کەلەبەرێکی گەورەی لە کتێبخانەی کوردیدا پڕکردەوەو سەرنجی ژمارەیەکی زۆری لە زانایانی کوردو بیانی ڕاکێشا • بێ‌گومـــان لەخۆڕا نی‌یە کوردناسی بەناوبانگ باسیل نیکیتین « خولاصـــە » بـــە تەواوکەری « شەرەفنامە » دادەنێ(١٣٨) • شایانی باسە خاوەنی «خولاصە» هەموو داهاتی بەرگی یەکەمی کردە دیاری‌یی دەستی بۆ « یانەی سەرکەوتن» کە زۆر نەبوو ڕووناکبیرانی کورد لـــە بەغـــدا دایانمەزراندبوو و خۆشیانکردبووە سەرۆکی •

پاش دەوروبەری شەش ســـاڵ بەرگی دووەمی « خولاصـــە » دەرچوو(١٣٩) کە بۆ باسی مێژووی میرنشینە ناودارەکانی کوردو کوردستان

---

١٣٧_ دەربارەی ئەو باسە بڕوانە « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، ژمارە ١ ، ١٩٧٣ ، ل ٥٥٢ _ ٥٦٦ •

١٣٨_ B. Nikitine, Les Kurdes. Etude sociologique et historique, Paris, 1956.

چاپی ڕووسی‌ی ، مۆسکۆ ، ١٩٦٤ ، ل ٢٧٠ •

١٣٩_ ساڵی ١٩٣٧ لە بەغدا چاپی‌کرد ، ٤٣١ لاپەڕەیە •

ه‌رخان كراوه . مامۆستا ئه‌مین زه‌كی ئه‌مجاریان وه‌ستایانه به‌سه‌رهاته هه‌ره گرنگه‌كانی سالاری و شه‌دادی و عه‌ننازی و دۆسته‌كی و ئه‌یوبی و زه‌ندی و وری و جزیرو بۆتان و بادینان و بابان و سۆران و موكریان و كه‌لهورو ره‌نگه‌نه و ته‌رگه‌وه‌رو شوانكاره و میروبه‌گ و ده‌سه‌لاتداره‌كانیانی بۆ گیراوینه‌وه‌و گه‌لێك لاپه‌ره‌ی نه‌زانراوی رابوردووی بۆ روون كردووینه‌وه . كه‌وابێ مامۆستا ئه‌مین زه‌كی دیسان هه‌ر بۆ خۆی هه‌نگاوی گه‌وره‌ی دووه‌می له مه‌یدانی مێژوونووسیی كوردیدا نا .

« تاریخی ولاتی سلێمانی »ش شاكارێكی‌تری مامۆستای گه‌وره‌مانه[١٤٠] كه به‌درێژی باسی كۆن و نوێی‌سلێمانی و ده‌وروبه‌ری و ئاودارانی و عێل و هۆزه‌كانی و ژماره‌ی دانیشتوان و قوتابخانه و مزگه‌وته‌كانی و گه‌لێ شتی‌ترمان تێدا بۆ ده‌كات . « تاریخی ولاتی سلێمانی » سه‌رچاوه‌یه‌كی ره‌سه‌ن و بایه‌خداره بۆ هه‌ركه‌سێك بیه‌وێ له هه‌ر لایه‌نێكی ژیان و به‌سه‌رهات و ئال و گۆره‌كانی ئه‌و ناوچه‌یه بكۆڵێته‌وه .

هه‌مان‌كات مامۆستا ئه‌مین زه‌كی زنجیره‌یه‌ك وتاری مێژوویی به‌نرخی له گۆڤاری « گه‌لاوێژ »دا بلاوكردۆته‌وه كه به‌شی زۆریان ده‌رباره‌ی زاناو گه‌وره‌پیاوانی كوردن و[١٤١] دوایی بوونه ناوه‌رۆكی به‌رهه‌مێكی دوو به‌رگیی بایه‌خداری تری مێژوونووسی گه‌وره‌مان . له یه‌كێك له وتاره به‌نرخه‌كانی له « گه‌لاوێژ »دا ئه‌مین زه‌كی نه‌ورۆزی لێكداوه‌ته‌وه‌و به‌به‌لگه‌وه سه‌لماندوویه كه ئه‌و رۆژه جه‌ژنی ئاته‌ش‌په‌رستی نی‌یه به‌لكو رۆژو جه‌ژنی تازه‌بوونه‌وه‌ی ژیانه بۆیه‌كا یادكردنه‌وه‌ی،وه‌ك ده‌لێ ، كارێكی « زۆر به‌جێ‌یه »[١٤٢] .

---

١٤٠ــ سالی ١٩٣٩ له به‌غدا چاپی‌كرد ، ٢٩٤ لاپه‌ره‌یه .
١٤١ــ ئه‌و وتارانه‌ی به نلونیشانی « كوردی به‌ناوبانگ »ه‌وه بلاوده‌كرده‌وه .
١٤٢ــ بروانه : « گه‌لاوێژ » ، ژماره ١ ، كانوونی دووه‌می ١٩٤٢ ، ل ١ــ٧ .

بەڵام لەبەرئەوەی مامۆستا ئەمین زەکی تەنهــا مێژوونووس نەبوو ، لەبەرئەوەش کە « گەلاوێژ »ی بە « جگەرگۆشەیەکی خۆی دەزانی »[١٤٣] ژمارەیەك وتاری زمانەوانیو[١٤٤] ئەدەبیو کۆمەڵایەتیی بەکەڵکی تێــــدا بڵاوکردۆتەوە[١٤٥] .

بە هەر تەرازوویەك بەرهەمە نایابەکانی مامۆستا ئەمین زەکی بکێشینو بە هەر پێوداێك بیانپێوین دەگەینە یەك ئەنجام: ئەمین زەکی مێژوونووسێکی یەکجار گەورەیە ، هیرۆدۆتو گویچاردینیو ئیبن خەلدونی کوردە ، نەوەی بەوەفای شەرەفخانو ڕابەری دڵسۆزی سەرتاپای مێژوونووسانی دوای

---

١٤٣ــ وتاری « ئامۆژگاری‌یەکی دڵسۆزانە »ی بەمجۆرە دەستپێ‌کردووە :
« من ئەم گۆڤارە بە جگەرگۆشەیەکی خۆم ئەزانم .. » ( بــڕوانە :
« گەلاوێژ » ، ژمارە ٤ ، نیسانی ١٩٤٧ ، ل ١ ) .

١٤٤ــ بەوێنە بڕوانە : محەمەد ئەمین زەکی ، زمانی کوردی ،ــ «گەلاوێژ » .
ژمارە ٣ ، مارتی ١٩٤٣ ، ل ١ ــ ٩ .

١٤٥ــ مامۆستا ئەمین زەکی جاروبار شیعریشی وتووە ، سەرەتا بە تورکیو دوایی بە کوردی . یەکێك لەو شیعرانەی کە لە ژمارە پێنجی ســـاڵی ١٩٤٤ی « گەلاوێژ »دا بڵاوی‌کردۆتەوە بە ناوی « سڵاو لە سەلام »ەوە پێشکەش بە سەلامی شاعیری کردووەو تێیدا دەڵێ :

کاتێ لە میسر گەڕامەوە شــــام
لاوانی گــەلم دەورویشتیان دام

قــەو باسمان کرد لە بابەت خۆمان
خۆشــە ســکاڵا لەگــەڵ لاوەکان

یەکێکیان باسی گەلاوێژی کـــرد
مەدحی ژمارە حەوتەمینی کـــرد

* *

سەرنجم لێدا دیم لــە ئــەو گوڵــە
وێنەی پەسەندی وەفای بــە دڵــە

قەڵەمی « سەلام » ڕەنگوبۆی پێدا
لەناو گوڵدەستەی گەلاوێژی نـــا

خۆین • بەرهەمەکانی ، وەك خۆی ئاواتەخواز بوو ، بوونە « سەبەبی تەشویقی قەلەم‌بەدەستان‌و بێ‌گەیشتوانی کورد »[١٤٦]• هەلبەت ئەوەش بۆخۆی یەکێك بوو لەو هۆ گەورانەی پالیان نا بە دەستەیەك ڕووناکبیری تێهاتووی کوردەوە ( محەمەد عەلی عەونی‌و سانیحە ئەمین زەکی‌و جەمیل بەندی ڕۆژبەیانی ) شاکارەکانی وەرگێڕنە سەر زمانی عەرەبی‌و بەوجۆرە پەرە بە مەودای ڕاگەیاندنی خزمەتە گەورەکانی ئەمین زەکی بدەن[١٤٧] •

دیارە گەر بلێین بەرهەمەکانی مێژوونووسی گەورەمان ، وەك هەر بەرهەمێکی‌تری وەك ئەوان ، لە هەلەو کەلێن بێ‌بەش نین ئەوە بێ هیچ گومانێك نە زۆرو نە کەم لە قەدری بەرزو پایەی بلندو بایەخی زۆرو نرخی بێ‌ئەندازەیان کەم‌ناکەینەوە • بەر لە هەر شت جاروبار هەست بە پچڕی‌و لێك‌دابڕان لەنێوانی باسەکانی ئەو بەرهەمانەدا دەکرێ ، تایبەت لە « خولاصە »دا • بەلام ئاخۆ بەر لە ئەمین زەکی‌و لە ڕۆژگاری ئەوو دوای ئاودا چ لە خۆو چ لە بێگانە یەکێك هەبوو بتوانێ ڕێگە نەدا درزێکی‌وا بێتە بەرهەمێکی وەك بەرهەمەکانی ئەوەوە ؟

ڕاستە نرخێنەر دەتوانێ گەلێك کەم‌وکورتیی لەوبابەتە لەناو بەرهەمەکانی مامۆستای مێژوونووساندا بدۆزێتەوە ، بەلام ، بێ‌گومان ، هەر ڕەخنەیەکی بیگرێ پاکانەی خۆی لەگەلدایە[١٤٨] ، یا « گەلاوێژ » گوتەنی « یەکتەنی دانەرو گەورەیی ئەو فەرمانەی ڕایگەیاندووە چاکترین وەلامن بۆ هەر

---

١٤٦ـ بەو وشانە کۆتایی بە پێشەکیی بەرگی یەکەمی « خولاصە » هێناوە .
١٤٧ـ لە شوێنی خۆیدا دێینەوە سەر ئەم باسە .
١٤٨ـ شایانی باسە کاتی خۆی ژمارەیەك لە ڕووناکبیرانی کورد هەستیان بەو کەم‌وکورتی‌یانە کردووەو پەنجەیان بۆیان ڕاکێشاوە ( بەوێنە بڕوانە : « گەلاوێژ » ، ژمارە ٥ و ٦ ، مارس‌و حوزەیرانی ١٩٤٢ ، ل ٢٢ ) . مستەفا شێخ نعمەتاللە ڕەخنەی لەوە گرتووە کە ئەمین زەکی لە « خولاصە »دا ژمارەی کوردی ئێران‌و تورکیای کەم داناوە ( بڕوانە : « گەلاوێژ » ، ژمارە ٥ ، مایسی ١٩٤٧ ، ل ٤١ ــ ٤٥ ) .

گلەیی‌یەك » لە بەرهەمەكانی ئەمین زەكی بكرێ[149] • ئەوەندە شـانازی بۆ مێژوونووسی دلسۆزمان مامۆستا ئەمین زەكی بەسە كە توانی بناغەیەكی پتەو بۆ لێكۆڵینەوەی نوێی مێژوویی كوردی دابڕێژێ • بێ گومان لە خۆوە نەبوو ڕووناكبیرانی كورد بە گەرمی پێشوازیی بەرهەمەكانیان دەكردو بیری نوێیان لێ وەردەگرتن‌و دەیانكردە هەوێنی بەرهەمی نازدارو تازەبابەتیان • عوسمان صەبریی ئەدیب‌و مێژوونووس زنجیرەیەك وتـاری دەربـارەی « خولاصە » لە گۆڤاری « هاوار »دا بڵاوكردەوەو بەرز ئـەو بەرهەمەی نرخاند[150] •

وابزانم لە ڕاستی دوورناكەومەوە گەر بڵێم حسەین حوزنی موكریانی یەكەم مێژوونووسی كوردە دوابەدوای ئەمین زەكی شایانی باس‌و لێدوان بێ • با لە ڕێگەی نیمچە ئەفسانەیەكەوە بچینە ناو جیهانی پان‌و بەرینی ئەو پیاوە گەورەیەوە كە بە ناسۆرەیەكی زۆرەوە سەری نایەوەو بەداخـــەوە نازناوی « حوزنی »ی لەگەڵ خۆی بردە ناو گۆڕەوە • دەڵێن گوایە كاتێك دەستەیەك لە ئاركیۆلۆجیستە ڕۆژئاوایی‌یەكان هاتوونە سۆراخی شوێنەوارە كۆنەكانمان دەستوبرد حسەین حوزنی بە مێخ‌و چـەكوش‌و گازەوە خۆی گەیاندۆتە ئەشكەوتێك‌و لەسەر دیوارەكانی نووسـینێكی دەسـتكردی هەڵكەندووە بەو نیازەی لە پایەی ژیاری‌و قەدری شارستانەتیی كۆنی كورد لە بەرچاوی زانایان بەرزبكاتەوە • ئەمە ڕاست بێ یا درۆ بـە هەر بارێكدا

---

١٤٩ـ « گەلاوێژ » بەم قسانە كۆتایی بەووتارەی هێنـاوە كە دەربارەی چاپی عەرەبیی « مشاهير الكرد » بڵاوی كردۆتەوە . دەقی قسـەكانی «گەلاوێژ» بەم جۆرەیە : « یەكەنی دانەرو گەورەیی فەرمانەكەی پێكی‌هێنـــاوە چاكترین وەرلەمن بۆ هەموو گلەیی‌یە كە لە كتێبەكە ئەكرێت » ( بڕوانە : « گەلاوێژ » ، ژمارە ٥ ، مایسی ١٩٤٨ ، ل ٤٥ ) .

١٥٠ـ بڕوانە : « هـــاوار » ، ژمارە ٢٨ ، ١٥ی مایسی ١٩٤١ ، ل ٥ ـ ٦ ؛ ژمارە ٢٩ ، ١٠ی حوزەیرانی ١٩٤١ ، ل ٦ ـ ٧ ، ژمـــارە ٣٠ ، ١ی تەمموزی ١٩٤١ ، ل ٩ ـ ١١ .

یشکێنیتەوە دەتگەیێنیتە تەنها یەك ئەنجام ـ دلسۆزیی بێ‌سنوورو ئەندازەی ئەو پیاوە کە بیانی‌یان بەر لە خۆمان هەستیان پێی‌کردووەو بەرز نرخاندویانە[١٥١] .

حسەین کوڕی سەید عەبدوللەطیف ڕۆژی ١٢ ی ئەیلوولی سالی ١٨٩٣ ە مەهاباد لەدایکبووە . تالو ترشیی ژیانو ئاوارەیی وایانلی‌کرد « حوزنی » بکاتە نازناوی خۆی[١٥٢] ، لەبەر ئەوەش کە مەهاباد سەر بە موکریانە ، بووە حسەین حوزنی موکریانی .

من نامەوێ لەخۆمەوە خەملی‌بدەمو بلێم مامۆستا حوزنی‌و گەلێکی‌تری وەك ئەو بە هیچ جۆر نەکەوتوونە هەلەوەو قەت پێیان نەخلیسکاوە ، بەلام ئەوە بۆخۆی پێویستی بە لێکدانەوەی قوولو تایبەتی‌یە بێ‌دابڕینی لە تەوارەی کاتو شوێنی‌و بێ لەیادکردنی دلسۆزیی بێ‌سنووریان بۆ گەل ، ئەو دلسۆزی‌یەی هەرگیز هێزی بزوێنەری سەرەکی بووە بۆ گشت ڕەفتارێکیان بەپێی تێگەیشتن‌و بۆچوونی خۆیان ، ئەگینا بە لاداتێکی کەم زوربەیان لە ژیاندا گەلێ لەوەی هەیانبوو زیاتریان دەستدەکەوت[١٥٣] . زولم‌و زۆری عوسمانی‌و قاجاری کارێکی ئەوتۆی کردبوو زوربەی ڕووناکبیرە هەرە دلسۆزەکانی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست تا ماوەیەکیش لەمەوبەر باوەڕیان بە ئینگلیزو ماسۆنیزم بەهێز بێ ، هیچ دوور نی‌یە تائیستەش هی ئەوتۆ هەر

---

١٥١ـ بەوێنە بڕوانە ئەو قسانەی ئەندازیاری ئینگلیز هاملتن دەربارەی حسەین حوزنی لەکتێبەکەی خۆیدا کردوونی .
A. M. Hamilton, Road through Kurdistan. The Norrative of an Engineer in Iraq, London, 1937.

١٥٢ـ وەك گۆرکی کە نازناوی نووسەری سۆڤیەتی بەناوبانگ ئەلێکسێی مەکسیمەڤیچ پێشکەڤە ( ١٨٦٨ ـ ١٩٣٦ ) . گۆرکی بە ڕووسی مانای تالە .

١٥٣ـ لەم باسەدا مامۆستا فەریدون عەلی ئەمین دەربارەی پیرەمێرد نیشانی دروست پێکاوە ( بڕوانە : فەریدون عەلی ئەمین ، چەند سەرنجێك لە پیرەمێردی نەمر ، بەغدا ، ١٩٧١ ) .

مابن • ئەو ئەمەریکایەی ئیمڕۆکە بۆتە دێوەزمە لای زوربەی خەڵك تــــ ڕابوردوویەکی نزیکیش نیشتمانپەروەرانی ڕۆژهەڵات بە پەناگەیان دادەناو بە سەرو باڵی یەکێکی وەك تیۆدۆر ڕۆزڤلتو ویدرۆ ویلسنیاندا هەڵدەدا • هەرچۆن بێ کەس نییە بتوانێ بە هیچ جۆر گومان لە دلسۆزیی مامۆستا موکریانیو ئەوانەی وەك ئەو بیریان دەکردەوە ، بکات •

پایەبەرزیی حـــــەین حوزنی لە گۆڕەپانی مێژوونووسیدا وا خۆ دەنوێنێ کوێریش نەتوانێ نەیبینێ • لێرەدا بەر لە هەموو شت پەنا دەبەینە بەر چەند ژمارەیەکی مانادار[١٥٤] • تا کۆچی دوایی ســــەیدای هێژای موکریان حەقدە کتێبی هەمەجۆری بلاوکردەوە کــــە یازدەیانی بۆ باسی مێژووی کوردو دوانیشیانی بۆ باسی مێژوو بەگشــتی تەرخــانکردووە • واتە پتر لە دوو سێی کتێبە چاپکراوەکانی مێژوویین • ژمــارەی لاپەڕەی گشت کتێبە چاپکراوەکانی موکریانی[١٥٥] بەسەر یەکەوە ١٦٨١ لاپەڕەن کە ١٢٩٥یان[١٥٦] بۆ باسی مێژووی کوردو ١٤٧یان بۆ باسی مێژوو بەگشتی تەرخانکراون ، واتە موکریانی بەسەریەکەوە ١٤٤٢ لاپەڕەی کتێبــــە چاپکراوەکانی بۆ باسی مێژوویی تەرخــانکردووە کــە لــە سێ چواری ژمارەی لاپەڕەی هەموو کتێبە چاپکراوەکانی تێپەڕ دەکات •

خۆ ئەگەر بێتو ژمارەی لاپەڕەی ئەو بەرهەمە مێژووییە زۆرانەی

---

١٥٤ـ بۆ دیارکردنی ئەم ژمارانە کەڵك لە بەرهەمەکانی موکریانی خۆیو چەنــد سەرچاوەیەك وەرگیراوە ، تایبەت لە : نەریمان ، کتێبخانەی کوردی • کەرکوك ، ١٩٦٠ ، نەریمــــان ، بیبلیۆگرافیـــای کتێبی کوردی • لەچاپکراوەکانی « کۆڕی زانیاری کورد » ، بەغدا ، ١٩٧٧ •

١٥٥ـ بێ ژمارەی لاپەڕەی چاپی دووەمی سیان لە کتێبەکانی کە بەسەر یەکەوە ٢٠٦ لاپەڕەن •

١٥٦ـ بێ « غونچەی بەهارستان » کە ٩٤ لاپەڕەیەو ساڵی ١٩٢٥ لە حەلەب چاپیکردووەو باسی « مەنشەئی کوردان »ی تێدا کردووە •

حسەین حوزنی لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکاندا بڵاوی کردوونەوە[١٥٧] بیانخەینە سەر ئەو ژمارانەی باسمان کردن هەڵبەت ئەوساکە جێگەی لە مەیدانی مێژوونووسیی کوردیدا دیارتر دەبێ ، هەرچەندە بێ ئەوەش یەکجار دیارو دیارچاوە . کەوابێ هیچ سەیر نییە ئەدمۆندس لەو بیبلیۆگرافیایەیدا کە نزیکەی پەنجا ساڵ لەمەوبەر بۆ باسی چاپەمەنیی کوردیی عیراقی تەرخان کردووە[١٥٨] کاتێك دێتە سەر باسی بەرهەمە مێژوویییەکانو تەنها سیازدە ناو دێنێ دەڵێ زوربەیان حسەین حوزنی دایناون .

وێڕای ئەو ژمارانەی باسمان کردنو پێویستیان بە هیچ ئەنگوستێك نییە ، گەلێك ڕاستییتر لەئارادان کە مانگی موکریانی لە ئاسمانی مێژوونووسیی کوردیدا هێندەی تر گەشو دیار دەکەن . حسەین حوزنی یەکەم کەسە بە کوردی لە زانستی مێژوو دواوە . ساڵی ١٩٢٥ لە « غونچەی بەهارستان »دا باسی مێژوو ، قۆناغەکانی مێژوو ، زوبانو ڕەگەزو «قەومیەتو میللەت »ی کردووە[١٥٩] . دوای مەلا مەحمودی بایەزیدی دیسان حسەین حوزنی یەکەم کەسە لە سەردەمی نوێدا بەرهەمی مێژوویی بە کوردی داناوە ، بەڵام ئەوەندە هەیە ئەویان بۆ جابای ڕۆژهەڵاتناسی ڕووسیو ئەمیشیان بۆ گەلی کوردی بڵاوکردەوە ! ، ڕاستە ڕۆژگاری ئەو دووانە جیاواز بوو ، بەڵام هەر بەودەستوورەش ئەنجامی کارەکەیان

---

١٥٧ــ تایبەت لە « زاری کرمانجی »و « گەلاوێژ »و « دەنگی گێتی تازە »دا .
لێرەش دیسان زوربەی وتارەکانی بۆ باسی مێژووی کورد تەرخان کردووە ، بەڵام هەمان کات ، وەك دواییش باسی دەکەین ، وتاری مێژوویی گشتیشی بڵاوکردۆتەوە .

١٥٨ــ بڕوانە : C. J. Edmonds, A bibliography of Kurdish periodical and books published in Iraq, - "Journal of the Royal Central Asian Society" London, Vol. XXIV, July 1937.

١٥٩ــ بڕوانە : نەریمان ، بیبلیۆگرافیای کتێبی کوردی ، ل ٢١ .

تارادەیەکی زۆر جیاواز بوو ۰ بەرگی یەکەمی « گاوڕێکی پاشەوە »[١٦٠] یەکەم کتێبی مێژوویی بلاوکراوەی سەربەخۆی کوردی‌یە کــــە بۆ باسی مێژووی کورد تەرخانکراوە ، هەر لەبەرئەوەشە ئەو کتێبە چەند بە بارست پچوك بێ[١٦١] هێند بە مانا گەورەیە ۰

جاری‌وا هەیە مامۆستا حسەین حوزنی موکریانی لە ساڵێکدا پتر لـــە بەرهەمێکی دەربارەی مێژووی کورد بلاوکردۆتەوە ۰ ساڵی ١٩٣١ بەرگی سێیەمی « گاوڕێکی پاشەوە »و « مێژووی ناودارانی کورد »و « تاریخی حوکمدارانی بابان »ی چاپکرد[١٦٢] کە بەسەر یەکەوە نزیکەی ٤٥٠ لاپەڕە دەبن ۰ پاش سێ ساڵ ، واتە ساڵی ١٩٣٤ « کوردو نادرشا »و « کوردی زەند »ی بلاوکردەوە[١٦٣] کە بە هەردووکیان ١٨٠ لاپەڕەن ۰ شایانی باسە بەشێك لە بەرهەمە مێژوویی‌یەکانی حسەین حوزنی دوو جار چاپکراون ۰ وەك « مێژووی میرانی سۆران » کە یەکەمجار لە ڕەواندوز ساڵی ١٩٣٥و دووەم جار لە هەولێر ساڵی ١٩٦٢ چاپکراوە ۰

بۆئەوەی باشتر لە مانای ئەم ڕاستی‌یانە تێبگەین لێرەدا دیسان پەنـــا دەبەینەوە بەر چەند ژمارەیەك[١٦٤] ۰ لە ساڵی ١٧٨٨وە تاوەکو ساڵی ١٩٢٤ هەمووی بەسەریەکەوە ٢٥ کتێب بە زوبانی کوردی چاپکراوە کە هیـــچ کامێکیان نە زۆرو نە کەم‌و نە بەگشتی ، چجای تایـــــەتی توخنی مێژوو نەکەوتوون ۰ لە ساڵی ١٩٢٥یشەوە تاوەکو ســـــالی ١٩٢٩ هـــەمووی بەسەریەکەوە ٢٣ کتێب بە زوبانی کوردی چاپکراوە کە تەنها سیانیان بۆ

---

١٦٠ــ ڕەواندوز ، ١٩٢٩ ۰

١٦١ــ ٣٧ لاپەڕەیە ۰

١٦٢ــ هەرسێکیان لە ڕەواندوز چاپکراون ۰

١٦٣ــ ئەمانیش لە ڕەواندوز چاپکراون ۰

١٦٤ــ بۆ ئەم بەراوردە کەڵك لە ژمارەکانی ناو ئەو خشتانە وەرگیراوە کە لـــە پاشکۆکەی « بیبلیۆگرافیای کتێبی کوردی »ی نەریماندا بلاوکراونەوە.

مـی مێژوو تەرخان کراونو هەرسێکیشیان بەرهـەمی خامـەی ڕەنگینی حـەسەین حوزنین • لە ساڵی ۱۹۳۰یشەوە تا سـاڵی ۱۹٤٥ هـەمووی بەسەریەکەوە ۱۸٤ کتێب بە زوبانی کوردی چاپکراوە کە تەنها سیازدەیان باسی مێژوو تەرخانکراون ، بەڵام لەو سیازدەیە هەشتیان ، واتە پتر لـە نیوەیان ، حسەین حوزنی داینـاون •

حسەین حوزنی موکریانی ژمارەیەك وشـەو زاراوی مێژوویی پەتی داڕشتووە یا بەر لە ڕووناکبیرانیتر بۆ مەبەسـتی مێژوویی لە نووسـیندا بەکاریهێناونو لە زوربەیاندا نیشانی دروست پێکاوە • پێم وایە یەکەم کەسە لە کاتێکی زووی وەك بیسـتەکانەوە ( مێـژوو )ی لەبریتی ( تاریـخ ) بەکارهێناوەو[165] لە سـاڕستەی ( لەمێژەوە )ی وەرگرتووە کـە مانـای ڕابوردوویەکی دوور دەگەیەنێو بەوجۆرە بۆ واتـای ( تاریخ ) پڕبەپێستی خۆیەتی • هیچکام لە مێژوونووسانی بیستەکان ئەو زاراوەیان بەکارنەهێناوە • زاراوی ( مێژوونووس )یش بەرهەمی ئـەو بۆچوونە وردەی موکریانییە • « وڵاتی مەیان دوو ڕووباران » کە دیسان مامۆستا حوزنی یەکەم کوردە لـە نووسـیندا بەکاریهێنـاوە[166] وەرگێڕانی دروسـتی ( میسۆپۆتامیا Mesopotamia) یە کە لە دوو وشەی یۆنانیی کۆن پێکهاتووە : « میسۆس » (Mesos) کە مانای ( نێوان ، ناوەند، ناوەڕاست)و «پۆتامۆس» (Potamos) کە مانای ڕووبار دەگەیەنێو بەسەریەکەوە بە عیراق دەگوترا[167] •

---

۱٦٥– بە وێنە بڕوانە : « ئاوڕێکی پاشەوە » ، بەندی دووەم ، ل ٤ •

۱٦٦– بڕوانە وتاری « پەیدابوونی شارستانیەتی لـە وڵاتی مـەیان دوو ڕووباراندا »ی حسـەین حوزنی لە گۆڤاری«دەنگی گێتی تازە »دا ، بەغدا، ژمارە پێنج ، بەرگی دوو ، ئاغستۆسی ۱۹٤٤ ، ل ٥۱ ٤ – ٤٥٥ •

۱٦۷– نووسـەرە ڕۆژئاواییەکان تا ماوەیەکیش لەمەوبەر زۆر جار لەبریتی عیراق « میسـۆپۆتامیا »یان بەکاردەهێنا • دوکتۆر زەکی صالحیش کـە یەکێکە لە مێژوونووسانی عیراق ساڵی ۱۹٥۷ کتێبێکی خۆی بـەوناوەوە بە ئینگلیزی بڵاوکردەوە ( بڕوانە :
Zaki Saleh, Mesopotamia. Iraq 1600—1914, Baghdad, 1957).

که ئەندازیاری ئینگلیز هاملتن چووە ڕەواندوزو بە چاوی خۆی هەولێو تەقەللای پڕ لە دڵسۆزیی حسەین حوزنیی بینی‌و زانی « زاری کرمانجی » بەرهەمی چاپخانەیەکی ساکار نیەو ، بەڵکو بەرهەمی چڕەنجێکە ، لە کتێبەکەی خۆیدا کە بە ناوی « ڕێگەیەك بە نـــاو کوردستاندا » بڵاوی‌کردەوە ئەم ڕاستی‌یە پڕمانایەی تۆمارکرد ، موکـریانی « خۆی بە تەنها وتارەکانی گۆڤارەکەی دەنووسی ، خۆی بەتەنها وێنـەکانی دەکێشان ، خۆی بەتەنها لەچاپی دەدان‌و ئینجا دەشی‌پێچانەوە • ئەمە بۆ خۆی نمونەیەکی بێ‌هاوتایە لەسەر ڕووی هەموو زەمین»[168] •بەڵام هاملتن دەبوو بشڵێ موکریانی ، ماڵی ئاوا ، بە هەمان دەستوور خۆی بەتەنها دانەرو تیپکارو چاپکەری بەرهەمە مێژووییەکانی بوو ، ئەوەی دیسان تائێستە لە وێنـــەی نەبووە ، دیارە زۆر زەحمەتە لە وێنەشی ببێ !•

وێڕای هەموو ئەوانەی باســـان‌کردن حســـەین حوزنی لــە مەیدانی وەرگێڕانی بەرهەمی مێژوویشدا دەستی باڵآ بوو • لە « گەلاوێژ »و « دەنگی گێتی تازە »دا ژمارەیەك وتاری بڵاوکردۆتەوە کە زوربەیانی لــە عەرەبی‌یەوە وەرگێڕاوەتە سەر زوبانی کوردی • تەنانەت لەو مەیدانەشدا حسەین حوزنی دەیزانی چی بۆ خوێندەواری کورد هەڵدەبژێرێ • « ئەرمەن وەتەنی قەومی‌یان چۆن پەیداکرد»و[169] «جمال‌الدین ئەفغانی»[170] لەو وتارە بەکەڵکانەن کە موکریانی کردوونی بە کوردی •

چەند هۆیەك لە مەودای قوولبینی مامۆســـتا حسەین حوزنی‌یان وەك مێژوونووس کەم‌دەکردەوە • هەرچەندە خوێندەوارێکی باش بوو ، بــەڵام

---

١٦٨– A. M. Hamilton, Op. Cit., pp. 122—123, 237

١٦٩– ئەم وتارەی لە گۆڤاری « الهلال »ی میسری‌یەوە وەرگرتووەو بە دوو جار بڵاوی‌کردۆتەوە ( بڕوانە : « گەلاوێژ » ، ژمارە ١ ، کانوونی دووەمی ١٩٤٤ ، ل ٥٤ ــ ٥٧ ، ژمارە ٣ ، مارتی ١٩٤٤ ، ل ٤٣ ــ ٤٧ ) •

١٧٠– بڕوانە : « گەلاوێژ » ، ژمارە ١٠ ، تەشرینی یەکەمی ١٩٤٤ ، ل١ــ٨، ژمارە ١ ، کانوونی دووەمی ١٩٤٥ ، ل ٧ــ١٤ •

خوێندنی هیچ کات نەچۆتە ئەودیوی دیواری مزگەوتەکانی کوردستانەوە ، دەوروبەری ئەوساش وەك دەوروبەری ئیستە نەبوو تا بتوانێ زۆری لێوە فێر بێ • ژمارەیەك زمانی ڕۆژهەلاتیی چـــاك دەزانی[١٧١] ، بەلام لە زمانـــە ڕۆژئاواییەکان تەنها کەمێك لە ئینگلیزی تێدەگەیشت • بێ گومان یەکجار دلسۆز بوو ، بەلام زۆر جار مەبەستی ئەودلسۆزی یەی پەردەیەکی ئەستووری بەسەر بۆچوونەکانیدا دەکیشا ، ئـەوەی لە پلــەی زانستی بەرهەمەکانی کەمدەکردەوە • جا ئاخۆ هەر دلسۆزێکی تر وەك ئەوو لە ڕۆژگاری ئـەوو لە جێگەی ئەودا بوایە دەیتوانی ئاوداماں بەرگی « حوزنی » نەپۆشێ ؟

هەرچەندە وابێ دەچێ سەرچاوەکانی نووسینە مێژووییەکانی مامۆستا حوزنی هی ڕەسەنیان کەم نەبن ، بەلام هەمان کات ئاشکرایە کە ئەو سەرچاوانە بە ژمارە زۆر نین • بێ گومان شەرەفنامەی شەرەفخانی بدلیسی یەکێکە لە سەرچاوە سەرەکییەکانی زوربەی بەرهەمە مێژووییەکانی،تایبەت «ئاوڕێکی پاشەوە »[١٧٢] • بەکــار هێنانی ئەو جۆرە ســـەرچاوانە لەلایەن حسەین حوزنییەوە سەرنجی باسیل نیکیتینی ڕاکیشاوە کە دەلێ :

« حسەین حوزنی نووســـەری کورد ••• دواسالانی ژیانی بۆ لێکۆلینەوەی مێژووی کورد تەرخـانکردو چـــەند کتێبێکی لەوبارەیەوە بلاوکردەوە کـــە ســـەرچاوەیان دەسنووس و قسەی سەرزاری پێشنیانو سەرچاوەی عەرەبیو تورکیو فارسین»[١٧٣] •

---

١٧١ــ جگە لە هەردوو زاراوی سەرەکیی کوردی عەرەبیو فارسیو تورکیشی دەزانی •

١٧٢ــ بۆ خۆی مامۆستا حسەین حوزنی لە نووسینەکانیدا چەندجارێك ناوی « شەرەفنامە »و ئەوجۆرە سەرچاوانەی هێناوە ( بـە وێنە بڕوانە : « ئاوڕێکی پاشەوە » ، بەندی دووەم ، ل ٣٧ ) •

١٧٣ــ B. Nikitine, Op. Cit. چاپی ڕووسی ل ٢٧٠ •

له بەرهەمەکانیدا حسەین حوزنی باسی مێژووی کۆنو سەدە ناونجییەکانو قۆناغی نوێی کوردی کردووە ٠ نەژادو ڕەگەزو زوبانو ئاینی کوردان ، لۆلۆو میدیو کاشیو کاردۆخیان ، میرو میرنشینەکانی کوردستان حەسنەویو موکریان ، سۆرانو بابان ، بنەماڵەی ئەردەلانو ناودارانی لوڕستان ، شاری هەولێرو دەشتی شارەزوورو ڕوداوە گەورەکانی مەهاباد خوێنین ــ ئەوباسانەن کە مامۆستا حوزنی شەونخونی بۆ دەکێشانو برسێتی لە ڕێگەیاندا دەچێشت ! ، یا « گەلاوێژ » گوتەنی « لاپەڕەکانی ژیانی ... بۆ خەرج کرد ، زەمانی جوانیی بۆ دانا ، عومری گرانقیمەتی لەپێناوە براندەوە، لەڕێگەیا چەوسایەوە، ڕووتی کێشا ، برسێتی چێشت، دەربەدەریو ملکزیی شارانی گرتە ئەستۆ »[١٧٤] ٠ دیارە هەر لەبەرئەوەش بوو کە ڕۆژی ٢٠ی ئەیلوولی ساڵی ١٩٤٧ لە بەغدا گیانی بەدەستەوەداو لاشەی بە خاکی هەولێری دێرین سپێردرا[١٧٥] دڵسۆزان لە قوڵایی دڵەوە گوتیان « حوزنی نەمردویت ، نامریت ، لە گۆشەی وڵاتا شوێنت تەرخانە ، ئەسەرەکانت چاوەندازی چاوی دڵوریاکانە »[١٧٦] ٠

زانای هێژاو گەورە تۆفیق وەهبی هەرچەندە بەر لە هەر شت زمانەوانە. بەڵام لە مەیدانی مێژووی ڕووتیشدا خزمەتی کەم نییە ٠ مامۆستا وەهبی وەستایانە بە یاریدەی مێژوو توانیویە گەلێك لە مەبەستەکانی لە مەیدانی

---

١٧٤ــ « گەلاوێژ »، ژمارە ٩ــ١٠ ، ئەیلوول ــ تەشرینی یەکەمی ١٩٤٧ ، ل ٦٨ ٠

١٧٥ــ خۆی بەر لە وەفاتی داوای کردبوو لە هەولێر بنێژرێ ٠

١٧٦ــ بڕوانە : « گەلاوێژ » ، ژمارە ٩ــ١٠ ، ئەیلوول ــ تەشرینی یەکەمی ١٩٤٧ ، ل ٧٠ . شایانی باسە مامۆستا شاکر فەتاحیش لە نامیلکەیەکی ٣٠ لاپەڕییدا بەتایبەتی باسی ژینامەو بەرهەمو چالاکییەکانی مامۆستا حسەین حوزنیی کردووە ( بڕوانە : شاکر فەتاح ، دەماوی موکریانی . سلێمانی ، ١٩٧٢ ) ٠

ـەکەوانیدا ڕوون بکاتەوە[١٧٧] . هەر بەودەستوورەش بنجو بناوانی مێژوویی زنجیرەیەک ناوی شارو مەڵبەندی بەناوبانگی کوردستانی لێکداوەتەوەو لـە جێجاکاندا بە عەرەبی لە گۆڤاری « سۆمەر »و « گۆڤاری کۆڕی زانیـاری عێراق »دا بڵاوی کردوونەوە[١٧٨] . لەم دواییەشدا چەند بەرهەمێکی لـە ڕۆژنامەو گۆڤارەکاندا بڵاوکردەوە[١٧٩] .

لەناو دەستەی دووەمی مێژوونووسانی کوردا خوالێخۆشبوو صـالح قەفتان جێگەی دیارە ، ئەوەی لـە کاتی باسی « ڕۆژنامەنووسیی کوردیو مێژوو »دا بەڕوونی هەستمان پێ کرد . کەم لە ڕووناکبیرانی سەردەمی خۆی

---

١٧٧ـ بەوێنە بڕوانە ئەو زنجیرە وتارەی بە ناوی « بنجو بناوانی زمـانی کوردی لە توێکلە گوێزێکدا » لە گۆڤاری « گەلاوێژ »دا بڵاوی کـردەوە ( بڕوانە : « گەلاوێژ » ، ژمارە ٣ ، مارتی ١٩٤٣ ، ل ٣٩ ــ ٤٤ ، ژمارە٤، نیسانی ١٩٤٣ ، ل ٣٥ ــ ٤٠ ؛ ژمارە ٥ ، مایسی ١٩٤٣ ، ل ٣٥ـ٤٠ ، ژمارە ٧ ؛ تەمموزی ١٩٤٣ ، ل ٤٣ـ٤٦) .

١٧٨ـ بەوێنە بڕوانە : توفیق وهبی ، ملاحظات عن تکون سهل السلیمانیة ، مجلة « سومر » بغداد ، العدد ١٣ ، ١٩٥٧ ، ص ١٨٨ ــ ١٩٠ ، توفیق وهبی ، التون کوپرو ــ الجسـر الذهب ، ــ « مجلـة المجمع العلمی العراقی» ، بغداد ، المجلد الرابع ، الجزء الثانی،١٩٥٦ ،ص٣٥٧ـ٣٨٤). مامۆستا وەهبی لە « سۆمەر »دا وتاری بە ئینگلیزیش بڵاوکردۆتەوە کە بەکێکیان دەربارەی ئەشکەوتی گوندۆکەو بەکر دلێر هـەر بەوبلوەوە کردبویە بە کوردیو ساڵی ١٩٥١ لە بەغدا بڵاوی کردۆتەوە . نامیلـکەی « ئەشکەوتەکەی گوندۆک » بە وێنەکانی ناوییەوە ٣١+٢ لاپەڕەیە . لـە گۆڤاری « الکاتب »یشدا وتاری بڵاوکردۆتەوە (بڕوانە : «الکاتب» بغداد ، العدد الاول ، حزیران ١٩٥٨ ) .

١٧٩ـ لە ناوەندی شوباتی ساڵی ١٩٧٤دا ، ئەوکاتەی من سـەرپەرشتیی لاپەڕەی « ثقافة کردیة »ی ڕۆژنامەی « التآخی »م دەکرد مامۆستا توفیق وەهبی پێنج وتاری سەربەخۆی نایابی دەربارەی شارەزوورو سەرچنارو پیرەمەگرون بۆ ئەو لاپەڕەیە نارد کە بەداخەوە فریانەکـەوتین بڵاویان بکەینەوە . دەستنووسی ئەو وتارانە ئێستە لای منن ، هیوادارم دەرفەتی بڵاوکردنەوەیانم بۆ هەلکەوێت .

بەڕادەی ئەو عەودالی مێژوو بوون کە تەنانەت وەك دەرسیش ئارەزووی بۆ وتنەوەی لە هەموو بابەتەکانیتر زیاتر بوو • خۆزگەو ئاواتی گەورەی صالح قەفتان ئەوەبوو کە «بەتەنیا ئێمە » لەم جیهانە پانو بەرینەدا «لە کەمتەرخەمید (بەرامبەر مێژووی گەلــك • م • ) ئەوەندە پێشکەوتوو نەبووینایە»[180].

مامۆستا صالح قەفتان یەکێك بوو لەوانەی هەوڵیان دەدا بەرهەمەکانیان بە کوردییەکی پەتیو پاراو دابڕێژن • دوای ئەمین زەکی یەکەم مێژوونووسی کوردە کە دیسان بەڕوونی باسی پێوەندی کوردی بـــە ئارییـــەکانەوە کردووەو[181] یەکەم مێژوونووسی کوردیشە کە بەتایبەتی وتاری دەربارەی هۆزە ئارییەکان بڵاوکردۆتەوە[182] • وادیارە ئـاریچیەتی نازییەکانی ئەڵەمانیا کە دەیانزانی چۆن هەست دەبزوێنن کاری زۆری کردۆتە ســەرو ساڵی ١٩٣٦ ، واتە لە گەرمەی هەراوبگری ئەواندا ، لە نامێلکەیەکی تایبەتیدا باسی نەژادو پەیدابوونی ئەڵەمانەکانی کردووەو ژیانی کوردی لەگەڵ ژیانی ئەواندا بەراوردکردووە •

جگە لەوانەی باسمانکردن مامۆستا صالح قەفتان بەرهەمی مێژوویی گشتیشی هەیە کە شەقڵی بۆچوونی زانستییانەیان پێوە دیارە ، وەك ئـەو وتارەی کە ناوی ئاوە « کۆچوڕەوی ئـەقوامی کۆن تاریخی هێنـــاوەتە کایەوە»[183]، یا وتاری « پەیابوونی ئایینی ئیسلام • بۆچ کەیانی ئاریی کۆن ڕووخاوە »[184] • هەروەها لە کاتێکی زووی وەك نـاوەندی سییەکان لە

١٨٠ـ بڕوانە : صالح قەفتان ، مێژووی نەتەوەی کورد ، بەغدا ، ١٩٦٩ ، ل ٥ .

١٨١ـ بڕوانە : «گەلاوێژ»، ژمارە ٥ و ٦ ، مایسو حوزەیرانی ١٩٤٢، ل٢٠.

١٨٢ـ هەمان سەرچاوە .

١٨٣ـ بڕوانە : « گەلاوێژ » ، ژمارە ١و ٢ ، کانوونی دووەمو شوباتی ١٩٤٢ ، ل ٣٠ ـ ٣٤ .

١٨٤ـ بڕوانە : « گەلاوێژ » ، ژمارە ٥ ، مایسی ١٩٤٣ ، ل ١ـ٦ .

کتێبێکی سەربەخۆی ٦٠ لاپەڕەییدا باسی شۆڕشی گەورەی فەرەنسەی کردووە[١٨٥] .

دوای شۆڕشی چواردەی گەلاوێژی ساڵی ١٩٥٨ مامۆستا صالح قەفتان لەگەڵ زۆریی تەمەنیشی لە جاران چالاکانەتر هاتە مەیدانی مێژوونووسیەوە . ساڵی ١٩٥٩ لە کتێبی « نەتەوەی کورد تورکمان نین »دا[١٨٦] دڵسۆزانە بەرپەرچی چەند ڕایەکی نازانستانەی دەربارەی نەژادی کورد دایەوە کە بە قاچاغ تێکەڵ بە لاپەڕەکانی ڕۆژنامەی « الاهالی » بوون[١٨٧] .

بەر لە کۆچی دوایی بە ماوەیەکی کەم صالح قەفتان لە دانانی گەورەترین بەرهەمی دەربارەی مێژووی کورد بۆوە کەوا دیارە چەندین ساڵ بە نووسینیەوە خەریکبووە . ئەو کتێبەی کە ٤٠٨ لاپەڕەیەو ناوی « مێژووی نەتەوەی کورد »ی لێ ناوە[١٨٨] بریتییە لە دارشتنێکی پاراوی نوێی بەرهەمە مێژوویەکانی ئەمین زەکی[١٨٩] بەونیازەی قوتابیانو لاوان ببنە « پەیڕەوکاری ئەو سەرداری زانستیە »[١٩٠] . ئەم ڕێزلێنانە زۆرەی ئەمین

---

١٨٥ـ ئەو کتێبەی ناوناوە « پەندی تاریخی » کە ساڵی ١٩٣٧ لە بەغدا چاپی کردووە .

١٨٦ـ « کورد تورکمان نین » ٣٥ لاپەڕەیەو لە سلێمانی چاپکراوە .

١٨٧ـ لێرەدا گلەییەکی بچوکم هەیە جارێکا نایدرکێنم .

١٨٨ـ ساڵی ١٩٦٩ لەسەر ئەرکی فەهمی قەفتانو بە سەرپەرشتیی دوکتۆر کاوس قەفتان لە بەغدا چاپکراوە . ناوی تەواوی کتێبەکە بەمجۆرەیە: « مێژووی نەتەوەی کورد . حاڵەتی سیاسی ، مێژوویی، کۆمەڵایەتی، ئاوەدانیی گەلی کورد لە سەرەتای مێژووەوە » .

١٨٩ـ صالح قەفتان بۆخۆی چەند جارێك ئەوەی لە پێشەکیو ناوەرۆکی کتێبەکەیدا تۆمار کردووە .

١٩٠ـ بڕوانە ئەو پێشەکییەی مامۆستا صالح قەفتان بۆ کتێبەکەی نووسیوە.

زەکی ، بێ گومان ، لە پایەو قەدری صالح قەفتان خۆی بەرزدەکاتەوە ، ئەمو دەرسەی ، زۆر بەداخەوە ، جارێکا تێیدا کۆلین •

خزمەتە زۆرەکانی صالح قەفتانو شێوازی ژیانی سەرنجی ڕووناکبیرانیان ڕاکێشا ، ئەوانەی بە ئەوپەڕی ڕێزو داخەوە مانگی ئابی سالی ١٩٦٨ بە خاکی سەیوانیان سپارد •

مامۆستا ڕەفیق حلمی پێشڕەوی یادداشتنووسیی کوردی‌یە کە تا ئیستەش وەك پێویستە بایەخی پێنەدراوە بۆیەکا بۆتە کەلێنێکی گەورە لە کتێبخانەی کوردیداو بێ پڕکردنەوەی ئەرکی نووسینەوەی زۆر لایەنی گرنگی مێژووی نوێمان کارێکی زەحمەت دەبێ • شەش بەرگە دانسقەکەی « یادداشت »ی ڕەفیق حلمی کە بەسەریەکەوە نزیکەی ٦٥٠ لاپەڕەن[191] سەرچاوەیەکی ڕەسەنو بەسوودن بۆ ڕوونکردنەوەی گەلێك لاپەڕەی خەباتی نەتەوەیی گەلی کورد • ڕەنگبێ لێرەدا ئەوەندە بەس بێ گەر بلێم زوربەی ئەمو کوردانەی لەدەرەوە خوێندنی بەرزیان تەواوکردووەو نامەی دوکتۆری‌یان بۆ باسی مێژووی نوێی کورد تەرخانکردووە پەنایان بردۆتە بەر «یادداشت»و کەلکی زۆریان لە زانیاری‌یەکانی وەرگرتووە •

وەنەبێ ڕەفیق حلمی لەو شاکارەیدا تەنها ئەو ڕوداوانەی تۆمارکردبێ کە بۆخۆی دیونی یا لە دروستکردنیاندا بەشدار بووە ، بەلکو هەمانکات هەولیداوە لە قوژبنێکی بەرفراوانەوە سەیریانبکاتو لە دەوروبەری خۆیانیان دانەبڕێ ، ئەوەش بۆخۆی ، وەك ئاشکرایە ، یەکێکە لە مەرجە گرنگەکانی لێکۆلینەوەی زانستی‌یانەی ڕوداوی مێژوویی‌و تێگەیشتنی • بڕواش ناکەم هیچکام لە پیاوە سیاسی‌یە کۆنەکانی عیراق بە کوردو

---

١٩١ــ هەر شەش بەرگی « یادداشت » لە بەغدا چاپکراون ، بەرگی یەکەمو دووەمو سێیەمو چوارەم سالی ١٩٥٦و بەرگی پێنجەم سالی ١٩٥٧و دوا بەرگی سالی ١٩٥٨ •

عەرەبیانەوە وەك ڕەفیق حلمی توانیێتی وێنەی ڕەقیو تڕو فیزو لووتبەرزیی کاربەدەستانی ئینگلیزمان لە ساڵەکانی دوای شەڕی یەکەمی جیهـــاندا بۆ بکێشێ ، ئەوەی بووە یەکێك لە هۆ گرنگەکانی تەقینەوەی ڕقی پـیرۆزی کۆمەلانی خەلکی هەموو عیراق •

وێڕای ئەوانەی باسمان کردنو گەلێك لایەنی بایەخداریتری ئەو بەرهەمە نازدارەی ڕەفیق حلمی ، « یادداشت » بووە بەردی بناغە بۆ یادداشتنووسیی کوردی ، چونکە بووە هاندەری ژمارەیەك لە پیاوە سیاسییە کۆنەکانی کورد کە ئەوانیش یادداشتەکانی خۆیان بنووسنەوە • ئەحمەد تەقی بۆ خۆی باسی ئەوەی کردووە[١٩٢] •

لە مەیدانی یادداشتنووسیدا ئەحمەد تەقیو ئەحمەد خواجاش خزمەتی چاکیان پێشکەش کردووەو گەلێك لاپەڕەی نەزانراوی ساڵانی بەرو دوای شەڕی یەکەمی جیهانو تایبـەت بیستەکانیان بۆ ڕوون کـردووینەوە[١٩٣] • ئەمجۆرە بەرهەمانە هیچ نەبێ لەبەرئەوەی سەرەتای ڕێگـــەن لـە هەڵەو کەموکورتیو سەراوەکی ( قوولنەبوونەوە ) بێبەش نین ، بـەلام لەگـەل ئەوەشدا بایەخیان بۆ مێژوونووس کەم نییە •

خوالێخۆشبوو ئەنوەر مائیش یەکێکە لەو سەربازانەی بـە ئەوپەڕی دلسۆزییەوە هاتنە گۆڕەپانی مێژوونووسیی کوردییەوە • ئەنوەر کوڕی

---

١٩٢ـ بڕوانە : « خەباتی گەلی کورد لە یادداشتەکانی ئەحمەد تەقیـــدا . لاپەڕەیەك لە شۆڕشەکانی شێخ مەحمودو ســـمکۆو هـەستانەکەی ڕەواندز » ، ڕێکخستنو ئامادەکردنی بۆ چاپ جەلال تەقی ، بەغـدا ، ١٩٧٠ ، ل ٦ ـ ٩ •

١٩٣ـ هەمان سەرچاوە کە ٩٢ لاپەڕەیە ، ئەحمەد خواجا ، چیمدی ، بەرگی یەکەم ، بەغدا ، ١٩٦٨ ، بەرگی دووەم ، سلێمانی ، ١٩٦٩ ، بەرگی سێیەم ، سلێمانی ، ١٩٧٠ ، بەرگی چوارەم ، سلێمانی ، ١٩٧٣ . هەر چوار بەرگی « چیم دی » بەسەریەکەوە ٧٠٠ لاپەڕە دەبن .

شێخ محەمەد تایەری کوڕی مەلا ئەوڕەحمانی ئالەکی مائیە ، لە بنەماڵەیەکی ئاینی ئەدەبپەروەرە ، ساڵی ١٩١٣ لـــە گوندی مایی نزیك ئامێـــدی لەدایكبووە ، لە هۆزی بەرواریی ژوورووە . خوێندنی ئاینی لە مزگەوتەکانی بامەڕنیو دهۆكو زاخۆو ئامێدیو هەولێر تەواوکردووە،ساڵی ١٩٣٦ ئیجازەی مەلایی وەرگرتووە . لە هەڕەتی لاویەوە شیعری بەسۆزی وتووەو نازناوی (لاوی چیا)ی بۆ خۆی هەڵبژاردووە[١٩٤] .

وادیارە بەر لە شـــۆڕشی چواردەی گەلاوێژ لاوی چیـــا دەرفەتی بڵاوکردنەوەی بەرهەمی مێژوویی بۆ هەڵنەکەوتووە ، ئەگینا گومان لـەوە ناکرێ کە لەزووەوە وەك شـیعر بایەخی بـە مێژووش داوە . گەورەترین بەرهەمی مێژوویی بڵاوکراوەی ئەنوەر مائی ناوی « کوردی بادینان »ە کە ساڵی ١٩٦٠ بە عەرەبی چاپی کردووە[١٩٥] . بەر لەوەش بە ســـاڵێك بە نامیلکەیەکی سەربەخۆدا ئەو وتارەی بڵاوکردۆتەوە کە لە چین دەبارەی کورد خوێندبوویەوە[١٩٦] .

ئەنوەر مائی لە یەکەمیاندا بە درێژیو لە دووەمیاندا بەکورتی باســـی مێژووی کۆنو نوێی کوردی کردووەو کەڵکی زۆری لـــە بەرهـــەمەکانی شەرەفخانی بدلیسیو ئەمین زەکیو حسەین حوزنیو صدیق الدملوجیو[١٩٧] سەرچاوە کۆنەکان وەرگرتووە . ئەو زانیاری‌یانەی دەربارەی مێژووی نوێی

---

١٩٤ــ بڕوانە : « ڕوناهی » ، بێروت ،ساڵی یەك ، ژمارە ١٢ ، ای‌ملوتی ١٩٤٣ ، ل ١٠ ــ ١١ .

١٩٥ــ بڕوانە : انور المائي ، الاكراد في بهدينان ، الموصل ، ١٩٦٠.

١٩٦ــ بڕوانە : انور المائي ، محاضرة عن الاكراد في الصين ، بغداد ، ١٩٥٩ . ئەنوەر مائی ئەندامی ئەو وەفدە بوو کە دوای ســـەرکەوتنی شۆڕشی چواردەی گەلاوێژ بە ناوی‌گەلی عیراقەوە چووە چین .

١٩٧ــ صدیق الدملوجي ، امارة بهدينان الكردية او امارة العمادية ، موصل ، ١٩٥٢ .

کورد لە « کوردی بادینان »دا بڵاوی کردوونەوە بایەخیان زۆرە چونکە یـا خۆی ئاگاداریان بووە یا لەوکەسانەی بیستوونەوە کە بە چاو دیویانن یـا تیایاندا بەشدار بوون .

بە دەستووری حسەین حوزنی زۆر جار هەست لای ئەنوەر مائی بەسەر زانستدا زاڵبووە . کار لای ئەمیان گەیشتۆتە باسی بۆرابۆزی « شاعیری کورد » کە گوایە دەوروبەری ۲۳۰۰ ساڵ لەمەوبەر بە کرمانجی یەکی ڕەوانو پاراو ( ! ) شیعری بەسۆزی بۆ یاری شۆخو شەنگی وتووە[198]. لای مائی، وەك گەلێك لە مێژوونووسانی تری لای خۆمان ، ئاسووری یەکان بوونەتە کوردو داشی دامەی دەستی ئینگلیز[199] .

وادیارە بەر لە کۆچی دوایی ( ساڵی ۱۹٦۲ وەفاتی کردووە ) مامۆســتا مائی بەرهەمێکی تری مێژوویی بایەخداری ئامــادە کــردووە کــە ئەویش وەرگێڕانی « مەصحەفا ڕەش »ی یەزیدی یەکانە لە کوردی یەوە بۆ عەرەبی کە دەسنووسەکەی ئیستە وا لە کتێبخانەی تەها مەزهەر مائی شاعیردا[200] .

---

۱۹۸ــ بڕوانە : انور المائي ، الاکراد في بهدینان ، ص ۱۹٦ ــ ۱۹۷ . نووسەر دەڵێ گوایە ئەو شیعرانەی لە یادداشتەکانی دوکتۆر بلەچ شــێرکۆ وەرگرتووە کە ئەویش گوایە لە ڕۆژهەڵاتناسی ڕووسی ن. فلیامینۆفی وەرگرتووە.دیارە لێرەدا مەبەست ڤلیامینۆڤ زێرنۆڤە کە هیچ بەڵگەیەك بەدەستەوە نی یە ڕۆژێك لە ڕۆژان ئەو گوتبێتی زانایان لــە باکووری ئێراندا لەوحەیەکیان دۆزیوەتەوە پارچەیەك هۆنــراوەی بۆرابۆزی شاعیری کوردی تێدایە کە دەوروبەری ساڵی ۲۳۰ی پێش عیسا ژیاوە. نەشمبیســتووە دوکتۆر بلەچ شێرکۆ یادداشتی هەبێ . بلــەچ شێرکۆ بۆخۆی ناوی خواســتەنیی جەلادەت بەدرخانە کە تەنها کتێبی « القضیة الکردیة »ی بەناوەوە بڵاوکردۆتەوەو لەو کتێبەشدا بە هیــچ کلۆجێ ناوی بۆرابۆز نەهاتووە .

۱۹۹ــ هەمان سەرچاوە ، ل ۲۳۵ ــ ۲٤۸ .

۲۰۰ــ بڕوانە ئەو وتارەی عبدالرحمن مزوری دەربارەی ئەنوەر مائی بــــە کوردیو عەرەبی لە « هاوکاری »و « العــراق »دا بڵاوی کردۆتەوە ( « العراق » ، ۲۱ ایلول ۱۹۸۱ ) .

به هەرجۆر چاپکردنی ئەو دەستنووسە کارێکی زۆر پێویستە ، هیچ نەبێ لەبەرئەوەی تائێستە تەنها دەنگی « مەصحەفا ڕەش »مان بیستووەو هێشتا ڕەنگیمان بەتەواوەتی نەدیوە .

عەلائەددین سەجادیو مەلا جەمیل بەندی ڕۆژبەیانی دوو ڕووناکبیری ناسراویترمانن کە پاشەنگی دەستەی دووەمو پێشەنگی دەستەی سێیەمی مێژوونووسانی کوردنو جێگەیان لە گشت ژیانی ڕووناکبیریماندا دیارە . کەس تائێستە وەك مامۆستا سەجادی بەگشتی لە مێژووی ئەدەبی کوردی نەکۆلیوەتەوە[٢٠١] . بەهۆی « گەلاوێژ »یشەوە دەوری لە مێژووی ڕۆژنامەنووسیی کوردیدا دیارە ، جگە لەوەی بەشێکی « مێژووی ئەدەبی کوردی »ی بۆ باسی « ڕۆژنامەی کوردی » تەرخان کردووە[٢٠٢] .

عەلائەددین سەجادی لە ڕۆژگاری « گەلاوێژ »ەوە جاروبار وتاری مێژوویی بڵاوکردۆتەوەو[٢٠٣] هەوڵی‌داوە جێگەی مێژوو بەگشتیو مێژووی کورد بەتایبەتی لەسەر لاپەڕەکانی ئەو گۆڤارە دیار بێ . گەشتەکەشی بە کوردستاندا[٢٠٤] پڕیەتی لە زانیاریی بەکەڵك بۆ هەرکەسێ بیەوێ لە ژیانی ئابووریو کۆمەڵایەتیو مێژووی نوێی کورد بکۆڵێتەوە .

دوای سەرکەوتنی شۆڕشی چواردەی گەلاوێژ مامۆستا سەجادی کتێبێکی مێژوویی سەربەخۆی بە ناوی « شۆڕشەکانی کورد وە کوردو

---

٢٠١ــ بڕوانە : علاءالدین سجادی ، مێژووی ئەدەبی کوردی ، چاپی یەکەم ، بغدا ، ١٩٥٢ (٦٣٤ل) ، چاپی دووەم ، بغدا ، ١٩٧١ (٧٠٦ل) .
٢٠٢ــ هەمان سەرچاوە ، چاپی دووەم ، ل ٦٠٩ ــ ٦٢٦ .
٢٠٣ــ بەوێنە بڕوانە : علاءالدین سجادی ، کوردی بەنلوبانگ . عەلی کەمال بەگ ، ــ « گەلاوێژ » ، ژمارە ٧ ، تەمموزی ١٩٤٣ ، ل ١ــ٩ .
٢٠٤ــ مەبەست ئەو کتێبەیەتی کە ساڵی ١٩٥٦ بەناوی « گەشتێك لە کوردستاندا » بڵاوی‌کردەوە ( ١٤٦ لاپەڕەیە ) .

کۆماری عیراق »ەوە بڵاوکردەوە[٢٠٥] کە وادیارە بەر لە شــــۆڕش پێوەی خەریك بووە ، یا هیچ نەبێ کەرەستەی باســــەکانی کۆکردۆتەوە • لەو بەرهەمەیدا سەجادی بەکورتی باسی مێژووی کۆن‌و ژمارەو شوێن‌و ژیــانی کۆمەڵایەتی‌و شۆڕشەکانی کورد دەکات‌و گــەلێك زانیــــاریی بەکەڵکی دەربارەی بەدرخانی‌یەکان‌و پاشا کوێرەی ڕەواندوزو سەردار ڕەشیدو شێخ مەحمودو سمکۆو مەهابادو مەلبــــەندو ســــەردارانی‌تری کوردەواری بڵاوکردۆتەوە •

بێ‌گومان « شۆڕشەکانی کورد » ســـەرچاوەیەکی بەکەڵکەو جێگەی شیاوی خۆی لە کتێبخانەی مێژوویی کوردیدا کردۆتەوە • بەڵام بەداخــەوە مامۆستا ســـەجادی جاروبار دەکــەوێتە هەڵەوە ، هەڵەی گــەورەش نــەك بچوك ••• بەوێنە لای ئەو «گەلێ جار مێژووی تاقەکەسێك لە قەومێکاو لە دەورێکا مێژووی هەموو قەومەکەیە لەودەورەدا،وەکو چۆن زۆر جار مێژووی هەموو قەومەکە ئەبێتە مێژووی نەفسیەتی تاقە تاقەی ئەو گەلە »[٢٠٦] • ئەم بۆچوونە ئیدیالیستە باوە قسەکانی گۆلباخی فەیلەسووفی ئەلەمانیمان دێنێتەوە یاد کە لە سەدەی هەژدەمیندا دەیگوت « هەر گەلەی موســــایەکی خۆی هەیە ! »،یا قسەکانی مامۆستا عەبدولڕەزاق حەسەنی کە دەڵێ : « شــێخ مەحمودی ناودار کێشەی کوردو کێشەی کورد شێخ مەحمود خۆیەتی ! »•

لەوەش سەیرتر : شەڕ هەر چۆن بێ لای مامۆستا سەجادی خراپ نی‌یە چونکە هیچ نەبێ ئاشتی‌و ئازادیی بەدواوەیە ! • هەروەها دەشڵێ « ڕووس نەوتی هەیەو لە قەوقازو باکۆدایە ، باکۆش کەوتۆتە خاکی خۆیەوە •• ڕەگ‌و دەماری ئەو نەوتەی کەوتۆتە وڵاتی ئازەربایجان‌و کوردەواری‌یەوە • ئەگەر

---

٢٠٥ــ علاءالدین سجادی ، شۆڕشەکانی کورد .وە کوردو کۆمــاری عراق ، بەغدا ، ٢٦٥٩ی کوردی ـ ١٩٥٩ی فەرەنگی ، ٣٦٤ لاپەڕەیە .

٢٠٦ــ هەمان سەرچاوە ، ل ٣ .

ڕۆژێك لەڕۆژان لە وڵاتی ئازەربایجان بیرێك لێ بدرێ مەعنای‌وایە نەوتەکەی باکۆی ئەو هەمووی وشك‌ئەکا ! ! »[٢٠٧] .

پێم‌وایە هەڵەو کەموکورتی‌یەکانی مامۆستا سەجادی گەر لەوەش زیاتر بن لایەنە چاکە زۆرەکانی بەرهەمەکانی بۆی دائەپۆشن !

سێرڤانتس نووسەری کەڵەی ئیسپانیاو جیهان ( ١٥٤٧ ـ ١٦١٦ ) کە بە تۆمەتێکی درۆ ئاخنرایـــە بەندیخـانەوە ڕۆمـــانی هەرەبەناوبانگی « دۆن‌کیشۆت »ی نووسی کە هەتا هەتایە گەوهەرێکی تریفەداری ڕشتەی مرواریی ئەدەبی جیهان دەبێ . ئێمەیش کە لە سەرەتای چلەکاندا مەلا جەمیلی ڕۆژبەیانی‌یان گرتین بێ‌ئەوەی بیانەوێ جەنگاوەرێکی چالاکیان بۆ خزمەتی مێژوو بۆ دروست‌کردین !

هەرچەندە ناوی جەمیل‌بەندی ڕۆژبەیانی لەسەر لاپەڕەکانی «گەلاوێژ» جاروبار دەکەوێتە بەرچاو[٢٠٨] ، بەڵام بەرهـــەمی خزمـــەتە گەورەکانی لە مەیدانی مێژوودا لە سەرەتای پەنجاکانەوە کەوتە ڕوو . « شـــەرەفنامە »ی شەرەفخانی بدلیسی‌و « تاریخی سلێمانی‌و وڵاتی »ی ئەمین زەکی لە هەر بەرهەمێکی‌تر زیاتر سەرنجی ڕۆژبەیانی‌یان ڕاکێشا . وەك خۆی دەڵێ لـــە ڕۆژی ١١ی مایسی ساڵی ١٩٤٣وە کاتێك لە بەندیخانەی عەمارە گیرابوو کەوتە وەرگێڕانی « شەرەفنامە » لە فارسی‌یەوە بۆسەر زوبانی عەرەبی .

مامۆستا ڕۆژبەیانی چاپە فارسی‌یەکەی قاهیرەی « شەرەفنامە »ی بە لێدوانەکانی ڤلیامینۆف زێرنۆف‌و محەمەد عەلی عـەونی‌و فەرەج‌الله زەکی کوردی‌یەوە وەرگێڕاوەتە سەر عەرەبی‌و بۆ خۆشی گەلێ پەراوێزی نوێی بۆ

---

٢٠٧ـ هەمان سەرچاوە ، ل ٣٠١ .

٢٠٨ـ بە وێنـــە بڕوانە : « گەلاوێژ » ، ژمـــارە ٦ ، حوزەیرانی ١٩٤٧ ، ل ٥٥ ـ ٦٠ ، ژمارە ٩ ـ ١٠ ، ئەیلول ـ تەشرینی یەکەمی ١٩٤٧ ، ل ٦٠ ـ ٦٢ .

ـکومو چەند هەڵەیەکی ڕاستکردۆتەوەو دەقی شیعرەکانی وەك خۆیـان ووسیونەوەو ئینجا فارسیو تورکی‌یەکانی کردوونەتە عەرەبی • کارێکی زۆر چەکیشی کردووە بەوەی گەڕاوەتەوە سەر دەقی عەرەبیی ئەو ســەرچاوە ڕەسەنە کۆنانەی کاتی خۆی شــــەرەفخان کەلکی لێ‌یان وەرگرتووە • « کۆڕی زانیاری عیراق » سالی ١٩٥٣ ئەو بەرهەمە بایەخدارەی لە ٤٨٠ لاپەڕەی گەورەدا بڵاوکردەوە[٢٠٩] •

بە هەمان دەستوورو لە دەوروبەری هەمان کاتدا دیوارەکانی بەندیخانەی « قرة السلمان »و عەممارە ڕۆژبەیانی‌یان خستۆتە سەر بیری وەرگێڕانی « تاریخی سولەیمانیو ولاتی » ئەمین زەکی بۆ ســـەر زوبانی عەرەبی • پاچوونەوەی مامۆستا ئەمین زەکی بۆ خۆی بە دەســنووسی وەرگێڕانی کتێبەکەیدا زیاتر بایەخی‌داوە بە کارەکەی ڕۆژبەیانی کە دیسان بە دەیـــان پەراوێزو لێکدانەوەی پێویستی خستۆتە سەر[٢١٠] •

شایانی باسە جەمیل بەندی ڕۆژبەیانی ماوەی بەندێتی لەگەڵ مێژوونووسی بەناوبانگ مامۆستا عەبدولڕەزاق حەسەنیدا بردۆتەسەر•هاوڕێیەتیو هاندانی حەسەنی زیاتر پالی بە ڕۆژبەیانی‌یەوە ناوە بۆ جێبەجێ‌کردنی ئەوکارانەی • دوایش زانای ئەدەبو زمانو مێژوو ، ئەندامی کۆڕی زانیاری عیراق مامۆستا محەمەد بەهجەت ئەسەری ئەوەندەی‌تر پێی لەسەر ئـــەو کارانـــەی پێ داگرتووە •

بەرلەوەی پەنجاکان کۆتایان بێ ڕۆژبەیانی بەرگی یەکەمی یادداشتەکانی

---

٢٠٩ـ بڕوانە : « الشرفنامه في تاريخ الدول والامارات الكردية ، الفه باللغـة الفارسية الامير شرفخان البدليسي ، نقله الى اللغـــة العربية وعلق عليه ملا جميل بندي روژبياني » ، بغداد ، ١٩٥٣ .

٢١ـ ئەو کتێبە بە ناوی « تاريخ السليمانية وانحائها » سالی ١٩٥١ لە بەغدا چاپکراوە ، ٢١٦ لاپەڕەیە .

ڕەفیق حلمی‌ی خستە بازاڕەوە[٢١١] ، بەڵام بەداخەوە ئەو پەیمانەی دابووی کە هەموو بەرگەکانی « یادداشت » بکاتە عەرەبی[٢١٢] تائیستە بۆی جێبەجێ نەکراوە • بەپێچەوانەی « شەرەفنامە »و مێژووی سلێمانی‌یەوە ڕۆژبەیانی زۆر کەم لە باسەکانی « یادداشت » دواوە ، هەرچەندە گەلێکیان لێکدانەوەو نرخاندن هەڵدەگرن • شێوازی عەرەبی‌یەکەی ئەو سێ کتێبەو لە سەروو هەموویانەوە « شەرەفنامە »کەی شەرەفخان کەم هاوتایە •

لەم ساڵانەی دواییدا جەمیل بەندی ڕۆژبەیانی لە گۆڤارەکانی کۆڕی زانیاریدا زنجیرەیەك وتاری بەنرخی دەربارەی مێژووی کوردو کوردستان لە سەدە ناوەنجی‌یەکاندا بڵاوکردەوە[٢١٣] • ئەم بەرهەمە نوێیانەی ڕۆژبەیانی شان‌لەشانی کارەکانی چل‌و پەنجاکانی دەدەن ، تایبەت لەبەرئەوەی تائیستە بەدەگمەن خامەی مێژوونووسانیان پێ ڕاگەیشتووە ، جگە لەوەی سەرچاوەی سەرەکی‌یان بریتی‌یە لە بەرهەمە ڕۆژهەڵاتی‌یە ڕەسەنە کۆنەکان • بەڵام بەداخەوە نووسینەکانی مامۆستا جەمیل ڕۆژبەیانی تائیستە بریتین تەنها لە گێڕانەوەو هێشتا شەقڵی لێکدانەوەیان بەخۆیانەوە نەبینیوە ، هەرچەندە تۆوی ڕەگ‌و ڕیشەی زۆر لایەنی تاریکی ئیمڕۆی کوردەواری لەو ڕۆژگارەدا وەشێنراوە کە ڕۆژبەیانی باسی ڕوداوەکانیان دەکات •

وەك لە بەشەکانی‌تری ئەم کتێبەدا هەستمان‌پێ‌کرد ڕووناکبیرانی

---

٢١١ـ رفیق حلمي ، مذکرات ، ترجمة جمیل بندی الروژبیاني ، بغداد ، ١٩٥٧ ، ١٠٧ ص •

٢١٢ـ هەمان سەرچاوە ، ل ١ •

٢١٣ـ وەك : « بندنیجین ( مندلی ) في التأریخ قدیما وحدیثا » ، ـ « گۆڤاری کۆڕی زانیاری عیراق ـ دەستەی کورد » ، بەغدا ، بەرگی حەوتەم ، ١٩٨٠ ، ل ٣٥٠ ـ ٤٣٩ ( دەوروبەری کۆتایی پەنجاکان ئەو وتارەی نووسیوە ) ، « فەرمانڕەوایی شوانکارەی کورد لە هەرێمی فارس‌و ئەسفەهان» ، هەمان گۆڤار ، بەرگی هەشتەم، ١٩٨١ ، ل ١٥٩ـ١٦٨ • لە شوێنی خۆیدا دێینەوە سەر باسی وتارەکانی‌تری •

بەرچەکانی‌تری کوردستان دەوریان لە مێژوونووسیی کوردیدا کەم نەبوو ٠
ە بەشی « ڕۆژنامەنووسیی کوردیو مێژوو »دا چەند جارێك ناوی عوسمان
صەبریو هەرەکوڵ ئازیزان هاتووە ، لێرەشدا بەنیازی زیاتر ڕوونکردنەوەی
نەوری ڕووناکبیرانی کوردی دەرەوەی عیراق لـە مەیدانی مێژوونووسیدا
بەکورتی باسی خزمەتەکانی جەلادەت بەدرخانو محەمەد عەلی عەونیو عەلی
سیدۆ گۆرانی دەکەین ٠

وەك دیمان بەدرخانی‌یەکان بـــە ئەوپەڕی دڵســۆزی‌یەوە خزمەتی
مێژوونووسیی کوردی‌یان کرد ٠ لەناو نەوەی بەپیتو بەرەکەتی[٢١٤] ئـەو
بنەماڵەیەدا جەلادەت بەدرخان لە هەموان زیاتر بایەخی‌دا بە مێژوو ٠ هەر بۆ
خۆشی یەکێکە لەوانەی دەوری گەورەی لە دروســـتکردنی مێژووی
ڕۆژنامەنووسیی کوردیدا بینیوەو بەوجۆرە لە دەمێکەوە جێگەی شـیاوو
دیاری لە ژیانی ڕووناکبیریماندا گرتۆتەوە ٠

جەلادەت کوڕی ئەمین عالی کوڕی بەدرخانی کوڕی عەبدولخان[٢١٥]
ڕۆژی ٢٦ی نیسانی سالی ١٨٩٧ لە شاری ئەستەموڵ لەدایكبووە ٠ ژیـانی
ناو کۆشكو تەلارو دەستداریی باوو باپیرانی هەلی خوێنـــدنو فێربوونی
چاکیان بۆی ڕێکخست ٠ هەر لە پایتەختی ئەوسای ئیمپراتۆریی عوســمانی
خوێندنی سەرەتاییو ناوەندیو فێرگەی بەرزی یاسای تەواوکرد ٠

---

٢١٤ـ وەك دەگێڕنەوە بەدرخان پاشای گەورەی باپیری جــەلادەت ٤٠ ژنی هێناوە کە ٩٥ کوڕو کچی لێ‌یان بووە .

٢١٥ـ سەرچاوەی زانیاری‌یەکانی ژینلەمەی جــەلادەت بەدرخان چەنــد دیدەنی‌یەکن لەگەڵ ڕەوشەن بەدرخانی هاوسەری لە شــام ( شوباتی سالی ١٩٧٢ ) جگە لە ژمارەکانی « هەوار »و « ڕووناهی »و بەرهەمەکانی خۆیو ئەم دوو نامیلکەیە : منصور شليطا و يوسف ملك ، ذكرى الامير جلادت بدرخان ( ١٨٩٧ ـ ١٩٥١ ) ، بيروت ، بلا ، « ذكرى الامير جلادت بدرخان الثانية ١٨٩٧ ـ ١٩٥١ » ، بيروت ، بلا .

وەك زوربەی بەدرخانیـیەکان گەرمەکان جەلادەت لە هەرەتی لاویدا تووشی ژیانی ئاوارەیی‌و دەربەدەریی ولاتان بوو ، تەنها لە ئەڵەمانیــا ماوەی هەشت سالی رەبەقی بردەسەر . جەلادەت ئەو سالانەی بەفیرۆ نەدا ، فێری ئەڵەمانی بوو ، خوێندنی باساشی تەواو کردو بووە خوێندەوارێکی لێهاتوو. لە ٢٥ی ئابی سالی ١٩٣٠یشەوە تا کۆچی دوایی لە دیمەشق نیشتەجێ بوو .

جەلادەت بەدرخان هەموو ئەو ٢١ ســـالەی لە دیمەشــق بردیە سەر[٢١٦] بۆ خزمەتی وشەی کوردیی تەرخان‌کرد . ناوەرۆکی « هاوار »و « رۆناهی »و نووسینەکانی‌تری بەڵگەن کە ئەو پیاوە بەرهەمی شــارەزایی‌و خوێندنی لە ئەستەموول‌و ئەوروپاو زانینی عــەرەبی‌و تورکی‌و فارســی‌و ئەڵەمانی‌و فەرەنسی‌و کەمێك یۆنانی‌و ئینگلیزی‌و رووسیی بەفیرۆ نەداوە . بەپێی قسەی یۆسف مەلەك ژمارەی ئەو وتارانەی جــەلادەت بەدرخــان بلاوی‌کردوونەوە دەگاتە هەزار دانە کە بەشی زۆریانی بێ‌ناو یا لەژێر نازناوی جیاوازی‌و وەك هەرەکول ئازیزاندا بلاوکردووەتەوە . هەروەها جەلادەت بەدرخان دەستی لە دانانانی پەخشەو بەلکە گرنگەکانی « خۆیبون »دا بــالا بوو ، ئەو پەخشەو بەلگانەی ئیمرۆ لە ریزی پێشەوەی ســەرچاوە هــەرە

---

٢١٦- رۆژی ١٥ی تەمموزی سالی ١٩٥١ لە دیمەشق وەفاتی کــرد . زۆر بەرێزەوە بە خاکی مزگەوتی مەولانا خالیدی نەقشبەندی لە گەرەکی کوردان سپێردرا . لە ناشتن‌و چلەو یادی یەکەم‌و دووەم سالەی کۆچی دوایی جەلادەت بەدرخاندا ژمارەیەکی زۆر لە رووناکبیرو ئەدیبو وەزیــرو کاربەدەستی گەورەو لاوانی کوردی سووریە بەشداربوون . « بردی»و « الایام »و « الکفاح »و «دمشق المساء »و « الاخبار »و « القبس »و گەلێك رۆژنامــەو گۆڤاری‌تــر هــەواڵی مــردنی لەناکــاوو کورتــەی ژینامەیان بلاوکردەوە . لــە عێراقەوە حەپــە خــانی نەقیب‌و ئیســماعیل شاوەیس‌و عەلی‌کەمال‌و مەعروف جیاووك بە ناوی هەموانەوە نامــەو وتاری ســەرخۆشی‌یان ناردووە . کێلی ژوور ســەری گۆری جەلادەت بەدرخــان بــە چــەند بەیتێکی بەســـۆزی قــەدری‌جانی شــاعیر رازێنراوەتەوە .

ڕەسەنەکانی لێکدانەوەی گەلێك لاپەڕەی بایەخـــداری مێژووی نوێی کورددان ٠

« القضية الكردية » یەکێکە لە بەرهەمە بەهادارەکانی جەلادەت بەدرخان کە سالی ١٩٣٠ بە فەرەنسی‌و عەرەبی بە ناوی دوکتۆر بلەچ شـــێرکۆوە بلاوی کردۆتەوە(٢١٧) ٠ لەوکتێبەدا کە عەرەبی‌یەکەی ١١٢و فەرەنسی‌یەکەی ٥٦ لاپەڕەیە ، جەلادەت بەدرخان بە جۆرێکی ڕێك‌وپێك پوختەی مێژووی کۆنی کوردو بلاوبوونەوەی ئایینی ئیسلام لە کوردستانداو دەوری گـەلی کورد لە ژیانی ژیاری ئیســـلامداو زمـــان‌و ئەدەبی کوردو خـەبات‌و ڕاپەڕینەکانیانی تۆمار کردووە ٠ ئـەو کتێبـە کـە بۆ خۆی یەکێکە لـە بلاوکراوەکانی کۆمەلەی « خۆیبون » هەمان‌کات سەرچاوەیەکی ڕەسەن‌و نایابە دەربارەی ئەو ڕێکخراوە کە جێگەی لە خەباتی نەتەوەیی گەلی کوردو چالاکی‌یەکانی ڕووناکبیرانی کوردستاندا دیارە ٠

ژمارەیەکی زۆر لە ڕووناکبیرانی کورد لە دەوری جەلادەت بەدرخان‌و گۆڤارەکانی کۆبوبونەوە ٠ هەر بەودەستوورەش جەلادەت بەدرخان لـــە نزیکەوە پێوەندی لەگەل زانایانی کوردا هەبوو کە یەکێکیان خوالێخۆشبوو محەمەد عەلی عەونی بوو ٠ میری بەدرخان‌و مامۆستا محـەمەد عەلی عەونی بوبونە برای گیانی بەگیانی‌و تەنانەت دەتوانرێ چاپی عەرەبیی « القضيـــة الكردية » بە بەرهەمی هاریکاریی هەردووکیان دابنرێ‌و هەر ئەویش بۆ خۆی لە قاهیرە سەرپەرشتیی چاپ‌کردنی دەقی فەرەنسی‌یەکەی ئەو کتێبەی کرد٠

---

٢١٧ـ الدكتور بلەچ شيركوه ، القضية الكردية . ماضى الكرد وحاضرهم ، القاهرة ، ١٩٣٠ .
Docteur Bletch Chirguh, La Question Kurde. Ses origines et ses causes, Le Caire, 1930.

محەمەد عەلی عەونی[218]. ساڵی ١٨٩٧ لە سوێرەکی سەر بە دیاربەکر لەدایك‌بووە • دوای تەواوکردنی خوێندنی سەرەتایی هاتۆتە قاهیرەو لــە ئەزهەر خوێندوویە • پاش ماوەیەك محەمەد عەلی عەونی لە دیوانی فاروقی پاشای میسر کرایە وەرگێڕی زمانە ڕۆژهەلاتی‌یەکان کە ژمارەیەکیانی وەك زمانی زگماکی خۆی دەزانی ، تایبەت عەرەبی‌و تورکی‌و فارسی • جگە لەوە مامۆستا عەونی فەرەنسیشی دەزانی‌و بەئاسانی کەلکی لەو ســەرچاوانە وەردەگرت کە ڕۆژهەلاتناسانی فەرەنسە دایانناون • وەك وتمان هــەر بۆ خۆشی سەرپەرشتیی چاپکردنی دەقی فەرەنسی‌یەکەی «القضیة الکردیة»کەی بلەچ شێرکۆی کرد •

خوالێخۆشبوو محەمەد عەلی عەونی تا کۆچی دوایی لە ١١ی تەمموزی ساڵی ١٩٥٢دا[219] ژیانی لەناو کتێب‌وکتێبخانەو لەگەڵ زاناو نووســەراندا بردەسەر • جگە لە بەدرخانی‌یەکان لە نزیکەوە پێوەندیشی لەگەڵ ژمارەیەك لە ناودارانی‌تری کوردا هەبوو کە مامۆستا ئەمین زەکی یەکێکیان بوو •

مێژوو لە هەموو زانستێك زیاتر سەرنجی محەمەد عەلی عەونیی ڕاکێشاو هەر زوو کردی‌یە دەروێشی دەسنووسە کۆنەکان‌و بەرهەمی مێژوونووســە گەورەکانی خۆرهەلات • هێشتا لە ئەزهەر دەیخوێند کە بوو بــە عەودالی مێژووی کورد • لە کۆتایی بیستەکانیشەوە کــە ویستی پێشەکی‌یەك بــۆ

---

٢١٨ـ سەرچاوەی زانیاری‌یەکانی ژینامەی محــەمەد عەلی عەونی چەنــد دیدمنی‌یەکە لەگــەڵ خوالێخۆشبوو نەجمەددینی بــرا بچوکی‌و نووسینەکانی خۆی‌و ئەو پێشەکی‌یەی چاپی کوردیی « شەرەفنامە »ی شەرەفخانی بدلیسی کە مامۆستا هەژار نووسیویە .

٢١٩ـ لە قاهــیرە نێژراوە . دوری‌یەی کچی یەکێکە لە ڕۆژنامەنووســە ناودارەکانی میسر کە زۆر جار گۆڤــاری « المصور » وتــارەکانی بلاودەکاتەوە . عیصامی کوڕیشی ئەندازیارێکی بەناوبانگە، لە سەرەتای حەفتاکاندا کارگێری بەشێکی گرنگ بوو لە کارگەی حەلوان .

« شەرەفنامە » فارسی‌یەکەی شەرەفخانی بدلیسی بنووسێ بۆ یەکەمجار خامەی ڕەنگینی لە مەیدانی مێژوونووسیدا خستەکار . وەك خۆی دەڵێ ئموساکە هەستی‌کرد چ‌کەلێنێکی گەورە لە کتێبخانەی مێژوویی عەرەبی‌و تورکی‌و فارسیدا هەیە ، ئەوەی وای‌لێ‌کرد هێندەی‌تر لەسەر لێکۆلینەوەی مێژووی کورد سوور بێ‌و ، بەونیازەی « ئەرکێکی زانستیی سەرشانی بەرامبەر برا موسڵمانەکانی » ڕاگەیەنێ کەوتە کۆکردنەوەی هەر شتێك « پێوەندی بە نەتەوەی کوردەوە هەبێ » تاوەکو لە دووتوێی کتێبێکی سەربەخۆدا بە ناوی « کتێبخانەی کوردی »یەوە بلاویان‌بکاتەوە .

لە گەرمەی کاردا بوو کاتێك محەمەد عەلی عەونی دانەیەك لە کتێبی « خلاصەیەکی تاریخی کوردو کوردستان »ی ئەمین زەکی پێ‌گەیشت . وەك دەگێڕنەوە هیچ دیاری‌و مژدەیەك لە ژیاندا هێند دلی خۆش نەکردووەو قولایی دەروونی نەهەژاندووە . بۆ خۆشی لەوبارەیەوە نووسیویە دەڵێ هەر کە ئەو بەرهەمە هێژایەم وەرگرت دەستم لە هەموو شت هەلگرت‌و بە گشت تواناوە کەوتمە فێربوونی سۆرانی بۆئەوەی ڕۆژێك زووتر بتوانم وەری‌بگێڕمە سەر زمانی عەرەبی . واشبوو . بە نزیکەی سێ ساڵ توانی « خولاصە »بکاتەعەرەبی‌و لە باسەکانی بدوێ‌و پێشەکی‌و پاشەکی‌یەکی بەنرخی بۆ بنووسێ[٢٢٠] کە بەڕاستی کەلێنێکی باشی لە کتێبخانەی مێژوویی ڕۆژهەلاتی‌و عەرەبیدا پڕکردەوە . پاش ماوەیەك بە هەمان دەستوور مامۆستا عەونی بەرگی دووەمی « مشاهیر الاکراد »ەکەی ئەمین زەکیی کردە عەرەبی‌و چاپی‌کرد .

---

٢٢٠- سالی ١٩٣٦ لەو کارەی بۆوەو سالی ١٩٣٩ لە قاهیرە بە ناوی « خلاصة تاریخ الکرد وکردستان من اقدم العصور التاریخیة حتی الآن »ەوە لە ٤٤٥ لاپەڕەدا ( ٤٧٢ + أ - ح + ٦٤ ) بلاوی‌کردەوە .

محەمەد عـەلی عەونی چەند ساڵێکیشی لەگەڵ « شـــەرەفنامە »ی شەرەفخانی بدلیسیدا بردەسەر . سەرەتا ساڵی ١٩٣١ دەقی فارسیەکەی بەرگی یەکەمی « شەرەفنامە »ی بە پێشەکیو لێـدوانو ڕوونکردنەوەی زۆرەوە بڵاوکردەوەو[٢٢١] بەوجۆرە بووە یەکەم کوردو یەکەم ڕۆژهەڵاتیو دووەم زانای جیهان دوای ڤلیامینۆڤ زێرنۆڤ[٢٢٢] کە ئەو بەرهەمە دێرینەی خستە کۆڕی زانستەوە . محەمەد عەلی عەونی بۆ ئەو چاپەی « شەرەفنامە » پشتی بە دەسنووسێکی سورەیا بەدرخانو دەسنووسێکی حەلەبو چاپەکەی زێرنۆڤ بەستووەو هەروەها ئەو پێشەکیەشی لەگەڵ چاپکردووە کە کاتی خۆی زێرنۆڤ لەگەڵ بەرگی یەکەمدا بڵاوی کردبۆوە .

دوابەرهەمی گەورەی محەمەد عەلی عەونی وەرگێڕانی بەرگی یەکەمی « شەرفنامە »ی شەرەفخانی بدلیسی بوو لە فارسیەوە بۆ سـەر زمـانی عەرەبی لەگەڵ لێدوانو ڕوونکردنەوەی زۆردا کە پەراوێزی کتێبەکەی پێ دەوڵەمەند کردووە . بەداخەوە مامۆستا عەونی بۆخۆی بە چاپی ئەو بەرهەمەی شاد نەبوو ، شێخی خانەی کوردان لە ئەزهەر مامۆستا عومەر وەجدی کـە یەکێك بوو لە هاوەڵە کوردە نزیکەکانی ئەو کارەی گرتە ئەستۆو ساڵی ١٩٥٨ لەسەر ئەرکی وەزارەتی پەروەردەی میسری بەپێشەکیەکی گەورەی یەحیا خەشابەوە لە ٥٤٠ لاپەڕەدا بڵاوی کردەوەو کردیە دیاریەکیتری محەمەد عەلی عەونی بۆ کتێبخانەی مێژوویی کوردی بەتایبەتیو عەرەبیو ڕۆژهەڵاتی

---

٢٢١ـ ئەویشی هەر لە قاهیرە چاپکرد .

٢٢٢ـ وەك لە شوێنی خۆیدا باسمانکرد ڕۆژهەڵاتناسی ڕووس ڤلیامینۆڤ زێرنۆڤ یەکەم کەس بوو ساڵی ١٨٦٠و ١٨٦٢ بەرگی یەکەمو دووەمی «شەرەفنامە»ی بە فارسی لە پێتەربۆرگ بە دوو پێشەکی فەرەنسیەوە بڵاوکردەوە .

بەگشتی • وایێدەچێ مامۆستا عەونی زۆر کاری مێژوویی‌تری بەدەستەوە بووبێ ، بەڵام بەداخەوە مەرگ بوواری نەداوە تەواویان بکات[٢٢٣] •

عەلی سیدۆ گۆرانی کوردی[٢٢٤] کە بە عەلی سیدۆ گۆرانی ناوی دەرکردووە یەکێکە لەو مێژوونووسانەی کورد کە دەگمەن ڕووناکبیران ناویان بیستووە • ساڵی ١٩٠٨ لە شاری عەممانی پایتەختی ئوردون لەدایك‌بووە • باپیری کە لە هۆزی دودکانی نیشتەجێی دەشتی گۆرانی نێوان دیاربەکرو ئەرغەنی‌یە ساڵی ١٨٨٠ لەگەڵ لەشکری عوسمانیدا هاتۆتە شاری سەلط کە ئەوساکە بۆ یەکەم‌جار دەزگای میریی تێدا دامەزرێنراوەو ڕێکەوت وابووە چ قایمقام‌و چ بەڕێوەبەرانی پۆلیس‌و دەرەکی تازەدانراوی ئەو شارە کورد بوون • لەوساوە بنەماڵەی عەلی سیدۆ لە ئوردون نیشتەجێ بوو •

عەلی سیدۆ خوێندنی سەرەتایی ( ١٩١٦ — ١٩٢٠ )و خوێندنی ناوەندیی ( ١٩٢٠ — ١٩٢٤ ) لە عەممان تەواوکردووە • پلەی یەکەمیانی بە تورکی‌و پلەی دووەمیانی بە ئینگلیزی خوێندووە • دوابەدوای ئەوە چۆتە بەشی سیاسەت‌و ئابووریی زانکۆی ئەمەریکی لە بێروت‌و ساڵی ١٩٢٨ بڕوانامەی بەکەلۆریۆسی لێ وەرگرتووەو[٢٢٥] بەو جۆرە بۆتە یەکەم دەرچووی زانکۆ لە سەرتاپای وڵاتی ئوردوندا •

---

٢٢٣— شوباتی ساڵی ١٩٧٢ کە چوومە قاهیرە عیصامی کوڕیم دیو لە پاشماوەی کتێبخانەکەی باوکیدا چەند لاپەڕە کۆنێکی دەستخەتی خۆیمان دۆزی‌یەوە کە ئێستە وان لای من ، ئەو لاپەڕە کەمانەش پایەی زانینی مامۆستا عەونی دەردەخەن‌و ئەوەش دەسەلێنن کە کاری مێژوویی‌تری بەدەستەوە بووە •

٢٢٤— سەرچاوەی زانیاری‌یەکانی ژینامەی مامۆستا عەلی سیدۆ گۆرانی جگە لە بەرهەمەچاپکراوو دەستنووسەکانی دوو نامەی تایبەتیشن کە بۆ خۆمی ناردوون ، یەکەمیان ڕۆژی ٢٩—٦—١٩٧٣ و دووەمیان ڕۆژی ٢٩—٩—١٩٧٣ •

٢٢٥— وەك خۆی دەڵێ مامۆستا عەلی حەیدەر سلێمان یەکێك بووە لە هاوڕێ کوردەکانی زانکۆی •

عەلی سیدۆ دوای گەڕانەوەی لە لوبنـان یەکسەر کرایە مامۆسـتای زمانی ئینگلیزی لە قوتابخانەی ناوەندیی میری لە عەممان . پاش پێنج ساڵ یەك لەدوای یەك بووە کارگێڕی قوتابخانەی ناوەندیی شـارانی کەرەکو عەممانو سەلطو ئەربد . ئینجا بۆ چەند ساڵێك کرایە سکرتێری وەزارەتی کاروباری ناوخۆو سکرتێری ئەنجومەنی پاسادابنان . لە ساڵی ۱۹٤۹وە عەلی سیدۆ بووە کاربەدەست لە وەزارەتی هەندەرانی ئوردون کە بەرلەوە بـە ساڵێك دەستی کردبووە دامەزراندنی باڵیۆزخانەی سـەربەخۆ لە وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا . پازدە ساڵی لەمکارەدا بردەسەرو لە باڵیۆزخانەکانی ئوردون لە عەرەبی سەعودیی‌و یەمەن‌و سوریەو تورکیە کاری‌کردووەو بەر لە خانەنشین‌کردنی بۆتە وەزیر مفوض . لە ماوەی مووچەخۆریدا عـــەلی سیدۆ چەند جارێك نیشانی بەرزی ئوردون‌و وڵاتانی‌تری پێ بەخشراوە .

ڕۆژی یازدەی تەمموزی ساڵی ۱۹۳۱ عەلی سیدۆ گۆرانی لە عەممانەوە دەستی‌کردە گەشتێك کە ڕۆژی یازدەی ئابی هەمان‌سـاڵ لە عەمادیە تەواوی‌کرد . بەر لە هاتنی بە ماوەیەك پێوەندی لەگـەڵ ڕووناکبیرانی کوردی عیراقدا بەسـتووەو کـە گەیشتووە کوردی بەغدا بەگـەرمی پێشوازی‌یان کردووەو خوالێخۆشبوو ڕەفیق حلمی لەگەڵی چۆتە هەولێرو عەمادیەو چەند ناوچەیەکی‌تری کوردستان .

مامۆستا عەلی سیدۆ گۆرانی ڕۆژی ۱۹ی تەمموز بە شەمەندەفەر لـە بەغداوە چۆتە کەرکوك . وەك خۆی دەڵێ ئەو شەوە تا بەیان خەو لە چاوی نەکەوتووە ، ویستویە بەو تاریکی‌یە چەند دەتوانێ هێند شت ببینێ . ڕۆژی ۲۲ی تەمموز لە کەرکووکەوە چۆتە سلێمانی‌و چوار ڕۆژی لێ بووەو کونو قوژبنی گەڕاوەو چۆتە لای گەورەپیاوانی شارو گەلێك لەگەڵ ئەحمەدبەگی تۆفیق‌بەگی متصرف دواوەو ئینجا چۆتە هەولێری دێرین‌و بە هەمان‌دەستوور چەند ڕۆژێکیشی لەوێ بردۆتەسەرو زۆر کـەسی بینیوەو بەناو قەڵاو

مزگەوتەکانی شاردا گەڕاوەو گەلێك یادداشتی دەربارەی دیمەنی‌یەکانی لای خۆی تۆمارکردووە • دوای هەولێر عەلی سیدۆ چۆتە شەقلاوەو ڕەواندزو کۆیەو ڕۆژی سێی ئاب لەگەڵ ڕەفیق حلمیدا چۆتە مووسڵو لەوێ ماجیــد مستەفاشی بینیوە کە ئەوساکە قایەمقامی عەمادی‌یە بووە • لــە مووسڵەوە هەرسێکیان ڕۆژی چواری ئاب دەچنە عەمادی‌یەو سەرسەنگو سۆلاف • ڕۆژی یازدەی ئاب عەلی سیدۆ گەڕاوەتەوە مووسڵو بۆ ڕۆژی داهاتوو بەرەو عەممان لە ڕێگەی دیمەشقەوە کەوتۆتەوەڕێ •

دوای گەڕانەوەی عەلی سیدۆ بۆ ماوەی چەند ســـالێك بێ‌وچان دەکەوێتە سۆراخی سەرچاوە کۆنو ڕەسەنەکانو گەلێك باسو خواسو بەسەرهاتی باووباپیران کۆدەکاتەوەو تەتەڵەیان دەکاتو لەگــەڵ پوختەی یادداشتەکانی گەشتەکەیدا تێکهەڵکێشیان دەکـــاتو دەیانکاتە کتێبێکی عەرەبیی نازدارو سالی ١٩٣٩ لە قاهیرە بەم‌ناوەوە بلاوی دەکاتەوە : « لــە عەممانەوە تاوەکو عەمادی‌یە یا گەشتێك بە کوردستانی باشووردا »[٢٢٦] •

عەلی سیدۆ گۆرانی بۆ خۆی باسی مەبەســـتی گەشتەکەی‌و دانانی کتێبەکەی بەم‌جۆرە دەکات :

« گەلێك هۆ پالیــان پێوەنام ئەم گەشــتە بکەم‌و بینووسمەوە : دلنیا بوون لەو ڕاستی‌یانەی لەناو کتێبانی ئینگلیزو ئەمەریکایی‌یە ڕۆژئاوایی‌یەکاندا دەربارەی کوردو وڵاتیــان خوێندبوومنەوەو پڕکردنەوەی کەلێنێك لە مێژووی ئیسلام و جوگرافیای ڕۆژهەلاتی

---

٢٢٦– علي ســيدو الكوراني ، من عمان الى العمــادية أو جولة في كردســتان الجنوبية، القاهرة، ١٩٣٩ . ئەو کاتەی کتێبەکەی بلاوکردەوە سکرتێری ئەنجومەنی یاسادانانی ئوردونی بوو •

نزیك‌و كێشانی وێنه‌یه‌كی دروستی كوردان بۆ ئه‌و هاوسێیانه‌یان كه تاوه‌كو ئێسته‌ش بێ‌ئاگان له زۆر شتیان ...»[227] .

له ٢٧٢ لاپه‌ڕه‌و ١٨ به‌شداو به پشتیوانی ٣٩ سه‌رچاوه‌ی عه‌ره‌بی‌و كوردی‌و توركی‌و ئینگلیزی‌و یادداشته تایبه‌تی‌یه‌كانی خۆی عه‌لی سیدۆ گۆرانی له كتێبی «له عه‌ممانه‌وه تاوه‌كو عه‌مادی‌یه یا گه‌شتێك به كوردستانی باشووردا» ئه‌م باسانه‌ی به شێوازێكی ڕێكوپێك‌و زمانێكی پاراو بۆ تۆماركردووین: مێژووی كۆن‌و نوێی عه‌ممان‌و دیمه‌شق‌و به‌غداو[228] شوێنه‌وارانی كوردستان‌و هۆزی ناوداری وه‌ك مزووری‌و دۆسكی‌و به‌رواری‌و جاف‌و هه‌مه‌وه‌ند‌و پشده‌رو حه‌ویزی‌و مامه‌ند‌و سۆران‌و بادینان‌و گه‌لێك دیارده‌و به‌سه‌رهات‌و ڕوداوی مێژوویی گرنگی وه‌ك ڕۆژگاری كۆنی كورد له سه‌رده‌می كاشی‌و لۆلۆو میدی‌یاو بلاوبوونه‌وه‌ی ئاینی ئیسلام له كوردستاناو ناكۆكی عوسمانی‌و سه‌فه‌وی‌و مێژووی میرنشینانی بابان‌و سۆران‌و بادینان‌و ژینامه‌ی كه‌ریم‌خانی زه‌ند‌و خانزادو میری ڕه‌واندوزو باسی داب‌و نه‌ریت‌و ئه‌ده‌ب‌و فۆلكلۆرو ئافره‌تی كوردو كۆمه‌ڵه‌و ڕێكخراوه نیشتمانی‌یه‌كان‌و ڕۆژنامه‌نووسیی كوردی‌و گه‌لێك باسی‌تر .

وێڕای هه‌موو ئه‌وانه «له عه‌ممانه‌وه تاوه‌كو عه‌مادی‌یه یا گه‌شتێك به‌ناو كوردستانی باشووردا» پڕیه له زانیاری‌و ژماره‌ی زۆر ده‌رباره‌ی ژیانی ڕووناكبیری‌و ئابووری‌و كۆمه‌لآیه‌تی كوردی عیراق به‌وجۆره‌ی كه خاوه‌نی بۆخۆی دیونی یا بیستوونی‌و به‌وجۆره كتێبه‌كه بۆته سه‌رچاوه‌یه‌كی ڕه‌سه‌نی بایه‌خدار بۆ هه‌ركه‌سێ بیه‌وێ له مێژووی نوێی كورد بكۆڵێته‌وه . جگه له‌وه عه‌لی سیدۆ ئه‌و به‌شه‌ی كتێبی «له خه‌لیجه‌وه بۆ ئارارات»ی هه‌ڵبژاردی

---

٢٢٧ـ هه‌مان سه‌رچاوه، ل٢ .

٢٢٨ـ ته‌نها به‌شی یه‌كه‌م‌و دووه‌می كتێبه‌كه‌ی بۆ ئه‌و باسانه ته‌رخان كردووه، شازده به‌شه‌كه‌ی تری ده‌رباره‌ی كوردن .

ئەندامی لیژنەی سنووری کردۆتە عەرەبی کە بۆ باسی ناوچە کوردەواری‌یەکانی ئێران تەرخانکراوەو وەك پاشکۆ لەگەڵ کتێبەکەیدا بڵاوی کردۆتەوە[٢٢٩] .

جگە لەو کتێبە مامۆستا عەلی سیدۆ داناو وەرگێڕانی زۆرە کە زوربەیان هێشتا دەسنووسن‌و بڵاونەکراوەن . شایانی باسە لەم ساڵانەی دوایيدا هیچ کتێبێکی گرنگ دەربارەی کورد دەرنەچووە ئەو نەی کردبێتە عەرەبی . لەوانە « گەشتێك بەناو ئازایاندا »ی ڕۆژنامەنووسی ئەمەریکایی دانا ئادەم شمیت‌و[٢٣٠] « کورد »ی حەسەن عەرەفەو[٢٣١] «کۆماری کوردی ساڵی ١٩٤٦ »ی ئیگلتن‌و[٢٣٢] « «کورد»ی تۆما بواو[٢٣٣] «کێشەکانی ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی تورکیا »[٢٣٤] .

ساڵی ١٩٣٥ ، واتە لە تەمەنی ٢٧ ساڵیدا عەلی سیدۆ دەستی کردە فێربوونی زمانی زگماکی خۆی‌و بۆئەوە پەنای بردە بەر داپیرەی نەنکی کە ، وەك خۆی دەڵێ ، بە « کوردی‌یەکی پاراوی دیاربەکری» گفتوگۆی دەکرد . هەروەها کەڵکی لە سێ پیرەمێردی کوردی‌تر وەرگرت کە کاتی خۆی لە هەکاری‌و بۆتانەوە هاتوونە ئوردون . دوای ئەوەی باش فێری کوردی بوو عەلی سیدۆ کەوتە خوێندنەوەی « هاوار »و « ڕوناهی » بەدرخانی‌یەکان‌و

---

٢٢٩ــ بڕوانە لاپەڕە ١٨٧ تاوەکو لاپەڕە ٢٠٩ی کتێبەکەی . ئەمەش ناوی کتێبەکەی هەبارد خۆیەتی :
G. E. Habbard, From the Gulf to Ararat, London, 1916.

٢٣٠ــ D. A. Schmidt, Journey among Brave Men, Boston, 1964

٢٣١ــ Hasan Arfa, The Kurds. A historical and political study, London, 1966.

٢٣٢ــ W. Eagleton, The Kurdish Republic of 1946, London, 1963.

٢٣٣ــ Th. Bois, Les Kurdes.

٢٣٤ــ لە تورکی‌یەوە کردوویە بە عەرەبی ، دەربارەی کوردستانی تورکیایە .

چوار ئینجیلی کوردی که به ڕێکەوت دەستیکەوتوون • ئینجــــا کەوتــە سۆراخی بەرهەمی زانایانی وەك سۆن دەربارەی زمانی کوردی تــا وای لێهات بەئاسانی بتوانێ له بەردەم ئەندامانی یانەی صــەلاحەددینی ئەیوبیی کوردانی ئوردونــدا وتــار دەربــارەی « زمـــــانو ئــەدەبی کوردی » بخوێنێتەوە[٢٣٥] • هەمانکات کەوتە دانانی فەرهەنگێکی عەرەبی ــ کوردیی که دوور نیه تاوەکو ئێستە تەواوی کردبێ •

جگه لەوانەی باسانکردن مامۆستا عەلی ســـــیدۆ نامیلکەیەکیشی دەربارەی بالیۆزگەری به عەرەبی بلاوکردۆتەوە کــه وەك خۆی دەلێ بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ تاکه سەرچاوەی فێربوونی کاری دیپلۆماسی بوو له ئوردون • هەروەهــا وتاری « لوڕو لوڕســـــتان »و « زەردەشــــتو زەردەشتایەتی»ی له «گۆڤاری کۆڕی زانیاری کوردا »ا بلاوکردۆتەوە[٢٣٦]• جگه له وتاری «زمانو ئەدەبی کوردی » گــەلێك وتــــاریتری لــــە کۆبونەوەکانی یانەی صەلاحەددینی عەممانداخوێندۆتەوە که یەکێکیان ناوی « کورد بەر له ئیسلام »ە[٢٣٧] •

زادی فیکرو بەرهەمی بیرو دلسۆزیی کاری ئــەو پیـــاوە بەڕاستی لێهاتووانەی باسانکردن تا ڕادەیەکی زۆر ئەرکی ســـەرشانی دەســـــتەی سێیەمی مێژوونووسانی کوردیـــــان بەتایبەتیو ڕووناکبیرانیانی بەگشتی ئاسانکرد ، ئەو باسەی له بەشی داهاتوودا هەولدەدەین بەپێی توانا چەند لایەنێکی ڕوونبکەینەوە •

---

٢٣٥ــ دەقی ئەو وتارەی ئێستە لای منه .

٢٣٦ــ بڕوانه : علي سيدو الكوراني ، اللرو لرستان ؛ ــ «مجلة المجمع العلمي الكردي » ، المجلد الثاني ، العدد الثاني، ١٩٧٤ ؛ ص ١٠٨ ــ ١٨١ ؛ زرادشت والزرادشتية ؛ ــ « مجلة المجمع العلمي الكردي » ، المجلــد الثالث ، العدد الثاني، ١٩٧٥ ، ص ٥٧٧ ــ ٥٩٤ .

٢٣٧ــ دەستنووسی ئەو وتارەشی لەگەل وتاری « زمانو ئەدەبی کوردی»یەکەی بۆ من ناردووە .

# دواکورتەی لاپەڕەی

# مێژوونووسیی کوردیی نوێ

**مێژووی کۆن . هەولێرو صەلاحەددینو سەعدە ناونجی‌یەکانی کوردستان . ئەوانەی ڕەنگیان هەیەو دەنگیان نی‌یە. قازی‌و شەمزینی‌و قاسملو . بەرهەمەکانی لەفتانو عوسمان . سەرەتای ڕەخنەی مێژوویی . وەرگێرەکانمانو مێژوو . دەنگی مێژوونووسیی کوردی لە کۆنگرەکاندا . مێژوونووسە کوردەکانی ئەرمەنستان.**

لەم‌بەشەدا هەوڵدەدەین بەپێی توانا چەند لایەنێکی‌تری مێژوونووسیی کوردی ڕوون‌بکەینەوە بەنیازی نیشان‌دانی ڕوی بەهێزو لاوازی ئەو مەیدانە گرنگەی ژیانی ڕووناکبیریمانو دیار کردنی بەشێك لە کەلێنەکانی کە پڕکردنەوەیان ، بێ‌گومان ، پێویستی بە چالاکی‌و لەخۆبوردنی دڵسۆزانە .

مێژووی کۆنی کوردو کوردستان تائێستەش بوخچەی نەکراوەیە . ڕاستە شارەزایانی مێژووی کۆن لەناو گەلانی‌تری ناوچەکەداو بەگشتی زۆر نین[٢٣٨] ، بەڵام وابزانم لەناو ڕۆژهەڵاتی‌یەکاندا کەس وەك کورد لەومەیدانەدا بێ‌کەس نی‌یە . کاتی خۆی « کۆڕی زانیاری کورد » هەستی بەو کەلێنە کردو یەکێك لەو پێنج شوێنەی بۆ خوێندنی بەرز لە یەکیەتی

---

٢٣٨- لە هەموو بەشی مێژووی کۆلێجی ئەدەبیاتی زانکۆی بەغدادا تەنها یەك کەس دوکتۆرای لە مێژووی کۆندا هەیە کە ئەویش دوکتۆر سامی سعید الاحمدە . لە زوربەی زانکۆکانی‌تری عیراق تەنانەت ئەو تاکە کەسەش نی‌یە .

سۆڤیەتی وەرگرتن بۆ لێکۆڵینەوەی مێژووی کۆنی کوردی تەرخانکرد ، بەڵام بەداخەوە ئەو بڕیارەی بۆ نەچووە سەر[٢٣٩] .

ئێستە تەنها دوو کەسمان هەن کە بتوانین بڵێین بەتەواوەتی خۆیان بۆ باسی مێژووی کۆنی کورد تەرخانکردووە ، یەکەمیان دوکتۆر جەمال ڕەشیدەو دووەمیان کەمال نوری مەعروف . بەداخەوە دوکتۆر جەمال بەرهەمی کەمە[٢٤٠] ، بەڵام ئەو یەك دوو وتارەی کە من دیومن و ئەو چەند جارە کەمەی لەگەڵی دانیشتووم وام لێدەکەن بەدڵنیاییەوە بڵێم شەقڵی ڕەسەنی و بۆچوونی وردی پێوە دیارە، ئەوەش بۆخۆی هەرچەندە مەرجێکی گەورەی سەرکەوتنی مێژوونووسە بەڵام بە هەتیوی دەمێنێتەوە تا دەگاتە قۆناغی دەربڕین و داڕشتن . کەمال نوری مەعروف[٢٤١] ئەمیانی زۆرو ئەویانی هێشتا کەمە ، بەڵام لەگەڵ ئەوەش نووسینەکانی[٢٤٢] مژدەی سەرەتایەکی پڕهیوان . پێم وایە تەواوکردنی خوێندنی بەرز لە دەزگایەکی ئەکادیمیی لێهاتوو یا خۆهیلاك کردنێکی تایبەتی و تەواو فێربوونی زمانی ئینگلیزی کەمال نوری مەعروف دەکەنە ئەو مێژوونووسەی لەباریدا بێ کەلێنێکی باشی مێژووی کۆنمان بۆ پڕبکاتەوە . با ئەوەش لەیادنەکەین کە مێژوونووسی ئەو مەیدانە دەتوانێ بکاتە گەلێك ئەنجامی نوێ و ڕەسەنی ئەوتۆ کە لەوانەن لە سەرتاپای جیهاندا دەنگ بدەنەوە . کووپەلەکانی

---

٢١ــ دوکتۆر جەبار قادر کە ئێستە یەکێکە لە مامۆستا کوردەکانی مێژوو کاتی خۆی بۆ ئەو شوێنە هەڵبژێردراو داوای لێ کرا لە لێنینگراد لەگەڵ پرۆفیسۆری بەناوبانگ دیاکەنەڤدا کاربکا ، بەڵام ئەویش نامەی دوکتۆراکەی بۆ باسی مێژووی نوێ تەرخانکرد .

٢٤٠ــ دوکتۆر جەمال ڕەشید ڕۆژی سێی حوزەیرانی ساڵی ١٩٤١ لەکەرکوك لەدایك بووە ، بەشی کوردیی لە زانکۆی بەغداو خوێندنی بەرزی لە بەلغاریا تەواوکردووە .

٢٤١ــ فەرمانبەرە لە موزەخانەی سلێمانی .

٢٤٢ــ تایبەت لە ڕۆژنامەی « التآخی »و « العراق »دا .

گوێستانە دێرینەکانی دەوروبەری پێنجوین یەکێکن لە بەڵگە زۆرەکانی ئەم تەمە .

وادیارە مێژووی کۆن خەریکە لە جاران زیاتر سەرنجی ڕووناکبیرانی کورد ڕابکێشێ . لەم ساڵانەی دوایدا ژمارەیەك لە مێژوونووسانی تازە پێگەیشتووی کورد بە پرواوە توخنی ئەو مەیدانە ناسکە کەوتوون . یەکێك لەوانە زوبێر بیلال ئیسماعیلە کە ئەشکەوتی شانەدەرو میدیو نائیرو مەنائی سەرنجی ڕاکێشاون[٢٤٣] . فوئادی حەمە خورشیدیش زوربەی باسەکانی ئەو کتێبەی خۆی کە بە ناوی « کورد »ەوە ساڵی ١٩٧١ بە زمانی عەرەبی بڵاوی کردۆتەوە[٢٤٤] بۆ باسی مێژووی کۆنی کوردستانی تەرخان کردوون . « کوردستان لە ڕۆژگاری بەردینی کۆندا »[٢٤٥]و « گوتیەکان »و « میدیەکان »و « کاردۆخەکان »و پێوەندی دێرینیان بە گەلی کوردی ئیمڕۆوە لە باسە سەرەکیەکانی ئەو کتێبەن . هەرچەندە بەشێك لە ڕاکانی دانەری « کورد » بنەوبەرەی زۆریان لەسەرەو هێشتا پێویستیان بە لێکۆڵینەوەی وردەو هیواشیان تێدایە کە جێگەی گومانن ، وەك ئەوەی کە لەبارەی نەژادی کوردەوە بەرپەرچی مینۆرسکی دەداتەوە[٢٤٦] بەڵام

---

٢٤٣ـ بەوێنە بڕوانە : زبیر بلال اسماعیل ، معالم الثریة في كردستان . كهف شانلدر ، ـ مجلة « شمس كردستان » ، العدد ٣ ـ ٤ ، آب ـ ایلول ١٩٧١ ، ص ٢١ ـ ٢٣ ، المیدیون وقیام الدولة المیدیة ، ـ « شمس كردستان » ، العدد ٧ ، اذار ١٩٧٢ ، ص ١٧ ـ ٢٠ ( سەرچاوەی لێکدانەوەکانی هەمەجۆرو دەوڵەمەندن ) ، مێژووی کۆنی کوردستان . نائیری یان نائیریەکان ،ـ گۆڤاری «ڕۆشنبیری نوێ» ، بەغدا ، ژمارە ٨٨ ، ئابو ئەیلولی ١٩٨١ ، ل ٣٢ ـ ٣٧ .

٢٤٤ـ فؤاد حمە خورشید ، الاكراد . دراسة علمیة موجزة ، بغداد ، ١٩٧١ ، ٨٠ ص .

٢٤٥ـ ڕۆژگاری بەردینی کۆن واتە العصر الحجري القدیم .

٢٤٦ـ بڕوانە لاپەڕە ٦٦ی کتێبەکەی .

دارشتنی بەرهەمەکەی‌و نەخشەو سەرچاوەکانی شەقلی زانستی‌یانەیان ئاشکرا پێوە دیارەو مافی ئەوە ئەدەنە خاوەنیان بە دلنیایی‌یەوە بتوانێ خۆی بـــــە باسەکانی مێژووی کۆنیشەوە خەریك بکات .

ئیبراهیم عومەر لەو بەرهەمەی خۆیدا کە سالی ١٩٧٢ بەناوی « کورد لەناو ئایین‌و مێژوودا » بلاوی کردۆتەوە[٢٤٧] باسی ئادەمیزادی کۆن‌و نوێ‌و ئاری‌یەکان‌و ئاوێستای زەردەشت‌و مێژووی دێرینی هەولێرو ژمارەیەك لـە گەل‌و ئاینە کۆنەکانی ڕۆژهەلاتی نزیك‌و ناوەڕاستی کردووە .

بەشێك لە بەرهەمەکانی گەڕیدە ـ کەریم زەند توخنی باســـەکانی ڕابوردووی زووی نەتەوی کورد کەوتوون . لە « میللەتی کورد » ا [٢٤٨] باسی « نەژادو بنچینەی زوبانی دانیشتووانی کوردستان »ی کردووە . لـە « ئایین‌و باوەڕ لە کوردستاندا »[٢٤٩] دەربارەی « زەردەشـــتی‌و یەزیدی‌و کریستیانی‌و مانی‌و مەزدەکی‌و نەخشی‌و قادری‌و کاکەیی‌و شەبەکی‌و سارلی‌و عەلی‌ئیلاهی »ی دەخوێنی‌یەوە . هەرچەندە ئـەو باسە وردو ناســـکانە دەریایەکی بێ‌بن‌و وەك مامۆستا زەند بۆ خۆی دەلی « نەبوونی هــــان‌و یارمەتی‌و ڕێ‌نەدان » دەبنە هۆی «کرچ‌وکالی »ی ئەو «جۆرە بەرهەمانە»ی لێیان دەکۆلنەوە[٢٥٠] بەلام کەم زانیاری بەکەلکی نەداوە بەدەستەوە، تایبەت لەو شوێنانەدا کە دیدەنی‌و تێبینی‌یە تایبەتی‌یەکانی خۆی تێدا تۆمارکردوون .

مێژووی سەدە ناونجی‌یەکانی کوردستان سەرنجی ڕووناکبیرانی زیاتر ڕاکێشاوە ، بەلام کەلێنەکانی ئەویش کەم نین . جگــــە لە جەمیل بەندی

---

٢٤٧ـ ١٣٤ لاپەڕەیە ، لە سلێمانی چاپ کراوە .
٢٤٨ـ بڕوانە : کەریم زەند ، میللەتی کورد ، سلێمانی ، ١٩٧٠ ، ٦١ ل .
٢٤٩ـ گەڕیدە ـ کەریم زەند ، ئایین‌و باوەڕ لە کوردســـتاندا ، ســـلێمانی ، ١٩٧١ ، ٩٢ ل .
٢٥٠ـ هەمان سەرچاوە ، ل ٩١ .

ڕۆژبەیانی کە لە شوێنی خۆیدا باسی بەرهەمەکانیمان کردو وادیارە تائێستەش بە باسەکانی ئەو ڕۆژگارەوە هەر خەریکە. ژمارەیەك ڕووناکبیری تێماتووی تری وەك دوکتۆر موحسین محەمەد حسەین و زوبێر بیلال ئیسماعیل و عەبدولڕەقیب یوسف لە نووسینەکانیاندا چەند لایەنێکی مێژووی سەدە ناوەنجییەکانی کوردیان ڕوونکردۆتەوەو گەنجینەی کتێبخانەی مێژوویییان دەوڵەمەند کردووین .

دوکتۆر موحسین ساڵی ١٩٧٤ نامەی ماجستێرەکەی بۆ باسی هەولێر لە سەردەمی ئەتابەگیداو ساڵی ١٩٨١ نامەی دوکتۆراکەی بۆ باسی لەشکری سەلاحەددینی ئەیوبی تەرخان کردووە ، یەکەمیانی لە کتێبێکی گەورەدا چاپکردووەو[٢٥١] دووەمیشیان چاوەڕوانی چاپە . جگە لەو دوو شاکارە دوکتۆر موحسین زنجیرەیەك وتاری بەکەڵکیشی دەربارەی ڕوداوە گرنگەکانی هەمان قۆناغ نووسیوە کە بەشی زۆریانی لە « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد »و « گۆڤاری کۆڕی زانیاری عیراق دەستەی کورد »و « گۆڤاری کۆلێجی ئەدەبیات »دا بڵاوکردوەتەوە[٢٥٢] .

---

٢٥١- بڕوانە : محسن محمد حسين ، اربيل في العهد الاتابكي ٥٥٢ - ٦٣٠هـ/ ١١٢٨ - ١٢٣٣م . بحث في اوضاع اربيل السياسية والاقتصادية والعسكرية والادارية والثقافية في العهد الاتابكي ، بغداد ، ١٩٧٦ ( ٤٣١ + ٦ ص ) .

٢٥٢- بەوێنە بڕوانە : محسن محمد حسين ، قراءة ثانية لما كتب عن تاريخ اربيل في العهد الاتابكي ، - « مجلة المجمع العلمي الكردي » ، العدد الرابع ، ١٩٧٦ ، ص ٥٢٠ - ٥٣٢ ، العز الضرير الاربيلي ، - « مجلة المجمع العلمي الكردي » ، العدد الخامس ،١٩٧٧، ص ٤٣٩ - ٤٤٩ ، دەوری قەڵای هەولێر لە پاراستنی شارەکەدا لە مێژووی ئیسلامدا ،- « گۆڤاری کۆلیجی ئەدەبیات » ، ژمارە ٢٣ ، ١٩٧٩ .

٢٥٣- لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکاندا باسیانکراوە ( بەوێنە بڕوانە ئەو وتارە نرخاندنەی فوئاد حەمە خورشید ڕۆژی ٧ی کانونی یەکەمی ساڵی ١٩٨١ لە ڕۆژنامەی « العراق »دا دەربارەی نامەی دوکتۆراکەی بڵاوی کردۆتەوە ) .

لێکدانەوەی بەرهەمە نایابەکانی دوکتۆر موحسین زۆری پێ دەوێ[٢٥٣] • لێرەدا وەك بەڵگەو نمونە تەنها چەند لایەنێکی وردی ئەو بەرهەمانە دەهێنینەوە •

بەدەگمەن خوێندەوارێکی کوردو بێگانە هەڵدەکەوێ نەزانێ هەولێر یەکێکە لە شارە هەرە کۆنو دێرینەکانی سەرجەمی جیهان • ئەوانەش کە نازانن هەولێر یەکێکە لەو شارە کەمانەی ئازایانە بەرەنگاری لێشاوی هێرشی لەشکری هۆلاکۆی خوێنڕێژ هات کەمن • بەڵام دیسان ئەوانەش کەمن کە دەزانن هەولێر دەوروبەری هەشت سەدە لەمەوبەر ، لەنێوانی ١١٢٧و١٢٣٤دا یەکێك بوو لە بنکە هەرە گەورەو ناودارە سیاسیو ژیاریەکانی سەرتاپای جیهانی ئیسلام • دەسەڵاتی میرنشینی هەولێری ئەو ڕۆژگارە گەیشتە شارەزوور ، ناڵەی سوارچاکە چاپوکەکانی خورپەی لە دڵی خاچدارانی شەڕگەکانی فەلەستینو میسر هەڵدەستاند • منارە نەخشینەکەی مزگەوتی موزەفەری تا ئیمڕۆ باسی ئاوەدانیو پێشکەوتنی ئەوسای هەولێر دەکات کە بێگومان زۆر بەولای شوورەکانی قەڵادا کشابوو • « منارەی چۆلی » کە لەناو کوردەواریدا ناوی باوی منارەکەی مزگەوتی موزەفەریە بەڵگەی ئاوەدانیی ئەو ڕۆژگارەی هەولێرە کە وادیارە دوایی چۆتەوە قاوغەکەی جارانی ناو قەڵاو دەوروبەری نزیکیەوە • مزگەوتو خانو خانەقاو قوتابخانە ئاینیەکانی ئەو ڕۆژگارەی هەولێر هاوتایان کەم بوو • هەولێر ئەوساکە ببوە زیارەتگای ناودارترین زانایانی ئیسلامی وەك یاقوتی حەمەویو سەبطی ئیبنولجەوزی ، هیواهەبوو لە ئەندەلوسو ئیسپانیای دوورەوە دەهاتنە هەولێر کە بۆ خۆشی ژمارەیەك بنەماڵەی زانای ناوداری هەبوو •

هەموو ئەم باسانەو گەلێك باسی وردیتری وەك ئەمانە بەدرێژیو بە بەڵگەی زۆرەوە لە کتیبەکەی دوکتۆر موحسیندا دەخوێنیەوە •

له دووەم بەرهەمی گەورەیدا دوکتۆر موحسین هـــەرچی دەربارەی لەشکری صەلاحەددین هەیە لە نزیکەی ٥٠٠ لاپـەڕەدا کۆی کردوونەوەو بەدرێژی لێیان دواوەو لایەنە نەزانراوەکانیانی ڕوون کردۆتەوە ٠ لە ڕووی مێژووی کوردەوە بایەخی هەرە گەورەی ئەو کارە زانستی یە بەلای منـــەوە بریتی یە لەوەی کە لە زۆر شوێنیدا هەست بە سەنگی ڕاستەقینەی گەلی کورد لە کاتێکی ناسکی سەدە ناونجی یەکاندا دەکرێ ٠ صـەلاحەددین کابرایەکی لەناسراو نی یە بازی بەخت بەسەری یەوە نیشتبێتەوە ، یا تەنها پیاوێکی ئازاو بەجەرگ نی یە بە پەیژەی لێهاتوویی خۆیدا تا لوتکە ســەرکەوتبێ ، بەڵکو یەکێکە لەناو گەلێك ناوداری تری کوردا کە خۆیان و پیاوەکانیان هەریەکەیان بەجۆرێك لەگەڵ مێژووی ڕابوردوویاندا دەوریان لــە دروســـتکردنی صەلاحەددین و سەرکەوتنەکانیدا بینیوە ٠ هەرچەندە دوکتۆر موحســـین قسەکەی جۆرجی زەیدانی بۆ ساغ نەکردووینەوە کە دەڵێ صـــەلاحەددین لەگەڵ یاریدەرە نزیکەکانی بە زمانێك دەدوا خەڵکەکە لێی تێ نەدەگەیشتن ، بەڵام بەپشتیوانی بەڵگەی ڕەسەن و دەگمەن ڕاســـتی یەکی گـرنگی تری سەلماندووە دەربارەی ئەوەی کە بەشێکی دیاری لەشکری ئەیوبی چەکداری کورد بوو ٠ لەو بەرهەمەی و بەرهـەمەکانی تریـدا دوکتۆر موحســین بەدرێژی باسی ژمارەیەك سەرداری گەورەی کوردی کردووە کە ئەوانیش هەر یەکەیان نیمچە صەلاحەددینێك بوون[٢٥٤] ٠ بێ گومان هەموو باســێکی زانســتی یانەی ئەو ڕۆژگارە بایــەخی بۆ مێژوونوسی و مێژووی کورد زۆرە ، تایبەت گەر ئەوەش لەیادنەکەین کە مێژوونوسی کۆنی ئەوتۆ هەن

---

٢٥٤ــ بەوێنە بڕوانە : الدكتور محسن محمـــد حسين ، المشطوب الهكاري ــ سيرة مجاهد . صفحة مشرقة من حياة أحد القادة الكرد في الحــروب الصليبية ، ــ « مجلة المجمع العلمي العراقي ــ الهيئة الكردية » ، العدد الثامن ، ١٩٨١ ، ص ٣٠١ ــ ٣٢٤ ٠

دەسەلاتی ئەیوبییەکان لە میسرو لە شام بە « دەولەتی کوردان » ناودەبەن[٢٥٥] .

بێلایەنیی دوکتۆر موحسین وەك مێژوونووس لەوەدا زۆر ئاشکرا خۆ دەنوێنێ کە هیچی دەربارەی سەلاحەددین نەشاردۆتەوەو بە دەستووری زوربەی مێژوونووسانی ڕۆژهەلات نەیکردۆتە کورە ئازای تاقانەی مەیدان بەدرێژایی مێژووی ژیانی[٢٥٦] . وێڕای ئەوە خامەی مێژوونووسی لاومان جاروبار خۆی دەگەیێنێتە باسی ئەوتۆ کە مێژوو بۆ خۆی خەریکە لەیادیان بکات،وەك گێڕانەوەی سەرگوزشتەی کوشتنی سولتان جەلالەددینی مونکوبەرەتیی دوا پاشای خەوارزم لەلایەن کوردێکی ناوچەی میافارقینەوەو ڕوونکردنەوەی ئەو بەلگەو نرخاندنە جیاوازە زۆرانەی دەربارەی ئەو باسە لەئارادان[٢٥٧] .

لە هەمان مەیداندا دەربارەی هەمان ڕۆژگار زوبێر بیلال ئیسماعیلیش گەلێك خزمەتی پێشکەش بە کتێبخانەی مێژوویی کوردی کردووە . بەر لە دوکتۆر موحسین بە چەند سالێك ئەویش مێژووی شاری هەولێری خۆشەویستی کردە ناوەرۆکی کتێبێکی سەربەخۆی گەورە[٢٥٨]، بەلام ئەمیان

---

٢٥٥ـ بەوێنە بڕوانە : « النقود والمكاييل والموازين » ، تاليف محمد عبدالرؤوف بن تاج العارفين بن علي للمناوي المتوفي سنة ١٠٣١ هـ ، تحقيق الدكتور رجاء محمود السامرائي ، بغداد ، ١٩٨١ ، ص ١٢٤ .

٢٥٦ـ لەگەل ئەوەش دوکتۆر موحسین بەوردی ڕاکانی ئیبنولئەثیری دەربارەی سەلاحەددین هەلسەنگاندووە ( بڕوانە : محسن محمد حسين، موضوعات في التاريخ الكردي ، بغداد ، ١٩٧٦ ، ص ٣ ـ ٤٨ ) .

٢٥٧ـ بڕوانە : موحسین محەممەد حوسێن ، کوژرانی سولتانی خوارزمی بەدەستی کوردێك ، ـ « گۆڤاری کۆلێجی ئەدەبیات » ، ژمارە ٩ ، ١٩٧٦ ، ل ١١٧ ـ ١٥٢ .

٢٥٨ـ بڕوانە : زبير بلال اسماعيل ، اربيل في ادوارها التاريخية ، بغداد ، ١٩٧١ .

لەبەرئەوەی بە یەك قۆناغو ڕۆژگارەوە نەوەستاوەتەوە بەڵکو کۆنو نوێی هەولێرو دەوروبەری خستۆتە ژێر نەشتەری یەکلاکردنەوەوە ، کە ئەوەش بۆ خۆی کارێکی ئاسان نییە، نەیتوانیوە بەتەواوەتی بچێتە ناو ناخی بەشێکی باسەکانییەوە • لەگەڵ ئەوەش مامۆستا زوبێر توانیویە وێنەیەکی دلگیرو ڕەوانی هەولێرمان لە سەردەمی پێش عیساوە بۆ بکێشێ • بایەخی ئـــــەو بەشانەی کتێبەکەی کە باسی کوردستان لە ڕۆژگاری ئەکەدو گوتیو کـــاتی شەڕەکانی ئەسکەندەری گەورەو مەغۆلەکان دەکەن زۆرە ، تایبەت چونکە ڕووناکبیرانمان کەمتر لە هەموو لایەنێکی مێژووی ڕابوردوومان ئاگاداری ئەو جۆرە باسانەن • ئەو کتێبەش کە بۆ ژینامەو لێکدانەوەی بەرهەمەکانی ئیبنوخەلەکان ( ابن خلکان )ی تەرخانکردووە[٢٥٩] جگە لە بایەخی زۆری ، تەواوکەری کتێبەکەی تریەتی لەمیاندا زیاتر چۆتە ناو دەرونی باسەکەیەوە • هەمانکات زوبێر بیلال ئیسماعیل زنجیرەیەك وتاری مێـــــژوویی دەربارەی سەدە ناونجییەکان لە گۆڤارەکانیشدا بلاوکردۆتەوە ، تایبەت لە « ڕۆژی کوردستان »دا[٢٦٠] •

هەرچی عەبدولڕەقیب یوسفە بە یارمەتی ٨٦ سەرچاوەی هەمەجۆر ، کە گەلێکیان لە سەرچاوە ڕەسەنە کۆنەکانن ، توانیوێتی لە دوو بەرگی گەورەدا، کە بەسەریەکەوە ٨٧٠ لاپەڕەن ، زۆر لایەنی مێژووی ســـیاسیو ژیاریو ئابووریو کۆمەلایەتی دەولەتی دۆستەکی لــــە کوردســـــتانی ناوەندا

---

٢٥٩ـ بروانە : زبیر بلال اسماعیل ، ابن خلکان ابو العباس شمس الدین احمد بن محمد بن ابی بکر بن خلکان ( ٦٠٨ ـ ٦٨١ هـ )، بغداد ، ١٩٧٩ ، ١٢٠ ص •

٢٦٠ـ بەوێنە بروانە : زبیر بلال اسماعیل، ابن خلکان، ـ « شمس کردستان »، العدد الاول ، حزیران ١٩٧١ ، ص ٢٩ ـ ٣١ ، ابن المستوفی الاربلي ، ـ « شمس کردستان » ، العدد الثاني ، تموز ١٩٧١ ، ص ٢٩ـ٣١ •

ڕوون بکاتەوە[٢٦١] . هەرچەندە خاوەنی ئەو کتێبە لەبەر کەمیو پەرش و بڵاوی ئەو سەرچاوانەی هەنو دەستکورتیی خۆی لــــە مــەیدانی بەکارهێنانی سەرچاوە ڕۆژئاوایی‌یەکان بەگشتیو سەرچاوە بیزەنتیو ئەرمـــەنی‌یەکان بەتایبەتی[٢٦٢] ، نەیتوانیوە وێنەیەکی یەکگرتووی دەوڵەتی دۆستەکیمان بۆ بکێشێ ، بەڵام بایەخی ئەو ڕاستی‌یانەی باسی‌کردوونو ئـــەو بەڵگانەی هێناونی‌یەوە بە هەر تەرازوویەك بیکێشی سەنگی زۆرو جێگەی دیارە . هەر ئەوەی کە دەڵێ فەرمانڕەوایانی دەوڵەتی دۆستەکی لە چەند شارێکــی وەك فارقینو ئامەدو جزیرو نەسیبەینو هیتر پارەو دراوی سەربەخۆی خۆیــان لێداوە[٢٦٣] کە نمونەیان ئیستە وا لە موزەخانە ناودارەکانی وەك موزەخانەی بەریتانیو ئەستەموول ، بەڵگەیەکی مێژوویی گەورەیە دەربارەی دەسەڵاتی کورد لە سەدە ناونجی‌یەکاندا . کۆبوونەوەی ئیمپراتۆری بیزەنتی باسیلیۆسی

---

٢٦١ـ بڕوانە : عبدالرقیب یوسف ، الدولة الدوستكية في كردستان الوسطى . دراسة تاريخية واقتصادية واجتماعية وحضـــارية ، الجـزء الاول ، بغداد ، ١٩٧٢ ، الجزء الثاني ، بغداد ، ١٩٧٥ .

٢٦٢ـ چ سەرچاوە ئەرمەنی‌یەکانو چ سەرچاوە بیزەنتی‌یەکان بایەخیــان بۆ ڕوونکردنەوەی گەلێك لایەنی کەم زانراوی مێژووی سەدە ناونجی‌یەکانی بەشێکی زۆری ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی نــزیكو ناوەڕاســت زۆرە . مامۆستا نەدەمران لە بەرێڤانی پایتەختی ئەرمینیای سۆڤیەتی پڕی‌یە لەوجۆرە سەرچاوانە . سەرچاوە بیزەنتی‌یەکانیش لە ئەورووپا ، تایبەت لە ئیتالیاو فەرەنســە ، کەم نینو بایەخیشیان لەبەر دوو هۆی ســـەرەکی زۆرە ، یەکەمیان چونکە سنووری دەوڵەتی بیزەنتی تەواو خزابووە ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی ئێمەو دەسەڵاتی ئەو دەوڵەتە زۆر جار خۆی لەو ناوچانەدا دادەسەپاند ، دووەمیشیان لەبەرئەوەی لــەو ڕۆژگارەی ســـەرتاپای ئەورووپادا بەدەگمەن مێژوونووسی ئەوتۆ هەڵدەکەوتن بتوانن شـان لە شانی مێژوونووسە بیزەنتی‌یەکان بدەن ، ئەوانەی بــەر لە کەوتنی قوستەنتەنی‌یە دەستنووسەکانیان بە لێشاو گوێزرانەوە ئیتالیا ، تایبەت لە نیوەی یەکەمی سەدەی پازدەمیندا .

٢٦٣ـ پارە یا دراو لێدان واتە سك النقود .

دووەم (٩٥٧ ـ ١٠٢٥) لەگەڵ مومەهیدولدەولەی فەرمانڕەوای دۆستەك[٢٦٤] وەك بەڵگەیەكی مێژوویی مانادار هیچی لەویان كەمتر نی‌یە ، تایبەت گەر ئەوەش بێنینەوە یاد كە ئەو سەدەیە ڕۆژگاری بەرەوو گەشەكردنی ئیمپراتۆری بیزەنتی بوو ، كە باسیلیۆسی دووەم یەكێك بوو لەپاشا هەرە بەدەسەڵاتو بەزەبرەكانی ئەو وڵاتەو لە ماوەی ٤٩ ساڵەی فەرمانڕەوایی خۆیدا[٢٦٥] بەسەر لەشكری ئیسلامدا زاڵبوو و. دیسان دەسەڵاتی بیزەنتیی گەیاندەوە حەلەبو حیمصو چەند ناوچەیەكی میسۆپوتامیاو گەلێك ناوچەی تری ڕۆژهەڵاتو ناوەندی ئۆلگاو شوێنی بایەخداری‌تر • قوستەنتەنی‌یەی پایتەختی ئیمپراتۆری‌ی بیزەنتی لە ماوەی فەرمانڕەوایی باسیلیۆسی دووەمدا لە هەموو ڕوویەكەوە گەیشتبووە لقەپۆپەی ئاوەدانی‌و پێشكەوتن ، تەنانەت مێژوونووسی ئەوتۆ هەیە كە بە « پاریسی سەدە ناونجی‌یەكان » ناوی‌دەبا •

خاوەنی دەولەتی دۆستەكی لە لاپەڕە ١٤٣ی كتێبەكەیدا كاتێك باسی كۆبوونەوەكەی مومەهیدولدەولەو باسیلیۆسی دووەم دەكا لەزمان ( سەعید الانطاكی)ی مێژوونووسەوە ئەم قسانەش دەگێڕێتەوە : «مومەهیدولدەولەی ••• میری كوردانو فەرمانڕەوای دیاربەكر چووە لای ( باسیلیۆس یا باسیل Basil ـ ك • م• ) ••• كە كردی‌یە مەلیك ماجسطرسو دۆقسی ڕۆژهەڵات ••• » • لە پەراوێزیشدا دەڵێ « نەمتوانی بگەمە واتای ماجسطرسو دۆقس »[٢٦٦] • بێ‌گومان ئەو دوو زاراوە تەواوكەری مەلیكو پاشایەتی‌یەكەنو لە ڕیشەی لاتینی‌و دارشتنی یۆنانی‌یەوە هاتوون ، دەبێ ماجسطرس یا لە (Majesty) وەرگیرابێ كەماناى گەورەو باڵاو بەرزە ، یا

---

٢٦٤ـ بڕوانە ل ١٤٢ ـ ١٤٣ی بەرگی یەكەم •

٢٦٥ـ ساڵی ٩٧٦ باسیلیۆسی دووەم هاتە سەر تەختی پاشایی ئیمپراتۆریی بیزەنتی •

٢٦٦ـ عبدالرقیب یوسف ، الدولة الدوستكية في كردستان الوسطى ، الجزء الاول ، ص ١٤٣ •

لـه (Magistrate) كه ماناى دادكارو قازى‌و حاكمه ، دۆقـه‌كه‌ش هه‌ر ده‌بێ له دۆق (Duke) وه‌رگیرابێ كه ئه‌ویش به لاتینی كۆن ماناى سه‌ردارو سه‌رۆك یا میر ده‌گه‌یێنێ‌و زیاتر به‌لاى سه‌ربازیدا ده‌شكێنێ . گـه‌روابێ ئه‌وساكه مه‌به‌ست له قسه‌كانى ( سعید الانطاكى ) واى لێ‌دێ : باســـیلیۆسى دووه‌م موه‌هیدولده‌وله‌ى كرده پاشایه‌كى خاوه‌ن‌شكۆو ده‌ســه‌ڵاتى ڕۆژهه‌ڵات ، مه‌به‌ستى ده‌سه‌ڵاته‌كه‌ش كارگێڕى‌و سه‌ربازى‌یه . ڕاسته‌كه‌شى باسیلیۆسى ئیمپراتۆرى بیزه‌نتى پێویستى به هاوپه‌یمانێكى له‌وجۆره زۆر بوو. بۆئه‌وه‌ى له‌لایه‌كه‌وه كێشه‌و گێره‌شێوێنه‌و ئـاژاوه لـه ســـنوورى وڵاته‌كـه‌ى دووربخاته‌وه‌و له لایه‌كى‌تریشه‌وه به‌ربه‌ستى هه‌موو جۆره ده‌ستدرێژى‌یه‌ك بۆ سه‌ر ئه‌و قافڵه بازرگانى‌یه زۆرانه بكات كه به‌و ناوچانه‌دا تێپه‌ڕ ده‌بوون.

حسام عه‌لى غالب نه‌قشبه‌ندى یه‌كێكه له‌و ڕووناكبیره كوردانه‌ى بــه مێژووه‌وه خه‌ریكن‌و له‌به‌رئه‌وه‌ى ڕه‌نگیان هه‌یه‌و ده‌نگیان كه‌مه گله‌یى زۆریان هاتۆته‌سه‌ر . واده‌بێ به حه‌وت ساڵ نامه‌ى ماجستێره‌كه‌ى مامۆستا حسام كه بۆ بڵاوكردنه‌وه ده‌شێ دیلى ده‌ستى خانه‌ى كتێبخانه تایبه‌تى‌یه‌كانه هه‌رچه‌نده باسه‌كانى كـه بۆ بـارى جوگرافى‌و كۆمه‌ڵایه‌تى‌و ئایینى‌و ڕووناكبیرى‌و مێژووى سیاسیى میرنشینى حه‌سنه‌وى‌و عه‌ننازیى به‌ر له هه‌زار ساڵ له‌مه‌وبه‌ر ته‌رخان كراون(٢٦٧) له هه‌موو ڕوویه‌كه‌وه بایه‌خیان زۆره . ئـه‌وه‌نده‌ى من ئاگادارم چه‌ند به‌رهه‌مێكى‌ترى ئاماده‌ى بڵاونه‌كراوه‌ى هه‌یه كه یه‌كێكیـان ده‌رباره‌ى شوێنه‌وارى شارى شاره‌زوورى كۆنه‌و ساڵى ١٩٧٦ له یه‌كـه‌م وه‌رزى ڕووناكبیریى كارگێڕى په‌روه‌رده‌ى ســلێمانیدا خوێندوویه‌وه‌و یه‌كێكى‌تریان كارێكى بیبلیۆگرافى مێژوویى‌یه‌و ســێیه‌میشیان ده‌ربـاره‌ى

---

٢٦٧ـ بروانه : حسام‌الدین علي غالب النقشبندي ، الكرد في الدینور وشهرزور خلال القرنین الرابع والخامس الهجریین ، رسالة ماجستیر في التاریخ الاسلامي من كلیة الاداب ـ جامعة بغداد ، ١٩٧٥ ، ٣٨٤ + ١٨ص .

فەرمانڕەوایی بنەماڵەی عەییار یا عەننازی خۆرهەڵاتی کوردستانە . ماکە بەرهەمی بڵاوکراوەی حسام نەقشبەندی ئەو وتارەیەتی کە دەربارەی گاوانی‌یەکان لە « گۆڤاری کۆڕی زانیاری‌کورد »ا بڵاوی‌کردۆتەوە[٢٦٨] .
والدیارە بەشێکی نامەی دوکتۆراکەشی کە ئێستە پێوەی خەریکەو دەربارەی ئازەربایجانی سەدە ناونجی‌یەکانە بەر سالاری‌و ڕاوەدی‌یەکان دەکەوێ کە ئەوانیش ، وەك ئاشکرایە ، لە بنەماڵە کوردە ناودارەکانی ئەو ڕۆژگارەن .

لەبەرئەوەی کاك حسام نەقشبەندی هاوپۆل‌و هاوڕێی خوێندنم بوو ، ڕێگە بە خۆم ئەدەم بڵێم هیوادارم خوێنە گەرمەکەی جارانی تێ‌بڕژێتەوەو بەرهەمی خامەی بۆ خەڵك بێ نەك بۆ خۆی .

لەبەر چەند هۆیەکی ئاشکراو وەك هەموو گەلانی‌تر هیچ قۆناغێك وەك مێژووی نوێ‌و هاوچەرخ سەرنجی مێژوونووسانی کوردی ڕانەکێشاوە . زوربەی ئەو نووسەرانەی لە بەشی ڕابوردوودا ناومان هێناون ( ئەمین زەکی‌و حسەین حوزنی موکریانی‌و سەجادی‌و صالح قەفتان‌و زۆری‌تریان ) هەریەکەیان بەجۆرێك باسی مێژووی نوێی کوردستانیان کردووە . وێڕای ئەوان ژمارەیەکی زۆر لە ڕووناکبیرانی کورد خۆیان بە لاپەڕەی جیاوازی ئەو مێژووەوە خەریك کردووە .

قۆناغی نوێی مێژووی کورد لە هەموو قۆناغەکانی‌تری زانستی‌یانەتر لێی‌کۆڵراوەتەوە کە ، بێ‌گومان ، تەواوکردنی خوێندنی بەرز لە دەزگا ئەکادیمی‌یەکانی جیهان لەلایەن دەستەیەك ڕووناکبیری کوردەوە یەکێکە لە هۆ گەورەکانی . عەبدولڕەحمان قاسملوو ڕەحیمی قازی‌و عەزیز شەمزینی‌و

---

٢٦٨– بروانه : حسام‌الدين علي غالب النقشبندي ، ملاحظات حول جلوان القبيلة الكردية المنسية ومشاهير الجلوانيين للدكتور مصطفى جواد ،– « مجلة المجمع العلمي الكردي » ، المجلد الثانى ، العدد الثانى ، ١٩٧٤ ، ص ٢٧٦ – ٢٨٢ .

کاوس قەفتانو ئەحمەد عوسمان ئەبوبەکرو حسەین بارزانیو عەبدولجەبار قادرو سەعید بارزانیو سیامەند زەید ئەحمەد عوسمانو ژمارەیەك لــە کوردەکانی سۆڤیەت[٢٦٩] نامەی زانستی‌یان بۆ لێکدانەوەی گەلێك لاپەڕەی جیاوازی مێژووی نوێی کورد تەرخانکردووە • بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد پتر لە هەموو باسەکانی‌تری ئەو قۆناغە سەرنجی ناوبراوانی ڕاکێشاوە•

ڕەحیمی قازیی ئامۆزای قازی محەمەدو برای محەمەد حسەینی سەدری قازیی وەزیری جەنگی کۆماری مەهاباد یەکەم ڕووناکبیری کوردە کە نامەی دوکتۆرای بۆ باسی مێژووی کورد تەرخانکردووە • ساڵی ١٩٥٤ ڕەحیمی قازی لە باکۆی پایتەختی ئازەربایجانی سۆڤیەت نامەی دوکتۆرای بە ناوی « پارتی دیموکراتی کوردستان ــ ڕەهبـــەری بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی نەتەوەیی کوردستانی ئێران ( ١٩٤٥ ــ ١٩٤٦ ) » پێشـــکەش بـــە زانکۆی کیرۆڤ کرد • نامەی ناوبراو بە زمانی ئازەربایجانی‌یەو کورتەیەکی بە زمانی ڕووسی چاپکراوە[٢٧٠] •

نامەی دوکتۆراکەی ڕەحیمی قازی بریتی‌یە لە پێشەکی‌و سێ بەش‌و ئەنجام کە هەموویان لەگەڵ سەرچاوەکاندا بەسەریەکەوە ٣٣١ لاپەڕەیـــان پڕکردۆتەوە • ئەمانەش ناونیشانی بەشەکانی‌یە : « بەشی یەکەم : بایـەخی شۆڕشی ئۆکتۆبەری سۆشیالیستیی مەزنو کاری بۆســـەر بزوتنـــەوەی ڕزگاریخوازی نەتەوەیی کورد » ، « بەشی دووەم : گەشەکردنی بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی نەتەوەیی لە کوردستانی ئێرانو دامەزراندنی پارتی دیموکراتی کوردستان» ، «بەشی سێیەم : دامەزراندنی ڕژێمی دیموکراسی لە کوردستانی ئێرانو تێکۆشانی لەژێر ئالآی پارتی دیموکراتی کوردستاندا » •

---

٢٦٩ــ دوایی بەتایبەتی دێینەوە ســـەر باسی مێژوونووســـە کوردەکانی سۆڤیەت .

٢٧٠ــ کورتەی ڕووسی‌یەکەی کە ساڵی ١٩٥٤ لە باکۆ چاپکراوە ٢٣ لاپەڕەیە.

لەڕاستیدا مەودای ناوەرۆکی نامەکەی دوکتۆر ڕەحیم زۆر لە ناونیشانی سەرەکیی خۆیو ناونیشانی بەشەکانی فراوانترە . لـە لاپەڕەکانی یەکەمیدا گەڕاوەتەوە سەردەمی زەینەفونو ڕۆژگاری بڵاوبوونەوەی ئاینی ئیسلام . دوای ئەوە بەدرێژی باسی تێکەڵبوونی کوردستان بە بازاڕی سەرمایەداریی جیهانو بەربەرەکانێی دەوڵەتە گەورەکان لەسەر خاكو سامانیو باری ژیـانی سیاسیی لە ساڵەکانی شەڕی یەکەمی جیهاندا دەکاو ئینجا لە لاپەڕە حەفتاوە دێتە سەر باسی شۆڕشی ئۆکتۆبەرو کاری بۆسەر بزووتنەوەی نەتەوەیی گەلی کورد . دوابەدوای ئەو باسە کە نزیکەی پازدە لاپەڕەی گرتۆتەوە قـازی دەکەوێتە گێڕانەوەی پوختەی مێژووی ڕاپەڕینو بزووتنەوە گەورەکانی کورد لەنێوانی شەڕی یەکەمو دووەمدا .

لە لاپەڕە ١٣٠وە دوکتۆر ڕەحیم گەیشتۆتە بەشی دووەمی نامەکەیو گەلێك زانیاریی بەنرخی دەربارەی گەشەکردنی بزووتنەوەی نەتەوەیی کوردی ئێرانو دامەزراندنی پارتی دیموکراتی کوردستانو خەباتی ئەو بڵاوکردۆتەوە. لە سەرەتای ئەو بەشەدا ڕەحیمی قازی بەکورتی باسی دەســـتێوەردانی نازییەکانی ئەڵەمانیا لە کاروباری ناوخۆی ئێران لە سەرەتای شەڕی دووەمی جیهاندا دەکاو وەك دەڵێ هیتلەرییەکان بایەخی زۆریان دابووە کوردستانو سیخوڕەکانیان چالاکانە لە مەهابادو کرمانشاو سنە لە کاردابوون . لەوەش خراپتر : سێ هەزار کەس لەو چوار هەزار کاربەدەستو پسپۆڕو شـارەزا ئەڵەمانییانەی سەرەتای چلەکان لە ئێران کاریاندەکرد لە کوردســــتانو ئازەربایجان بوون . ئەڵەمانەکان زۆر بەپەرۆشەوە دەیانویست نەتەوەکانی ئێرانو بەر لە هەموان کوردو ئازەری بکەنە داردەستی خۆیان بۆ پەلاماردانی ئەرمەنستانی سۆڤیەت[٢٧١] .

---

٢٧١ــ بڕوانە لاپەڕە ١٣٤و ١٣٥ی نامەی دوکتۆراکەی .

دوکتۆر ڕەحیم سەرتاپای نیوەی دووەمی نامەکەی بۆ باسی دامەزراندنو چالاکی‌یەکانی کۆمەڵەی ژ ۰ ک۰ (زیانەوەی کورد )و ژینامەی قازی محەممەدو کۆماری مەهاباد تەرخان‌کردووە ۰ لەوێدا گەلێك زانیاریی نوێ دەخوێنی‌یەوە کە یەکێکیان ، بەوێنە ، باسی قوتابخانەی گەلاوێژە ۰ بەتەنهـــا ژمـــارەی شاگردانی ئەو قوتابخانەیە کە مەهابادی‌یەکان دایانمەزراند نزیکەی ۳۰۰ کەس دەبوو بەرامبەر بە ٤۳۹ کەس کـــە بەرلەوە لە پێنج قوتابخـــانەدا بەسەریەکەوە دەیانخوێند ۰ گەلاوێژ بڕیارە جلو بەرگو کتێبو دەفتەری بەسەر قوتابی‌یەکانیدا دەبەشی‌یەوە[۲۷۲] ۰

هەرچەندە ڕەحیمی قازی هەموو مەبەستەکانی بە دروستی نەپێکاوەو چاوپۆشیی لە هەندێك هەڵەو کەموکورتی کردووەو جاروبار پەتی بۆ هەستی نەتەوەیی‌و تایبەتی شل‌کردووەو کەمتر بە لای لێکدانەوەی زانستی‌یانەدا دایشکاندووە ، بەڵام نامەی دوکتۆراکەی بێ‌گومان بەرهەمێکی مێژوویی بایەخدارە ۰

دوکتۆر ڕەحیم چەند وتارێکی مێژوویی بە ڕووسی‌و ئازەربایجانی لـە ئۆرگانە زانستی‌یەکانی کۆڕی زانیاری ئازەربایجاندا بڵاوکردۆتەوە۰هەروەها بەشێکی زۆر لە وتارە مێژوویی‌یەکانی ڕۆژنامەی « کوردستان »[۲۷۳] ئـەو نووسیونی ۰ لە کۆتای شەستەکانیشدا بە کوردی کتێبێکی ۳۲۳ لاپەڕەیی سەربەخۆی دەربارەی ژیانو خەباتی قازی محەممەد دانا کە بەداخەوە تائێستە

---

۲۷۲ـ بڕوانە لاپەڕە ۱۹۷و ۱۹۸ی نامەی دوکتۆراکەی ۰

۲۷۳ـ مەبەست ئەو ڕۆژنامەی « کوردستان »ەیە کە لە سەرەتای کانونی یەکەمی ساڵی ۱۹٤۷وە دەستەیەك ڕووناکبیری کوردی ئێران لەژێر چاودێریی دوکتۆر عەلی گەلاوێژو دوکتۆر ڕەحیمی قازیدا لە باکۆی پایتـــەختی ئازەربایجانی سۆڤیەت بۆ ماوەی نزیکەی پازدە ساڵ بڵاویان‌کردەوە ۰

مرفەتی بڵاوکردنەوەی بۆ هـــەڵنەکەوتووە[٢٧٤] . پێم‌وایـە دەتوانین « پێشمەرگە »کەشی بە یەکـەم چـیرۆکی مێـــژوویی دابنێین . لـە « پێشمەرگە »دا ڕەحیمی قازی بە کوردی‌یەکی پاراوو شێوازێکی شـیرین وتەی زیانی سەختو خەباتی ڕەوای چەوســـاوانی کوردســـتانمان بۆ دەکێشێ[٢٧٥] .

دوکتۆر عەبدولڕەحمان قاسملو چەند بەرهەمێکی بایەخداری هەیە کە تیایاندا وەستایانە باسە مێژوویی‌یەکانی کوردی تێکەڵ بە باری ژیـــانی ئابووری‌و کۆمەڵایەتی‌یان کردووە . کتێبی « کوردستان‌و کورد » شاکاری قاسملووە . ئەو کتێبەی کە نامەی دوکتۆراکەیەتی[٢٧٦] بۆ یەکەم‌جار سالی ١٩٦٤ بە زمانی سلۆڤاکی لەلایەن « بنکەی بڵاوکردنەوەی سیاسی »ی لـــە براتیسلاوی چیکۆسلۆڤاکیا بڵاوکرایەوە . دیسان هەر لە چیکۆسلۆڤاکیا بۆ سالی داهاتوو « کوردستان‌و کورد » بە زمانی ئینگلیزی بڵاوکرایەوەو لـە لەندەنیش بنکەی کۆلێتنز چاپی‌کردەوە ، سالی ١٩٦٨ بە عەرەبی[٢٧٧]و پاش سالێك لە وارشاو بە پۆلۆنیش بڵاوکرایەوە . سالی ١٩٧٣ نۆرەی زمـــانی کوردیش هات ، بە سەرپەرشتیی دوکتۆر عەبدولڕەحمان قاســــملو خۆی ڕووناکبیری هێژا مامۆستا عەبدوللا حەسەن‌زادە « کوردستان‌و کورد »ی

---

٢٧٤ـ ڕوونووسی دەستنووسی ئەو کتێبە ئێستە لای منە کە پڕی‌یـە لـــە زانیاریی مێژوویی بەکەڵك ، هیوادارم ڕۆژێك بێت بتوانین بـــڵاوی بکەینەوە .

٢٧٥ـ بڕوانە : دوکتۆر ڕەحیمی قازی ، پێشمەرگە . لاپەڕەیەکە لە خەبـاتی نەتەوەی کورد بەرامبەر ئاغاوەتو داگیر کەران لە دەورەبەری جمهووریەتی دیموکراتی کوردستانا ، بەغدا ، ١٩٦١ ، ١٦٠ ل .

٢٧٦ـ دوکتۆر عەبدولڕەحمان قاسملو خوێندنی بەرزی لە پراگی پایتـەختی چیکۆسلۆڤاکیا تەواوکردووە .

٢٧٧ـ ثابت منصور کردوویە بە عەرەبی‌و لـــە کتێبێکی ٢٠٠ لاپەڕەییـــــدا بڵاوی‌کردۆتەوە . سالی ١٩٧٠ چاپێکی کورت‌کراوەی « کوردســـتان‌و کورد » بە عەرەبی لەبێروت دیسان بڵاوکرایەوە .

کردە کوردی‌یەکی پاراوو ڕەوانو بنکەی پێشـــەواش لـــە کتێبێکی ٤٠٠ لاپەڕەییدا بلاوی کردەوە[٢٧٨] .

« کوردستانو کورد » جێگەی شیاوی بۆ خۆی لە کتێبخانەی کوردی‌و دەرونی ڕووناکبیری کوردو کتێبخانەی ڕۆژهەلاّتناسیدا کردۆتەوە . تائێستە چەند جارێك گۆڤارو ڕۆژنامەکانی خۆو بیانی ئەو کتێبەیان بەرزنرخاندووە. « کوردستانو نەتەوەی کورد »و کورتـــە باســـێکی مێژوویی کوردو « دابـەش‌کردنی کوردســـتان»و « ئـاوڕێکی گشتی بۆ سەر ئابووریی کوردستان »و « ئاوڕێکی گشتی بۆسەر مێژووی کۆمەلّی کوردەواری‌ی »و شێوازەکانی خاوەنداری زەوی‌و مولّکانەو ئەمرازی کارو پایـەی ژیـانی دانیشتوانی لادێ‌و پیشەسازی‌و بازرگانی‌و باری دارایی‌و جێگەی نەوت لە ئابووری نەتەوەییداو « گیروگرفتەکانی هەلّدانی ئابووری »و « مەسەلەی کورد لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا »و مافی دیارکـــردنی چـارەنووسی نەتەوەیی‌و مەسەلەی کورد لە باسەکانی « کوردستانو کورد »ن .

بۆ شی‌کردنەوەی ئەو باسە وردانە قاسملو پەنای بردۆتە بـــەر گەلێك سەرچاوەی ڕەسەنو دەگمەن ، وەك خۆی دەلێ « هیچ کتێبێکی گرنگ‌و سەرچاوەیەکی بەنرخ نەبووە کە پێوەندی بە کوردۆلۆژی‌یەوە هەبێ چـاوی پێی‌نەکەوتبێ »[٢٧٩] . ئەوە لەگەلّ بۆچوونو لێکدانەوەی وردی خۆی‌و بیری زانستیی نوێ قاسملویان گەیاندۆتە گەلێك ئەنجامو نرخاندنی دروست، بەتایبەتی لەو شوێنانەی کتێبەکەیدا کە بۆ لێکۆلینەوەی دیاردە ئابووری‌یەکانی کوردستانی تەرخان کردوون . پێم‌وایە قاســـملو دەیتوانی لـــە باســـە مێژوویی‌یەکانیش زیاتر قوولّبێتەوە ، تایبەت لەو بەشەی کتێبەکەیدا کە بۆ

---

٢٧٨ــ بڕوانە : دوکتۆر عبدالرحمن قاسملو،کوردستانو کورد. لێکۆلینەوەیەکی سیاسی‌و ئابووری ، بنکەی پێشەوا ، ١٩٧٣ ، ٣٨٨ل .

٢٧٩ــ هەمان سەرچاوە ، ل ٣ .

کۆماری مەهابادی تەرخانکردووە[٢٨٠]و بۆ خۆی لە نزیکـــەوە ئاگاداری ڕووداوەکانی بە •

وێڕای ئەوە لە لاپەڕە دەولەمەندەکانی « کوردستانوکورد »ا جاروبار وردە هەڵەش بەدیدەکرێ • بۆ ئەدمۆندس لەوانەیە ڕەوابێ گەر بلێ حاجی قادری کۆیی سالی ١٨٩٢ وەفاتی کردووە ، بەلام بۆ قاسملو ئەو قسەیە ڕەوا نییە[٢٨١] چونکە دەمێکە بە یاریدەی ڕۆژنامەی « کوردستان »ەوە ئەو ساڵە لە مێژووی ئەدەبی کوردیدا بەتەواوەتی ساغکراوەتەوە کە ( ١٨٩٧ )ە[٢٨٢] • ئەمۆ ، نەك شەمۆن ، نووسەری گەورەی کوردی سۆڤیەتە نەك شـــاعیر وەك ئەو دەلێ[٢٨٣] • چ خۆیو چ وەرگێڕ کارێکی زۆر باشیان کردووە کە ژمارەیەك زاراوی لە باری نوێیان داڕشـــتووە[٢٨٤] ، بەلام بـــەوڕادەیەش خراپیان کردووە کاتێك لەبریتی باشوورو باکوورو میـــزۆپۆتامیا ( جنوبو شمالو بین النهرین )یان بەکارهێناوە[٢٨٥] •

نەوەی شێخ عوبەیدوللای گەورە دوکتۆر عەزیز شەمزینی کە بە سەید عەزیز ناوی دەرکردووە سالی ١٩٥٩ لە ئامۆژگای ڕۆژهەلاتناســی ســەر بە کۆڕی زانیاری سۆڤیەت بڕوانامەی دوکتۆرای لـــە مێژوودا وەرگرت • « بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی نەتەوەیی گەلی کورد لەنێوان سالانی ١٩٤٢و ١٩٤٦دا » ناوی نامەی دوکتۆراکەی شـــەمزینییە کە کاتی خۆی ڕۆژنامەی « خەبات » بەشی زۆری بە عەرەبی بلاوکردەوە • نامەی ناوبراو کە نزیکەی

٢٨٠ـ هەمان سەرچاوە ، ل ٩٠ ـ ٩٨ •
٢٨١ـ هەمان سەرچاوە ، ل ٣٤ •
٢٨٢ـ بڕوانە بڕوانە : « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، ژمارە ١ ، ١٩٧٣، ل ٤٠٣ ـ ٤٠٥ •
٢٨٣ـ دوکتۆر عبدالرحمن قاسملو ، سەرچاوەی ناوبراو ، ل ٣٤ •
٢٨٤ـ لە باشکۆیەکی سەربەخۆدا ئەو زاراوانەیان بە عـــەرەبیو فارسی لێکداوەتەوە ( بڕوانە ل ٣٦٥ ـ ٣٦٦ ) •
٢٨٥ـ ئەوانە تەنها نمونەن •

٣٠٠ لاپەڕەیە پڕی یە لە بەڵگەو زانیاری مێژوویی گرنگی کەمزانراو دەربارەی یەکێك لە ڕۆژگارە ناسکەکانی مێژووی نوێی کورد . وەك بەڵگە لێرەدا یەك ڕاستی دەهێنمەوە کە ڕووناکبیرانی کورد کاتی خۆی لە ڕێگەی بەرهەمەکەی دوکتۆر شەمزینی یەوە پێیانزانی . وەك ئاشکرایە بەر لـە شەڕی دووەمی جیهانو لە سەرەتای ئەو شەڕەدا تورکیا بێ پێچ و پەنا بەلای ئەڵەمانیای نازیدا دەیشکاندەوە . ئەو هەڵوستەی تورکیا دوابەدوای سەرکەوتنە زووەکانی ئەڵەمانیاو بڕینی خەتی ماجینۆو گرتنی پاریس و دامەزراندنی حکومەتی ڤیشی لە فەرەنسە هێندەی تر ڕەنگی دایەوە . فۆن پاپنی بالیۆزی ئەڵەمانیای هیتلەری لە ئەستەموڵ بە ڕاستو بە چەپدا کنەی لە دەسەڵاتی ناحەزانی ئەڵەمانیادا دەکردو دوژمنانیانی لە ڕۆژهەڵاتی نزیكو ناوەڕەستدا هاندەدا . هـەموان هاتبوونە سەر ئەو بڕوایەی ئەمڕۆ نا سبەی تورکیا ئەداتە پـــاڵ ئەڵەمانیاو هاوپەیمانانی . لەو کاتە ناسکەدا ڤیرمەنی سەرۆکی بەشی سیاسیی وەزارەتی هەندەرانی ئەڵەمانیای نازی لە ڕاپۆرتێکی نهێنی زۆر گرنگی خۆیدا کە ڕۆژی دووی کانونی یەکەمی ساڵی ١٩٤١ نووسیویە دەڵێ گەر ترسی بزوتنەوەی نەتەوەیی کورد نەبوایا تورکیا دەیدایە پاڵ ئەڵەمانیا . شایانی باسە سۆڤیەتەکان لەگەڵ تەواوبوونی شەڕو گرتنی بەرلیندا ئەو ڕاپۆرتەیان لەگەڵ زۆر بەڵگەی نهێنیی تردا دەسکەوت کە هەموویانیان بەسەریەکەوە لە چەند بەرگێکدا بـە ناوی « دەکومێنتەکانی وەزارەتی هەندەرانی ئەڵەمانیا »وە بڵاوکردەوە .

نامەی دوکتۆراکەی شەمزینی گەلێك زانیاریی بەنرخی لـەو جۆرەی تێدایە . بەڵام بە ئەوپەڕی داخەوە کاتێك دانەری دێتە سەر باسی کۆماری مەهابادو تایبەت سەردارەکانی بە دەستووری ڤێرجێلی کۆمیدیاکەی دانتێ ، بەڵام بە زۆرو بۆ مەبەستێکی جیاواز ، دەتباتە تاریکستانێکی دواکەوتووی پڕ لە جەورو ستەمو خۆفرۆش[٢٨٦] . لەوێدا قازی محەمەد « دەرەبەگێکی

٢٨٦ــ بەتایبەتی بڕوانە لاپەڕە ٢٦٧ تا لاپەڕە ٢٨٦ی نامەی دەکتۆراکـــەی عەزیز شەمزینی .

۳۰۰ لاپەڕەیە پڕیەیە لە بەڵگەو زانیاری مێژوویی گرنگی کەمزانراو دەربارەی یەکێك لە ڕۆژگارە ناسکەکانی مێژووی نوێی کورد . وەك بەڵگە لێرەدا یەك ڕاستی دەهێنمەوە کە ڕووناکبیرانی کورد کاتی خۆی لە ڕێگەی بەرهەمەکەی دوکتۆر شەمزینییەوە پێیانزانی . وەك ئاشکرایە بەر لـە شەڕی دووەمی جیهانو لە سەرەتای ئەو شەڕەدا تورکیا پێیچوپەنا بەلای ئەڵەمانیای نازیدا دەیشکاندەوە . ئەو هەڵوەستەی تورکیا دوابەدوای سەرکەوتنە زووەکانی ئەڵەمانیاو بڕینی خەتی ماجینۆو گرتنی پاریسو دامەزراندنی حکومەتی ڤیشی لە فەرەنسە هێندەی تر ڕەنگیدایەوە . فۆن پاپنی بالیۆزی ئەڵەمانیای هیتلەری لە ئەستەموڵ بە ڕاستەو بە چەپدا کنەی لە دەسەڵاتی ناحەزانی ئەڵەمانیادا دەکردو دوژمنانیانی لە ڕۆژهەڵاتی نزیكو ناوەڕەستدا هاندەدا . هـەموان هاتبوونە سەر ئەو بڕوایەی ئەمڕۆ نا سبەی تورکیا ئەداتە پـــاڵ ئەڵەمانیاو هاوپەیمانانی . گا لەو کاتە ناسکەدا ڤێرمەنی سەرۆکی بەشی سیاسیی وەزارەتی هەندەرانی ئەڵەمانیای نازی لە ڕاپۆرتێکی نهێنی زۆر گرنگی خۆیدا کە ڕۆژی دووی کانونی یەکەمی سالی ۱۹٤۱ نووسیویە دەڵێ گەر ترسی بزوتنەوەی نەتەوەیی کورد نەبوایا تورکیا دەیدایە پاڵ ئەڵەمانیا . شایانی باسە سۆڤیەتەکان لەگەڵ تەواوبوونی شەڕو گرتنی بەرلیندا ئەو ڕاپۆرتەیان لەگەڵ زۆر بەڵگەی نهێنیی تردا دەسکەوت کە هەموویانیان بەسەریەکەوە لە چەند بەرگێکدا بـە ناوی « دەکومێنتەکانی وەزارەتی هەندەرانی ئەڵەمانیا »وە بڵاوکردەوە .

نامەی دوکتۆراکەی شەمزینی گەلێك زانیاریی بەنرخی لـەو جۆرەی تێدایە . بەڵام بە ئەوپەڕی داخەوە کاتێك دانەری دێتە سەر باسی کۆماری مەهابادو تایبەت سەردارەکانی بە دەستووری ڤێرجێلی کۆمیدیاکەی دانتێ ، بەڵام بە زۆرو بۆ مەبەستێکی جیاواز ، دەتباتە تاریکستانێکی دواکەوتووی پڕ لە جەورو ستەمو خۆفرۆش[۲۸٦] . لەوێدا قازی محەمەد « دەرەبەگێکی

---

۲۸٦ــ بەتایبەتی بڕوانە لاپەڕە ۲٦۷ تا لاپەڕە ۲۸٦ی نامەی دەکتۆراکـــەی عەزیز شەمزینی .

یەکجار گەورەیە »و پیاوی ئەمەریکایە ، حاجی بابەشێخی سەرەك وەزیران « نوێنەری پیاوە ئایینییە گەورەکانو هاوڕێی گیانیبەگیانی ڕەزا شایە »و بە سەدان ( بەڵێ بێکەمو زیاد بە سەدان ) میدالو نیشانی میریی بەسنگەوەیە ، حەمە ڕەشید خانیش لە نانەوەی ئاژاوەو گێرەشێوێنی لەسەر داوای ئینگلیزەکانی ئاغای بەولاوە نە کارێکیتری لەئەستۆدایەو نە بیرێکیتر لە مێشکیا .

بێگومان ئەو بەشە لە سەنگی زۆرو نرخی بەرزی نامەکەی دوکتۆر شەمزینیی هێناوەتە خوارێ . بەداخەوە دوکتۆر عەزیز شەمزینی بەرهەمی مێژوویی‌تری کەمە . پێموایە لە بەشێك لە وتارە مێژووییەکانی ڕۆژنامەی « کوردستان » بەولاوە[287] بەرهەمێکی مێژوویی‌تری ئەوتۆی نییە .

لاپەڕەکانی مێژووی نوێو هاوچەرخی گەلی کوردو بەر لە هەموبان بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کۆمەلآنی خەلك لە دەمێکەوە سەرنجی دوکتۆر کاوس قەفتانیان ڕاکێشاوە . زۆر بەسەر شۆڕشی چواردەی گەلاوێژدا تێنەپەڕی کاتێك دوکتۆر کاوس بە ناوی کاکەی ڕێبوارەوە لە نامێلکەیەکی ٣٠ لاپەڕەییدا « شۆڕشی ئاگریداغ »ی بلآوکردەوە کە دەربارەی یەکێك لە ڕاپەڕینە گەورەکانی کوردی تورکیایە لە سەرەتای سییەکاندا[288] . سەرچاوەی سەرەکیی ئەو بەرهەمە کتێبەکەی دوکتۆر بلەچ شێرکۆیە کە وەك لە شوێنی خۆیدا وتمان « خۆیبون » لە قاهیرە بە عەرەبیو فەرەنسی بلآویکردەوە . بەهۆی « شۆڕشی ئاگریداغ »ەوە زوربەی ڕووناکبیرانی لای خۆمان بۆ یەکەمجار پوختەیەکی دروستی ئەو ڕاپەڕینەو هۆ بزوتنەکانییان بە کوردی کەوتە بەردەست .

---

٢٨٧ــ بڕوانە پەراوێزی ژمارە ٢٧٣ .

٢٨٨ــ بڕوانە : کاکەی ڕێبوار ، شۆڕشی ئاگریداغ ، سلێمانی ، ١٩٦٠ .

سالی ۱۹٦۰ کاوس قەفتان لەگەڵ دەستەیەك لاوی کوردا چووە سۆڤیەتستان بۆ تەواوکردنی خوێندنی بەرز لە یەکێك لە دەزگا ڕۆژهەڵاتناسی‌یەکانی ئەو وڵاتە[۲۸۹] . کاوس قەفتان‌و مارف خەزنەدار لێنینگرادیان هەڵبژاردو هەردووکیان بە سەرپەرشتیی مامۆستا کوردۆیێف کەوتنە ئامادەکردنی نامەی دوکتۆرا ، ئەویان لەسەر مێژووی نوێی کوردو ئەمیشیان دەربارەی ئەدەبی کوردی .

سالی ۱۹٦٤ کاوس قەفتان بڕوانامەی دوکتۆرای وەرگرت‌و دوای ئەوە بۆ ماوەی سێ ساڵێك هەر لە لێنینگراد بە کاری زانستەوە خەریك‌بوو . بەرهەمی ئەوساڵانەی نامەی دوکتۆراکەی‌و باسێکی گەورەی تر بوو[۲۹۰] کە هەردووکیانی بۆ لێکدانەوەی چەند لاپەڕەیەکی بایەخداری مێژووی بزوتنەوەی نەتەوەیی کورد تەرخان‌کردوون . بەیاریدەی پتر لە ۱۰۰ سەرچاوەو بەڵگەو نامەی تایبەتی‌و ڕۆژنامەو گۆڤار کاوس قەفتان لە ۲۳۷ لاپەڕەی نامەی دوکتۆراکەیدا توانیویە بگاتە گەلێك ئەنجامی دروست دەربارەی مێژووی نوێی کوردو لەوڕێگەوە پەردەی لە ڕووی زۆر بیری هەڵەو ڕای چەوتی مێژوونوسە شۆڤێنی‌یەکان هەڵمالیوەو ڕووی ڕاستی گەلێك بەسەرهات‌و ڕوداوی کوردستانی بە دەزگایەکی ئەکادیمیی بەرز سەلماندووە .

---

۲۸۹ــ دوکتۆر کاوس قەفتان سالی ۱۹٥۷ کۆلێجی پەروەردەی لە بەغدا تەواو کردو دەوروبەری سێ ساڵ لە فێرگە ناوەندی‌یەکانی سلێمانی جوگرافیاو مێژووی وتەوە. لە ڕۆژانی خوێندنی‌یەوە لە بەغدا خولیای چیرۆکنوسی لە مێشکی دا . هەر ئەوساش جاروبار وتاری لە ئێزگەی کوردی‌یەوە دەخوێندەوە .

۲۹۰ــ جگە لە چیرۆکەکانی کە هەر ئەوسا یەکێکیانی لە ژمارە یەکی گۆڤاری « پرشنگ »دا بلاوکردەوە .

دوای گەڕانەوەی بۆ نیشتمان دوکتۆر کاوس قەفتان زنجیرەیەك وتاری مێژوویی لە گۆڤارە کوردی‌یەکاندا ، تایبـــەت لـــە « گۆڤاری کۆلیجی ئەدەبیات »دا بڵاوکردەوە ، زوربەیانی بۆ باسی میرنشینی بابان‌و فەرمانڕەوا خودارەکانی تەرخان‌کردوون[۲۹۱]و هەوڵی‌داوە هۆ بزوێنـــە نەبێنراوەکانی دووبەرەکی‌و ناکۆکیی نێوان سەرزدارانی ئەو میرنشینە بدۆزێتەوەو بە ڕقێکی پیرۆزەوە ڕیـسوای کردوون .

جاروبار هەستی نەتەوەیی ناسك لای دوکتۆر کاوس زاڵ‌دەبێ‌و وای لێ‌دەکا « ئاوڕدانەوەی ڕاستەقینە لە دۆخی زەحمەت‌کێشان » بۆ یـــەکێکی وەك بەدرخان پاشای گەورە دروست‌بکات[۲۹۲] هەرچەندە ئەوساکە نە ئەوو نە کەسێکی‌تری وەك ئەوی کوردو ناکورد نە دەیانتوانی‌و نە دەیانخـستە ئاوڕی ڕاستەقینە لە دۆخی زەحمەت‌کێشان بدەنەوە . هـــەر ئەو هەستەش وای‌لێ‌دەکا « زل‌کردنی » مەسەلەی ئاسووری‌یەکانی لا پەســـــند نەبێ هەرچەندە ، وەك دەڵێ ، « لە ڕۆژانی ڕابوردوو و نوێدا گەلێك ڕوداوی لەوە خوێناوی‌تر ڕووی داوەو باسیش نەکراوەو گەورەش نەکراوە»[۲۹۳] ! وەك ئەمیان چاك‌و ئەویان خراپ بێ ، بەڵام ڕاستەکەی ئەویان چاك‌و ئەمیان خراپەو مایەی شەرم‌و جێگەی داخە هیچ ڕوداوێکی خوێناوی لەبەر هەر مەبەستێك بێ بکرێ بە ژێر لێوەوە ، یا کاوس وتەنی « باسیش نەکرێ‌و گـــەورەش نەکرێ » .

---

۲۹۱ــ بەوێنە بڕوانە : « چەند سەرنجێك دەربارەی میرنشینی بابان » ، ــ « گۆڤاری کۆلیجی ئەدەبیات » ، بەغدا ، ژمارە ۱۹ ، ۱۹۷٦ ، ل ۱٥٦ ــ ۱۷۲ ، « ئەوڕەحمان پاشا لە تای تەرازوودا » ، هەمان گۆڤار ، ژمارە ۲۰ ــ ۲۱ ، ۱۹۷۷ ، ل ۷۱ ــ ۹۰ .

۲۹۲ــ بڕوانە : دوکتۆر کاوس قەفتان ، لێکۆڵینەوەیێك دەربارەی بزوتنەوەی بەدرخان پاشا ( ۱۸٤۳ ــ ۱۸٤۷ ) ، ــ « گۆڤاری کۆلیجی ئەدەبیات » ، ژمارە ۱۷ ، ۱۹۷٤ ، ل ۷۲ .

۲۹۳ــ هەمان سەرچاوە ، ل ۷۸ .

دوکتۆر ئەحمەد عوسمان ئەبوبەکریش خوێندنی بەرزی لە مۆسکۆ تەواوکردووەو بە هەمان دەستوور نامەی دوکتۆراکەی بۆ بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد لەنێوان سالآنی ۱۹۲۰و ۱۹۲۵دا تەرخانکردووە•ئەویش لەوڕۆژەوەی گەڕاوەتەوە نیشتمان بێدرێغی چاکی لێکردووە بەلاداو قەڵەمی ڕەنگینی بۆ خزمەتی مێژووی کورد خستۆتەکارو گەلێك بەرهەمی بەنرخی پێشکەش بە کتێبخانەی مێژوویی کوردیی کردووە کە زوربەیانی بە زمانی عەرەبی لە ڕۆژنامەی « التآخی »و « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد »و « گۆڤاری کۆلیجی ئەدەبیات »و.گۆڤاری « الثقافه »دا بلآوکردووەتەوە •

هەروەها دوکتۆر ئەحمەد عوسمان سالی ۱۹۷۳ بە عەرەبی کتێبێکی سەربەخۆی ٦۰ لاپەڕەیی بە ناوی « کوردی میللیو برایم پاشا »وە چاپکرد[۲۹٤] • لەو بەرهەمەیدا بە یاریدەی ۱۸ سەرچاوە کە یازدەیان ئینگلیزیو ڕووسین کورتە باسێکی دەربارەی مەلبەندو هەلسوکەوتو ناوی هۆزو عێلو تیرەکانی میللیو بەسەرهاتەکانیانی نووسیوە • لەم چەندانەی دواییشدا دوکتۆر ئەحمەد لە گۆڤاری « الثقافه »دا زنجیرەیەك وتاری دەربارەی کوردستان دوای شەڕی یەکەمی جیهان بلآوکردەوە[۲۹٥] کە پڕن لە بەلگەی گرنگ سەبارەت ڕوداوەکانی ئەو ڕۆژگارە پڕ ئالوگۆڕە • وەك دوایی باسی دەکەین دوکتۆر ئەحمەد لە مەیدانی وەرگێڕانیشدا خزمەتی کەم نییە[۲۹٦] •

---

۲۹٤ـ بڕوانە : الدكتور احمد عثمان ابو بكر ، اكراد الملي و ابراهيم باشا ، بغداد ، ۱۹۷۳ •

۲۹٥ـ دوکتۆر ئەحمەد عوسمان ئەبوبەکر ئەو زنجیرە وتارەی لە گۆڤاری « الثقافه »دا بە ناوی « كردستان في عهد السلام »موە بلآوکردەوە ( دەربارەی بڕوانە ئەو بەشەی کتێبەکەمان کە بۆ باسی بیبلیۆگرافیای مێژوونووسیی کوردیمان تەرخان کردووە ) •

۲۹٦ـ بە پێویستی دەزانم بۆ مێژوو ، تاوەکو کاتی خۆی دێ لە ئێستەوە بەکورتی ، چەند ڕاستییەك لێرەدا بخەمە بەرچاو . وەك لەسەرەوە وتم

بێ گومان بەرهەمەکانی دوکتۆر ئەحمەد عوسمان لەڕووی ناوەڕۆك و سەرچاوەوە دەوڵەمەندن و بەهاو بایەخی باسەکانیان زۆرە ، بەڵام پێم وایە لەڕووی داڕشتنەوە کەمێك لاوازن ، وێنەیەکی دەوڵەمەند لە بیرو مێشکی

---

→

دوکتۆر ئەحمەد عوسمان لە مەیدانی وەرگێڕانی مێژوویشدا خزمەتی کەم نی یە . یەکێك لەو کتێبانەی کردوونی بە عەرەبی و زۆر بەداخەوە تاوەکو ئێستە بڵاونەکراوەتەوە « عادات و ڕسومەتنامە »کەی مەلا مەحمودی بایەزیدی یە کە لە شوێنی خۆیدا باسیمان کرد . سەرەتای کانونی دووەمی ساڵی ١٩٧٨ دەقی عەرەبی یەکەی دوکتۆر ئەحمەدیان بۆ نرخاندن بۆ من نارد ، منیش بێدواخستن ڕۆژی یازدەی کانونی دووەمی هەمان ساڵ ئەم وەڵامەم دایەوە :

« بەڕێز سەرۆکی بەشی مێژوو .

دوای سلاو

کتێبی « عادات و تقالید الاکراد »ی مەلا مەحمودی بایەزیدی کە دوکتۆر ئەحمەد عوسمان ئەبوبەکر کردوویە بە عەرەبی لە هەموو ڕوویەکەوە شایانی پشتگیری یە . بایەخی کتێبی ناوبراو لەوەدایە کە سەرچاوەیەکی ڕەسەن و گرنگە بۆ تێگەیشتنی گەلێك لایەنی خووڕەوشتی کوردان و هەڵس وکەوتی هۆزەکانیان لەسەدەی نۆزدەدا . دانەری پیاوێکی بەتواناو ئایینی بوو کە پێوەندیی لەگەڵ زۆر دەستەو چینی جیاوازی هۆزە کوردەکاندا هەبوو . ئەوەش کە نووسینی « عادات و ڕسومەتنامە » لەژێر سەرپەرشتی و چاودێریی ڕۆژهەڵاتناسی بەناوبانگ ئەلێکسەندەر جابادا بووە لە نرخ و بەهای زۆرتر دەکات . لە دەمێکەوە ئەو کتێبە سەرنجی شارەزایانی ڕاکێشاوە و بۆتە سەرچاوەی گەلێك لێکۆڵینەوەو نامەی زانستی ، هەروەها پتر لە دە ساڵ لەمەوبەر کراوەتە ڕووسی .

« عادات و ڕسومەتنامە » بە جۆرێکی ڕێك وپێك و بێ هیچ لادانێك لەلایەن دوکتۆر ئەحمەد عوسمانەوە کراوەتە عەرەبی ، پێشەکی و لێدوانەکانی وەرگێڕ هەرچەندە کەمن بەڵام ئەوی مەبەستە ڕای دەگەیێنن . ژمارەیەکی کەم سەرنجی تایبەتیم هەیە گەر پێتان پەسندە بە خودی وەرگێڕیان دەڵێم و ئەویش دەتوانێ ئەوانەی پێی یان قایل دەبێ بەئاسانی چاریان بکات . لەگەڵ ڕێزم »

←

خاوەنیاندایە کەچی لە دەربڕین و کێشانیدا کورت دەهێنێ بۆیەکا خوێنەر کەمتر ڕادەکێشێ ، کەرەسەیەکی باش و بەپێزی بەدەستەوەیە بەڵام تائێستە بەتەواوەتی ئەو بەرگە نازدارەی پێ نەچنیوە کە خۆی و هەموو دڵسۆزێك دەیانەوێ • بەوێنە بەلای کەمەوە چوار پێنج یەکی کتێبی .« کوردی میللی »یەکەی قسەی نووسەرانیترە کە بێ لێکدانەوەو هەڵسەنگاندنی

---

به هەمان دەستوور وەك سکرتێری گشتیی کۆڕی زانیاری کوردو وەك نرخێنەر زۆر بەگەرمی پشتگیریی چاپکردنی کتێبی « اکـراد الملي و ابراهيم پاشا »کەی دوکتۆر ئەحمە عوسمان ئەبوبەکرم کردو ئەنجام ئەوەبوو کتێبەکە ساڵی ١٩٧٣ بە یارمەتی کۆڕ چاپکرا .

دیسان کاتی خۆی بەرهەمەکانی دوکتۆر ئەحمەدیان بۆ من و دوو شارەزای‌تر نارد بۆ نرخاندن و من بە دڵی خۆی و خۆم و هەموو دڵسۆزێکی ڕەسەن ، نەك ساختە ، وەڵام دایەوەو تەنانەت نیشانی خۆیشیم دا . بۆ هەمان مەبەست و بە هەمان چەشن جارێکی‌تریش لێکۆڵینەوەیەکی‌تریم زۆر بەرز نرخاند .

ڕۆژ هات و ڕۆژ ڕۆیی تا ڕۆژی نۆزدەی تەشرینی دووەمی ساڵی ١٩٧٩ دەستنووسی ئەو بەرهەمەم کە لەسەر چینی کرێکاری عێراقی نووسیومە بۆ لێکۆڵینەوە پێشکەش بە بەشی مێژووی کۆلیجی ئەدەبیات کرا . لەگەڵ ئەوەش کە دوانی خۆمانە بێ بەزەیی بەربوونە گیانی کتێبەکە بێ هیچ کۆمەکێك ڕێگەی خۆی گرت و چاپکراو بووە بەیەك لەو تەنها دوو کتێبەی ساڵی ١٩٨١ دە هەزار دانەیان لێ بڵاوکرایەوەو لە یەکەم دوو مانگی دەرچوونیدا زوربەی ڕۆژنامەو گۆڤارە عێراقیی‌یەکان ( «الجمهورية»و « العراق »و «الثقافة»و « وعي العمال »و « حراس الوطن »و هی‌تر ) زۆر بەرز نرخاندیان و تەنانەت ڕۆژنامەی « الجمهورية » لە ماوەی حەفتەیەکدا دوو وتاری گەورەی دەربارە بڵاوکردەوە ( بڕوانە : « الجمهورية » ، بغداد ، ١ و ٩ كانون الثاني ١٩٨٢ ) کە پێم وایە بەر لەوە شتی‌وای بۆ هیچ کتێبێك نەکردووە . لە ماوەی مانگێکدا گۆڤاری « وعي العمال »یش دوو وتاری دوو نووسەری جیاوازی دەربارە بڵاوکردەوە ( بڕوانە : « وعي العمال » ، بغداد ، العدد ٦٤٥ ، ١٢ كانون الاول ١٩٨١ ، ص ٤٥ ــ ٤٦ ، العدد ٦٥٠ ، ١٦ كانون الثاني ١٩٨٢ ، ص ٤٨ ــ ٤٩ ) . گەلێك نامەی نرخاندنم دەربارەی ئەو کتێبەم بۆ هات ، یەکێکیان نامەی مێژوونووسی

پێویست وەك خۆیان یەك لەدوای یەك ڕیزی کردوون ، لە چەند لاپەڕەیەکی کەمی ئەو کتێبەیدا پتر لە ٣٠ جار دەڵێ میلینگن یا مارك سایکس یا نیکیتین یا لۆنگریگ یا ئەمین زەکی وتی‌و بە دەیان دێڕ لە دەقی قسەکانیان دەهێنێتەوە .
بە هەمان دەستوور لە هەر ٢٥ بەشەکەی زنجیرە وتارەکەی « الثقافە »یدا زۆر بەدەگمەن هەست بە بوونی دوکتۆر ئەحمەد خۆی دەکەیت .

---

بەناوبانگ عەبدولڕەزاق حەسەنی‌یە کە بەڕاستی شەرمەدەکەم لێرەدا پیاهەڵدانە بێ‌ئەندازەکەی بهێنمەوە . بە بۆنەی دەرچونی ئەو کتێبەوە دوکتۆر مستەفا عەبدولقادر نەجاری بەڕێوەبەری گشتیی «مرکز دراسات الخلیج العربی » بە ڕەسمی دەعوەتی بەسرەی کردم .
هەرگیز نەمدەزانی لەو هەڵوەستەی برادەرە کوردەکانم بەرامبەر کتێبەکەم خراپتریش هەیە . بەڵام خوا کاریان ڕاست کات دیسان هەردوکیان تێیان‌گەیاندم ئەوی بە خەو چاوەڕوان ناکرێ لە ژیاندا بەئاسانی دەستەو یەخە تووشت‌دێ . ماوەیەك لەمەوبەر داوای تەرفی‌یەم کرد بۆ پلەی « استاذ »ی ، بەرهەمەکانم نێرران بۆ سێ شارەزا کە زۆر بەرزیان نرخاندبوون . دوای ئەوە ، وەك بڵاوبۆوەو منیش وەك هەموان بیستمەوە ، داوایان لە یەکێك لە مامۆستا کوردە کۆنەکانم کردبوو بە یاریدەی دوکتۆر ئەحمەد هەر ئەوەندە بڵێ کە ئایا باسەکانم لە دوو نامەی دوکتۆراکەم وەرگیراون یا لەگەڵیان جیاوازن.ماڵیان ئاوا بە هەردووکیان ٦ لاپەڕە تۆمەتیان بۆ پڕکردبوومەوە کە دەبوو زۆر بە لای کەمەوە بینە هۆی دەرکردنم . هیچ کاتێك وەك ئەو ڕۆژە لە ژیان وەڕس نەبووم ، نەك تەنها لەبەرئەوەی کوردم ، بەڵکو لەبەرئەوەش کە بەدرێژایی ژیانم‌و تا ئەوەندەی تەشرینی دووەمی ساڵی ١٩٨١ ئەو مامۆستایەم لە ڕێزی زۆرو خۆشەویستیی ڕەسەن بەولاوە شتێکی‌تری لە من نەدیبوو . زۆر بە ناچاری بە حەفدە لاپەڕە وەڵامم‌دانەوەو دوو شارەزای‌تر سەرتاپای ڕاپۆرتەکەی ئەوانیان ڕەت کردەوەو ئینجا باسەکانم نێرران بۆ سێ پسپۆڕ لە دەرەوەی عێراق کە ئەوانیش زۆر بەرزیان نرخاندبوون ، بەڕادەیەك ، وەك بیستمەوە ئەلئیستە دەگمەن نرخاندنی‌وا بەرز لە دەرەوە بۆ کەس هاتۆتەوە .
هیوادارم خوێنەری بەڕێز لە دواڕۆژێکی زوودا درێژەی ئەم باسانە لەو کتێبەمدا بخوێنێتەوە کە بە ناوی « خەڵك »ەوە دەستم بە دانانی کردووە.دڵنیام لەوەی «خەڵك» (الناس) پڕ دەبێ لە دەرس بۆ ئەوەی ئیمڕۆو دواڕۆژمان .

هیچ لەڕاستی دوورناکەومەوە گەر بڵێم ئەم وردە کەمو کورتی‌یانە نە زۆرو نە کەم لە نرخو بایەخی بەرهەمەکانی دوکتۆر ئەحمەد عوسمان ئەبوبەکر کەم‌ناکەنەوە . دڵنیام گەلێك بەرهەمی بەکەلکی‌تر لە خامەی ئەو مێژوونوسە قاڵبووەمان ، کە بەسەر هەموو مەرجە پێویستەکانی نوسینی مێژوویــدا زاڵە ، دەکەوێتەوە .

مێژووی نوێ سەرنجی ژمارەیەکی‌تر لە ڕووناکبیرانی کوردی ڕاکێشاوە کە هیچ‌کامیان لە مەیدانی مێژوونووسـیدا پسپۆڕ نین ، بـەڵام دڵسۆزی خستونی‌یە سـەر ئـەو ڕێگە چاکە . عەبدولعەزیز یامولکیی کوڕی مستەفا پاشای بەناوبانگ جگە لەو وتارانەی زوو لە گۆڤاری «ژین»ی ئەستەموولدا بڵاوی‌کردوونەوەو کاتی خۆی باسـمان‌کردن سـالی ١٩٤٦یش کتیبی « کوردستانو شۆڕشەکانی کورد »ی بـە زمـانی تورکی لـە تاران چاپ‌کردووە[٢٩٧] . لەوکتێبەیدا کە ٩٥ لاپەڕەیە عەبدولعەزیز یامولکی بـە کورتی باسی ڕابوردووی کوردو سنووری نیشتمانی‌و پێوەندی بەئەرمەنەوەو کوردستان لە ڕۆژگاری زووی عوسمانی‌یانو سەردەمی فەرمانڕەوایی سوڵتان عەبدولحەمیدو تورکانی لاوو شەڕی یەکەمی جیهانو دوای سـەرکەوتنی مستەفا کەمالی کردووە . وادیارە خاوەنی ئـەو بەرهـەمە نیـازی بووە بەرگێکی‌تری بۆ باسی ڕووداوەکانی کوردستانی ئێرانو عیراق تەرخان‌بکات، بەڵام بەداخەوە نیازەکەی بەجێ‌نەگەیاند[٢٩٨] .

خوالێخۆشبوو ڕەمزی قەزاز سالی ١٩٧١ لە « بزوتنەوەی کورد » ا باسی گەلێك ڕوداوی سیاسیی کوردستانی نێوان دەوروبەری نـاوەندی

---

٢٩٧ــ بڕوانە : عبدالعزیز یاملکی ، کوردســـتانو کورد اختلالری ، تهران ، ١٩٤٦ .

٢٩٨ــ لە پێرستی کتێبەکەیو کۆتاییدا یامولکی باسی ئەو نیازەی کردووە ( بڕوانە لاپەڕە ٢و ٩٤ی کتێبەکەی ) .

سەدەی نۆزدەو ناوەندی سەدەی بیستی کردووە[٢٩٩] . عوسمان عوزێریش بە ئەوپەڕی هەستو دڵسۆزی‌یەوە باسی شێخ سەعیدی پیرانو شۆڕشگێڕانی دیاربەکرو خەباتی ڕێکخراوە سیاسی‌یەکانی کوردستانی تورکیای لە کتێبێکی سەربەخۆدا نووسیوە[٣٠٠] . دەربارەی هەمان باسو دیاردە گرنگەکانی ژیانی سیاسیی ئەم چەندانەی دوایی کوردی تورکیا ئەندازیاری ڕووناکبیر صەلاح سەعدوللا زنجیرەیەك وتاری بایەخداری لە ڕۆژنامەی «التآخي»دا بلاوکردەوە کە گەلێك زانیاریی بەکەڵکی کەمزانراوی تیایاندا تۆمارکردبوو[٣٠١] . دیسان هەر ئەو بە ناوی گاڤان ( گاوان )ەوە بە زمانی ئینگلیزی کتێبێکی نازداری بە ناوێکی نازدارترەوە بلاوکردەوە کە لە دەمێکەوە سەرنجی ڕۆژهەلاتناسانی ڕاکێشاوەو بۆتە سەرچاوە بۆ نووسینەکانیان[٣٠٢] . سالی ١٩٥٩ هەمان کتێبی بە دەسکاری‌یەکی کەمەوە بە زمانی عەرەبی بە ناوی خۆیەوە،بەلام لەژێر ناونیشانێکی‌تردا بلاوکردەوە[٣٠٣] . هەندێك جار لای کاك صەلاحی دوورو وردبین هەستو زانست خراپ تێکەڵ بە یەك دەبن . لای ئەو ڕژێمی پاشایەتی عیراق خزمەتی تەنها « ئیمپریالیزمو زەویدارە گەورەکانی باشووری ولاتی »دەکرد[٣٠٤] ، وەك

---

٢٩٩ـ بڕوانە : ڕەمزی قەزلز ، بزوتنەوەی کورد ، سلێمانی ، ١٩٧١ ، ٢٤٨ ل .

٣٠٠ـ بڕوانە : عوسمان عوزێری ، شۆڕشی دیاربەکر ، سلێمانی ، ١٩٦١ ، ٧٤ ل .

٣٠١ـ بڕوانە : « التآخي » ، صفحة الثقافة الكردية ، ٥ و ١٢ تشرين الثاني و ٣ و ١٠ كانون الاول ١٩٧٣ .

٣٠٢ـ بڕوانە :
S. S. Gavan, Kurdistan - divided Nation of the Middle East, London, 1958.

٣٠٣ـ بڕوانە : صلاح‌الدين محمد سعد الله ، كردستان والحركة الوطنية الكردية ، بغداد ، ١٩٥٩ ، ٧٤ ص .

٣٠٤ـ هەمان سەرچاوە ، ل ٦٥ .

سەرەك هۆزو زەویدارە گەورەکانی باکووری وڵات ، واتە دەرەبەگە کوردەکان کەم لە سایەی ئەو ڕژێمەدا حەسابنەوە .

ساڵی ١٩٦٠ کەریم زەند بە عەرەبی کتێبی « بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردستانو ئازەربایجان »ی بڵاوکردەوە[٣٠٥] . بایەخی ئەو کتێبەی زەند لەوەدایە کە خاوەنی بەشێکی زۆری ئەو ڕووداوانەی باسی کردوون بۆ خۆی دیونی . جەبار جەباریش ساڵی ١٩٦٩ بۆ یەکەمجار لە بەرهەمێکی سەربەخۆی ٧٦ لاپەڕەییدا کورتەی مێژووی ژیانو خەباتی دەستەیەك ئافرەتی ناوداری[٣٠٦] وەك حەپسەخانی نەقیبو قەدەمخەیرو عادلە خانی جافو ئەختەری هاوسەری هونەرمەندی نیشتمانپەروەر ڕەشۆڵو خانزادو ڕەوشەن بەدرخانی خێزانی جەلادەت بەدرخانو چەند ئافرەتی بەناوبانگی تری کوردی نووسیوە[٣٠٧] .

ڕۆژنامەنووسیی کوردی یەکێکە لەو لاپەڕانەی مێژووی نوێی کورد کە ماوەیەکە سەرنجی ڕووناکبیرانی کورد ڕادەکێشێ ، ئەوانەی توانیویانە تائێستە هەندێك لایەنی بە باشی ڕوون بکەنەوە . عەلائەددین سەجادیو جەبار جەباریو جەمال خەزنەدارو دوکتۆر کەمال فوئادو محەمەدی مەلا کەریمو دوکتۆر مارف خەزنەدارو دوکتۆر عیزەددین مستەفا ڕەسوڵو حەمەسەعید حەمەکەریمو ژمارەیەك ڕووناکبیریتری کورد هەریەکەیان بەجۆرێك لاپەڕەی جیاوازی ئەو مێژووەیان تۆمارکردووە . بەڵام لەگەڵ

---

٣٠٥ـ بڕوانە : کریم زەندی ، حرکة کردستان واذربایجان التحرریة ، السلیمانیة ، ١٩٦٠ .

٣٠٦ـ بەهۆی هەڵەیەکی چاپی بچوکەوە ناوی ئەم کتێبە ، بەداخەوە ، لە دوالاپەڕەی ئەو کتێبەمدا کە ماوەیەك لەمەوبەر بە ناوی « ئافرەت لە مێژوودا » بڵاوم کردەوە چاپنەبووە .

٣٠٧ـ بڕوانە : جەبار جەباری ، ئافرەتە ناودارەکانی کورد ، کەرکوك ، ١٩٦٩ .

ئەوەش زوربەی بەرهەمەکانیان لە ســـنووری گێڕانەوەی بیبلیۆگرافی هچوونەتەدەرێ .

سالی ۱۹۷۰ جەبار جـەباری یەکـەم کتیبی لـە مەیدانی مێژووی ڕۆژنامەنووســیدا بلاوکردەوە کـــە پاش پێنج ســـال هەر بۆ خۆی هەمسکاری یەکی کەمەوە وەری گێڕایە سەر زمانی عەرەبی و چاپی کرد[۳۰۸] . جمال خەزنەداریش یەکەم ڕووناکیری کوردە کە یەکەم کتیبی بیبلیۆگرافیایی سەربەخۆی دەبارەی ڕۆژنامەنووسیی کوردی بلاوکردوەتەوە[۳۰۹]. هەروەها جمال خەزنەدار لە سێ بەرهەمی سەربەخۆی تردا بە پێشەکیی خۆیەوە وێنەی ژمارەکانی « ڕۆژی کوردستان »و « بانگی کوردستان »ەکانی شێخ مەحمودو « ڕۆژی کورد »ەکەی ئەستەموولی چاپکردووە[۳۱۰] .

سالی ۱۹۷۲ دوکتۆر کەمال فوئاد وێنەی ۲٦ ژمارەی «کوردستان »ی یەکەمین ڕۆژنامەی کوردیی بلاوکردەوە[۳۱۱] . بێ گومان پێشەکی یە یـەك

---

۳۰۸- بڕوانە : عبدالجبار محمد جەباری ، مێژووی ڕۆژنامەگەریی کوردی ، کەرکوك ــ سلێمانی ، ۱۹۷۰ ، ۱۹۰ ل ، جبار جباری ، تاریخ الصحافة الکردیة في العراق ، بغداد ، ۱۹۷٥ .

۳۰۹- بڕوانە : جمال خزنەدار ، ڕابەری ڕۆژنامەگەریی کوردی ، بەغـــدا ، ۱۹۷۳ ، ۱۹۲ ل. زانیاری یە بیبلیۆگرافیایی یەکانی ناو ئەم کتێبە بـــە کوردی و عەرەبی و ئینگلیزی بلاوکراونەوە .

۳۱۰- بڕوانە : « ڕۆژی کوردستان » ، کۆکردنەوەو پێشـــەکیی جـەمال خەزنەدار ، بەغدا ، ۱۹۷۳ ، ۷٦ل. ، « بانگی کوردســـتان » ، کۆکردنەوەو لەسەر نووسینی جەمال خەزنەدار ، بەغدا ، ۱۹۷٤ ، ۱۳٦ ل. ، « ڕۆژی کورد ۱۹۱۳ » ، بلاوکـــردنەوەو پێشـــەکی و لەسەرنووسینی جەمال خەزنەدار ، بەغدا ، ۱۹۸۱ ، ۱۲٥ل .

۳۱۱- بڕوانە « کوردستان » ــ یەکەمین ڕۆژنامەی کوردی ۱۸۹۸ ــ ۱۹۰۲ ، کۆکردنەوەو پێشەکی دوکتۆر کەمال فوئاد ، بەغدا، ۱۹۷۲ ، ۱۰٤ ل .

لاپەڕەیی‌یەکەی دوکتۆر کەمال بە هیچ جۆر لەڕادەی بەرزیی کارە گەورەکەیدا نی‌یە کە لە یەکەم ڕۆژی دەرچوونی‌یەوە بۆتە سەرچاوەیەکی ڕەسـەنی لێکۆڵینەوەی مێژووی ڕۆژنامەنووسی‌و بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد . هەرچەندە « کوردستان » وەك یەکەمین ڕۆژنامە زۆری لەسەر نووسراوە ، بەڵام ئەو باسە هێشتا ئاو زۆر دەکێشێ .

باسەکانی مێژووی نوێ بەگشتی‌و مێژووی بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد بەتایبەتی سەرنجی گەلێك ڕووناکبیری‌تریان ڕاکێشـاوە . لێرەدا دلسۆزیی خوالێخۆشبوو محەمەد تۆفیق وردی تایبـەت خۆ دەنوێنێ . ژمارەی لاپەڕەی کتێبە کوردی‌یەکانی مامۆستا وردی بەتەنها لە هـەزار تێپەڕدەکات[312] . وردی جگە لەوەی گەلێك وتاریشی لـە ڕۆژنامـەو گۆڤارەکاندا بڵاوکردۆتەوە بەرهەمی بە عەرەبیشی کەم نی‌یە کە بەشـێکی دەربارەی مێژووی نوێی کوردە[313] .ناوبراو شـەش لە نۆزدە کتێبـە کوردی‌یەکانی بۆ باسی مێژووی کورد تەرخان‌کردووە کە بەسەریەکەوە ٢٨٧ لاپەڕەن[314] . وادیارە مەبەستی بەرودوای وردی باسی مێژووی کورد بووە

---

٣١٢ــ بڕوانە : نەریمان ، بیبلیۆگرافیای کتێبی کوردی ، ل ٢٨٠ .

٣١٣ــ بەموێنە بڕوانە : محمد توفیق وردی ، الاکراد في الاتحاد السـوفیاتي ، بغداد ، بلا ، ٢٤ ص .

٣١٤ــ دەربارەی ئەو کتێبانەی محەمەد تۆفیق وردی بڕوانە : نەریمـان ، بیبلیۆگرافیای کتێبی کوردی ، ل ٨٨ ، ٩٦ ، ١٢٥ ، ١٢٦ ، ١٢٧ ، ١٣١ .

تا کۆچی دوایی لە ڕۆژی دووی کانونی یەکـەمی سـالی ١٩٧٥دا خوالێخۆشبوو محەمەد تۆفیق وردی گەلێك دەردو ئـازارو نەبوونیی چێشت ، بەڵام هیچ نەیتوانی دەستی لە خزمەتی ئەدەب‌و مێژووی کورد پێ‌هەڵبگرێ . ئەدمۆن سەبری‌و دوکتۆر ئیحسان فوئاد وەك سەربازی تێکۆشەری مەیدانی خەباتی وشەی پیرۆز باسیان کردووە ( بـڕوانە : الدکتور احسان فؤاد ، في ذکری رحیل الکاتب محمد توفیق وردي ، ـ « العراق » ، ٢٣ شباط ١٩٨٣ ) .

بۆیەکا بایەخێکی ئەوتۆی بە جۆری دارشـــتنی بەرهـــەمەکانی نەداوەو لێکدانەوەشی بەجارێك خستۆتە لاوە . لەگەڵ ئەوەش شارەزای چاك دەتوانێ شت لە نووسینە مێژوویییەکانی هەلکرێنێ .

کاری بیبلیۆگرافیو نرخاندن لە مێژوونووسیی کوردیدا هەنگاوی کەمی بەرەوپێش ناوە . نووسینەکانی ئەم مەیدانە یەکجار گرنگە[٣١٥] کەمو پەرشو بلاون[٣١٦] . سەرەتای حەفتاکان حسەین فەیزوللا جاف هەنگاوێکی باشی نا کە دەیتوانی بیکاتە بەردی بناغەی بەرهەمێکی بیبلیۆگرافیایی گەورە . ئەوەبو لە ژمارە یەکی گۆڤاری « ڕۆژی کوردستان »دا ناوی پتر لە ٥٠ بەرهەمو ڕاپۆرتو ڕۆژنامەو گۆڤاری بە شێوازێکی زانستییانەی ورد بلاوکردەوەو کورتەی ناوەرۆکو باسی دانەرو بلاوکەرەوەو شوێنو کاتی چاپکردنیـــانی لەگەڵ نووسی[٣١٧] .

دلسۆزیش لە یەکـــەم ژمـــارەی گۆڤاری « بەیان »دا بە نیـــازی ڕوونکردنەوەی « لایەکی نەزانراوی مێژووی نەتەوەکەمان » باسی ژمارەیەك سەرچاوەی مێژوویی کردووە[٣١٨] . دیسان دلسۆز « بۆ ئـــەوەی مێژووی

---

٣١٥- لە ولاتە پێشکەوتووەکانا بایەخی زۆر بە کاری بیبلیۆگرافیو نرخاندن دەدەن چونکە دەبنە هۆی کەمکردنەوەی ئەرکی ســـەرشانی زانایان . لەوجۆرە ولاتانە گۆڤاری زانستیی ئەوتۆ هەیە پارەی نووسین تەنها بۆ ئەو وتارانە تەرخان دەکات کە خاوەنەکانیان کتێبی نوێیان پێ دەنرخێنن.

٣١٦- هەرچەندە کارە بیبلیۆگرافییەکانی مامۆستا نەریمـــانو کوردەکانی سۆڤیەت گشتین ، بەلام مێژوونووس دەتوانێ کەلکی چاکیـــان لێ ببینێ .

٣١٧- بڕوانە : حسین الجاف ، مراجع مختارة عن الثورة الكردية المعاصرة ،- « شمس كردستان » ، بغداد ، العـــدد الاول ، حزيران ، ١٩٧١ ، ص ٢١ — ٢٨ . ئەوەندەی من ئاگادارم خاوەنی ئەم بەرهەمە لە ناوەندی حەفتاکاندا بەرهەمێکی بیبلیۆگرافیی گەورەتری دانا کە «کۆڕی زانیاری کورد » لێی کڕیەوەو پێموایە ئێستە لە کتێبخانەی کۆڕدا هەلگیراوە .

٣١٨- بڕوانە : « بەیان » ، بەغدا ، ژمارە یەك ، تەشرینی دووەمی ١٩٦٩ . دلسۆز یەکێکە لە ناوناوەکانی محەمەدی مەلا کەریم .

جۆرەکا بایەخێکی ئەوتۆی بە جۆری دارشـــتنی بەرهـــەمەکانی نەداوەو تێکدانەوەشی بەجارێك خستۆتە لاوە . لەگەڵ ئەوەش شارەزای چاك دەتوانێ شت لە نووسینە مێژوویی‌یەکانی هەڵکرێنێ .

کاری بیبلیۆگرافی‌و نرخاندن لە مێژوونووسیی کوردیدا هەنگاوی کەمی بەرەوپێش ناوە . نووسینەکانی ئەم مەیدانە یەکجار گرنگە[٣١٥] کەم‌و پەرش‌و بڵاون[٣١٦] . سەرەتای حەفتاکان حسەین فەیزوڵلا جاف هەنگاوێکی باشی نا کە دەیتوانی ببێتە بەردی بناغەی بەرهەمێکی بیبلیۆگرافیایی گەورە . ئەوەبو لە ژمارە یەکی گۆڤاری « ڕۆژی کوردستان »دا ناوی پتر لە ٥٠ بەرهەم‌و ڕاپۆرت‌و ڕۆژنامەو گۆڤاری بە شێوازێکی زانستی‌یانەی ورد بڵاوکردەوەو کورتەی ناوەڕۆك‌و باسی دانەرو بڵاوکەرەوەو شوێن‌و کاتی چاپکردنیـــانی لەگەڵ نووسی[٣١٧] .

دلسۆزیش لە یەکـــەم ژمـــارەی گۆڤاری « بەیان »دا بە نیـــازی ڕوونکردنەوەی « لایەکی نەزانراوی مێژووی نەتەوەکەمان » باسی ژمارەیەك سەرچاوەی مێژوویی کردووە[٣١٨] . دیسان دلسۆز « بۆ ئـــەوەی مێژووی

---

٣١٥- لە وڵاتە پێشکەوتووەکانا بایەخی زۆر بە کاری بیبلیۆگرافی‌و نرخاندن دەدەن چونکە دەبنە هۆی کەم‌کردنەوەی ئەرکی ســـەرشانی زانایان . لەوجۆرە وڵاتانە گۆڤاری زانستیی ئەوتۆ هەیە پارەی نووسین تەنها بۆ ئەو وتارانە تەرخان دەکات کە خاوەنەکانیان کتێبی نوێیان پێ دەنرخێنن.

٣١٦- هەرچەندە کارە بیبلیۆگرافی‌یەکانی مامۆستا نەریمـــانو کوردەکانی سۆڤیەت گشتین ، بەڵام مێژوونووس دەتوانێ کەڵکی چاکیـــان لێ ببینێ .

٣١٧- بڕوانە : حسین الجاف ، مراجع مختارة عن الثورة الكردية المعاصرة ،- « شمس كردستان » ، بغداد ، العـــدد الاول ، حزيران ، ١٩٧١ ، ص ٢١ - ٢٨ . ئەوەندەی من ئاگادارم خاوەنی ئەم بەرهەمە لە ناوەندی حەفتاکاندا بەرهەمێکی بیبلیۆگرافیی گەورەتری دانا کە «کۆڕی‌زانیاری کورد » لێی‌کڕیەوەو پێم‌وایە ئێستە لە کتێبخانەی کۆڕدا هەڵگیراوە .

٣١٨- بڕوانە : « بەیان » ، بەغدا ، ژمارە یەك ، تەشرینی دووەمی ١٩٦٩ . دلسۆز یەکێکە لە نازناوەکانی محەمەدی مەلا کەریم .

نوێیشمان کوێرنەییتەوە » لە ژمارەیەکی‌تری هەمان گۆڤاردا چەند تێبینی‌و بیرێکی تایبەتی‌ی خۆی دەربڕیوە[٣١٩] .

دوکتۆر ئەحمەد عوسمان ئەبوبەکرو زوبێر بیلال ئیسماعیل‌و کەمال غەمبارو عەبدولغەنی عەلی یەحیاو بەدری‌و حەسەین ئەحمەد جاف‌و فوئاد حەمە خورشیدو محەمەدی مەلا کەریم‌و ژمارەیەك ڕووناکبیری‌تر لە وتاری تایبەتیدا بەرهەمی مێژوویی خۆو بێگانەیان نرخاندووە . جێگەی ئەو وتارانە لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکاندا دیارە ، تایبەت لە « التآخی »و « طریق الشعب »و « الثقافه »و « ڕۆژی کوردستان »و « بەیان »و « هاوکاری »و « العراق »دا[٣٢٠] . بەڵام زوربەی هەرە زۆری نرخاندنەکانمان تاوەکو ئیستە ، بە دەستووری ئەو ڕێبازەی لە ڕۆژهەڵات باوە ، بریتین لە گێڕانەوەی کورتەی ناوەرۆکی بەرهەمەکان خۆیان . جاری وا هەیە خۆشەویستی یا ڕقی نرخێنەر زۆر زەق تێکەڵ بە نووسینەکەی دەبێ . نرخاندن دەبێ هەڵسەنگاندنی بێ‌لایەنی ڕووی چاك‌و دەرخستنی ڕووی لاوازو کەموکورتی‌یەکانی ئەو بەرهەمە بێ کە دەنرخێنرێ . جاروبار نرخاندنی لەو جۆرە بەر چاو دەکەوێ ، وەك ئەو دوو وتارەی کاوەو هەڵۆ لە گۆڤاری « بەیان »دا دەربارەی بەرگی یەکەمی « چیم‌دی »یەکەی ئەحمەد خواجا بڵاویان کردەوە[٣٢١] .

---

٣١٩ـ بڕوانە : « بەیان » ، ژمارە چوار ، ١٩٧٠ .

٣٢٠ـ بۆنمونە بڕوانە نرخاندنی کتێبەکەی دوکتۆر جەلیلی جەلیل دەربارەی ڕاپەڕینە گەورەکەی شێخ عوبەیدوڵلاو کتێبە بەنلوبانگەی ڕامبۆ ( تۆما بوا ) لەلایەن دوکتۆر ئەحمەد عوسمانەوە لە ژمارە یەك‌و پێنج‌و شەشی ساڵی ١٩٧١ی گۆڤاری « ڕۆژی کوردستان »دا ، یا نرخاندنی کتێبەکەی زوبێر بیلال ئیسماعیل دەربارەی ئیبن‌خەلەکان لەلایەن عەبدولغەنی عەلی یەحیاوە ( بڕوانە : « العراق » ، ١٣ کانون الاول ١٩٧٩ ) .

٣٢١ـ بڕوانە : کاوە ، بەرگی یەکەمی چیم‌دی‌و چەند سەرنجێکی ڕەخنە



وەرگێڕانی بەرهەمی مێژوویی لە تێکڕای مێژوونووســـــی کوردیدا هەنگاوی باشتری ناوە • ڕەفیق حلمی سالی ١٩٣٤ یەکەم بەرهەمی مێژوویی کردە کوردی کە بریتی‌یە لە بەشێکی کتێبێکی فەرەنسەیی دەربارەی مێژووی نوێی عیراق • ئەو کتێبە کە بەبۆنەی وەرگیرانی عیراق بە ئەندامی کۆمەڵی نەتەوەکانەوە دەرچووە باسی مەسەلەی کوردیشی کردووە[٣٢٢] •

محەمەد فیداو قانیعی شاعیرو کەریم زەندو صەلاح سەعدوڵلاو بورهان قانیع چەند بەرهەمێکیان دەربارەی مێژووی کۆن کردۆتە کوردی • یەکەمیان ئەو باسانەی مێژووەکەی ئایەتوڵلا مەردۆخی کە پێوەندی‌یان بە کوردەوە هەیە لە فارسی‌یەوە وەری گێڕاونو بە کوردی‌یەکی ڕەوان بە ناوی « مێژووی کوردو کوردستان »ەوە سەرەتای سالی ١٩٥٨ بە یاریدەی ڕەشید عارف لـــە دوو بەرگدا کە بەسەریەکەوە ٢٦٠ لاپەڕەن چاپی کردوون[٣٢٣] • زوربەی باسەکانی هەردوو بەرگی« مێژووی کوردو کوردستان » لە ڕۆژگاری کۆن دەدوێن ، وەك پەیدابوونی کوردو کوردستانی پێش عیساو مادو مادستان • زمانو ئایینو هۆزو تیرەو ناودارانی کوردیش بەشێکن لە ناوەرۆکی ئـــەو بەرهەمە •

سالی ١٩٧٠ قانیعو کەریم زەند « مێژووی نەژادو پەیوستەگی کورد»ی ڕەشید یاسەمی‌یان بە کوردی بلاوکردەوە کە باسی ڕەگەزو ڕیشەی کوردو

---

←

لێ‌گرتن ، ــ « بەیان » ، ژمارە ســــێ ، نیسانی ١٩٧٠ ، ل٢٨ــ٣١ ، ٣٨ ــ ٣٩ ، هەڵۆ ، ڕووونکردنەوەیەك دەربارەی هەندێك لە باسەکانی چیم دی ، ــ « بەیـــان »، ژمارە پێنج ، کانوونی دووەمی ١٩٧١ ، ل ٣٦ ــ ٣٨ •

٣٢٢ــ بڕوانە : رفیق حلمی ، خلاصەی مسئلەی کورد ، موصل ، ١٩٣٤ •
٣٢٣ــ هەردووکیان لە بەغدا چاپ‌کراونو بە ناوی گۆڤـــاری « هیوا »وە بلاوکراونەوە •

دانیشتوانی دێرینی زاگرۆس‌و گەلە ئاری‌یەکان دەکات[٣٢٤] • بە داخـــەوە ئەوان دەقی فارسیی ئـــەو کتێبەیان وەرنەگێڕاوە کە نزیکـــەی ٢٥٠ لاپەڕەیە[٣٢٥] ، کوردی‌یەکەی قانیع‌و زەند هەمووی بەســـەریەکەوە ١١٢ لاپەڕەیە • بێ‌گومان بایەخی وەرگێڕانەکە زۆر زیاتر دەبوو گەر لە پێشەکی یا پەراوێزی کتێبەکەیاندا بیری خۆیان دەربارەی ڕا چەوتەکانی یاســـەمی دەربڕیبایە • کاتی خۆی قەناتی کوردۆ (کوردۆیێف) لە وتارێکی سەربەخۆدا، کە دوایی دێینەوە سەر باسی ، بەوردی بەرپەرچی یاسەمی داوەتەوە •

سالی ١٩٧٨ بورهان قانیع بەرهەمێکی مێژوویی زۆر گەورەی لـــە بەرگێکی قەشەنگدا پێشکەش بە کتێبخانەی کوردی کرد • ئەو بەرهەمـــە کتێبە بەهادارەکەی ڕۆژهەلاتناسی بەناوبانگی سۆڤیەت پرۆفیسۆر ئیگـــەر میخایلەڤیچ دیاکەنەڤە کە سالی ١٩٥٦ بە زمانی ڕووسی بلاوی‌کردۆتەوەو پاش ماوەیەك کراوەتە فارسی‌و ئەویش لەمیانەوە « بێ دەســـکاری‌و گۆڕین » وەری‌گێڕاوەتە سەر کوردی‌یەکی شیرین‌و پاراو[٣٢٦] • هەرچەندە بورهـــان قانیع نەیتوانیوە لە باسەکانی « میدیا » بدوێ کە ئەوەش کارێکی هـــەروا ئاسان نی‌یەو پسپۆری تایبەتیی پێ‌دەوێ[٣٢٧] ، بـــەلام بەرهەمی کارەکەی یەکجار پەسەندەو بە ڕاستی شایانی قەدرو ڕێزە •

---

٣٢٤ـ بڕوانە : ڕەشید یاسمی ،مێژووی نەژادو پەیوەستەگی کورد ، سلێمانی، ١٩٧٠ •

٣٢٥ـ بڕوانە : رشید یاسمی ، کردو پیوستگی نژادی‌و تاریخی او ، تهران .

٣٢٦ـ بڕوانە : ئی . م . دیاکونوف ، میـــدیا ، برهان قانع لە فارسی‌یەوە کردویەتی بە کوردی ، بەغدا ، ١٩٧٨ ، ٨٨٧ ل .

٣٢٧ـ تلوەکو نیـــتە مێژووی میدیاو مادەکان بەتەواوەتی ساغ نەبۆتەوە ، گەلێك لە باسەکانی بێنەو بەرەی زۆریان لەسەرە .

بایەخی گەورەی کتێبەکەی دیاکەنەف بۆ کورد لەوەدایە کە ، پێم‌وایە ، تائێستە باشترین پوختەی وێنەی ژیانی ژیاریی سەربەخۆی میدی‌یەکانی باپیرە گەورەیان دەخاتە بەرچاوو بەپێچەوانەی گەلێك مێژوونووسی‌ترەوە مێژووی دەسەلاّت‌و فەرمانڕەواییان ناکاتە بەشێك لە مێژووی هەخامەنشی‌یەکان . جگە لەو دوو لایەنە گرنگە لە کتێبی « میدیا »دا گەلێك زانیاریی کەم‌زانراو دەربارەی بەسەرهاتە گەورەکانی ئەو ڕۆژگارەو هۆزو گەلەکانی ناوچەی زاگرۆس دەخوێنی‌یەوە ، ئەوانەی لەنزیکەوە پێوەندیان بە نەژادو ڕابوردووی کوردەوە هەیە .

پێویستە ئەوەش بلێین کە دیاکەنەف کتێبەکەی تەنها بۆ پسپۆرانی مێژوو دانەناوە ، بەلکو ویستوویە زانیاری‌یەکانی ناوی بەجۆرێکی ڕەوان بخاتە بەردەست هەموو ئەوانەی خوێندنەوەی ئەو جۆرە باسانەیان مەبەستە . خوا هەلناگرێ بورهان قانیعیش لە وەرگێڕانەکەیدا بەپێی توانا ئەو لایەنە گرنگەی ڕەچاو کردووەو ویستوویە کارێکی ئەوتۆ بکا کە خوێنەری کورد بەئاسانی لە ناوەرۆکی کتێبەکە تێ‌بگاو بەوجۆرە توانی دیاری‌یەکی بەنرخ پێشکەش بە کتێبخانەی کوردی بەگشتی‌و کتێبخانەی مێژوویی کوردی‌ی بەتایبەتی بکات .

دوای جەلادەت بەدرخان دوو ڕووناکبیری ترمان دیسان پوختەی قسەکانی زەینەفونیان دەربارەی کورد بۆ گێڕاوینەوە ، یەکەمیان صەلاح سەعدوللای زاوای‌و دووەمیان کەریم زەندە . صەلاح سەعدوللا سالی ١٩٧٣ ئەوبەشانەی « ئەناباسیس » کە باسی کوردستانی دێرین دەکەن لە ئینگلیزی‌یەوە کردنی‌یە عەرەبی‌و لە نامیلکەیەکی ٤٦ لاپەڕەیی سەربەخۆدا بلاّوی‌کردنەوە . وابزانم ئەو کارەی مامۆستا صەلاح لە هەموو کارەکانی ئەوانی بەر لەو زیاتر سەرنجی ڕووناکبیری کوردی بۆ زەینەفون‌و ئەناباسیس

ڕاکێشا ، تایبەت لەبەرئەوەش کە وەرگێڕ ناونیشانێکی نوێی سەرنج ڕاکێشی بۆ نامیلکەکەی هەڵبژاردوە[٣٢٨] .

هەرچی کەریم زەندە بەر لەو بەکوردی هەمـــان باسی لە فارسییەوە وەرگرتووەو لە گۆڤاری « ڕۆژی نوێ »دا بڵاوی کردۆتەوە[٣٢٩] . وتارەکەی زەند هەرچەندە دەقی تەواوی قسەکانی زەینەفون نییەو لە شوێنی ناسکدا دەسکاری کراوەو ناوی لێ گۆڕڕاوە ، بەڵام یەکـــەم گێڕانەوەی ڕەوانی کوردیی ئەو سەرگوزوشتە دێرینەیە کە شوێنی لە مێژووی کۆنی کوردا تایبەتییە .

وەرگێڕانی کوردی لە مەیدانی مێژووی سەدە ناونجییەکاندا هێشتا زۆر کزو لاوازەو شتێکـــی ئەوتۆی لـــەوە زیاتر نییە کە تائێستە لەگەڵ ناوی مێژوونونووسانی کوردا خستومانەتە بەرچاو . هەژاری شاعیر جگە لـــە « شەرفنامە »کەی شەرەفخانی بدلیسی کە لە شـــوێنی خۆیدا بەدرێژی باسمان کرد « هۆزی لەبیرکراوی گاوانو گاوانییە بەناوبانگەکان »ی دوکتۆر ستەفا جەودایشی کردۆتە کوردییەکی ڕەوانو لەگـــەڵ پێشەکییەکی دە لاپەڕەییدا ساڵی ١٩٧٣ لە ڕێگـــەی « کۆڕی زانیـــاری کورد »ەوە بڵاوی کردەوە[٣٣٠] . « چمکێك لە مێژووی هـــەورامانو مەریوان » کـــە محەمەدی مەلا کەریم لە فارسییەوە کردوویە بەکوردیو ساڵی ١٩٧٠ لـــە کتێبێکی پەنجا لاپەڕەییدا بڵاوی کردۆتەوە باسی ژمـــارەیەك لە پیـــاوە

---

٣٢٨- بڕوانە : زینفون ، مسیرة العشرة آلاف عبر کردستان ، ترجمة صلاح سعد الله ، بغداد ، ١٩٧٣ ( من مطبوعات « التآخی » ) . سێ هـــەزار دانەی لێ چاپ کراوە .

٣٢٩- بڕوانە : کریم زەندەی ، کوردستـــان لە یادداشتی سەرلەشکری یۆنانی ئەگزینافون ، - « ڕۆژی نوێ » ، ژمـــارە ٣ ، حوزەیرانی ١٩٦٠ ، ل ٢٥ - ٢٩ .

٣٣٠- ١٠٥ لاپەڕەیە . هەژار شیعرەکانی دیـــان بە شیعر دارشتوونەوە .

ئاینی‌یه‌کانی ناوچه‌ی هه‌ورامان‌و موکریان لـه ده‌وروبه‌ری کۆتایی سـه‌ده ناونجی‌یه‌کاندا ده‌کات[٣٣١]. کاکه حه‌مه دوو وتاری جه‌میل به‌ندی ڕۆژبه‌یانیشی له فارسی‌یه‌وه کردووه به کوردی‌و له « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ا بڵاوی‌کردوونه‌ته‌وه، یه‌که‌میان ده‌رباره‌ی «میرنشینی به‌نی‌عه‌یارو ده‌وڵه‌ته‌که‌یان له ڕۆژئاوای ئێراندا »یه‌و دووه‌میان له‌سه‌ر « دینه‌وه‌رو ناودارانی»یه[٣٣٢] .

مێژوونووسه موسڵمانه‌کان هه‌ریه‌که‌یان به‌جۆرێك باسی کوردو ناوچه کورده‌واری‌یه‌کانیان کردووه . نووسینه‌کانی ئه‌وان سه‌رچاوه‌ی ڕه‌سه‌نن بۆ لێکدانه‌وه‌ی مێژووی سه‌ده ناونجی‌یه‌کانی گشت ڕۆژهه‌ڵات . کۆکردنه‌وه‌و وه‌رگێڕان‌و لێکدانه‌وه‌ی ئه‌و به‌شانه‌ی کتێبه مێژوویی‌یه کۆنه ئیسلامی‌یه‌کان که باسی کورد ده‌که‌ن ئه‌رکێکی گه‌وره‌و پێویسته بۆ ڕوونکردنه‌وه‌ی گه‌لێك لایه‌نی ڕابوردووی کوردو کوردستان .

له مه‌یدانی وه‌رگێڕانیشدا دیسان مێژووی نوێ شـوێنی یه‌کـه‌می گرتۆته‌وه . محه‌مه‌دی مه‌لا که‌ریم‌و جه‌لال ته‌قی‌و شـێخ مارفی قه‌ره‌داغی‌و دوکتۆر ئه‌حمه‌د عوسمان ئه‌بوبه‌کرو دوکتۆر کاوس قه‌فتـان‌و ژمـاره‌یه‌ك ڕووناکبیری‌تر به‌پێی توانا کـه‌م‌و زۆر کتێبخـانه‌ی مێژوویی کوردی‌یان ده‌وڵه‌مه‌ند کردووه . یه‌که‌میان لـه کوردی‌یه‌وه بۆ عه‌ره‌بی‌و له‌میانه‌وه بۆ ئه‌ویان چه‌ند به‌رهه‌مێکی وه‌رگێڕاوه که « مێژووی میرانی سوران »ه‌کـه‌ی حه‌سه‌ین حوزنی موکریانی یه‌کێکیانه[٣٣٣] . پاش ماوه‌یه‌ك « کوردستان له

٣٣١ـ له کتێبی « نور الانوار »ی عه‌بدولصه‌مه‌د سه‌ید صالحی مورادی‌یه‌وه وه‌ری‌گێڕاوه‌و له به‌غدا چاپی‌کردووه .

٣٣٢ـ بڕوانه :«گۆڤاری کۆڕی زانیـاری کورد »، به‌رگی پێنجه‌م ، ١٩٧٣ ، ل ٤٧٩ ـ ٥٠٥ ، به‌رگی شه‌شه‌م ، ١٩٧٨ ، ل ٥٤٣ ـ ٥٩١ .

٣٣٣ـ بڕوانه : حسین حزنی المکریانی ، موجز تاریخ امراء سوران ، نقله الی العربیة محمد الملا عبدالکریم ، بغداد ، بلا ، ٨٩ ص . وه‌ك خۆی ده‌ڵێ ساڵی ١٩٦٨ چاپی کردووه .

ساڵەکانی شەڕی یەکەمی جیهاندا »شی کردە عەرەبی‌و لە ڕێگەی « کۆڕی زانیاری کورد »ەوە بلاوی‌کردەوە[٣٣٤] . هەروەها کاکەحەمە لە عەرەبی‌یەوە چەند بەرهەمێکی دەربارەی مێژووی نوێی ڕووسیا وەرگێڕاوەتە سەر کوردی[٣٣٥] .

ڕووناکبیری کورد چاکدەزانێ وەرگێڕانەکانی کاکەحەمە چ لە کوردی‌یەوە بۆ عەرەبی‌و چ لە عەرەبی‌یەوە بۆ کوردی چەند ڕەوانو ڕێکوپێکن ، بەلاّم بەداخەوە خامەی ئەو وەرگێڕە گەورەیەمان بەوجۆرەی پێویستە هەرگیز پەیڕەویی مەرجە زانستی‌یەکانی هونەری وەرگێڕان ناکات. بەوێنە کە « مێژووی میرانی سۆران »ەکەی حسەین حوزنی موکریانی‌ی کردۆتە عەرەبی هەر لەخۆیەوە وشەی ( کورتە )ی خستۆتە پاڵ ناوە عەرەبی‌یەکەی‌و کردوویەتە « موجز تأریخ امراء سوران » ، تەنانەت بێ‌ئەوەی لە هیچ شوێنێکی کتێبەکەشدا بلێ کارێکی وام کردووە . هەرچەندە ناوی کتێبەکە بەو « موجز »ەوە زۆر زیاتر لەگەڵ ناوەرۆکیدا دەگونجێ ، بەلاّم ئەو کارە بەپێودانی زانست ڕەوا نی‌یە[*]. جگە لەوە کاکە حەمە زۆر دەگمەن لە ناوەرۆکی ئەو بەرهەمانەی وەریاندەگێڕێ دەدوێ . بەوێنە تەنها چوار پەراوێزی وەرگێڕ سەرتاپای ٨٩ لاپەڕەکەی مێژووی میرانی سۆرانیان

---

٣٣٤- بڕوانە : الدكتور كمال مظهر احمد ، كردستان في سنوات الحرب العالمية الاولى ، ترجمة محمد الملا عبدالكريم ، بغداد ، ١٩٧٧ ، ١٦ ص.

٣٣٥- بڕوانە : « لینینی مەزن » ، بەغدا ، ١٩٧٠ ، ١١٤ ل. ، « شۆڕشی ١٩٠٥ - ١٩٠٧ » ، بەغدا ، ١٩٧٥ ، ٣٠ ل .

(*) لەم چەندسانەدا کاکە حەمە پێی‌ڕاگەیاندم کە ئەو « مێژووی میرانی سۆران »ەکەی لە چاپێکی کۆنی ڕۆژگاری مامۆستا حوزنی‌یەوە کردووە بە کوردی‌و لەوێدا وشەی « موجز » هەیە . من بەش بەحاڵی خۆم ئەو چاپەم نەدیوە . جا گەر وابێ‌و ، دیارە واشە ، ئەوساکە ڕەخنەیەکی تر لە گەردنی کاکە حەمە دەئاڵێ ، دەبوو لەپێشەکیی وەرگێڕانەکەیدا ئەو ڕاستی‌یەمان بۆ ڕوون بکاتەوە .

ڕازاندۆتەوە کە ئەوانیش سیانیان سەرپێین. دیسان زوربەی وەرگێڕانەکانی کاکەحەمە پێویستیان بە پێشەکیی شیاوو گونجاوە لەگەڵ ناوەرۆکی ئـــەو بەرهەمانەی وەریاندەگێڕێ . لێرەشدا دێمەوە ســــەر « مێژووی میرانی سۆران » کە دوو وشە پێشەکیی بۆ نەنووسیوە ، هیچنەبێ بۆئەوەی بـــە خوێنەری عەرەب بڵێ مامۆستا حسین حوزنی موکریانی کێیە ! .

با ئەوەش بڵێم کە من ئەم وردە تێبینیانە تەنها لەبەرئەوە دەخەمە بەرچاو چونکە دڵنیام لەوەی خامەی ڕەنگینی کاکەحــەمە هێشتا زۆری لەباردایە ، ئەگینا هیچ کامێك لە ڕەخنەکانم لەوانە نییە لە پایەی بەرزی ئەو ڕووناکیرە چالاکەمان کەمبکاتەوە[٣٣٦] .

گەر ئەوانەی لە مێژوودا پسپۆڕنو تا ئیمڕۆکە ، بەداخەوە ، ڕەنگیــان هەبەو دەنگیان نییە ، وەك جەلال تەقیی ئەندازیار خۆیان هیلاك کردبایـــە هەڵبەت کتێبخانەی مێژوویمان ئیستە ڕازاوەتر دەبوو لەوەی هەیە[٣٣٧] . ساڵی ١٩٧٠ جەلال تەقی یەکێك لە بەرهەمە نایابەکانی کوردناسی سـۆڤیەتی بەناوبانگ نەفتوللا ئەرۆنەڤیچ خالفینی کردە کوردیو لـە کتێبێکی ٢٢٠ لاپەڕەیدا بڵاوی کردەوە . کەم بەرهەمی مێژوویی تائیستە توانیوییە وەك

---

٣٣٦ـ کاکە حەمە ئەوەندەی بەسە کە ژمارەی لاپەڕەی تەنها کتێبە کوردییەکانی تاوەکو ئیستە لە دوو هەزار تێپەڕی کردووە . بەپێی بیبلیۆگرافیاکەی مامۆستا نەریمان کە ساڵی ١٩٧٧ چاپکراوە کاکە حەمە ١٢ کتێبی کوردیو ١٨٨٢ لاپەڕەی هەبەو هەشتەمین شوێنی لەناو نووسەرانی کوردا بەرکەوتووە ( بڕوانە : « بیبلیۆگرافیای کتێبی کوردی ١٨٧٨ ـ ١٩٧٥ » ، ل ٢٦٣ و ٢٨١ ) .

٣٣٧ـ ڕێگە بە خۆم دەدەم لێرەدا بەئاشکرا گلەیی تەنهـا لە دوکتۆر جەبـار قادر بکەم چونکە پێوەندیم لەگەڵی لەسەر بناغەی مامۆستایی‌و برایی دارێژراوە . لە ماوەی دوازدە ساڵەی ژیانی مامۆستاییم لـە زانکۆی بەغدا زۆر دەگمەن تووشی قوتابی لێهـاتووی وەك ئـــەو هاتووم . زۆریشم دەربارەی لە مامۆستاو هاوەڵەکانم بیستۆتەوە ، بۆیەکا پێم سەیرە گرێی بەختی مێژوونووسیی کوردی وا لەعاستیا چۆتە بەستن.

کتێبەکەی خالفین باسی سەرەتای چاوتێبڕینی دەوڵەتە گەورەکان لە سامانو شوێنی ستراتیژی کوردستانمان بۆ شیدەکاتەوە ، ئەو باسە گرنگەی زۆر بەداخەوە تاوەکو ئێستە بە باشی لە خۆیو ئەنجامەکانی تێنەگەیشتووین ، لەبەرئەوە جەلال تەقی چاکی کردووە ئەو کتێبەی خالفینی کردۆتە کوردی ، سەردەستەی وەرگێڕانەکانی ، تەنها ئەوەندە هەیە کە لە وەرگێڕانی ناوی کتێبەکەدا ، پێم وایە ، کەمێك کەوتۆتە هەڵەوە چونکە « بەربا زا کوردستان»ی ڕووسی بە هیچ جۆر « خەبات لەڕێی کوردستاندا » بۆ ناوەڕۆکی کتێبەکەی خالفین ناگەیێنێ[٣٣٨] ، بێ گومان دەوڵەتە گەورەکان خەباتیان لە ڕێی کوردستاندا نەکردووە ، ئەوان لەسەر خاکو سامانی لە زۆرانبازیو دووبەرەکیو ململانێدا بوون ، ئەوەی خالفین لە هەر شت زیاتر بایەخی پێداوەو هەوڵی داوە لایەنە شاراوەکانی بدۆزێتەوە ، هەرچەندە ئەو هەڵەیەی جەلال تەقی تێکەڵ بە بەرهەمی مێژوویی‌تر مان بووە[٣٣٩] ، بەلام دوکتۆر ئەحمەد عوسمان ئەبوبەکر دروست ناوی کتێبەکەی کردۆتە عەرەبی: « الصراع على كردستان »[٣٤٠] ، وەك لە بەشی یەکەمدا وتمان جەلال تەقی شەڕەکانی ئەسکەندەری گەورەشی لە سەرچاوەیەکی ڕەسەنی کۆنەوە کردووە بە کوردی ،

«کوردستانو کێشەی کورد»ەکەی میخائیل سیمیۆنەڤیچ لازەریێف[٣٤١]

---

٣٣٨ــ بڕوانە : ن . ا . خالفین ، خەبات لە ڕێی کوردستاندا ، وەرگێڕانی جەلال تەقی ، سلێمانی ، ١٩٧٠ .

٣٣٩ــ بەوێنە بڕوانە : « گۆڤاری کۆلێجی ئەدەبیات » ، ژمارە ١٧ ، ١٩٧٤ ، ل ٨٠ ، بەراوێزی ژمارە ٨ ، ژمارە ١٩ ، ١٩٧٦ ، ل ١٧٠ ، بەراوێزی ژمارە ١٠ ، ژمارە ٢٠ ــ ٢١ ، ١٩٧٧ ، ل ٩١ ، سەرچاوەی ژمارە ٩ .

٣٤٠ــ ن. أ . خالفين ، الصراع على كردستان ، ترجمة الدكتور احمد عثمان ابو بكر ، بغداد ، ١٩٦٩ .

٣٤١ــ سالی ١٩٦٤ لە مۆسکۆ چاپی یەکەمی ئەو کتێبەی لازەریێف لە ٤٠٠ لاپەڕەدا بڵاوکرایەوە . چاپی دووەمی سالی ١٩٧٢ بە دەستکاری‌یەکی کەمەوە لەژێر ناوی « مەسەلەی کورد ١٨٩١ ــ ١٩١٧ » لە ٤٧٢ لاپەڕەدا دیسان لە مۆسکۆ بڵاوکرایەوە .

که بەڕاستی لە وێنەی کەمەو تەواوکەری کتێبەکەی خالفینە لـــە دەمێکەوە سەرنجی دوکتۆر کاوس قەفتانو جەودەت بیلال ئیســـماعیلی ڕاکێشاوە ، یەکەمیان کردوویەتە کوردیو بەشێ زۆری لە ئیزگەوەو بەشی کەمی لـە ڕۆژنامەو گۆڤارەکاندا بلاوکردۆتەوەو نیازییە بەسەر یەکەوە لـە کتێبێکی سەربەخۆدا چاپیبکات • هەرچی جەودەت بیلال ئیسماعیلە زنجیرەیەکی بـە عەرەبی لێ بلاوکردۆتەوە • باسەکانی ناو ئەو کتێبەی لازەریڤ پێویستیان بە لێدوانو ڕوونکردنەوەی زۆرە •

کتێبی « کورد »ی مینۆرسکی کە دوکتۆر مارفخەزنەدار کردوویەتە عەرەبی[٣٤٢]و تایبەت ئەو بەشەی کتێبە گەورەکەی ئەولیا چەلەبی کە سەعید ناکام کردوویە بە کوردی[٣٤٣] لەو سەرچاوانەن کە کەرەســەی باش ئەدەن بە دەست مێژوونووسەوە •

وەك وتمـان ڕووناکبیرانمان دەیانتوانی لـە ڕێگـەی وەرگێڕانەوە کتێبخانەی مێژوویمان دەولەمەندتر بکەن • گەلێك بەرهەمی بەکەڵك هەن کە خۆو بێگانە زۆر کەمیان دەربارە دەزانن ، تایبەت ئەوانەیان کە نووسەرانی کورد بە زمانیتر دایانناون ، وەك کتێبە نایابەکەی دوکتۆر نوری دەرسیمی کە ساڵی ١٩٥٢ لە حەلەب بەتورکی چاپی کردووەو گەلێك زانیاریی بەکەڵكو دەگمەنی دەربارەی خەباتی کوردی تورکیـا تێــــدا بلاوکردۆتەوە ( ٣٤٠ لاپەڕەیە )[٣٤٤] •

---

٣٤٢ـ بڕوانە : ف . ف . مینورسکی ، الاکراد . ملاحظات وانطباعات ، ترجمه وعلق علیه وقدم له الدکتور معروف خزنەدار، بغداد ، ١٩٦٨ ، ٩٨ص.

٣٤٣ـ « کورد لە مێژووی دراوسێکانیدا . سیاحەتنامەی ئەولیا چەلەبی‌ی » وەرگێڕانی سەعید ناکام ، لە چاپکراوەکانی « کۆڕی زانیاری کورد » ، بەغدا ، ١٩٧٩ ، ٣٧٥ ل .

٣٤٤ـ بڕوانە : Dr. Vet. M. Nuri Dersimi, Kurdistan Tarihinde Dersim, Halep, 1952.

تائیستە چەند جارێك دەنگی مێژوونووسی کورد لە کۆنگرە تایبەتیو گشتییەکاندا بەرزبۆتەوە • مێژوونووسە کوردەکانی سۆڤیەتو لە سەرو هەموویانەوە مامۆستا کوردۆیێف بەشداری لەو کۆڕە زانستییانەدا دەکەن کە دەزگا ڕۆژهەلاتناسییەکانی ئەو ولاتە دەیانبەستن • لە یەکەم کۆبوونەوەی گشتیی ئەو کۆنگرە گەورەیەدا کە ئامۆژگای گەلانی ئاسیای سەر بە کۆڕی زانیاری سۆڤیەت لە ٢٢وە تاوەکو ٢٦ی مایسی سالی ١٩٦٢ لە باکۆ گرتی دوکتۆر ڕەحیمی قازی دووەم وتاری بەم ناوەوە خوێندەوە : « لێکۆلینەوەی مێژووی بزوتنەوەی نەتەوەیی ــ ڕزگاریخوازی گەلی کورد » • هەر لەو کۆڕەدا دوو کوردناسی سۆڤیەتی دوو وتاری تریان دەربارەی مێژووی کورد پێشکەشکرد ، یەکەمیان دوکتۆر خالفین بوو کە باسی « بلاوبوونەوەی دەسەلاتی بەریتانیا »ی بەناو کوردستانی سەدەی نۆزدەمیندا کردو دووەمیشیان ڕۆژهەلاتناسی ئەرمەنی دوکتۆر گ • ب • ئاکۆپۆڤ بوو کە وتارەکەی بۆ باسی « پەرەسەندنی پێوەندی سەرمایەداری لە کوردستانی ئێران »دا تەرخان کردبوو •

لە ڕۆژی ٢٥وە تاوەکو ٣٠ی مارتی سالی ١٩٧٣ لە بەغدا کۆنگرەیەکی مێژوویی گەورە بەسترا کە ژمارەیەکی زۆر لە مێژوونووسانی عیراقو عەرەبو جیهان تێیدا بەشدار بوون • کارە زانستییەکانی کۆنگرە بەسەر سێ لیژنەدا دابەشکران : فەلەستینو خەلیج ، ئیمپریالیزمو بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی نەتەوەیی ، کەلەپووری عەرەب •

لە لیژنەی « ئیمپریالیزمو بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی نەتەوەیی »دا کە من سەرپەرشتیم دەکرد چەند جارێك باسی مێژووی کورد هاتە پێشەوە • دوکتۆر ئەحمەد عوسمان ئەبوبەکر وتاری « چەند لایەنێکی مەسەلەی کورد بەر لە

شەڕی یەکەمی جیهان »ی پێشکەش بەو لیژنەیەکرد[٣٤٥] . منیش باسێکم دەربارەی ســـروشتی بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی ـ نەتەوەیی کورد[٣٤٦] خوێندەوە[٣٤٧] کە بووە هۆی لێدوانێکی گەرم[٣٤٨] .

لە دوا ڕۆژی کۆبوونەوەکاندا لیژنەیەکی تایبەتی بۆ داڕشتنی بڕیارەکانی کۆنگرە دانرا کە ئەمانە ئەندامی بوون : پرۆفیسۆر جاك بێرك ( فەرەنسە ) ، پرۆفیسور کیسیلۆڤ ( یەکیەتی سۆڤیەت ) ، پرۆفیسور فلایش هامنـــەر (ئەڵەمانیا) ، دوکتۆر محەمەد ئەنیس ( میسر ) ، دوکتۆر نیقولا زیادە (لوبنان)، دوکتۆر سەعد زەغلول ( میسر ) ، دوکتۆر عەبدولوەهاب کەیالی ( فەلەستین)، دوکتۆرە خەیریەیە قاسمیەیە ( فەلەستین ) ، دوکتۆر فەیصەل سامیر (عیراق)، مامۆستا محەمەد تۆفیق حسەین ( عیراق ) ، دوکتۆر حسەین ئەمین (عیراق)، دوکتۆر عەبدولئەمیر محەمەد ئەمین ( عیراق )و من . من پوختەی کـــاری لیژنەکەی خۆمم بەمجۆرە پێشکەش بە لیژنەی داڕشتنی بڕیارەکانی کۆنگرە کرد :

« بەشدارانی کارەکانی لیژنەکەمان ، لیژنـــەی ئیمپریالیزمو بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی نەتەوەیی، بایەخی زۆری خەباتی گەلانیان دیارکردو پێیانوایە

---

٣٤٥ـ ڕۆژنامەی « التآخی » دەقی وتارەکـــەی بڵاوکـردەوە ( بـــروانە : « التآخی » ، ٢ نیسان ١٩٧٣ ) .

٣٤٦ـ سەرەتا نیازم نەبوو هیـــچ پێشکەش بکـــەم ، بەتایبـــەتی چونکـە بڕیاروابوو « کۆمەڵی ڕووشنبیری کورد » ئەرکی باسی مێژووی کورد لە کۆنگرەکەدا بگرێتە ئەستۆی خۆی ( بڕوانە : « التآخی »، ١ آذار ١٩٧٣ ) ، بەڵام کە ئەوبان نەبوو ناچار منیش ئەو باسەم پێشکەش‌کرد.

٣٤٧ـ ناوی وتارەکەم « الابعاد والملامح الاســـاسیة لحرکة التحرر الوطني للشعب الکردي » بوو کـــە « التـآخي » دەقەکەی بڵاوکردەوە (بڕوانە: « التآخی » ، ٨ نیـسان ١٩٧٣ ) .

٣٤٨ـ خوالێخۆشبوو صەلاحەددین بەیطارو یوسف ئیبراهیم یەزبەکو دوکتۆر نەزلر حەدیسیو دوکتۆر بەهجەت کامیل تکریتی لەوانە بوون کە لـــە باسەکانی وتارەکە دووان ( بڕوانە : « التآخی » ، ١ نیسان ١٩٧٣ ).

نابێ بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی عەرەب لە بزوتنەوە ڕزگاریخوازەکانی جیهان جیابکرێتەوە . هەروەها تێگەیشتنی سروشتی نیۆکۆلۆنیالیزم و ڕیسواکردنی بە ئەرکێکی پێویست دەزانن چونکە نیۆکۆلۆنیالیزم مەترسییەکی گەورەو سامناکە بۆ گەلان . بە هەمان دەستوور بەشدارانی کارەکانی لیژنەکـــەمان بایەخێکی زۆریان بە خەباتی هاوبەشی عەرەب و کورد داو بەیانـنـــــامەی مێژوویی ئازاری بەرز نرخاندو گەلێك ستایشی پێوەندی مێژوویی بەتین و تێکەڵیی چارەنووس و بەرژەوەندییەکانی نێوان دوو گەلی بـــرا عــەرەب و کوردیان کرد . دڵنیاین لەوەی ناتوانرێ ئەرکەکانی ڕزگاریی ڕاستەقینەو نەهێشتنی دواکەوتوویی و دابڕین کە بوونەتە شــــەقڵی دیاری کۆمەڵگای عەرەب ، جێبەجێ بکرێن بێ هێنانە کایەی مەرجە پێویستەکانی کە بریتین لە دانی سەربەستی بە کۆمەڵانی خەڵك بۆ دەربڕینی خواست و ویستەکانی لەگەڵ یەکگرتنی هێزە نیشتمانی و پێشکەوتنخوازەکانی عــەرەب و بڵاوکردنەوەی زانستی ئەفسانەڕەوێن بۆ نەهێشتنی هـــەر کۆسپێك هــەبێ لــە بەردەم سەرفرازبوونی کۆمەڵایەتی و ڕووناکبیریدا » .

لەسەر پێشنیاری من و پشتگیریی گەرمی خوالێخۆشـــبوو دوکتۆر عەبدولوەهاب کەیالی و جـاك بێرك و کیسیلۆڤ و دوکتۆر محەمەد ئەنیس و دوکتۆر نیقولا زیادەو دوکتۆر فەیسەڵ سامیرو مامۆستا محـەمەد تۆفیـق حسەین لیژنەی داڕشـــتنی بڕیارەکانی کۆنگرە بایەخدان بــە لێکۆڵینەوەی کەلەپوورو مێژووی کوردی کردە بەندی حـــەوتەمی بڕیارەکانی کــە لــە دواکۆبوونەوەی گشتیی کۆنگرەدا خوێندرایەوەو دوایش بڵاوکرایەوە .

هەر ئەوسالەش مێژوونووسیی کوردی دیسان بوونی خۆی سەلماند ، بەڵام ئەمجاریان لە کۆبوونەوەیەکی جیهانیی گەورەتردا . بەبۆنەی یادی ١٥٠ ساڵەی دامەزراندنی ڕۆژهەڵاتناسیی فەرەنسی و یادی ١٠٠ ساڵەی بەستنی یەکەم کۆنگرەی ڕۆژهەڵاتناسی لە پاریس ، لە ١٦وە تاوەکو ٢٢ی تەممووزی

سالی ١٩٧٣ لە سۆربۆنی پاریس کۆنگرەیەکی گەورە بەسترا کە نزیکەی سێ هەزار زاناو پسپۆری دەیان ولات لە کارەکانیدا بەشـــدار بوون . ئـەم کوردانەش وەك وەفدێکی زانستی سەربەخۆ ئامادەی کۆبوونەوەکانی کۆنگرە بوون : دوکتۆرە نەسرین فەخری ، هەژاری شاعیر ، دوکتۆر ئیحسان فوئاد ، دوکتۆر شەفیق قەزاز ،دوکتۆر عیصمەت شەریف وانلی ، دوکتۆر محەمەد نوری عارف ، دوکتۆر موزەفەر نەقشبەندیو من .

ڕۆژی ١٩ی تەمموز یەکێك لە کۆڕەکانی کۆنگرە بە سەرپەرشتی تۆما بواو باریدەی دوکتۆرە جۆیس بلۆ بۆ کوردناسیی تەرخانکراو پێنج باسی تێدا خوێندرایەوە ، باسێکی دوکتۆرە نەسرین فەخریدەربارەی ڕێزمـــانی کوردیو باسێکی دوکتۆر ئیحسان فوئـــاد دەربارەی کارکردنی ئەدەبی ئەوروپایی لە پەخشانی کوردیو باســـێکی دوکتۆر محەمەد نوری عارف دەربارەی کارکردنی زمانو ئەدەبی فارسی لە زمانو ئەدەبی کوردیدا لەگەل دوو باسی مێژوویی کە یەکێکیان دوکتۆر عیصمەت شەریف پێشکەشی کردو دەربارەی کشانی کوردستان بەرەو ڕۆژئاوا لەنێوانی ســـەدەی دەیەمینو بازدەمینـــدا بوو ، ئەویتریشیان وتارێکی من بوو دەربارەی « کێشەکانی نووسینەوەی مێژووی گەلی کوردو ئەرکەکانی کۆڕی زانیـاری کورد » . بەشدارانی کۆڕەکە لە چەند مەسەلەیەکی مێژوویی تـری کورد کۆلینەوە . یەکێکیش لە بڕیارە تایبەتیەکانی کۆنگرە دەربارەی دامەزراندنی «کۆمەڵەی کوردناسیی جیهانی » بوو کە لە دوا کۆبوونەوەی گشتیدا وەك یەکێك لـە ئەنجامەکانی کۆنگرە خوێندرایەوە . هەرچەندە بەهۆی مردنی تۆما بواوە کە بە سەرۆکی کۆمەڵەکە هەڵبژێردرا ، لەگەل چەند هۆیەکیتری ئاشـــکرا ئەو کۆمەڵە تا ئیمڕۆکە هیچی بۆ نەکراوە ، بەلام تەنها بڕیاری دامەزراندنی

له کۆنگرەیەکی جیهانی گەورەدا دەسکەوتێکی گەورە بوو بۆ کوردناسی بەگشتی[٣٤٩] •

ڕووناکبیرانی کوردی سۆڤیەت گەلێك خزمەتیـــان پێشکەش بـە مێژوونووسیی کوردی کردووە • لە بیستەکانەوە دەستکرا بە چاپکردنی ژمارەیەك کتێبی مێژوویی تایبەتی بۆ فێرگە کوردیەکانی ئەرمەنستان • بەرهەمە زووەکانی شامیلۆڤ دەچنە خانەی سەرچاوەی مێژوویشەوە[٣٥٠]• چ ئەوو چ پرۆفیسۆر حاجیە جندیو جاسمی جەلیل لەسەرەتای سیەکانەوە چەند بەرهەمێکی مێژوویییان کردۆتە کوردی •

لەدوای چلەکانەوە مێژوونووسیی کوردیی سـۆڤیەت ڕەنگو بۆی تایبەتیی خۆی وەرگرت • کوردۆیێف لـــەم مەیدانەشدا دەنگی زوڵاڵەو بەرهەمەکانی هەرچەندە لە کەموکورتی بێبەش نین ، بـەڵام جێگـەیان زۆر دیارە ، تایبەت چونکە زوربەیانی بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەو مێژوونووسـانە تەرخانکردووە کە لە بەرهـــەمەکانیاندا بەرامبـــەر مێـــژووی کورد بەهەڵەداچوون[٣٥١] • ساڵی ١٩٥٤ لە وتاری « شێواندنی مێژووی کورد لە

---

٣٤٩ـ بۆ درێژەی ئەو باسانە بڕوانە : « برایەتی » ، بەغدا ، ژمارە ٦٤ ، ١٧ی ئابی ١٩٧٣ ، « التآخی » ، ٥ و ٨ اب ١٩٧٣ •

٣٥٠ـ یەکێك لەو بەرهەمانەی ئەو « دەربارەی مەسەلەی دەرەبەگی لەناو کوردا »یە کە ساڵی ١٩٣٤ بۆ یەکەمجار بە زمانی ڕووسی بڵاوی کردەوەو منیش ساڵی ١٩٧٧ کردمە عەرەبی ( بڕوانە : ا. شـامیلوف ، حول مسألة الاقطاع بين الكرد ، ترجمه وكتب مقدمته وعلق عليه الدكتور كمال مظهر احمد ، بغداد ، ١٩٧٧ ، ١٠٢ ص ) •

٣٥١ـ دوای گەڕانەوەی لە یەکیەتی سۆڤیەت دوکتۆر ئـەورەحمانی حاجی مارف زوربەی ئەو بەرهەمانەی مامۆستا کوردۆیێفی کـردە کوردیو لە کتێبێکی سەربەخۆدا بڵاوی کردنەوە ( بڕوانە : پرۆفیسۆر قەناتی کوردۆ ( کوردۆیێف ) ، هەندێك بیروباوەڕی هەڵە لەبارەی زمـــانو مێژووی کوردەوە ، لە چاپکراوەکانی « کۆڕی زانیاری کورد » ، بەغدا ، ١٩٧٣ ـ ١٩٧٤ ، ١٦٦ ل • ) •

مێژوونووسیی بۆرجوازیی فارسیدا » کوردۆیێف زۆر بەتوندی وەڵامی ڕەشید یاسەمیی داوەتەوەو سەلماندوویە کە کتێبەکەی[٣٥٢] بۆ مەبەستێکی سیاسیی ڕووت ، بۆ بەزۆرکردنی کورد بە فارس دانراوە . ئەمەیان ، بێگومان ، ڕاستەو دروستە ، بەڵام مامۆستا کوردۆ لە وەڵامدانەوەکەیدا زۆر جار ئێرانیو فارسی کردۆتە یەك کە پێموایە ڕەشید یاسەمی بۆ دوو مەبەستی جیاوازی بەکارهێناون، یا هیچ نەبێ زۆر جار هەست بەو جیاوازییە دەکرێ ئەگەرچی خۆیشی ئەوەی نەویستبێ .

بە هەمان دەستوور کوردوێیف بەرپەرچی ڕای ژمارەیەك لە کوردناسانی سۆڤیەتی سەبارەت بە نەژادی کورد داوەتەوە ، تایبەت هی ڤلچێڤسکیو ئاکۆپۆڤ[٣٥٣] . لەوجۆرە بەرهەمانەیدا قەناتی کوردۆ زۆر جار پەنادەباتە بەر سروشتو تایبەتییەکانی زمانی کوردی بۆ زیاتر سەلماندنی ڕەگەزی ڕەسەنی کورد . بەوێنە ڕەشید یاسەمی زۆر لەسەرئەوە ڕۆیشتووە کە گوایە جیاوازی لەنێوانی کوردیو فارسیدا نییە ، کوردۆش وێڕای ئەوەی سەربەخۆیی تەواوی زمانی کوردی لە هەموو ڕوویەکەوە دەسەلمێنێ ئینجا ئەوە دێنێتەوە یاد ڕەشید یاسەمی کە یەکیەتی زمان بەڵگەی بەرودوای یەکیەتی نەتەوەیی نییەو باشترین نمونەی ژیانیش بۆ ئەو ڕاستییە نەرویجو دانیمارکییەکانن کە موویەکی باریك لە ئەوروپادا لێکیان جیادەکاتەوەو بە یەك زمانیش دەدوێنو ئینجا دوو نەتەوەی جیاوازیش پێکدەهێنن !

---

٣٥٢ـ مەبەست « کردو پیوستکی نژادیو تاریخی او »ە کە لەپێشدا باسیمانکرد ( بڕوانە پەراوێزی ژمارە ٣٢٥ ) . کەلپاکوف سالی ١٩٤٣ ئەو کتێبەی ڕەشید یاسەمیی کردۆتە ڕووسی بۆ بەکارهێنانی ڕۆژهەڵاتناسانی سۆڤیەت . دەستنووسی ئەو وەرگێرانە لە کتێبخانەی ئامۆژگای ڕۆژهەڵاتناسی ـ لقی لێنینگراد هەڵگیراوە .

٣٥٣ـ ئەو ڕایانەی کوردۆیێف بۆ لێکۆڵینەوەی زانستی تایبەتی بووە ، بۆیەکا تائێستە بە ڕووسی بڵاونەکراونەوە ، بەڵام دوکتۆر ئەوڕەحمانی حاجی مارف وەریگێراونەتە سەر زمانی کوردی ، ئەوەی بابەخی کتێبەکەی زیاتر کردووە ( بڕوانە ل ١٢١ ـ ١٦٦ی کتێبەکەی ) .

دوکتۆر جەلیلی جاسم[٣٥٤] ژمارەیەك بەرهەمی چاکی دەربارەی مێژووی نوێی کورد بڵاوکردۆتەوە کە لەگەڵ بەرهەمەکانی خالفین و لازەریێقدا تا ڕادەیەکی زۆر زنجیرەیەکی پێکەوە بەستراو دروستدەکەن . لە یەکەم بەرهەمی مێژوویی گەورەیدا دوکتۆر جەلیل باشترین لێکۆڵینەوەی دەربارەی ڕاپەڕینە فراوانەکەی شێخ عوبەیدوڵلای شەمزینی پێشکەش کردووە . ئەو بەرهەمەی[٣٥٥] کە لە کتێبێکی سەربەخۆدا ساڵی ١٩٦٦ بە ڕووسی بڵاوی کردۆتەوە پوختەی بەشێکی سەرەکیی نامەی دوکتۆراکەیەتی کە ساڵی ١٩٦٣ بە ناونیشانی «بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد لە پەنجاکانەوە تاوەکو هەشتاکانی سەدەی نۆزدە » پێشکەش بە ئامۆژگای ڕۆژهەڵاتناسی سەر بە کۆڕی زانیاری سۆڤیەتی کرد . زۆر لایەنی ئەم کتێبە سەرنج ڕادەکێشن ، تایبەت چونکە دانەری دەستی گەیشتۆتە گەلێك سەرچاوەی ڕەسەن و دەگمەن و[٣٥٦] توانیویەیە بکاتە زۆر ئەنجامی ورد کە هیچ گومانێك لە سروشتی ئەو ڕاپەڕینە گەورەیەدا ناهێڵن . ناوی باسە سەرەکییەکانی کتێبەکە بۆی هەیە بیرێکی گشتی دەربارەی ناوەڕۆکی بداتە خوێنەر : بەشی یەکەمی باسی باری ژیانی ئابووری و کۆمەڵایەتی کورد لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەمیندا دەکات ، بەشی دووەمی پێوەندی کورد بە شەڕی ساڵی ١٨٧٧ — ١٨٧٨ی نێوان ڕووسیاو تورکیای عوسمانی ڕووندەکاتەوە ، بەشی سێیەمی ئەو ڕوداوانە دەگێڕێتەوە کە ڕێگەیان بۆ بەرپابوونی ڕاپەڕینی ساڵی

---

٣٥٤ــ دوکتۆر جەلیل کوڕی نووسەری بەناوبانگ جاسمی جەلیلە . جەمیلەی خوشکی و دوکتۆر ئۆردوخانی برایشی خزمەتیان زۆرە ، پێم وایە بنەماڵەی جاسمی جەلیل زیاتر لە هەموو خێزانە کوردەکانی ئەرمەنستان نەریتی کوردەواریان پاراستووە .

٣٥٥ــ بڕوانە : جەلیلی جەلیل ، ڕاپەڕینی کوردەکان ساڵی ١٨٨٠ ، بە زمانی ڕووسی ، مۆسکۆ ، ١٩٦٦ ، ١٣٢ ل .

٣٥٦ــ وەك سەرچاوە ئەرشیفییە کۆنەکان و بەرهەمە ئەرمەنییەکان . ژمارەی سەرچاوە ئەرمەنییەکانی « ڕاپەڕینی کوردەکان » بەتەنها حەڤدەن .

١٨٨٠ خۆش‌کرد ، بەشی چوارەمیشی دێتە سەر باسی ئەو ڕاپەڕینەی عوسمان بەگو حسەین بەگی کوڕانی بەدرخانی گەورە سالی ١٨٧٨ لە جزیر بەرپایان کرد ، بەشی داهاتووی کتێبەکە باسی ئەو هەراوبگرانە دەکات کە ناوچەی هەکاری‌یان گرتەوەو ئینجا لە لاپەڕە ٧٣وە دوکتۆر جەلیل دەگاتە مەبەست‌و دەکەوێتە شی‌کردنەوەی بەسەرهاتەکانی « ڕاپەڕینی کورد بە سەرۆکایەتی شێخ عوبەیدوللا لە ئێران سالی ١٨٨٠ » . لە کۆتایی کتێبەکەشیدا دوکتۆر جەلیلی جەلیل ٢٠ بەلگەو دەکومێنتی یەکجار گرنگی بلاوکردۆتەوە کە هەموویان ڕەوایی ڕاپەڕینەکەی شێخ عوبەیدوللا دەسەلمێنن ، ئەو ڕاپەڕینەی لە یەککاتدا ڕۆژنامە ئینگلیزی‌یەکان بە کاری دەستی ڕووس‌و ڕۆژنامە ڕووسی‌یەکانیش بە پیلانی ئینگلیزیان دادەنا ــ گۆڕی خاوەنەکانیان پڕ لە نوور بێ ــ ئامین !.

دووەم کتێبی مێژوویی دوکتۆر جەلیلی جەلیل دەربارەی « کوردەکانی ئیمپراتۆریی عوسمانی لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەمیندا »یە[٣٥٧] . لەم کتێبەیدا دوکتۆر جەلیل بە پشتیوانی ١٦٤ سەرچاوەی هەمەجۆر کە دیسان بەلگەو دەکومێنتە دەگمەنەکانی ئارشیڤە زۆرەکانی مۆسکۆو لێنینگرادو تبلیسی پایتەختی گورجستان‌و بەرهەمە ئەرمەنی‌یەکان بڕبڕەیانن ، توانیوی‌یە زنجیرەیەك باسی گرنگی مێژووی کورد لە سەردەمێکی زۆر ناسکدا ڕوون‌بکاتەوە ، وەك سروشت‌و خەبات‌و چارەنووسی میرنشینە ناودارەکانی بابان‌و بادینان‌و سۆران‌و بۆتان‌و هەکاری ، جگە لە بزوتنەوە چەکدارەکانی ئەو ڕۆژگارە کە ڕاپەڕینەکانی بەدرخانی گەورەو میری ڕەواندزو یەزدانشێر

٣٥٧ــ سالی ١٩٧٣ لە مۆسکۆ بە ڕووسی چاپ‌کراوە ، ٢٠٠ لاپەڕەیە . من پێشەکی‌و بەشی یەکەمی ئەم کتێبەم کردنە عەرەبی‌و کاتی خۆی لە ڕۆژنامەی « التآخی »دا بلاوم‌کردنەوە ( بڕوانە : « التآخی » ، ١ و ١٥و ٢٢ و ٢٩ تشرین الاول و ٥ و ١٢ تشرین الثانی و ١٠ و ٣١ کانون الاول ١٩٧٣ ) .

له سەروو هەموویانەوەن ‌. بە یاریدەی گەلێك بەڵگەی نەزانراو جەلیلی جەلیل توانیویە بە سروشتی دروستی ڕاپەڕینەکەی یەزدان شێرمان بۆ دیاربکات کە بەهۆی ڕایەکی سەرپێیی دوکتۆر بلەچ شیرکووە[358] دڵی ڕووناکبیری کوردی لێ ڕەنجابوو . هەر لە سەرەتاشەوە دوکتۆر جەلیل باری ژیانی ئابووری و کۆمەڵایەتی و ناوچەی هۆزە گەورەکانی کوردستانی ناو ئیمپراتۆریی عوسمانی لە کۆتای سەدەی هەژدەو نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەدا شی کردۆتەوەو بەوجۆرە ڕێگەی بۆ تێگەیشتنی باشتری باسەکانی ناو کتێبەکەی خۆش کردووە .

جگە لەو دوو کتێبەی و بەرهەمە ئەدەبییە زۆرەکانی[359] دوکتۆر جەلیلی جەلیل زنجیرەیەك وتاری مێژوویشی بڵاوکردۆتەوە ، وەك « دەربارەی باری ژیانی کۆمەڵایەتی و ئابووری کوردی تورکیا لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەمیندا »و « کوردو شەڕی سالی ١٨٧٧ ــ ١٨٧٨ی نێوان ڕووسیاو تورکیا » . هەروەها دوکتۆر جەلیل گەلێك بایەخی بە ژیانی

---

٣٥٨ــ یەزدان شێر ( عزالدین شێر ) خزمی نزیکی بەدرخانی گەورە بوو . « دەردە کورد » بووە هۆی ناکۆکییان لە کاتێکی ناسکدا ، ئەوەی دوکتۆر بلەچ شێرکۆ بە خیانەتو یەکێك لە هۆکانی ژێرکەوتنی بەدرخانی داناوە ( بڕوانە : الدکتور بلەچ شیرکوه ، القضیة الکردیة ، ص ٤٤ــ٤٥ ) . بەڵام زۆری نەبرد یەزدان شێر لە عوسمانییەکان هەڵگەڕابەوەو ڕاپەڕینێکی گەورەی دژیان بەرپاکرد . لە بەشی حەوتەمی کتێبەکەیدا دوکتۆر جەلیل باسی ئەو ڕاپەڕینەی کردووەو گەلێك زانیاریی نەزانراوی دەربارە بڵاوکردۆتەوە .

٣٥٩ــ وەك کتێبی « زارگوتنا کوردا » ( فۆلکلۆری کوردی ) کە سالی ١٩٧٨ لە مۆسکۆ لەگەڵ دوکتۆر ئۆردوخانی براییدا لە دوو بەرگدا چاپیان کردووە ( بەرگی یەکەمی ٥٠٨و بەرگی دووەمی ٥٣٤ لاپەڕەن ) . سالی ١٩٧٢ش هەردووکیان کتێبێکی گەورەیان دەربارەی پەندی پێشینیانی کوردی بڵاوکردەوە کە ١٥ هەزار دانەی لێ چاپکراوە . ئەمجۆرە بەرهەمانەش ، بێگومان ، کەرەستەیەکی باش ئەدەن بەدەست مێژوونووسەوە .

ڕووناکبیریی کورد داوەو زۆر بەرهەمو بەڵگەی کوردیی کۆنی کۆکردۆتەوەو ژمارەیەك لە ڕۆژنامەو گۆڤارە کوردییە زووەکانی دەسکەوتووە[٣٦٠] • لەم مەیدانەشدا جەلیلی جەلیل بەرهەمی هێژای کەم نییە • لە وتاری « گۆڤاری ڕۆژا کورد وەك سەرچاوەی لێکۆڵینەوەی بیری کۆمەلایەتی سیاسیی کوردیی سەرەتای سەدەی بیست » زۆر لایەنی کەم زانراوی یەکەم گۆڤاری ڕۆژنامەنووسیی کوردیی شیکردۆتەوە[٣٦١] • هەر بەو دەستوورەش گەلێك زانیاریی بەنرخی دەربارەی « کوردستان »ی یەکەمین ڕۆژنامەی کوردی لەو وتارەیدا بلاوکردۆتەوە کە نـاوی ناوە « لە مێژووی پەیدابوونی چاپەمەنیی سیاسیی‌کوردی »•لەوێدا ئەو بڕیارەی سوڵتان عەبدولحەمیدی بلاوکردۆتەوە کە عەبدولڕەحمان بەدرخان بە خۆفرۆش دادەنێ چونکە دەست لە دەرکردنی « کوردستان » هەڵناگرێو ناگەڕێتەوە ئەستەموول بۆئەوەی بکرێتە کاربەدەستێکی گەورە • دیارە دەبوو بیری سوڵتان وابێ ، دەشبوو ڕۆژهەلاتناسێکی وەك ماکاش گەلێك ستایشی ئەو ڕووناکبیرە دڵسۆزە بکات

---

٣٦٠ـ زۆر بەداخەوە دوکتۆر جەلیل ئەو بەرهەمو بەڵگە دەگمەنانەی لە حەوت پریاسکەدا قایم‌کردووەو هەزارو یەك مووروی چاوەزاری پیا هەڵواسیون ، ئەو کارەی ، وەك بە خۆیم گوتووە ، لە ڕەفتاری زانای ڕەسەن دوورە .

٣٦١ـ لەو وتارەیدا دوکتۆر جەلیلی جەلیل بەهەڵەداچووە کە دەڵێ ڕەفیق حلمی دەوری لە دامەزراندنی کۆمەڵی « هیوا »ی ئەستەمووڵدا زۆر بووە ( بڕوانە : جەلیلی جەلیل ، گۆڤاری ڕۆژا کورد وەك سەرچاوەی لێکۆڵینەوەی بیری کۆمەلایەتیو سیاسیی کوردیی سەرەتای سەدەی بیست ، ـ « ولاتانو گەلانی ڕۆژهەلاتی نزیكو ناوەڕاست » ، زنجیرەی حەوتەم ـ کوردناسی ، یەریڤان ، ١٩٧٥ ، ل ٧٤ ) . سەرچاوەی دوکتۆر جەلیل بۆ ئەو قسەیەی لاپەڕە ٦١ی ژمارە یەکی ساڵی ١٩٦٠ی گۆڤاری « ژیانی نوێ »یە ، بەلام « ڕۆژی نوێ » مەبەستی ئەو کۆمەڵی « هیوا »یەیە کە ساڵی ١٩٣٨ لە عیراق دامەزرێنراو ڕەفیق حلمی سەرۆکی بالای بوو نەك ئەو کۆمەڵەی دەستەیەك قوتابیی کورد ساڵی ١٩١٢ لە ئەستەمووڵ هەر بەوناوەوە دایانمەزراند .

کە بە دڵێکی فراوانەوە دەستی یاریدەی فێربوونی ئەدەبی کوردیی بۆ درێژ کردووە .

مێژووی هەرە نوێی کوردو تایبەت بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان لەدوای شەڕی یەکەمی جیهانەوە سەرنجی ژمارەیەك لە مێژوونووسانی کوردی سۆڤیەتیان ڕاکێشاوە کە دوکتۆر شاکرۆ مگۆیان ( شاکرۆی محۆی خودۆ ) لە هەموویان چالاكو بەرهەمدارترە . دوکتۆر شاکرۆ کە سالی ١٩٣٠ لە گوندی ئەلەگەز لە ناوچەرگەی کوردەواریی ئەرمەنستانی سۆڤیەتدا لەدایك‌بووە لە سەرەتای ژیانی کاریەوە تێکەڵ بە کۆڕی ڕووناکبیریی کوردیی ئەو وڵاتە بووە . دوای ئەوەی ساڵی ١٩٥٢ بەشی مێژووی ئامۆژگای پەروەردەی ئابۆڤیانی لە یەریڤان تەواوکردو بۆ ماوەی سێ ساڵ هەر لە ئەلەگەز مامۆستایی کرد لە سەرەتای ساڵی ١٩٥٥ەوە بووە بە یەکێك لە نووسەرانی ڕۆژنامەی «ڕیا تازە» (ڕێگەی نوێ)و پاش ساڵێك کرا بە یاریدەری سەرنووسەری ئەو ڕۆژنامەیە .

لە ساڵی ١٩٦٠ەوە دوکتۆر شاکرۆ بووە بە یەکێك لە فەرمانبەرانی بەشی کوردیی تازە دامەزرێنراوی دەزگای ڕۆژهەڵاتناسیی کۆڕی زانیاریی ئەرمەنستانی سۆڤیەت[٣٦٢] . لەوساوە خزمەتە زانستییەکانی دەستپێدەکەن . دوکتۆر شاکرۆ تائێستە دوو کتێبو دەیان وتاری بڵاوکردۆتەوە کە هەموویانی بۆ لێکدانەوەی بزوتنەوەی نەتەوەیی ـ ڕزگاریخوازی کورد تەرخان کردووە ، ئەو باسەی سەرنجی دوکتۆر شەرەف ئەشیریانو دوکتۆر چاچانی کارلێنو ژمارەیەکیتر لە ڕووناکبیرانی کوردی سۆڤیەتی ڕاکێشاوە . دوکتۆر شەرەف لە چەند لایەنێکی ژیانی ئابووریو

٣٦٢ـ ئەو دەزگایە ساڵی ١٩٥٨ دامەزرێنراو ساڵی ١٩٧١ کرا بە ئامۆژگایەکی سەربەخۆ کە لە پێنج بەش پێکهاتووە : وڵاتانی عەرەب ، تورکیا ، ئێران ، ڕۆژهەڵاتی کۆنو کوردناسی .

کۆمەڵایەتیش لە کوردستان کۆلیوەتەوە . چاچانی کارلێنیش کە یەکێکە لە نووسەرو ئەدیبە ناســـراوە کوردەکانی ئەرمەنســـتان یەکێك لە بەرهەمە گەورەکانی خۆی بۆ باسی کوردی دەرسیم لە کۆتایی ســـەدەی نۆزدەوە تەرخان کردووە .

هەرچی دوکتۆر خالیدی مورادی چەتۆ ( چەتۆێیف )ی سەرۆکی بەشی کوردیی ئامۆژگای ڕۆژهەڵاتناسیی ئەرمەنستانی سۆڤیەتە لە هەر باسێك زیاتر بایەخی بە مێژووی کوردەکانی سۆڤیەت‌و کارکردنی شـــۆڕشی ئۆکتۆبەر لە بزوتنەوەی سیاسیی کورددا داوە . چەتۆ ســـاڵی ١٩٦٥ لە یەریڤان بە زمانی ڕووسی کتێبی « کوردی ئەرمەنستانی سۆڤیەت »ی بڵاوکردەوە[٣٦٣] کە بە دیاری پێشکەشی « هاوڕێیەتیی دوو گەلی ئەرمەن‌و کورد »ی کردووە .

لەو کتێبەیدا چەتۆێیف گەلێك بەڵگەو زانیاری‌و ژمارەی دەربارەی ژیانی ئابووری‌و ڕووناکبیری‌و کۆمەڵایەتیی کوردی ئەرمەنستان‌و مێژووی ئاڵوگۆڕەکانیانی بڵاوکردۆتەوە ، ئەوانەی ئاشکرا جیاوازیی بێ‌سنووری نێوان ئیمڕۆو ڕابوردووی ئەو بەشە کەمەی کورد دەخەنە بەرچاو . لەگەڵ ئەوەش سێ ژمارەی بەشی یەکەمی ئەو کتێبە زۆر سەرنج ڕادەکێشن . لـــە لاپەڕە ٢دا دوکتۆر چەتۆێیف دەڵێ بەپێی سەرژمێری ساڵی ١٩٥٩ کوردی سۆڤیەت ٥٩ هەزار کەسن کە ٢٦ هەزاریان لە ئەرمەنستان‌و ١٦ هەزاریان لە گورجستان ( جۆرجیا )و ئەوانی‌تریان لە ئازەربایجان‌و تورکمانیاو شوێنی‌تر

---

٣٦٣ـ ئەو کتێبە ١٥٢ لاپەڕەیەو چاکترین ســـەرچاوەیە دەربارەی کوردی سۆڤیەت بەگشتی‌و کوردەکانی ئەرمەنستان بەتایبەتی . وەك لەسەرەوە وتمان دوکتۆر خالید چەتۆێیف نووســـینی دەربارەی کارتێ‌کردنی شۆڕشی ئۆکتۆبەر لە خەباتی میللەتی کورددا زۆرە ( بەوێنە بڕوانە: خ.م. چەتۆێیف ، شۆڕشی ئۆکتۆبەرو کوردی یەکیەتی ســـۆڤیەت ، ـ « وڵاتان‌و گەلانی ڕۆژهەڵاتی نزیك‌و ناوەڕاست » ، زنجیرەی حەوتەم ـ کوردناسی ، ل ١٥ ـ ٢٦ ) .

دەژین • کەچی پاش تەنها سێ لاپەڕە ئەم دوو ژمارەیە دەخوێنینەوە : سەرەتای سەدەی نۆزدە ژمارەی کوردەکانی ئەرمەنستان ١٠٧٣٧ کەس بوو ، بەڵام تا کۆتایی ئەو سەدەیە ژمارەیان گەیشتە ٣٦١٨٨[٣٦٤] • کەوابێ بە هەر پێوداێك بپێوی دەبوو سالی ١٩٥٩ ئەو ژمارەیە لە ٦٠ هەزار تێپەڕبکات نەك بێتە سەر ٢٦ هەزار !•

هەرچۆن بێ دەسکەوتەکانی مێژوونووسیی کوردی سۆڤیەت گەلێك دیارن‌و کەلێنێکی گەورەیان لە کتێبخانەی مێژوویی هەموو ڕۆژهەڵاتدا پڕکردۆتەوە • لەگەڵ ئەوەش هێشتا زۆر لەو مێژوونووسی‌یە چاوەڕوان دەکرێ ، تایبەت لەبەرئەوەی جێگەی چاودێریی زانا کاربەدەستەکانی ئەرمەنستانە •

وەك وتمان بەشێك لە بەرهەمە ئەدەبی‌یەکانی مامۆستایان حاجی‌یە جندی‌و جاسمێ جەلیل‌و ئۆردوخان‌و ژمارەیەکی‌تر لە ڕووناکبیرە کوردەکانی سۆڤیەت دەستدەدەن بینە سەرچاوەی لێکۆلینەوەی گەلێك لاپەڕەی کەم‌زانراوی مێژووی کورد • بەوێنە دوکتور ئۆردوخان تائێستە ژمارەیەکی یەکجار زۆر گۆرانی‌و لاواندنەوەی کوردیی ناوچەی جیاوازی کوردستانی کۆکردۆتەوە[٣٦٥] کە پڕن لە باسی بەسەرهات‌و ڕوداوی هەمەجۆری دوا ٣٥٠ ساڵەی کوردستان • وەك ئۆردوخان بۆ خۆی دەڵێ ئەو گۆرانی‌یانەی کۆی‌کردوونەوە بایەخیان زۆرە بۆ لێکدانەوەی بزوتنەوەو ڕاپەڕینەکانی

---

٣٦٤- خ • م • چەتۆیێف ، کوردی ئەرمەنستانی سۆڤیەت ، ل ٩٠ و ١٢ •

٣٦٥- تا سەرەتای حەفتاکان دوکتۆر ئۆردوخان پتر لە ١٥٠ گۆرانیی کۆکردبۆوە ( بڕوانە : ئۆردوخانێ جاسمێ جەلیل ، دەربارەی لێکۆلینەوەی گۆرانی‌یە مێژوویی‌یە کوردی‌یە بلاوەکان ، ـ « حەوتەم کۆڕی زانستیی ئاموزگای ڕۆژهەڵاتناسیی کۆڕی زانیاریی سۆڤیەت‌ـ لقی لێنینگراد » ( کورتەی باسەکان ) ، بە زمانی ڕووسی ، لێنینگراد ، ١٩٧١ ، ل ٨٦ •

یەزدان شێرو شێخ سەعیدی پیرانو سمکۆو ئاراراتو تەنانەت شـــێخ
مەحمودو خەلیل خۆشەوی‌و شۆڕشە گەورەکانی‌تریش[٣٦٦] • بێ‌گومان ئەو
کرمی دوکتۆر ئۆردوخان شایانی نرخاندنی بەرزە چونکە ، وەك کاتی خۆی
وتمان ، گۆرانی‌و لاواندنەوەی کوردی سەرچاوەیەکی مێژوویی ڕەسەنن ،
قەکا ڕزگارکردنیان فرمانێکی پێویستی زانستی‌و نەتەوەیی‌یە •

پێم‌وایە مێژوونووسیی کوردی بەگشتی دەتوانێ کـەلکی زۆر لـە
بەرهەمە هێژاکانی زانا کوردەکانی سۆڤیەت وەربگرێ •

---

٣٦٦ــ هەمان سەرچاوە ، ل ٨٧ .

# ئەنجـــام

هەموو باسەکانی ئەم کتێبە ، نەك تەنها باسەکانی بەشی یەکەمو دووەمی، بایەخی زۆری مێژوو لە ژیانی مرۆڤو گــەلاندا نیشاندەدەن • مێژوو ، پێم‌وایە ، یەکەم دەرسی گەورەی ژیانە ، تایبەت بۆئەوانەی جلەوی کاریان وا بەدەستەوە • ئەرماندۆ ساپۆری مێژوونووسی ئیتالیایی باشی بۆچووە کــە دەڵێ :

« مێژوو هەرگیز ناتوانێ بریتی‌بێ تەنها لە مێژووی ئابووری یــا سیاسەت یا ئەدەب یا هی‌تر ، مێژوو سەرتاپای هەموو ئەوانەیــە بەسەریەکەوە »[1] •

ڕۆژبەڕۆژ بایەخی مێژوو لە ژیانی مرۆڤدا زۆرتر دەبێ • هیچ لە خۆڕایی نی‌یە کە ئیمڕۆ کۆچی دوایی مێژوونووسێکی بەناوبانگ بەڕادەی مــردنی پیاوێکی سیاسیی گەورە دەنگ دەداتەوە[2] •

دەربارەی مێژوونووسیی کوردیش هــەر ئەوەندە دەتوانم بڵێم کــە چرۆیەکی ناسکی دەسنێژو پەروەردەی ئارەقی ناوچەوانی دڵسۆزانە !

---

١ ـ بڕوانە : ف . ی . بووتێنبورگ ، کەڵەپیاوانی ڕێنیسانس ، بە زمــانی ڕووسی ، لینینگراد ، ١٩٧٦ ، ل ٢١ .

٢ ـ بەوێنە بڕوانە ئەو وتارەی ڕۆژنامەی « الجمهورية » بەبۆنەی مــردنی مێژوونووسی ئەماریکایی گەورە ، خاوەنی دەیان بــەرگی « مێژووی ژیاری » دیورانتەوە بڵاوی‌کردۆتەوە ( « الجمهورية » ، بغداد ، ٢٧ کانون الثانی ١٩٨٢ ) . کۆچی دوایی توێنبی لە هەموو جیهاندا دەنگی‌دایەوە .

# کورتەی

## بیبلیۆگرافیای مێژوونووسیی کوردی

بێ‌گومان دانانی بیبلیۆگرافیایەکی گشتی بۆ مێژوونووسیی کوردی کارێکی زۆر پێویستە کە بۆی هەیە تا ڕادەیەکی باش ئەرکی سەرشانی مێژوونووسانی خۆو بێگانە ئاسان‌بکات • کارێکی‌وەها لە سنووری ئەم بەرهەمەدا نی‌یە ، بەڵام وەك هەنگاوی یەکەم هەوڵدەدەین پوختەیەکی بیبلیۆگرافیای مێژوونووسیی کوردی لێرەدا پێشکەش بکەین • بەلای ئێمەوە دەتوانرێ ئەو بەرهەمانەی ڕووناکبیرانی کورد بە هەر زمانێك بۆ ڕوون‌کردنەوەی لایەنێکی مێژووی کورد دایانناوە یا وەریان‌گێڕاوە یا لێکیان‌داوەتەوە بخرێنە پاڵ مێژوونووسیی کوردی‌یەوە •

لەبەرئەوەی ئەو بەرهەمانەی لەم بیبلیۆگرافیایەدا ناویان هاتووە زۆر نین بە پێویستمان نەزانی بەپێی چەرخ و قۆناغ یا باس و ناوەرۆك بڵاویان‌بکەینەوە ، هەر بەپێی زمان جیامان کردوونەوە • تەنها ناوی ئەو وتارانەشمان تۆمارکردووە کە لامان‌وایە بایەخی زانستی‌یان زۆرە ، یا لە ڕێگەیانەوە دەتوانین باشتر لە ڕووی جیاوازی مێژوونووسیی کوردی بگەین • هەروەها ناوی ئەو بەرهەمانەشمان تۆمارکردووە کە لەوانەیە تەنها بەشێکیان باسی مێژوو بکات ، یا وەك سەرچاوەی مێژوویی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و ئەدەبی و هی‌تر بایەخیان بۆ کاری مێژوونووس هەبێ ، وەك بەرهەمی بەپێتی مامۆستا شاکیر فەتاح •

دووبارەی دەکەینەوە کە ئەم بیبلیۆگرافیایە تەنهـــا هـــەنگاوێکی سەرەتایی‌یەو هیچ دوور نی‌یە کەموکورتیی زۆری تێدابێ ، بەڵام لەوە دڵنیاین کە کەڵکی بۆ ڕووناکیر بەگشتیو بۆ مێژوونووس بەتایبەتی دەبێ . پێم وایە مێژوونووسانمان دەتوانن ژمارەیەك بەرهەمی بیبلیۆگرافیایی سەربەخۆ دابنێن ، وەك « بەرهەمی مێژوونووسانی[1] کورد بە زمانی عەرەبی »و « بەرهـــەمی مێژوونووسانی کورد بە زمانی فارسی »و « بەرهەمی مێژوونووسانی کورد بە زمانی تورکی »و « بەرهەمی مێژوونووسانی کورد بە زمانی ڕووسی »و « بەرهەمی مێژوونووسانی کورد بە زمانە ئەوروپایی‌یەکان »و مێژوونووسیی کوردی لە هەر کام لە ڕۆژنامەو گۆڤارە کوردی‌یەکاندا ، یا هەر ڕۆژنامەو گۆڤارێك بە هەر زمانێك بایەخی تایبەتیی دابێ بـــە مێژووی کورد ، وەك « خەبات ــ النضال »و « التآخی »و « العراق » .

بە پێویستی دەزانین ســــەرنجی خوێنەر بۆ ئەم لایەنانەی خوارەوە ڕابکێشـــین :

● ژمارەیەك بەرهەمی گشتیی نووسەرانی کوردمان تۆمار کردووە بەو نیازەی ڕادەی پێشکەوتنو جۆری بایەخ پێدانی مێژوونووســـیی کوردی بەگشتی نیشان بدەین .

● بۆ پاراستنی یەکێتی ناوەکانو بۆ ئەوەی خوێنەر باشتر لە ڕادەی خزمەتی مێژوویی زانا ناسراوەکانمان تێبگات لەو شوێنانەدا کـــە بـــە پێویستمان زانیوە دەستکاریی ناوی دڵنەرانی بەرهەمەکانمـــان کردووە . بەوێنە ژمارەیەك لە وتارەکانی کوردۆییێف بـــە نـــاوی ( قەناتێ کوردۆ )وە بڵاوکراونەوە ، ئێمە لەو شوێنانەشدا وەك ئەوانی‌تر کردومانەتە کوردۆییێف . گەر بە پێویستمان زانیبێ کەمێك دەستکاریی ڕێنووسی بەرهەمەکانیشـــمان

---

(1) دەتوانرێ بوترێ بەرهەمی مێژوویی ڕووناکبیرانی کورد .

کردووه ، وامان نەکردایە ئەو وێکچوونەی بەتایبەتی بۆ ناوەکان پێویستە دەشێوا .

● بەپێی توانا هەولم داوە ناوی هەموو کتێبە مێژوویی‌یەکان تۆمار بکەم ، بەلام وتارە مێژوویی‌یەکانی ناو گۆڤارو ڕۆژنامەکان هەلبژاردەن‌و دوور نی‌یە وتاری بایەخدارم بەسەردا تێپەڕیبێ،یا دەستم پیایدا ڕانەگەیشتبێ، چونکە ڕاستیەکەی بەشی زۆری ئەم بیبلیۆگرافیایە بریتی‌یە لەو بەرهەمانەی کە بۆ کاری زانستیی خۆمم کۆکردوونەوە یا بەتایبەتی لای خۆم ناویانم تۆمار کردووه .

● بەشێك لەو بەرهەمانەی دەربارەی فۆلکلۆرو پەندی پێشنیانن تۆمارمان کردوون چونکە کەلکیان بۆ مێژوونووس زۆرە ، بەلکو دەچنە خانەی سەرچاوەی ڕەسەنی هەندێك باسی مێژوویی‌یەوە . هەروەها بەپێی توانا هەولمان داوە ناوی ئەو بەرهەمانەش تۆمار بکەین کە بۆ لێکدانەوەی لایەنی جیاوازی مێژووی کورد کەلکیان هەیەو خاوەنەکانیان کوردن . بەوێنە مامۆستا ئەحمەد خواجا لە وتاری « گۆشتی بۆ تۆ ئێسقانی بۆ من »دا[۲] چەند ژمارەیەکی بەکەلکی دەربارەی پیشەگەریی کوردستانی دوا قۆناغی فەرمانڕەوایی عوسمانی‌یەکان هێناوەتەوە کە بۆ مێژوونووس کەلکدارن ، هەرچەندە ناوی وتارەکە بۆ خۆی لە دووریشەوە ئەو بۆنەی لێ نایەت .

● لەو شوێنانەدا کە بە پێویستمان زانیوە کورتە ڕوونکردنەوەیەکمان خستۆتە تەك بەرهەمەکان .

● مەبەست لە ( بێ )ی کوردی‌و ( بلا )ی عەرەبی نەبوونی شوێن یا سالی چاپە . ( ل ) کورتکراوەی لاپەڕەی کوردی‌و ( ص ) کورتکراوی (صفحە)ی عەرەبی‌یە .

---

(۲) بڕوانە : « دەفتەری کوردەواری » ، ژمارە ۲ ، مایس - ئاغستۆس ۱۹۷۰ ، ل ٤٥ - ٤٨ .

● هەر بەرهەمێك لە ناوەرۆكی كتێبەكەماندا ناوی هاتبێ خوێنەرمان گێڕاوەتەوە بۆ لاپەڕە یا لاپەڕەكانی • لای ئەو جۆرە بەرهەمانەوە نووسراوە: بڕوانە ل ••• هەر نووسەرێكیش لە بەرهەمێك زیاتری هەبێ ناویان بەجیا لەسەرەوە نووسیوە بۆ ئەوەی بەپێی ژمارەی بەرهەمەكانی ناوی دووبارە نەبێتەوە •

لە كۆتاییشدا دەڵێم هیوادارم لە هیچ كامێك لە لایەنەكانی « مێژوو »دا هەڵەیەك یا كەمتەرخەمییەكی ئەوتۆم بەسەردا تێنەپەڕیبێ • ئەوی لە وزەو توانامدا بوو كردمو وستم بەرهەمێكی بەكەڵكو بایەخ پێشكەش ئەوەی ئیمڕۆو هیوای دواڕۆژمان بكەمو دیسان پەنا دەبەمەوە بەر بەلوكی گەورەی مێژوونووسیی كوردی شەرەفخانی بەدلیسیو لە زمان ئەوی پایە بلندەوە منیش دەڵێم :

« لە زانایانی پیاوچاكو دڵپاكو بەوەج دەپاڕێمەوە زۆر بەوردی لە نووسینەكەم وردبینەوەو ئەگەر پەشێوی‌یەكیان بەرچاو كەوت بە شێوەیەكی مەردانە بەراوردی بكەن • خۆ ئەگەر هەڵەو لەبیرچوونێكم لەسەر دەدۆزنەوە هەر بە گاڵتە پێ‌كردنو تیزو تەشەر لێم نەقۆزنەوە ، پیاوەتیم لەگەڵ بكەنو بە پارچەیەكی چاكترو بە بزگوڕێكی تازەترو پاكتر بۆم پینە بكەن » •

## (١) بە زمانی كوردی

١ ــ **ئارشاك سافراستیان** ، مێژووی كوردو كوردستان ، عەبدوڵلا شالی كردوویە بە كوردی ، سلێمانی ، ١٩٦٠ ، ٦٢ل •

كورتەیەكی ناوەرۆكی كتێبە نایابەكەی ئارشاك سافراستیان « كوردو كوردستان »(٣) نەك دەقی •

---

(٣) بڕوانە :
A. Safrastian, Kurds and Kurdistan, London, 1948, 106 pp.

٢ ـ ئازا ن. ، هەلۆ خان ، ـ « گەلاوێژ »(٤) ، ژمارە ٦ ، حوزەیرانی ١٩٤٥ ، ل ٢٥ ـ ٢٨ .
دەربارەی فەرمانڕەوایی هەلۆ خانی میری ئەردەلانە لە کۆتایی سەدەی دەیەمین‌و سەرەتای سەدەی یازدەمینی کۆچیدا .

٣ ـ ئاگری ، ئاورێك لە شـۆڕشەكەی دیاربەکر ، ـ « ڕۆژی نوێ »(٥) ، ژمارە ٥ ، ساڵی ٢ ، خەرمانان ٢٥٧٣ ك ـ ئاب ١٩٦١ز ، ل ١ـ٦ .

٤ ـ « ئامانجەكانی شۆڕش » ، بەغـدا ، ١٩٦٠ ، ٨٨ ل . لە بلاوكراوەكانی وەزارەتی ئیرشادە .

٥ ـ « ئامانجەكانی شۆڕش » ، بغداد ، ١٩٦١ .

٦ ـ « ئاو ڕەشەی ڕوسی سوور » ، سلێمانی ، ١٩٤٠ ، ١٢ ل . (؟) .
دەربارەی بڕوانە : ئەڕیمان ، بیبلیۆگرافیای کتێبی کوردی ، ل ٥٥ .

٧ ـ ئاوی ن . ، پایەی بەرزی مستەفا پاشا ، ـ « گەلاوێژ » ، ژمـارە ٤ ، نیسانی ١٩٤٥ ، ل ١٩ ـ ٢٠ .
دەربارەی مستەفا پاشا یامولکی‌یە .

٨ ـ « ئەتۆم لە مێژوودا » ، کمال جـەلال غـەریب کردوویە بە کوردی ، سلێمانی ، ١٩٦٨ ، ٦٨ ل .

٩ ـ ئەحمـــەد تاقانە ، ئەمین فەیزی ـ بەهرەوەرێکی کوردی لە بیر کراو ، ـ « بەیان »(٦) ، ژمارە ٣٥ ، نیسانی ١٩٧٦ ، ل ٣٥ ـ ٤٠ .

**ئەحمەد جەزراوی :**

١٠ـ بنچینەی جەماوەران بۆ چارەسەرکردنی مەسەلەی کورد ، ـ« ڕۆشنبیری نوێ »(٧) ، ژمارە ٥١ ، گەلاوێژی ١٩٧٦ ، ل ٤ ـ ٦ .

---

(٤) گۆڤار ، بەغدا ، ژمارە یەکی کانونی یەکەمی ساڵی ١٩٣٩و دوا ژمـارەی ئابی ١٩٤٩ دەرچوون .
(٥) گۆڤار ، سلێمانی ، ژمارە یەکی مارتی ١٩٦٠و دوا ژمارەی ئـابی ١٩٦١ دەرچوون .
(٦) گۆڤار ، بەغدا ، ژمارە یەکی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٦٩ دەرچو . تـا ئیستەش « دەزگای ڕۆشنبیری‌و بلاوکردنەوەی کوردی » بلاوی دەکاتەوە.
(٧) گۆڤار ، بەغدا ، ژمارە سفری ڕۆژی یازدەی تشـرینی دووەمی ١٩٧٣ دەرچو . تا ئیستـەش « دەزگای ڕۆشنبیری‌و بلاوکردنەوەی کوردی » دەری دەکات .

لە هەمان ژمارەدا هەمان وتار بە عەرەبیش بڵاوکراوەتەوە (بڕوانە: ل ١٦ – ١٧) .

١١– کێشەی کورد لە بەیاننامەی ئازارەوە هەتا ئۆتۆنۆمی ، – « ڕۆشنبیری نوێ » ، ژمارە ٤٦ ، شوباتی ١٩٧٦ ، ل ٧–٨ ، ٣٨ .
هەمان وتار لە هەمان ژمارەی هەمان گۆڤاردا بە عەرەبیش بڵاوکراوەتەوە (ل ٩ – ١٠) .

**ئەحمەد خواجا :**

١٢– چیم دی ، بەرگی یەکەم ، بەغدا ، ١٩٦٨ ، بەرگی دووەم ، سلێمانی ، ١٩٦٩ ، بەرگی سێیەم ، سلێمانی ، ١٩٧٠ ، بەرگی چوارەم ، سلێمانی ، ١٩٧٣ .

هەر چوار بەرگی « چیم دی » بەسەریەکەوە ٧٠٠ لاپەڕە دەبن .
« چیم دی » ناوێکی لەبارو کوردییەکی پەتیی ڕەوانـــە . هەڵۆو کاوە نرخاندوویانە . دەربارەی بڕوانە ل ١٧٩ .

١٣– دەشتی قەراج ، – « گەلاوێژ » ، ژمارە ١٢ ، کانونی یەکــەمی ١٩٤٨ ، ل ٢١ – ٢٥ .

١٤– گەنجینەکانی وڵات ، – « دەفتەری کوردەواری »(٨) ، ژمارە ١ ، کانونی دووەمی ١٩٧٠ ، ل ٧ – ١١ .

١٥– گوشتی بۆ تۆ ئێسقانی بۆ من ، – « دەفتـــەری کوردەواری » ، بەرگی سێیەم ، مایس – ئابـ ئەیلوول ١٩٧٠ ، ل ٤٥ – ٤٨ .
باسی پیشەگەریی ناوچەی سلێمانیی پێش شەڕی یەکـــەمی جیهان دەکات .

١٦– ئەحمەد سالار ، سالم لە تای تەرازوودا ، سلێمانی ، ١٩٦٨ ، ٤٨ ل .

**ئەحمەد عوسمان ئەبوبەکر ، دوکتور :**

١٧– ئایا مێژووی کورد نووسراوەتەوە ؟ ، – « دەفتـــەری کوردەواری » ، ژمارە ١ ، کانونی دووەمی ١٩٧٠ ، ل ٨٥ – ٨٨ .

١٨– کوردستان لە پەیمانی سایکس – پیکۆو ســـازانۆف – پالیولۆگدا ، – « ڕۆژی کوردستان »(٩) ، ژمارە ٧ ، مایسی ١٩٧٢ ، ل ٥٠ – ٥١ .

---

(٨) « کۆمەڵە نووسینێک » بوو لە شێوەی گۆڤاردا دەردەچو . سێ ژمارەی لێ چاپکرا .

(٩) گۆڤار ، بەغدا ، ژمارە یەکی حوزەیرانی ســـالی ١٩٧١ دەرچو . تـــا ئێستەش نلو ناوە بە کوردیو عەرەبی دەردەچێ .

١٩ـ موعادەلەی ئەو پێوەندی‌یەی لە نێوان مێژووی زایینی‌و کۆچی‌دا هەیە ، ـ « گۆڤاری کۆلێجی ئەدەبیات »(١٠) ، بەغداد ، ژمارە ٢٠ ـ ٢١ ، ١٩٧٧، ل ٤٧ ـ ٦٩ .

٢٠ـ ئەحمەد فەرهادی ، هەولێر بەرهەڵستی هۆلاکۆ دەکا ، ـ « ڕۆژی کوردستان » ، ژمارە ٢ ، ساڵی ٢ ، ل ٣٩ ـ ٤٠ .

٢١ـ « ئەدیبی بەناوبانگی کورد صالح زەکی بەگی صاحێبقران» ،ـ «گەلاوێژ»، ژمارە ٣ ، مارتی ١٩٤٥ ، ل ١ ـ ٥ .

بەبۆنەی کۆچی دوایی صالح زەکی بەگەوە « گەلاوێژ » بڵاوی‌کردۆتەوە .

٢٢ـ « ئەرمەن وەتەنی قەومی‌یان چۆن دروست‌کرد » ، ـ حسین حوزنی موکریانی کردوویە بە کوردی ، ـ « گەلاوێژ » ، بەشی یەکەم : ژمارە ١ ، کانونی دووەمی ١٩٤٤ ، ل ٥٤ ـ ٥٧ . بەشی دووەم : ژمارە ٣ ، مارتی ١٩٤٤ ، ل ٤٣ ـ ٤٧ .

٢٣ـ ئەژدەر ، سلێمانی ، ـ « ڕۆژی نوێ » ، ژمارە ٥ ، ساڵی ٢ ، خەرمانان ٢٥٧٣ ك ـ ئاب ١٩٦١ز ، ل ٧٦ ـ ٨٠ .

٢٤ـ « ئەشکەوتەکەی گوندۆك » ، بەغداد ، ١٩٥١ ، ٢٤ل .

باسی شوێنەوارێکی نزیك ئاکرێ‌یە . بەکر دلێر لە عەرەبی‌یەوە کردوویە بە کوردی . دەربارەی بڕوانە : ل ١٧٥

٢٥ـ « ئەمیر ئەرسەلان » ، کەرکوك ، ١٩٥٦ ، ٨٨ل .

عەلی باپیر ئاغا لە فارسی‌یەوە بە هۆنراوە کردوویە بەکوردی.

٢٦ـ « ئەمین زەکی کۆچی کرد » ، ـ «گەلاوێژ» ، ژمارە ٧ ، تەمموزی ١٩٤٨، ل ٥٤ ـ ٦٤ .

ژینامەی مامۆستا ئەمین زەکی‌یە ،« گەلاوێژ » بە بۆنەی کۆچی دواییەوە بڵاوی‌کردۆتەوە .

٢٧ـ ئەمین فیزی ، انجمن ادیبان کرد ، استمول ، ١٩٢٠ ، ١٤٧ ل. (؟) .

باسی مەولانا خالیدو نالی‌و شێخ ڕەزای تاڵەبانی‌و سالم‌و مەولەوی‌و ژمارەیەك شاعیری‌تری کوردو بەرهەمیان دەکات .

---

(١٠) گۆڤار ، زانکۆی بەغدا دەری دەکات . لە ژمارە پازدەیەوە ( ١٩٧٢ ) بەشێکی بۆ زمانی کوردی تەرخان‌کرد .

شارەزایان گەلێك جار باسی ئەم کتێبەیان کردووەو بەرز نرخاندویانە .

٢٨ـ **ئەنوەر مەحمود عەبدوللا** ، ڕۆژنامەی کوردستان پێشەنگی کاروانی ڕۆژنامەگەری کوردیەیە ، ـ « ئاسۆی زانکۆیی »(١١) ، ژمارە ٧ ، سالی ٢ ، مایسی ١٩٧٨ ، ل ٨٣ ـ ٨٥ .

٢٩ـ **ئەوڕەحمان** ، چواردەی تەمموز ، سلێمانی ، ١٣٦ ل .
دەربارەی شۆڕشی گەورەی فەرەنسەیە .

**ئەوڕەحمانی حاجی مارف ، دوکتۆر :**

٣٠ـ بزانین بەگیزارۆف دەربارەی کورد چیی نووسیوە ؟ ، ـ « بەیان » ، ژمارە ٣٤ ، مارتی ١٩٧٦ ، ل ١ ـ ٤ .

٣١ـ چی لە بارەی زمانی کوردییەوە نووسراوە ، بەغداد ، ١٩٧٤ ، ٧٠ ل .
لە چاپکراوەکانی « کۆڕی زانیاری کورد »ە .

٣٢ـ کارە زانستییەکانی پیۆتەر لێرخ ، « بەیان » ژمارە ٣٢ ، کانونی یەکەمی ١٩٧٥ ، ل ١ ـ ٥ .

٣٣ـ کورتەیەکی مێژووی نووسینی کوردی بە ئەلفوبێی عەرەبی ـ « گۆڤاری کۆڕی زانیاری عیراق . دەستەی کوردی »(١٢) ، بەرگی هەشتەم، ١٩٨١، ل ٦٦ ـ ١٢٠ .

٣٤ـ لە بارەی کوردناسییەوە لە روسیاو یەکێتی سۆڤێت ، ـ « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد »(١٣) ، بەرگی دووەم ، بەشی یەکەم ، ١٩٧٤ ، ل ٤٩٩ ـ ٥٦٨ .

٣٥ـ **« ئنجیلا لوقا »** ، بێروت ، ١٩٥٣ ، ٢٠٨ ل .

---

(١١) گۆڤار ، سەرەتا زانکۆی سلێمانی و دوایی زانکۆی صەلاحەددین چاپی دەکرد . جارێکا وەستاوە . ژمارە یەکی مانگی مایسی سالی ١٩٧٧ چاپ کرا .

(١٢) گۆڤار ، بەغدا . دەربارەی بڕوانە پەراوێزی داهاتو .

(١٣) « کۆڕی زانیاری کورد » لە بەغدا چاپی دەکرد . بەرگی یەکەمی سالی ١٩٧٣ دەرچو . تا سالی ١٩٧٨ شەش بەرگ و هەشت ژمارەی بەو ناوەوە لێ دەرچوو . لە سالی ١٩٨٠ەوە « گۆڤاری کۆڕی زانیاری عیراق ـ دەستەی کورد » جێگەی گرتەوە . ئەمیان تا ئێستەش دەردەچێ .

ئۆردیخانی جەلیل :

٣٦ــ پەندی پێشنیان ، یەرێوان ، ١٩٦٩ ، ٢٤٢ ل . (؟) .
٣٧ــ دلۆکێت جماعەتا کوردا ، یەرێوان ، ١٩٦٤ ، ٢٢٤ ل .
٣٨ــ ئیحسان شێرزاد ، دامەزراندنی « کۆڕی زانیاری کورد » ، ــ « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، بەرگی یەکەم ، بەشی یەکەم ، ١٩٧٢ ، ل ٣ ــ ٨ .

ئیحسان فوئاد ، دوکتۆر :

٣٩ــ ئەدەبی کوردی لە لای ڕۆژهەڵاتناسەکان ، ــ « ڕۆشنبیری نوێ » ، ژمارە ٦٨ ، حوزەیرانو تەمموزی ١٩٧٨ ، ل ٧٦ ــ ٧٧ .

٤٠ــ بیرەوەری شەش ساڵەی « ڕۆشنبیری نوێ » ، ــ « ڕۆشنبیری نوێ » ، ژمارە ٧٨ ، کانونی یەکەمی ١٩٧٩ ، ل ٦ ــ ٧ .

هەمان ژمارە وتاری دەستەی نووسەرانو حسەین عارفو زادوق آدمو مەحمود زامداری بە بۆنەی بیرەوەریی دەرچونی یەکەم ژمارەی « ڕۆشنبیری نوێ »وە بڵاوکردۆتەوە .

٤١ــ سەردەمی ڕۆشنبیری ، ــ « ڕۆشنبیری نوێ » ، بەشی یەکەم : ژمارە ٧٠، ئەیلولو تشرینی یەکەمی ١٩٧٨ ، ل ٥٩ ــ ٦١ . بەشی دووەم : ژمارە ٧٢، شوباتی ١٩٧٩ ، ل ٤٧ ــ ٥١ .

٤٢ــ ئیبراهیم ئەحمەد ، ژانی گەل ، سلێمانی ، ١٩٧٤ ، ٢٥٤ ل .
دوکتۆر کەمال فوئاد پێشەکی بۆ نووسیوە .

٤٣ــ ئیبراهیم عومەر ، کورد لەناو ئایینو مێژوودا ، سلێمانی ، ١٩٧٢ ، ١٣٤ ل .

دەربارەی بڕوانە : ل ٢٠٢ .

٤٤ــ ئیبراهیم نادری ، سەرەنجامی عەلی موراد خانی بەختیاری ، ــ « گەلاوێژ » ، ژمارە ٤ ، نیسانی ١٩٤٤ ، ل ١٩ ــ ٢١ .

٤٥ــ ئیسماعیل تالی ، سەرهاتییت کەڤن . سەرهاتیا حەمکێ ئاکرەیی ، ــ « ڕۆشنبیری نوێ » ، ژمارە ٨٨ ، ئابو ئەیلولی ١٩٨١ ، ل ٧٢ ــ ٧٤ .

ئیسماعیل حەقی شاوەیس :

٤٦ــ پروپوچی پێشنیان ، بەغداد ، ١٩٣٨ ، ٤٨ ل .
٤٧ــ خەباتی گەلی کورد لە ڕۆژەکانی جەنگی گێتی یەکەمیندا لە دەرەوەو ناوەوەی کوردستان ، ــ « ڕۆژی نوێ » ، ژمارە نۆ ، سەرماوەز ٢٥٧٢ك ــ کانونی یەکەم ١٩٦٠ ز ، ل ٢٤ ــ ٣٠ .

٤٨ـ شۆڕشی قۆچگیری ، ـ« ڕۆژی نوێ » ، بەشی یەکەم ، ژمارە ٣ ، ساڵی ٢ ، جۆزەردان ٢٥٧٣ ك ـ حوزەیران ١٩٦١ ز ، ل ٩٠ ـ ٩٨ . بەشی دووەم ، ژمارە ٤ ، ساڵی ٢ ، پوشپەڕ ٢٥٧٣ ك ـ تەمموز ١٩٦١ ز ، ل ١ ـ ٧ . بەشی سێیەم ، ژمارە ٥ ، ساڵی ٢ ، خەرمانان ٢٥٧٣ ك ـ ئاب ١٩٦١ ز ، ل ١٨ ـ ٢٨ .

٤٩ـ قسەی پێشنیان ، بەغداد ، ١٩٣٣ ، ٥٩ ل .

٥٠ـ کۆمەڵی کوردستان ، ـ «ڕۆژی نوێ» ، ژمارە شەش ، گەلاوێژ ٢٥٧٢ ك ـ ئەیلوول ١٩٦٠ ز ، ل ٤٢ ـ ٤٥ .

٥١ـ کۆمیتەی ئیستیقلالی کوردستان ، ژمارە ١ ، ساڵی ٢ ، خاکەلێوە ( نەورۆز ) ٢٥٧٣ ك ـ مارت ١٩٦١ز ، ل ٢٠ ـ ٢٤ .

٥٢ـ مەلا سلیم ئەفەندی ، ـ « ڕۆژی نوێ » ، ژمارە هەشت ، خەزەڵوەر ٢٥٧٢ ك ـ تەشرینی دووەمی ١٩٦٠ ز ، ل ٢١ ـ ٢٨

مەبەست مەلا سەلیم خێزانی‌یە کە بەر لە شەڕی یەکەمی جیهان بە چەند مانگێك ڕاپەڕی .

٥٣ـ میر عبدالرزاق بەدرخان ، ـ « ڕۆژی نوێ » ، ژمارە حەوت ، ڕەزبەر ٢٥٧٢ ك ـ تەشرینی یەکەم ١٩٦٠ ز ، ل ٥٠ ـ ٥٣ .

٥٤ـ ئیسماعیل ڕەسول ، باسێك دەربارەی گەشەکردنی ئابوری لە کوردستانی عیراقدا . شێوەو ڕوخساری ئابوری کوردستان لە سەدەی نۆزدەمێندا ، ـ « ڕۆشنبیری نوێ » ، ژمارە ٨٢ ، تشرینی یەکەمی ١٩٨٠ ، ل ١ ـ ٦ .

٥٥ـ « ئیمپریالیزم » ، بەغداد ، ١٩٤٧ ، ٣٢ ل .

شێخ محەمەد ( شێخە شەل ) لە « مستلزمات کفاحنا الوطنی »ی ئەهدەوە کردوویە بە کوردی .

٥٦ـ «ئینجیلی موقەددەس» ، نیویۆرك ، ١٩٥١ ، ٣٠٠ ل .

٥٧ـ پراجیکشۆر شاستری ، ئەوی لە چین دیومە ، بەغداد ، ١٩٥٧ ، ١٠٠ ل.

لە بڵاوکراوەکانی باڵیۆزخانەی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکایە لە بەغدا . ناوی وەرگێری لەسەر نی‌یە .

٥٨ـ « بەرگوێیکی خەرمانی کوردناسی لە ئەورووپادا » ، بەغداد ، ١٩٧٤ ، ١٦٠ ل .

سێ وتاری دوکتۆر ئەورەحمانی حاجی مەلا مارفو دوکتۆر جەمال نەبەزو مامۆستا کوردۆیێڤە دەربارەی کوردناسی . لە چاپکراوەکانی « کۆڕی زانیاری کورد »ە .

٥٩ـ « بریارو ڕاسپێری‌یەکانی کۆنگرەی یەکەمی مەلاکانی کوردستان » ، ـ « برایەتی »(١٤) ، ژمارە ٧ ، ساڵی ١ ، خولی دووەم ، تشرینی یەکەمی ١٩٧٠ ، ل ٣٤ .

٦٠ـ « بریاری ئەنجومەنی فەرماندەی شۆڕش دەبارەت مافە خوێندەواری‌یەکانی نەتەوەی کوردەوە » ، ـ « دەفتەری کوردەواری » ، ژمارە ١ ، کانونی دووەمی ١٩٧٠ ، ل ٤ ـ ٦ .

٦١ـ ب . ع . ی . ، شتکاری مێژوویی ، ـ « گەلاوێژ » ، ژمارە ١٢ ، کانونی یەکەمی ١٩٤٣ ، ل ٥٧ ـ ٥٩ .

مەبەستی لە « شتکاری مێژوویی » ( المادیة التاریخیة )یە .

٦٢ـ بەکر دلێر ، نامیلکەی ڕەش . لاپەڕەیەك لە مێژووی دیاربەکر ، ـ « ڕۆژی کوردستان » ، ژمارە ٧ ، ساڵی ١ ، مارتی ١٩٧١، ل ٥٧ـ٥٨ .

٦٣ـ « بهاءالله و دەوری نوێ » ، بەغداد ، ١٩٣٣ ، ٢٣٦ل .

لە نووسینی ( ج . ا . سێلمنت )ە . محمود جەودەت کردوویە بە کوردی . باسی بابی‌و بەهایی‌یە .

٦٤ـ بەهرە ، یەکێتی ئافرەتانی کوردستان ، ـ « هاوکاری »(١٥) ، ٢ ی کانونی دووەمی ١٩٧١ .

سەرۆکی یەکێتی زەکێ ئیسماعیل حەقی باسی مێژووی « یەکێتی ئافرەتانی کوردستان »و چالاکیکانی دەکات .

**بورهان قانیع :**

٦٥ـ بنچینە کۆمەلایەتی‌یەکانی ئافرەتی لادێ‌نشینی کوردەواری ، بەغدا ، ١٩٧٩ ، ٤٨ ل .

٦٦ـ کورتەیەك لە بارەی پیشەی هونەری‌و دەستکردی ماددەکانەوە ، ـ «بەیان» ، ژمارە ٤٩ ، مایسی ١٩٧٨ ، ل ٦٧ ـ ٦٩ .

٦٧ـ کۆمەلگای سەرەتایی سەرزەمینی ماد لە چەرخی بەردو بەردومس ( ئانیۆلیت )دا ، ـ « بەیان » ، ژمارە ٥٢ ، تشرینی دووەمی ١٩٧٨ ، ل ٦٤ ـ ٦٥ .

---

(١٤) پاشکۆی ڕۆژنامەی « التآخی » بوو ، لە خولی دووەمیدا ( ژمارە یەکی حوزەیرانی ١٩٧٠ ) لە شێوەی کۆڤاردا دەردەچو .

(١٥) ڕۆژنامە ، بەغدا ، ژمارە یەکی ٩ی کانونی دووەمی ساڵی ١٩٧٠ دەرچو . تا ئێستەش بلاو دەبێتەوە .

٦٨ـ « بەیانە مێژوویی‌یەکەی یانزەی مارت » ، ـ « برایەتی » ، ژمـــارە ١ ، سالی ١ ، خولی دووەم ، حوزەیرانی ١٩٧٠ ، ل ٦ ـ ٨ .

٦٩ـ « بەیاننامەی شێخ سەعیدی پیران » ، ـ « ڕۆژی نوێ » ، ژمارە حەوت، ڕەزبەر ٢٥٧٢ ك ـ تەشرینی یەکەم ١٩٦٠ ز ، ل ٣٦ ـ ٣٩ .

٧٠ـ « بیبلیۆگرافیا کتیبیتا کوردی‌یە سۆفیێتیێ » ( سالێد ١٩٢١ ـ ١٩٦٠ ) ، حازر کر ن . أ . ئەلێکسانیان ، یەریڤان ، ١٩٦٢ ، ١٢٤ ل .

بیبلیۆگرافیاکە لە دوو بەش پێکهاتووە ، بەشی یەکەمیان نــاوی کتێبە کوردی‌یەکانە بە زمانی کوردی‌و بەشی دووەمیان ناویانە بە زمانی ڕووسی . ئەنوەر قادر محەمەد ( ئەنوەر جـــاف ) ناوەرۆکی ئەو کتێبەی خستۆتە سەر ڕێنوسی لای خۆمـــانو « واتای هەندێ وشـــەو ڕەمزی لێکدلوەتەوە » ( بڕوانە : « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد »، بەرگی چوارەم ، ١٩٧٦ ، ل ٤٠١ ـ ٤٣٢ ، بەرگی پێنجەم ، ١٩٧٧ ، ل ٣١٢ ـ ٣٤٢ ) .

٧١ـ «بیرکردنەوە لە کورد » ، بابــە عەلی لــە ئینگلیزی‌یەوە کــردوویە بـــە کوردی(١٦) ، ـ « گەلاوێژ » ، ژمارە ١١ ، تشـــرینی دووەمی ١٩٤٤ ، ل ١ ـ ١١ .

٧٢ـ « بیروباوەڕی نازییەکان بەرامبەر ئاینەکان » ، بەغداد ، ١٩٤٢ ، ١٨ ل . بالیۆزخانەی بەریتانی لە بەغدا دژی ئەلەمانیـــای هیتلەری بلاوی کردۆتەوە .

٧٣ـ « بیرەوەری نۆزدەی حوزەیران » ، ـ « ڕۆژی نوێ » ، ژمـــارە سێ ، جۆزەردان ٢٧٥٢ ك ـ حوزەیران ١٩٦٠ ز ، ل ١ ـ ٥ .

٧٤ـ « پارتی دیموکراتی کوردســـتان . ڕێکخراوی ئەوروپا ، لە پێنـــاوی مافە نەتەوایەتی‌یەکانی گەلی کورد ، لە پێناوی دیموکراسی لە عیراق‌دا » ، بێ ، مایسی ١٩٦٢ .

٧٥ـ « پارتی دیموکراتی کوردســـــتان . دەربارەی پێویستی بوونی پـــارتی پێشرەومان » ، سلێمانی ، ١٩٦٠ .

٧٦ـ « پاراستنی پاشـــماوەی کۆنمان لە کاری کۆڕدا » ، ـ « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، بەرگی یەکەم ، بەشی یەکەم ، ١٩٧٣ ، ل ٣٨٠ ـ ٤١٨. ئەو وتارە من نوسیومە . باسی « وەقفنامەی عەبدولرەحمان

---

(١٦) لە گۆڤاری "Blackwoods Magazine" ی ئەمەریکایی‌یەوە وەری گرتووە.

پاشای بابان »و « دوو دەستخەتی حـــاجی کاك ئەحمەدی شێخ »و شێخ ڕەزای تاڵەبانیو یەکەم ژمارەی «کوردستان»ی یەکەمین ڕۆژنامەی کوردیو « شەرەفنامە »و « مۆرو ئۆرگانی کۆمەڵەی کوردستان »و گۆڤاری « گرو گاڵی منداڵانی کورد » دەکات .

٧٧ــ پاکیزە ڕەفیق حیلمی ، دوکتۆرە ، ڕێزمانو مێژووی زمـــانی کوردی ، ــ « دەفتەری کوردەواری » ، ژمـــارە ١ ، کـــانونی دووەمی ١٩٧٠ ، ل ٣٣ ــ ٤٠ .

٧٨ــ « پاڵەوانی زەند » ، بەغداد ، ١٩٥٦ ، ١٤٩ ل .
حەسەن فەهمی جاف لە فارسی‌یەوە کردوویە بە کوردی.

٧٩ــ پشکۆ ، کورد لە ئێنسیکلۆپیدیای تورکیدا ، ــ « گەلاوێژ » ، ژمارە ٢ ، شوباتی ١٩٤٤ ، ل ١٥ ــ ١٩ .

٨٠ــ پەڤلیکین ڤی ٠ ، شۆڕشی ١٩٠٥ ــ ١٩٠٧ ڕێگا بۆخۆش‌کەری شـــۆڕشی ئۆکتۆبەری مەزن بوو ، محەمەدی مەلا کەریم کردوویە بـــە کوردی ، ــ « ڕۆژی کوردستان » ، ژمارە ٢٧ ، ١٩٧٥ ، ل ٣٥ ــ ٤٠ .

٨١ــ پلوتارك ، شەڕەکانی ئەسکەندەری مەکدۆنی ، جەلال تەقی کردوویە بـــە کوردی ، سلێمانی ، ١٩٧٣ ، ٩١ ل .

٨٢ــ « پۆستەی کوردەواری » ، ــ « گەلاوێژ » ، ژمارە ٣ ، مـــارتی ١٩٤٨ ، ل.١٣ ــ ٢٣ .
دەربارەی ئەو وەفدانەی کوردستانە کـــە بۆ زیارەتی گۆڕی شەهیدانی ڕاپەڕینی ١٩٤٨ هاتوونەتە بەغدای پایتەخت .

**پیرەمێرد :**

٨٣ــ دوازدە سوارەی مەریوان ، سلێمانی ، ١٩٣٥ ، ٢٧ ل .

٨٤ــ شیوەنی ئەمین زەکی ، ــ «گەلاوێژ» ، ژمارە ٧، تەمموزی ١٩٤٨ ، ل ٣٤ .
بەبۆنەی کۆچی دوایی ئەمین زەکیی مێژوونووسی گەورەمانەوە گوتویە . تێیدا دەڵێ :

تۆمـــاری کوردیی تاریخ هـــەڵپێچرا
پەردەی ڕەش بەڕوی ئەدەبدا کێشرا

٨٥ــ نەورۆز ، ــ « گەلاوێژ » ، ژمارە ٣ ، مارتی ١٩٤٣ ، ل ١٠ ــ ١٢ .

٨٦ـ « پێشەوای بەرزی کوردستان جەنابی قازی محەممەد » ، ـ «هەڵاڵە»(١٧)» ژمارە ٢ ، خاکەلێوەی ١٣٢٥ ، ل ١ ـ ٢ .

٨٧ـ تاهیر ئەحمەد حوێزی ، مێژووی کۆیە ، بەغداد ، ١٩٦٢ ، ١٠٦ ل .

٨٨ـ « تحفەء مظفریە بە زمانی کوردیی موکری » ، گردلری ئۆسکەرمان ، بەرلین، ١٩٠٥، پێشەکی و ساخکردنەوەو هێنانەوەسەر ڕێنووسی کوردی هێمن موکریانی ، بەغدا ، ١٩٧٥ ، ٤١٦ ل .

لە چاپکراوەکانی « کۆڕی زانیاری کورد »ە .

٨٩ـ « تەرجەمەی ژیانی مامۆستا مەلا محەمەدی کۆیی » ، ـ « گەلاوێژ » ، ژمارە ١١ ، تشرینی دووەمی ١٩٤٤ ، ل٥٤ ـ ٥٦ .

بە ناوی گۆڤاری « گەلاوێژ » خۆیەوە بڵاوکراوەتەوە . بەدوو بەیتەی حاجی قادری کۆیی دەستی پێ‌کردووە کە لە نامەیەکیدا بۆ مەلا عەبدوللای جەلی‌زادەی نووسیوەو دەڵێ :

« بەغیری جەدی ئێوە کێ‌یە دانا
لە کوردستان بناغەی عیلمی دانا »

٩٠ـ تۆفیق قەفتان، مێژووی حوکمدارانی بابان لە قەڵاچوالان تا دروست‌کردنی شاری سولەیمانی ١٠٨٠ ـ ١١٩٩ کۆچی ، ١٦٦٩ ـ ١٧٨٤ زایین ، بەغدا ، ١٩٦٩ ، ٦٨ ل .

## تۆفیق وەهبی :

٩١ـ بنج و بناوانی زمانی کوردی لە توێکلە گوێزێکدا ، ـ « گەلاوێژ » ، بەشی یەکەم : ژمارە ٣ ، مارتی ١٩٤٣ ، ل ٣٩ـ٤٩ . بەشی دووەم : ژمارە ٤ ، نیسانی ١٩٤٣ ، ل ٣٥ـ٤٠ . بەشی سێیەم : ژمارە ٥ ، مایسی ١٩٤٣ ، ل ٣٥ ـ ٤٠ . بەشی چوارەم : ژمارە ٧ ، تەمموزی ١٩٤٣ ، ل ٤٣ـ٤٦ .
دەربارەی بڕوانە : ل ١٧٥ .

٩٢ـ قسنێک لە کوردستاندا ، بەغداد ، ١٩٤٧ ، ١٨ ل .
باسی قسنەکەی قزقاپانی شارەزوور دەکات . لە بڵاوکراوەکانی گۆڤاری « دەنگی گێتی تازە »یە .

---

(١٧) لە گۆڤارەکانی مەهاباده ، لە بۆکان چاپ دەکرا . ژمارە یەکی ڕەشەمێی ١٣٢٤ ـ سەرەتای مارتی ١٩٤٦ دەرچو .

**تۆمـا بوا :**

٩٣ـ ژیانی کوردەواری ، گۆڕینی حمه سعید حمه کریم .

٩٤ـ کوردناسـین ، وەرگێـڕ : دوکتۆر نوری تاڵەبانی ، ـ « دەفتەری کوردەواری » ، بـەرگی سـێیەم ، مایس ـ ئافستۆسی ١٩٧٠ ، ل ١٤١ ـ ١٤٩ .

٩٥ـ « **تۆمارێك دەربارەی تیپی مۆسیقای سلێمانی** » ، ئامادە کردنی ئەحلام مەنسورو پیاچوونەوەی یاسەمین مەحمود بەرزنجەیی ، ـ « بەیـان » ، ژمارە ٥٢ ، تشرینی دووەمی ١٩٧٨ ، ل ٨٣ ـ ١١٠ .

٩٦ـ « **تەیموری لەنگی نوسێنەو** » ، ـ « گەلاوێژ » ، ژمارە ١٠ ، تشـرینی یەکەمی ١٩٤٥ ، ل ٢٤ ـ ٢٨ .
ف . ر . لە گۆڤاری « ورلد دایجێـست » ی وەرگرتووە .

**جەبار جەباری :**

٩٧ـ ئافرەتە نلودارەکانی کورد ، کەرکوك ، ١٩٦٩ ، ٧٦ ل .
دەربارەی بڕوانە : ل ٢٢٨ .

٩٨ـ لاپەڕەیەك لە مێژووی ڕۆژنامەگەریی کوردی لە شـاری کـەرکوك ، « بەیان » ، ژمارە ١٢ ، ١٩٧٤ز ـ ٢٦٧٤ی کوردی ، ل ١٣ ، ١٨ .

٩٩ـ مێژووی ڕۆژنامەگەریی کوردی ، کەرکوك ـ سلێمانی ، ١٩٧٠ ، ١٩٠ ل .
دەربارەی بڕوانە : ل ٢٢٩ .

١٠٠ـ **جگەرخوێن** ، گوتنی پێشنیا ، شام ، ١٩٥٧ ، ٦٤ ل .
بە پیتی لاتینی چاپکرلوە .

١٠١ـ **جەلال دەباغ** ، دیمترۆف ، بەغداد ، ١٩٧٢ ، ٥٦ ل .

١٠٢ـ **جەمال بابان** ، مامەیلرە پیاوێکی ڕاستو سەیر بوو . ڕوونکردنەوەی هەندێك کەلەوقوژبنی تارێك لە ژیانی یلرە ، ـ « بەیان » ، ژمارە ١٢ ، ١٩٧٤ ز ـ ٢٦٧٤ی کوردی ، ل ٧ ـ ١٠ . دیسانەوە دوانزە سـوارەی مەریوان ، ژمارە ١ ، ١٩٧٢ ، ل ١٦ ـ ١٧ .

**جەمال خەزنەدار :**

١٠٣ـ جارێکیتریش دەربارەی مامۆستا نەجمەدین مەلا ، ـ « عیراق »(١٨) ، ژمارە ١٢ ـ ١٣ ، شوباتو ئادلاری ١٩٧٨ ، ل ٢٠ .

---

(١٨) پاشکۆی ڕۆژنامەی « العراق »ە .

کورتەی ژینامەی مامۆستا مەلا نەجمەدینە کە بۆ خۆی سالی ۱۹٤٥ لە دەفتەرێکی شیعردا نووسیویەو .

۱۰٤ــ رابەری رۆژنامەگەری کوردی ، بەغدا ، ۱۹۷۳ ، ۱۹۲ ل .
دەربارەی بڕوانە : ل ۲۲۹ .

۱۰٥ــ مێژووی رۆژنامەگەری کوردی ، ــ « دەفتەری کوردەواری » ، ژمارە ۱ ، کانونی دووەمی ۱۹۷۰ ، ل ۱۰۷ ــ ۱۱۰ .

۱۰٦ــ ناوی نووسەرو وتارەکانی دوو بەرگی سالی یەکەمو دووەم لە گۆڤاری « رۆژی کوردستان » ، ــ « رۆژی کوردستان » ، ژمارە ٦ ، تشرینی دووەمی ۱۹۷۳ ، ل ٦۸ ــ ۷۲ .

۱۰۷ــ **جەمال شالی** ، شۆڕشێکی نوێ لە کوردستاندا ، سلێمانی ، ۱۹۷۱ ، ۱۱۲ ل .

۱۰۸ــ **جەمال نەبەز** ، دوکتۆر ، کورتە مێژوویەکی کوردناسی لە ئەڵەمانیادا ، ــ « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، بەرگی دووەم ، بەشی یەکەم ، ۱۹۷٤ ، ل ٤۱۳ ــ ٤۹۸ .

۱۰۹ــ **جەمیل صائب** ، لە خەوما ، پێشکەش‌کردنو لێکۆلینەوەی جەمال بابان ، بەغدا ، ۱۹۷٥ .

۱۱۰ــ « **جەنگاوەرێکی ڤیێتنامی** » ، محەممەدی مەلا کەریم لە عەرەبی‌یەوە کردوویە بە کوردی ، بەغداد ، ۱۹۷۰ ، ۱۷٤ ل .

۱۱۱ــ **جەواری ن.** ، کلامێد جماعەتا کوردا ، یەرێوان ، ۱۹٦۰ ، ٦۱ ل .

۱۱۲ــ « **جەواهێر لال نەهرو** » ، ــ « گەلاوێژ » ، ژمارە ٤ ، نیسانی ۱۹٤۸ ، ل ۱۱ ــ ۱٤ ، ٤۱ ــ ٤۳ .

ناوی کەسی بەسەرەوە نی‌یە . لە نووسینی مێژوونووسێکی سۆڤیێتی‌یەوە وەرگیراوە کە وا دیارە کراوەتە عەرەبی .

۱۱۳ــ **جومعە محەممەد مەحمود** ، ژیانی پێغەمبەری نازدارمان ، سلێمانی ، ۱۹۷٥ ، ۱۰۸ ل .

۱۱٤ــ « **چەپکێک لە قسەکانی ماو** » ، بەغداد ، ۱۹۷۲ ، ۳٥۸ ل .
لە بلاوکراوەکانی « کتێبخانەی بیری نوێ »یە . ناوی وەرگێری لەسەر نی‌یە . وا پێدەچێ دەستەیەک لە عەرەبی‌یەوە کردبێتیانە کوردی .

١١٥ــ **چرا** ، چەند کورد گەلاوێژ دەخوێننەوە ، ــ « گەلاوێژ » ، ژمارە ٦ ، حوزەیرانی ١٩٤٤ ، ل ١٤ ــ ١٦ .

١١٦ــ « **چمکێك لە مێژووی هەورامان** » ، محەمەدی مەلا کەریم لە فارسی‌یەوە کردوویە بە کوردی ، بەغداد ، ١٩٧٠ ، ٤٩ ل .
دەربارەی بڕوانە : ل ٢٣٦ ــ ٢٣٧ .

١١٧ــ « **چەنگیز خان** » ، ن . أ . لــە ئینگلیــزی‌یەوە وەری‌گێڕاوە ، ــ « گەلاوێژ » ، بەشی یەکەم : ژمارە ٥ ، مایــس ١٩٤٣ ، ل ٧ ــ ١١ .
بەشی دووەم ، ژمارە ٦ ، حوزەیرانی ١٩٤٣ ، ل ٣٣ ــ ٣٧ .

**حاجیا جندی :**

١١٨ــ فۆلکلۆرا کرمانجا ، یەریڤان ، ١٩٣٦ ، ٦٦٤ ل .
لەگەڵ ئەمینێ ئەڤدال دایناوە .

١١٩ــ کلامێد جماعەتا کوردایە لیریکی‌یێ ، ــ « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، بەرگی دووەم ، بەشی یەکەم ، ١٩٧٤ ، ل ٦٦٤ ــ ٧٥٠ .

١٢٠ــ کلامێد جماعەتا کوردایە لیریکی‌یێ ، یەریڤان ، ١٩٧٢ ، ٢٤٠ ل .
دوکتۆر مارف خەزنەدار نرخاندوویە ( بــڕوانە : « ڕۆژی کوردســتان » ، ژمارە سێ ، ئاداری ١٩٧٣ ، ل ٣٤ ــ ٣٧ ) .

١٢١ــ کلامێ جماعەتا کورمانجا ، یەریڤان ، ١٩٣٦ ، ١٦٤ ل .
دەربارەی پەندی پێشینیانە .

١٢٢ــ **حامید فەرەج** ، ڕێنووسی کوردی لە سەدەیەکدا ، بەغــدا ، ١٩٧٦ ، ٤٢ ل .
لە چاپکراوەکانی « کۆڕی زانیاری کورد »ە .

حەسەن فەهمی جاف :

١٢٣ــ چەن وتارێکی بەنرخی پیاوە گەورەکانی تاریخ ، ــ «گەلاوێژ» ، ژمارە ٨، ئەیلی ١٩٤٤ ، ل ١٩ ــ ٢٦ .

١٢٤ــ شازادەی بتلیس ، ــ « گەلاوێژ » ، ژمــارە ٧ ، تەممووزی ١٩٤٣ ، ل ٤٧ ــ ٥٢ .
دەربارەی بڕوانە : ل ١٤٢ .

١٢٥ــ عەلی موراد خانی زەند ، ــ « گەلاوێژ » ، ژمارە ٤ ، نیسانی ١٩٤٥ ، ل ١ ــ ٦٠ .

دەربارەی بڕوانە : ل ١٤٣ .

١٢٦ــ کەریم خانی زەند ، ــ « گەلاوێژ » ، ژمارە ١٠ ، تشرینی یەکەمی ١٩٤٣، ل ١ ــ ٦ .

دەربارەی بڕوانە : ل ١٤٣ .

١٢٧ــ لطفعلی خانی زەند ، ــ « گەلاوێژ » ، ژمارە ١ ، کانونی دووەمی ١٩٤٤، ل ٥ ــ ١١ .

دەربارەی بڕوانە : ل ١٤٣ .

١٢٨ــ مێژووی خوڵمار ، ــ « گەلاوێژ » ، ژمارە ١٢ ، کانونی یەکەمی ١٩٤٤، ل ١ ــ ١٠ .

دوو پەڕاوێزی هی ئەمین زەکی‌و یەکێکیان هی عەلائەددین سەجادی‌یە ــ دەربارەی بڕوانە : ل ١٤٣ .

١٢٩ــ حەسەن قزلجی، شاعیری میللی‌و بەناوبانگی کورد هەژار ، ــ «هەڵاڵە»، ژمارە ٣ ، بانەمەڕی ١٣٢٥ ، ل ١٦ ــ ١٩ .

## حسەین حوزنی موکریانی :

١٣٠ــ اقتصادیاتی نیشتمان‌و کۆمەڵی کوردان ، ــ « ڕوناکی »(١٩) ، ٣١ی تەشرینی یەکەمی ١٩٣٥ ، ل ١٤ ــ ١٥ .

بە ناوی ح.ح. ڕەنجبەرەوە بلاوی‌کردۆتەوە . بەشی هەرە زۆری وتارەکانی « ڕوناکی » نووســـینی حســەین حوزنی موکریانین ، بۆیەکا بەشێکیانی بـــە نـــاوی خۆیـــەوە بلاونەکردۆتەوە . لەو ژمارەیەی « ڕوناکی »دا کە ڕۆژی ١٩ی کانونی یەکەمی ١٩٣٥ چاپ‌کراوە پێنج وتاری بلاوکردۆتەوە، یەکێکیان دەربارەی ناپلیۆن‌و یەکێکیان دەربارەی مۆسۆلینی‌یە.

١٣١ــ ئاوڕێکی پاشەوە ، بەرگی یەکەم ، ڕەواندز ، ١٩٢٩ ، ٣٧ ل . ، بەرگی دووەم ، ڕەواندز ، ١٩٣٠ ، ٦٩ ل . ، بەرگی سێیەم ، ڕەواندز، ١٩٣١، ٥٠ ل .

---

(١٩) گۆڤار ، هەولێر ــ ژمارە یەکی ٢٤ی تشرینی یەکەمی ١٩٣٥ چاپ‌کرا .

باسی ژمارەیەك میرنشینی کوردو مێژووی هەولێرو شارەزور لە سەدە ناونجی‌یەکاندا دەکـــات . لەبریتی بەرگ یا بەش ( بەند )ی بەکار هێناوە .

١٣٢ـ بەکورتی هەلکەوتی دێرێکی لە ڕۆژنامەکانەوە ، بەغدا ، ١٩٤٧ ، ٤١ ل.
دەربارەی مەهاباده . ژمارەیەك وێنەی مێژوویی لەگـــەڵ بلاوکردۆتەوە .

١٣٣ـ پێشکەوتن ، ڕەواندز ، ١٩٢٧ ، ٥٣ ل .
١٣٤ـ تاریخی حوکمدارانی بابان ، ڕەواندز ، ١٩٣١ ، ١٧٣ ل .
١٣٥ـ جەمالەدینی ئەوغانی ، ـ « گەلاوێژ » ، بەشی یەکەم : ژمـاره ١٠ ، تشرینی یەکەمی ١٩٤٤ ، ل ١ ـ ٨ . بەشی دووەم : ژمارە ١ ، کانونی دووەمی ١٩٤٥ ، ل ٧ـ ١٤ .

١٣٦ـ غونچەی بەهارستان ، حەلەب ، ١٩٢٥ ، ٩٤ل . ( ؟ ) .
دەربارەی بڕوانە : ل ١٦٨ .

١٣٧ـ کوردستانی موکریان . ئەترۆپاتین ، ڕەواندز ، ١٩٣٨ ، ٤٧٢ ل .
ئاترۆپاتەکان یا ئەترپاتەکان یا ئادۆربیجان زاراوێکی کۆنە لـە بەلگە گرێکی‌و پەهلەوی‌و ئەرمەنی‌و ســریانێکاندا بەکـار هێنراوە . لە سەردەمی کۆن‌و سەدە ناونجی‌یەکاندا بـەو ناوچەیە دەگوترا کە ئیستە شاخەکانی تالش‌و مەلبەندەکانی دەوروبەری ڕۆباری ئاراس‌و گۆمی ورمێ پێکدەهێنن ، واتـە میدیای پچوك یا میــدیای باکور کە سەدەی چوارەمی پێش عیسا ئەترۆپات فەرمانڕەوای بوو و ناوی لەوساوە بەســەر ناوچەکەشدا دابڕا . ناوی ئازەربایجان لــە ئاترۆپاتەکانەوە هاتووە . حسەین حوزنی موکریانی یەکەم مێژوونووسی کوردە ئەو زاراوەی بەکار هێناوە .
١٣٨ـ کورد لە ڕوسیە ، ـ « گەلاوێژ » ، ژمــارە ٦ ، حوزەیرانی ١٩٤٤ ، ل ٢٥ ـ ٢٩ .

١٣٩ـ کوردو نادر شا ، ڕەواندز ، ١٩٣٤ ، ٩٠ ل .
١٤٠ـ کوردی زەند ، ڕەواندز ، ١٩٣٤ ، ٩١ ل .
١٤١ـ لاپەڕەیەك لە دێرێکی کوردستانی موکریان ، بەغدا ، ١٩٤٧ ، ٣٦ ل .
١٤٢ـ مێژووی میرانی سوران ، ڕەواندز ، ١٩٣٥ ، ١١٢ ل. ، چاپی دووەم : هەولێر ، ١٩٦٢ ، ١٢٦ ل .

١٤٣ـ نەژادو بنەچەکەی کورد ، ـ « ڕوناکی » : بەشی یەکەم ٢٤ ی تشرینی یەکەمی ١٩٣٥ ، ل ٧ ـ ٩ . بەشی دووەم ٣١ی تشرینی یەکەمی ١٩٣٥ ،

ل ۱ ــ ٥ . بەشی‌ی سێیەم ، ۲۹ی تشرینی دووەمی ۱۹۲۵ ،ل ۱ــ۲ .
دەربارەی مێژووی کۆنی کورده . سەرچاوەی ئەرمەنی‌و کتێبی سترابۆنی زانای جوگرافیی بەکارهێناوه . پێوەندیی کورد به کاردۆخەوه نیشان دەدات . بەرپەرچی لێرخ دەداتەوە که کوردی گێڕاوەتەوه سەر کلدانی .

**حسەین ڕەشوانی :**

۱٤٤ــ حاجی قادری کۆیی ماموستاو ڕابەری نەتەوەی کورده ،ــ « کاروان »(۲۰) ، ژماره ۷ ، نیسانی ۱۹۸۳ ، ل ۲٤ ــ ۳۱ .

۱٤٥ــ کورته باسێك لەسەر نەورۆز ، ــ « کاروان » ، پاشکۆی ژماره ٦ ، ئاداری ۱۹۸۳ ، ص ۳۹ ــ ٤۷ .

۱٤٦ــ **حسەین عارف** ، حیکایەتی دەرکردنی ژماره ( سفری ) « ڕۆشنبیری نوێ » ، ــ « ڕۆشنبیری نوێ » ، ژماره ۷۸ ، کانونی یەکەمی ۱۹۷۹ ، ل ۱۰ ــ ۱۳ .

۱٤۷ــ **حەمدون** ، شەڕی پێشو ، ــ « گەلاوێژ » ، ژماره ٤ ، سالی ۷ ، نیسانی ۱۹٤٦ .

۱٤۸ــ **« حیزبی دیموکراتی کوردستان »** ، ــ « کوردستان »(۲۱) ، ژماره ۱ ، سەرماوەز ۱۳۲٤ ، ل ۱۱ ــ ۱۲ .

۱٤۹ــ **خالفین ن . ا .** ، خەبات لەڕێی کوردستاندا ، وەرگێڕانی جەلال تەقی ، سلێمانی ، ۱۹۷۰ ، ۲۲۰ ل .

دەربارەی بروانه : ل ۲۳۹ ــ ۲٤۰ .

۱٥۰ــ **خالیدی چەتۆ** ، کوردی ئەرمەنستانی سۆڤیتی ، وەرگێڕانی دوکتۆر عیزەددین مستەفا ڕەسوڵ ، ــ « برایەتی » ، ژماره ۱ ، سالی ۱ ، خولی دووەم ، حوزەیرانی ۱۹۷۰ ، ل ۲٦ ــ ۲۸ .

بەشێکه له کتێبی ناوبراو له ڕووسی‌یەوە کردوویه به کوردی. بروانه ژماره ۸۷۰ .

---

(۲۰) گۆڤاری ئەمینداریتی گشتیی ڕۆشنبیری‌و لاوانه . ژماره یەکی مانگی تشرینی یەکەمی ۱۹۸۲ دەرچو .

(۲۱) گۆڤار ، مەهاباد . بلاوکەرەوەی بیری پارتی دیموکراتی کوردستان بوو . ژماره یەکی ١٥ی سەرماوەزی ۱۳۲٤ ، ٦ی کانونی یەکەمی ۱۹٤٦ دەرچو.

١٥١ـ « خەباتی کرێکاران » ، سلێمانی ، ١٩٧٣ ، ٧٦ل .

١٥٢ـ « خەباتی گەلی کورد لە یادداشتەکانی ئەحمەد تەقیدا . لاپەڕەیەك لە شۆڕشەکانی شێخ مەحمودو سمکۆو هەستانەکەی ڕەواندز » ، ڕێكخستن و ئامادەکردنی بۆ چاپ جەلال تەقی ، سلێمانی ، ١٩٧٠ ، ٩٢ ل .

دەربارەی بروانە : ل ١٧٩

١٥٣ـ خدری سلێمان و خەلیلی جندی ، ئێزدیاتی لەبەر ڕۆشنایا هەندەك تێکستێد ئاینێ ئێزدیان ، بغدا ، ١٩٧٩ ، ٢١٦ ل .

لە چاپکراوەکانی « کۆڕی زانیاری کورد »ە .

١٥٤ـ « خلاصەی مسئلەی کورد » ، کۆڕینی رفیق حلمی ، موصل ، ١٩٢٤ ، ٣٢ ل .

لە فەرەنسی‌یەوە کردوویە بە کوردی(٢٢) . دەربارەی بروانە : ل ٢٣٣ .

١٥٥ـ دیاکونوف ئی . م . ، میدیا ، برهان قانع لە فارسی‌یەوە کردویەتی بە کوردی ، بغدا ، ١٩٧٨ ، ٨٨٧ ل .

دەربارەی بروانە : ل ٢٢٤ ـ ٢٢٥ .

١٥٦ـ « دەربارەی چەند مەسەلەیەکی تیۆری » ، بغداد ، ١٩٧٤ ، ٤٣ ل .

لە بلاوکراوەکانی بالیۆزخانەی کۆریای دیموکراسی‌یە لە بغدا .

١٥٧ـ دەوسیم ، مەلا محمدی کۆیی ، ـ « ڕۆژی نوێ » ، ژمارە حەوت ، ڕەزبەر ٢٥٧٢ ك ـ تەشرینی یەکەم ١٩٦٠ز ، ل ٧٦ ـ ٨١ .

١٥٨ـ « دەستووری کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد لە ئەوروپا » ، ـ « برایەتی » ، ژمارە ١٠ ، سالی ١ ، خولی دووەم ، کانونی دوومی ١٩٧١ ، ل ١٧ ـ ١٨ .

١٥٩ـ « دەسەلاتی سۆڤیەت و باری ئافرەت » ، بغداد ، ١٩٧٤ ، ١٦ ل .

سامی‌یە چاوشلی لە عەرەبی‌یەوە کردوویە بە کوردی .

١٦٠ـ دڵسۆز ، بۆ ئەوەی مێژووی نوێشمان کوێرنەبێتەوە ، ـ « بەیان » ، ژمارە ٤ ، ١٩٧٠ ، ل ٦ ـ ٧ .

دڵسۆز یەکێك لە نازناوەکانی محەمەدی مەلا کەریمە .
دەربارەی بروانە : ل ٢٣١ ـ ٢٣٢ .

---

(٢٢) بەشێکە لەم کتێبە : "L' Iraq et la Société des Nations".

١٦١ـ دلسۆز ، پارتێکی سیاسی تورك بڕیار لەسەر بوونی نەتەوەی کورد نەدات ، ـ « برایەتی » ، ژمارە ١٣ ، سالی ١ ، خولی دووەم ، نیسانی ١٩٧١ ، ل ٣ ـ ٤ ، ٢٠ .

« پارتی کرێکاران »ی تورکیایە .

١٦٢ـ دلسۆز ، تا گربداغ چوین ، ـ « گەلاوێژ » ، ژمارە ٩ ـ ١٠ ، ئەیلول ـ تشرینی یەکەمی ١٩٤٧ ، ل ٤١ ـ ٤٩ .

١٦٣ـ دلسۆز ، نەوتی عیراق لە بیرەوە تا دەریا ، ـ « گەلاوێژ » ، ژمارە ٦ ، حوزەیرانی ١٩٤٧ ، ل ٢٢ ـ ٣٢ ، ٦٥ ـ ٦٦ .

لە عەرەبیەوە کراوە بە کوردی(٢٣) .

١٦٤ـ دلشاد ، هۆشی مینە یا نیو سەدە خەبات ، ـ « برایەتی » ، ژمارە ٧ ، سالی ١ ، خولی دووەم ، تشرینی یەکەمی ١٩٧٠ ، ل ١٠ ـ ١٢ ، ١٤ .

دلشاد نازناوی خوالێخۆشبو ئەحمەد غەفورە .

١٦٥ـ دیمیترۆف ، دەربارەی کادیر ، جەلال دەبباغ کردوویە بە کوردی ، بەغداد ، ١٩٧٢ ، ١٦ ل .

١٦٦ـ « ڕاپەڕینەکانی بارزان بە واتەی هەندێك لە بەشداربووەکانی » ، کۆکردنەوەی قەنالی کوردۆ ، ئامادەکردنو بلاوکردنەوەی دوکتۆر کاوس قەفتان ، ـ « ڕۆژی کوردستان » ، ژمارە ١٥ ، کانوونی دووەمی ١٩٧٤ ، ل ٤٦ ـ ٤٩ .

١٦٧ـ « ڕاپۆرتێك دەربارەی فیستیڤالی دەیەمی لاوانو قوتابیانی گیتی » ، بەیامنێری گۆڤاری « ڕۆژی کوردستان » جەمال خەزنەدار ئامادەی کردووە ، ـ « ڕۆژی کوردستان » ، ژمارە ٦ ، تشرینی یەکەمو دووەمی ١٩٧٣ ، ل ٥٢ ـ ٥٦ .

باسی چالاکیی نوێنەرانی « یەکێتی لاوانی دیموکراتی کوردستان » لە فیستیڤالی ناوبراو دەکات کە کۆتایی تەمموز ـ سەرەتای ئابی سالی ١٩٧٣ لە بەرلین بەسترا .

١٦٨ـ « ڕاپۆرتێك دەربارەی کۆمیتەی ناوەندی » ، بەغداد ، ١٩٧٢ ، ١٦٢ ل .

دەربارەی کۆنگرەی پێنجەمی « پارتی کار »ی کۆریایە . ناوی وەرگێری لەسەر نییە . لە بلاوکراوەکانی « کتێبخانەی بیری نوێ »یە .

---

(٢٣) دەربارەی دەقی عەرەبیی ئەو وتارە بڕوانە : « المعلم الجديد » ( مجلة ) ، بغداد ، نيسان ١٩٤٧ .

١٦٩ــ ڕەئوف سەلیم ، مەلا ، کوردستان‌و ئایینی ئیسلام ، بەغداد ، ١٩٧٠ ، ١٣٢ ل .

١٧٠ــ ڕەحمی ع . ، ژێ بۆ شەریف پاشا ، ــ « ژین »(٢٤) ، عدد ٢٢ ، ١٣٣٥ ، ص ١٥ ــ ١٦ .

شیعرە بەسەر شەریف پاشای بەناوبانگدا هەڵدراوە .

ڕەحیمی قازی ، دوکتۆر :

١٧١ــ پێش‌مەرگە. لاپەڕەیەکە لە خەباتی نەتەوەی کورد بەرامبەر ئاغاوەت‌و داگیرکەران لە دەوروبەری جمهووریەتی دیموکراتی کوردستانا ، بەغدا ، ١٩٦١ ، ١٦٠ ل .

دەربارەی بڕوانە : ل ٢١٥ .

١٧٢ــ قازی موحەممەد ، دەستنووس .

دەربارەی بڕوانە : ل ٢١٤ ــ ٢١٥ .

١٧٣ــ « ڕەسافی » ، ــ « گەلاوێژ » ، ژمارە ٤ ، نیسانی ١٩٤٥ ، ل٥٤ــ٦٠ .

کورتەی ژینامەی شاعیری عەرەبی کوردی نەژاد مەعــروف ڕەسافی‌یە کە خۆی حەزی کردووە هەر بە عەرەب ناوببرێ .

١٧٤ــ ڕەشید غەفور ، کوردو فەلەستین ، ــ « گەلاوێژ » ، ژمارە ١١ ، تشرینی دووەمی ١٩٤٧ ، ل ٢٥ ــ ٢٩ .

کۆتایی وتارەکەی بەم جۆرە هێناوە : « پایەدار بێت تەقەلای گەلان لە ڕێی ئازادی‌و سەربەخۆیی‌یانا . بژی یەکێتی کوردو عەرەب . بڕوخێ ئیستیعمار ، نەژێ سەهیونیتی ، بــژی دیموکراتی » .

١٧٥ــ ڕەشید کەریم ، بیرەوەری ، سلێمانی ، ١٩٦٠ ، ٦٤ ل .

بیرەوەریی ژیانی مامۆستایی خۆیەتی . گۆران پێشــەکی بۆ نووسیوە .

١٧٦ــ ڕەشید نەجیب ، ئەمین زەکی ، ــ « گەلاوێژ » ، ژمــارە ٧ ، تەمموزی ١٩٤٨ ، ل ٤٩ ــ ٥٢ .

بــەبۆنەی کۆچی دوایی مامۆســـتا ئــەمین زەکی‌یەوە بڵاوی‌کردۆتەوە .

---

(٢٤) گۆڤار ، ئەستەموول ، ژمارە یەکی لەگەڵ تەواوبوونی شـــەڕی یەکـەمی جیهاندا دەرچو .

١٧٧ـ ڕەشید یاسمی ، مێژووی نەژادو پەیوەستەگی کورد ، قانیـــع و کەریم زەند کردوویانە بە کوردی ، سلێمانی ، ١٩٧٠ .
دەربارەی بڕوانە : ل ٢٣٢ ــ ٢٣٤ ، ٢٤٦ ــ ٢٤٧ .

**ڕەفیق حیلمی :**

١٧٨ـ شیعرو ئەدەبیاتی کوردی ، بەغداد ، ١٩٤١ ، ١٥٠ ل .
١٧٩ـ یادداشت ، بەشی ١ ــ ٤ ، بەغدا ، ١٩٥٦ ، بەشی ٥ ، بەغدا ، ١٩٥٧ ، بەشی ٦ ، بەغدا ، ١٩٥٨ .

بەسەر یەکەوە ٦٣٧ لاپەڕەن ، یەکێکـــە لـــە ســـەرچاوە ڕەسەنەکانی لێکدانەوەی ڕاپەڕینەکانی شـــێخ مەحمود .
دەربارەی بڕوانە : ل ١٧٨ ــ ١٧٩ .
١٨٠ـ یەك لە دوای یەك ئاوابوونی چوار ئەستێرە لە ئاسمانی کوردستاندا ، ــ « گەلاوێژ » ، ژمارە ٢ ، شوباتی ١٩٤٩ .

بەبۆنەی کۆچی دوایی ئـــەمین زەکی و زیوەرو بێکـــەس و دلدارەوە نووسیویە .

**ڕەفیق چالاك :**

١٨١ـ کوردو یەکیەتی عەرەب ، ــ « گەلاوێژ » ، ژمـــارە ٤ ، نیسانی ١٩٤٤ ، ل ١ ــ ٩ .

لێدوانە لە وتارەکەی عەلی کەمال ، ( بڕوانە ژمارە ٣١ ) .

١٨٢ـ مشتێك خۆڵ ، ــ « گەلاوێژ » ، ژمارە ٩ ، ئەیلولی ١٩٤٤ ، ل ٢١ــ٢٢ .

پارچەیەك پەخشانی مێژوویی ڕازاوەیە . چـــالاك یەکێکە لەوانەی ، بەداخەوە ، نە ئێمەو نە خۆی نرخیمان نەزانی .

**ڕەمزی قەزاز :**

١٨٣ـ بزوتنەوەی کورد ، سلێمانی ، ١٩٧١ ، ٢٤٨ ل .
دەربارەی بڕوانە : ل ٢٢٦ ــ ٢٢٧ .

١٨٤ـ داستانی دوو پاڵەوان ، بەغداد ، ١٩٦٨ ، ٩٦ ل .
داستانی ئەقی ئەحمەدی دارشمانەیە .

١٨٥ـ سەلاحەددین شیاوی شانازی یە بۆ کورد ، ــ « ڕۆژی کوردســـتان » ، ژمارە ٢ ، ساڵی ٢ ، ل ٦١ ــ ٦٢ .

١٨٦ـ مێژووی کوردو کوردستان لە چەند دێڕێکدا . جەنگی یەکەمی جیهـانو هاتنی سوێندخواران بۆ ئەستەموول . باری سـیاسی لە کوردستانی ژوورودا ، ـ « برایەتی » ، ژمارە ١٣ ، ساڵی ١، خولی دووەم ، نیسـانی ١٩٧١ ، ل ٣١ ـ ٣٢ .

١٨٧ـ « ڕۆژی کوردستان » ، کۆکردنەوەو پێشەکیی جەمال خەزنەدار، بەغدا، ١٩٧٣ ٧٦ ل .

دەربارەی بڕوانە : ل ٢٢٩ .

١٨٨ـ « ڕۆژی کورد ١٩١٣ » ، بڵاوکردنەوەو پێشەکی‌و لەسەرنووسینی جەمال خەزنەدار ، بەغدا ، ١٩٨١ ، ١٢٥ ل.

دەربارەی بڕوانە : ل ٢٢٩ .

١٨٩ـ « ڕۆژی نوێ » ، ژمارە دە ، بەفرانبار ٢٥٧٢ک ـ کانونی دووەم ١٩٦١ز.
بەشی زۆری وتارو لاپەڕەکانی بۆ مێژووی « کۆماری مەهاباد» تەرخان کراوە .

١٩٠ـ « ڕوناکی ڕێکوپان » ، سلێمانی ، ١٩٤٠ ، ١٤ ل .
لە بڵاوکراوەکانی گۆڤاری « دەنگی گێتی تازە »یە . باسـی هۆکـانی بەرپـابوونی شـەڕی دووەمی جیهـــان دەکـات . دژی هیتلەرییەکانە .

١٩١ـ « ڕوونکردنەوەیەک دەربارەی مێژووی ڕۆژنامـــە نهێنییەکان » ، ـ « برایەتی » ، ژمارە ١١ ، ساڵی ١ ، خولی دووەم ، شوباتی ١٩٧١ ، ل ٢٩ .

ڕوونکردنەوەیەکی مامۆستا ساڵح حەیدەرییە دەربـارەی ڕۆژنامەی « ڕزگاری » . هەڵەیەکی منی ڕاستکردۆتەوە .

١٩٢ـ « زارگوتنا کوردا » ، کتێبی یەکەم ، مۆسکۆ ، ١٩٧٨ ، ٥٠٨ ل . ، کتێبی دووەم ، مۆسکۆ ، ١٩٧٨ ، ٥٣٤ ل .

گەورەترین بەرهەمی فۆلکلۆریی کوردییە ، جووتە برا دوکتۆر ئۆردیخانی جەلیل‌و دوکتۆر جەلیلی جەلیل کۆیان‌کردۆتەوەو ڕێکیان‌خستووەو لێی دواون‌و پێشەکییان بە کوردی‌و بـە ڕووسی بۆ نووسیوە . تەنها گۆرانییـــە مێژووییەکانی ٦٥ لاپەڕەیان پڕکردۆتەوە ( کتێبی یەکـــەم ل ٢٥٦ ـ ٣٢١ ) . ئەوانیتری داستان‌و شـــیوەن‌و پەندو مەتەڵ‌و مەتەڵۆکی هەمەجۆرن کە ئەوانیش بایەخیان بۆ مێژوونووس کەم نییە . ( زارگوتنا )یان لەبریتی « فۆلکلۆر » بەکار هێناوە کە لە وشەی ( زار )و ( گوتن )ەوە دایانڕشتووە .

٨٤٢ـ **محمود زامدار** ، نصف قرن مع محو الامية في كردستان . « كۆمەڵی زانستی كوردان » ، ـ « العراق » ، ٥ تموز ١٩٨٠ .

٨٤٣ـ « **مذكرات مامون بك بن بيگه بك** » ، نقلها الى العربية وعلق عليها محمد جميل الروژبياني وشكور مصطفى ، بغداد ، ١٩٨٠ ، ٩٥ ص .
لە چاپكراوەكانی « كۆڕی زانیاری عیراق ـ دەستەی كورد »ە،

**مسعود محمد :**

٨٤٤ـ حول مسار حملة سرجون في كردســـــتان ، ـ « التآخي » ، ٢٦ آب ١٩٧١ ، ص ٨ .

٨٤٥ـ ممدوح سليم ـ ربع قرن من النضال الكردي الدؤوب ، ـ « مجلـــة المجمع العلمي الكردي » ، المجلد الخامس ، ١٩٧٧ ، ص ٥٠٩ـ٥١٣ .

**معروف جياوك :**

٨٤٦ـ القضية الكردية ، بغداد ، ١٩٢٥ ، ١١٥ ص .
ناوەرۆكی وەڵامە بۆ نووسینێكی ئەنەستاس ماری كەرمەلی.
بە ناوی ( جیاوك الكردی )یەوە بڵاوی كردۆتەوە .

٨٤٧ـ مأساة بارزان المظلومة ، بغداد ، ١٩٥٤ .

٨٤٨ـ نيابتي في ١٩٢٨ ـ ١٩٣٠ ، بغداد ، ١٩٣٧ ، ٢٤٠ ص .
وتارو قسەكانی‌یە لە پەرلەماندا . گەلێك باسی هەواڵێرو پێویستی‌یەكانی تێدایە . نیشتەجێ‌كردنی ئاسووری‌یەكانو چالاكی‌یەكانی لەشكر لە زێبارو عەممادی‌یە لە باسەكانین .

**معروف خزنەدار ، الدكتور :**

٨٤٩ـ الشعر السياسي الكردي في كردستان العراق بين الحربين العالميتين، ـ « ڕۆژی كوردستان ـ شمس كردستان » العدد الثالث ، آذار ١٩٧٣ ، ص ١٦ ـ ١٨ .

٨٥٠ـ مخطوطات فريدة ومطبوعات نادرة ، الجزء الاول ، بغداد ، ١٩٧٨ ، ٨٦ ص .

٨٥١ـ **مغيد حاجي** ، حسين حزني المكرياني ، ـ « العراق » ، ٢٤ ايلول ١٩٨١ .

٨٥٢ـ « **مقدمة في اصل الشعب الكردي** » ، اعـــداد أ . ف . ، ـ « رۆژی کوردستان ـ شمس کردستان » ، العـــدد ٤٣ ـ ٤٤ ، كانون الاول ١٩٧٧ ، ص ٢٠ ـ ٢٣ .

أ . ف . دوکتۆر ئیحسـان فوئاده .

**مكرم الطالباني ، الدكتور :**

٨٥٣ـ ابراهيم خان ثائر من كردستان ، بغداد ، ١٩٧١ ، ١٠٤ ص .

دەربارەی برایم خانی دەلۆیە . نەریمـــان نرخـــاندوویە ( بڕوانە : « التآخي » ٧ آذار و ١١ نيـسان ١٩٧١ ) لە هەمان ڕۆژنامەدا دوکتۆر موکەڕەمیش وەڵامی داوەتەوە ( «التآخي» ٢٢ آذار ١٩٧١ ) .

٨٥٤ـ الثروة الزراعية في كردستان ، ـ « رۆژی کوردســـــتان ـ شـمس كردستان » ، العدد الاول ، حزيران ١٩٧١ ، ص ٧ ـ ٨ .

٨٥٥ـ دروس وعبر من انهيار التمرد الرجعي في كردســـــتان ، ـ « ڕۆژی کوردستان ـ شمس كردستان » ، العدد ٢٧ ، ١٩٧٥ ، ص ١ـ٢ .

بە هەڵە نووسراوە ساڵی ١٩٥٧ .

٨٥٦ـ **ملا شريف** ، الصداقة العربية الكردية ، موصل ، ١٩٥٨ ، ٢٤ ص .

٨٥٧ـ « **المنطلقات المبدئية للحزب الديمقراطي الكردستاني** » ، بغداد ، ١٩٧٨ ، ٥٠ ص .

٨٥٨ـ « **المنهاج والنظام الداخلي لاتحــــاد الادبـــاء الاكراد** » ، ـ « ڕۆژی کوردستان ـ شمس كردستان » ، العدد ٤٩ ، شـــباط ١٩٧٨ ، ص ٢٥ ـ ٢٩ .

٨٥٩ـ « **المنهاج والنظام الداخلي لجمعيـــة الثقافة الكردية** » ، ـ « ڕۆژی کوردستان ـ شمس كردستان » ، العدد ٤٩ ، شـــباط ١٩٧٨ ، ص ٣٠ ـ ٣٤ .

٨٦٠ـ « **للنهاج والنظام الداخلي للحزب الديمقــراطي الكردستاني ـ ايران . اقره الكونفرانس الثالث للحزب** » ، بلا ، ١٩٧١ ، ٢٩ ص .

٨٦١ـ « **المؤتمر الثالث للحزب الديمقراطي الكردستاني ( ايران )** » ، ڕەزبـەر ١٣٥٢ ـ ايلول ١٩٧٣ ، بلا ، ٥٢ ص .

٨٦٢ـ « **المؤتمر المحلي الاول للمعلمين الاكراد في شـــقلاوه** » ، بغـــداد ، ١٩٥٩ ، ٤٠ ص .

لە بڵاوکراوەکانی ڕۆژنامەی « ئازادی »یە .

٨٦٣ـ « **موجز تاريخ الحزب الديمقراطي الكردستاني حتى نهـــاية المؤتمـــر الثالث** » ، ـ « الكادر » ، العدد الثامن ، شباط ١٩٧١ ، ص ٧١ـ٨٢ .
زنجيره‌یه‌ك وتاری گرنگه « الكادر » له ژماره هه‌شتی‌یه‌وه ده‌ستی كرده بلاوكردنه‌وه‌ی .

٨٦٤ـ **مينورسكي ف .** ، الاكراد احفاد الميديين ، ترجمـــة وتعليق الدكتور كمال مظهر احمد ، ـ « مجلة المجمع العلمي الكردي » ، المجلد الاول ، العدد الاول ، ١٩٧٣ ، ص ٥٥٢ ـ ٥٦٦ .

٨٦٥ـ **مينورسكي ف . ف .** ، الاكراد . ملاحظات وانطباعات ، ترجمه وعلق عليه وقدم له الدكتور معروف خزنه‌دار ، بغداد ، ١٩٦٨ ، ٩٨ ص .
ده‌رباره‌ی بروانه : ل ٢٤١ .

٨٦٦ـ « **النظام الاساسي والداخلي لنادي جمعية الارتقاء الكوردي** » ، بغداد ، ١٩٣٠ ، ١٣ ص .
ده‌رباره‌ی « یانه‌ی سه‌ركه‌وتنی كوردان » ی به‌غدایه .

٨٦٧ـ « **النظام السياسي والداخلي للجمعية الخيرية لمعاونة فقراء الاكـــــراد بالجزيرة** » ، بيروت ، ١٩٣٢ ، ٣٤ ص .
به عه‌ره‌بی‌و كوردی‌و فه‌ره‌نسی‌یه .

٨٦٨ـ **نيكيتين ف .** ، العائلة البارزانية ، ترجمة الدكتور كاوس قفطان ، ـ « رۆژی كوردستان ـ شمس كردستان » ، العـــدد الخامس ، آب ١٩٧٣ ، ص ١٩ ـ ٢٢ .

**هادي رشيد چاوشلي :**

٨٦٩ـ الحياة الاجتماعية في كردستان ، بغداد ، ١٩٧٠ ، ١٦٠ ص .
٨٧٠ـ القومية الكردية وتراثها التاريخي ، بغداد ، ١٩٦٧ ، ١٢٤ ص .
وه‌زاره‌تی ئیرشاد چـــاپی‌كردووه . واتای نه‌ته‌وه‌ی كوردو جوگرافیای كوردستان‌و مێژووی كۆن‌و میرنشینه‌كانی كوردو ژیانی كورده‌واری دوای شه‌ڕی یه‌كه‌می جیهان له باسه‌كانین .

٨٧١ـ مشاكل العراق الداخلية مع الايام ، بغداد ، ١٩٦٧ ، ٩٦ ص .
له به‌شی چواره‌میدا باسی مه‌سه‌له‌ی كورد ده‌كات .

٨٧٢ـ **هاشم طه عقراوي** ، الاســس النفسـية والاجتماعية للقبـائل الكردية ، كركوك ، ١٩٧١ ، ١٦٠ ص .
ژیانی ئایینی‌و كۆمه‌لایه‌تی‌و پێوه‌ندیی ده‌ره‌به‌گی له ناو هۆزه كورده‌كاندا له باسه‌كانین .

## (٣) به زمانی تورکی‌و ئاڵمانی‌و فارسی

٨٧٣ـ **احسان نوری** ، ویلسون پرنسیبی و کوردلر ، ـ « ژین » عدد ١٥ ، ٢٠ مارت ١٣٣٥ ، ل ٣ ـ ٥ .

باســــی کوردو چوارده خاڵه بەناوبەنگەکەی وەدرۆ ویلسنی سەرەك کۆماری وڵاته یەکگرتووەکانی ئەمەریکایە . بایەخی له هەموو ڕوویەکەوە زۆرە .لەوانەیە نووسەری ئیحسان نوری پاشا بێ .

٨٧٤ـ **احمد شریفی** ، عشایر شکاك و شرح زندگی آنها به رهبری اســماعیل اغا سمکو ، طهران ، ١٣٤٨ ، ٧٤ ص .

دەربارەی ئیسماعیل ئاغای شوكاك ( سمكۆ )یە .

٨٧٥ـ **امین بدرخان** ، حاصلاتی کردستانك عزم قوی جمعیتنه عائدر، ناشری: کردلر جمعیتی نامنه ، مطبعة اجتهادده طبع اولونمشدر .

٨٧٦ـ **« تورك عفو عمومیسی قارشیسنده کوردلر ســـــنة ١٩٣٢ »** ، کورد خویبون جمعیتی نشریاتندن ، عدد ٨ ، ٢٤ ص .

له چاپکراوەکانی « کۆمەڵی خۆیبون »ە . نیوەی به عەرەبی‌و نیوەکەی‌تری به تورکی‌یه .

٨٧٧ـ **« جلد دویم از کتاب شرف نامه تالیف شرف خان بن شمس‌الدین بدلیسی که باهتمام اقل عباد ولادیمیر ملقب ولیامینوف زرنوف در محروســـه پطربورغ در دار الطباع اکادمیه ایمپراطوریه سنه ١٨٦٢ عیسوی مطابق سنه ١٢٧٨ هجری مطبوع گردید »** ، ٢٠٨ ص .

دەربارەی بڕوانه : ل ١٠٤ ـ ١٢٦ .

٨٧٨ـ **« جلد یکم از کتاب شرف نامه تالیف شرف خان بن شمس‌الدین بدلیسی که باهتمام اقل عباد ولادیمیر ملقب ولیامینوف زرنوف در محروســـه پطربورغ در دار الطباع اکادمیه ایمپراطوریه سنه ١٨٦٠ عیسوی مطابق سنه ١٢٧٦ هجری مطبوع گردید »** ، ٤٥٦ ص .

دەربارەی بڕوانه : ل ١٠٤ ـ ١٢٦ .

٨٧٩ـ **حسین علی شانوف** ، عبدالله گوران پویزیسنده نوفاترلوغ مسلسی ، ـ « خبرلری » ، باکو ، ١ ، ١٩٦٤ ، ص ٥٧ ـ ٦٥ .

بڕوانه ژماره ٦٠٢ .

٨٨٠ـ **رحیم قاضی** ، سوفیت ئیتیفاقنده کوردشوناسلغن انکشافی و وزیفلری حقنده ، ـ « خبرلری » ، باکو ، عدد ۲ ، ۱۹۵۹ ، ص ۱۳۱ـ۱٤۲ .
دەربارەی کوردناسیی سۆڤیێتو ئەرکەکانی‌یە .

٨٨١ـ **رشید یاسمی** ، کردو پیوســـتگی نژادیو تاریخی او ، تهران ، ؟ ، ۲٤٦ ص .
خـــلوەتی مامۆســـتای زانکۆی تارانە . دەربارەی بروانە : ل ۲۳۳ ـ ۲۳٤ ، ۲٤٦ ـ ۲٤۷ .

٨٨٢ـ **سـیوەرکلی حلمی** ، کردلردە ضروب امثال ، ـ « ژین » ،عدد ۱۹ ، ۲۲ مایس ۱۳۳۵ ، ص ۹ ـ ۱۱ .
دەربارەی پەندی‌پێشنیانی کوردە .

٨٨٣ـ **شیلانلی زادە ایوب صبری** ، کوردلر تاریخی بـر ملتدر ، ـ « ژین » ، عدد ۱۸ ، ۸ مایس ۱۳۳۵ ، ص ۹ ـ ۱۱ .

٨٨٤ـ **عبدالعزیز یاملکی** ، کوردستان و کورد اختلاللری ، جلـد ۱ ، تهران ، ۱۹٤٦ ، ۹۵+ ٦ ص .
دەربارەی بروانە : ل ۲۲٦ .

٨٨٥ـ **« قیام شیخ عبیداللە شمزینی در کردستان »** ، به اهتمام عبداللە مردوخ کردستانی ، تهران ، ۲۵۳٦ ، ۱۱۰ ص .
دانەری کتێبەکە ناوی ئەسکەندەر قۆریانسە .

٨٨٦ـ **« کرد تعمیم معارف جمعیتی بیاننامەسی »** ، ـ « ژین » ، عـدد ۱۰ ، ۲ شباط ۱۳۳۵ ، ص ۱۰ ـ ۱٦ .
بایەخی مێژوویی زۆرە . پرۆگرامی کۆمەڵەی ناوبراوی لەگەڵ کە بریتی‌یە لە ۲۰ خاڵ .

٨٨٧ـ **« کرد طلبه هیوی جمعیتی بیاننامەسی »** ، ـ « ژین » ، عـــدد ۲۲ ، ۱۳۳۵ ، ص ۱۲ ـ ۱۳ .
لە هەمان ژمارەدا بە کوردیش بە ناوی «بەیانناما جڤاتا فقیه هیوی کوردان »ەوە بڵاوکراوەتەوە ( ل ۱٤ ـ ۱۵ ) . بایەخی مێژوویی زۆرە .

٨٨٨ـ **« کردستان »** ، ـ «ژین » ، عدد ۱۰ ، شباط ۱۳۳۵ ، ص ٦ـ۹ .
باسی سروشتو ژمارەو ڕەوشتی دانیشتوانی دەکـات . وا دیارە محەمەد ساکن نووسیویەو لـــە « ئەنسکلۆپیدیای بەریتانی » وەرگرتووە .

۸۸۹ــ **کەماڵ مەزهەر ئەحمەد** ، عيراق كوردستانندە ميللى ازادليق حركتنن سبلرى حقندە ( ۱۹۱۸ ــ ۱۹۳۲ ) ، ــ « خبرلرى . سوڤيت ئازربايجان عيلملر ئەكاديمياسنن » ، باكو ، نمره ۲ ، ۱۹٦٦ ، ص ۳۷ ــ ٤۲ .

دەربارەی هۆ بزوتنەکانی بزوتنەوەی ڕزگاریخوای کوردی عیراقە لە ڕۆژگاری فەرمانڕەوایی ئینگلیزدا .

۸۹۰ــ **« كورد مسئلەسى بر اجنبى نقطه نظرندن . ممتاز مستشرق موسيو باسيل نيكيتينيك ديكسيونر ديپلوماتيكه كورد مسئلەسى حقندە نشر اولنان مقالە سنك ترجمەسى »** ، ناشرى : حاجو اغا ، شام ، ۱۹۲٤ ، ٤۰ ل .

لە بڵاوکراوەکانی « کتێبخانەی هاوار »ە . لە کۆتایی کتێبەکەدا نامەیەکی باسیل نیکیتین بۆ جەلادەت بەدرخان بە فەرەنسی چاپکراوە ( ل ۳۵ ــ ٤۰ ) .

۸۹۱ــ **کوردی بتلیسی** ، كوردلر ( ايران )ى دكلميدر ..؟ ، ــ « ژين » ، عدد ۱۸ ، ۸ مايس ۱۳۳۵ ، ص ۱ ــ ۸ . عدد ۱۹ ، ۲۲ مايس ۱۳۳۵ ، ص ۵ ــ ۸ .

۸۹۲ــ **لاو رشيد** ، كوردلردە ضروب امثال ، ــ « ژين » ، عدد ۸ ، كانون ثانى ۱۳۳۵ ، ص ۱۲ ــ ۱۵ .

دەربارەی پەندیپێشنیانی کوردییە .

۸۹۳ــ **محمد ساكن** ، كردستان اثار قديمەسى ، ــ « ژين » ، عدد ۱۱ ، ۱۵ شباط ۱۳۳۵ ، ل ۳ ــ ٦ ، عدد ۱۲ ، ۲۵ شباط ۱۳۳۵ ، ص ۱ــ٤ .

باسی زمانو ئایینی کوردو ئیدریسی بدلیسیو بەدرخان پاشا دەکات . لە پێرستی وتارەکەدا ناوی بەو جۆرەی سەرەوە هاتووە ، لە ناویشەوە بۆتە : « كورد تاريخندن . اثار قديمەسى » . وا دیارە تەواوکەری وتاری « کوردستان »ە کە لە ژمارە دەی هەمان گۆڤاردا بڵاوکراوەتەوە ( بڕوانە ژمارە ۸۸۸ ) .

۸۹٤ــ **ممدوح سليم** ، كوردستان تعالى جمعيتندە برمصاحبە ، ــ « ژين » ، عدد ۲۲ ، ۱۳۳۵ ، ص ۱ ــ ۷ .

بایەخی بۆ مێژووی ڕێکخراوە کوردییەکانی دوای شەڕی یەکەمی جیهانو دیارکردنی چالاکیی دەستەی ڕوناکبیری کورد لەو قۆناغەدا زۆرە .

٨٩٥ـ نژاد توفیق م . سلیمانیەلی ، حضرت مولانا خالد ، ـ « ژین » ، عـدد ۱۰ ، ۲ شباط ۱۳۳٥ ، ص ۱ ـ ٥ .
ژینامەی مەولانا خالیدی نەقشبەندی‌یە .

٨٩٦ـ **Nuri Dersimi**, Kurdistan Tarihinde Dersim, Halep, 1952, 342 S.

سەرچاوەیەکی بایەخدارە بۆ لێکدانەوەی مێـــژووی نوێ‌و هاوچەرخی کوردی تورکیا . دەربارەی بڕوانە : ل ۲٤۱ .

٨٩٧ـ **یاملکی‌زادە عبـــدالعزیز** ، کرد تاریخندن بابان خاندانی ، ـ « ژین » ، عدد ۱۱ ، ۱٥ شباط ۱۳۳٥ ، ص ۱ـ۲ .
مەبەست لە دانەری عەبدولعەزیز یاموڵکی‌یە. بەشی‌تری هەیە.

## (٤) بە زمـانی ڕووسی

٨٩٨ـ **ئەشیریان ش . چ .** ، بزوتنەوەی نەتەوەیی ـ دیموکراسی لە کوردستانی عیراق ۱۹٦۱ ـ ۱۹٦٨ ، مۆسکۆ ، ۱۹۷٥ ، ۱٦٨ ل .

٨٩٩ـ **ئەنوەر دلسۆز** ، کێشـەی دیارکردنی چارەنووسیی گەلی کورد لەبـــەر ڕۆشنایی قانونی نێوان دەوڵەتاندا ، مۆسکۆ ، ۱۹۷۱ ، ۳۹ ل .
کورتەی نامــەی دوکتۆراکەیەتی .

٨٩٩ | ـ **ئەوڕەحمانی حـــاجی مـارف** ، مێژووی لێکسـۆگرافیای کوردی‌و مەرجەکانی دانانی فەرهەنگی ڕووسی ـ کوردی ، لێنینگراد ، ۱۹۷۲ ، ۲۱ ل .
کورتەی نامەی دوکتۆراکەیەتی .

**ئۆردیخان جاسمەفیچ جەلیلۆف ( ئۆردیخانی جەلیل ) :**

۹۰۰ـ خانی لەپ زێڕین ( دمدم ) ـ داستانی قارەمانێتی کورد ، لێنینگراد ، ۱۹٦۱ ، ۲۰ ل .
کورتەی نامــەی دوکتۆراکەیەتی .

۹۰۱ـ خانی لەپ زێڕین ( دمدم ) ـ داستانی قارەمانێتی کورد ، مۆســکۆ ، ۱۹٦۷ ، ۲۰٦ ل .

« ئەساسی مێژوویی داستانی خانی لەپ زێڕین »و «خستنە سەرو بڵاوبوونەوەو مێژووی تۆمارکردنی داستانی خانی لەپ زێڕین » و « ناوەڕۆکی داستانی خانی لەپ زێڕین‌و چەنــد تایبەتی‌یەکی هونەریی ئەو » باسە سەرەکی‌یەکانین .

٩٠٢ـ دەربارەی لێکۆلینەوەی گۆرانی‌یە مێژوویی‌یە کوردی‌یــــە باوەکان ، ـ « حەوتەم کۆڕی زانستیی ئامۆژگای ڕۆژهەلاتناسیی کۆڕی زانیـــاری سۆڤیێت ـ لقی لێنینگراد » ( کورتە باسەکان ) ، لێنینگراد ، ١٩٧١ .
دەربارەی بڕوانە : ل ٢٥٤ .

٩٠٣ـ **ئیحسان فوئاد** ، هونەری حاجی کۆیی‌و شوێنی لــــە ئەدەبی کوردیدا ، مۆسکۆ ، ١٩٦٦ ، ١٦ ل .
کورتەی نامەی دوکتۆراکەیەتی .

٩٠٤ـ **بــەوزانی س . ا . ، باکلان ی. ، خـــەباتی کوردی عـــیراق ...** ( ١٩٤١ ـ ١٩٦٣ ) ، مۆسکۆ ، ١٩٦٤ .
کورتەی نامەی دوکتۆراکەیانە . هەڵەی زۆری تێدایە . لـــە ڕووی سەرچاوەوە لاوازە . فاریزۆف کە من لە نووسینەکانی خۆمدا ڕیسوام کردووە لای ئەوان یەکێکە لەو مێژوونووسانەی بە باشی مێژووی کوردیان لێکداوەتەوە ( ل ٦ ) . ( بڕوانـــە ژمارە ٩٣٤ ) .

٩٠٥ـ **« بیبلیۆگرافیای کتێبی کوردیی سۆڤیێتی ( سالانی ١٩٢١ـ١٩٦٠ ) »** ، ئامادەکردنی ن . ا . ئەلێکسانیان ، یەریڤان ، ١٩٦٢ ، بەشی ڕووســـی ل ٧٣ ـ ١٢١ .

## جەلیلی جەلیل :

٩٠٦ـ خەباتی ڕزگاریخوای کورد لە پەنجاکانەوە تلوەکو هەشـــتاکانی ســـەدەی نۆزدە ، مۆسکۆ ، ١٩٦٣ ، ٢٠ ل .
کورتەی نامەی دوکتۆراکەیەتی .

٩٠٧ـ ڕاپەڕینی کوردەکان ساڵی ١٨٨٠ ، مۆسکۆ ، ١٩٦٦ ، ١٣٢ ل .
دوکتۆر ئەحمەد عوسمان ئەبوبەکر نرخاندوویە ( بڕوانە ژمارە یەکو پێنجو شـــەشی ســـالی ١٩٧١ی گۆڤاری « ڕۆژی کوردستان » ) . دەربارەی بڕوانە : ل ٢٤٨ ـ ٢٤٩ .

٩٠٨ـ کوردەکانی ئیمپراتۆریی عوســـمانی لە نیوەی یەکـــەمی ســـەدەی نۆزدەمیندا ، مۆسکۆ ، ١٩٧٣ ، ٢٠٠ ل .
من نرخاندوومە ( بڕوانە : « التـــآخی » ، ١ تشـــرین الاول ١٩٧٣ ) . هەروەها پێشەکی‌و بەشی یەکەمیم کردۆتە عەرەبی‌و دیـــسان لە « التـــآخی »دا بلاوم کردۆتەوە . دەربارەی بڕوانە : ل ٢٤٩ ـ ٢٥٠ ، هەروەها بڕوانە ژمارە ٦١٩ .

٩٠٩ـ گۆڤاری « ڕۆژا کورد » وەك سەرچاوەی لێکۆڵینەوەی بیری کۆمەڵایەتی‌و سیاسیی کوردیی سەرەتای سەدەی بیســـت ، ـ « وڵاتان‌و گــەلانی ڕۆژهەڵاتی نزیك‌و ناوەڕاست » ، زنجیرەی حـــەوتەم ، کوردناسی ، یەریڤان ، ١٩٧٥ ، ل ٧١ ـ ٩٠ .
دەربارەی بڕوانە : ل ٢٥١ .

**چەتۆییێف خ . م . ( خالیدی موڕادی چەتۆ ) :**

٩١٠ـ بەشداری کوردی یەکێتی سۆڤیێت لە شەڕی گەورەی نیشـــتمانیدا ١٩٤١ ـ ١٩٤٥ ، یەریڤان ، ١٩٧٠ ، ١٧٢ ل .

٩١١ـ شۆڕشی ئۆکتۆبەرو کوردی یەکیەتی سۆڤیێت ، ـ « وڵاتان‌و گــەلانی ڕۆژهەڵاتی نزیك‌و ناوەڕاست » ، زنجیرەی حەوتەم ، کوردناســی ، یەریڤان ، ١٩٧٥ ، ل ١٥ ـ ٢٦ .
دەربارەی بڕوانە : ل ٢٥٣ .

٩١٢ـ کوردی ئەرمەنستانی سۆڤیێت ، یەریڤان ، ١٩٦٥ ، ١٥٢ ل .
دەربارەی بڕوانە : ل ٢٥٣ ـ ٢٥٤ .

٩١٣ـ **چەچانی ئە . ا .** ، بەڵگەی بەنرخ دەربارەی پێوەندیی ئەرمەن‌و کورد ،ـ « وڵاتان‌و گەلانی ڕۆژهەڵاتی نزیك‌و ناوەڕاست » ، زنجیرەی حەوتەم ، کوردناسی ، یەریڤان ، ١٩٧٥ ، ل ٢٢٦ ـ ٢٤٨ .

وتارەکە بــە ئەرمەنی‌یەو کورتەیەکی ڕووسیی لەگەڵدایە . دەربارەی چەند بەڵگەیەکی بایەخدارە کە لە « ماتێنەدەران » دۆزیونێتەوە . یەکێکیان کـــە ســـاڵی ١٩٠٨ نووسراوەتەوە دەربارەی پێوەندیی سەردارێکی کوردە بـــە ناوی شــێخ ئیسماعیلەوە لەگەڵ سەردارانی ئەرمەنداو هـــەوڵدانی بـۆ کردنەوەی قوتابخانەی کوردی بە یارمەتی ئەوان .

٩١٤ـ **حاجیا جندی** ، دەربارەی مەسەلەی شێوازە کوردی‌یەکانی داستانی ڕۆستەمی زاڵ ، ـ « وڵاتان‌و گەلانی ڕۆژهەڵاتی نزیك‌و ناوەڕاست » ، زنجیرەی حەوتەم ، کوردناسی ، یەریڤان ، ١٩٧٥ ، ل ١٦٨ ـ ١٩١ .
وتارەکە بە ئەرمەنی‌یەو کورتەیەکی ڕووسیی لەگەڵدایە .

٩١٥ـ **حسەین بارزانی** ، خەباتی پارت‌و ڕێکخراوە کۆمەڵایەتێکانی کورد لـــە پێناوی چارەســەرکردنی کێشـــەی کوردا ، نامـــەی دوکتورا ، ١٩٧١ ، ٢٦٠ ل .
کورتەی لە ٣٠ لاپەڕەدا چاپکراوە .

٩١٦ـ **علي شاتۆف ( کوردئۆغلو )** ، شـــیعری شـاعیری کوردی هاوچەرخ عەبدوللا گۆران ، باکۆ ، ١٩٦٦ ، ٢٤ ل .
کورتەی نامەی دوکتۆراکەیەتی .

٩١٧ـ **خەزنەدار م .** ، کورتەی مێژووی ئەدەبی کوردیی هاوچەرخ ، مۆسکۆ ، ١٩٦٧ .
مەبەست دوکتۆر مارف خەزنەدارە.نامەی دوکتۆراکەیەتی کە بە کتێب چاپکراوە . بەشـــێکی دەربارەی مێـــژووی ڕۆژنامەنووسیی کوردی‌یە .

**ڕەحیمی قازی :**

٩١٨ـ پارتی دیموکراتی کوردستان ـ ڕەهبەری بزوتنـــەوەی ڕزگاریخوای نەتەوەیی کوردستانی ئێران ( ١٩٤٥ ـ ١٩٤٦ ) ، باکۆ ، ١٩٥٤ ، ٢٢ ل.
کورتـــەی نامـــەی دوکتۆراکەیەتی . دەربارەی بڕوانـــە : ل ٢١٢ ـ ٢١٤ .

٩١٩ـ لێکۆلینەوەی مێژووی بزوتنەوەی نەتەوەیی ڕزگاریخوای گەلی کورد ،ـ « کۆڕی لێکۆلینەوەی باسە مێژوویی‌و ئابووریێکانی ئەفغانستان‌و ئێران‌و تورکیا . کورتەی وتارەکان » ، مۆسکۆ ، ١٩٦٢ ، ل ٩ـ١٠ .
کۆڕی ناوبراو لە باکۆی پایتەختی ئازەربایجانی سـۆڤێت لە نێوانی ٢٢ و ٢٦ی مایسی سالی ١٩٦٢دا بەسترا . دووەم وتار بوو کە لە یەکەم کۆبونەوەی گشـتیی ئـــەو کۆڕەدا خوێندرایەوە . دەربارەی بڕوانە : ل ٢١٢ـ٢١٤ .

**شاکرۆی خەتۆی محۆ ( مگویان ) :**

٩٢٠ـ بزوتنەوەی نەتەوەیی ڕزگاریخوای کورد لە عیراق دوای شەڕی دووەمی جیهان ، کورتەی نامەی دوکتۆرا ، یەریڤان ، ١٩٦٣ .

٩٢١ـ چەند لایەنێکی ڕووی نێودەولەتیی بزوتنەوەی نەتەوەیی ڕزگاریخوای کوردی عیراق ، ـ « بەخشەی زانیاری‌یە کۆمەلایەتێکان » ـ ئۆرگانی کۆڕی زانیاری ئەرمەنـستانی سۆڤێت ، ژمارە ٥ ، ١٩٦٨ ، ل ٦٩ـ٧٧ .
کورتەی لە کۆڕی « یەکیەتی سـۆڤێت‌و ولاتانی ڕۆژهـەلاتی نزیك‌و ناوەڕاست » خوێندۆتەوە کـــە ڕۆژانی ١٠و ١١ی شوباتی ١٩٦٧ ڕۆژهەلاتناسان لە لێنینگراد بەستوویانە .

**شامیلۆف ا . ( عەرەبێ شەمۆ ) :**

٩٢٢- دەربارەی مەسەلەی دەرەبەگی لەناو کوردا ، یەرێڤان ، ١٩٣٦ .
بڕوانە ژمارە ٦٣٢ .

٩٢٣- دمدم ، مۆسکۆ ، ١٩٦٩ ، ٢٠٦ ل .
دانەر خۆی لەگەڵ ن. کۆرسکەیادا لە کوردییەوە کردوویانە بە ڕووسیو پێشەکییەکی بەسۆزی بۆ نووسیوە . ٣٠هەزار دانەی لێ چاپکراوە .

٩٢٤- **شوکریە ڕەسول ئیبراهیم** ، پەندی پێشینیانو قسەی نەستەقی کوردان، مۆسکۆ ، ١٩٧٧ ، ٢١ ل .

کورتەی نامەی دوکتۆراکەیەتی .

٩٢٥- **عادل حەسەن حوسنی** ، کێشە دیمۆگرافیێکانی کوردستانی عێراق ، مۆسکۆ ، ١٩٧٢ ، ٢٢ ل .
کورتەی نامەی دوکتۆراکەیەتی .

٩٢٦- **عەبدولجەبار قادر غەفور** ، بزوتنەوەی نەتەوەی کوردی تورکیا لە نێوانی هەردوو شەڕی جیهانیدا ، مۆسکۆ ، ١٩٧٧ ، ١٩ ل .

کورتەی نامەی دوکتۆراکەیەتی .

٩٢٧- **عەزیز شەمزینی** ، بزوتنەوەی ڕزگاریخوای نەتەوەیی گەلی کورد لە نێوان ساڵانی ١٩٤٢ و ١٩٤٦دا ، مۆسکۆ - لێنینگراد ، ١٩٥٩ ، نزیکەی ٣٠٠ ل . ، نامەی دوکتۆرا .
کورتەی چاپکراوە . بەشێکی لە ڕۆژنامەی « خەبات »دا بە عەرەبی بڵاوکراوەتەوە . دەربارەی بڕوانە : ل ٢١٧-٢١٩ .

٩٢٨- **عەسکەرۆف شامیل سەلیم ئوغلو** ، شیعری شاعیری کوردی هاوچەرخ جگەرخوێن ، باکۆ ، ١٩٦٩ ، ٢٦ ل .

کورتەی نامەی دوکتۆراکەیەتی . خاوەنی کوردێکی دڵسۆزو شاعیرێکی لێهاتووە . بڕوانامەی سێ ئامۆژگای وەرگرتووە .

٩٣٠- **عەلی عەبدولکەریم عەلی** ، جوگرافیای فیزیایی عێراق ، مۆسکۆ ، ١٩٦٦ ، ١٩ ل .

کورتەی نامەی دوکتۆراکەیەتی . بەشێکی دەربارەی ناوچە کوردەوارێکانە .

٩٢١ـ عەلی گەلاوێژ ( صەلاحۆف ) ، پێوەندیی وەرزێریی لە کوردستانی ئێرانی ئیمرۆدا ، باکۆ ، ١٩٥٥ ، ٢١ ل .
کورتەی نامەی دوکتۆراکەیەتی . خاوەنی لە هۆزی فەیزوڵلا بەگی‌یە ، ئابووری‌ناس‌و شاعیرێکی لێهاتووە .

**عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ :**

٩٢٢ـ ئەحمەدی خانی ـ شاعیرو موفەکیری کورد ( ١٦٥٠ ـ ١٧٠٧ ) ، مۆسکۆ ، ١٩٧٧ ، ٣٥ ل .
کورتەی نامەی دوکتۆرای ناوك ( علوم )ەکەی‌ـیە .

٩٢٣ـ ڕیالیزم لە ئەدەبی کوردیی دوای شەڕی دووەمی جیهاندا ( لەبەر ڕۆشنایی بەرهەمەکانی کوردستانی عیراقدا ) ، باکۆ ، ١٩٦٣ ، ١٩ ل .
کورتەی نامەی دوکتۆراکەیەتی .

٩٢٤ـ **فاریزۆف ا .و .** ، شوێنی بزوتنەوەی نەتەوەیی ڕزگاریخوای کورد لە خەباتی گەلانی ڕۆژهەلاتی نزیك‌و ناوەڕاستدا دژی ئیمپریالیزم ، مۆسکۆ ، ١٩٥٣ .
کورتەی نامەی دوکتۆراکەیەتی . هەڵەی گەورەی تێدایە .
من چەند جارێك لە نووسینەکانی خۆمدا بەرپەرچیم داوەتەوە .

٩٢٥ـ **کەریمی ئەیوبی** ، هونەری شاعیری پێشکەوتنخوازی هاوچەرخ هەژار ، لێنینگراد ، ١٩٦٣ ، ١٣ ل .
کورتەی نامەی دوکتۆراکەیەتی .

٩٢٦ـ **کەمال محەممەد سەعید خەیات** ، ئاڵوگۆڕە کشتوکاڵی‌یەکانی عیراق لە ١٩٤٥ەوە تاوەکو ١٩٦٥ ، مۆسکۆ ، ١٩٦٦ ، ١٨ ل .
کورتەی نامەی دوکتۆراکەیەتی .

**کەمال مەزهەر ئەحمەد :**

٩٢٧ـ بزوتنەوەی نەتەوەیی ڕزگاریخوای کوردستانی عیراق ١٩١٨ ـ ١٩٣٢ ، باکۆ ، ١٩٦٧ ، ١٨٤ ل .
نامەی دوکتۆراکەیەتی وەك کتێب چاپکراوە .

٩٢٨ـ بزوتنەوەی نەتەوەیی ڕزگاریخوا لە کوردستانی عیراق لە ١٩١٨ەوە تاوەکو ١٩٥٨ ، کورتەی نامەی دوکتۆرای ناوك ، مۆسکۆ ، ١٩٦٩ ، سێ بەرگە ، ٧٣٥ ل .
هەمان ساڵ کورتەی لە مۆسکۆ چاپکراوە ، ٤٦ ل .

٩٣٩ــ چەند لایەنێکی دروستبوونی چینی کرێکار لـــە عیراقدا ، ــ کتێبی « دروستبوونی چینی کرێکاری ولاتانی ئاسیاو ئەفەریقا » ، مۆسکۆ ، ١٩٧١ ، ل ٣٧ ــ ٥١ .

٩٤٠ــ دەربارەی کتێبی امین سامی الغمراوی(٦١) : قصة الاکراد في شـــمال العراق(٦٢) ، ــ گۆڤاری « گەلانی ئاسیاو ئەفەریقا » ، مۆسکۆ ، ژمارە ٦ ، ١٩٦٩ ، ل ٢٠٢ ــ ٢٠٣ .

٩٤١ــ دەربارەی کتێبی ماتڤییێڤ ( بەرمەتای )و ی . ی . مار یۆحەنا ،مەسەلەی ئاسوری‌یەکان لە سالانی شەڕی یەکەمی جیهان‌و سالەکانی دوای ئەو ( ١٩١٤ ــ ١٩٣٣ ) ، ــ گۆڤاری « گەلانی ئاسیاو ئەفەریقا » ، مۆسکۆ، ژمارە ٦ ، ١٩٧٠ ، ل ١٦٤ ــ ١٦٦ .

٩٤٢ــ دەربارەی کێشەی ئاسوری‌یەکانی عیراق ( ١٩١٨ ــ ١٩٣٢ )، گۆڤاری « هەوالەکانی کۆڕی زانیاری ئازەربایجانی سۆڤیێتی » ، باکۆ ، ژمارە ٢ ، ١٩٦٩ ، ل ٣٠ ــ ٤٠ .

٩٤٣ــ دەربارەی مێژووی یەکەم ڕۆژنامەی کوردی ، ــ گۆڤاری « گەلانی ئاسیاو ئەفەریقا » ، مۆسکۆ ، ژمارە ٤ ، ١٩٦٨ ، ل ١٦١ ــ ١٦٤ .

٩٤٤ــ ڕۆژنامەنووسیی پێشکەوتنخوازی کوردو شۆڕشی ئۆکتۆبەری مەزن،ــ کتێبی « شۆڕشی ئۆکتۆبەری مەزن‌و خەباتی گەلانی ڕۆژهەلاتی نزیک‌و ناوەڕاست » ، باکۆ ، ١٩٦٧ ، ل ١٤٨ ــ ١٦٠ .

٩٤٥ــ مانگرتنی کرێکارانی نەوتی کەرکوك لە سالی ١٩٤٦دا ، ــ گۆڤـاری « گەلانی ئاسیاو ئەفەریقا » ، مۆسکۆ ، ژمارە ٦ ، ١٩٦٨ ، ل ٥٥ــ٦٢ .

**کوردۆییێف ئە . ئە . ( قەناتی کوردۆ ) :**

٩٤٦ــ ئەکادیمی ئۆرەبیللی‌و کوردناسی ، ــ « گۆڤاری مێژوو و زمانەوانی » ، یەریڤان ، ژمارە ١ ( ٦٠ ) ، ١٩٧٣ ، ل ٦١ ــ ٧٠ .

٩٤٧ــ دەربارەی دەقە ئایینی‌یە نووسراوەو سەرزارەکانی کوردە یەزیدی‌یەکان،ــ « پاشماوە نووسراوەکان‌و کێشەکانی مێژووی ڕووناکبیری گـــەلانی ڕۆژهەلات » ، کورتەی باسەکانی نۆیەمین کوبونەوەی زانیاری ئامۆژگای

---

(٦١) بەرهەمی لەو جۆرەم زۆرە ، لێرەدا تەنها چەند نمونەیەکی کەمیـــــان دەهێنمەوە .

(٦٢) القاهرة ، ١٩٦٧ .

ڕۆژهەڵاتناسیی کۆڕی زانیاری سۆڤیێت ـ لقی لێنینگراد ، لێنینگراد ، ١٩٧٣ ، ل ٦١ ـ ٦٥ .

٩٤٨ـ کارەکانی پ. ی. لێرخ لە کوردناسیدا. دەربارەی لێکۆلینەوەی مێژووی کورد لە ڕووسیادا ، لە کتێبی « کورتە مێـــژووی ڕۆژهـــەڵاتناسیی ڕووسی » ، مۆسکۆ ، ١٩٥٩ .

٩٤٩ـ کوردناسی ، ـ « موزەخـــانەی ئاسیایی ـ لقی لێنینگرادی ئامۆژگای ڕۆژهەڵاتناسیی کۆڕی زانیاری ســـۆڤیێت » ، مۆســـکۆ ، ١٩٧٢ ، ل ٢٨٦ ـ ٢٩٩ .

یەکێکە لەو بەشانەی دوکتۆر مارف خـــەزنەدار لـە کتێبی ناوبراوەوە کردوویەتە عەرەبی ( بڕوانە ژمارە ٥٦٤ ) .

٩٥٠ـ گەشەکردنی کوردناسیی سۆڤیێتی ، ـ « دەفتەری زانایانی ئامۆژگای ڕۆژهەڵاتناسیی کۆڕی زانیاری یەکیـــەتی ســـۆڤیێت » ، بـــەرگی بیستوپێنجەم ، مۆسکۆ ، ١٩٦٠ .

٩٥١ـ کورد ، ـ « گەلانی ئاسیای پێشەوە(٦٣) » ، مۆسکۆ ، ١٩٥٧ .

٩٥٢ـ **کەیکاوس ( کاوس ) ن . قەفتان** ، ڕاپەڕینـــەکانی ١٩٠٠ ـ ١٩٤٥ لاپەڕەیەکی پرشنگداری خەباتی نەتەوەیی ڕزگاریخوای گەلی کوردن ، لێنینگراد ، ١٩٦٣ ، ٢٣٧ ل .

نامەی دوکتۆراکەیەتی . کورتەی چاپکراوە ( ١٨ل . ) .

٩٥٣ـ **مەجید حەمید عەلی عارف** ، ئەتنۆگرافیای کوردی ناوچەی سلێمانی لە عیراق ، مۆسکۆ ، ١٩٧٦ ، ٢٥ ل .

کورتەی نامەی دوکتۆراکەیەتی .

٩٥٤ـ **ملا محمود بایزیدی** ، عاداتو رسوماتنامەء اکرادیـــە ، وەرگێـــرانو پێشەکیو لێدوانی م.ب. ڕودێنکۆ ، مۆســـکۆ ، ١٩٦٣ ، بەشـــی ڕووسییەکەی ل ٣ ـ ٦٩ .

دەربارەی بڕوانە : ل ١٣٠ ـ ١٣١ .

---

(٦٣) پێم وایە زاراوی « ئاسیای پێشەوە » تەنها لە زمانی ڕووســـیدا بەکار دەهێنرێ .

## (ه) بە زمانی ئینگلیزیو فەرەنسیو ئەلەمانی

**Bedir Khan, Emir Kamuran:**

٩٥٥- Kurdish Question, Paris, 1960.

٩٥٦- La Question Kurde, Paris,?, 16 pp.

٩٥٧- **"De la Question Kurde. La loi de déortation et de dispersion des Kurdes", 1934, 40 pp.**

لە بڵاوکراوەکانی « خوێبون »ە .

٩٥٨- **Gavan S. S.**, Kurdistan. Divided Nation of the Middle East. London, 1958.

دەربارەی بڕوانە : ل ٢٢٧ ـ ٢٢٨ .

٩٥٩- **Ghassemlou A.R.**, Kurdistan and the Kurds, Prague, 1965.

دەربارەی بڕوانە : ل ٢١٥ ـ ٢١٧ .

٩٦٠- **"Interview sur le Kurdistan et la Question Kurde donnée par Ismet Chériff Vanly"**, Berlin, 1960, 28 pp.

٩٦١- **Jamal al-Haidari,** The Kurdish Question in Iraq and the common struggle against imperilism for consulidation of the Iraqi Democratic Republic, "Iraqi Review", Vol. I, No. 2, 1959.

٩٦٢- **Jamal Khaznadar**, Kurdish Journalism Guide, Baghdad, 1973, 192 pp.

دەربارەی بڕوانە : ل ٢٢٩ .

٩٦٣- **"Kurdische Handschriften"**, beschrieben van Kamall Fuad, Wiesbaden, 1970.

٩٦٤- **"Memorandum sur la situation des Kurdes et leurs revendications"**, Paris 1948, 51 pp.

یادداشتێکە بەدرخانییەکان داویانە بە کۆمەڵـــەی نـــەتەوە یەکگرتووەکانو دەوڵەتە گەورەکان .

٩٦٥- **"Memorandum sur les revendications du Peuple Kurde"** Paris, 1919.

یادداشتەکەی شەریف پاشایە کە ساڵی ١٩١٩ پێشکەشی کۆنگرەی ئاشتیی پاریسی کرد .

٩٦٦- **Nafie Yunis,** Anniversary of a Kurdish Paper, "Iraqi Review" Vol. I, No. 29, 1960.

دەربارەی رۆژنامەی « ئازادی »یە .

٩٦٧- **Nebez J.,** Kurdistan und seine Revolution, Munich, 1972.

**Siyamend Othman:**

٩٦٨- "Le Kurde et le sang versé des Arméniens" par K.M. Ahmad. Apercu general du texte et du sujet. Mémoire Pour le D.E.A., Paris, 1981, 153 pp.

دەربارەی پروانە : ل ٢٨ ــ ٣٠ .

٩٦٩- Participation des Kurdes dans le masscare Arméniens-1915,- "Critique Socialiste", Syros 44, Arménie du génocide ó l'explosion, Paris, pp. 31-46.

٩٧٠- **Taufik Wahby,** The remants of Mithraism in Hatra and Iraqi Kurdistan and its traces in Yazidism. The Yazidis are not devil-worshippers,- "Kurdistan", Vol. XIII, 1969, pp. 18-19.

٩٧١- **"The massacres of Kurds in Turkey",** Cairo,- 1928.

لە بڵاوکراوەکانی « خۆیبون »ە

**Vanly I.C.:**

٩٧٢- Aspects de la question nationale Kurde en Iran, Paris, 1959, 30 pp.

٩٧٣- Le Kurdistan irakien. Étude de la Revolution de 1961, Neuchâtel, 1970.

١٧٤- Revolution of Iraqi Kurdistan, published by the Commitee of the defence of the Kurdish People rights, April, 1965.

١٧٥- Survey of the National Question of Turkish Kurdistan with historical background, S.l., 1972.

١٧٦- The war of national libration of Iraqi Kurdistan - "Revolution-Africa, Latin America, Asia", Vol. I, No. 4-5, Aug. 1963.



# پێرستی ناوەکان(*)



---

(*) تۆمارکردنی ناوی شوێن‌و هۆزم بە پێویست نەزانی چونکە « مێژوو » زیاتر بۆ باسی ناودارانە وەك لە مەڵبەندو وڵاتان . لە ناوەکانیشدا تەنها ئەوانەیان تۆمارکراون کە پێوەندی‌یان بە مێژوونووسیی کوردی‌و کوردناسی‌یەوە هەیە ، وانەبوایە لیستەکە یەکجار تەبە دەردەچو. مەبەست لە (پ) پەراوێزو ( ن.پ ) پەراوێزو نلوەرۆکە ، ( ن – و )یش کورت‌کراوەی ئازناوە .

# پێڕست

# سوپاسی زۆرم

● بۆ بەڕێزان ئەمیندارو کاربەدەستانی « ئەمینداریتی گشتیی ڕۆشنبیری‌و لاوان » .

● بۆ هونەرمەندی لێهاتوو ، هاوڕێی خۆشەویست یوسف الصائغ کە ئەو وێنە پڕ لە سۆزەی بۆ بەرگی « مێژوو » کێشا .

● بۆ کاک طارق علي حمد ( ئەبو زیاد )ی بەڕێوەبەری چاپخانەی « آفاق عربیە »و تیپکارانی کاک رحومی صافی ( ئەبو زوهێر )و کاک صبحي فرج ( ئەبو شوکور ) کە لەگەڵ هەموو دێرو پیتێکی « مێژوو »دا وا ڕەفتاریان کرد وەك بەرهەمی شەونخونی خۆیان بێ ، ئەوانەی هیچ وشەیەکی ڕازاوەی وەفاو ڕێز بۆی نی‌یە هەستی پێزانینم بەرامبەریان دەرببڕێ .

● بۆ برایانی خۆشەویستم کاکە حەمەو دوکتۆر ئەوڕەحمانی حاجی مارف کە سێبەری هەستی پڕ لە دڵسۆزی‌یان بۆتە خێرو بەسەرما ڕژاوە ! ، خوا لە وێنەیان زۆر کات .

الدكتور كمال مظهر احمد

# التأريخ

## دراسة موجزة لعلم التأريخ والكرد والتأريخ

بغداد ١٩٨٣

له كتيبخانەی نيشتمانيی بەغدا
ژمارە ( ٨٤٢ )ی ســـالی ١٩٨٣ی دراوەتێ

دوكتۆر كەمال مەزهەر ئەحمەد

# خەباتی ڕزگاریخوازی كورد و ئازەر لە ئێران

ئازاد عوبێد ساڵح

كردوویە بەكوردی

ناوی کتێب: خەباتی ڕزگاریخوازی کورد و ئازەر لە ئێران
نووسینی: د. کەمال مەزهەر ئەحمەد
گۆڕینی بۆ کوردی: ئازاد عوبێد سالح
بڵاوکراوەی ئاراس- ژمارە: ٢٤٩
دەرهێنانی هونەری: حاجی دلاوەر
بەرگ: ئاراس ئەکرەم
نووسینی سەر بەرگ: محەممەد زادە
هەڵەگری: شێرزاد فەقێ ئیسماعیل
سەرپەرشتیی کاری چاپخانە: ئاورەحمانی حاجی مەحموود
چاپی یەکەم، هەولێر- ٢٠٠٤
لە کتێبخانەی بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی ڕۆشنبیری و هونەر لە هەولێر ژمارە (٩٤)ی ساڵی ٢٠٠٤ی دراوەتێ

## وشەیەک

خوێنەری خۆشەویست...

ئەوەی بەردەستت دوو بەشی (شەشەم و حەوتەم)ی کتێبی (دراسات في تأريخ ايران الحديث والمعاصر)ی مامۆستای مێژوونووس دوکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەدە کە ساڵی ١٩٨٥ بەزمانی عەرەبی بڵاوبۆتەوە.

ئەوەی ڕاستی بێ لەگەڵ خوێندنەوەی کتێبەکە ئەو دوو بەشە پتر سەرنجیان ڕاکێشام، بڕواشم وابوو کە هێند دەهێنن بکرێنە کوردی بۆیە بەئاگاداری دوکتۆر و بەگوێرەی توانا وەرم گێڕان، بەو هیوایەی بێ کەڵک نەبێ و وەرگێڕانەکەش بەدڵی مامۆستا دوکتۆر کەمال بێ، منیش توانیبم خزمەتێکی بچووک بکەم.

ئازاد

# پێشەکی

کەمال مەزهەر

لە ئێران پتر لە ٣٠ نەتەوە و گەل و کەمینە و دەستەی ئەسنی جیاواز دەژین، زۆربەی هەرە زۆریان سەر بەرەگەزی ئاری و سامی و تورکن. فارس و ئازەر و کورد بەریز، چ بەژمارە و چ بەسەنگی ئابووری و کۆمەلایەتی و سیاسی لە ریزی هەرە پێشەوەن، دوای ئەوان عەرەب و گەیلان و مازەندەرانی و تورکمان و بەختیاری و تات و تالیش و ئەرمەن و ئاشووری و گورج و ئەفغان و تاجیک و خەزەر و هی تر دێن. لەبەر ژمارەیەک هۆی جیاوازی رەوا و نارەوا مێژووی هیچ کامێک لەو نەتەوە و گەل و کەمینانە بەرادەی مێژووی فارس لێی نەکۆڵراوەتەوە، جگە لەوەی جاری وا هەیە لایەنی بایەخداری مێژووی گەلە نافارسەکان شێوێنراوە. بەداخەوە بەشی کورد و تا رادەیەکیش ئازەر، کە لەگەڵ کورد دراوسێ و نزیکن، کەم نییە، ئەوەی پاڵی پێوەنام لەو کتێبەمدا کە لە بەغدا ساڵی ١٩٨٥ بەزمانی عەرەبی بەناوی «دراسات في تأريخ ايران الحديث والمعاصر»ەوە بڵاوم کردەوە، ئاورێکی تایبەتی لە چەند لایەنێکی بایەخداری رووداوە نوێ و هاوچەرخەکانی مێژووی ئەو دوو نەتەوەیە بدەمەوە.

سەرچاوەکانی ئەو دوو بەشە ئینگلیزی و رووسی و فارسی و ئازەری و عەرەبی و کوردین، ژمارەیەکیان لە سەرچاوە کۆنە رەسەنەکانن، ئەوانی تریشیان بۆ ناوەندی هەشتاکان سەرچاوەی نوێ بوون، هەیانە بەڵگەنامەی دیپلۆماسین، هەشیانە لێکۆڵینەوە و وتارن، جگە لە زانیاریی دەگمەنی ناو رۆژنامە و گۆڤارەکان. هەڵبەت لە ماوەی حەڤدە ساڵی رابردوودا سەرچاوەی نوێی هەمەجۆر دەربارەی باسە مێژووییەکانی ئەم دوو بابەتە دەرچوون، زانیارییەکانی ئەوانەیان کە ئێمە دەستمان پێیان راگەیشتووە جەختی سەرجەمی بۆچوونەکانی ئەم بەرهەمە دەکەن، تایبەت ئەو لایەنەیان کە سیاسەتی شۆڤێنی دەستە فەرمانرەوا کورتبینەکان هەرگیز لە خوێن و نەگبەتی و نەهامەتی و رق و کینە و ناکۆکی و ماڵوێرانی بەولاوە هیچیان بۆ کەس نەهێناوە و، کاتی ئەوە هاتووە هەمووان دەرس لە تاقیکردنەوە دەوڵەمەندەکانی رابردوو وەربگرن و دەسبەرداری عەقڵی تاریک و کۆنەپەرستی سەدە ناوەنجییەکان بن و، ئیتر لەوە بگەن کە دیموکراسی و یەکسانی و هۆشی ورد و لەسەرەخۆ دەوای سەرجەمی نەخۆشییە کوشندە کۆمەلایەتییەکانن، کە بێگومان کێشە نەتەوەییە دژوارەکان لە پێشی پێشەوەیان دێن.

پێویسته لێرەدا سەرنجی خوێنەری بەڕێز بۆ ئەوە ڕابکێشین کە دەبێت بەچاوی ساڵی ١٩٨٥، واتا کاتی دانانی کتێبەکە بەعەرەبی، سەیری گشت ژمارە و ئامارەکانی ناو ئەم بەرهەمە و چەند زاراوێکی وەک وڵاتی شوورەوی و سۆڤێت بکەن، چونکە بەوێنە، ژمارەی کورد و ئازەری و گەلانی تری ئێران ئێستا گەلێک لەوەی ساڵی ١٩٨٥ پترن، یا ئەوەی کە دەڵێین ئازەربایجانی باکوور بەشێکە لە وڵاتی شوورەوی بۆ ئەوساکە دەشێت نەک ئێستاکە، چونکە ئەو بەشەی ئازەربایجان لە سەرەتای نەوەدەکانی سەدەی ڕابردووەوە بۆتە کۆمارێکی سەربەخۆ و یەکێک لە ئەندامەکانی کۆمەڵەی نەتەوە یەکگرتووەکان.

بەختەوەرم بەوەی ئەو دوو بەشەی کتێبەکەم سەرنجی برای ڕووناکبیر کاک ئازاد عوبێدیان ڕاکێشاوە و کردوونی بەکوردییەکی پاراو و ڕێکوپێک و لە کتێبێکی سەربەخۆدا بڵاویان دەکاتەوە کە هیوادارم سەرنجی ڕووناکبیرانی کورد ڕابکێشێت، تایبەت ئەوانەیان کە لە نەوەی تازە پێگەیشتوومانن و تینووی زانینی لاپەڕە پڕ لە شانازی و کارەساتەکانی نەتەوەکەیانن.

## بەشی یەکەم

### هەندێ ڕاستی دەربارەی خەباتی ڕزگاریخوازی کورد لە ئێران

کوردستانی ئێران لە بەشی باکوری ڕۆژئاوای ئێران هەڵکەوتووە، لە باکور و ڕۆژهەڵاتەوە بەخاکی ئازەربایجانی باشوورەوە دەنووسێت، لە ڕۆژهەڵاتیشەوە تا هەمەدان و لە باشووریشەوە تا هەڵەتەکانی برۆ و شاهۆ و داڵەهۆ و درێژاییەکانی و لە ڕۆژئاواشەوە تا سنووری ڕۆژهەڵاتی عێراق درێژ دەبێتەوە. سەرچاوەکان لە دیاریکردنی ڕووبەری تێک ناکەنەوە لە نێوان چارەکێک، کە ژمارەیەکی زۆرە و[1]، کەمتر لە دەیەکی ڕووبەری ئێران کە تێکڕای لە یەک ملیۆن و ٦٠٠ هەزار کم٢ تێدەپەڕێت «د. عەبدولڕەحمانی قاسملو ڕووبەری کوردستانی ئێران بەدەورووبەری ١٢٥ هەزار کم٢ دادەنێت». لە دوای فارس و ئازەربایجانییەکان کورد سێیەم زۆرینەن لە ئێران، هەروەها سەرچاوەکان لە خەمڵاندنی ژمارەشیان جیاوازن کە بە سێ ملیۆن تا حەفت ملیۆن کەسی دەخەمڵێنن[2]، بەڵام بەمەزەندە ژمارەی کورد لە ئێران ئێستاکە لە پێنج ملیۆن کەمتر نییە، بەو کوردانەشەوە کە لە دەرەوەی کوردستان دادەنیشن «تارانی پایتەخت و ئازەربایجان و باکوری خۆراسان و کرمان و گەیلان و فارس و شوێنەکانی دی»[3] کە نزیکەی شەش یەکی هەموو ژمارەی دانیشتووانی ئێران پێک دێنن[4]. بەڵام سەرچاوە ڕەسمییەکانی ئێران لە کۆتایی

---

(١) ژمارەی ناوبراو لە گۆڤاری (أم درمان). ژمارەی بیست و پێنج. ساڵی دووەم، یەکی یۆنیۆ ١٩٤٦، ل٥دا نووسراوە.

(٢) بۆ درێژەی ئەو باسە بڕوانە:

سرتیب علي رزم آرا، جغرافیاي نظامي ایران، کردستان تهران: ل ٤-٥.

الدکتور عبدالرحمن قاسملو، کردستان والأکراد، دراسة سیاسیة واقتصادیة، ترجمة ثابت منصور، بیروت ١٩٦٨، ل ٤-٦، ١١-١٧؛ فؤاد حمه خورشید، الأکراد، دراسة علمیة موجزة، بغداد، ١٩٧١ ل١٠، ٢٠-٢١.

A. R. Ghassemlou, Iranian Kurdistan, pp 1-2.

(٣) هەندێ سەرچاوە ئەو بەشەی گەلی کورد بەچارەکە ملیۆنێک دادەنێن.

(٤) لە ئاداری ساڵی ١٩٧٤ دانیشتووانی ئێران گەیشتە ٣١،٨ ملیۆن کەس.

بڕوانە: "Sovrimenay Iran" p. 16

سەردەمی پەهلەوی تەنیا دان بەملیۆنێک کورد لە ئێران دادەنێن(٥). گەلی کورد لە ئێران بەسەر نزیکەی ٣٠ هۆز دابەش دەبێت، زۆربەی هەرە زۆریان نیشتەجێن، بەشێکیشیان نیوە کۆچەرن و گەرمیان و کوێستان دەکەن. موکری و دیبوکری و شکاک و کەلهوڕ و گۆران و بلباس و جەلالی و جوانڕۆ لە هۆزە ناودارەکانی کوردی ئێرانن. بەڵام گرنگترین مەڵبەندی گەورەی شارستانی کوردستانی ئێران، کرماشان و سنە و مەهاباد و ماکۆ و بانە و سەقز و نەغەدە و هەندێکی دیکەن. بۆ ئەوەی بۆچوونی گەشەسەندنی دانیشتووانی شارە کوردەوارییەکان لە ئێران نیشان بدەین ئاماژە بەژمارەی دانیشتووانی شاری کرماشان دەکەین کە ساڵی ١٩٥٦ گەیشتە نزیکەی (١٢٦) هەزار کەس و ساڵی (١٩٦٦) گەیشتە (١٨٨) هەزار کەس و ساڵی ١٩٧٠ گەیشتە نزیکەی (٢٢١) هەزار کەس(٦).

لەمێژە فەرمانڕەوا یەک لەدوا یەکەکانی ئێران، ئەخمینی و ئەرشاکی - (فرث) و ساسانی(٧) چاویان بڕیوەتە کوردستان کە گەلەکەی وەک گەلانی دیکەی ناوچەکە دووچاری مەینەتی شەڕە بەردەوامەکانی ئەو فەرمانڕەوایانە لەگەڵ یۆنان و ڕۆمان بیوون. بۆ زانیاری پتر دەکرێ ئەو تابلۆیەی کە شارموا لەو پێشەکییەی بۆ شاکاری مێژوویی (شەرەفنامە)ی کێشاوە، لەسەر واقیعی سیاسی کوردستان لەو هەوارەدا بۆچوونێکی ڕوونمان نیشان بدات. هەروەک ئاماژەی بۆ دەکات لە سەرەتاوە، ئەخمینییەکان دەستیان بەسەر کوردستان داگرت و فەرمانڕەواییان کردووە، پاشان کەوتە دەست ئەسکەندەری مەکدۆنی. دوای مردنە ناکاوییەکەی لە بابل کەوتەوە دەست ئەخمینییەکان کە ئەوجارە بەهۆی بنەماڵەی ئەرشاکی ئەرمەن فەرمانڕەوایان کرد. پاشان ئەسکەندەری کوڕی مارک ئەنتۆنیۆ دەستی بەسەردا گرت و دوای ماوەیەک کەوتەوە دەست ئەرشاکییەکان، کە جارێک بەناوی (فرث) و جارێکی دیکە بەناوی ڕۆمانەکان فەرمانڕەواییان کرد.

ئەوجا نۆرە هاتە سەر ساسانییەکان کە لە سەردەمی هەردوو شا ئەردەشێر و شاهپور دەستیان بەسەردا گرت، پاشان ڕۆمانەکان هاتنەوە، ئینجا ساسانییەکان کە بەنۆرە لەگەڵ

---

(5) Lbid. p. 34

(٦) ئەو پەرەسەندنە ڕێژەییە بەتەنیا لە ئەنجامی گەشەسەندنی سروشتی ناوەوە نەبوو، بەڵکو کۆچکردن لە لادێشەوە دەوری خۆی هەبوو.

(٧) ئەخمینییەکان حوکمی ئێرانیان لە ماوەی نێوان هەردوو ساڵی ٥٥٠ و ٣٣٠ پێش زایین کردووە، ئارشاکییە -(فرث)ەکانیش لە ساڵی ٢٥٠ی پێش زایین تا ساڵی ٢٢٤ی پاش زایین، پاشان نۆرەی ساسانییەکان هات کە لە ساڵی ٢٢٤ تا ساڵی ٦٥١ی زایین فەرمانڕەواییان کرد.

بیزەنتییەکان دەستیان بەسەردا گرت تا هەڵهاتنی کازیوەی ئیسلام.

ئیدی لە هەینێکەوە باپیرانی کورد گەلێ جار دژی پاشاکانی ئەخمینی و (فرث) و ساسانییەکان[8] و یۆنان و ڕۆمان و بیزەنتییەکان ڕاپەڕیون. گەواهی فەیلەسووف و سەرکردەی یۆنانی زەینەفۆن پێش نزیکەی ۲٤۰۰ ساڵی ڕابردوو بایەخێکی مێژوویی تایبەتی لەو بارەیەوە هەیە. زەینەفۆن لە کتێبەکەی (ئەناباسیس) پەنجە بۆ ئەوە ڕادەکێشێت کە کوردەکان چەند ئازاد و سەربەخۆ بوون و چۆن (ملیان بۆ شا کەچ نەکردووە) و بەدرێژیش باسی سوپاکەی کردووە کاتێ بەناو خاکەکەیاندا کشاینەوە و کورد چییان بەسەر هێناون. شاکانی ئێران زۆر جار ناچار بوونە سوپای بێ شومار بنێرنە کوردستان، خەڵکی کوردستانیش هەمیشە بەرووی داگیرکەراندا ڕاست بووینەتەوە و زیانی زۆریانی لێ داون[9]. لە سەدەکانی ناوەندا ژمارەیەک میرنشینی کوردی سەربەخۆ لە ئێران پەیدابوون، لەوانە میرنشینی ڕەوادییە کە مەڵبەندەکەی تەوریز بوو، لە سەرەتای سەدەی دەیەمەوە تا ساڵی ۱۰۷۱وە ژیا[10]. میرنشینی شوانکارەش لە هەرێمی فارس، لە سەرەتای چلەکانی سەدەی یازدەمین تا ناوەڕاستی شەستەکانی سەدەی چواردەمینی زاینی ژیاوە. هەروەها بنەماڵەی فەرمانڕەوا لە میرنشینی شەدادی کە لە ساڵی ۹٥٦ لە

---

(۸) ڕەشید یاسەمی، مامۆستای پێشوو لە زانکۆی تاران، لە هەوڵێکی نازانستانەی ئامانج ڕوون، ڕەچەڵەکی ساسانییەکان دەباتەوە سەر کورد، بڕوانە؛ ڕەشید یاسەمی، کرد و پیوستگی نژادی و تأریخی او، تهران، ل ۱٦٥ – ۱۷٤.

(۹) بۆ درێژەی ئەو باسانە بڕوانە:

Xenophon, Ansabasis, Russian trans. by M. Maksimovich, Moscow - Lenengrad, 1951, book III and IV; Xenophon, the Parsian Expedition, trans. by R. Wamer, Baltimore, 1961, pp 97-148; B. Nikitine, Les Kurdes, Russian trans. By I. O. Farizov, Moscow, 1964, pp 97-243;

محمد أمين زكي، خلاصة تأريخ الكرد وكردستان من أقدم العصور التأريخية حتي الآن، ترجمة محمد علي عوني، الطبعة الأولى، القاهرة، ۱۹۳۹، ص ۸٦-۱۲۹؛ سرتيب علي رزم آرا، جغرافياي نظامي ايران، كردستان، ل۱.

(۱۰) بەپێی زانیارییەکانی محەمەد ئەمین زەکی، میرنشینی ڕەوادی لە ساڵی ٤۲۰ی کۆچی – ۱۰۲۹ی زاینی دامەزراوە، فەرمانڕەوایەتی تا ساڵی ٤۲٦ک-۱۰۳٥؛ خایاند، (کلیفورد أدموند بوسورث) دەڵێت: «لە سەرەتای سەدەی چوارەمی کۆچی – سەرەتای سەدەی دەیەمی زایینی پەیدابووە، تا ساڵی ٤٦۳-۱۰۷۱ز. ژیا.

ئازەربایجان سەری هەڵدا بەرەچەڵەک کورد بوون[١١].

سەردەمی سەفەوییەکان (١٥٠٢-١٧٣٦) سەرەتایەکی نوێ بوو بۆ مێژووی کورد لە ئێران، زۆربەی لاپەڕەکانی بەقەوماوی خوێناوی و کارەسات پڕ بۆتەوە. دامەزرێنەری دەوڵەتی سەفەوی شا ئیسماعیلی سەفەوی (١٤٨٧-١٥٢٤) ڕکی لە هەموو شتێکی کورد دەبۆوە، تەنانەت فەرمانی گرتنی ئەو میرە کوردانەشی دا کە هاتبوونە لای بۆ نیشاندانی گوێ بەفەرمانی خۆیان، لە جێی ئەوان قزلباشەکانی[١٢] لایەنگیری خۆی لە شوێنی دانان. دەربارەی ئەو ڕۆژگارە مێژوونووسی ناوداری کورد محەمەد ئەمین زەکی دەڵێت: «سەردەمی شا ئیسماعیل بۆ کورد سەردەمی ستەم و زوڵم و زۆری و دوژمنکارییەکی سەخت بوو. چونکە کورد سوننی بوون، لێیان ئەمین نەبوو، بڕوای پێ نەدەکردن، بۆیە کۆی لە هیچ هەلێک نەدەکردەوە بۆ ئازادانی کوردان[١٣]. عوسمانییەکانیش لە ململانێی چارەنووسسازانەیان لەگەڵ ئێرانییەکان، زانییان چۆن ئەو هەلە بقۆزنەوە و میرە کوردەکان بەلای خۆیاندا ڕابکێشن. زۆری نەبرد لە هەموو لایەکەوە کوردستان دژی فەرمانڕەوای سەفەوی ڕاپەڕی و شۆڕشگێڕان دەسەڵاتدارانی سەر بە شایان دوورخستنەوە، لە هەر کوێ هەبان دەریان دەپەڕاندن. کاتێ شا ئیسماعیل هەوڵی دا ئەو ناوچە کوردەوارییانەی لە دەستی دابوون وەربگرێتەوە، ڕووی لە هەر لایێ دەکرد ڕووبەڕووی بەرهەڵستی سەخت دەبۆوە. کوردەکانیش قوربانی زۆریان دا. گەمارۆدانی شاری دیاربەکر لەلایەن هێزەکانی شاوە ساڵێکی پتر خایاند، ١٥ هەزار کەس لە دانیشتووانی لەناوچوون. بەدرێژایی سەردەمی سەفەوی ئەو وێنە خوێناوییانە زۆر جار دووبارە دەبوونەوە. لەو شاڵاوەی شا تەهماسبی یەکەم لە ساڵی ١٥٥٤ بۆ کوردستانی هێنا، ئەو ڕێگەیەی گرتیەبەر ئەوەی ئاوەدانی بێ نەیهێشت، هەمووی کاول کرد. هێزەکانی تەهماسب پاش کەمتر لە ساڵێک دیسان گەڕانەوە بۆ وێرانکردنی شارە کوردییەکانی بەدلیس و ئەرجیش و مووش و هی دی «سەرلەبەری کاول کردن و

(١١) بۆ درێژەی بڕوانە: محمدامین زکی، المصدر السابق، ل١٤٦-١٤٧؛
C. E. Boswarth, Op. Cit., NN 36, 37, 39; Sharifli, Ogosudarstve Ravadiov - "Trudi Instituta Istorii Academii Nauk Azerbaijanskay USSR", BAKU 1957, NXl.
شەریفلی، دەربارەی دەوڵەتی ڕەوادی «کارەکانی ئامۆژگای مێژووی سەر بەئەکادیمیای زانستی ئازەربایجانی سۆڤێتی»، ڕووسی، باکۆ، ١٩٥٧، ژمارە یازدە.
(١٢) رشید یاسمی، کرد و پیوستگی نژادی وتاریخی او، ل ٢٠٣.
(١٣) محمدامین زکي، المصدر السابق، ص١٧٤.

کوشتارێکی زۆریشی لە دانیشتووانیان کرد». دوای ئەویش سەرۆکی پاسەوانەکانی، کارەکەی بۆ تەواو کرد و بەناشرینترین شێوە و ترسناکترین وێنە هێزەکانی ئێران «ئەوەندە کاری دڕندانە و شێوازی دڵڕەقانەیان ئەنجام دا، تا وای لە خەڵک کرد کردەوەی دڕندانەی هۆلاکۆ و تەیمورلەنگیان لەبیر بچێتەوە»، پیاوەکانی تەهماسب لە ڕۆژێکدا ٤٠٠ ڕۆڵەی هۆزی دونبلییان کوشت، فەرمانی قڕکردنی هەموو ئەو دونبلییانە درا کە لە کۆشکی شاهانە کاریان دەکرد، لەبەر ئەوە ئەو دونبلییانەی بە گیان مابوون ناچاربوون پەنا ببەنە بەرخاکی عوسمانی(١٤).

کردەوەکانی شا عەباسی یەکەم (١٥٨٧-١٦٢٩) لە کردەوەی پێشینەکانی کەمتر نەبوو، بەڵکو لە هەندێ باردا زۆر لەوانیشی تێپەڕاند. هەر بەخودی خۆی بەسەرۆکایەتی سوپایەکی گەورە چووە خوی، لەوێشەوە شالاوی بردە سەر ماڵەکانی هۆزی مەحموودی کورد، کە مستەفا بەگی سەرۆکیان زۆر دلێرانە بەرگری لە قەڵای ماکۆ کرد، هەروەک مێژوونووسی ناوداری شا ئەسکەندەر مونشی(١٥) دانی پێدا دەنێت سوپای ئێران «هیچ خراپییەک نەما لەو ولاتەدا نەیکات، لە ڕادەبەدەر دزی و تالان و کاولکارییان کرد، خەڵکێکی یەکجار زۆریان لێ کوشتن»، چەند هەزار ئافرەت و منداڵیان گواستەوە، وەک دیل ڕەفتاریان لەگەڵ دەکردن. لە کانوونی یەکەمی ساڵی ١٦٠٨ سوپای شا ئابڵووقەیەکی مەحکەمی کوردە برادۆستەکانی لە قەڵای دمدمی بەناوبانگی نزیک ورمێ دا و، چەند مانگێکی خایاند. «بەهۆی هێرش و شەبەیخوونی کوردەکان بۆ سەر ئۆردوگا پەرژ و بلاوەکانی دەوروبەری قەڵا، سوپای ئێران قوربانییەکانی زل و زیانێکی گەورەی لێ

(١٤) بۆ درێژەی ڕووداوەکانی کوردستانی ئێران لە سەردەمی سەفەوییەکان بڕوانە: شەرەفخانی بەدلیسی، شەرەفنامە، هەردوو چاپی، ڕووسی (وەرگێڕانی. ڤاسیلیفا، مۆسکۆ ١٩٦٧) و کوردی (وەرگێڕانی هەژار، بەغداد، ١٩٧٣)، محمدامین زکی، المصدر السابق. ل١٧٤-٢١٦، ڕشید یاسمی. کرد و پیوستگی نژادی و تأریخی او، ل٢٠٧.

(١٥) ئەسکەندەر بەگی تورکمان مونشی (١٥٦٠ یا ١٥٦١-١٦٣٤)، مێژوونووسی شا عەباسی یەکەم و نووسەری کتێبی (تاریخ عالم آراي عباسی) بەناوبانگە بەزمانی فارسی. ئەو کتێبە بایەخێکی مێژوویی گەورەی هەیە لەبەر ئەوەی خاوەنەکەی ئەو ڕووداوانەی تۆماری کردوون بەچاوی خۆی بینیونی، هاوڕێیەتی شای لە شالاو و گەشتەکانی کردووە، هەموو قەوماوەکانی کوردستانی سەردەمی شا عەباسی یەکەمی بەشێوەیەکی ناحەزانە تۆمار کردووە، هەمان شتیشی لەگەڵ قەوماوەکانی شێروان و جۆرجیا کردووە و بایەخێکی زۆری بەقەوماوەکانی ئازەربایجانی نیشتمانی خۆی داوە.

کەوت». کوردەکان بەسەرکردایەتی ئەمیرخان تا دوا کەسیان لێ قڕکردن بەرگرییان لە قەڵاکەیان کرد...» کەس نەما عەجەمەکان شەڕیان لەگەڵ نەکردبێ، تەنانەت ئەگەر شەڕنەکەریش با، بەدڕندانەترین شێوە دەیان کوشتن»، ئەو تراژیدیایە پاشان بووە داستانێک ڕۆژهەڵاتناسەکان پێیان هەڵگوت، نووسەران لەسەریان نووسی(١٦). ئەوەی جێی سەرنج بێ ئەو ناوچانەی بن دەستی ئێران لەو ماوەیەدا زنجیرەیەک ڕاپەڕینی میللی وەک ئەوەی لە کوردستان قەوما بەخۆوە بینی، لەوانەش ڕاپەڕینی تالش ساڵی ١٥٩٣، ڕاپەڕینی عەرەبستان ساڵی ١٥٩٦، لە جۆرجیای ڕۆژهەڵاتیش ساڵی ١٦٢٣-١٦٢٤، لە ئازەربایجان بەسەرۆکایەتی کۆرئۆغلو ساڵی ١٦١٠-١٦٣٠.

ماوەیەکی کەم دوای کارەساتی دمدم شا عەباس بەخۆی سەرکردایەتی هێزەکانی کرد دژی هۆزی موکری، پیاوەکانی شا قەسابخانەیەکی گشتییان بۆ خەڵکەکە دامەزراند «کەسیان لە کوشتاری گشتی نەبوارد»، هەزاران ئافرەت و منداڵی ناوچەکەیان ئێخسیر کرد، هەر لە سەردەمی شا عەباسی یەکەمدا ١٥ هەزار ماڵە کوردیان بۆ ناوچەی خۆراسان ڕاگوێزت(١٧).

لەگەڵ ئەو هەموو زەبر و زەنگەش شاکانی سەفەوی نەیانتوانی دەسەڵاتیان بەسەر

(١٦) هەردوو چیرۆکنووسی کورد عەرەب شامیلۆف و مستەفا ساڵح کەریم ڕووداوەکانی داستانی دمدمیان بەدوو چیرۆک تۆمار کردووە کە شوێنیان لە ئەدەبی کوردی هاوچەرخدا دیارە. چیرۆکەکەی شامیلۆف وەرگێڕراوەتە سەر چەند زمانێک، لەوانەش زمانی ڕووسی لە ساڵی ١٩٦٩. وەرگێڕانە ڕووسییەکەی دمدم دەکەوێتە ٢٠٦ لاپەڕە و ٣٠ هەزار دانەی لێ چاپ کراوە. لە چیرۆکی «شەهیدانی قەڵای دمدم»ی چیرۆکنووس مستەفا ساڵح کەریم تا ئێستا دوو چاپی بڵاوکراوەتەوە. هەروەها دکتۆر ئۆردیخانی جەلیلۆف لێکۆڵینەوەیەکی درێژی بەزمانی ڕووسی دەربارەی هەمان بابەت بڵاوکردۆتەوە. بڕوانە:

O. J. Jalilov, Kurdski giroechisici epos “zlatoruki khan”, Moscow, 1967,pp 206.

هەروەها بڕوانە: «بطولة الكرد في ملحمة قلعة دمدم» اعداد جاسم جليل، ترجمة شكور مصطفى، تقديم ومراجعة الدكتور عزالدين مصطفى رسول، بغداد، ١٩٨٣.

(١٧) سەرەڕای ئەو هەموو دڵڕەقی و بێ بەزەییەی شا عەباسی یەکەم زۆر بەداخەوە توانی ژمارەیەکی باشی سەرکردە کوردەکان بەشێوەی جۆراوجۆر بەلای خۆیدا ڕابکێشێ و توانایان بۆ خزمەتی ئامانجەکانی خۆی بەکاربێنێ، بەهێزی ئەو کوردانەی ڕایگواستنە خۆراسان جەنابی شا توانی ڕادەیەک بۆ هێرشی یەک لەسەر یەکی ئۆزبەگەکان دابنێت کە تا ئەو کاتە ببوونە چقڵی چاوی سەفەوییەکان لە ڕۆژهەڵاتەوە.

کوردستاندا بسەپێنن، کە ناوچەیەکی بەفروانی بەرهەڵستی دەسەڵاتی شایان دەکرد، هەندێ بەشی گرنگیش هەر بەسەربەخۆیی تەواو لە شای ئێران دەژیان. بەقسەی شەرەفخانی بەدلیسی، بۆ وێنە، لەدوا دواییەکانی سەدەی شازدەمین دەسەڵاتی هەڵۆخانی سەرداری ئەردەڵان، سەربەخۆیی لە شا گەیشتە پلەیەک «وەسف نەدەکرا». هەروەها مێژوونووسی شا عەباسی یەکەمی ناوبراویش باسی نازناوەکانی خان ئەحمەد خان دەکات، کە جێی هەڵوخانی باوکی لە میرنشینی ئەردەڵان گرتبوّوە و سوپایەکی هەبوو شا لە پەلامارەکانیدا پەنای بۆ دەبرد و پشتی پێ دەبەست. لە کۆشکی میرایەتییەکەشیدا گەلێ شاعیر دەوریان دابوو، بەکردەوەکانیان هەڵدەگوت. دوای مردنی شا عەباسیش خان ئەحمەد خان دراوی بەناوی خۆی لێدا، فەرمانڕەوایانی ناوچەیەکی فراوانی هەر لە کرماشانەوە بگرە تا ورمێی دادەمەزراند. بەڵام چاوی سەفی شای ئێران بەوە هەڵنەدەهات، بۆیە ساڵی ١٦٣٨-١٦٣٩ هێرشی کردەسەر. ئەگەرچی خان ئەحمەد خان یارمەتی لە سوڵتانی عوسمانیش وەرگرت، بەڵام لەو شەڕەی لەسەر لێوارەکانی گۆمی مەریوان قەوما، هێزەکانی لەبەردەم سوپای ئێران خۆی نەگرت، خان ئەحمەد خان خۆشی پەنای بۆ مووسڵ برد، لەوێ مایەوە تا فەرمانی خوای بەجێ هێنا(١٨).

بەهەرحاڵ خەباتی کورد، هەروەک خەباتی گەلانی دیکەی ئێران، دوا دۆری نەبوو لە لاوازکردن یا ڕووخانی دەوڵەتی سەفەوی. ئەو زوڵم و زۆرییەی کە کوردەکان لەسەردەمی نادر شای ئەفشاری(١٩) (١٧٣٦-١٧٤٧) دووچاری بوون زۆر جیاوازی لەوەی ئازەربایجانییەکان نەبوو(٢٠). هێزەکانی نادر شا تاوانی ناهەمواریان دەرهەق بەکوردەکانی موکریان و بۆتان و هەولێر و مووسڵ کرد، هەروەها دەرهەق بەڕۆڵەکانی هۆزی دونبلیش کە چەکیان لە ڕووی هەڵگرتبوو، لە ناوەڕاستی سەدەی هەژدەمیندا ڕاپەڕینێکی گەورەیان دژی ڕژێمەکەی بەرپاکرد و بڵێسەی تا خۆی و سەلماس و ناوچەکانی دیکەی

---

(١٨) بڕوانە: «مێژووی خەسرەوی کوڕی محەمەدی بەنی ئەردەڵان» بەزمانی فارسی، لێکۆڵینەوە و وەرگێران و پێشکەشکردنی، ی. ڤاسیلیڤا، مۆسکۆ ١٩٨٤، ل٧٨-٧٩ لە پێشەکی ڕووسی، ٥٧ (١١٢٧)، ٦٥ (١٣١) لە دەقی ئەو دەستنووسەی لەگەڵ وەرگێڕانە ڕووسییەکە بڵاوکراوەتەوە.

(١٩) هەرچەندە نازناوی شای لە ٨ی ئاداری ساڵی ١٨٣٦ لەخۆنا، بەڵام دەسەڵاتی ڕاستەقینەی نادر شا پێش ئەو مێژووە بەشەش ساڵ دەستی پێ کردبوو.

(٢٠) بۆ درێژەی بڕوانە: بابەتی: «هەندێ ڕاستی دەربارەی خەباتی ڕزگاریخوازی ئازەربایجان لە ئێران».

کوردەواری لە ئێران تەنییەوە[٢١]. لە هەندێ ناوچەدا تەنانەت ئافرەت و منداڵیش لە قەسابخانەی هێزەکانی نادر شا ڕزگاریان نەبوو.

مێژوونووسی کورد محەمەد ئەمین زەکی سەبارەت بەزوڵم و ستەمی نادر شا دەرهەق بەگەلی کورد دەڵێت: شاراوە نییە کە ڕەفتاری نادر شا لەگەڵ کورد هەرگیز باش نەبوو، بۆیە کورد یەکجار زۆر دەیانبوغزاند، تەنانەت هۆنراوەیان بەزاراوی گۆرانی کوردی لە هەجووی نادر شا هۆنییەوە، بەزۆردار و دڵڕەق وەسفیان دەکرد[٢٢]. ئەوەی شیاوی گوتنە نادر شا لە کاتی شاڵاوەکەی لە دژی کوردی خۆراسان لە ڕۆژی ٢٠ی تەمووزی ساڵی ١٧٤٧ کوژرا، کە وەک کوردەکانی ئەردەڵان و شەدەڵوو زەفەرانلو[٢٣]، بەنیمچە سەربەخۆیی مابوونەوە.

وێڕای شێوازی توندوتیژی و زوڵم و زۆری، کوردەکانیش وەک ئازەربایجانییەکان هێزێکی کاریگەر بوون لە ژیانی سیاسی ئێران، کە لە ناوەڕاستی شەستەکانی سەدەی هەژدەمین محەمەد کەریم خانی[٢٤] پێشەوای هۆزی زەندی کورد[٢٥] دەسەڵاتی لە ئێران گرتە دەست. لێرەش واقیعێک سەرنج ڕادەکێشێت کە ڕەنگە لە باری دەروونی کپەوە هەڵقووڵابێ، کە چەوساندنەوەی بەردەوام لە ناخی کوردەکانی ئێرانی دروستی کردووە. ئەگەرچی کەریم خان دادپەروەرترین دەسەڵاتدارە لە مێژووی ئێرانی نوێ، پەیدابووبێ، تەنانەت ئەوروپاییەکان نازناوی «پاشای خێرخواز»[٢٦]یان پێ دابوو، لە ساڵی ١٧٦٠[٢٧]وە بووە یەکە فەرمانڕەوای هەموو ئێران، بەڵام نازناوی شای هەڵنەگرت، بەڵکو ناوی خۆی نا جێگر (وکیل)[٢٨]، لە کاتێکدا کەریم خان ئەو پێشەوا سەفەوییەی داوای تەختی دەکرد، خستبووە زیندانەوە، لەوەپێش لەگەڵ عەلی مەردان خان لاگیریان کردبوو.

---

(21) "Vsemirnaya Istoria", Vol. V. p. 246.

(٢٢) محمدامين زكي، المصدر السابق، ص٢٣٠.

(23) P. Sykes, Op. Cit., p 291.

(٢٤) ساڵی ١٧٠٤ یا ١٧٠٥ لەدایک بووە، ساڵی ١٧٧٩ کۆچی دوایی کردووە.

(٢٥) هۆزی زەند لە ڕۆژئاوا و باشووری ڕۆژئاوای ئێران نیشتەجێن.

(26) The Good king.

(٢٧) جگە لە ناوچەی خۆراسان کە نەوەی نادر شا، شا (رخ)ە کوێر فەرمانڕەوانی دەکرد.

(٢٨) مەبەستی لە جێنشینی تەخت بوو.

فەرمانڕەوایی زەندییەکان زۆری نەبرد. پاش ئەوەی کەریم خانی دامەزرێن لە ساڵی ١٧٧٩ کۆچی دوایی کرد، ئەوزەندییانەی پاشی ئەو هاتن لە هەموو ڕوویێکەوە لە ئاستی ئەو دانەبوون. بۆیە پێشەوای قاجارییەکان ئاغا محەمەد خان ئەو هەلەی قۆزتەوە، توانی زەندییەکان لەناو ببات، بۆ ئەوەی لە ساڵی ١٧٩٦ سەردەمێکی نوێ لە مێژووی ئێرانی نوێ دەست پێ بکات کە پێی دەڵێن سەردەمی قاجارییەکان.

بێ هەڵاوێردن گەلانی ئێران هەموویان لە دڵڕەقی و پاشکەوتوویی قاجارییەکانیان چێشت، ئێران لە سەردەمی ئەوان بووە موستەعمەرەیەکی سەر بەدەوڵەتە گەورەکان، ئاغا محەمەد خان کە لە شوێنێکی دی ئەو کتێبە باسی دڵڕەقی بێ وێنەیان کرد[29]، سەردەمەکەی بەخوێنڕشتنی بێ ڕەحمانەی زەندییەکان دەست پێ کرد، هەرچەند بەقسەی هەموو مێژوونووسانی ئێران و ڕۆژئاوا[30] کەریم خانی زەند ڕێزی لێنا و چاویشی لێ بوو، خوشکەکەشی خواست، لە کاروباری سیاسی گرنگ ڕاوێژی پێ دەکرد و درێژایی شازدە ساڵان بە(ڕاوشکار و بیرکردنەوە) لە شیرازی پایتەختی زەندییەکانی بردە سەر.

بەڵام ئەو ئاغا محەمەد خانەی کە مێژوونووسی ئێران سەعید نفیسی وەک مرۆیەکی بوودەڵە و دەم و چاو شەڕانی وەسفی دەکات، لە دڵەوە ڕقی لە خەڵک دەبۆوە، مرۆڤێک بوو کە ڕکی لە یەکێک بووبایەوە لێ خۆشبوونی نەبوو. لە پێناو تەختی فەرمانڕەوایی سڵی لە کوشتنی نزیکترین خزمی و خۆشەویسترین برادەری نەکردەوە[31]، دڵڕەقی بەرانبەر زەندییەکان لە ئەندازە بەدەربوو، تەنانەت ئەوەی هاوکاریشی کردبوون. دوای سەرکەوتنی لە دوامین شەڕی لەگەڵ لوتف عەلی خانی دوا فەرمانڕەوای زەندییەکان، فەرمانی ئامادەکردنی بیست هەزار جووتە چاوی دوژمنەکانی دا. هەر کە هەواڵی دیلکردنی خودی لوتف عەلی خانیان بۆ هێنا، فەرمانی دا بەو بۆنەیەوە سەری شەش هەزار

---

(٢٩) بڕوانە بابەتی «من تأريخ الحروب الايرانية الروسية:» لە ئەسڵی کتێبەکە «دراسات في تأريخ ايران الحديث والمعاصر»، بەعەرەبی.

(٣٠) بەوێنە بڕوانە: سعید نفیسی، تاریخ اجتماعی وسیاسی ایران در دوره معاصر. ل ٤٦، ٥٥، ٥٧؛

J. R. Perry, Karim Khan Zand. A history of Iran 1747 - 1779, Chicago - London, 1979, pp. 146 - 147; P. Sykes, Op. Cit., p. 298

(٣١) سعید نفیسی، تاریخ اجتماعی وسیاسی در دورهء معاصر، ل٥٢-٥٤.

دیلی زەندی ببڕن[٣٢]. نەخۆشیی ئەو کابرایە گەیشتە پلەیەک بەخۆی مافورێکی گرانبەهای پارچە پارچە کرد کە کەریم خان لە پاشی بەجێ مابوو، هەروەک دەیگوت ئەو ڕۆژانەی بەبیر دێنێتەوە کە دەچووە بەردەستی[٣٣]. بۆ ئەوەی گەورەیی خۆی بنوێنێ گڵکۆکەی لەگەڵ گڵکۆی نادر شای ئەفشاری گواستەوە و لەبەردەم کۆسپی دەرکەی کۆشکەکەی ناشتی. بەڵام دەکرا لەوە کەمتر لە ئاغا محەمەد خانی قاجاری چاوەڕوان بکرێت؟، هەر ئەو بوو لە بیری نەچوو، تۆڵە لە ڕۆنفرۆشێکی شیرازی بکاتەوە، کە ڕۆژێک لە ڕۆژان بەر لەوەی بێتە سەر تەخت فێڵی لێ کردبوو. هەر ئەوەبوو جەعفەر قولی خانی برای کوشت، هەر لەبەر ئەوەی وێرابوو داوا بکات بیکەنە والی ئەسفەهان، ئەگەرچی بەدڵسۆزییەکی بێ هاوتا لە ڕۆژانی ململانێی لەپێناو دەسەڵات پشتگیری کردبوو. تەنانەت دایکیشی هەڵخەڵەتاند کاتێ لێی وەشک کەوتبوو، پاش پاڕانەوەیەکی زۆر، گفتی دایێ کە براکەی لە شەوێک زیاتر بۆ کارێکی گرنگ لە تاران نامێنێتەوە، بەڕاستیش گفتەکەی بردە سەر، چونکە جەعفەر قولی عەلی خان لە شەوێک زیاتر لە پایتەختی وڵاتەکەی نەماوە[٣٤]. لێرە دەبێ دیاردی بۆ ئەوەش بکەین لە کاتێکدا ئاغا محەمەد خان بەو هەموو دڵڕەقییەوە لەگەڵ زەندییەکان دەجولایەوە، ئەوا لەگەڵ هەندێ کوردی بەدەسەڵاتی ئێرانی، وەک سادق خانی سەرۆکی هۆزی شکاکی بەدەسەڵات، کە ١٥ هەزار چەکداری هەبوو، نێوانی خۆش بوو. هەروەها خەسرەوخانی میری ئەردەڵان، کە بەقسەی پێرسی سایکس[٣٥] «لە هەرێمێکی فراواندا سەربەخۆ بوو» و بووە «پاڵپشتێکی بەهێز بۆ ئاغا محەمەد خان». کاتێکیش کە ئاغا محەمەد خان بەڕێگاوە بوو بۆ بەسەردادانی جۆرجیا ساڵی ١٧٩٧ لە شووش لەناو خێوەتەکەی کوژرا، گومانی کوشتنی شا کەوتە سەر سادق خانی شکاک، ئەویش لەبەر چەند هۆیەک، گرنگترینیان داوای سادق خان بوو بۆ تەختی پاشایەتی، ئەوە جگە لە داڵدەدانی ئەو پاسەوانەی کە شایان کوشتبوو. ئیدی کشایەوە بۆ ئازەربایجان و دەسەڵاتی خۆی بەسەر چەند شارێکی

---

(٣٢) دکتر علی بینا، تاریخ سیاسی و دبلوماسی ایران، جلد اول، ل٣٥.

(٣٣) سعید نفیسی، تاریخ اجتماعی و سیاسی ایران در دوره‌ء معاصر، ل٥٥-٥٦، P. Sykes, Op. Cit., p. 298.

(34) J. R. Perry, Op. Cit., p. 147: p. Sykes, Op. Cit., pp. 295 - 296.

(35) P. sykes, Op. Cit, p. 291.

داسەپاند(٣٦). هەروەها سادق خان پێوەندییەکی بەتینی بەئازەربایجانییەکان و بەجۆرجییەکانیشەوە هەبوو کە لە سەروبەندی پەلامارەکەی شای قاجار بۆ سەر ولاتەکەیان ئەنجوومەنێکیان پێک هێنا و بڕیاریان دا پەنا بەرنە هەر هۆیەک بۆ ئەوەی ئێرانییەکان نەگەڕێنەوە ولاتەکەیان و هەوڵ بۆ لەناوبردنی ئاغا محەمەد خان بدەن، چونکە بڕوایان وابوو هەر کە بکوژرێ ئیدی تارمایی داگیرکردنی ئێرانیانی لێ دوور دەکەوێتەوە(٣٧). دوای پێکدادانێکی چەکدارانە لە نزیک قەزویندا شکاکەکان لەبەردەم هێزەکانی فەتح عەلی شا شکان کە جێی ئاغا محەمەد خانی گرتبۆوە. بۆ چارەکردنی تەنگ و چەڵەمەی نێوان هەر دوولا، جۆرە سازشکارییەکی رامیاری لەنێوان قاجارییەکان و شکاکەکان کرا، بڕیار درا سادق خان گەوهەرەکانی شای کوژرا و بداتەوە فەتح عەلی شای جێگری ئاغا محەمەد و بەرانبەر بەوەش ببێتە فەرمانڕەوای (گرمرد) و (سەراب)(٣٨).

هەر لەو سەروبەندەشدا شا دەسەلاتی بەسەر هەرێمەکانی دیکەی کوردستانی ئێران رانەدەگەیشت، بۆیەکا لەژێر دەسەلاتی شادا نەمابوون. ئەو گەڕیدە ئەوروپاییانەی لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەمین سەریان لە ناوچەکەداوە، لەوانەش مالکۆلمی بەناوبانگ و جێنیشن (مقیم)ی بەریتانی لە بەغدا کلۆدیۆس جێمس ریچ، خاوەن گەشتە بەناوبانگەکەی بۆ کوردستان و ئیدیکەش، بەدرێژی باسی دەسەلاتی میری ئەردەلان (ئەمان-اللەخان) دەکەن، بەپێی وەسفی ئەوان حاڵ و باری ئەوان لە حاڵ و باری پاشایان دەچوو، هەر بەپێ لێنانی زۆربەی ئەو بیانیانەی بەچاوی خۆیان دیتبوویان، لە هەموو ئێران هیچ کۆشکێکی دیکە جگە لە کۆشکی شا نەبێ نەگەیشتۆتە کۆشکی ئەمانوڵلاخان لە سنە. لەبەر ئەوەی بەقسەی خۆی خاوەنی «ژمارەیەکی زۆری کەڵەمێرد و ئەسپی بەنارامە»، بۆیە بەناو نەبێ سەری بۆ شا شۆڕ نەکردووە. بەڕێکەوتیش نەبوو کە شۆڕشگێڕە هیندییەکان لە تێکۆشان دژی بەریتانییەکان، ڕوو لە شا و ئەمانوڵلاخان بەیەکەوە بکەن بۆ ئەوەی یارمەتییان بدات. وا چاکە پەنجە بۆ خەسرەوخانی کوڕی ئەمانوڵلاخانیش درێژ بکەین کە ولیە خانمی کچی فەتح عەلی شای هێنابوو، لە پاش

---

(٣٦) هەروەها بڕوانە: بابەتی «من تاریخ الحروب الایرانیة والروسیة» لە ئەسڵی کتێبەکە بەعارەبی.

(37) Z. M. Sharashenidze, Iran vo ftoroi polovine XVIII veka, Tiflis, 1971, pp. 34 - 35.

ز. م شاراشینیدزی، ئێران لە نیوەی دووەمی سەدەی هەژدەمین، کورتەی نامەی دکتۆرا بەزمانی رووسی، تەبلیس، ١٩٧١، ل٣٤-٣٥.

(٣٨) دکتور علی بینا، تاریخ سیاسی و دبلوماسی ایران، جلد اول، ل٥٣.

ئەوەی مـێـردەکـەی بـووە مـیـر و دەسـەڵاتی پەرەی سـەند و بووە هۆی ئەوەی کـاروباری کـوردسـتـانی بکەوێتـە دەست «خـەڵکی نامـۆ کـە بەفـارسی دەدوان» هەروەک دەق لە دەسنووسی «مێژووی خەسرەوی کوڕی محەمەد بەنی ئەردەڵان» داهاتووە و مێژووی دانانی بۆ ئەو سەردەمە دەگەڕێتەوە[٣٩]. هەر ئەوەش ڕێی بۆ ناسرەدین شا (١٨٤٨-١٨٩٦) خۆشکرد مامە چوست و چاپووکەکەی، پازدەمین کوڕی عەباسی میرزا (نائب السلطنة)ی ناودار، حاجی فەرهادی میرزا (معـتـمـد الدولة) بکاتە فەرمانڕەوای ئەردەڵان لە پاش کـۆچی دوایی ئەمـانوڵلاخـانی دووەمی کـوڕی خـەسـرەوخـان لە سـاڵی ١٢٤٨ی کـۆچی (١٨٦٧-١٨٦٨)ی زایینی. بەڵام ناوچەی هەورامان سەری بۆ تاران دانەنواند، هەروەک باسیل نیکتن دەڵێت «چونکی ئەوە لەگەڵ ئاکاری خەڵکەکەی نەدەگونجا». (معـتـمـد الدولة) زۆر بەسـەخـتـی توانی دەسـەڵاتی خـۆی بەسـەر ئەو ناوچەیەدا بسـەپێنی کـە سەرۆکەکانیان بۆ ماوەیەکی دیکەش بەنیمچە سەربەخۆیی مابوونەوە[٤٠]. ڕاپەڕینی شێخ عـوبێـدوڵڵای کوڕی سـەید تەهای شەمـزینی[٤١] سـاڵی ١٨٨٠ چڵەپۆپەی ڕەنگدانەوەی نارەزایی کـورد بوو لـە فـەرمانڕەوایی دواکـەوتووی شـاکـانی (آل قـاجـار) لە ئێـران. شـێخ دەسەڵاتی ئایینی و دنیـایی زۆری لەنێو کـوردەکـانی ناوچەی بەرفراوانی گـۆمی وانەوە تا ناوچەی ورمێ و خوی و مەهاباد و ئەردەڵان و زۆر ناوچەی دیکە هەبوو، (٢٠٠) گوندیان موڵکی تایبەتی خۆی بوون[٤٢].

---

(٣٩) تاريخ خسرو بن محمد أردلان، ل ٩٣.

(40) B. Nikitine, Op. Cit., pp. 257-258.

(٤١) ئەو نازناوەی لە گوندی شەمدینانی ناوچەی هەکارییەوە بۆ هاتووە کە شێخی تێدا دەژیا.

(٤٢) دەربارەی شێخ عوبەیدوڵلا و ڕاپەڕینەکەی بڕوانە:

اسکندر قوریانس، قیام شیخ عبیدالله شمزینی در عهد ناصرالدین شا، به اهتمام عبدالله مردوخ کردستانی، تهران، ١٣٣٦، هەرچەند دانەرەکەی بابەتی نییە بەڵام کتێبەکە زانیاری گرنگی تێدایە کە دەکرێت بۆ لایەنە گرنگەکانی ڕاپەڕینی شێخ عوبەیدوڵلا و ئەنجامەکانی کەڵکیان لێ وەربگیرێت؛

Jalile Jalil, Vosstonie Kurdov 1880 goda, Moscow, 1966.

جەلیلی جەلیل، ڕاپەڕینی کوردەکانی ساڵی ١٨٨٠، بەزمانی ڕووسی، مۆسکۆ، ١٩٦٦.

N. A. Khalphin, Barba za, Kurdistan, Moscow, 1963, pp. 108 - 132, 134 - 144.

ن. ک. خالفین، ململانێ لەسەر کوردستان، بەزمانی ڕووسی، مۆسکۆ ١٩٦٣، ل١٠٨-١٣٤، ١٣٤-١٤٤.

دکتۆر ئەحمەد عوسمان ئەبوبەکر وەرگێڕانی عارەبی ئەو کتێبەی لە ساڵی ١٩٦٩ و جەلال ئەحمەد تەقیش وەرگێڕانی کوردییەکەی لە ساڵی ١٩٧٠ بڵاوکردەوە.

بەگوێرەی وەسفی کرزن شێخ عوبەیدوڵلا «پاشایانە ڕەفتاری دەکرد»، ڕۆژانە تێکڕا پێنج سەد تا هەزار کەس لە دیوەخانەکەی سەردانیان دەکرد. هەروەها دەڵێت: خەونی بەئازادبوونەوە دەدیت «وەک بەردی بناغە بۆ هێرش بردنە سەر حکوومەتی ئێرانی... نگریس»[٤٣]. لە ئێران هەر تەنیا چەوساندنەوە پاڵی بەڕۆڵەکانی گەلی کوردەوە نەنا تا لە دەوری شێخ کۆببنەوە، بەڵکو وێڕای ئەوە، هەڵسووکەوتی نموونەیەک بوو جیاوازی تەواوی لەگەڵ بەرپرسە ئێرانییەکانەوە هەبوو، بەشایەتی هەمووانیش بەرپرسە ئێرانییەکان ببوونە بارێکی گران بەسەر شانی خەڵکەوە. ئەو زانیارییانەی کە دەگەیشتە کونسوڵی بەریتانیا لە تەورێز نیشانیان دەدا، شێخ مردنی کردبووە سزای بەرتیل خۆرەکان. لەو ڕاپۆرتەی کونسوڵ پێی دەڵێت «داگیرکردنی ئێران لەلایەن کوردەکانەوە» شێخ عوبەیدوڵلا «مرۆڤێکی ڕووناکبیر بوو، هەوڵی دەدا بەگوێرەی توانا فێری بیر و شێوازی ژیانی کۆمەڵە شارستانییەکان ببێت». هەروەک سەرچاوە ئەرمەنییەکان و ئەوانی دیکەش دەیسەلمێنن، شێخ لەلانی ئایینییەوە دەمارگیر نەبوو، بۆیە ئەرمەن و ئاسوورییەکان ئەوەندەی موسوڵمانەکان سۆزیان بۆی دەبزووت[٤٤]. ئەرمەنییەک ئاوا وەسفی شێخ دەکات:

«مرۆڤێکی بەرز، حەزی لە ئیشوکار بوو، سەرنجڕاکێش و کاریگەر بوو، ناسک و زیرەک بوو، هەمیشە سۆزی باوکانەی خۆی بۆ هەتیوو و بێوەژنەکان دەردەبڕی. کوردەکان لە هەموو لایەکەوە دادەبارینە سەر شەمدینان بۆ ئەوەی باسی کوێرەوەری و ئەو پاڵەپەستۆیە بکەن کە لەسەریان بوو، پرسیان پێ دەکرد و لە کێشە ئایینی و دنیاییەکان ڕایان وەردەگرت. ڕێزیان دەگرت و بەسەرۆکێکی ئینسانی و دادپەروەریان دادەنا».

لەو دوو نامەیەی کە بۆ میسیۆنێری ئەمریکی دکتۆر کۆهران لە ورمێ ناردبوو، پێوەندییەکی باشیشی لەگەڵ هەبوو شێخ بەخۆی ڕووداوی زۆری لە ستەمی ئێرانییان تۆمار کردبوو کە پاڵیان بەکوردەوە دەنا بەرووی تاران ڕاپەڕن.[٤٥] لە یەکێ لە نامەکانی کە مێژووی ٢٥ی ئەیلوولی ١٨٨٠ی[٤٦] پێوەیە دەڵێ لە ساڵی ١٨٧٩ (شجاع السلطنة) فەرمانی مردنی بەسەر پەنجا کەس لە دەروێشەکانی داوە، زیانی زیاتر لە ١٠٠

---

(43) G. N. Curzon, Persia and Persian question,vol. I, p. 553.

(٤٤) بۆ درێژەی ئەو باسە بڕوانە: J. Jalil, Op. Cit., pp 52 - 75

(45) G. N. Curzon, Op. Cit., P. 554.

(٤٦) بۆ درێژەی دەربارەیان بڕوانە: J. Jalil, Op. Cit., PP. 75 - 76, 105 - 107

هەزار تمەنیان[٤٧] لێ داوە، هەروەها پیاوەکانی ڕژێم ئازاری پیاوی ناسراوی ناوچەکە فەرجولڵاخانیان دا تا مرد. لە شنۆدا (٢٠) هەزار تمەنیان تاوانانە بەسەر عەلی عەبدولڵاخان و ئیبراهیم خان سەپاند، ئابرووی ئافرەتانیان برد. بۆ بەریەرچدانەوەی ئەوانە و تۆڵەسەندنەوەی ئەو زایانانەی لە براکیان کەوتووە، شێخ ڕایگەیاند: «کە هێزەکانی بەسەرۆکایەتی کوڕەکانی بۆ ئێران» نارد[٤٨].

باری شپرزەی ئابووری ڕۆڵێکی کەمی لە وروژاندنی کوردەکان نەبوو. ڕاپۆرتی دبلۆماسییە رووسەکان لە سەروبەندی ڕاپەڕینەکەی شێخ عوبەیدولڵا دەربارەی ئەو (بارە ناهەموار) و (کوێرەوەرییە مەزنە) دەدوان کە پاڵی بەخەڵکی کوردستانەوە دەنا (بەبەڕوو و پەلکە چرو)، تەنانەت (لەسەر گۆشتی کەریش) بژین. دبلۆماسییەکان چاوەڕوانی (هەرایەکی میللی بەڕاستی بوون) لەو ناوچەیەدا کە برسیەتی بەهێزترین پاڵ پێوەنەری بوو[٤٩].

بەحوکمی ئەو هۆیانە و هی دیکەیش ژمارەی ئەو بێزار و وەڕسانەی لە دەوری شێخ عوبەیدولڵا بەخێرایی گرد دەبوونەوە لە زیادبووندا بوو. لە ڕاپۆرتێکی تایبەتی کونسوڵی گشتی رووس کە لە تەورێز بۆ وەزارەتی هەندەرانی وڵاتەکەی ناردووە لە پترسبۆرگ دەڵێت، کوردەکانی ئێران «ئازار دراو و چەوسێنراوی ژێردەستی دەسەڵاتی فارسەکانن... بەباوەشێکی فراوانەوە بەپیر شێخەوە دەچن بۆ دەست لەملکردنی وەک ڕزگارکەرێک، بەکۆمەڵ دەدەنە پاڵی»[٥٠]. بۆیە سەیر نەبوو کە ژمارەی شۆڕشگێڕانی شێخ عوبەیدولڵا بەماوەیەکی کورت لە سەرەتاوە لە دەوروبەری (٣-٥) هەزار کەسەوە دوو چەندانە بوو[٥١]. هەروەک دکتۆر ن. ئا. خالفین پەنجەی بۆ ڕادەکێشێ بەپاڵپشتی ئەو ڕاپۆرتە دبلۆماسییە تایبەتییانەی سەرەتای نەوەدەکانی سەدەی نۆزدەمین، هەندێ لایەنی عەرەب، بەشەریفی مەککە و خدێوی میسریشەوە لایەنگیری شێخ عوبەیدولڵایان کردووە، هەر

---

(٤٧) بەگوێرەی نرخی دراوی ئەو وەختە پارەیەکی یەکجار زۆرە.

(48) N. A. Kalphin, Op. Cit., 124.

(49) Ibid, PP. 108 - 111.

(50) Ibid. P. 125.

(51) Ibid. P. 127 J. Jalil. Op. Cit., P. 77; M. S. Lazarev, Kurdski Vopros 1891 - 1917, Moscow, 1972, P. 34.

م. س. لازاریف. مەسەلەی کورد ١٨٩١-١٩١٧، مۆسکۆ، ١٩٧٢، ل٤٣.

وەک باوە گوایە ڕۆڵی وەهابییەکان لە ناوچەکەدا دەگێڕێت(٥٢). هەندێ ڕاپۆرتی دیکەش ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە هەندێ لە سەرۆک هۆزە عەرەبەکان لایەنگیری شێخ عوبەیدوڵلایان کردووە(٥٣). شۆڕشگێڕان توانییان لاهجیان و سەردەشت لە نیوەی یەکەمی ئەیلوولی سالّی ١٨٨٠ ڕزگار بکەن، پاشان ڕوویان لە مەهاباد کرد و(٥٤) ئەویشیان ڕزگار کرد، لە ٢٣ی ئەیلوول چوونە ناو شنۆ، پاش چوار ڕۆژانیش چوونە ناو عەشتارۆخ. دوای ئەوەی ورمێ و ناوچەکانی دیکەشیان ڕزگار کرد؛ شۆڕشگێڕان گەیشتنە دەروازەی تەورێز بارەگای جێنشین (ولی العهد). ترس و لەرز کەوتە ناو دانیشتووانی شارەکە بەهۆی دابڕانیان لە ناوچەکانی دەوروبەرەوە و دووچاری برسیەتی بوون. جگە لەوەش خەڵکێکی زۆریش پەنایان بۆ بردبوو(٥٥). ناسرەدین شا دەترسا شۆڕشگێڕان ڕوو لە تارانی پایتەخت بکەن، بۆیە بۆ خۆ قورتارکردن هانای بردە بەر ڕووس و ئینگلیز و عوسمانییەکان. تەزاری ڕووسیش لە خوای دەویست بۆ بەدەنگەوەچوونی، فەرمانی دا هەندێ هێزی سوپاکەی ڕوو بکەنە نەخچەوانی سەر سنووری ئێران. لەسەر داوای ڕووس و بەریتانییەکان دەروازەی بالآ (باب العالی)ش هەندێ لە هێزەکانی لەسەر سنوورەکانی ئێران قایم کرد(٥٦). لەگەڵ هەموو ئەوەش ڕۆژنامەکانی لەندەن پێیان لەسەر ئەوە دادەگرت، کە ڕاپەڕینی شێخ عوبەیدوڵلا فیتی دەستی ڕووسەکانە، بەڵام ڕۆژنامەکانی پترسبۆرگ بەتەواوی پێچەوانە بوون، پەنجەی تاوانیان بۆ ئینگلیز درێژ دەکرد. ڕۆژنامەی (دیلی تەلگراف)ی لەندەنی لە وتارێکیدا بەناوونیشانی «بۆچی کورد ڕاپەڕی» دووپاتی دەکردەوە «هۆی ڕاپەڕینەکە بەمسۆگەری ڕووسەکانن». هەمان کات ڕۆژنامەی (قەفقاس)ی ڕووسیش دەیگوت شێخ عوبەیدوڵلا «توانی بەهاندانی ئینگلیز پاڵ بەکوردەوە بنێ ڕاست بینەوە».

لەولاشەوە ڕۆژنامە ئەرمەنییەکان دووپاتیان دەکردەوە کە گوایە تورکەکان دەستیان لە ڕاپەڕینی کوردەکاندا هەیە(٥٧). ئەم جیاوازییە گەورەیە بۆ خۆی بەڵگەیەکی تەواوی

(52) N. A. Khalphin, OP. Cit. P. 116.
(53) Ibid, P. 126; J. Jalil, OP. Cit., P. 91

(٥٤) هەینێکە بەشاری مەهابادیان دەگوت سابلاخ.
(٥٥) بروفیسور و مینورسکی، تاریخ تبریز، ترجمه وتحشیه عبدالعلی کارنک، ل٧١.
N. A. Khalphin, OP. Cit., p. 127.
(56) J. Jalil, OP. Cit., P. 84.
(57) Ibid, PP. 99 - 100.

هەڵقوڵانی ڕاپەڕینەکەی شێخ عوبەیدوڵڵایە لە ناخی دەروونی گەل و خاکی نیشتمانەوە.

تاران سوپایەکی گەورەی (٢٠) هەزار کەسی بەتۆپخانەوە، بۆ سەرکوتکردنی ڕاپەڕینەکەی شێخ عوبەیدوڵڵا[٥٨] تەرخان کرد. لە دواییدا ئێرانییەکان مەرامەکانیان بەهاوکاری بێگانە و ژمارەیەکی زۆری بەکرێگیراوی ناوەخۆ ئەنجام دا. لاوازی ڕێکخستن و ڕیزی شۆڕشگێران، هۆیەکی یاریدەری ژێرکەوتنی شێخی شەمدینان بوو. هێزەکانی شا بۆ هەر کوێ دەچوون پەنایان دەبردە بەر چەپەڵترین شێوازی تۆقاندن دەرهەق بەکورد. لێرەدا بەوەرگێرانی ڕاپۆرتێکی دبلۆماسی نهێنی لەو بارەیەوە واز دێنین کە تێیدا دووپاتی دەکاتەوە، دامرکاندنەوەی ڕاپەڕینەکە هاوشانی قەسابخانەیەکی خوێناوی بوو لە کوردستانی ئێران و بووە هۆی «کوشتنی هەزاران کورد بێ گوێدانە تەمەن و ڕەگەز و تالانکردن و سووتاندنی زیاتر لە ٢٠٠ گوندی کوردەواری»[٥٩].

پاش سەرنەکەوتنی ڕاپەڕینەکە، شێخ عوبەیدوڵڵا کشایەوە ناو خاکی عوسمانی، «لەژێر فشاری ئەوروپاش بۆ سەر دەروازەی باڵا» لە تەمووزی ١٨٨١ بۆ ئەستەنبوڵ گوازرایەوە[٦٠] بەڵام لەگەڵ ئەوەش بەڕێزەوە لە پایتەختی عوسمانی پێشوازی لێ کرا، کاربەدەستان چوونە دیدەنی و خەڵک ڕژانە شەقامەکان، تۆپیان بەو بۆنەیەوە تەقاند؛ بەڵام شێخ، بەقسەی س. ولسن، زوو تێگەیشت کە ئەو میوانی سوڵتان نییە، بەڵکو دەس بەسەرە لەلای[٦١]. هەر لەبەر ئەوەش شێخ عوبەیدوڵڵا لە پێوەندییە نهێنییەکانی بەردەوام بوو، بەتایبەتی کە دەیزانی بارودۆخ هێشتا لەبارە بۆ درێژەپێدانی تێکۆشان. دوای لەناوبردنی بزووتنەوەکەی هۆیەکانی ناڕەزایی و بێزاری لەنێو گەلی کورد لە ئێران هەر لە زیادی بوون، ئەویش بەهۆی کورتبینی سیاسی فەرمانڕەوایانی تاران. ڕەنگە لێرە بەس بێ پەنجە بۆ ئەو بروسکەی باڵیۆزی ڕووسیا لە ئەستەنبوڵ بۆ وەزارەتی هەندەرانی وڵاتەکەی لەو بارەیەوە ناردووە درێژ بکەین کە دەڵێت: فەرمانڕەوای ئێران «نەک هەر هیچی بۆ سووککردنی باری سەرشانی کورد نەکرد کە بەهۆی ڕاپەڕینی ئەو دواییە

---

(58) G. N. Curzon, OP. Cit., Vol. I, P. 554.

(٥٩) لە N. A. Khalphin, OP. Cit., P. 133 وەرگیراوە.

(60) G. N. Curzon, OP. Cit., Vol. I., P. 554.

(٦١) بۆ درێژەی بڕوانە: J.Jalil,. OP. Cit. P. 93.

بارودۆخـــیـــان تێکچـــوو بوو، بەڵکو نیـــاز وایە باجی نوێی دیکەشـــیـــان بەســـەردا بسەپێنن» (٦٢).

شێخ عوبەیدوڵڵا بەزیرەکی لە ئەستەنبۆڵ هەڵات. بەبۆنەی هاتنی جەژنی ڕەمەزان هەلی بۆ هەڵکەوت، ڕایگەیاند کە نیازی وایە بەدرێژایی جەژن بچێتە خەڵوەت بۆ خواپەرستن لە ژوورەکـەی، بۆیە نایەوێ کـەس ببـینێت، لەو لاشـەوە بەنهـێنی لە ناوەڕاسـتی ئابی ١٨٨٢ (٦٣) بەهۆی کـەشـتـیـیـەکی فـەرەنسی و گـوزەرنامـەیەکی سـاختـە و بەجلوبەرگی بازرگانێکی تورک، گەیشتە بەندەری بوتی جۆرجیا تا لەوێیەوە بگەڕێتەوە کوردستان.

بەڵام شـێخ ئەو جـارەش سـەرنەکـەوت، پاش تێـپـەڕبوونی چەند مـانگێک بەسـەر هەڵاتنەکـەی جـارێکی دیکە دیل کـرایەوە، لەسـەر خـواسـتی ناسـرەدین شـا سـوڵتـان عـەبدولحەمـیـد بڕیاری دا لەگـەڵ ئەندامـانی خێـزانەکـەی، بۆ مـەککە دووری بخـاتەوە، لە مانگی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٨٨٢ لەوێ کۆچی دوایی کرد(٦٤).

بەنەمانی شێخ عـوبەیدوڵڵا لەسەر شانۆ دوایی بەخـەباتی ڕزگـاریخـوازی کـورد نەهات، بەڵکە دوای تێـپـەڕبوونی چەند سـاڵێکی کـەم، دووبارە هەڵگـیـرسـایەوە، ئەویش «وەک بەرپەرچدانەوەی هەوڵەکـانی تاران کـە دەیەویست فـشـار بخـاتە سـەر خۆیـبـوونی کـوردە نیـشـتـمـانپـەروەرەکـان و زیاتر لەلانی ئابووری بیـانڕووتێنێـتـەوە» (٦٥). ڕۆڵەکـانی هۆزی دەشت لە دژی ڕەفتارەکانی فەرمانڕەوای ورمێ میر جیهانسۆز میرزا ڕاپەڕین، حەسۆ بەگ و بەدر بەگی کـوڕانی حەسـەن بەگ ڕابەریان دەکـردن، حـەسـەن بەگ لە زینداندا گـیـانی

---

(62) N. A. Khalphin, OP. Cit., P. 134.

(٦٣) کیرزن پەنجە بۆ ئەوە درێژ دەکا کە شێخ عوبەیدوڵڵا لە ئەستـەنبۆڵ لە ئابی سـاڵی ١٨٨٢ هەڵات، بەڵام دکـتـۆر جەلیلی جەلیلیش بەپاڵپـشـتی قسـەی س. ولسن دەڵێت: شێخ لە کۆتایی تەمووزی هەمـان سـاڵ هەڵات، لەبەر ئەوەی ڕۆژی یەکـەمی جەژنی ڕەمـەزانی سـاڵی ١٢٩٩ دەکـاتە ڕۆژی شازدەی ئابی ساڵی ١٨٨٢، بۆیە مێژووی یەکەم ڕاست ترە.

(64) G. N. Curzon, OP. Cit., Vol. 1., P. 554.

بەپێی سەرچاوەکانی دیکە شێخ لە مەدینەی منەوەرە کۆچی دوایی کردووە (بڕوانە: الدکتور بلەج شیرکوە، القضیة الکردیة، ماضي الکرد وحاضرهم، القاهرة، ١٩٣٠ ص ٤٨) باسل نیکتن کـەوتۆتە هەڵەیەکی گـەورە کـاتێ دەنووسـێت شـێخ هەر لە ژیاندا مـابوو، لە دوای سـەرکـەوتنی شۆڕشی ئیـتـحـادییـەکـان لە سـاڵی ١٩٠٨ گەڕاوەتەوە بۆ ئەوەی لەگەڵ شێخ عەبدولقـادری کوڕی بژی.

(65) N. A. Khalphin, OP. Cit., p. 145.

سپارد، گڕی ڕاپەڕینی دەشت بەخێرایی ناوچە فراوانەکانی مەهاباد و سەردەشتی گرتەوە و فەرمانڕەوای ئەو ناوە عزەتوڵڵا خان، کە دیارە عەجەم بوو، ناچار بوو شار بەجێ بهێڵێت، شۆڕشگێڕان هەڕەشەیان لەورمێش کرد، دەسەڵاتداران نەیانتوانی سنوورێک بۆ بەرهەڵستی شۆڕشگێڕان دابنێن و جموجۆڵیان تا کۆتایی ساڵی ۱۸۸۷ بەردەوام بوو. حکوومەتی ناسرەدین شا ناچار بوو بەدەنگ داخوازییەکانیانەوە بچێت. عزەتوڵڵا خان فەرمانڕەوای سەردەشتی دوورخستەوە و ئەحمەدبەگی موکری لە جێی دانا، میر جیهانسۆز میرزایشی لە ورمێ گواستەوە و فەرمانڕەوایەکی خەڵکی ناوچەکەی لە شوێنی دانا(٦٦).

کورد دەوریان لە ڕووداوەکانی شۆڕشی دەستووری ئێرانیشدا (۱۹۰۵-۱۹۱۱) هەبوو، کە هەرچەندە لە دوو واقیعی دژ بەیەک ڕەنگی دەدایەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەش لە خاڵە بنەڕەتییەکانی هۆ شاراوەکان بەیەک دەگەیشتەوە. زۆربەی زۆری جەماوەری کورد لایەنی شۆڕشیان گرت، بەڵام هەندێ لایەنی دیکەی کوردی خاوەن سەنگ و کاریگەر لە سەنگەرەکەی دی بوون. لێرەدا دەمانەوێت بیرورایەکی چڕوپڕ دەربارەیان پێشکێش بکەین. نەدەبوو هێزە نیشتمانییە لە ڕادەبەدەری بێزارەکانی کورد لە شوێنەواری بزووتنەوەی شۆڕشگێڕی دوورەپەرێز بن، کە ئامانجی هەڵتەکاندنی ڕژێمی دواکەوتووی قاجاری بوو. یەکێک لە بەڵگەکانی «ئەرشیفی سیاسەتی ڕووسیای دەرەوەی ساڵی ۱۹۰۷» پەنجە بۆ ئەوە ڕادەکێشێت کە ۳۰ هەزار کوردی جەنگاوەر لە ناوچەکانی خوی و ماکۆ لە دژی ئەو چەتانەی کە دوژمنانی شۆڕش لەو ناوچانە دروستیان کردبوون بەشداربوون، بەنیازی زەبر لێدانیان. بەڵگەنامەیەکی دیکەش لە هەمان کۆمەڵەدا پەنجە بۆ (ئەو یارمەتییە زۆرانەی» کە «کورد دەیاندا شۆڕشگێڕان لە ناوچەکانی ورمێ و سابلاخ (مەهاباد) و سەلماس»(٦٧) درێژ دەکات، کە هەر هەموویان ناوچەی کوردەوارین. دەستوورییەکان ژمارەیەک ئەنجوومەنیان لە شارە کوردەوارییەکانی، کرماشان و مەهاباد و سنە و سەقز و بۆکان و ئەوانی دیکە دامەزراند. ئەنجوومەنی سەقز لە هەموویان موکوڕتر

---

(66) Ibid, PP. 145 - 146.

(67) M. S. Lazarev, Kurdistan iKurdskaya Problema (90 - egodi xix veka - 1917), Moscow, 1964, p. 118.

م. س. لازاریف، کوردستان و مەسەلەی کورد (نەوەدەکانی سەدەی نۆزدەمین تا ساڵی ۱۹۱۷) بەزمانی ڕووسی، مۆسکۆ ۱۹٦٤، ل۱۱۸، هەروەها بڕوانە:
عبدالله رازی، تاریخ مفصل ایران از تاسیس سلسله ماد...، ل ۵۱۸-۵۱۹.

بوو بۆ داواکردنی مافە نەتەوایەتییەکانی کورد لە ئێران.

بەڵام هەمان کات دوژمنانی شۆڕش توانیان بڕێکی زۆری کورد بۆ لای خۆیان ڕابکێشن. سالار ئەلدەولەی برای محەمەد عەلی شای لێکەوتوو، لە ململانێی بەردەوامی لەپێناو تەختی پاشایەتی، توانی ئەو پێوەندییانەی لە دەمی ولایەت نشینەکەی سنەی ڕۆژگاری فەرمانڕەوای موزەفەرەدین شای باوکی، کە لەگەڵ چەندین سەرۆک هۆزی کەڵهوڕ و سنجاوی و جاف و زەنگەنە و موکری و ئەوانی دیکە، پێکەوەی نابوو بۆ سوودی خۆی بەکاربێنێت.

سالار ئەلدەولە دوو جاران داوای تەختی کرد، یەکەمیان لە ساڵی ۱۹۰۷ کە باوکی کۆچی دوایی کرد. دووەمیشیان دوای بەرپابوونی ئەو ئاژاوە بەرفراوانەی لەدوا هەواری تەمەنی شۆڕشی دەستووریدا بوو بەهاتنەوەی برا لێکەوتووەکەی لەدوورخراوەیی، کەوتەوە. جاری دووەم پشتیوانی سالار ئەلدەولە ئەو چەند هەزار کوردە چەکدارانەی سەر بەداودخانی کەڵهوڕ و عەلی خانی لوڕستانی و بڕێکی دیکە بوون[٦٨]. لە سەرەتاوە لە هەمەدان نیشتەجێ بوو، نازناوی ئەبولفەتح شای قاجاری لە خۆی نا، سوڵتانی عوسمانیشی لەوە ئاگادار کردەوە[٦٩]، فەرمانی بۆ هەموان دەرکرد کە پێوەندییان بەتارانەوە ببڕن و هەڕەشەی پەلاماردانی لێکردن. کاتێ لەبەردەم بەختیارییەکانی لایەنگرانی شۆڕش شکا، لەگەڵ جەنگاوەرانی ڕووی لە کوردستان کرد و شاری سنەی داگیر کرد و عەبدولحوسێن میرزا فرمای حاکمی و پیاوەکانی ناچار بوون بکشێنەوە کرماشان. لە ۳ی ئەیلوولی ۱۹۱۲ سالار ئەلدەولە کاربەدەستە ئێرانییەکانی لایەنگرانی ئەحمەد شای، بەدەستوورییەکانیشەوە، ناچار کرد کرماشان بەجێ بهێڵن، یان پەنا ببەنە

---

(٦٨) بۆ درێژەی بڕوانە:

دکتر نورالله دانشور علوی و مجاهد السلطان تاریخ مشروطه ایران. جنبش وطن برستان اصفهان و بختیاری، تهران، ١٣٣٥، ل٨٦-١١٣.

(٦٩) سالار ئەلدەولە بروسکەیەکی بۆ سوڵتانی عوسمانی نارد پێی ڕاگەیاند کە خۆی کردۆتە شای ئێران، بەڵام سوڵتان وەرامی بروسکەکەی نەدایەوە، بڕوانە:

«وەزارەتی هەندەران، پێوەندی نێو دەوڵەتان لەسەردەمی ئیمپریالیزم، بەڵگەنامەی ئەرشیفەکانی حکوومەتی تەزاری و حکوومەتەکانی ۱۸۷۸-۱۹۱۲»، بەزمانی ڕووسی، زنجیرەی دووەم، بەرگی بیست، بەشی یەکەم (١٤ی مایس - ١٣ی ئابی ١٩١٢)، مۆسکۆ - لینینگراد، ١٩٣٩، ل٢٢.

بەر كونسولى توركيا لەشارەكە(٧٠). هەر كە فەرمان فەرما لەڕادە دانان بۆ جووڵانەوەكانى سالار ئەلدەولە و لايەنگرانى بێ هومێد بوو، بەبروسكە وازى لە كار هێنا(٧١).

جموجۆڵەكانى سالار ئەلدەولە لە كوردستان، ڕووس و بەريتانييەكانى ورووژاند و داوايان لێ كرد چەك دابنێ. بەڵام ئەو بەگوێى نەكرد(٧٢)، بەينێكى ديكەش جموجۆڵەكانى بەردەوام بوو، تا هێزەكانى ئێران ناچاريان كرد كرماشان و سنە و ناوچەكانى ديكەى كوردەوارى بەجێ بهێڵێ، لە دواييدا ناچار بوو چەك فڕێ بدا و هەڵبێتە ناو خاكى ڕووسيا(٧٣). بەڵام لێرەدا پێويستە ئاماژە بۆ ئەوە بكەين كە خڕبوونەوەى ئەو ژمارە زۆرەى پياوانى هۆزە كوردەكان لە دەورى سالار ئەلدەولە لە ئاكامى پێوەندييەكانى پێشووى نەبوو بەسەرۆكەكانيانەوە، بەڵكو كارەكە زياتر ڕەنگدانەوەى بارى نارەزايى كورد بوو لە ڕژێمى قاجارى. هەندێكيان هەر بۆيە دابوويانە تەك سالار ئەلدەولە تەنيا لەبەر ئەوەى داواى كرد باج نەدەنە ميرى، بەتايبەتى باجى بێ ڕەزاى خۆى كە تاران سالى ١٩١٠ بەشێوەيەكى گەوجانە بەتەواوى ماناى وشە بەسەريدا سەپاندن، ئەو چەردە باجە نوێيەى كە بەسەر بەرهەمى خوێى خۆماڵيدا سەپێنرا بوو شەش هەندەى ئەو باجە بوو كە بەسەر خوێى لە دەرەوە هێنراودا سەپێنرابوو. بەقسەى پسپۆڕى دارايى ئەمريكى (مۆرگان شوستەر) كە تاران بۆ چاككردنى بارى شپرزەى ئابوورى پرسى پێكرد بوو، باجى خوێ هيچ كەڵكى نەبوو جگە لە «قەڵەوبوونى باجگرەكان لەسەر حيسابى ئەو (واتە باجى خوێ. و.)، چونكە ئەوەندەى ئەوان كۆيان كردەوە پێنج هەندى ئەوە بوو كە ياسا دايناوبوو(٧٤).

فەرامەرز بزرگر ئيسماعيل رائينى پشكنەرى دارايى كوردستانى ئێران بەر لە شەڕى

---

(٧٠) دواى لەناوبردنى شۆڕشى دەستوورى سالار ئەلدەولە بۆ ماوەيەكى ديش لەسەر جووڵانەوەكانى لە كوردستان بەردەوام بوو.

(٧١) «وەزارەتى هەندەران. بەڵگەنامەى ئەرشيفەكانى حكوومەتى تەزارى و كاتى ١٨٧٨-١٩١٧»، زنجيرەى دووەم، بەرگى بيست، بەشى دووەم (١٤ى ئاب - ١٧ى تشرينى يەكەمى ١٩١٢) مۆسكۆ - لينينگراد ١٩٤٠، بەڵگەى ژمارە ٨٢١.

(٧٢) هەمان سەرچاوە، زنجيرەى دووەم، بەرگى نۆزدە، بەشى دووەم (١٤ى كانوونى دووەم - ١٣ى مايس ١٩١٢)، مۆسكۆ - لينينگراد، ١٩٣٨، ل ٤٥٣ - ٤٥٤، بەڵگەى ژمارە، (٥٠٨).

(٧٣) دكتر نورالله دانشور علوى، تاريخ مشروطه ايران، ل١٢٥.

(74) W. M. Shuster, The strangling of Persia, PP. 33-34.

یەکەمی جیهان، زانیاری وای لایە کە دەقا و دەق ئەوەی ئێمە دەمانەوێت ڕوون دەکاتەوە، رائین دەڵێت، خەڵکەکە پێیان خۆشتر بوو خوێ بەکار نەهێنن وەک لەوەی «مل بۆ ئەو یاسا وشکە شۆڕ بکەن»، تەنانەت لە هەندێ ناوچەدا فرۆشتنی خوێ تا ڕادەیەکی یەکجار زۆر کەم ببۆوە. ئەو کاربەدەستە ئێرانییە دووپاتی دەکاتەوە، بێزاری لە باجی خوێ یەکێک بوو لەو هۆیە بنەڕەتییانەی پاڵی بەخەڵکەوە دەنا لە کوردستان بەرهەڵستی حکوومەت بکەن و «بەبێ هیچ جۆرە ترس و زۆرلێکردنێک» بەشداری بزووتنەوەی سالار ئەلدەولە بکەن. لە کۆتاییدا فەرامەرز بزرگەر دووپاتی دەکاتەوە کە کوردەکان ئەو بڕیارەی تاران بەهەڵوەشاندنەوەی باجی خوێ لەسەر پێشنیاری شوستەر بەدەسکەوتێکی مەشروتەیان نەدەزانی، بەڵکو «لایان وابوو ئەمە لە ئەنجامی لایەنگرتنی سالار ئەلدەولە بووە کە خەڵکەکەی لە دانی باجی خوێ بەخشی بوو... ئەوان دەسەڵاتی سالار ئەلدەولەیان وەک مرۆڤێکی بەخۆناز پێ خۆش بوو»(٧٥). بەڵام ئەوەی بەڕاستی جێی داخە (یپرم) خانی پێشەوای گەورەی ئەرمەنییەکان(٧٦) و یەکێ لە ئازاترین سەرکردەکانی شۆڕشی دەستووری کە ڕۆڵێکی لە هەمووان گەورەتری لە لێخستنی محەمەد عەلی شا بینی بوو، لەسەر دەستی پیاوانی هۆزە کوردەکانی لایەنگرانی سالار ئەلدەولە، لەو شەڕەی ڕۆژی ١٩ی مایسی ساڵی ١٩١٢ قەوما، کوژرا و دەنگێکی گەورەی لەناو ئێران و تەنانەت لە دەرەوەش دایەوە(٧٧).

ئەگەرچی شۆڕشی دەستووری لەناوبراو، بزووتنەوەکانی سالار ئەلدەولەش کۆتابوون، بەڵام بەر لە دەستپێکردنی شەڕی یەکەمی جیهان ناوچە کوردەوارییەکانی ئێران ئارام نەبوونەوە. ڕەنگە لێرە بەس بێ پەنجە بۆ ئەوە درێژ بکەین کە ئەو فەرمانڕەوا نوێیەی تاران

---

(٧٥) بروانە: مورگان شوستر، اختناق ایران، ترجمه ابو الحسین موسوی شوشتری، با تصحیح ومقدمه و حواشی واسناد محرمانه منتشر نشره در ایران توسط: فرامرز بزرگر اسماعیل رائین، جاب دوم، تهران، ١٣٥١، ل ٩٣ - ٩٤.

(٧٦) یپریم یا (یفریم) خان لە ئەرمەنەکانی تورکیا بوو، پەنای بۆ ڕەشت هێنابوو لە ئێران و خەریکی بازرگانی بوو. لە ڕۆژگاری مەشروتییەت بەگەرمی چووە ڕیزی شۆڕشگێڕان، زۆر کارتێکەر و ڕوو نەرم و زۆر شارەزا و یەکجار ئازاش بوو.

(٧٧) «وەزارەتی هەندەران، بەڵگەنامەی ئەرشیفەکانی حکوومەتی کاتی ١٨٧٨-١٩١٧»، بەرگی بیستەم، بەشی یەکەم، ل ٢٢، ٨٩ - ٩١. بەڵگەنامەی ژمارە (١٠٢)،
W. M. Shuster, OP. Cit, PP. 81, 86 - 87.

بۆ ورمێی دانابوو دوای لە ناوبردنی مەشروتییەت، بەدرێژایی سێ مانگ نەیتوانی بچێتە بارەگـــای کـــارەکـــەی لە تەورێز، ئەویش بەهۆی ئەو هەرایەی هەینێکە ئەو ناوچەی گرتبۆوە(٧٨).

هەر لەو ماوەیەدا لەسەر شانۆی رامیـاری و رووناکبیـری کـوردستـانی ئێـران پیـاوێکی هەڵکەوتوو پەیدابوو، ئەویش عـەبدولرەزاق بەدرخـان بوو کـە دیوەخـانی ئاوەدانی ببـووە یانەیەکی ئەدەبی و مەکۆی بەیەکگەیشتنی نیشتـمانپەروەران(٧٩)، لە سەرەتای سـاڵی ١٩١٣ کۆمەڵێکی رووناکبیـری لە شاری خۆی دامەزراند، یەکەمین فێرگـەی کوردی لە ئێـران کـردەوە، لەو پارەیەی کـە خـەڵکی ناوچەکـە خۆیان بەخـشیـبوویان. عـەبودلرەزاق بەدرخان گەلێ جاران هەوڵی دا یارمەتی لە رووسـەکـان دژی قـاجاری و عـوسمـانییـەکـان وەربگرێت، کـە ناچاریان کـرد لە ژێر پاڵەپەسـتۆیان پەنابەرێتـە بەتەبلیس لە جـۆرجیـا و پاشانیش بۆ پاریس.

لە سالانی شەڕی یەکەمی جیـهان هەمـوو هەوڵیـان دەدا، هەریەکە و بەشێـوەی تایبەتی خۆی، بێـزاری کـورد بۆ بەرژەوەندی خـۆی بقـۆزتەوە. پیـاوەکـانی مـوخـابەراتی ئەڵمـانیـا (شیونمان) و (ینیدرمایز) و (زوگمـایر) چالاکی فراوانیـان لەناو کوردەکانی ئێران نواند و سـەرکـەوتنی بەرچاویان وەدەست هێنا» لەبەر هۆی مـەزهەبی کـوردەکـان لە زۆربەی موسـڵـمـانانی دیکەی ئێـران بۆ دەوڵەتی عـوسمـانی بەپەرۆشـتـر بوون» ، هەروەک جـۆرج لنشۆفسکی دەڵێ(٨٠). لەو کردەوانەی ئەڵمـانییـەکان ئەنجامیـان دا بۆ راکێشانی کورد بەلای خۆیاندا هەوڵیان دا لە کاتی شەڕ بەیاننامەی داخوازیانی کۆمەڵەی ئیسلام و هەموو

---

(٧٨) بڕوانە:

Acodemic V. A. Gardleveski, Izbraine sochinenia, T. I. Moscow, 1960, PP. 174 - 175.

ئەکادیمیی ڤ. ا. گەردلێڤسکی، کارە هەڵبژاردەکانی، بەزمانی رووسی، بەرگی یەکەم، مۆسکۆ ١٩٦٠، ل١٧٤-١٧٥.

(٧٩) بۆ درێژەی دەربارەی ئەو و چالاکییەکانی، بڕوانە: الدکتور کمال مظهر احمد، کردستان في سنوات الحرب العالمیة الاولی، ترجمة: محمد الملا عبدالکریم، الطبعة الثانیة، بغداد، ١٩٨٤، ص٥٠، ٦٤، ١٠٢-١٠٤.

(80) G. Lenczowski, Russia and the West in Iran 1918 - 1948, NewYork, 1949. P. 150.

چاپەمەنییەکانی دیکەیان لە سەرتاپای کوردستانی ئێران بلاوبکەنەوە(٨١). شیاوی باسە ڕووسەکان سۆسەی چالاکییەکانی شیوغمانیان بەشێوەیەکی تایبەتی دەکرد، هەولیاندا بەهۆی بەرپرسە ئێرانییەکان و سەرەک هۆزەکانی لایەنگریان فشاری بخەنە سەر بەرلەوەی ئاگری شەڕ هەلبگیرسێ(٨٢). لە سالانی شەڕیشدا بەهاوکاری ئینگلیزە هاوپەیمانەکانیان زیاتر کەوتنە سۆراخی چالاکییەکانی شیوغمان لە ناوچەی کرماشان، بەهەردوو بالیۆزی ڕووس و بەریتانیا داخوازییەکی هاوبەشیان پێشکێش بەکاربەدەستانی ئێران کرد بۆ گرتنی(٨٣). بەکرێگیراوانی ئەلمانیا کە هەموو جۆرە پارەیەکی نەختی ئێرانی و بیانییان پێ بوو، پێوەندییان بەگەورە پیاوان و سەرۆک هۆزەکان دەکرد و زۆر بەدەست بلاوی لێیان خەرج دەکردن و، توانییان زۆر لە سیاسییەکان بۆ لای خۆیان ڕابکێشن. لەوانە مستەوفی مەمالیک کە گفتی دا سوپای ئێران بخاتە ژێر سەرپەرشتی مارشالی ئەلمانی ڤون دێر گۆلتز Von der Goltz کە لە کۆتایی سالی ١٩١٥ بەفەرماندەی گشتی ئەو هێزە تورکیانەی لە عێراق کاریان دەکرد دامەزرا. گۆلتز بەخۆی ناوچە کوردەوارییەکانی ئێرانی لە کانوونی دووەمی سالی ١٩١٦ بەسەرکردەوە، چونکی ئومێدی بەگفتی سوپای ئێرانی هەبوو(٨٤). لە هەمان کاتدا پڕوپاگەندەی تورکەکان لەنێو هۆزەکانی کاشان و کوردستان گەیشتبووە ڕادەیەک ببووە جێی نیگەرانی لێپرسراوانی ئێرانی(٨٥).

بەلام نارەزایی ڕەوای کورد باکی بەو جۆرە چالاکیانە نەبوو، تا لە دەرفەتی نوێدا لەسەروبەندی هەلگیرسانی ئاگری شەڕی یەکەمی جیهان هاتە ئاراوە. لەو سالانەدا کوردی ئێران تێکۆشانیان بەگەرمی دەست پێکرد. لە زۆر ناوچەدا چەکیان دژی دەسەلاتدارانی

---

(٨١) بەکرێگیراوانی ئەلمانیا لە سەرتاپای ئێران بلاوبوونەوە و لە هەلمەتی پڕوپاگەندە گێرەشێوێنییەکانیان دوواتیان دەکردەوە کە گەلی ئەلمانیا و ئیمپراتۆرەکەیان (حاجی ولیەم!) پابەندی ڕێنوێنییەکانی ئیسلامەتییە. بڕوانە: P. Sykes, OP. Cit. PP. 442 - 443.

(٨٢) «وەزارەتی هەندەران. بەلگەنامەی ئەرشیفەکانی حکوومەتی تەزاری و حکوومەتی کاتی (١٨٧٨-١٩١٧)» بەرگی نۆزدە، بەشی یەکەم، ل٣٠١، بەلگەی ژمارە (٣٣٤).

(٨٣) هەمان سەرچاوە، زنجیرەی سێیەم ١٩١٤-١٩١٧، بەرگی حەوتەم، بەشی یەکەم (١٤ی کانونی دووەم - ٢٣ی، ١٩١٥)، مۆسکۆ - لینینگراد، ١٩٣٥، ل٥٢١-٥٢٢، بەلگەی ژمارە (٣٩٥).

(84) P. Sykes, OP. Cit, PP. 543 - 544.

(٨٥) «وەزارەتی هەندەران، بەلگەنامەی ئەرشیفەکانی حکوومەتی تەزاری و حکوومەتی کاتی ١٨٧٨-١٩١٣»، زنجیرەی سێیەم، بەرگی حەوتەم، بەشی یەکەم، ل٢٠٦-٢٠٧، بەلگەنامەی ژمارە ١٥٨.

ئێران و داگیرکەرە بیانییەکان بەرزکردەوە، لەو کاتەدا لە گۆڕەپانی چالاکی نیشتمانی ژمارەیەک رووناکبیری کوردی ئێران پەیدابوون، لەوانەش هەندێ کەسی بنەماڵەی قازی بەناوبانگ لە مەهاباد و شێخ باباغەوسی ئابادی شاعیر، کە کۆمەڵەیەکی بچووکی دامەزراند و هەوڵی دا پێوەندی بەرووسەکانەوە بکات، بەڵام چالاکی کۆمەڵەکەی لەمەودایەکی تەسک دابوو، لە شاعیر خۆی و هەندێ لە هاورێ نزیکەکانی تێنەپەڕی. لەولاشەوە زوڵم و زۆری داگیرکەران،(٨٦) بەهەموو لایەنەکانیانەوە، کاردانەوەیەکی گەورەی لەنێو لایەنە کوردییە جۆراوجۆرەکانی ئێران هێناکایەوە، کە ناچار بوون پەنا ببەنە بەر چەک بۆ بەرگری کردن لە کەرامەتیان. دانیشتووانی ناوچەی مەهاباد چالاکانە بەرێبەری پیاوێکی ناسراوی وەک قازی فەتاحی (١٨٣٢-١٩١٦) برا بچووکی باپیری قازی محەمەدی ناودار بەرهەڵستی سوپای عوسمانی و پاشانیش سوپای رووسییان کرد.

لە سالانی شەڕ و بەدواوەش، کوردە نیشتمانپەروەرەکان رۆڵی دیاریان لەو بزووتنەوە شۆڕشگێڕییەی بەرابەری میرزا کوچک خان لە ناوچەی گەیلانی باکووری ئێران تەقییەوە گێڕا. خەباتی نیشتمانپەروەرانی گەیلان بە(بزووتنەوەی جەنگەلییەکان)، واتە لێرەوارییەکان بەناوبانگە، چونکە شۆڕشگێڕان لێرە چڕەکانی گەیلانیان کردبووە بنکەی چالاکییان. سەرکردایەتی و بنکەکانی بزووتنەوەی جەنگەلییەکان لە نەتەوەی جۆراوجۆر پێک هاتبوو، وێڕای گەیلانییەکان(٨٧) ژمارەیەکی زۆری خۆبەخشکەری شار و

---

(٨٦) هەرچەندە ئێران بێ لایەنی خۆی راگەیاند، بەڵام بەدرێژایی سالانی شەڕی یەکەمی جیهان خاکەکەی بووە گۆڕەپانی شەڕی نێوان هەردوو بەرەی سوپای شەڕکەر، بەخاکی کوردستانی ئێرانیشەوە کە بەقسەی دکتۆر م. س. لازاریفی رۆژهەلاتناس یەکەم پروشکی شەڕ لەوێیوە، لە پێش دەریای رەش لە رۆژهەلاتی ناوەڕاستدا هەڵگیرساوە.

(M. S. Lazarev, Kurdistan..., P. 299).

(٨٧) هەرێمی گەیلان ناوچەکانی هەندا و لێواری باشووری رۆژئاوای دەریای قەزوین پێک دێنێت. رووپێوی دەوروبەری ١٥ هەزار کم٢ دەبێت. ژمارەی دانیشتووانی هەرێمەکە لە دوو ملیۆن زیاترە (بەپێی ئاماری سالی ١٩٦٦ ژمارەیان گەیشتە ملیۆنێک و ٧٥٤ هەزار کەس). رەشت و لاهیجان لە شارە ناودارەکانی گەیلانن، لێرەوار زیاتر لە ملیۆن و نیو هکتار رووبەری دادەپۆشێ. زمانی گەیلانی سەر بەکۆمەڵە زمانی هیندۆ ئەوروپییە. لە سالی ١٣٧ تا سەدەی شازدەمین بەشەکانی رۆژهەلاتی گەیلان دەولەتێکی سەربەخۆیان پێک دەهێناو لە سالی ١٥٩٢ سەفەوییەکان توانیان دەسەلاتی راستەقینەی خۆیان بەسەردا بسەپێنن. خەڵکی گەیلان جارەهای جار دژی حوکمی سەفەوییەکان راپەڕیون (لە سالانی ١٥٧٠-١٥٧١ و ١٥٩٢ و ١٦٢٩). گەیلانییەکان بەگەرمی بەشداری شۆڕشی دەستوورییان کرد. لە ٥ی حوزەیرانی سالی ١٩٢٠ دامەزراندنی کۆماری گەیلانییان لە شاری رەشت راگەیاند، بەڵام هێزەکانی ئێران لە ٢٩ی ئەیلوولی ١٩٢١ لەناویان برد.

ناوچەکانی دی چوونە پاڵیان بەتارانی پایتەخت و شاری تەوریزی ئازەربایجان و هەندێ ناوچەی کوردەواری و شوێنی دیکەشەوە. ئامانجی هاوبەش ئەوانەی لە ساڵانی شەڕی یەکەمی جیهان بەیەکەوە کۆکردبۆوە بۆ خەباتکردن دژی ئیمپریالیزم و داگیرکەران، لە پێشەوەی هەمووشیان ڕووس و ئینگلیز، لەپێناو مسۆگەرکردنی خۆبوونی سیاسی بۆ ئێران. بەشدارانی بزووتنەوە سوێندیان خوارد ڕیشیان نەتاشن هەتا ئامانجەکانیان وەدی نەهێنن، لەوەوە بووە نەریت زۆر جار شۆڕشگێڕانی ئێران لەوەدوا پەیڕەویان دەکرد(٨٨).

ئەوەی پاڵی بەخەڵکەوە دەنا، بەتایبەتیش جووتیاران، لە دەوری بزووتنەوەکە کۆبنەوە، دووپات کردنەوەی سەرکردەکانیان بوو لەسەر پێویستی گەڕانەوە بۆ سەر دەستوورەکانی ڕەسەنی ئیسلامەتی، تا بیانکەنە چەک بۆ خەبات دژی داگیرکەرە بیانییەکان، تا ئەندازەیەکی کەمیش دژی چەوسێنەرانی ناوەوە. جەنگەڵییەکان لەدوا دواییەکانی ساڵی ١٩١٧ لیژنەیەکی تایبەتیان بەناوی (یەکیەتی ئیسلام) دامەزراند بۆ سەرپەرشتی کردنی بزووتنەوەکەیان. ئەوەی جێی گوتنە ئەڵمانییەکان و عوسمانییەکان لە ساڵانی شەڕ چالاکانە کاریان بۆ خۆشکردنی پڕوپاگەندەکردن بۆ کۆمەڵەی ئیسلامەتی لە ناوچەی گەیلان دەکرد، چونکە ئەوان دەیانزانی دەکرا، بەهۆی جەنگەڵییەکان زەبرێک بسرەوێننە ڕووس و ئینگلیزی دوژمنیان. تەنانەت هەندێ ئەفسەری وەک ئەفسەری عوسمانی (مقدم) حسەین ئەفەندی تەوریزیشیان ناردە ناوچەکەیان، کە شارەزای ناوچەکە و کاروباری کوردەواری بوو، بەتایبەتیش چونکە بەشداری ئەو شەڕانەی کردبوو کە لە نێوان هێزەکانی ڕووسیا و عوسمانی لە کوردستان قەومابوو(٨٩). ئیتحادییەکان و ئەڵمانییەکان بەڕاستی تا ڕادەیەک توانیان کەڵک لە بزووتنەوەی جەنگەڵییەکان وەربگرن، تەنانەت میرزا کوچک خان هەندێ کۆمەڵی جەنگاوەری نارد بۆ یارمەتیدانی هێزەکانی تورکیا و ئەڵمانیا لە ناوچەکانی دیکە بەناوچەی کرماشانی کوردیشەوە.

---

(٨٨) بۆ درێژەی دەربارەی بزووتنەوەی جەنگەلییەکان بڕوانە:

ابراهیم فخرائی، میرزا کوچک خان سردار جنگل، تهران، ١٣٤٤ شمسی؛

M. S. Ivanov, Ochirk..., PP. 259 - 269, 279 - 285, 293 - 299.

(89) M. N. Ivanoa, Natsionalno-osvoboditelnaya dvijenie v Irane, Moscow, 1961, P. 18.

م. ن. ئیڤانۆڤ، بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی نیشتمانی لە ئێران، بەزمانی ڕووسی، مۆسکۆ، ١٩٦١، ل١٨.

ژمارەیەکی بەرچاوی جووتیارە کوردەکان بەگەرمی بەشداری بزووتنەوەی جەنگەڵیان کرد و چەند کۆمەڵی دیکەشیان دابارینە سەر مەڵبەندی بزووتنەوە. خاڵۆقوربان بووە یەکێ لە دیارترین ڕابەرانی بزووتنەوەی نزیک بەمیرزا کوچک خان، هەروەها ژمارەیەکی دیکەی کوردی وەک کەریم خان و قەنبەرخان و خاڵۆحشمەت و باباخان کە لەگەڵ خاڵۆقوربان خزمایەتیان هەبوو لە ڕیزی جەنگەڵییەکان بەدەرکەوتن.

تا دەهات پایەی خاڵۆ قوربان لە ڕیزی جەنگەڵییەکان بەرز دەبۆوە، هەتا گەیشتە پایەی قۆمیسەر، کە بەرامبەر بەپلەی وەزیری جەنگە، بەڵام لە کۆتاییدا لە بزووتنەوەکە جودا بۆوە و چووە ناو بازاڕی سازشکاری باوی ئەوکاتە و لەو کارە سەربازییانەی کە دژی سمکۆ ئەنجام دران کوژرا. سمکۆش پیاوێکی هەڵکەوتووی دیکەیە کە پاش تەواوبوونی شەڕی یەکەمی جیهان نەخشی گەورەی لە خەباتی ڕزگاریخوازی کوردی ئێران گێڕا، ئەو باسەی دوایی دەگەڕێینەوە سەری.

بزووتنەوەی جەنگەڵییەکان پاش سەرکەوتنی شۆڕشی ئۆکتۆبەر و کۆتابوونی شەڕی یەکەمی جیهان پێی نایە هەوارێکی نوێ. لە پێنجی حوزەیران ساڵی ۱۹۲۰ کۆماری گەیلان پێک هات. دوای کۆککردنی ڕیزەکانیان شۆڕشگێڕانی جەنگەڵ ڕوویان لە قەزوین کرد، تارانیش فەرمانی بەقۆزاقەکان دا پەلاماری جەنگەڵییەکان بدەن، بەڵام خۆیان لەبەر نەگرتن، ناچاربوون پاشەکشێ بکەن بۆ گوندەکانی قەزوین و بڵاوەی لێ بکەن. مەترسی لە پایتەخت نزیک بۆوە، تا وای لێهات باڵوێزی بەریتانیا دەستوبردی کرد لە گواستنەوەی بارەگاکەی بۆ ئەسفەهان، بانقی شاهنشاش لکەکانی لە ڕەشت و تەورێز داخست. بەڵام هێزەکانی بەریتانیای جێگیر لە قەزوین، نەیانهێشت جەنگەڵییەکان لە تارانی پایتەخت بچنە پێش(۹۰). وێڕای ئەوەش لاوازی هاوپەیمانی نێوان هێزە نیشتمانییەکانی نەتەوە جیاجیاکانی ئێران کەلێنێکی گەورەی خستە بەرەی جەنگەڵییەکان، کە توانرا بزووتنەوەکە و کۆمارەکەیان لە تشرینی یەکەمی ساڵی ۱۹۲۱ لەناو ببەن. میرزا کوچک خانیش لە کاتی ڕاونانی لەلایەن حکوومەتەوە لە کۆتایی تشرینی دووەمی ساڵی ۱۹۲۱ لە چیای تاڵش کوژراو سەریان بڕی و بردیانە پایتەخت(۹۱).

---

(۹۰) بۆ درێژەی بڕوانە: حسن اعظام قدسی (اعظام الوزاره)، کتاب خاطرات من یا روشن شدن تاریخ صد ساله، جلد دوم، تهران، ل ۱۰ - ۱۳.

(۹۱) هەمان سەرچاوە، ل ۱۷.

کوردی ئێران هەر بەتەنیا لە دەمی شەڕ لەگەڵ بزووتنەوەی جەنگەڵییەکان بەشدارییان لە ژیانی سیاسی وڵات نەکردووە، بەڵکو بەزۆر شێوەی جیاجیا هاوبەشیان لە خەباتی ئێرانییەکان کردووە. هەر کە حکوومەتی وسوق ئەلدەولە لەساڵی ۱۹۱٦دا پێک هات ئەوا ململانێی هێزە نیشتمانییەکان لە دژی ئەو حوکمەتە تیژتر بوو، بۆ ئەوەی ئەو حکومەتە ناچار بکەن هەڵبژاردنێکی نوێ بکات و داوا لە شوورا بکەن کۆبێتەوە، بۆ ئەمەش کۆبوونەوەی جەماوەری لە شاری کرماشان بەستران و دروشمیان بەو مانایانەوە بەرز کردەوە. شاعیری ناسراوی بە نەتەوە کورد ئەبولقاسم لاهوتی دەورێکی بەرزی لەو کۆبونەوانەدا گێڕا(۹۲).

بەسەرکەوتنی شۆڕشی ئۆکتۆبەری سۆشیالستی و پاشان تەواوبوونی شەڕی یەکەمی جیهان، خەباتی ڕزگاریخوازی گەلانی ئێران پێی نایە وارێکی پێگەیشتووتر لەپێشوو(۹۳)، بەخەباتی رزگاریخوازی کوردیشەوە، کە ئەو کاتی لە زنجیرەیەک بزووتنەوە و ڕاپەڕینی نوێ خۆی نواند، وەک جارانیش دەرژانە دوو ڕێچکەی لە ئامانج ناکۆک و یەک دەگیر لە هۆ خەفە بزوێنەکانی. دوای شەڕ سەرلەنوێ سالار ئەلدەولە لەسەر شانۆ بەدەرکەوتەوە، بەڵام ئەو جارەیان وەک جاری پێشوو سەرەک هۆزە کوردەکانی هاوپەیمانی بەگەرمی پێشوازییان لێ نەکرد، بۆیە لەبەردەم هێزەکانی ئێران خۆی نەگرت و هەڵاتە ناو خاکی عێراق و گیرا. لەسەر داخوازی حوکمەتی ئێران، کە رازی بوو سامانەکەی بداتەوە، بۆ حەیفا دوورخرایەوە(۹٤).

بەر لەوەی شەڕ ببڕێتەوە سەردار ڕەشیدی نەوەی ئەمانوللا خانی بەناوبانگ جموجۆڵی لە ناوچەی ئەردەلان دەست پێ کرد، ژمارەیەکی زۆری سەرەک هۆزەکانی موکریان و هەورامان و ناوچەکانی دیکەی کوردەواری لە دەوری خڕبوونەوە و، هەروەها پێوەندی بەڕووسەکان و سالار ئەلدەولەشەوە کرد(۹٥). دەسەڵاتی سەردار ڕەشید و لایەنگرانی بەخێرایی پەلی بۆ کرماشان و سنە و مەڵبەندەکانی دیکەی کوردستانی ئێران هاویشت.

---

(۹۲) بڕوانە: M.N. Ivanova, OP. Cit., pp. 22-23.

(۹۳) بڕوانە: بابەتی "هەندێ ڕاستی دەربارەی خەباتی ڕزگاریخوازی ئازەربایجان لە ئێران".

(94) P. Sykes, OP. Cit., pp. 430-431.

(۹٥) بۆ درێژەی دەربارەی ئەو باسە بڕوانە: عەلائەدین سەجادی، شۆڕشەکانی کورد و، کورد و کۆماری عێراق، بەغداد، ۱۹٥۹، ل۷۱-۷۷.

بەڵام ئێرانییەکان توانیان لە شوباتی ساڵی ١٩٢٠ لە داوی کەن و بیگرن، کە شەریف ئەلدەولەی فەرمانڕەوای ئەو کاتی سنە بۆی نابۆوە. دواتر دەرفەتی دیکە بۆ سەردار ڕەشید هەڵکەوتن، بەڵام نەیتوانی ڕۆڵێکی دیار لە خەباتی ڕزگاریخوازی کورد لە ئێران ببینێ کە دوای شەڕ بەشێوەیەکی تایبەت لەو ڕاپەڕینە گەورەیەی سمکۆ ڕابەری دەکرد خۆی نواند.

مێژووی سەرهەڵدانی ئیسماعیل ئاغای شکاک، ناسراو بە سمکۆ بۆ ساڵانی پێش شەڕی یەکەمی جیهان دەگەڕێتەوە، تایبەت دوای ئەوەی کاربەدەستانی ئێران جەعفەر ئاغای برا گەورەیان لە ساڵی ١٩٠٥ بەفێڵ کوشت لەبەر ئەوەی پێوەندی بەشۆڕشگێڕانی ئێرانەوە هەبوو. لە هەنگینێەوە سمکۆ پێوەندی بە عەبدولڕەزاق بەدرخان و ڕووسەکانەوە هەبوو. کە بەڵگەنامە دبلۆماسییەکانیان زۆر جار پەنجەیان بۆ ناو و جموجۆڵەکانی ڕاکێشاوە[٩٦]. ڕاپۆرتێکی تایبەتی ڕووس دەڵێت: "ناوی سمکۆ لە دەوروبەری ساڵی ١٩١٤وە لەسەر ئاستێکی فراوان لە فەرمانگە دبلۆماسییەکانی ڕووس و بەریتانی و ئێرانی و تورکی ناسرابوو. لە باڵیۆزخانەی هەر یەک لەو وڵاتانە و لە وەزارەتەکانی هەندەرانیشیان دۆسییەکی گەورە دەربارەی سمکۆ هەیە»[٩٧]. «ئیسماعیل ئاغا و هۆزی شکاک» ڕاپۆرتێکی تایبەتی بەزمانی ڕووسی، ل١، لە ساڵی ١٩٦٨ د. عەلی گەلاوێژی هاوڕێ، کە هەنووکە لە کونجی زیندانەکانی ئێراندا، دانەیەکی ئەو ڕاپۆرتەی دامێ. «زۆر بەداخەوە لە ساڵی ١٩٨٨ گیانی پاکی بەخاک سپارد - وەرگێڕ».

بۆ ئەوەی سمکۆ «هەموو دەروازەکانی لە بەردەم والا بن» بەقسەی (مارتن فان برونسن)، لە ساڵانی شەڕی یەکەمی جیهان سیاسەتێکی تا ڕادەیەک هێمنانەی گرتەبەر[٩٨]. بەڵام دوای تەواوبوونی شەڕ سمکۆ بووە دیارترین ماک (عنصر) لە خەباتی ڕزگاریخوازی کوردی ئێران، ئەو خەباتەی ناوەڕۆکەکەی قووڵتر و ئامانجەکانی پتر بەدەر دەکەوتن، بۆ ئەوەی ببێتە دیاردەیەکی دیار لە مێژووی سیاسی ئێران، بەتایبەتیش پاش پەیدابوونی ڕەزاخان (دواتر شا) لەسەر شانۆ، کە بەحوکمی بارودۆخی ئێران سیاسەتێکی

---

(٩٦) بە وێنە بڕوانە: "وەزارەتی هەندەران، بەڵگەنامەی ئەرشیفەکانی حکومەتی تەزاری و حکومەتی کاتی"، زنجیرەی دووەم، بەرگی بیست، بەشی یەکەم، ل٥٥-٧٧. هەر دوو بەڵگەنامەی ژمارە ٦٢و ٨٠.

(97) “Ismail Aga simko i plemia shkak, P. I.

(98) M. Van Bruinessen, Kurdish Tribes and the State of Iran. The Case of Simko’s Revolt, p. 18.

نادیموکراتییانەی دەرهەق بەکێشە نەتەوایەتییە هەمیشە هەڵایسەکانی گرتەبەر. وێڕای ئەو هەڵانەی سمکۆ دەرهەق بەئاسووری و ئازەربایجانییەکان کردی[99]، بەڵام هەڵوەستی لە مافەڕەواکانی نەتەوەکەی ئاشکرا بوو، بۆیە هەردەم لە سەنگەری دژ بەتاران بوو. ئەو ناوەی بۆ ڕۆژنامەکەشی هەڵبژاردبوو کە لە ورمێ دەری دەکرد، وامان لێ دەکا پێویست نەکات بچینە ناو درێژەی ئەو لایەنەی بابەتەکە کتومت ناوی نابوو «ڕۆژی کورد و شەوی عەجەم»[100].

سمکۆ بزووتنەوەکانی لە ناوەڕاستی ساڵی ١٩٢١ دەستپێکرد و ناوچەیەکی فراوانی ڕۆژئاوای گۆمی ورمێی تەنی بوو. لە سەرەتا سمکۆ توانی دەسەڵاتی خۆی بەسەر شاری ورمێدا بسەپێنێ کە بەکردەوە ببووە بارەگای. دوای ئەوە هێزەکانی سمکۆ ڕوویان لە شاری مەهاباد کرد و ڕۆژی ٧ی تشرینی یەکەم چوونە ناوی پاش ئەوەی توانی هێزێکی گەورەی جەندرمان بەفەرماندەی مەلەک زادە تێک بشکێنێ. لە ماوەیەکی کورتدا شۆڕشگێڕان شارەکانی سەلماس و خوی و سەڵدۆز و سەقز و بانە و ناوچەکانی دیکەیان ڕزگار کرد[101]. لەبەر ئەوەی هێزە تایبەتییەکانی تاران توانایان نەبوو ڕاپەڕینی سمکۆ لەناوببەن بۆیە هانایان بۆ هەندێ کوردی بەدەسەڵاتی وەک خالۆ قوربان برد کە ڕەزاخان توانیبووی ویژدانی بکڕێت، هەروا ئەمیر ئەرشەد میری کوردی سەر بەتاران کە ڕەزاخان نازناوی سەرداری پێ بەخشی بوو، بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە، ئەوەی دواییان بەسەرۆکایەتی چەند هەزار بەکرێگیراوێکی چەکدار ڕووی لە مەهاباد کرد. لەو چەند شەڕانەی لە تشرینی دووەمی ١٩٢٤ لەگەڵ شۆڕشگێڕانی کرد، سەرکەوت. لە ١٥ی کانوونی یەکەم هێزێکی هاوبەش لە پیاوەکانی ئەمیر ئەرشەد و جەندرمە و قۆزاق توانیان

---

(٩٩) بەتریکی ئاسووری (مار بنیامین شەمعون)ی لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لە پیاوەکانی پاش چاوپێکەوتنی لە ڕۆژی ٣ی مارتی ساڵی ١٩١٨، کوشت، هەروەها لە هەندێ ناوچەشدا دڵڕەقانە لەگەڵ ئازەربایجانییەکان ڕەفتاری کرد.

(١٠٠) پاشان سمکۆ ناوی ڕۆژنامەکەی کردە (ڕۆژی کورد) ئینجا بەتەنیا (کورد) لە سەرەوەی ناوی ڕۆژنامەکە نووسیبووی «وَاَعْتَصِموا بِحَبلِ اللّهِ جَميعاً وَلاتَفَرَّقُوا». بۆ درێژەی ئەو بابەتە بڕوانە: محمد تمدن، اوضاع ایران در جنگ اَول. تاریخ رضائیه، تهران، ل ٣٧١ – ٣٧٢.

(١٠١) احمد شریفی، عشایر شکاک و شرح زندگی انها به رهبری اسماعیل اغا سمکو، تهران، ١٣٤٨، ل ٤٢ – ٤٣.

D. N. Wilber, Riza Shah Pahlavi. Ressurrection and Reconstrution of Iran, New-York, 1975. P. 59.

مـەهاباد بگرنەوە. دوای تێپـەڕبوونی تەنیـا (١٠) ڕۆژ شـۆڕشگێـڕان دژە هێـرشـێکی فراوانیـان بۆ کردەوە، هەمـوو ئەو ناوچانەی کە لە دەسـتیـان دابوو وەریان گرتنەوە و زیانی گەورەیان لە هێزەکانی دوژمن دا، ئەمـیر ئەرشەدیش لەو شەڕانەی دوایـیـدا بەسزای خۆی گەیشت(١٠٢). پاشان خالۆ قوربانیش لەسەر دەستی شۆڕشگێڕانی سمکۆ کوژرا(١٠٣).

ئا بەو جۆرە پێکدادان تا ناوەڕاستی تەمووزی ساڵی ئایندە لە نێوان هەردوولا بەردەوام بوو، کاتێ هێزەکانی حکوومەت توانیـان شۆڕشگێڕان ببەزێنن و بارەگای سەرەکیـیان لە جەهریق لێ داگیر بکەن، سمکۆ پەنای بردە ناو خاکی تورکیا، پاشان بۆ ناو خاکی عێراق و پێوەندی ڕاستەوخۆ لەگەڵ بەریتانییەکان گرت، کە هەڵوەستیـان لە سمکۆ هەندێ لێ وردبوونەوەی دەوێ. بەر لەهەر شت ڕۆژنامـەکـانی بەریتـانیـا سـمکۆیان بەدز و (ڕۆبن هودی) ڕۆژهەڵات لە قـەڵەم دابوو(١٠٤). بەسـەرکـەوتنی هێـزەکـانی ئێـران بەسـەریدا خۆشحاڵ بوون(١٠٥). بەڵام هەڵوەستەکردنی ئینگلیزی فێڵباز بەشێوەیەکی وردتر لەسەر زمانی ئەدمـۆندسی حاکـمی سیـاسی ئەو کـاتەی کـەرکـووک بوو، هەر لە ڕێی ئەویشـەوە پێوەندی بەسمکۆوە دەکرا. پاشان ئەدمۆندس دەنووسێت و دەڵێت:

«پێی سـەیر بوو (واتە سـمکۆ. -و) کـە ئێـمـە ئەوەندە بایەخ بەفـارسـەکـان دەدەین، هەرچەند ئەوان بەدرێژایی سنوور لەگەڵ تورکەکان هاوکاری دەکەن، ئەو تورکانەی ئێمەیان لە ڕواندز و ڕانیـە وەدەرنا و هەتا ئێـسـتـاش بەئاشکرا لەگـەڵمان دەجەنگن. لە حاڵەتی پێچەوانەی ئەمە نیازی نەبوو داوای پەناهەندەیی بکات، بەڵکو دەگەڕایەوە ناو هۆزەکەی تا بەتەنیا کار بکات»(١٠٦). هەر واش بوو، سمکۆ کە تووشی نائومێدییەکی گەورە ببوو

---

(102) D. N. Wilber, OP. Cit, P. 59; "The Near East and India", London, Vol, XXI, No. 556, January 5, 1922, PP. 2 - 3; No. 557, January 12, 1922, PP. 38 - 39.

(١٠٣) ابراهیم فـخـرائی، مـرزا کـوچک خـان سـردار جنگل، ل ٣٤٧؛ عـەلی سـەنجەری، لە پیـاوە ناودارەکـانی کـورد میـرزا کـوچک خان، ڕۆژنامـەی (ژین)، سلێمـانی، ژمـارە (٣٢)، تەمووزی ١٩٧١.

(١٠٤) بڕوانە:

"The Near East and India", Vol XXIII, No. 888, January 5, 1928, P. 2

(105) "The Near East and India", Vol. XXI, No. 557, January 12, 1922, P. 39

(106) C. J. Edmonds, Kurds, Turks and Arabs. Politics travel and research in North-Eastern Iraq, London, 1957, P. 307.

له سیاسه‌تی به‌ریتانیا[١٠٧]، سالّی ١٩٢٤ گه‌رایه‌وه کوردستانی ئێران، بۆ ئه‌وه‌ی سه‌رله‌نوێ بۆ ماوه‌ی چه‌ند مانگێک ململانێی ده‌ست پێ بکاته‌وه، پاشان ناچار بوو له‌ژێر فشاری هێزه‌کانی ئێران بۆ دووه‌مین جار ناوچه‌که به‌جێ بهێلّێت. لێره‌دا هه‌واری یه‌که‌می بزووتنه‌وه‌کانی سمکۆ کۆتایی پێ دێت که به‌نرخێکی زۆر گران له‌سه‌ر تاران که‌وت[١٠٨]. له خۆڕا نه‌بوو که ڕه‌زاشا به‌درێژایی ژیانی نه‌یتوانی، وه‌ک پیته‌ر ئه‌فری (ده‌لّێت: «کورده سه‌ر ڕه‌قه‌کان و... سمکۆی پێشه‌وایان له‌بیر بکات که ڕێکه‌وت وابوو دژی ئه‌و تێبکۆشێت له ڕێڕه‌وی ململانێی له‌پێناو ده‌سه‌لاّتدا»[١٠٩].

بزووتنه‌وه‌کانی سمکۆ بۆ ماوه‌ی شه‌ش سالّی دیکه‌ش له نێوان هه‌لّکشان و داکشاندا به‌رده‌وام بوو. هه‌ندێ بزووتنه‌وه‌ی خۆجێی دیکه‌شی هاوشان بوون، که به‌ده‌وری خۆی ڕه‌نگدانه‌وه‌ی بێزاری سه‌ختی کرده‌وه نادیموکراسییه‌کانی تاران بوو. کۆتایی مارتی ١٩٢٩ هه‌رایه‌ک له نزیک مه‌هاباد قه‌وما دژی «هه‌ولّی حکوومه‌تی ئێران بۆ به‌زۆر له‌به‌رکردنی جلوبه‌رگی فه‌ڕه‌نگی و له‌سه‌رکردنی شه‌پقه‌ی په‌هله‌وی «هه‌روه‌ک ڕۆژنامه بیانییه‌کان ڕایان ده‌گه‌یاند. ڕه‌زا شا ناچار بوو هێزێکی ٤ هه‌زار که‌سی بنێرێت بۆ له‌ناوبردنی نه‌یاری مه‌هابادییه‌کان که توانیبوویان فه‌رمانده‌ی ئۆردووی ئێرانییه‌کان له ئازه‌ربایجان بپێکن. هێزه‌کانی ئێران توانییان بزووتنه‌وه‌که‌ی سه‌رکوت بکه‌ن و ژماره‌یه‌ک له سه‌رکرده‌کانیان ناچاربوون په‌نا ببه‌نه به‌ر خاکی عێراق[١١٠]. ده‌سه‌لاّتدارانی شا سیاسه‌تی زه‌بروزه‌نگیان له هه‌موو لایه‌ک په‌ره‌پێدا. پاشان ڕه‌زاشا توانی له ناوه‌ڕاستی ته‌ممووزی سالّی ١٩٣٠

---

(١٠٧) ده‌رباره‌ی ڕای سمکۆ خۆی به‌رانبه‌ر به‌ئینگلیز و بروانه‌بوون پێیان بڕوانه: یادداشته‌کانی ئه‌حمه‌د ته‌قی که ماوه‌یه‌ک هاوڕێیه‌تی کرد «خه‌باتی گه‌لی کورد له یادداشته‌کانی ئه‌حمه‌د ته‌قیدا. لاپه‌ڕه‌یه‌ک له شۆڕشه‌کانی شێخ مه‌حموود و سمکۆ و هه‌ستانه‌که‌ی ڕواندز». ڕێکخستن و ئاماده‌کردنی بۆ چاپ جه‌لال ته‌قی، به‌غدا، ١٩٧٠، ل ٧٠.

(108) "The Near East and India", Vol. XXII, No. 588, August 17, 1922, P. 202; No. 591, September 7, 1922, P. 307. O. S. melikov, Ustonovlenie dictaturi Riza Shaha V Irane, Moscow, 1961, PP. 88, 90.

(109) P. Aery, OP. Cit. P. 387.

(110) Report by His Majesty's Government in the United Kingdom of Great Britain and Northern Ireland to the Council of the League of Nations on the administration of Iraq for the year 1929, London, 1930, PP. 39 - 40.

«العالم العربي» (جريدة). بغداد، ٣ نيسان ١٩٢٩.

پیـلانێـک لە شـاری شنۆ ڕێک بخـات، ژیانی سـمکۆ و ١٠ کـەس لە پیـاوەکـانی تیـاچوو(١١١). پاشـان لاشـەکـەی گـوازرایەوە گـوندی جـەهریق کـە یەکـەم پڕیشکی ڕاپەڕینەکەی لێ هەڵگیرسا(١١٢).

دوای لەناوبردنی ڕاپەڕینەکـەی سـمکۆ یەکـێـک لە نزیکەکانی ڕەزاشـا، بەناوی عـەلی دەشتی، لەبەردەم پەرلەمـانی ئێران ڕایگەیاند کـەوا «لە ئێـران کێشـەیەک نیـیە بەناوی کێشەی کورد، کورد لێرە وەک کەمینەی نەتەوەیی ڕەفتاریان لەگەڵ ناکرێت»(١١٣). لەو ساکەوە ماوەی کپی لە خەباتی ڕزگاریخوازی کوردی ئێران دەستی پێکرد. کوردستانی ئێران بەدرێژایی دە ساڵی دوایی جگە لە چەند بزووتنەوەیەکی چەکداری بچووک نەبێت، بەوێنە ئەو بزووتنەوەی جەعفەر سوڵتان ڕابەری کرد و ناچار پەنای بردە ناو خاکی عێراق لە ناوەڕاستی کـانوونی دووەمی سـاڵی ١٩٣٢(١١٤) چی دیکەی بەخـۆوە نەدیت. کـە ڕەزاشا لە سییەکـان توانی پایەی ڕژێمە دکتاتۆرییەکەی بچەسپێنێت شۆڤینییەتی تاران دەرهەق بەگـەلانی نافـارس زیاتر پەرەی سەند، بەگـەلی کـوردیشـەوە، زیندانەکـانی وڵات بەنیشتمانپەروەران ئاخنران، بەهەندێ لەو سەرۆک هۆزانەشەوە کە بەشێوەیەک یا جۆرێکی دی دژی فـەرمـانڕەوایی پەهلەوی نوێ ڕاوەسـتـان، کـە درێژبوونەوەی فـەرمـانڕەوایی قاجـارییەکـان بوو لە زۆر خاڵ و ڕوخسـاردا.(١١٥) نکۆڵی لەوە ناکرێت نارەزایی توندی سەرۆک هۆزەکـان لە سیاسەتی نوێی ڕژێم گرنگترین هۆ بوو پاڵی پێیانەوە دەنا بکەونە بەرەی دژ بەڕژێم. بەڵام لە هەندێکیـاندا هەسـتی نەتەوایەتی دەوری خـۆی هەبوو، دەنا

---

(١١١) «العالم العربي» لە ٢٣ی تەمووز ١٩٣٠.

(١١٢) سمکۆ لەناو کورددا زۆر خۆشەویستە، شایانی باسە کە هێزێکی پێشمەرگەکانی کوردستانی ئێران ئێستە (ساڵی دەرچوونی کتێبەکە - ١٩٨٥)ە، بەناوی سمکۆوەیە و تایەرخانی کوڕی کە تەمەنی دەوروبەری حەفتا ساڵە ڕابەری دەکات.

(١١٣) «مەحزەری شوورای ئێران لە ٢٢ی تشرینی یەکەمی ١٩٣٠» لە:
R. Qazi, Kurdistan democrat partiaci Iran Kurdistaninda Kurd Khalginin milli azadlig harakatinin rahbari va taskhilaici 1945 - 1946, baku, 1954, P. 107.
ڕەحیـمی قـازی، حـزبی دیموکـراتی کـوردسـتـان ڕێکخـەر و ڕابەری بزووتنەوەی ڕزگـاریخـوازی نیشـتـمانی گەلی کورد لە کوردستانی ئێران، بەزمانی ئازەربایجانی لەگەڵ کورتەی بەزمانی ڕووسی، نامەی دکتۆرا، باکۆ، ١٩٤٥، ل ١٠٧.

(١١٤) بڕوانە: «العراق» (جريدة)، بغداد، كانوني الثاني، ١٩٣٢.

(١١٥) بۆ درێژەی ئەم باسە بڕوانە: «رضا المازندراني والعرش الايراني» لە ئەسڵی کتێبەکە بەعارەبی.

ڕژێمی پەهلەوی لایەنی بنەڕەتی پێوەندی دەرەبەگی پێشووی پاراستبوو. هەرچەندە ئەو یاسای زەوی و زاری ساڵی ١٩٢٨ دەرچوو هەندێ شوێنەواری ڕاستەوخۆی لەسەر قەوارەی ڕژێمی خێڵەکی بەجێهێشت، بەڵام لە هەمان کاتدا دەسەڵاتی موڵکدارەکانی لەسەر زەوییەکان چەسپاند و لە سنوورێکی تەسک نەبێت هیچ کارێکی وای نەکردە سەر پێوەندی موڵکایەتی و شێوازی بەکاربردنی ئەو زەوییانەی کەپێش ئەو مێژووە هەبوون. ئەو سیاسەتەی ڕەزاشا کە بە«تەختە قاپۆ» ناسرابوو، مەبەستی لەناوبردنی ژیانی کۆچەرایەتی بوو لەنێو هۆزەکانی ئێران، بەهۆی ئەو کۆسپانەی دەهاتنە ڕێیان مەڕدارەکان زۆربەی مێگەلەکانیان لە دەست دا، هەندێکیان ژیانیشیان لە دەست دا، بۆیە دەبوونە سووتمانی هەر بزووتنەوەیەک دژی تەختی شا با. بەڕاستیش دێهاتەکانی سەر بە سنە و هەورامان و مەریوان زنجیرەیەک ڕاپەڕینی جووتیارانیان لەنێوان ساڵانی ١٩٣٦ و ١٩٣٩ بەخۆوەبینی، کە ڕێکخستن و توندوتۆڵییان لەنێواندا لاواز بوو، بۆیە هێزەکانی شا توانیان بەئاسانی بەسەرۆکایەتی جەنەڕاڵ ئەمیر ئەحمەدی لەناویان ببەن کە هیچ درێخی لە ڕشتنی خوێنی بێ تاوانانیش نەکرد(١١٦).

بەپێی چەندین سەرچاوە(١١٧) کاربەدەستانی ئێران لەنێوان ساڵانی ١٩٣٤ و ١٩٤٠دا بەلایەنی کەمەوە ١٢٠ کوردیان لەناو زیندانەکاندا هەڵواسی. شوێنەواری ئەو سیاسەتە شۆڤینییە لە سەرباری ڕووناکبیری و تەندروستی و کۆمەڵایەتی گەلی کورد لە ئێران ڕەنگی دایەوە. تا شەڕی دووەمی جیهان لە هەموو بەشەکانی باکووری هەرێمی کوردستان، کە لە شارەکانی سەردەشت و سەقز و بانە و مەهاباد و شنۆ و لاهیجان و نەغەدە و بۆکان و ئەوانی دی پێک هاتبوو لە فێرگەیەکی دواناوەندی زیاتر نەبوو، گەرچی هەینێکە ژمارەی دانیشتووانی ئەو ناوچە فراوانە لە ملیۆنێک کەس زێتر دەبوو، بەڵام لە ناوچەی مەهاباد و هەر شەش سەد و پەنجا دێهاتەکانی تەنیا پێنج فێرگەی سەرەتایی لێ هەبوو.

باری تەندروستی کوردستانی ئێران لە باری ڕووناکبیری چێتر نەبوو، بۆ هەموو

---

(116) R. Qazzi, Op. Cit., P. 111.

(١١٧) دەربارەی ئەو ڕاستییانەی پێوەندیان بەچەوساندنەوەی نەتەوایەتی هەیە و گەلی ئێران پێش دامەزراندنی «کۆماری مەهابادی خاوەن خودموختاری» دووچاری ببوو لە بنەڕەتەوە پشتمان بەنامەی دکتۆرای دکتۆر ڕەحیمی قازی بەستووە کە بەدرێژی لە پەڕاوێزی (١١٣) باسی کراوە.

دانیشتووانی ناوچەی مەهاباد، کە ژمارەیان ئەو کاتی دەگەیشتە ۲۰۰ هەزار کەس، یەک نەخۆشخانەیان بۆ تەرخان کرابوو، ژمارەی تەختەکانی لە بیست تەخت پتر نەبوو، بەپێلێنانی ڕۆژنامەی (کەیهان)ی نیمچە ڕەسمی لە کانوونی دووەمی ساڵی ۱۹۵۱ ژمارەی تەختەی نەخۆشخانەکانی ناوچەی کرماشان، کە زۆر لە ناوچەکانی دیکەی کوردستانی ئێران پێشکەوتووترە، بەزیادەوە دەگەیشتە دەیەکی پێویستی ڕاستەقینەی ناوچەکە. دیارە ئەمەش ئەنجامێکی سروشتی سیاسەتی جیاوازییە بەرانبەر مرۆڤی کورد، کە بەدان پێدانانی هەر ئەو ڕۆژنامەیە بەشی کوردێک لە تەرخانی تەندروستی (مخصصات الصحية) دەگەیشتە ۱٪ی بەشی فەردێکی ناوچە پێشکەوتووەکانی ئێران. جا بۆیە لە خۆڕا نییە ڕۆژنامەی (سنندج) لە ژمارەی ڕۆژی ۲۲ی خرداد ۱۳۳۱دا، دان بەوەدادەنێ کەوا «کوردستان بەئەندازەی ٦۰ ساڵ پێش ئێستا هیچ گۆڕانی بەسەردا نەهاتووە». ئەوەش مانای ئەوە نییە کە بارەکە بەگوێرەی ئازەربایجانییەکان یان عەرەب و بەلووچ و ئەوانیش باشترە. جێی خۆیەتی لەو بارەیەوە پەنجە بۆ ئەوە ڕابکێشن کەوا تا ساڵی ۱۹٤۱ لە ئێران وەزارەتێک بۆ تەندروستی نەبوو، بەڵکو بەڕێوەبەرایەتییەکی سەر بەوەزارەتی ناوەخۆ سەرپەرشتی هەموو کاروبارێکی دەکرد پێوەندی بەتەندروستییەوە هەبووایە لە ئێران، کە توانای پزیشکایەتی بەکەمتر لە پێویستی ڕاستەقینەی دانیشتووان خەمڵ دەکرا[118].

لە سەردەمی ڕەزاشادا کاربەدەستانی ئێران لە ساڵی ۱۹۳۵ سیاسەتی کۆچ پێکردنیان پەیڕەو کرد و بەشێکی زۆری ڕۆڵەی هۆزی گوڵباغی و جەلالی و پیران و ئەوانی دیکەیان بۆ سوڵتان ئاوا و کرمان و شیراز گوازتنەوە. ڕاگوێزتنی ئەوانە لە بارودۆخێکی زۆر ناهەموار بەڕێوە دەچوو، بەدانپیانانی ئەو ئەفسەرەی سەرپەرشتی گواستنەوەی ڕۆڵەکانی هۆزی گوڵباغی دانیشتووی ناوچەی نێوان سنە و سەقزی دەکرد، هەموو ئەو منداڵ و ئافرەت و ژمارەیەکی زۆری پیاوەکان لە ڕێگا گیانیان سپارد[119].

لە ساڵانی دوایی فەرمانڕەوایی ڕەزاشا چەوساندنەوەی نەتەوەیی دەرهەق بەهەموو گەلانی ئێرانی نافارس پەرەی سەند، بەوێنە لە کوردستان کاربەدەستان هەوڵیاندا زمانی کوردی بەکار نەهێنرێت، تایبەت لەناو فێرگە و فەرمانگە میرییەکاندا، هەروەها هەوڵی

(118) "Sovrimenay Iran", P. 519.

(۱۱۹) «کوردستان» (ڕۆژنامە)، مەهاباد، ۱۹ی مایسی ۱۹٤٦.

بەزۆر لەبەرنەکردنی جلوبەرگی نەتەوایەتی درا، پیاوانی پۆلیس هەڵیان دەکوتایە سەر مزگەوتەکانیش بۆ ئەوەی زۆر لە گوندییەکان بکەن واز لە جلوبەرگی نەتەوایەتی بێنن. هەروەها ناوی ژمارەیەکی زۆری شار و گوندی کوردەواریان کردە فارسی، ناوی شاری ورمێی ناسراو کرا ڕەزائیە، سەڵماس بووە شاهپور، ساین قەڵا بووە شاهیندیر، چۆمی چەغەتوو بووە زرینەرود.

شوێنەواری ئەو سیاسەتە ڕەگەزپەرستانە پەلی بۆ لایەنی ئابووریش هاویشت. کاربەدەستانی تاران سیاسەتی جوداوازی ئاشکرایان لە بواری ئابووری دەرهەق بەناوچەکانی نافارس لە ئێران گرتەبەر. لەو دوا دە ساڵەی فەرمانڕەوای ڕەزاشا (٤) کارگەی ڕستن و چنین و (٨) کارگەی دروستکردنی شەکر و ژمارەیەکی زۆری کارگەی لۆکە و کارگەی پاککردنەوەی دانەوێڵە و دروستکردنی جگەرە دامەزران، بەشی ئازەربایجان و کوردستان دوو کارگەی چکۆلەی دروستکردنی شەکر بوو، یەکیان لە میاندواو، ئەوەی دیکەیان لە شاهاوا دامەزراند، ئەگەرچی ئەو دوو بەشەی وڵات هەتا هەنووکەش لە سەرووی هەموو شوێنەکانی دیکەوەن لەلانی بەرهەمی کشتوکاڵییەوە، کوردستان لە سەرووی ئەو ناوچانەوەیە کە تووتن بەرهەم دێنن لە ئێران. ئەوەی شیاوی باسیشە ڕەزاشا خۆی زەوی کشتوکاڵی فراوانی لە میاندواو، شاهاوا و ناوچەکانی دەورویەریان هەبوو.

سیاسەتی ناوەندە فەرمانڕەواکان هەمو چین و توێژەکانی کۆمەڵایەتییان لە کوردستان خرۆشاند و بووە هۆیەکی یەکجار گرنگ بۆ دیارکردنی سروشتی خەباتی ڕزگاریخوازی کورد لەو وارە مێژووییەی پێشکەوتنیدا، کە پاشان قازی محەمەدی پێشەوا بەڕوونی لە زۆربەی دوان و وتارەکانی[(١٢٠)] دەربڕی.

ئا بەو جۆرە هەموو هۆیەکانی جوڵانەوە و تەقینەوەی ناوەوەی کوردستانی ئێران لەگەڵ هەڵگیرسانی شەڕی دووەمی جیهان لە ئاراد بوون، بەڵام فەرمانڕەوای دکتاتۆری پەهلەوی نەیهێشت ئەوەندەی بۆی کرا ئەنجامەکانی سەرهەڵبدەن. ئەوە هەر بەکوردستانیشەوە بەند نەبوو، بەڵکو بووە دیاردەیەکی گشتی کە شوێنەواری سەرجەم ئێرانی گرتەوە و لە هیچ بەشێکیدا تۆزقاڵێک دەرفەتی خەباتی سیاسی ئاشکرا و نهێنی نەهێشتەوە، تەنانەت

---

(١٢٠) بەوێنە بڕوانە: «کوردستان»، ٢٩ی مایسی ١٩٤٦.

هێزە نیشتمانییەکان ناچار بوون لەو ماوەیەدا لەسەر شانۆی سیاسی خۆیشارنەوە. لە کوردستانی ئێران بۆ ماوەی بیست ساڵان تەنیا ڕێکخراوێکی بچووک دروستبوو بەناوی «حزبی ئازادیخوازی کوردستان» کە عەزیز زەندی، یەکێ لە ڕووناکبیرە بەرزەکانی کوردستانی ئێرانی ئەو ڕۆژە بوو ڕابەریی کرد. زەندەی پێوەندی بەژمارەیەک سەرەک خێڵی لیبرالی و ڕووناکبیری ناوچەی مەهاباد کرد، هەوڵیدا لەگەڵ ئەرمەنییەکانی تەوریز ڕێک بکەوێت تا سوود لە ئەزموونە دەوڵەمەندەکانیان وەربگرێت، بەڵام بەحوکمی سروشتی دروستبوونی و لە بارودۆخێکی وا تۆقێنەردا، ئەو ڕێکخراوە نەیتوانی بچێتە ناو ڕیزی جەماوەری کوردەواری و چالاکی سنوورداری لە شاری مەهاباد تێنەپەڕی، لەبەر ئەوە نەیتوانی کار بکاتە سەر ڕەوتی ڕووداوەکانی کوردستانی ئێران، بۆیە چالاکیی ئەو حزبە دوو ساڵ تێپەڕی نەکرد (لە ١٩٣٩ تا ١٩٤١)، دوای ئەوە ئیتر لەسەر شانۆ بزر بوو.

بەڵام هەر لەو ماوەیەدا هەندێ هۆی دەرەکی دیار سەریان هەڵدا کە هاوشانی ساڵە گرنگەکان بوون لە مێژووی شەڕی دووەمی جیهان دا، کە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ ئەنجامەکانی لەگەڵ واقیعی ناوەوە کاریان لەیەک دەکرد و ڕووداوی سیاسی گەورەی لێ هاتنە ئاراوە و شوێنەوارەکانی لە ئێران دەرچوون و پەلی بۆ ناوچە گرنگەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست هاویشت. لە بیست و پێنجی ئابی ساڵی ١٩٤١ هێزەکانی شۆرەوی لە باکوورەوە و، هێزەکانی بەریتانیاش لە ڕۆژئاوا و باشوور هاتنە ناو خاکی ئێران، وەزارەتی عەلی مەنسووری سەر بەئەڵمانیای هیتلەری دوای دوو ڕۆژ دەستی لەکار کێشاوە. ڕەزاشا ناچاربوو لە ١٦ی ئەیلوولی هەمان ساڵ لە تەخت بێتە خوارێ بۆ محەمەدی کوڕی. بەو جۆرە دوایی بەدکتاتۆری ڕەزاشا هات کە بیست ساڵی ڕەبەقی بێ پسانەوەی خایاند.

ئەو قەوماوانە دۆخێکی لەباریان بۆ چالاکی بەرهەڵستکاران و خەباتی گەلانی چەوساوە لە ئێران هێناکایەوە، هێزە نیشتمانییەکان لە تاران و شارە گەورەکانی ئێران جووڵەیان تێ کەوت، ئازەربایجان و کوردەکان بەشێوەیەکی تایبەت بزووتن.

ئەو ڕووداوانە بارودۆخێکی تایبەتیان خوڵقاند، کە تا ڕادەیەک لە کوردستانی ئێران دژ بەیەک بوون. بەشی باشوور (لە ناوچەی کرماشانەوە تا سنە) کەوتە ژێر دەسەڵاتی بەریتانیا، بەشی باکووریشی، واتا لە باکووری مەهابادەوە بەرەو ژوور کەوتە ژێر دەستی شورەوی، ناوچەی نێوانیشیان بەشاری مەهابادیشەوە بێ لایەن مایەوە و بەناو سەر بەدەسەڵاتی ناوەندی تاران بوو. گەورە بەرپرسانی ئێران ناچار بوون شوێنەکانیان لە هەموو

ناوچەکانی کوردەواری بەجێ بهێڵن کە ڕووداوەکانی خێرا و یەک لەدوای یەک بوون. لە ١٦ی ئەیلوولی ساڵی ١٩٤٢ «کۆمەڵەی ژیانەوەی کورد» (١٢١) دامەزرا و لە مایسی ساڵی ١٩٤٣ ئۆرگانی خۆی بەناوی گۆڤاری «نیشتمان» دەرکرد» (١٢٢).

کۆمەڵەی (ژ. ک) نوێنەری دەستەی ڕووناکبیری کورد و هەڵگرانی بیروباوەڕی دایانمەزراند و لە سەرەتاوە سەرکردایەتی بەدەست ئەوانەوە بوو، بەڵام بنکەکانی وێڕای ڕووناکبیران نوێنەری جووتیارانیشی گرتەخۆ کە کۆمەڵە بایەخێکی جۆری نوێی پێدان، هەروەک لە ژمارە پێنجی گۆڤاری «نیشتمان»دا هاتووە کۆمەڵە تا هاوینی ساڵی ١٩٤٣ توانی ڕێکخستنەکانی لە هەموو لایەکی کوردستانی ئێران دابمەزرێنێت تایبەت دوای ئەوەی ژمارەیەک موڵکدار و سەرەک خێڵی لیبراڵی ڕاکێشان. سەرکردایەتی کۆمەڵە توانی قازی محەمەد، ئەو پیاوە ناودارەی کورد، قایل بکات لە کۆتایی ساڵی ١٩٤٤ بچێتە ڕیزی.

قازی محەمەد سەر بەبنەماڵەیەکی ناسراوی ناوچەی موکریانە، لە بەهاری ساڵی ١٩٠٠ لە شاری مەهاباد لە دایک بووە، زانستە ئایینییەکانی لەسەر دەستی باوکی میرزا عەلی خوێندووە کە بووە قازی موکریان. قازی محەمەد هەر لە منداڵییەوە حەزی لە ئەدەب دەکرد، هۆنراوەکانی شاعیری نوێخواز حاجی قادری کۆیی کاریان تێکرد. پاش ئەوەی فێری فارسی و عارەبی بوو، بایەخێکی زۆری بەئەدەبی ڕۆژهەڵات دا. پاشانیش فێری زمانەکانی تورکی و ئینگلیزی و ڕووسی و خەریکی زانستەکانی مێژوو و جوگرافیا و بیرکاری بوو. بیروباوەڕ و خەباتی قازی فەتاحی شاعیر، کە برا بچووکی باپیری بوو، کاریان لە قازی محەمەد کرد، کە بەرهەڵستی فەرمانڕەوای قاجارییەکان و بەرگری داگیرکردنی عوسمانی و ڕووسەکانی لە کوردستانی ئێران کردبوو، لە کاتی بەرەنگاربوونەوەی هێزەکانی تەزاری شەهید ببوو هەروەک پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد. یەکەمین ئەزموونی سیاسی لە ژیانی قازی محەمەد چوونە ناو ڕیزی بەرگریکەرانی

---

(١٢١) بە(ژ. ک) یان هەر بەتەنیا بە(کۆمەڵە) ناسراوە.

(١٢٢) دکتۆر ڕەحیمی قازی لەلاپەڕە ١٥٠-١٥١ی نامەکەی کە بۆ وەرگرتنی بڕوانامەی دکتۆرا پێشکێشی کردبوو (بڕوانە پەراوێزی ژمارە -١١٣- پەنجە بۆ ئەوە ڕادەکێشێ کە کۆمەڵەی (ژ. ک) لە حوزەیرانی ساڵی ١٩٣٨ دامەزرا، لە ساڵانی شەڕدا چالاکی دەست پێ کردووە. وا پێدەچێ کە دانە و دامەزراندنی حزبی «ئازادیخوازی کوردستان»ی بەسەرەتای سەرهەڵدانی کۆمەڵە دانابێ.

مەهاباد بوو دژی هێزەکانی عوسمانی داگیرکەر لە ساڵی ١٩١٥ کە هێشتا تەمەنی نەگەیشتبووە پانزە ساڵان. هەروەها بیروباوەڕی دیموکراسیش کە بەهۆی شۆڕشی دەستووری لەبرەودابوو کاری تێکرد. هەروەک «ئەنسکلۆپیدیای گەورەی سۆڤیەتی» دەڵێ: قازی محەمەد پێوەندی بەو شانە بەڵشەویکانەشەوە هەبوو کە لە ساڵانی شەڕی یەکەمی جیهان لە ڕیزی هێزەکانی تەزاری جێگیر لە ئێران کاریان دەکرد[١٢٣]. قازی محەمەد لە ساڵی ١٩٢٢ دەستی بەدەرس وتنەوە کرد تا ساڵی ١٩٢٦ بەکارگێڕی زانیاری لە مەهاباد دامەزرا، کۆششی زۆری کرد بۆ کردنەوەی ژمارەیەک فێرگە، لەوانەش یەکەمین فێرگەی کچان لە ناوچەکە. لە ساڵی ١٩٣١ قازی محەمەد گوازرایەوە بۆ پایەیی قازی موکریان، تا تەواوبوونی شەڕ لەو پایەدا مایەوە.

بەهاتنە ڕیزی قازی محەمەد بنکەی کۆمەڵەی (ژ. ک) بەشێوەیەکی بەرچاو فراوان بوو، بەتایبەتیش دوای لێکەوتنی ڕەزاشا، دەستی کرد بەگەڕان بەنێو هۆزەکانی موکریان، لە کۆتایی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٤١ ژمارەیەکی زۆری سەرۆکەکانی لە مەهاباد لە نیمچە کۆنگرەیەکدا کۆکردەوە کە چەند ڕۆژێکی خایاند، هەوڵێکی زۆری دا بۆ کۆکردنەوە و یەکخستنیان و بۆ ئەوەی قسەیان یەک بخات. هەر بۆ هەمان مەبەست کۆنگرەیەکی فراوانتری لە تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٤٢ بەست، ئەوجارەیان سەرۆک هۆزە لیبرالییەکان و ڕووناکبیرە شۆڕشگێڕەکانی بەیەکەوە کۆکردەوە. ئەوەی جێی گوتنە قازی محەمەد ئەو ڕۆژانە چیرۆکێکی بەناوی «سەلاحەدین» دانا و ژمارەیەک ڕووناکبیری مەهاباد کردیانە شانۆگەری و نیشاندانی سەرکەوتنێکی گەورەی وەدەست هێنا[١٢٤].

گواستنەوەی سەرکردایەتی کۆمەڵەی (ژ. ک) بۆ قازی محەمەد، کە ناوی حزبی (بینایی) بوو، وەرامدانەوەیەکی سروشتی هاوڕێژەی هێزەکانی ناو خەباتی ڕزگاریخوازی کورد لە ئێرانی ئەو ڕۆژە بوو، لەو مێژووەدا کۆمەڵە بەکردەوە چووە چالاکی ئاشکرایەوە.

---

(١٢٣) «ئینسکلۆپیدیای گەورەی سۆڤیەت» بەزمانی ڕووسی، چاپی دووەم، بەرگی بیست و هەشتەم، ل٤٦٠.

(١٢٤) بڕوانە:

O. L. Vilchevski, Mukrianski Kurdi (Ethnographicheski Ochirk), "Piredneasiatski Ethnographicheski Sbornik", T. I, Moscow, 1958. P. 220.

و. ل. ڤلیجێڤسکی، کوردەکانی موکریان، کورتەی ئەتنۆگرافی، بەزمانی ڕووسی، لە کتێبی «لێکۆڵینەوەی ئەتنۆگرافی وڵاتانی ئاسیای نزیک»، بەشی یەکەم، مۆسکۆ، ١٩٥٨، ل ٢٢٠.

قازی محەمەد دوو جاران سەردانی تارانی کرد، لەو سەردانانە داخوازییەکانی گەلی کوردی خستە بەردەم شا، هەروەک پاشان بەخۆی ڕایگەیاند کە ئەو داوای لێ کردووە «بایەخ بەکاروباری ڕووناکبیری و تەندروستی کورد بدات لەباتی ناردنی تۆپ و تانک لە دژیان»(١٢٥). کۆمەڵەی (ژ.ک) لە دوادواییەکانی شەڕ بەردەوام و چالاکانە لەپێناو فراوانکردنی بنکەکانی و چەسپاندنیان و بەرزکردنەوەی هۆشیاری لە ڕیزەکانی جەماوەر کاری دەکرد و بەم جۆرە ئاسۆیەکی نوێی لەبەردەم خەباتی ڕزگاریخوازی کورد لە ئێران کردەوە کە ڕەنگدانەوەی ئەو بارە دیموکراسییە نوێیە بوو کە ئێران و هەموو ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی گرتبۆوە، ئەوەش هاوکاتی لەناوبردنی نازییەت و کۆتایی هاتنی شەڕی دووەمی جیهان بوو، بەتایبەتیش ئەو گۆڕانکارییە بنەڕەتییە خێرایەی کە ئازەربایجانی دراوسێ بەخۆیەوە بینی، کاریان تێ کرد(١٢٦). هەروەها هەڵوەستی تارانیش ڕۆڵێکی گەورەی لە خێرا هاتنە پێشی قەوماوەکانی ئازەربایجان و کوردستاندا گێڕا. دوای سەرنەگرتنی سەردانەکانی قازی محەمەد بۆ تاران، کارەکان ڕێڕەوی دیکەیان گرتەبەر. لە ١٦ی ئابی ساڵی ١٩٤٥ لە مەهاباد بەیاننامەیەک بڵاوکرایەوە مۆری ٧١ کەسی بەسەرەوە بوو، هەموویان لە ئەندامانی (ژ.ک) و نوێنەری توێژە کۆمەڵایەتییە جۆراوجۆرەکان بوون، دامەزراندنی (حزبی دیموکراتی کوردستان) یان لە ئێران تێیدا ڕاگەیاند، کە درێژبوونەوەی شەرعی کۆمەڵەی (ژ.ک) بوو. حزب کۆنگرەی یەکەمی خۆی لەنێوان ٢٥ تا ٢٨ی تشرینی یەکەمی ١٩٤٥ لە مەهاباد بەست، نوێنەری هەموو لک و ڕێکخراوەکانی ئامادە بوون. کۆنگرە بەرنامە و پەیڕەوی ناوەخۆی حزبی دانا، قازی محەمەد بەسەرۆکایەتی حزب بەڕای گشتی هەڵبژێرا. بەرنامە لە چوار بەش پێک هاتبوو دابەشی سەر ٢٢ مادە(١٢٧) کرابوو کە سروشتی دیموکراسییانەی حزبیان دەنواند، ئەویش پشتی بە(هەق و داد و شارستانییەت) دەبەست (مادەی دووەم).

حزب لە بەرنامەدا دووپاتی دەکردەوە کە ئامانجی بنەڕەتی «دابینکردنی مافە نەتەوەییەکانە بۆ کوردستان لە ناو سنووری ئێران» (مادەی چوارەم) حزب «هیچ دوژمنایەتی بەرانبەر حکوومەتی ناوەندی نییە، بەڵکو داوای ئاشتی دەکات، گەلی کورد

---

(١٢٥) «کوردستان»، ژمارە دوو، شەممە ١٣ی کانوون دووەمی ١٩٤٦.

(١٢٦) بڕوانە بابەتی «هەندێ ڕاستی دەربارەی خەباتی ڕزگاریخوازی ئازەربایجان لە ئێران».

(١٢٧) بڕوانە: «مەرامنامەی حزبی دیموکراتی کوردستان»، مەهاباد، چاپخانەی کوردستان، سەرماوەرز ١٣٢٤ هەتاوی.

که تا ئەو ڕۆژە دووچاری ماڵوێرانی ئیمپریالیزمی نگریس ببۆوە... داوای مافی خۆی لە خودموختاری دەکات» (مادەی شەشەم). مادەی پێنجەمی بەرنامە دەڵێت، پێویستە خەبات لەپێناو دیموکراتی و ئاشتی بکەین. حزب لە بەرنامەکەیدا بۆ یەکەمین جار لە کوردستانی ئێران، بایەخ بەهەندێ کێشەی کۆمەڵایەتی دەدا. مادەی دەیەمی بەرنامە دەڵێت، هەوڵ بدرێت لەپێناو فراوانکردنی بەکارهێنانی هۆیەکانی نوێی بەرهەمهێنان و مسۆگەرکردنی ساغکردنەوەی بەرهەمی جووتیار، پێشخستنی لادێ، سنوور بۆ کۆچکردنی جووتیاران دابنرێت. مادەی دوازدەی بەرنامە دەڵێت، حزب بەرگری «لە ژیانی چەوساوەکان و بەرژەوەندی سیاسیی و ئابووری و تەندروستیان دەکات، بەبێ گوێدانە ڕەگەز و نەتەوە و ئایین». هەروا بەرنامە لە مادەکانی دیکەیدا داوای پێویستی فراوانکردنی بنکە پیشەسازییەکان و لێدانی بەرژەوەندییەکانی ئیمپریالیزم و دانی مافی ئافرەت و پاراستنی مافی ئازەربایجانییەکان و ئەرمەن و ئاسوورییەکان دەکات.

دامەزرانی (حزبی دیموکراتی کوردستان) خاڵی وەرچەرخان بوو لە خەباتی ڕزگاریخوازی کورد لە ئێران، کە خەریک بوو دەچووە چوارچێوەیەکی ڕێک و دیار. لە ١١ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٤٦ حزب (کوردستان)ی وەک ئۆرگانی خۆی دەرکرد کە ڕۆژەک نا ڕۆژەک دەردەچوو بەرلەوە بەمانگێک گۆڤارێکی تیۆری بەهەمان ناوەوە دەرکرد. هەروەها حزب لە بۆکان گۆڤاری (هەڵاڵە)ی دەرکرد، یەکیەتی لاوانی دیموکراتی کوردستانیش گۆڤاری (هاواری نیشتمان)ی دەرکرد. لەسەر باسی ئەو بابەتانەی کە ڕۆژنامەکانی حزب دەیاننووسی بیرێکی ڕوونمان لە ئامانجە نوێکانی خەباتی ڕزگاریخوازی کورد لە ئێران، پاش شەڕی دووەمی جیهان بۆ دەردەکەوێت. (کوردستان) و گۆڤارەکانی (هەڵاڵە) و (هاواری نیشتمان) و ئەوانی دیکە وتاریان بەو سەرباسانە بلاودەکردەوە: (دیموکراتی چییە)، (سۆشیالیزم چییە)، (سۆشیالیزمی زانستی)، (لە پێناوی نان)، (یەکگرتن)، (گڕی ئازادی)، (کورد بۆچی ڕاپەڕی)، (زمان و ئەدەبی کورد)، (ئیبنی خەلەکان)، (لە یادی تۆلستۆی) و زۆر بابەتی دی.

لە دوادواییەکانی ساڵی ١٩٤٥ خەباتی ڕزگاریخوازی ئازەربایجان و کورد پێی نایە هەوارێکی ناسک. لە دوازدەی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٤٥ جەعفەر پێشەوەری لە تەورێز دامەزراندنی (کۆماری دیموکراتی خودموختاری ئازەربایجان)ی ڕاگەیاند. لە ٢٢ی کانوونی دووەمی ١٩٤٦ قازی محەمەدیش لە کۆبوونەوەیەکی جەماوەری لە مەهاباد، دامەزراندنی (کۆماری دیموکراتی خودموختاری کوردستان)ی ڕاگەیاند، کە لە مێژوودا

بەناوی (کۆماری مەهاباد)(١٢٨) ناسراوە. قازی محەمەد زۆر جار دووپاتی دەکردەوە کە بزووتنەوەکەی مەبەستی جیابوونەوە نییە، بەڵکو ئامانجی کۆتایی هێنانە بەزوڵم و ستەمی سیاسەتی شۆڤینیانەی تاران بەرامبەر بەگەلی کورد و دابینکردنی خودموختاری بۆی.

حکوومەتی شا پەنای بردە بەر کردەوەی جۆراوجۆر بۆ لەناوبردنی بزووتنەوەی کورد لەو قۆناغە نوێیەیدا. پێش هەموو شتێک (قوام السلطنة)ی سەرەک وەزیران ویستی تۆی ناکۆکی لەنێوان ئازەری و کورد بەشێوەیەکی فێڵبازانە بوەشێنێ. پیاوەکانی هەوڵی کڕینی هەندێ خۆفرۆش و دەست ڕۆیشتووی ناسراوی ناوچەکەیان دا.

کاتێ قازی محەمەد تێگەیشت کەوا تاران بەنیازە هێزەکانی بەبیانووی سەرپەرشتیکردنی هەڵبژاردنی داهاتوو، بنێرێتە ئازەربایجان و کوردستان، لە سەرەتای کانوونی یەکەمی ١٩٤٦ کۆبوونەوەیەکی بۆ سەرکردەکانی بزووتنەوە بەست، تێیدا بڕیاردرا نەهێڵن ئەو هێزانە بێنە ناوچەی کوردەواری. هەندێ کاری بەپەلەیان بۆ پتەوکردنی شوێنی شۆڕشگێڕان لە سەقز و بانە و سەردەشت کرد(١٢٩). قازی محەمەد تەورێزیشی لەو بڕیارە ئاگادار کردەوە، ئەوەش وەک جێبەجێکردنی بەندەکانی ئەو ڕێککەوتننامەی لە ٢٣ی نیسانی ساڵی ١٩٤٦ لە نێوانیان مۆرکرابوو. بەڵام خیانەتی هەندێ سەرکردەی ئازەربایجانی وەک جاوید و شبوستری و محەمەد بێ ڕیا کە پێوەندییان بەتارانەوە هەبوو، وای کرد نەخشەکە سەر نەگرێت، ئەوان حکوومەتی (قوام السلطنة)یان بەدرێژی لە نیازەکانی مەهاباد ئاگادار کردەوە، هەروەها لە ڕادیۆی تەورێز بەیاننامەیەکی یەک لایەنەیان پەخش کرد، تیادا بەناو حکوومەتی ئازەربایجان بڕیاری ڕێگەدانی هێزەکانی ئێرانیان بۆ هەر لایەک دەیانەوێت، بچن، ڕاگەیاند. قاز محەمەدیش بەبروسکە ناڕەزایی خۆی لە ١١ی کانوونی یەکەم، واتە تەنیا ڕۆژێک دوای بڵاوکردنەوەی بەیاننامەکە(١٣٠) دژی ئەو بڕیارە دەربڕی.

---

(١٢٨) زۆر کەس لەسەریان نووسیوە، بۆ درێژەی بڕوانە:
W. Eagleton, The Kurdish Republic of 1946, London, New York Toronto, 1963, 142. PP.

(١٢٩) ئەو دانراوانەی کە باسی بزووتنەوەی کورد لە ئێران دەکەن، دەڵێن گوایە قازی محەمەد لە سەرەتاوە نەیدەویست بەرەنگاری هێزەکانی ئێران بێتەوە، ڕاست ناکەن.

(١٣٠) دکتۆر ڕەحیمی قازی، قازی محەمەد، دەسنووس، ل ٢٠٤ - ٢٠٧.

بەپشتگیری تەواوی واشنتۆن و لەندەن هێزەکانی ئێران لە چوار قۆڵەوە ڕوویان لە ئازەربایجان و و کوردستان کرد. هێزێکی پێنج هەزار کەسی ڕووی لە قەزوین و زەنجان کرد، هێزی دووەم کە لە پێنج هەزار کەس پێک هاتبوو، ڕووی لە تیکانتەپە هەوشار کرد، هێزی سێیەمیش لە دوو هەزار کەس پێک هاتبوو، ڕووی لە ڕەشت و پەهلەوەی کرد، دوا هێزیش کە دەوروبەری چواردە هەزار زەلام دەبوون ڕووی لە سەقز و بانە کرد. نیوەی زیاتری ئەو هێزانە بەپاڵپشتی (١٠٤) تۆپ و (٥٥) تانک و ژمارەیەک فڕۆکە(١٣١) ڕوویان لە ناوچە کوردەوارییەکان کرد. هێزەکانی ئێران تاوانی کوشندەیان دەرهەق بەئازەربایجانی و کوردەکان کرد(١٣٢). هەروەک لە هەندێ سەرچاوەی ئاگاداردا هاتووە ژمارەی ئەو دیموکراتیانەی لەو ڕۆژە ناهەموارانە تیاچوون لە ١٥ هەزار کەسی تێپەڕاند(١٣٣). ژمارەیەکی زۆرتریش گیران. پاش دادگاییەکی نهێنی و ڕواڵەتی بەرەبەیانی ٣٠ی مارتی ١٩٤٧ فەرمانی لە سێدارەدانیان بەسەر قازی محەمەد و سەدری قازی برای و ئەندامی پەرلەمانی ئێران و سەیفی قازی ئامۆزای درا. بەپێی ئەو زانیارییانەی لە گۆڤاری (ڕۆژگاری نوێ)(١٣٤)دا هاتووە، بەکرێگیراوانی واشنتۆن و لەندەن بێ هوودە هەوڵیان دا قازی محەمەد بۆ لای خۆیان ڕاکێشن، هەر لەبەر هەندێ سێ مانگ زیاتر فەرمانی جێبەجێکردنی لە سێدارەدانی خۆی و براکانی دواخرا(١٣٥).

قازی محەمەد جوامێرانە ڕووبەڕووی مردن بۆوە. پاش چەند ساڵان سەرهەنگ ئەمیر پەروێز کە ئامادەی جێبەجێکردنی خنکاندنەکەی ببوو، دەنووسێت وادەڵێت، قازی محەمەد نەیهێشت چاوی ببەستنەوە، لە دوا قسەکانی جەختی لەسەر پێویستی بەردەوامی خەبات دەکردەوە، داوای لە براکانی کرد، کە (بڕوا بەحکوومەتی ئێران نەکەن)(١٣٦).

دوای لەناوبردنی مەهاباد سەردەمی کپی لە خەباتی ڕزگاریخوازی کورد لە ئێران دەستی پێ کرد، ئەویش هەروەک خەباتی ڕزگاریخوازی ئازەربایجان. لە هەمان کاتدا و لە سەردەمی محەمەد ڕەزاشای دووەم شا و دواشای پەهلەوی، هیچ ئاڵوگۆڕێک بەسەر

---

(١٣١) هەمان سەرچاوە، ل ٢٠٧.

(١٣٢) دیسان بڕوانە: «هەندێ ڕاستی دەربارەی خەباتی ڕزگاریخوازی ئازەربایجان لە ئێران».

(١٣٣) الدکتور عبدالرحمن قاسملو، کردستان والاکراد، ص ٧٢.

(134) "Novaya Vermia", Moscow, April 15, 1947.

(١٣٥) هێزەکانی ئێران لە ڕۆژی ١٧ی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٤٦ چوونە ناو شاری مەهاباد.

(١٣٦) (ئازادی)، ٨ی نیسان ١٩٦٠.

سیاسەتی دەوڵەت بەرامبەر بەگەلانی نافارس دانەهات. هەرچەندە داهاتی نەوت زیادی کرد، بەڵام ناوچەی کوردەواری هەر بەهەژاری مایەوە، دووچاری بارێکی ڕووناکبیری و تەندروستی و کۆمەڵایەتی ناهەموار ببوو.

لە ساڵی ١٩٦٦ ڕادەی نەخوێندەواری لەنێو دانیشتووانی لادێی کرماشان گەیشتە ٨٨,٢٪، لە سنە ٩٢,٩٪ لە سەقز ٩٣,١٪ و لە مەهاباد ٩٤٪. هەر لەو ساڵەدا ناوچەی کوردەواری وا لە ئێران هەبوو ژمارەی دانیشتووانیان لە بیست هەزار کەس پتربوو بەبێ ئەوەی یەک پزیشکی لێ بێت، لە کاتێکدا وەک ڕێژە هەر ٤٨٠٠ کەس لە دانیشتووانی ئێران پزیشکێکی بەردەکەوت. بەپێی ئاماری ڕەسمی ساڵی ١٩٦٦ زیاتر لە ٥٠٪ی خێزانە کوردەکانی ئێران، کە ژمارەی ئەندامانی هەر یەکێکیان ٥-٦ دەبوو، لە ژوورێکدا دەژیان، لە بارێکدا کە زۆر جیاوازی لە دۆخی ئەو خێزانە کوردە ئێرانییانە نەبوو کە گەڕیدەی فەرەنسی (هنری بندور) لە ساڵی ١٨٨٧ وەسفیان دەکات. لێکۆڵینەوەی سادەی ئەو زانیارییانەی ئاماری ڕەسمی لە کۆتایی سەردەمی پەهلەوی بەڕوونی بۆمان دەردەخات کەوا کەم شوێن هەیە لە ئێران لە پاشکەوتن بگاتە کوردستان(١٣٧).

هەر ئەو واقیعە بەتەنیا بەسە بۆ ئەوەی پاڵ بەگەلی کوردەوە بنێ لە ئێران تاوەکو بداتە پاڵ سەنگەری دژ بەتاران، بۆ ئەوەی خەباتی (کورد) بەردەوام بێ کە دوای سەرنەکەوتنی مەهاباد لە شێوەی جۆراوجۆر خۆی نواند و هەندێکیان نوێش بوون، ئەوا دیموکراتییەکان دوای ئەوەی ڕیزەکانیان لە هەندێ ناوچەدا ڕێک خستەوە تێهەڵچوونەوە. بەڵام کاربەدەستانی ڕژێم هەوڵی کوشتنی شایان لە ڕۆژی ٤ی شوباتی ١٩٤٩ لە زانکۆی تاران بەهەل زانی بۆ ئەوەی زەبرێکی بەهێز بخێوێننە سەرجەم بزووتنەوەی نیشتمانی لە ئێران. لە کوردستاندا ژمارەیەکی زۆری دیموکراتییەکان گیران و فەرمانی گرتنی لە گۆترەیان بۆ ماوەی جۆراوجۆر بەسەرداداندن. بەڵام خێرا زۆر بەرپوچێ (منطقی) وەڵام درانەوە. ئەوە بوو لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٩٥٢ پاڵێوراوی حزبی دیموکراتی کوردستان لە مەهاباد و ناوچەکانی دەوروبەری، ڕێژەی نێوان ٨٠٪ و ٩٩٪ی دەنگی دەنگدەرانی وەدەستهێنا، بەڵام تاران هەڵبژاردنەکەی هەڵوەشاندەوە، یەکێکی دیکەی لە جێگەی ئەو دانا. هەر لەو

---

(١٣٧) بۆ درێژەی بڕوانە:
A. R. Ghassemlou, Iranian Kurdistan, PP. 9 - 11 "Sovrimenay Iran", PP. 378 - 403.

ساڵەدا جووتیارانی ناوچەیەکی فراوانی نێوان بۆکان و مەهاباد ڕاپەڕین، هێزەکانی ئێران بەدڕندەترین شێواز سەرکوتیکردن. کاتێ بزووتنەوەی موسەدیق دەستی پێ کرد کوردەکانی ئێران زۆر بەگەرمی پشتگیرییان لێ کرد. لەو ڕا وەرگرتنەی ڕۆژی ٣ی ئابی ١٩٥٣ دەربارەی ئەو پێشنیارەی پێوەندی بەدیارکردنی دەسەڵاتەکانی شاوە هەبوو، بەڕێوەچوو، زۆربەی زۆری دەنگدەرەکان لە کوردستان بەقازانجی پێشنیارەکە دەنگیان دا. بۆ نموونە لە شاری مەهاباد لەو پێنج هەزار کەسەی بەشداری ڕا وەرگرتنەکەیان کردبوو تەنیا دوو دەنگیان لە چاکەی شا بوون(١٣٨).

پاش بەستنی پەیمانی بەغدا ڕێڕەوی نادیموکراتیانەی حکوومەتی شا زیاتر پەرەی سەند و بووە هۆی لەدایکبوونی کاردانەوەیەکی بەهێز لەنێو نیشتمانپەروەرانی ئێران. کوردستانی ئێران یەکەم ڕاپەڕینی چەکدارانەی دژی پەیمانی ناوبراو بەخۆیەوە بینی. هۆزی جوانڕۆی دانیشتووی ناوچەی باکووری کرماشان، کە لە ساڵی ١٩٥٠ داوای خودموختارییان بۆ گەلی کورد لە ئێران کردبوو(١٣٩)، لە سەرەتای ساڵی ١٩٥٦ لە دژی تاران ڕاپەڕین و دروشمیان دژی پەیمانی بەغدا بەرزکردەوە، هەندێ هۆزی دەوروبەریش لایەنگری ڕاپەڕینەکەیان کرد. لە چواری شوباتەوە هێزەکانی ئێران هێرشێکی بەربڵاویان کردە سەر ناوچەکە، ژمارەیەکی زۆری گوندەکانیان کاول کرد. بەسەدان جوانڕۆییان کوشت و گرت و بریندار کرد، بەهەزاران منداڵ و ئافرەت و پیریان ئاوارە کرد(١٤٠)، تەنانەت سەرنجی ڕۆژنامەکانی جیهانیشی ڕاکێشا. لە ژمارەی ڕۆژی ٢٧ی شوباتی ١٩٥٦ (لۆمۆند)ی فەرەنسی باسی ڕاپەڕینی جوانڕۆی دژ بەپەیمانی بەغدا و بەکاربردنی تۆپ لەلایەن هێزەکانی ئێران بۆ سەرکوتکردنیان دەکات.

هەر لەو ماوەیەدا ڕێبازێکی نوێ لە سیاسەتی ئێران بەرانبەر کێشەی کورد سەری هەڵدا، ئەویش هەوڵدان بۆ پووچەڵکردنەوە و کەمکردنەوەی ڕەنگدانەوەی ناوخۆیی، دکتۆر عەبدولڕەحمان قاسملۆ ئەو کاردانەوەیە ئاوا دەستنیشان دەکات کە لە سەرویەندی

---

(١٣٨) بۆ درێژەی بڕوانە: A. R. Ghassemlou, Iranian Kurdistan, PP. 24-25.

(١٣٩) بڕوانە: "Moyen-Orient", Paris October-November 1950.

(١٤٠) بۆ درێژەی ڕاپەڕینەکە و سەرکوتکردنی و هەڵوەستی حکوومەتی نوری سەعید لێی بڕوانە «انتفاضة العراق الاخيرة»، بلا، ل ٢٧؛
A. R. Ghassemlou, Iranian Kurdistan, PP. 25-26. p. Vanlly, Aspects de la Question Nationale Kurde en Iran, Paris, 1959, PP. 21 - 22.

شۆڕشی چواردەی گەلاوێژی ساڵی ١٩٥٨ی عێراق بەدامەزراندنی ئێستگەی کوردی لە قاهیرە سەرەتای ئەو ڕووکارە، لەو بارەیەوە پێشەوای کوردی ئێران دەڵێت:

«حکوومەتی ئێران ترسێکی وای لێ نیشت کە وای لێ کرد هەندێ کاری وا بکات کە پێشتر نەکراون، حکوومەت گەشتێکی پروپاگەندەی لەسەرتاپای کوردستان کرد، بەدوایدا حەوت ملیۆن دۆلاری بۆ ئاوەدانکردنەوەی ناوچەکە تەرخان کرد، چالاکی پروپاگەندەی ڕەسمی توندتر بوو، حەوت شەپۆلی ئێزگەی بەزمانی کوردی تەرخان کرد»(١٤١).

سیاسەتی نوێ نەیدەتوانی کار لە واقیعی خەباتی ڕزگاریخوازی کورد لە ئێران بکات، کە هێشتا هۆ ڕەسەنە خەفەبووەکانی هەرمابوون و وەک پێشووش کاری خۆیان دەکرد و بوونە هۆی تەقینەوەی ڕاپەڕینێکی دیکە لە زستانی ساڵی ١٩٦٧. کاربەدەستانی تاران دوای تێپەڕبوونی هەژدە مانگ بەسەر هەڵگیرسانی ئینجا توانییان لەناوی ببەن. بەلەناوبردنی ڕاپەڕینەکە، کوردستانی ئێران وەک جاران لە دۆخێکی ڕاستەقینەی گوڕی شۆڕشگێڕانە دەژیا. ئا بەو جۆرە خەباتی ڕزگاریخوازی کورد ڕۆڵێکی کەمی نەگێڕا لە شلۆقکردنی بناغەی ڕژێمی پەهلەوی، هەر وەک پێشان و ئێستاش لکێکی بنەڕەتییە لە ڕێڕەوی بزووتنەوەی نیشتمانی گەلانی نافارس لە ئێراندا.

---

(١٤١) الدکتور عبدالرحمن قاسملو، کردستان والاکراد، ص ٢٤٠ - ٢٤١.

## بەشی دووەم

### هەندێ ڕاستی دەربارەی خەباتی ڕزگاریخوازی ئازەربایجانی

ئازەربایجان دەکەوێتە بەشی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئەو مەڵبەندەی بەپشتی قەفقاس ناسراوە، ئەم وڵاتانە دەوریان داوە، لە باکوور داغستان، لە باکووری ڕۆژئاوا جۆرجیا، لە باشووری ڕۆژئاوا ئەرمینیا و تورکیا، لە باشووریش کوردستان. هەروا بەشێکی بنەڕەتیش لە لێوارەکانی باشوور و ڕۆژئاوای قەزوین پێک دێنێت کە بەگەورەترین دەریای داخراوی جیهان دەژمێرێت[١٤٢].

ڕووبەری ئازەربایجان بەدەوروبەری ١٨٦ هەزار کم٢ دەخەمڵێنت، نزیکەی هەشتا و حەوت هەزار کیلۆمەتری چوارگۆشەی دەکەوێتە ناو یەکێتی سۆڤیەت[١٤٣]، ئەوی دیکەی دەکەوێتە ناو ئێران و بەشەکانی باکووری ڕۆژئاوای پێک دێنێت. ژمارەی ئازەربایجانییەکان ئێستا لە یەکیەتی سۆڤیەت لە چوار ملیۆن[١٤٤] و لە ئێرانیش لە شەش ملیۆن تێدەپەڕێت.

ئازەربایجانییەکان بەدانیشتووانی ڕەسەنی ئەو ناوچەیەی پێشان بەئەترۆپاتینا[١٤٥] و ئەلبانیای قەفقاسیا[١٤٦] دەناسرا، دەژمێردرێن. لە ماوەی مێژوویی دوور و درێژی نێوان هەزارەی یەکەمی پێش زایین و هەزارەی یەکەمی پاش زایین تێکەڵ بەگرووپە بەڕەچەڵەک ئێرانی و تورکەکان بووین. لەنێوانی هەردوو سەدەی یازدەمین و سێزدەمین زمانی ئازەری یەکگرتوو، لە ئەنجامی هاتنی شەپۆلی هۆزە تورک زمانەکان بۆ ئازەربایجان[١٤٧] دروست بوو، کە زمانەکەیان گۆکردن و پێکهاتنی لە زمانەکانی دیکەی باوی ئەوێ ئاسانتر بوو،

---

(١٤٢) درێژی لێوارەکانی دەریای قەزوین نزیکەی ٧ هەزار کم دەبێت، زیاتر لە ٦ هەزار کیلۆمەتری دەکەوێتە ناو یەکیەتی سۆڤیەت، لە هەزاریش کەمتری دەکەوێتە ناو ئێران.

(١٤٣) ئەو بەشەی ئازەربایجان یەکێک لە کۆمارەکانی یەکیەتی سۆڤیەت پێک دێنێ.

(١٤٤) ساڵی ١٩٦٥ ژمارەیان گەیشتە ٣ ملیۆن و ٦٠٠ هەزار کەس.

(١٤٥) ئەترۆپاتین - ئەترۆپاتینا (Atropatene) ناوێکی گریکی کۆنە، بەباشووری ئازەربایجانیان دەگوت، لە ئەسڵدا واتەی ئەخمینییەکان دەگەیەنێت.

(١٤٦) ئەلبانیای قەفقاسیا یەکێک لە دەوڵەتە کۆنەکانە کە لە ڕۆژهەڵاتی پشت قەفقاس دامەزرا.

(١٤٧) تایبەت شەپۆلەکانی سەلجوقی.

جۆرە کارتێکردنێکی سروشتیش لەنێوانیاندا ڕوویدا.

لەسەر ئەو بنچینەیە ئازەربایجان شوێنێکی دیاری لە ڕۆژهەڵاتی دێرین پەیدا کرد. هەروەک لە پێدەشت و دۆڵەکانیشدا شوێنەواری ژیاری ڕۆژگاری پێش زایینی تێدا هەن. لە سەرەتای سەدەی پێنجەمدا ئازەربایجانییەکان (ئەلفبای)، تایبەتی خۆیان کە لە (٥٢) پیت[١٤٨] پێک دەهات بەکاردەهێنا. هەر لەو بەینەدا ئازەربایجانی خاوەن توانای فراوان لە گەشەستاندنێکی ئابووری بەرچاو دەژیا، شاری وای لێ پەیدابوون کە بەپێی پێوانەی ئەو ڕۆژە سەنگایی ژیاری و ئابووری خۆیان هەبوو، وەک شابران و شماخا و کبالا و شمخور و شکی و بردە و گەنجە و تەورێز و هەندێکی دیکە لەو شارانەی کە بوونە مەڵبەندی گرنگی ئیسلامەتی، دوای ئەوەی ئایینی نوێ لە سەدەی حەوتەمی زایینیدا لە ئازەربایجان بڵاوبۆوە. لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆیەم و لە نیوەی یەکەمی سەدەی دەیەمدا میرنشینی نیمچە سەربەخۆ لە ئازەربایجان پەیدا بوون، وەک هەردوو میرنشینی ناسراوی سالاری و شەدادی[١٤٩] و هەندێکی دی لەو میرنشینانەی کە شارەکانی ئازەربایجان پێشکەوتنیان لەژێر سایەیاندا بەخۆوە دیت. تەنانەت ژمارەی دانیشتووانی هەندێکیان (بەوێنە تەورێز و ئەردەبیل و باکۆ) گەیشتە دەیان هەزار کەس.

هەر لە چاخە کۆنەکانەوە دەستە و تاقمی جیاجیا چاوی تەماعکارانەیان بڕیە ئازەربایجانی دەوڵەمەند. لە سەرەتای سەدەی سێیەمدا ساسانییەکان دەستیان بەسەردا گرت. لە سەدەی چوارەمدا خاکی ئازەربایجان بووە یەکێ لە شەڕگەکانی نێوان ساسانی و ڕۆمانەکان. هەر لەو کاتیشەوە ئازەربایجانییەکان دەست لە چۆکان لەبەردەم چەوسێنەرەکانیاندا، دانەنیشتن، بەڵکو گەلەجاران دژی ساسانییەکان لە ساڵانی ٤٥٠-٤٥١ و ٤٥٧ و ٤٨١-٤٨٤ و ٥٧١-٥٧٢ ڕاپەڕیون.

لە ناوەڕاستی سەدەی یازەمیندا ئازەربایجان کەوتە بەر شاڵاوی سەلجوقییەکان، پاشانیش لە چلەکانی سەدەی سێزدە وەبەر شاڵاوی مەغۆلەکان و پاشان بەبەشێک لە

---

(١٤٨) بۆ ئامادەکردنی بەشی یەکەمی ئەو باسە دانەر کەڵکی زۆری لەو چوار بەرگانەی کە ئەکادیمیای زانیاری ئازەربایجان بەناوونیشانی (مێژووی ئازەربایجان) بەزمانی ڕووسی لە ١٩٥٨-١٩٦٣ دەری کردووە بەتایبەتیش بەرگی یەکەم و دووەم (Istoria Azerbajana, Baku) وەرگرتووە.

(١٤٩) دەربارەی بڕوانە:

C. E. Bosuorth, The Islamic Dynasties-A. Chronological and Genealiogical Handbook, Edinburgh, 1967, NN. 35, 37.

دەوڵەتی مەغۆلی مایەوە تا حەفتاکانی سەدەی چواردەمین. دوایی بووە پارچەیەک لە هەردوو دەوڵەتی ناسراوی قەرەقۆینلۆ و ئاق قۆینلۆ.

دامەزراندنی دەوڵەتی سەفەوی لەسەر خاکی ئازەربایجان لە سەرەتای سەدەی شازدەمین، دەورێکی گرنگی لە مێژووی ئەو وڵاتەدا گێڕا. دامەزرێنی دەوڵەتی سەفەوی شا ئیسماعیل (١٥٠٢-١٥٢٤) دەستی بەسەر بەشی زۆری ئازەربایجاندا گرت کە بووە مەڵبەندی فەرمانڕەوایی ئەو دەوڵەتە تازەیەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست.

سەفەوییەکان لە ماوەیەکی کورتدا توانییان ئەوەی لە ئازەربایجان مابۆوە بیخەنە سەر دەوڵەتەکەیان و شاری تەورێزیشیان کردە پایتەخت و زمانی ئازەربایجانیشیان کردە زمان ڕەسمی کۆشک و سوپا و دامودەزگاکانی کارگێڕی و تەنانەت بۆ نامە گۆڕینەوەی ڕەسمیش لەگەڵ دەوڵەتە بێگانەکان. ئازەربایجانییەکان دەستیان بەسەر زۆربەی دامودەزگاکانی دەوڵەتی سەفەوی داگرت. لە ناوەڕاستی سەدەی شازدەمین لە سەرجەم میرەکانی دەوڵەت کە بەتەنیا ٧٤ میر بوون ٦٩ یان ئازەربایجانی بوون، هەروەها ڕێژەیەکی بەرزیشیان لەناو سوپای سەفەوی بەئەفسەر و سەربازەوە پێک دەهێنا. بۆیە بەڕای هەندێ لە مێژوونووسان مۆرکی نەتەوەیی دەوڵەتی سەفەوی لە هەواری بەرایی‌دا، لێوردبوونەوەی پێ دەوێ. پسپۆڕی ناسراوی لێکۆڵینەوەکانی ئێران پرۆفیسۆر م. س. ن. ئیڤانۆف لەو بارەیەوە دەڵێت: «ئەگەرچی سەردەمی سەفەوییەکان لە مێژووی ئێران، لە سنوورێکی زۆر تەسک نەبێ لێی نەکۆڵراوەتەوە، بەڵام دەکرێت بڵێین سەرەتا ئەو دەوڵەتە هەرگیز دەوڵەتێکی ئێرانی نەبوو بەمانای نەتەوایەتی»(١٥٠) بەڵام ئەم باری نەتەوەییەی دەوڵەتی سەفەوی ئاوا درێژەی نەکێشا. لە سەردەمی شا عەباسی یەکەمدا، کە بۆ ماوەی ٤٢ ساڵی (لە ١٥٨٧ تا ١٦٢٩) فەرمانڕەوای ئێرانی کرد، ئازەربایجانییەکان سەنگی پێشوویان لە دەوڵەتی سەفەوی لە دەست دا. شای تەمەعکار سەرکردە ئازەربایجانییەکانی لە سوپا و پێشەواکانیانی لە کۆشک دوورخستەوە. لە ساڵی ١٥٩٨ پایتەختی وڵاتەکەی لە قەزوین گواستەوە ئەسفەهان کە کەوتۆتە ناوەندی مەڵبەندی فارسەوە(١٥١). بەخێرایش لەو سەردەمەوە گەورە پیاوانی فارس جێی ئازەربییەکانیان گرتەوە و بەو جۆرە ئازەربایجان بووە هەرێمێکی ئاسایی لەناو ئێراندا. شان بەشانی ئەوە باری ئابووری ئازەربایجان

(150) M. S. Ivanov, Ochirk..., PP. 61 - 62.
(151) "Vsemirnaya Istoria", Vol. IV, Moscow, 1958, P. 561.

شپرزە بوو، گرفتەکانی بەهۆی ململانێی خوێناوی سەفەوی و عوسمانییەوە لەپێناو دەستگرتن بەسەر ناوچەکەدا، لە پێشەوەشیان ئازەربایجان، ئاڵۆزتر بوون. هەروەها سەفەوییەکان لە سەردەمی شا عەباسی یەکەمدا سیاسەتی نگریسی کۆچ پێکردنیان دەرهەق بەرەگەزە نافارسەکان دەست پێ کرد.

لە سۆنگەی ئەم هۆیانەوە بایەخی خەباتکردن دژی فەرمانڕەوا سەفەوییە چەوسێنەرەکان هاتەپێشەوە، دەکرێ سەرەتای ئەو خەباتە لە سەردەمی شا ئیسماعیلی سەفەوی دەستنیشان بکەین کە ساڵی ١٥٠٩ هێرشێکی توندی کردە سەر دانیشتووانی شابران و شێروان و دەربەند، گەرچی کەم تواناش بوون بەڵام بەرهەڵستیان کرد، بەتایبەتی خەڵکی دەربەند. هێزەکانی شا پێیان نەکرا دەست بەسەر شارەکەیاندا بگرن تا دوازدە کونیان لەبن دیواری قەڵاکەی نەکرد(١٥٢). لەسەردەمی شا تەهماسبی یەکەمیشدا (١٥٢٤-١٥٧٦)، کە سەرچاوەکان وەک مرۆڤێکی قرچۆک و ڕەزیل و بێزراو(١٥٣) وەسفی دەکەن،

ڕاپەڕینێکی فراوان لە شاری تەورێز و ناوچەکانی دەوروبەری تەقییەوە، زۆرانبازەکانی (المصارعون) شار ڕۆڵێکی سەرکردەیی دیاریان گێڕا. بەهاری ساڵی ١٥٧١ خەڵکی تەورێز پەنایان بردە بەر چەک و کاربەدەستە سەفەوییە گەورەکانیان شار بەدەرکردن. لە ماوەی نزیکەی دوو ساڵاندا شۆڕشگێڕان دەستیان بەسەر تەورێز و دەوروبەری داگرت، هێزەکانی شاش تا ساڵی ١٥٧٣ پێیان نەکرا وەری بگرنەوە. دوای ئەوەی شا دەستی بەسەر تەورێز و دەوروبەری دا گرتەوە پتر لە ١٦٠ نیشتمانپەروەری ئەو شارەی لە سێدارە دا و فەرمانی دا لاشەکانیان لەسەر شەقامەکان و لەبەردەم دەروازەی مزگەوتەکاندا هەڵواسرێن. بەڵام لەگەڵ ئەوەش شا ناچاربوو بۆ هێورکردنەوەیان خەڵکی تەورێز لە دانی (باجی دیوان) بیان بەخشێ(١٥٤).

لە هەشتاکان و نەوەدەکانی سەدەی شازدەمین چەند ڕاپەڕینی دیکەی وەک ڕاپەڕینی تەورێز لە شێروان و تاڵش تەقینەوە، شۆڕشگێرانی تاڵش توانییان تا نزیک ئەردەبیل ئازاد بکەن، بەڵام لەوێ لەبەردەم هێزەکانی شادا، کە بەژمارە و چەک لەوان بەهێزتر بوون، شکان. لەو ڕۆژەوە و بەدرێژایی نیوەی یەکەمی سەدەی حەڤدەمین هەر دوو ناوچەی

---

(152) “Istoria Azerbaijana” T.I, Baku, 1958, P. 26.
(153) M. S. Ivanov, Ochirk…, P. 62.
(154) “Vsemirnaya Istoria”, Vol. IV, P. 560; “Istoria Azerbaijana”, T. I, P. 250.

شێروان و تاڵش، بوونە دوو بنکەی بنەڕەتی بەرهەڵستیکردنی دەسەلاتی سەفەوی. ئەو دوو مەڵبەندە و ناوچەکانی دەوروبەریان، زنجیرەیەک ڕاپەڕینیان لە ساڵانی ١٦١٤ و ١٦١٥ و ١٦٢٩ و ساڵانی دیکەدا بەخۆوە بینی. تەنانەت شا عەباسی یەکەم ناچار بوو بەخۆی بەسەرۆکایەتی هێزێکی گەورە بچێتە ئازەربایجان بۆ دامرکاندنەوەی بزووتنەوە نەیارە یەک لەدوا یەکەکان. هەموو جارێکیش هێزەکانی ئێران پەنایان دەبردە بەر سەختترین شێوازی سەرکوتکردن لە دژی دانیشتووانی ناوچەکە. کاتێک ساڵی ١٦٢٩ پتر لە ٣٠ هەزار جووتیاری تاڵشی دژی دەرەبەگە فارسەکان ڕاپەڕین، هێزێکی گەورەی میری بۆ لەناوبردنی ڕاپەڕینەکەیان زیاتر لە حەفت هەزار تاڵشی کوشت[١٥٥]. لە ساڵی ١٦٧١ و بەدرێژایی چەندین ساڵ، قەرەباغی دراوسێی خەباتێکی چەکدارانەی دژی شا و خائینەکانی ناوخۆی لایەنگرانی بەخۆوەبینی. بەدانپیانانی پسپۆڕەکان ڕاپەڕینە یەک لەدوا یەکەکانی ئازەربایجانییەکان دەورێکی دیاریان لە لاوازکردن و ڕووخاندنی دەوڵەتی سەفەوی گێڕا و کردییە نێچیرێکی ئاسان لەبەردەم ئەفغانییەکاندا و توانییان ساڵی ١٧٢٢ لەناویبەرن.

نە لە ساڵانی کەس بەکەس و پشێوی ئەفغان و، نە لە سەردەمی نادر شای ئەفشاری بەدەسەلات (١٧٣٦-١٧٤٧) هیچ گۆڕانێک بەسەر دۆخی ئازەربایجانییەکاندا نەهات، بەڵکو بەپێچەوانەوە، کاروبار لە ئازەربایجان تا ئەندازەیەکی ڕوون لە ڕۆژگاری فەرمانڕەوایی ئەفشارییەکان لە ئێران شپرزەتر بوو. بەقسەی ئەوانەی بەچاوی خۆیان بینویانە فرۆشگاکان بەبێ کەلوپەل مابوونەوە، ڕەزا قولی خانی کوڕی نادر شاش پارەیەکی یەکجار زۆری لە خەڵکەکە خڕ کردەوە، خۆی لە ملیۆنێک و نیو قرانی زیو دەدا[١٥٦]، کە تەنانەت بەلای باوکیشیەوە، کە بەزەیی بەکەسدا نەدەهاتەوە، کارێکی زۆر سەیر بوو. فشاری باجدان بەسەر خەڵکەکەوە بەهۆی جەنگە یەک لەدوا یەکەکانی شای ئەفشارییەوە بووە هۆی سەرهەڵدانی تەنگ و چەڵەمەیەکی ئابووری سەخت لە ناوچەکەدا. بەپێی بەڵگەنامەیەکی ئەو سەردەمە نرخی پێداویستییەکانی ژیان بەشێوەیەکی خەیاڵی لە ئازەربایجان بەرز بۆتەوە. لە ساڵی ١٧٣٧ برسییەتی بووە هۆی بڵاوبوونەوەی نەخۆشی گرانەتا لە زۆربەی ناوچەکانی ئازەربایجان. سەرەڕای ئەمانەش ئەفشارییەکان سیاسەتی

---

(155) “Istoria Azerbaijana”, T. I. PP. 250, 275 - 276.

(١٥٦) پارەیەکی زیوە، کێشی لەنێوان (٤,٥-٥) گرام بوو.

کۆچ پێکردنیان دەرهەق بەئازەربایجانییەکان ئەنجام دا، بەدەیان هەزارانیان لێ ڕاگوێزتن بۆ ناوچە جیاجیاکانی ئێران. بۆیە مێژوونووسان، چلەکانی سەدەی هەژدەمین بەدژوارترین سەردەمی مێژووی ئازەربایجان دادەنێن(۱۵۷).

بەحوکمی هەموو ئەو شتانە زۆر سروشتی بوو کە خەباتی ئازەربایجانییەکان دوای نەمانی سەفەوییەکان شەقڵێکی فراوانتر لە پێشوو بگرێتەبەر، بەبێ گوێدانە زەبر و زەنگ و دڵڕەقی بێ ئەندازەی نادر شا(۱۵۸). ڕەنگە ئەوەندە بەس بێ لەو بارەیەوە پەنجە بۆ ئەوە ڕابکێشین کە هەر چەند نادر شا خەریکی شەڕ و شۆڕ و پەلامارەکانی بوو، کە گەیاندنییە ناو جەرگەی هیند، بەڵام ناچاربوو بەخۆی ڕابەری چوار هێرش بکات بۆ سەرکوتکردنی ڕاپەڕینەکانی خەڵکی ئازەربایجان، بێ ئەوەی ئەنجامێکی دیار بەدەست بێنێ(۱۵۹). محەمەد کازمی مێژوونووسی تایبەتی نادر شا، پەنجە بۆ تینی بزووتنەوەی شۆڕشگێڕی ئازەربایجان ڕادەکێشێت لە سەردەمی ئەفشاریدا، کە هەندێ لە ڕاپۆرتە دیپلۆماسییە تایبەتییەکانیش دووپاتی دەکەنەوە(۱٦۰).

گرنگترین ئەو ڕاپەڕینانەی لە ڕۆژگاری فەرمانڕەوایی نادر شا لە ئازەربایجان تەقینەوە ڕاپەڕینی ئاستەر بوو حوزەیرانی ۱۷۳٤، ساڵی داهاتووش ڕاپەڕینێکی دیکەی بەهێز لە ناوچەکانی دەوروبەری بەدواداهات. نادر شا خۆی ڕابەری دوو هێرشی گەورەی کرد و نەیتوانی بەسەریاندا زاڵ بێت. ساڵی ۱۷۳۸ دانیشتووانی قەرەباغ و شەکی و شێروان و شوێنەکانی دیکەی ڕاپەڕین. نادر شا هێزیکی گەورەی بەسەرۆکایەتی ئیبراهیم خانی برای لە دژیان نارد، کە لەو شەڕە گەورەیەی لەنێوان هەردوو لا، لە ڕۆژی ۲٦ی تشرینی یەکەمی هەمان ساڵ قەوما، کوژرا. لەبەر ئەوەی نادر شا هەمیشەکە خەریکی هێرش بردنە سەر هیند بوو، نەیتوانی هێزی دیکە بۆ سەرکوتکردنی شۆڕشگێڕانی ئازەربایجان تەرخان بکات، هەتا شوباتی ۱۷٤۱ سوپایەکی زۆر گەورەی پێک هاتوو لە ۱۰۰ هەزار زەلام ئاژوا بەئامانجی لەناوبردنی هەموو بنکەیەکی بەرهەڵستکاران لە ئازەربایجان و داغستان. بەڵام لەگەڵ ئەوەش دوو ساڵی نەبرد کاتێک خەڵکی شێروان و ئەردەبیل و ناوچەکانی

---

(157)"Istoria Azerbaijana", T. I, PP. 321 - 343.

(۱۵۸).زۆربەی ئەو گەلانەی نێوان قەفقاس و دیجلە و سەند دووچاری دڵڕەقی و ئازار و ئەشکەنجەی نادر شا بوونەوە.

(159) "Istoria Azerbaijana", T. I., P. 332.

(160) Vesmirnaya Istoria", Vol. IV, PP. 245 - 246.

دی، یاخیبوونی خۆیان دژی نادر شا ڕاگەیاند، شۆڕشگێڕان هێزەکانی شایان بەزاند و حەیدەرخانی سەرکردەشیان کوشت. لەبەر ئەوەی ئەو ناوچەیەی نێوان ئاق سو و دەربەند کەوتە دەست شۆڕشگێڕان، شا سوپایەکی گەورەتری نارد بۆ لەناویردنی بزووتنەوەکەیان. بەفەرمانی نادر شا سەربازەکان پەنایان بردە بەر شێوازی یەکجار دڕندانە لە دژی ئازەربایجانییەکان. بەتەنیا لە دەربەند کێشی ئەو چاوانەی دەرهێنران گەیییە ١٤ مەن (نزیکەی ٤٠ کیلۆگرام)، هەروا ئەوانەی لە شێروان کوژران خۆی دەدا لە ١٥ هەزار کەس، لەگەڵ ئەوەش بەرگری ئازەربایجان بەردەوام بوو، نادر شا بەر لەوەی بکوژرێت، ناچار بوو بەخۆی سەرکردایەتی هێرشی چوارەم و دواهێرش دژی خەڵکەکەی بکات بێ ئەوەی دوا ئامانجی بەدەست بێنێت(١٦١).

دوای کوژرانی نادر شا بەپیلانێک شەوی ٩ی شوباتی ساڵی ١٧٤٧، سەر لە نوێ لاوازی کەوتەوە ناو پایگاکانی دەوڵەتی ئێران. دەسەلاتی ناوەندی وەک نەبووی لێهات. لە ئازەربایجان ژمارەیەکی زۆر میرنشین (خانەنشین)ی نیمچە سەربەخۆی وەک قەرەباغ و شەکی و شێروان و گەنجە و باکۆ و کوبا و دەربەند و تەورێز و ئەردەبیل و مەراغە و قەرەداغ و زۆر میرنشینی دی پەیدابوون، کە بەکردەوە ملیان بۆ شای ئێران نەدا، بەتەنیا لە سەردەمی کەریم خانی زەند نەبێت کە لە ساڵی ١٧٥٠ وە تا کۆچی دوایی لە ساڵی ١٧٧٩دا بووە تاکە فەرمانڕەوای ئێران. بەلام لە ڕۆژگاری قاجارییەکاندا دیسان کار لە کار ترازاوە. ئاغا محەمەد خانی دامەزرێنەری دەوڵەتی قاجاری ساڵی ١٧٨١ هێرشی کردە سەر ئازەربایجان و توانی دەسەلاتی خۆی بەسەر ژمارەیەک لە خانەنشینەکانی ئازەربایجانی باشووردا بسەپێنێ، بەدوو ساڵی تریش ئەستەرئاوا و مازەندەران و گەیلانیشی داگیر کرد(١٦٢).

دوای ئەوەی ئاغا محەمەد خانی قاجاری توانی دەسەلاتی خۆی بەسەر باشووری ئازەربایجاندا بسەپێنێت، نۆرە هاتە سەر ناوچەکانی باکوور و یەک لە دوای یەک دەستی بەسەرداگرتن، کە خراپ بەسەر هەردوو لایاندا شکایەوە، لەبەر ئەوەی ئیبراهیم خانی

(161) Ibid, Vol, V, PP. 246 - 247; "Istoria Azerbaijana"., T. I. PP. 324 - 329, 332.

(١٦٢) ئاغا محەمەد خانی قاجاری تا کۆتایی ساڵی ١٧٩٤ توانی دەسەلاتی خۆی بەسەر گشت مەڵبەندەکانی ئێران بسەپێنێت.

میری قەرەباغ قایل نەبوو کورەکەی بەبارمتە بنێرتە تاران، بۆیە ئاغا محەمەدخان هێزێکی (٨) هەزار کەسی نارد بۆ لەناوبردنی میرنشینەکەی. قەرەباغییەکان بەهاریکاری جۆرجییەکانی(*) دراوسێیان هێزەکەی ئێرانیان لە شەڕێکدا کە لە نزیک قەڵای عەسکەران قەوما شکاند. هاوینی ساڵی ١٧٨٥ سوپایەکی گەورەی قاجاری(١٦٣) ڕووی کردە قەرەباغ، گەمارۆ قەڵای شووشی دا کە ژمارەی بەرگریکەرانی گەیشتبووە ١٥ هەزار کەس. پاش بۆردوومانێکی سێ ڕۆژە بەتۆپ، گەمارۆی ٣٣ ڕۆژەی شووش سەری نەگرت. داگیرکەران هەموو شێوەیەکی دزی و تاڵان و دڵڕەقییان لەگەڵ دانیشتووانی ناوچە بێوەییەکانی بەکارهێنا(١٦٤).

لە ڕۆژگاری قاجارییەکاندا، چارەنووسی ئازەربایجان بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ بەشەڕەکانی ئێران و رووسیا و ئاکامەکانییەوە بەندبوو(١٦٥). ئەو ڕۆژانە بێزاری ئازەربایجان بەوێنەی جۆراوجۆر خۆی دەنواند، لە هەمووشیان گرنگتر هاوکاریکردنی ژمارەیەکی زۆری ڕۆڵەکانی ئازەربایجان بوو لەگەڵ ڕووسەکان لە دژی ئێرانییەکان لە هەڵوەست و شوێنە حاستەمەکان، کە بەدرێژی ڕواڵەتەکانیمان لە بابەتێکی پێشتردا نیشان دا.(**)

وا ئەو ڕاستیانەی خوارەوەش دەخەینە سەر ئەوەی لەوێدا باسکراوە، کە لێرەدا مەغزای خۆی هەیە، کە ئێمە لێرە دەمانەوێ لایەکانی ڕوون بکەینەوە. لەنێوان ساڵانی ١٧٩٧ و ١٧٩٩ زۆر نێراو لە هەردوو میرنشینی قەرەباغ و کوبا سەردانی ڕووسیایان کرد بۆ ئەوەی داوای پارێزگاری (الحماية) بکەن. لە سەرەتای شەڕی ١٨٠٤-١٨١٣ی نێوان ڕووسیا و ئێران، ئیبراهیم خەلیل خانی میری قەرەباغ داوای یارمەتی لە ڕووسەکان کرد بۆ بەربەرچدانەوەی ئێرانییەکان. کە مەترسی ئێران زیاتر لە لە میرنشینەکەی نزیک بۆوە لە ١٤ی ئەیاری ١٨٠٥ ڕێککەوتننامەیەکی لەگەڵ سەرکردەی ئەو هێزە ڕووسیانەی لەودیو قەفقاس کاریان دەکرد مۆر کرد. بەپێی بەندەکانی میرنشینەکەی خستە ژێر پارێزگاری

---

(*) ناویان بەگورجیش دێت. وەرگێڕ.

(١٦٣) سوپای ئاغا محەمەد بەپێی هەندێ سەرچاوە لە ٨٥ هەزار زەلام پێکهاتبوو.

(164) “Istoria Azerbaijana”., T. I. PP. 334 - 343, 372 - 376.

(١٦٥) بۆ درێژەی دەربارەیان بڕوانە بابەتی «من تاريخ الحروب الايرانية الروسية. صفحة من العلاقات الدولية في الشرق الاوسط قبل ظهور الامبريالية» لە ئەسڵی کتێبەکە بەعارەبی.

(**) بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو. وەرگێڕ.

ڕووسیا. هەر ئەوێ دەمێ خانشینی شەکی دراوسێیشی هەمان هەنگاوی هەڵێنا[١٦٦].

کار هەر بەو نزیکبوونەوە بەرچاوەی نێوان لایەنە ئازەربایجانە موسوڵمانەکان و ڕووسیای عیساییەوە نەوەستا، بەڵکو لەوەش تێپەڕی و کار گەیشتە ئەوەی سەرلەنوێ ئازەربایجانییەکان تاو بدەنەوە چەک لە دژی ئێرانییە چەوسێنەرەکان. جێی خۆیەتی لێرە پەنجە، لەو بارەیەوە، بۆ ئەوە ڕابکێشین کە مێژوونووسی کۆشکی قاجاری میرزا فەیزوڵلا دان بەو بەرگرییە خۆڕاگرییەی خەڵکی ئازەربایجان لەبەردەم هێزەکانی ئێران بنێت، لە شەڕی ساڵانی ١٨٠٤-١٨١٣دا، ئەو ڕاستییەی کە بەڵگەنامە تایبەتییەکانی ڕووسیاش ئاماژەیان بۆ کردووە لە کاتی شەڕی ١٨٢٦-١٨٢٨، ئازەربایجانییەکان دەستەی تایبەتییان بۆ لێدانی سوپای ئێران دروست کرد. کاتێ عەباس میرزای جێنشین (ولی العهد) ناچار بوو لە پایتەختی تەورێز بکشێتەوە، خەڵکی شار ئەو سەربازانەیان چەک کردن کە بەجێ مابوون، پاشان پێشوازی سوپای ڕووسییان کرد کە لە دوا ڕۆژەکانی شەڕەکە هاتنە ناو تەورێز[١٦٧].

لە سۆنگەی شەڕەکانی ١٨٠٤-١٨١٣ و ١٨٢٦-١٨٢٨ وە ئازەربایجان بۆ نزیکەی دوو بەشی یەکسان کەرت بوو، بەشێکیان لەناو ئێراندا مایەوە و هەر لەو وەختەوە بەئازەربایجانی ئێران ناسراو، کەوتە بەر سیاسەتی شۆڤینیانەی فەرمانڕەوایانی ئێران. ئەو واقیعە بووە بزوێنی بنەڕەتی خەباتی ڕزگاریخوازی ئازەربایجان، خستیە سەر ئەو بارەی کە شوێنێکی دیار لە مێژووی ئێرانی نوێ و هاوچەرخ داگیر بکات. ئەو وڵاتە قەوماوێکی سیاسی گەورەی بەخۆیەوە نەدیتووە ئەگەر ئازەربایجانییەکان دەورێکی گەورەیان تێدا نەبووبێت[١٦٨].

کۆمەڵێک هۆی کارلێککەری نێوان خۆیان لە دەیەکانی دوایی سەدەی نۆزدەمین، وایان لە ئازەربایجانییەکان کرد ببنە نوکی ڕم لە بزووتنەوەی نیشتمانیی ناو ئێران. سیاسەتی فەرمانڕەوا شۆڤینییەکانی ئێران دەرهەق بەئازەربایجانییەکان پەلی بۆ هەموو لایەنی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی هاویشت، چەوساندنەوەیان پتر پەرەی سەند، باری

(166) "Istoria Azerbaijana"., T. I. PP. 381; T. II. Baku, 1960, PP. 6 - 7.
(167) Ibid, T. II., PP. 8 - 9, 37, 42.
(١٦٨) لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەمیندا، جۆرە کپییەک لە خەباتی چەکدارانەی ئازەربایجانییەکان و ڕۆڵەکانی دیکەی گەلانی ئێران دەبینرێت.

ئابووریـیـان خراپتر بوو، دەیان هەزاریان ناچاربوون سنووری دەوڵەتی ڕووسیا ببڕن بەدوای کـار لە نەوتەڵانەکـانی باکـۆ و شـوێنەکـانی دی. لە کـۆتایی سـەدەی نـۆزدەمین و سـەرەتای سـەدەی بیـسـتـەمین سـاڵانە لانی کـەم ۲۰۰ هەزار ئێـرانی سنووریـان دەبڕی، کـە زۆربەیان ئازەربایجانی بوون. تەنیا ژمارەی ئەوانەی لە شاری تەورێزەوە بەشێوەیەکی ڕەسمی(۱٦۹) لە سـاڵی ۱۸۹۱ چوونە ڕووسـیا گـەیشـتـە ۲٦۸۵۵ کـەس، ئەو ژمارە لە سـاڵی ۱۹۰۳ بۆتە ۳۲۸٦٦ کـەس. بەتـەنیـا لە سـاڵی ۱۹۰٤ لە تەورێز و ورمێ ٦۲۲٦۷ کـەس بەشێوەیەکی ڕەسمی گەیشتنە ڕووسیا. هەر لەو دەمەدا ساڵانە دەوروبەری (۳۰) هەزار کەس بەتەنیا لە ولایەتی ئەردەبیل دەچوونە ڕووسیا(۱۷۰). ئەوانە لە نزیکەوە ڕۆڵەکانی بەشی باکووری نیشتمانەکەیان دەدیت، کە کەوتبووە بن دەسەڵاتی دەوڵەتێکی ئەورووپایی و خـەریک بوو ڕێگەیەکی باشی پێـشکەوتنی دەبڕی، کـە نەدەکـرا لەگـەڵ ئازەربایجـانی باشـووری پاشکەوتووی سـەدە ناوەنجـییـەکـان دەینـاڵاند، بەراورد بکرێت. ئازەربایجـانی باکوور خەریک بوو ڕواڵەتی ئابووری و ژیاری و ڕووناکبیری و فیکری هەمە جۆری نوێی لێ بەدەردەکەوتن، تایبەت لەناو شاری باکۆدا(۱۷۱)، کە دامودەزگا سەرمایەدارییەکان لەبەر سامانی نەوت ڕێچکەیان بۆی بەستبوو و ڕووسەکان دەستیان بەدەرهێنانی کردبوو. هەر لە سەرەتای سەدەی بیستەمەوە ژمارەی کرێکارانی ئەو بەشەی ئازەربایجان خۆی دەدا لە دەوروبەری (٦۰) هەزار کـەس. مـاوەیەک بەر لە تـەواوبوونـی سـەدەی نۆزدەمین، لە ئازەربایـجانی باکـوور دەسـتـەیەک ڕووناکـبـیـری وشـیـار پەیدابوون کـە ڕاسـتـەوخـۆ بیـری ئەورووپایی کـاری تێ کـردبوون و خـاوەن ئەدەبیـات و ڕۆژنامـەی تایبـەتی خۆیان بوون. لە شـەقـامـەکـانی باکـۆش سـاخـتـمـانی نوێ و بانـک و خـانـووی ئۆپرا و شـتـی دیکەش بەرزبوونەوە. شتێکی سروشتی بوو کە ئەو دیاردانە جێپەنجەیان لەسەر وشیاری فیکری و سـیـاسی ئازەربایجـانیـیـەکـانی باشـوور بەجێ بێـڵـێت کـە بەهۆی جۆراوجـۆرەوە دەچوونە شارەکـانی ئازەربایجـانی باکـوور، تایبـەت کـە پێـوەندیان بەکـەسوکـار و هـاوولاتییـەکـانی خۆیان لە باشوور نەبڕی بوو، زۆربەی ئەوانەی دەچوونە باکوور خێزانەکانیـان لەگەڵ خۆیان

---

(۱٦۹) ژمارەیەکی زۆری ئازەربایجانییەکان بەشێوەیەکی ناشەرعی لە سنوور دەپەڕینەوە.

(۱۷۰) بۆ درێژەی بڕوانە:

S. Sh. Aslan, Obrozovaine Iranskay Partii “Ejtimain - Amion” (Mujahid), Baku, 1975, PP. 6 - 7.

(۱۷۱) باکۆ، هەنووکە پایتەختی کۆماری ئازەربایجانی ناو یەکیەتی سۆڤیەتە.

نەدەبرد. هۆشیارەکانیشیان پێوەندییان بەڕێکخستنە شۆڕشگێڕییە نهێنییەکانی ڕووسیاوە هەبوو، بەڕێکخستنە سوشیالیستییەکانیشەوە. وەک بەڵگە بۆ کارتێکردنی بیری ئەوان بۆ سەر هەموو ئێرانییەکان، لەسەر ئازەربایجانییەکان بەتایبەتی، دەڵێین هەندێکیان یەکەم ڕێکخستنی نیمچە کرێکاریان بۆ ڕەنجدەران لە ئێران دامەزراند و ناویان نا «پارتی کۆمەڵایەتی ڕەمەکییەکان»، «حزب اجتماعیون - عامیون» کە ڕێکخستنێکی سوشیالیستی - دیموکراسی بوو. بەرنامە و پەیڕەوی ناوەخۆیان لەژێر کارتێکردنی سۆشیالیستە ڕووسەکان دانابوو. حزب بڵاوکراوەکانی بەئاشکرا لە باکۆ چاپ دەکرد، لەوێشەوە بەنهێنی دەبردرانەوە بۆ ناو ئێران، لکەکانیشی بەسەر شارەکانی ئازەربایجان و شوێنەکانی دی دابەشیان دەکرد[172]، بەبەرهەمی فیکری پێشکەوتووی ڕووناکبیرەکانی باکووری وەک ئەدیب و ڕووناکبیری گەورە میرزا عەلی ئاخندۆڤ (١٨١٢-١٨٧٨)شەوە[173].

ڕۆژنامەکانیشیان برەوی زۆریان لەنێو ڕووناکبیرانی ئازەربایجان لە ئێران پەیدا کرد. بۆ وێنە لەسەر ئاستێکی فراوان گۆڤاری ڕەخنەیی (مەلا نەسردین) کە لە تەبلیس بەزمانی ئازەربایجانی دەردەچوو، دەستا و دەستی پێ دەکرا، کە بەشێوازێکی گاڵتەجاڕی بەرەنگاری کێشەکانی ئێران دەبۆوە، پاشانیش شوێنەوارێکی گەورەی لەسەر ڕۆژنامەنووسی ئێران بەجێهێشت. ڕەنگدانەوەی ئەو شتانە و دەوری دیاری ئازەربایجانییەکان لە بزوتنەوەی ئێرانی پێش شۆڕشی دەستووری و لە ساڵەکانی شۆڕشیشدا بەرجەستە بوون. کاتێ بزووتنەوەی مانگرتنی گشتی لە ناوەڕاستی ساڵی ١٨٩١ دژی دانی ودم (امتیاز)ی تووتن لەلایەن ناسرەدین شا بۆ کۆمپانیای تاڵبووتی بەریتانی، تەقینەوە، ئازەربایجانییەکان لە پێشەوەی ئەوانە بوون کە بەدەنگ دروشمی

---

(172) A. Sh. Aslan, Op. Cit, PP. 12, 15; Sovrimenay Iran “Moscow, 1975, P. 142.

(١٧٣) دەربارەی کارتێکردنی گەورەی لەسەر بیروباوەڕی شۆڕشگێڕانەی ئێران بڕوانە:

A. M. Agahi, O Vlianii M. F. Akhundova na Razvitie progressivenay obshestvenay Misl V Irane, “Izvestia Academii Nauk Azerbaijana USSR”, N. 10, 1962, PP. 75 - 85.

دکتۆر ک. م. ئاغاهی، دەربارەی کارتێکردنی ئاخندۆڤ لەسەر پەرەسەندنی بیری کۆمەڵایەتی پێشکەوتنخوازی لە ئێران، گۆڤاری «هەواڵەکانی ئەکادیمیای زانستی ئازەربایجانی سۆڤیت»، ژمارە: دە، ١٩٦٢، ل٧٢-٨٤، بڕوانە کورتەی ژیانی ئاخندۆڤ لە نامیلکەی «ئاخندۆڤ» وەرگێڕانی بۆ عەرەبی عزەدین مستەفا ڕەسوول، باکۆ، ١٩٦٢.

بزووتنەوەکە چوون. لە ١٩ی ئاب تەورێزییەکان خۆپیشاندانێکی فراوانیان ڕێکخست، شەقامەکانی شاری داگرت، بەبەردەم کۆشکی جێنشینی (ولی العهد)ی فەرمانڕەوای ولایەتدا تێپەڕین، سوێندیان خوارد کە کونسولخانەی بەریتانیا لە تەورێز تێک بدەن، ئەگەر شا ودمەکەی هەڵنەوەشێنێتەوە، ئاگاداری و بانگەوازەکانی کۆمپانیای تاڵبووتیان دڕاند. ڕۆژانی مانگرتن ٢٠ هەزار تەورێزی چەکیان هەڵگرت. تەورێز تاقە شار بوو کە نوێنەرانی تاڵبوت نەیانتوانی بچنە ناوی، بۆ بەرپەرچ دانەوەی ئەوانە، ناسرەدین شا هێزەکانی بۆ لەناوبردنی بەرهەڵستی لە تەورێز نارد و، دەیەویست بیکاتە دەرس بۆ ئەوانەی زات دەکەن بەرەنگاری ودمەکەی ببنەوە. بەڵام لە دواییدا ناچار بوو پەشیمان بێتەوە و ودمی بەخشرا بەکۆمپانیای بەریتانیا هەڵوەشێنێتەوە(١٧٤).

ڕەنگدانەوەی ڕواڵەتی نوێی ژیانی سیاسی لە ئازەربایجان لە سالانی شۆڕش دەستووری (١٩٠٥-١٩١١) بەوەرچەرخانێکی گەورە بەڕووی ئیمپریالیزم و زۆرداری شا و گەورە دەرەبەگەکان دادەنرێت. دروشمی دانانی دەستوورێکی دیموکراتی بۆ ولات بەرزکرایەوە، ئەو داخوازییەی کە لایەن و دەستە کۆمەلایەتییە جۆراوجۆرەکان لە دەوری خڕ ببوونەوە.

ئازەربایجانییەکان دەوری بنەڕەتییان لە هەموو هەوارەکانی شۆڕشی دەستووریدا گێڕا. هەر لە ساڵی ١٩٠٥وە لە هەواری ئامادەکردن و تەقاندنەوە کۆمەڵێک (ئەنجوومەن) کۆمەڵی نهێنی هاتنە مەیدان و چوزەریان لە ئازەربایجان و ناوچەکانی دیکەی باکوور دەرکرد. بەئەندامەکانیان دەگوت (موجاهید). دەتوانین گرنگترین ئامانجەکانی ئەو کۆمەڵە شۆڕشگێڕییە نهێنییانە لەو خالانەدا کۆ بکەینەوە:

١- دابینکردنی مافی هەڵبژاردنی گشتی و بەنهێنی دەنگدان بۆ هەموو ڕۆڵەکانی گەل.

---

(١٧٤) بۆ درێژەی ئەم باسە بڕوانە:

N. R. Keddie, Religon and Rebliion in Iran. The Tabacco Protest of 1891 - 1892, London. 1966. PP. 39 - 40, 45 - 47, 55 - 59; 66 - 68 etc; L. M. Kulagina, Ekspasia Inostranovo Imperialisma V Iran..., "Ochirk Novay Istorii Irana", Moscow, 1978, PP. 161 - 165.

ل. م. کۆلاگینا، دەست تێوەردانی ئیمپیریالیزم لە ئێران و کردنی بەنیمچە موستەعمەرەیەک (هەشتاکانی سەدەی نۆزدەمین - سەرەتای سەدەی بیستەمین)، بەزمانی ڕووسی، لە کتێبی «کورتەی مێژووی ئێرانی نوێ» مۆسکۆ، ١٩٧٨. ل١٦١-١٦٥. ب. و. لیباریتونیتش، خەبات دژی کۆلۆنیالیزم و دەرەبەگ لە ئێران لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەمین، کورتەی نامەی دکتۆرای بەزمانی ڕووسی، یەریڤان، ١٩٧٤، ل٢٥-٢٦.

٢- دانی ئەوەی پێی دەگوترا حەوت سەربەستییەکان بەگەل، کە مەبەستیان لە سەربەستی قسە و چاپ و دوان و کۆبوونەوە و مافی دامەزراندنی کۆڕ و کۆمەڵ و مانگرتن و سەربەستییەکان کەسییەکان (الشخصیة) بوو.
٣- دەستگرتن بەسەر زەوییەکانی شا و کڕینی زەویوزاری دەرەبەگە گەورەکان و دابەشکردنی بەسەر جووتیاران دا.
٤- دیارکردنی ڕۆژی کار بەهەشت سەعات.
٥- چاککردنی شێوازی باجگری لەسەر بناغەی ڕێژەی سەر بەرەوژوور کە لەگەڵ سامانی تاکە کەسی مرۆڤ و توانای دەگونجێت.
٦- بڵاوکردنەوەی فێرکردنی گشتی بەخۆڕایی(١٧٥).

ئەو کۆمەڵانە بڕوایان بەتۆقاندنی تاکەکەسی هەبوو، وەک هۆیەک بۆ لەناویردنی ڕژێمی قاجاری و دامودەزگاکانی. بەکردەوەش موجاهیدەکانی. ئەندامانی ئەو کۆمەڵانە، فەرمانی کوشتنی چەندین کاربەدەستی گەورەی کۆنەپەرستی وەک سەرەکی وەزیران ئەتابەگی مەزنیان دا، کە ڕۆژی ٣١ی ئابی ساڵی ١٩٠٧ جەنگاوەرێکی ئازەربایجانی لەبەردەم ساختمانی ئەنجوومەن لەناو جەرگەی تارانی پایتەختدا کوشتی(١٧٦)، هەروا لە شوباتی ساڵی داهاتووش هەوڵیان دا محەمەد عەلی شا بکوژن، بۆمبایەکیان فڕێدایە ناو کەژاوەکەی لە یەکێ لە شەقامەکانی پایتەخت، کە بەڕێکەوت لە مردنی مسۆگەر قورتاری بوو، چونکە لە دەمی تەقینەوەی بۆمبایەکە ئەو لەناو ئەو عارەبانەی بۆی تەرخان کرابوو نەبوو.

سەرەتای شۆڕش زۆر کۆمەڵە «ئەنجوومەن»ی ئاشکرا پەیدابوون کە ئەندامەکانیان بۆ سەرپەرشتیکردنی هەڵبژاردنی ئەندامانی شورا هەڵدەبژێران، ئەوەش دوای ئەوەی موزەفەرەدین شا ناچار بوو قایل بێ یەکەم دەستوور بۆ وڵات دابنرێ لە ئەیلوولی ١٩٠٦دا. بەڵام ئەو ئەنجوومەنانە بەخێرایی بوونە دامودەزگای سیاسی چەسپاو و خاوەن کێشی جەماوەری زۆر. یەکەم ئەنجوومەنی لەو جۆرە بەناوی ‹ئەنجوومەنی میللی) لە

---

(١٧٥) بۆ درێژەی دەربارەی ئەو کۆمەڵانە و چالاکییان، بڕوانە:
M. S. Ivanov, Ochirk...,pp. 209 - 210.

(١٧٦) بکوژی ئەتابەگی ئەعزەم، ناسنامەیەکی لابوو، ئەوەی خوارەوەی تێدا نووسرابوو:
«عەباس ئاغا. پارەگۆڕەوە (صیرفی) ئازەری، ئەندامی ئەنجوومەن، جەنگاوەری گەل، ژمارە، ٤١» بڕوانە: P. Sykes, A History of Perisa, Vol, II., PP. 408 - 409.

تەورێز سەری هەڵدا و خەڵکەکەی لەسەر ئاستێکی فراوان بەشداری لە هەڵبژاردنی ئەندامەکانی کرد. ناوبانگی ئەنجوومەنی تەورێز گەیشتە رادەیەک فەرمانڕەوای ئازەربایجان (ولی العهد محمد علی میرزا)[177]، کە تا بناگوێی نقوومی بیروباوەڕی کۆنەپەرستی ببوو، ناچار بوو حسێبی تایبەتی بۆ ئەنجوومەن و پێشنیارەکانی بکات. ئەندامانی ئەنجوومەن کەموکورتییەکانی ڕژێمیان بێ سێ و دوو لە چالاکی ڕۆژانەیان ڕیسوا دەکرد. تەنانەت هەندێ کاری گرنگیان لە بەرژەوەندی جەماوەدا کرد، بێ ئەوەی تۆزقاڵێک گوێ بدەنە دامودەزگای حکومەتی شا. دەستەکانی ئەنجوومەن نرخیان بۆ پێویستییەکانی ژیانی وەک گۆشت و نان دانا. تەرازوو پێوەریان ڕێکخست. دژایەتی بازاڕی ڕەشیان کرد. دەستیان بەسەر دانەوێڵە داکراوەکانی هەندێ قۆڵبڕدا گرت و پاشان بەسەر هەژارانی دانیشتووانی تەورێز و دەوروبەریان دابەش کرد. ئەنجوومەنی تەورێز نوێنەرانی خۆی نارده شار و گوندەکانی ئازەربایجان بەمەبەستی وریاکردنەوەی خەڵکەکەی و بڵاوکردنەوەی بیری شۆڕشگێڕی دەستووری لە ناویاندا. ئەنجوومەن ڕۆژنامەیەکی هەبوو وەک زمانحاڵ، پێیان دەگوت (ئەنجوومەن) هەر جارەی پێنج هەزار دانەی لێ چاپ دەکرا، ئەو ژمارەیە بەگوێرەی پێوانەی ئەو ڕۆژگارە مانای خۆی هەبوو[178]. هەروەها ئەنجوومەن پێناسی دەدایە ئەندامەکانی کە دروشمی (دادپەروەری، ئازادی، یەکسانی، یەکیەتی) پێوە بوو، بەو جۆرە تا ئەندازەیەکی زۆر لە یانەکانی شۆڕشی فەرەنسای دەکرد[179].
ئابی ١٩٠٧ (ئەنجوومەنی تەورێز) بڕیاری محەمەد عەلی شای نوێی ڕەتکردەوە کە میر فەرمان فەرمای کردبووە فەرمانڕەوای ئازەربایجان، چونکە بە چوونی خۆی بۆ سەر تەختی شایەتی شوێنەکەی بەچۆڵی مابۆوە. هەر ئەو ئەنجوومەنە، ئەویش بەهۆی ئەندامە ئازەرییەکان دەوری ڕابەری لەناو شوورادا گێڕا کە بەردەوام فشاریان دەخستە سەر حکومەت لەپێناو دابینکردنی دیموکراسی و دوورخستنەوەی ئەو کاربەدەستە گەورانەی

(١٧٧) ساڵی ١٩٠٧، دوای مردنی موزەفەرەدین شای باوکی، هاتە سەر تەخت، بەمحەممەد عەلی شا ناسرا.
(١٧٨) لە ساڵانی شۆڕشی دەستووری ڕۆژنامەنووسی ئێران لێشاوێکی بێ وێنەی نەک لە مێژووی ئێران بەڵکو لە مێژووی زۆربەی وڵاتەکانی دیکەی ڕۆژهەڵات بەخۆوەبینی، تەنها لە هەواری یەکەمی شۆڕش زیاتر لە ١٥٠ ڕۆژنامە و گۆڤار دەرچوون کە هەندێکیان بەزمانی ئازەربایجانی بوون.
(١٧٩) احمد کسروی، تاریخ مشروطه ایران، چاپ هفتم، تهران، ١٣٤٦، ل٧٢٢؛
P. Sykes, Op, Cit, Vol. II. P 408.

بەکۆنەپەرست ناسرابوون. (ئەنجوومەنی تەوریز) بەهۆی چالاکی و دەسکەوتەکانی بووە پێشەنگ، شۆڕشگێڕان لە شارەکانی ئێران چاویان لێ دەکرد، هەروەها دەورە مەزنەکەی سەرنجی چاودێرە بیانییەکانی ڕاکێشا. لە ڕاپۆرتێکی دبلۆماسی رووس کە مێژووی ٢٤ی ئابی ١٩٠٨ی لەسەرە لەو بارەیەوە دەڵێت:

«ڕاستییەکەی ماوەیەکی درێژە دەسەلات لە تەوریز کەوتۆتە دەست ئەنجوومەنێکی ناوچەیی کە لە هەموو ئەنجوومەنەکانی دیکەی ئێران بەدەسەلاتترە و لکێکیشی لە تارانی پایتەختدا هەیە و هەموو ئەندامانی شووراش بەقسەی دەکەن»(١٨٠).

کە محەممەد عەلی شا توانی زەبرێکی بەهێز بسرەوێنێتە هێزە دیموکراسییەکان لە تارانی پایتەخت، قورسایی خەباتی شۆڕشگێڕی کەوتە ئازەربایجان. لە ٢٣ی حوزەیرانی ١٩٠٨ شا دەسەلاتی عورفی ل تاران ڕاگەیاند، بەفەرمانی ئەویش قۆزاقەکان(١٨١) ساختمانی شوورایان بۆ ماوەی چەند سەعاتێک تۆپباران کرد و ئەندامە ڕادیکالەکانیش گیران، لەگەڵ گەلێ لە کەسانی دیموکراسی کە دووچاری جۆرەها هەڕەشە و ئازار و ئەشکەنجە بوون، هەروەها فەرمانی مردن دەرهەق چەند ناودارێکی وەک ڕۆژنامەنووس و نووسەری ناسراو «ملک المتکلمین» جێبەجێ کرا. ژمارەی قوربانییەکانی بۆردوومان و تۆقاندن بەکوژراو و بریندار و زیندانی لە چەند سەد نیشتمانپەروەرێک تێپەڕی کرد(١٨٢).

بەرپەرچ دانەوەی ئازەربایجان لەسەر ڕووداوەکانی پایتەخت بەپەلە و یەکجار بەهێزیش بوو، لە ڕیزی جەماوەری چەوساوە دوو سەرکردەی شۆڕشگێڕ سەتارخان و باقرخان(١٨٣) سەریان هەڵدا، کە لە سەرتاسەری وڵات دەنگیان دایەوە. لە ڕۆژی یەکەمی کودەتای شا بەیەکەوە بروسکەیەکیان بۆ شورا نارد و بەناوی ئەنجوومەنی تەوریز دووپاتیان کردەوە کە زۆربەی شارەکانی ئێران محەممەد عەلی شا بەخائینی نیشتمان دەزانن(١٨٤).

سەتارخان وەرزێرێکی بچووک بوو، کاریگەری زۆری لەسەر هاوەڵەکانی هەبوو، ئازا و بوێر بوو، بەهێز و بەبڕشت بوو، یەکجار ڕاستگۆ بوو، هەمیشە لایەنگری خەباتی

---

(١٨٠) لە M. Ivanov, Ochirk... P. 212 وەرگیراوە.

(١٨١) هێزێکی سەربازی بوو لەسەر شێوەی قۆزاقەکانی رووس دامەزرابوو، یەکێک لە ئەندامەکانی ڕابەریی دەکرد، ئەفسەرێکی رووسیش مەشقی پێ دەکردن.

(١٨٢) سەرچاوەکان بەو ڕووداوانە ئەڵێن: (کودەتای محەممەد عەلی شا).

(١٨٣) خەڵکی ڕەمەکی ناوی (خان)یان لێ نابوون، وەک دەربڕینی ڕێز و خۆشەویستی بۆیان.

(١٨٤) عەبدوڵلا ڕازی، تاریخ مفصل ایران از سلسله ماد تا عصر حاضر، ل ٥٢١.

هەژارانی ئازەربایجانی دەکرد لە پێناو زەوی و نانداا(١٨٥).

بۆیە ئاسایی بوو لەگەڵ تەقینەوەی شۆڕشی دەستووری بەگەرمی بەشداری لە قەوماوەکانیدا بکات، هەر بۆیە شیاوی ئەوەبوو شەرەفی هەڵبژاردنی ئەندامی شانازی بۆ «ئەنجومەنی تەورێز»ی پێ ڕەوا ببینێت. سەتارخان جەنگاوەرە هەرە جەربەزەکانی لە دەوری خۆی کۆکردەوە، بەگەرمییەوە داکۆکی لە دەسکەوتەکانی شۆڕش کرد، کە بووە هۆی ڕق هەڵسانی کۆنەپەرستان، تەنانەت شا پارەیەکی زۆری پاداشت تەرخان کرد بۆ ئەوەی کەللە سەرەکەی بۆ بێنن. جێ ئاماژە پێکردنە، ناوی سەتارخان لە ڕۆژنامە ئەوروپاییەکانیش دەنگی دایەوە، ناویان لێنابوو (گاریبالدی ئێران)، جەماوەریش نازناوی بەرز (سەرداری میللی) یان پێ بەخشی، لە هۆنراوی نوێی ئازەربایجانیش وەک قارەمانێکی میللی ناوی دێت(١٨٦).

باقرخانی هاوڕێی بیروباوەڕ و چەکیشی کرێکارێکی ئاسایی بوو، لە کارگەی بەرد دەرهێنان کاری دەکرد. ئازا و دڵسۆز بوو. شۆڕشگێڕانی ئازەربایجان نازناوی (پێشەوای میللی)یان پێ بەخشی بوو.

نیشتمانپەروەرانی ئازەربایجان لە دەوری ئەو دوو سەرکردە کۆبوونەوە، کە بەهۆیەوە ڕاپەڕینێکی گەورە لە تەورێز گەڵاڵە بوو، بەترۆپکی کاری شۆڕشگێڕی دادەنرێ لەنێو شۆڕشی دەستوریدا(١٨٧)، دروشمەکانیشیان بەڕاستی دەربڕی قووڵی ناوەرۆکیان بوو و سەرکردەکانیشیان دەرکیان بەئەرکەکانی ئەو هەوارەیان دەبوو. داخوازی شۆڕشگێڕان بەگەڕاندنەوەی دەستوور و داوای بەستنی ئەنجومەنێکی نوێ و دەرکردنی هەموو ئەو بیانیانەی کە لە ڕۆژانی کودەتای حوزەیرانی ١٩٠٨ لە تاران لایەنگیری محەمەد عەلی شا و دەوروبەرە کۆنەپەرستەکەیان کردبوو. بەگردبوونەوەی جەماوەر لە دەوری ئەو دروشمانە سەرکردەکانی ڕاپەڕین توانیان زەبر لە دوژمنانی شۆڕش بدەن و لە تشرینی

---

(١٨٥) دەربارەی مێژووی ژیانی سەتارخان و باقرخان و چالاکییەکانیان بڕوانە: محمد رضا عافیت، سردار ملی سەتارخان، بەزمانی ئازەربایجانی، باکی ١٩٦٨؛ اسماعیل امیر خیزی، قیام ازربایجان و ستارخان، تبریز، ١٣٣٩هـ، ل٢-٧، ٢١-٢٣؛ احمد کسروی، تاریخ مشروطه ایران، ل٦٩١-٧٠٩؛ کریم طاهر زاده بهزاد، قیام ازربایجان در انقلاب مشروطیت ایران، ل٤٤٢-٤٤٧.

(١٨٦) بڕوانە: محمد رضا عافیت، سردار ملی ستارخان، ل ١٣٥ - ١٤٩.س

(187) “Sovrimenay Iran”, P. 143.

یەکەمی ساڵی ١٩٠٨ تەورێزیان لێ خاوێن بکەنەوە. شۆڕشگێڕان دەستیان بەسەر شتومەکی ناو جبەخانەی ئۆردووی حکوومەت لە تەورێزدا گرت، کە پێکهاتبوو لە بیست هەزار تفەنگ، لەگەڵ ژمارەیەک تۆپ و هەندێ ئازوخە[١٨٨]. هەروەها شۆڕشگێڕان کاروباری شاریان بەجۆرێک ڕێکخست، کە سەرنجی چاودێرانی بیانی ڕاکێشا. کاربەدەستانی ڕووس کە پێشتر شۆڕشگێڕانیان دەبوغزاند و پیلانیان لە دژیان دەگێڕا، لەو ڕاپۆرتە نهێنیانەی دەیان ناردنە پترسبۆرگ، دانیان بەوە دادەنا کە بارودۆخی ناوچەکە لەژێر سایەی کارگێڕی شۆڕشگێڕان زۆر لەوەوپێش باشتر بووە. بەماوەیەکی کەم شۆڕشگێڕان توانییان چەند دەستەی تایبەتی پێک بێنن بۆ سەرپەرشتیکردنی شارەوانی و فەرمانگەکانی بروسکە و پۆستە و دارایی و زانیاری و داد، سنووریان بۆ ئەو قۆڵبڕ و دەستبڕانەی یارییان بەپارووی گەل دەکرد دانا، دەستیان بەسەر شتومەکی شا و خزمەکانی لە ناوچەکەدا داگرت، هەندێ کاری پێویستیان دژی بەرژەوەندییەکانی لە ئازەربایجان کرد، هەروەها دەستیان گرت بەسەر زەوی هەندێ لەو زەویدارانەی سەر بەڕووسیا بوون. کۆمپانیای تەلگرافی بەریتانیان ناچار کرد هەندێ پارە بداتە خەزێنەی شۆڕشگێڕان. بایەخی زۆریان بەبەرگریکردن لە تەورێزدا. بۆ ئەوەش لیژنەیەکی تایبەتیان بۆ سەرپەرشتیکردنی کاروباری شارەکە بەناوی (کمسیون جنک) واتە کۆمیتەی جەنگ دانا و ڕێکخستنی کاروباری دەستە خۆبەخشەکانی (کتائب المتطوعین)ی خستبووە ئەستۆی خۆی و مەشقیان لەسەر بەکارهێنانی چەک و تۆپ بەئەندامەکانی دەکرد. تا وەکو ئەیلوولی ١٩٠٨ ژمارەی خۆبەخشەکان لە ناوچەکەدا ببووە دەوروبەری دە هەزار کەس[١٨٩]. شاهێدی باوەڕپێکراو هەیە کە کاروبار لەناو تەورێز و دەوروبەری لەژێر سێبەری کارگێڕی شۆڕشگێڕاندا تەواو هێمن و ئارام بوو[١٩٠]. کۆڕ و کۆمەڵ و لایەنەکانی خەڵکی ئازەربایجان لە هەموو شوێنێک هەواڵی ڕاپەڕینی تەورێزیان بەدڵ خۆشییەوە وەردەگرت.

---

(188) M. S. Ivanov, Ochirk..., P. 228.

(١٨٩) اسماعیل امیر خیزی، قیام ازربایجان و ستارخان، ل ٢٤٩ - ٢٥٠.
M. S. Ivanov, Ochirk..., PP. 228 - 229; H. Nazem, Russia and Great Britain in Iran (1900 - 1914), Teheran, 1975 P. 42.

(١٩٠) بروانە:
W. M. Shuster, The strangling of Persia, story of European Diplomacy and oriental Intrigue that Resulted in the Denationalization of Tweleve Million Mohammedans. A Personal Narrative, NewYORK,1912,P.XI.

خۆبەخشەکان داباریـنە سەر شار، بەماوەیەکی کەم دەسەلاتی ڕاستەقینە لە گشت ناوچەکانی کارگێڕی ئێران کەوتە بن دەستی شۆڕشگێڕانی تەورێز، کە یارمەتی بەرچاویان لە ئازەربایجانی باکووری برایان و شۆڕشگێڕانی ئەودیوی قەفقاسیشەوە وەرگرت و لیژنەیەکی تایبەتیان بۆ چاپکردنی بڵاوکراوەی شۆڕشگێڕان دامەزراند بوو. هەموو جۆرە یارمەتییەکیان بەچەک و تەقەمەنیشەوە دەدانێ و وێڕای ئەمانەش خۆبەخشەکان لە ناوچەکانی ئەودیوی قەفقاسیش دەهاتنە تەورێز، کارگەی چکۆلەیان بۆ دروستکردنی بۆمبا و نارنجۆک دامەزراند، نەخۆشخانەیەکیان بۆ چارەسەری نەخۆش و بریندارەکانی خەڵکی شار و دەوروبەری دانابوو، لە ڕۆژی ١٤ی (ذی القعدە)ی ١٣٢٦ (٩ی کانوونی یەکەمی ١٩٠٨) بەناوی (مریضخانەء ملی)، واتە نەخۆشخانەی گەل کرایەوە. هەروەها بەشداری ڕاستەوخۆی شەڕیان لە دژی دوژمنانی شۆڕشگێڕان کرد، زیاتر لە بیست خۆبەخشیان لێ کوژراو، ناشتنیان بووە خۆپیشاندانێکی میللی. زۆر ئاسایی بوو ئەو کردەوانە ڕقی محەمەد عەلی شا بوروژێنن، بۆیە شا داوای لە خودی تەزار نیقۆلای دووەم کرد کە وا بکات بەر لەم کردەوانە بگرێت، تەزاریش بەڕاستی فەرمانی توندی لەو بارەیەوە دەرکرد(١٩١).

ڕاپەڕینی تەورێز زایەڵەی لە ناوچەکانی ئەودیو قەفقاس و دوورتریش دەبیسترا. ڕۆژنامەی (مساوات)ی هەفتانە لە ژمارەی ڕۆژی ١٤ی محەرەمی ١٣٢٧ دەقی ئەو نامەیەی کە (٧٥٨) خوێندکاری خانەی هونەر (دار الفنون) لە مۆسکۆ بۆ سەتارخانیان ناردبوو بڵاوکردەوە، تێیدا بەگەرمی لایەنگیری خۆیان بۆ خەبات لە پێناو (بەرزکردنەوەی ئاڵای ئازادی) دەربڕی بوو. لە هەمان ژمارەدا ڕۆژنامەکە نامەیەکی دیکەی بڵاوکردبۆوە کە «کۆمەڵی خێرخوازانی ژنانی ئێرانی نیشتەجێ لە ئەستەنبوڵ» (الجمعیة الخیریة للإیرانیات المقیمات في استنبول) بۆ سەتارخانیان ناردبوو. نامەکە دوایی بەدوعای سەرکەوتنی (جەنگاوەرانی ڕێی خوا بەسەر گشت خائینانی گەل و وێرانکەرانی نیشتمانی پیرۆز» هاتبوو.

ڕۆژنامەی (صباح) کە لە ئەستەنبوڵ دەردەچوو وتاری لایەنگیریکردن لە شۆڕشگێڕانی ئازەربایجانی بڵاوکردەوە، داوای لە خەڵکیش دەکرد کە پیتاکیان بۆ کۆبکەنەوە. هەروەک نیسماعیل ئەمیر خیزی، یەکێ لە ئەندامانی (ئەنجوومەنی تەورێز)، دەڵێت ڕۆژگاری

---

(191) M. S. Ivanov Ochirk..., PP. 229 - 231.

شۆڕشی دەستووری سروودێکی نیشتمانی لە مەغریب باوبوو بەقارەمانیەتی سەتارخانی هەڵ دەگوت(١٩٢). تیشکی ڕووداوەکانی ئازەربایجانی شۆڕشگێڕ بەخێرایی گەیشتە ناوچەکانی دیکەی ئێران بۆ ئەوەی ئەو خامۆشییەی کودەتای حوزەیرانی ١٩٠٨ دروستی کردبوو، بکاتە لێشاوێکی شۆڕشگێڕی نوێ. لە کانوونی دووەمی ١٩٠٩ ڕاپەڕینێک لە ئەسفەهان بەرپابوو، بووە هۆی ئەوەی دەسەڵات لە شار و دەوروبەری بکەوێتە دەست دەستوورییەکان، دوای ئەوەی شا نەیتوانی هۆزی ناسراوی بەختیاری لە دژی شۆڕشگێڕانی تەورێز بەکاربێنێ ئەوا ڕۆڵەکانی دایانە پاڵ شۆڕشگێڕان. خەڵکی گەیلانیش خرۆشان، دەستوورییەکان دەستیان بەسەر ناوچەی باشووردا گرت بەبەندەری بەندەر عەباس و بوشەهریشەوە.

ئا بەو جۆرە دیسان مەترسی لە هەموو لایەک هەڕەشەی لە تەختی محەمەد شاوە کرد و دەسەڵاتی لە تەواوی ناوچەکانی ئێران لە دەست دابوو. بۆ بەرپەرچدانەوەی شۆڕشگێڕان شا پەنای بردە بەر بەکارهێنانی هێز و دواکەوتووترین هێزی دەرەبەگی لە دژیان بەگەڕخست، بەچەتە و ڕێگریشەوە. هەوڵی دا زەبری یەکەم لە شۆڕشگێڕانی ئازەربایجان بوەشێنێ بۆ لەناوبردنی بزووتنەوەکەیان، هێزێکی گەورەی لەشکری دەرەبەگە خۆفرۆشەکانی وەک ڕەحیم خانی کردنە سەر. بەڕاستیش دوژمنان توانییان جارێکی دی دەسەڵات بگێڕنەوە سەر هەندێ ناوچە و دەستیان گرت بەسەر ڕێگای گرنگی جلفە - تەورێز کە ئەلقەی پێوەندی بنەڕەتی نێوان شۆڕشگێڕان و دیموکراسییەکانی ئەودیو قەفقاس بوو. پێش هاتنی شوباتی ١٩٠٩ ئابلوقەیەکی مەحکەمی خودی تەورێزیان دا، بەفەرمانی شا چەتە و ڕێگرەکانیش بەشدارییان تێدا کرد، دانیشتووانی تەورێز گیرۆدەی مەترسی کەمبوونی ئازووقە بوون(١٩٣)، بەڵام لەگەڵ ئەوەش شۆڕشگێڕان دلێرانە بەرگرییان لە دەستکەوتەکانیان کرد، هەرچی پێیان کرا کردیان بۆ ئەوەی بەری شاڵاوی دوژمن بگرن. پیاوەکانی سەتارخان و باقرخانیش زەبرەکانیان دەخێواندە هێزەکانی شا و لایەنگرانی، هەروەها شۆڕشگێڕان لایەنگرانی خۆیان دەنارده لای سەربازەکان بۆ ئەوەی پێوەندییان پێوە بکەن.

---

(١٩٢) اسماعیل امیر خیزی، قیام ازربایجان و ستارخان، ل٢٩٧-٢٩٨، ٣٠٣، ٣٩٦-٣٩٧.
(193) M. E. Yapp. 1900 - 1921, The Last Years of Qajar Dynasty, "Twentieth Century Iran", New York, 1977, P. II; H. Nazem, OP. Cit., pp. 47 - 50.

کاتێ کە شا ئەو سەرکەوتنەی دەیویست بەدەستی نەهێنا و مەترسی شۆڕش هەر مابوو، داگیرکەرانی ڕووس و بەریتانیا بەفریای کەوتن، بەتایبەتیش لەبەر ئەوەی لە تەشەنەکردنی شۆڕشی دەستووری دەترسان، کە ڕەنگ بوو کار بکاتە سەر نەتەوەکانی قەفقاس و هێندی دراوسێی ئێران، بەسەرکەوتنی شۆڕشی ئیتحادییەکان لە تورکیا ساڵی ١٩٠٨ هێندەی دی مەترسییەکەی پتر بوو. ئا بەو جۆرە فەرمانڕەوایانی پترسبۆرگ و لەندەن پەردەیان لەسەر ڕووی خۆیان هەڵماڵی وە لە نیسانی ١٩٠٩ هێزەکانیان دابەزینە ناو خاکی ئێران بۆ ئەوەی ڕاستەوخۆ بەشداری لێدانی بنکەکانی شۆڕش بکەن. هێزەکانی بەریتانیا گەلێک شاری باشووری ئێرانیان داگیر کرد، لە کۆتایی نیسانیش فەرمانڕەوایانی ڕووسیا ڕووی هێزەکانیان بەسەرکردایەتی جەنەراڵ (سنارسکی Snarski) لە تەورێز کرد بەبیانووی قووتارکردنی ئەو بیانیانەی لەوێن و بردنی کەلوپەلی پێویست بۆیان، لە هەمان کاتدا هێزێکی دیکەی ڕووس ئەردەبیلی داگیر کرد.

ئەگەرچی ڕووسەکان تەورێزیشیان داگیر کرد، بەڵام نە ستارخان و باقرخانیان گرتن(١٩٤)، نە پیاوەکانیشیان یەکسەر چەک کرد، چونکە دەترسان لەو ئاکامانەی پێش بینیان لە ئەنجامدانی کاری وا. بەڵام هەر کە کاروباریان بۆ هێوەر بۆوە داوایان لێکردن تەورێز بەجێ بهێڵن، هەردووکیان لەگەڵ بەشێک لە پیاوەکانیان ڕوویان لە تارانی پایتەخت کرد، جەماوەری شار وەک قارەمان پێشوازییان لێکردن. سەرکردەکانی دیکەی ڕاپەڕینیش ناچاربوون وڵات بەجێ بهێڵن و ڕوو بکەنە ئەستەنبوڵ.

داگیرکردنی تەورێز لەلایەن هێزەکانی ڕووسیا هەستی دەستوورییەکانی ناوچەکانی دیکەشی خرۆشاند، بروسکەی هەڕەشە و ناڕەزایی لە ڕەشت و قەزوین و ئەسفەهان، وێڕای تەورێز، بەسەر سەرەک وەزیراندا داباری، داوایان دەکرد میری دەستوبرد بکات بۆ کشانەوەی بەپەلەی هێزەکانی ڕووسیا لە ناوچەکە(١٩٥). پاش ماوەیەکی کەم تەورێزییەکان دووبارە دەستیان دایەوە چەک، وەک هەوڵێک بۆ پاشەکشە پێکردنی داگیرکەران، بۆ زانینیش پێشەوایانی دەستووری هەر لە سەرەتاوە جەنگاوەرانیان ڕاسپارد بوو کە بەرەنگاری هێزەکانی ڕووسیا نەبنەوە، چونکە سەرکردەکانی ڕووس دڵنیایان کردبوون کە کاری ئەوان تەنیا ڕێگا کردنەوەیە بۆ شار و گەیاندنی یارمەتییە بۆ

---

(١٩٤) لەسەرەتاوە سەتارخان و باقرخان پەنایان بردە بەر خانووی کونسوڵی عوسمانی لە تەورێز.
(195) H. Nazem, Op. Cit, P. 51.

خەڵکەکەی و مسۆگەرکردنی کشانەوەی بێگانەکانە لێی، پاشانیش بەبێ گیربوون خۆیان دەکشێنەوە. بەڵام ڕووسەکان مرخیان لەناوچەی تەورێز خۆش کردبوو و لەسەروبەندی گفتوگۆی بەستنی (پەیمانی تورکمانچای)ش داوایان کردبوو، بۆیە نیازی کشانەوەیان پێوە دیار نەبوو. هەر بەڕاستیش تا ساڵانی شەڕی یەکەمی جیهان لەوێ مانەوە، هەر بۆشیان لوابایە جێی خۆیان خۆش دەکرد. کاتێ پیاوەکانی ڕەحیم خان لە ئەیلوولی ۱۹۰۹ پەلاماری ئەردەبیلیان دا پترسبۆرگ ئەوەی کردە بیانوو تا هێزی تازە بنێرنە ناوچەکە و کشانەوەیان دواخست لەبەردەم بێ دەسەلاتی و کەمتەرخەمی میری، خەڵکی تەورێز خۆیان هاتنە مەیدان بۆ بەرەنگاربوونەوەی چەکدارانەی هێزەکانی ڕووسیا، هەرچەند تواناشیان ئەوەندە نەبوو، لە ۲۷ی کانوونی یەکەمی ۱۹۰۹ جەنگاوەران پەلاماری ئەو هێزانەی ڕووسیایان دا کە لە دژی پەلامارەکەی ئەوان (واتە جەنگاوەران) ۱۰۰٪ حورمەتی شارەکەیان شکاندبوو، بەسەرۆکایەتی جەنەراڵ (ڤوربانۆڤ Vorbpanov)، چوونە ناوی و فەرمانی خنکاندنی ژمارەیەک جەنگاوەریان دا[۱۹٦].

لە کۆتایی ساڵی ۱۹۱۱دا، بەرگری ئازەربایجانییەکان دژی هێزەکانی ڕووسیا دەستی پێ کردەوە، ئەویش لە ئەنجامی سەرهەڵدانی ئەو تەنگ و چەڵەمە سیاسییە دژوارەی لە ئاکامی هەڵوەستی ڕووسیا دژ بەهاتنی پسپۆڕی دارایی ئەمریکی شووشتەر، لە ئێران دەنگی بەرهەڵستیکردنی کەلوپەلی ڕووسیا بەرزبۆوە. لە کۆتایی کانوونی یەکەم پێکدادانی ڕاستەوخۆ لەنێوان سەربازەکانی ڕووس و خەڵکی تەورێز و ڕەشت قەوماو بووە هۆی کەوتنەوەی زیان لە هەردوولا، کە سەرچاوەکان جیاوازن لە قەبلاندنی، بەڵام ئەوەی سەرنج ڕادەکێشێت تەورێزییەکان لاشەی سەربازە کوژراوە ڕووسەکانیان لەتوپەت کردبوو، ئەو کارەی کە ڕۆژنامەی تایمسی لەندەنیش وێنەکانی لە ژمارەی ڕۆژی ۱۵ی کانوونی دووەمی ۱۹۱۲ بلاوکردەوە. ئەوەش پاڵی بەڕووسەکانەوە نا ڕەفتاری دڵڕەقانەی دەرهەق بەتەورێزییەکان بجوڵێنەوە، ژمارەیەکی زۆریان لێگرتن و درانە دادگای تایبەتی کە بۆ ئەو مەبەستە پێک هاتبوو، فەرمانی مردنیان دەرهەق بە۹ کەس لە پێشەوایانی بەرزی جەنگاوەرانی ئازەربایجان جێبەجێ کرد و ناڕەزاییەکی توندی لەناو خەڵک لە دەرەوە و ناوەوە نایەوە[۱۹۷].

ڕاپەڕینی تەورێز و ئاکامەکانی لەگەڵ هەڵوەستی شا لە داگیرکردنی ڕووسەکان و

---

(۱۹٦) پروفیسور و. مینورسکی، تاریخ تبریز، ترجمه وتحشیه عبدالعلی کارنگ، ل۷۵.

(۱۹۷) بۆ درێژەی بڕوانە: H. Nazem, Op. Cit, PP. 105 - 108.

خراپییەکەی دۆخی ئێرانیان قڵیشاندەوە، جەنگاوەران لە باکوور و باشوور ڕووە و تاران بزووتن، محەمەد عەلی شایان ناچار کرد واز لە تەخت بێنێ بۆ ئەحمەد پاشای کوڕی کە بووە دواپاشای قاجار و تا ساڵی ١٩٢٥(١٩٨) فەرمانڕەوای ئێرانی کرد. شۆڕشی دەستووریش کە ئازەربایجانییەکان هێزی بزوێنەر و بنەڕەتی بوون بەدەست تێوەردانی ڕاستەوخۆی داگیرکەرانی بەریتانی و، بەتایبەتیش ڕووس و بەهاوکاری لەگەڵ حکوومەتی شا لە کۆتایی ساڵی ١٩١١ وای لێهات بتوانرێت کۆتایی پێ بهێنرێت.

بەدامرکاندنەوەی شۆڕشی دەستووری سەردەمێکی کپ لە خەباتی ڕزگاریخوازی ئازەری دەستی پێ کرد، ئەویش وەک سەرجەم بزووتنەوەی نیشتمانی ئێران. بەڵام هەینێکەش زۆر جار دەنگی ناڕەزایی دژی بوونی ڕووسیا لە ئازەربایجان بەرز دەبۆوە کە بەڵگەنامەکانی دبلۆماسی نهێنی ڕووسیا لە جارێک زیاتر تۆماری کردوون(١٩٩)، هەر هەمان بابەتیش لایەنەکانی دیکەی لە دەوروبەری ئێران وروژاند. لە چاوپێکەوتنێکی نێوان وەزیری هەندەرانی تورکیا عاسم بێگ و باڵیۆزی ڕووسیا لە دەروازەی باڵا (جریکۆڤ Chrikoff) وەزیر هیوای خواست کە «بەپەلە چارەی گرفتی تەوریز بکرێت»، بەتایبەتی کە دووپاتی دەکردەوە «نیگەرانییەکی گەورەی خستۆتە نێوان موسڵمانەکانی تورکیا»(٢٠٠).

هەموو بەڵگەکان نیشانیان دەدا کە فەرمانڕەوایانی ڕووسیا نەخشەیان دادەنا تا دەست بەسەر ئازەربایجانی باشووردا بگرن بۆ ئەوەی لە نزیکترین هەلدا بیخەنە سەر وڵاتەکەیان، بۆیە دەبینین لەسەر ئاستێکی فراوان هانی هاونیشتمانییەکانیان و ئازەربایجانەکانی لایەنگرانی خۆیان و ئێرانییەکانی دیکەیان دەدا بۆ وەچەنگ خستنی زەوی کشتوکاڵی. هەروەک ڕۆژنامەی (تایمس)ی لەندەنی لە ژمارەی ڕۆژی ١٨ی حوزەیرانی ١٩١٤ دووپاتی دەکاتەوە و بەپاڵپشتی سەرچاوەکانی ڕەسمی ئێرانیش نزیکەی سێیەکی زەوییەکانی ئەو ناوچەیە کەوتنە بن دەستی ڕووسەکان. هەندێ سەرچاوەی دیکەش پەنجە

---

(١٩٨) بۆ درێژەی بڕوانە: P. Sykes,Op. Cit, PP. 419 - 420.

(١٩٩) «وەزارەتی هەندەران. پێوەندییە دەوڵەتییەکانی لە ڕۆژگاری ئیمپریالیزمدا. بەڵگەنامەکانی ئەرشیفەکانی حکومەتی تزاری و حکومەتی کاتی ١٨٧٨-١٩١٧»، زنجیرەی ژمارە سێ، بەرگی چوارەم (٢٨)ی حوزەیران - ٢٢ تەممووز ١٩١٤)، بەزمانی ڕووسی، مۆسکۆ - لینینگراد، ١٩٣١، ل٣١٥-٣١٨، بەڵگەنامەی ژمارە ٢٥٥.

(٢٠٠) هەمان سەرچاوە، بەرگی نۆزدەمین، بەشی دووەم (١٤ی کانوونی دووەم - ١٣ی مایسی ١٩١٢) مۆسکۆ، لینینگراد، ١٩٣٨، ل١-٢، بەڵگەی ژمارە، ٣٤٦ و پەراوێزی ژمارە ٢.

بۆ ئەوە ڕادەکێشن کە دەورویەری ٧٤٪ی خاوەن موڵکەکان لە ئازەربایجان لە کاتی شەڕی یەکەمی جیهاندا لە ڕەعایای رووسیا لەوانە بوون کە لە لایەن ئەوەوە پارێزگاری دەکران(٢٠١). ئا بەو جۆرە ئازەربایجانی ئێرانی پێش شەڕی یەکەمی جیهان بەڕاستی ببووە ژێردەستەی رووس، بەتایبەتیش دوای ئەوەی شوجاع ئەلدەولەی بەکرێگیراوی خۆیان کردە والی کە لە ڕووسەکان رووسیتر بوو، ئەوەندە سستی لە هەڵوەستەکانی دەنواند بەڕادەیەک تەگەرەی خستەبەر کۆکردنەوەی باج لە ئازەربایجان بۆ خەزێنەی ناوەندی، کە بەتاکە سەرچاوە دادەنرا، تاران دەسەڵاتی خۆی لێیەوە بەسەر ئەو مەڵبەندەدا ڕاپەڕێنێت. هەروەها نەیهێشت ئازەربایجان بەشداری ئەو هەڵبژاردنە نوێیەی شوورا بکات کە ئاداری ١٩١٤ دەستی پێ کرد(٢٠٢)، کاری گەیاندە ڕادەیەک کە ئەحمەد پاشا باڵق بوو پەڵپی لە ئاهەنگ گێڕان بەبۆنەی تاج لەسەر نانییەوە گرت، بەئاشکراش فەرمانی لەوبارەیەوە دەرکرد(٢٠٣).

لە ساڵانی شەڕی یەکەمی جیهان، ئازەربایجان دووچاری جۆرەها مەینەتی بوو، تایبەت کە خاکەکەی بووە مەیدانی کارە سەربازییەکانی ڕووسیا و تورکیا و ئەڵمانیا، ئەوە سەرەڕای کردەوەی دەستوپێوەندی دەرەبەگە گەورەکان، کە بەڕاستی ببوونە ڕێگر و، بەئارەزووی خۆیان دزی و تاڵانیان دەکرد. ئەوەش بووە هۆی دروستبوونی گرفتی گەورەی ئابووری، هەژارەکان گیرۆدەی ببوون. لێرە بەسە ئاماژە بۆ نرخی گەنم لە تەورێز بکەین کە بۆ نزیکەی ٢٠٠ هەندەی نرخی پێش شەڕ بەرز ببۆوە(٢٠٤).

هەرچەند هەڵوەست سەختیش بوو، بەڵام نیشتمانپەروەرانی ئازەربایجان مەیدانی خەباتیان چۆڵ نەکرد کە لە ساڵانی شەڕدا شێوەی جۆراوجۆری گرتەخۆ و یەک مەبەستیان هەبوو. لەگەڵ هەڵگیرسانی ئاگری شەڕ (حزبی موجاهیدی ئازەربایجان) لەو ڕێکخستنە سیاسییانە بوو کە چالاکانە بەشداری شۆڕشی دەستووری کردبوو، چالاکی خۆی دەست پێ کردەوە. لە ساڵانی شەڕدا ئەندامانی حزب هاریکارییان لەگەڵ ئەو هێزانەی تورکیا کرد کە

---

(201) H. Nazem, Op, Cit, P. 128.

(202) Ibid, P. 157 - 158.

(٢٠٣) «وەزارەتی هەندەران - بەڵگەنامەی ئەرشیفەکانی حکومەتی کاتی»، زنجیرەی سێیەم، بەرگی چوارەم (٢٨ی حوزەیران - ٢٢ی تەمووزی ١٩١٤)، مۆسکۆ، لینینگراد، ١٩٣١، ل٢٢٣، بەڵگەی ژمارە ١٦٨.

(٢٠٤) بڕوانە: جبرائیل روئین دژ، انقلاب کبیر سوسیالستی اکتبر و جنبش خیابانی، «انقلاب اکتبر و ایران»، از انتشارات شعبه تبلیغات حزب توده ایران، باکو، ١٣٤٦، ل ٢٩٣.

بەشەکانی ڕۆژئاوای ئێرانیان داگیر کردبوو، چالاکی پڕۆپاگەندەی کاریگەریان دژی دەسەڵاتی ناوەندی و هاوپەیمانەکانی دەکرد. کە ئیتحادییەکان لە دروشمەکانی (یەکیەتی ئیسلام)ی ئایینی هەڵگەڕانەوە بۆ دروشمەکانی (یەکیەتی تۆرانیەت)ی نەتەوەیی، ژمارەیەکی زۆری ئازەربایجانەکانی ئێران بەدەنگیانەوە چوون و وتاریان لە ڕۆژنامەکانیان بڵاوکردەوە و دووپاتی تۆرانییەتی خۆیان دەکردەوە. هەر کە ئازەربایجانییەکانی باکوور بەیارمەتی تورکیا (کۆماری ئازەربایجان)یان پێش کۆتایی هاتنی شەڕ دامەزراند، داوایان لە ئازەربایجانییەکانی ئێران کرد بچنە تەکیان، دروشمی گواستنەوەی پایتەختیان لە باکۆوە بۆ تەورێز بەرز کردەوە. ڕۆژنامەکانیشیان کە ژمارەکانیان دەگەیشتە تەورێز و شارەکانی سنوور، برەوێکی فراوانیان پەیدا کرد بوو، مژدەی هەمان بیروباوەڕیان ڕادەگەیاند، کە بووە هۆی وروژاندنی فەرمانڕەوایانی ئێران و نێوەندە نەتەوەییەکانی فارس. ڕۆژنامەکانی ئەمانیش بەرەنگاری بیروباوەڕی ئازەربایجانی جیاخواز بوونەوە(٢٠٥).

لەگەڵ جاڕدانی شەڕ «کۆمەڵەی بڵاوکردنەوەی زانیاری» کۆبوونەوەیەکی نائاسایی لە تەورێز بەست بۆ وتووێژ لەمەڕ هەڵوەست گرتنی ئەندامانی لە بارودۆخی نوێ، هەندێکیان دەیانەویست دۆخی شەڕ بۆ تەقاندنەوەی شۆڕش لە ئازەربایجان بقۆزنەوە، هەندێکی کەشیان دەیانەویست بدەنە پاڵ عوسمانییەکان و ئەڵمانییەکان، تاقمی سێیەمیش ڕای وابوو کە بەرژەوەند وا دەخوازێت هەڵوەستەکی بێ لایەنیان هەبێت. سێ کەس لە بەرزترین ئەندامانی کۆمەڵ (محەمەد عەلی خان و میرزا ڕەزاخان تەربیت و مەحموود غەنی زادە) سەریان لە بەرلین دا و بەهاوکاری لەگەڵ حەسەن تەقی زادە کۆمەڵەیەکیان دامەزراند و گۆڤارێکی تایبەتیان بەناوی (کاوە)وە دەرکرد، ژمارەی یەکەمی مێژووی ٢٤ی کانوونی دووەمی ١٩١٦ی پێوە بوو، لە کێشە سیاسییەکانی ئێران دەدوا. بەتەواوبوونی شەڕ کۆمەڵەکەش بزر بوو، کارگێڕیەتی (کاوە)ش کەوتە دەست کەسانی نائەندام لە کۆمەڵ(٢٠٦).

ساڵانی شەڕی یەکەمی جیهان ئەستێرەی سیاسییەکی لیبراڵ ناسراو بەشێخ محەمەد

(٢٠٥) بۆ درێژەی بڕوانە: فوزي خلف شويل، ايران في سنوات الحرب العالمية الاولي، رسالة ماجستير، كلية الاداب، جامعة بغداد، ١٩٨٣، ص ١٨٣-١٨٤.

(٢٠٦) بۆ درێژەی بڕوانە: كريم طاهر زاده بهزاد، قيام اذربايجان در انقلاب مشروطيت ايران، ل٣٦٨-٣٧٦.

خیابانی بەرز بۆوە، کە بۆی لوا دەورێکی گەورە لە مێژووی ئێران بەگشتی و مێژووی ئازەربایجان بەتایبەتی بگێڕێت. محەمەد کوڕی حاجی عەبدولحەمید، کە بەشێخ محەمەد خیابانی ناسراوە، ساڵی ١٨٨٠ لە گوندی خامنئی نزیک تەورێز لە خێزانێکی بازرگانی بچووک لە دایک بوو، خۆشی بەگەنجی بازرگانی کردبوو(٢٠٧)، خیابانی هەر لە منداڵییەوە چووتە بەر خوێندن، (فقه واصول وحکمه وکلام وعلوم صرف)ی لە تەورێز و بترۆفسک(*) خوێند. بووە ڕووناکبیرێکی دیار، حەزی لە فەلسەفە و مێژوو ئابووری و بیرکاری و گەردوونناسی دەکرد، سەرەڕای زمانەکەی خۆی ئازەری و فارسی و تورکی و عارەبی و فەرەنسی دەزانی. خیابانی زیرەک و هێمن و دڵسۆز بوو، دواندەرێکی بێ وێنە بوو، وشەکانی کاری لە ناخی گوێگرانی دەکرد. ڕۆژنامەی (تجدد) ئاوا بەتوانای دواندنی هەڵدەڵێت:

«وشە جوانەکانی و ڕستە پاراوەکانی وەک ئاوی ڕوون بەجۆگەی بەخوڕدا دەڕۆیشتن»(٢٠٨).

شێخ محەمەد خیابانی لە قووڵایی دڵییەوە بڕوای بەژیانی پەرلەمانی و بەبەهاکانی دیموکراسی و سەربەستی تاک هەبوو، لە دژی هەموو جۆرەکانی ئازار و ئەشکەنجە ڕاوەستا، لە دوان و نووسینەکانی دووپاتی دەکردەوە کە بەرژەوەندی گەل و هاوولاتییەکانی لەسەرووی هەر بەرژەوەندییەکی دیکەوەیە(٢٠٩).

خیابانی زۆر بەگەرمی بەشداری شۆڕشی دەستووریی کرد، دەورێکی گەورەی لە ڕاپەڕینی تەورێز گێڕا، لە خولی دووەمی شوورا لە ساڵی ١٩٠٩ بەنوێنەری ئازەربایجان هەڵبژێررا. لە کاتی تەنگ و چەڵەمەی ساڵی ١٩١١ خیابانی لە شوورا بەجەرگەوە

---

(٢٠٧) دەربارەی مێژووی ژیانی خیابانی بڕوانە: «شێخ محمد خیابانی»، ازربایجانین دموکراتیک قوەلری، (ازربایجان) روزنامەسینین نشریەسی، ١٩٦١، بەزمانی ئازەربایجانی، ل١-٩ (پێشەکی)، بروفیسور مینورسکی، تاریخ تبریز، ترجمە وتحشیە عبدالعلی کارنگ، ل٧٨-٧٩؛ N. S. Fatemi, Diplomatic History of Persia 1917 - 1923. Anglo - Russian power politics in Iran, New York, 1952, PP. 246 - 248, 250; M. S. Ivanov, Ochirk..., P. 275.

(*) پایتەختی داغستانە، پاش شۆڕشی ئۆکتۆبەر ناوەکەی پێشووی مەحج قەڵای لێنراوە.

(٢٠٨) لە N. S. Fatemi, Op, Cit, P. 247 وەرگیراوە.

(٢٠٩) بڕوانە دوانەکەی لە: س. علی ازری، قیام شیخ محمد خیابانی در تبریز، جاب اول، تهران، ل٢٤-٣٩.

لایەنگری بەرپەرچ دانەوەی هەڕەشەی ڕووسیای کرد، لەگەڵ سەرەکی شوورا و گەورە لێپرسراوان مشتومڕێکی دوور و درێژی دەربارەی ئەو باسە کرد، پاشان کۆبوونەوەیەکی فراوانی لە یەکێ لە گۆڕەپانەکانی تارانی پایتەخت بۆ ماوەی سەعات و نیوێک بەست، تێیدا پەردەی لەسەر سروشتی سیاسەتی حکوومەتی شا و فەرمانڕەوایانی ڕووسیا بەرانبەر بەئازەربایجان هەڵماڵی(٢١٠) و لەبەر ئەوەی ناچار بوو لە ترسی گرتن تاران بەجێ بێڵێت بۆ جاری دووەم چووە داغستان، پێوەندییەکی بەتینی بەڕووناکبیرانی شۆڕشگێڕی ناوچەکانی ئەودیوی قەفقاسی وەک میرزا ڕەحیم تالبۆڤی بەرەچەڵەک تەورێزییەوە هەبوو، ئەوەی نووسینەکانی دەورێکی بالایان لە بەرزکردنەوەی وشیاری سیاسی و کۆمەڵایەتی لەنێو ڕووناکبیرانی ئازەربایجانی ئێران گێڕا. لەو وەختەوە بیروباوەڕەکانی خیابانی خەریک بوو تا ڕادەیەک لە ڕای سۆشیالیستە دیموکراسییەکان نزیک دەبۆوە. تەنانەت وای لێهات بێتە سەر ئەو بڕوایە کە پێویستە گەل بۆ بەرژەوەندی هەژاران دەست بەسەر دەسەلاتدا بگرێت بۆ بەرژەوەندی هەژاران(٢١١). پێویستە لێرەدا پەنجە بۆ ئەوە ڕابکێشین کە خیابانی لە سروشتی ئینگلیز وەک دەوڵەتێکی داگیرکەر لەو هەوارەی خەباتدا گەیشتبوو(٢١٢)، واتە لەو کاتەی کە زۆر لەسەرکردە لیبرالییەکانی ئێران بڕوایان وابوو کە دەکرێت لە خەباتیاندا لەپێناو دەستوور پشت بەلەندەن ببەسترێت، تەنانەت کار گەیشتە ئەوەی باخچەی باڵیۆزخانەی بەریتانیا هەڵبژێرن بۆ یەکەم مانگرتن کە بەهەنگاوی یەکەمی شۆڕشی دەستووری دادەنرێت.

هەر کە ئاگری شەڕی یەکەمی جیهان هەڵگیرسا خیابانی گەڕایەوە ئێران، چالاکی فراوانی دژی سیاسەتی شا و بوونی بێگانە لە تەورێز نواند، دووچاری ڕاونانی کاربەدەستانی ناوخۆ بۆوە، کە دەترسان لیبرالییەکان لە دەوری کۆببنەوە، کە تورکەکان ساڵی ١٩١٦ تەورێزیان داگیر کرد، گرتیان و بۆ قارسیان دوورخستەوە. بەڵام خێرا بەرەڵا کرا و گەڕایەوە تەورێز و چالاکی سیاسی دەست پێ کردەوە. لە ڕۆژی ٩ی نیسانی ١٩١٧ ڕۆژنامەی (تجدد)ی دەرکرد و ڕووناکبیری شۆڕشگێڕی ئازەربایجان لە دەوری خڕبوونەوە. پاشان خیابانی دەسپێشخەری لە دامەزراندنی پارتی دیموکراتی ئازەربایجان کرد، یەکەم

(٢١٠) هەمان سەرچاوە، ل٢٤-٣٩.

(211) Sh. M. Badi, Op. Cit., P. 134.

(٢١٢) س. علی ازری، قیام شیخ محمد خیابانی در تبریز، ل ٤١.

کۆنگرەی دامەزرانی لە کۆتایی ئابی ١٩١٧دا بەئامادەبوونی ٤٨٠ نوێنەر بەست، کە نوێنەرانی خاوەن زەوییە لیبرالییەکان و ڕووناکبیرانی شۆڕشگێڕ و بۆرجوازییە نوێیەکان و هەندێ کەسی هوشیاری کرێکار و پیشەگەر و پیاوە ئایینییە بچووکەکان بوون(٢١٣).

شۆڕشی ئۆکتۆبەری سۆشیالیستی بووە نوختەی گۆڕانێکی گرنگ لە خەباتی ڕزگاریخوازی ئازەربایجان لە ئێران. هەر بەکشانەوەی هێزەکانی ڕووسیا لە تەورێز و ئەردەبیل و شوێنەکانی دیکەی ئازەربایجان، دۆخێکی لەبارتر بۆ بزووتنەوەی سیاسی لە دۆخی لەبەریەکترازانی دەسەڵاتی ناوەندی، کە تاران گیرۆدەی ببوو هێنا ئاراوە. پاشان گۆڕانێکی فیکری بەرچاویش بەسەر بۆچوونی سیاسی لایەنە ڕادیکالەکانی ئازەریدا هات. پارتی دیموکراتی ئازەربایجانیش دروشمی دامەزراندنی ڕژێمی سۆشیالیستی بەرزکردەوە، داوای کرد جەماوەر بەشداری لە بەڕێوەبردنی دەسەڵاتی حوکم بکەن(٢١٤). بەڵام بەرابەر بەوە، بەدەرچوونی ڕووسیا لە یارییەکە دەروازەکانی ئێران لەبەردەم هێزە چاوچنۆکەکانی دی کەوتنە سەرپشت. تورکەکان دیسان بەشێکی زۆری خاکی ئازەربایجانیان بەتەورێزیشەوە داگیر کردەوە، دووبارە خیابانی و هەندێ لە هاورێکانی بۆ ورمێ دوورخرانەوە. ئەڵمانییەکان و ئەمریکییەکان و ئەوانی دیکەش لە ناوچە جۆربەجۆرەکانی ئێران جووڵەیان تێکەوتەوە. بەڵام هیچ دەوڵەتێک ئەوەندەی ئینگلیز کەڵکی لەو بارە نوێیەی ئێران وەرنەگرت، بەتەواوی مەیدانیان بۆ چۆڵ بوو تا پێیان لەوێ بەشێوەیەک چەسپ بکەن کە لەوەبەر وێنەی نەبێت، بەتایبەتی دوای ئەوەی ئەڵمانییەکان و تورکەکان ناچاربوون وەک ئەوانی دیکە لە خاکی ئێران بکشێنەوە، چونکە لە شەڕی یەکەمی جیهان بەزیبوون.

بەر لەوەی شەڕ بەدوو مانگ و شتێک ببڕێتەوە، وسوق ئەلدەولە وەزارەتێکی نوێی پێک هێنا و هیچ کۆی لە هاوکاریکردن لەگەڵ بەریتانییەکان لە هەموو مەیدانێکدا نەکردەوە. ئەوەندە بەسەر بڕانەوەی شەڕ تێنەپەڕی بوو، حوکمەتەکەی پەیمانێکی نوێی

---

(213) Sh. A. Tagieva, Natsionalo-Osvoboditelone Divijenie V Iranskom Azerbaijane v 1917 - 1920, Baku, 1956, PP. 44-48.

ش. ا. تاگییفا، بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی نیشتمانی لە ئازەربایجانی ئێران لە ١٩١٧-١٩٢٠، بەزمانی ڕووسی، باکۆ، ١٩٥٦، ل٤٤-٤٨؛ جبرائیل روئن دژ، انقلاب کبیر سوشیالستی اکتبر و جنبش خیابانی، ل ٢٩٧.

(214) N. S. Fatemi, Op. Cit., P. 250.

لەگـەڵ لەندەن مـۆرکـرد، بەندەکـانی مـافی وای بەئینگلیـزدا ئێـرانی وا لێ کـرد کـە لەژێردەسـتـەیی بەریتـانیـا بکات[٢١٥]. بەسـتنی پەیمانی ئەنگلۆ - ئێـرانی شـەپۆلێکی نارەزایی توندی لەنێو ئێـرانییـەکـان پەیدا کرد. بەڵام حکوومەتی وسوق ئەلدەولە پەنای بردە بەر زنجیـرەیەک کـاری وا کـە سنوور بۆ کـاریگەری بەرهەڵسکارانی نیـشـتـمـانیی دابنێت. دەسەڵاتی عورفی بەسەر تارانی پایتەختدا سەپاند، بۆ ماوەیەکی درێژ و تا دوای سەعات ٩ی شەو هاتوچۆ قەدەغە کرا، چالاکی حزبیی نەهێشت، سانسـۆرێکی توندی خستە سەر چاپکراوەکان و جموجۆڵی لیبرالییەکان.

لە هەمان کاتدا پەرەسەندنی شوێنەواری جێ پەنجەی دەست تێوەردانی بەریتـانیـا بووە بارێکی گران بەسەر شانی ئابووری ئێران، کە بەردەوام و بەسەختی دووچاری پاشماوەی وێرانەیی ئابووری ببوو، ئەوەی ساڵانی شەڕ بۆی بەجێهێشـتبوو. هەروەها برانی پێوەندی بازرگـانی لەگەڵ ڕووسیـا کـە ٧٠٪ی تەرازووی بازرگـانی دەرەوەی ئێـرانی پێک دەهێنا بەرامبەر تەنها ٢٠٪ ئینگلیز لە گەرمەی شەڕدا[٢١٦]، کاری لە دۆخی گشتی بازاڕ کرد. بۆیە باری چینە هەژارەکـانی دێ تێکچـوو، شـەقـامی شـارەکـان بەسـوپایەکی گـەورەی دەرۆزەکـەر و بێ کـار تەنران، ڕەوکـردن لە لادێوە بۆ شـار و هەندێ جـاریش بۆ دەرەوەی وڵات، ببووە دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی باو و بڵاو.

بەتەواوبوونی شـەڕ ئەو بارودۆخـە بووە هۆی تەقـینەوەی باری سیـاسی لە وڵاتدا. لەو مـاوەیەدا زۆر شـاری ئێران جموجۆڵی جەماوەری و مـانگرتنی کرێکارانەیان بەخۆوەبینی. هەڵوەست لە ئازەربـایجـان زیاتر لە هەمـوو ئێـران مـۆرکـێکی کـوشندەی بەخـۆوە گـرت، ڕاپەڕینێکی نوێ لە سـاڵی ١٩٢٠ تەقـیـەوە و بەناوی (ڕاپەڕینی خـیـابانی) چووە ناو لاپەڕەکـانی مـێژوو، لەبەر ئەوەی شێخ مـحـەمەد خیـابانی ڕابەری بوو، کە لە ڕۆژی ٩ی نیسان[٢١٧] و لە کۆبوونەوەیەکی جەماوەری ڕایگەیاند، ولایەتی ئازەربایجان پێوەندی خـۆی بەدەسـەڵاتی ناوەندی دژ بەدیموکـراتیـیـەت بڕی. دوای چەند ڕۆژێک نەخـشـەیەکی چاککردنی دەربارەی کـاروباری ڕووناکـبـیـری و دارایی لە ئازەربـایجـان ڕاگـەیاند،

(٢١٥) بۆ درێژەی دەربارەی بڕوانە: بابەتی (رضا المازندراني والعرش الايراني) لە نەسڵی کتێبەکە بەزمانی عارەبی (دراسات في تاريخ ايران الحديث والمعاصر).

(216) H. Nazem, Op. Cit,. P. 173.

(٢١٧) بەپێی هەندێ سەرچاوە ڕۆژی حەوتی نیسانە.

نەخۆشخانەیەک و سێ فێرگەی نوێی لە تەورێز دامەزراند کە (المحمدیة) و (فیوضات) و (حکمت) بوون. گۆڤاری (ئازادیستان)ی بلاوکردەوە، کە کاری پەخشی (تیورو بیروباوەڕەکانی ڕاپەڕینی) خستە ئەستۆی خۆی. نرخی کەرەستەی پێویستی ژیانی کەم کردەوە، نازناوی لابرد، نەخشەی دامەزراندنی سوپایەکی میللی دانا کە ١٢ هەزار جەنگاوەری هەبێ(٢١٨). خیابانی هەوڵی دەدا ناوچەکانی دیکەی ئێرانیش هان بدا کە بەرووی وەزارەتی وسوق ئەلدەولە ڕاپەڕن. لە ژمارەی ڕۆژی ١٥ی حوزیرانی ١٩٢٠ی ڕۆژنامەی (تجدد) دەنووسێت و دەڵێت (بزووتنەوەی تەورێز ئاگادارکردنەوەی چینی فەرمانڕەوای بۆگەنی تاران و نموونەیەکی چاکی هەرێمەکانی دیکەی وڵات بوو)(٢١٩).

خیابانی لە نووسین و دوانەکانی ڕۆژانەیدا(٢٢٠) لەسەر پێویستی (گۆڕینی ڕژێمی حوکم لە ئێران) موکڕبوو بەڕژێمێکی کۆماری کە (ئازادی و بەهای ئەخلاقی باشتر و ئاسانکردنی زۆرتری دەرفەتی خوێندن (بەدەست بێنێ)(٢٢١).

جەماوەری ئازەربایجان زۆر بەگەرم و گوڕییەوە پێشوازی بزووتنەوەی خیابانی کرد، زایەڵەی شۆڕشگێڕان لە هەموو شوێنێک بەرز بۆوە، تایبەت لە مەڵبەندی شارەکان(٢٢٢). شۆڕشگێڕان دەستیان بەسەر مەڵبەندەکانی میری داگرت و هەموو فەرمانبەرانی سەربەشایان دەرکرد، ئەوانەی دیکەش چوونە ناو دامودەزگا شۆڕشگێڕیی نوێیەکان، لەوانە جەندرمەکان کە ژمارەیەکی باشی لە بەشدارانی شۆڕشی دەستووری تێدابوو. شۆڕشگێڕان ناوێکی نوێیان بۆ ڕژێمەکەیان و ناوچە ئازادکراوەکان هەڵبژارد کە (ازادیستان) بوو، واتە (نیشتمان یا وڵاتی ئازادی)، حکوومەتێکی تایبەتیشیان لە ڕۆژی ٢٤ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٢٠ پێک هێنا، نوێنەرانی ڕووناکبیر و بازرگان و پیاوانی ئایینی و خاوەن موڵکە بچووکەکان بەشدارییان تێدا کرد. حکوومەتی (ازادیستان) ئامانجەکانی لەو خاڵە

---

(٢١٨) س. علی ازری، قیام شیخ محمد خیابانی در تبریز، ل ٤٠٧، ٤٩٥ - ٤٩٦، Sh. A. Tagieva. Op. Cit,. PP. 98 - 99.

(٢١٩) لە N. S. Fatemi, Op. Cit., PP. 251-252 وەرگیراوە.

(٢٢٠) خیابانی ئێوارانی هەموو ڕۆژێک دوانی بۆ خەڵکی تەورێز دەدا ( و. مینورسکی، تاریخ تبریز، ترجمە وتحشیە عبدالعلی کارنگ، ل ٧٩).

(221) G. Lenczowski, Russia and West in Iran (1918 - 1948), New York, 1949, P. 61.

(٢٢٢) ڕژێمی خیابانی بایەخی تەواوی بەزەوی نەدا، ئەوەش بووە هۆی دوورە پەرێزی جەماوەری بەرینی جووتیاران تا ئەندازەیەکی بەرچاو لە قەوماوەی شۆڕشگێڕییەکانی تەورێز.

سەرەکیانەی خوارەوە کورت کردبۆوە:

١- هەڵگێرانەوەی ڕژێمی شا و دامەزراندنی ڕژێمێکی دیموکراتی.

٢- دوایی هێنان بەپاشکۆیەتی ئێران بەدەوڵەتە گەورە داگیرکەرەکانەوە.

٣- دانی خۆڕێبەری بەئازەربایجانی ئێران.

٤- دانی سەربەستییە دیموکراتییەکان، چاککردنی ئابووری و ڕووناکبیری و شتی دیکەش.

قەوماوەکانی ئازەربایجانی شۆڕشگێڕ ترسیان خستە دڵی فەرمانڕەواکان و هەموو کۆنەپەرستانی ئێران، بۆیە پەنایان بردە بەر ئەنجامدانی کردەوەی پێویست بۆ سەرکوتکردنی بزووتنەوەی نیشتمانی ئازەری پێش ئەوەی لەو هەوارە کاریگەرە نوێیەیدا ببێتە شۆڕشێکی سەرتاسەری وەک شۆڕشی دەستووری[٢٢٣]. نەخشەی حکوومەتی شا دژی (ازادیستان) ڕاستەوخۆ لەلایەن باڵیۆزخانەی بەریتانیا لە تاران پشتیوانی لێ کرا، نەخوازە کە لایەنێکی گەورەی دەنگی نارەزایی شۆڕشگێرانی ئازەربایجان دژی بوونی بەریتانیا بوون لە وڵاتدا، تایبەت دژی پەیمانی ساڵی ١٩١٩ کە چەند جار لە دوانەکانی خیابانی و لەسەر لاپەڕەکانی ڕۆژنامەی (تجدد)[٢٢٤] ناوی هاتووە. بۆیە شتێکی سروشتی بوو بەریتانییەکان دژایەتی ڕاپەڕینی خیابانی بکەن، بەقسەی عەلی ئازەری دانەری کتێبی (هەستانی شێخ محەمەدی خیابانی لە تەوریز)[٢٢٥]، ئەدمۆندسیان بەتایبەتی بۆ ناوچەکە نارد (بۆ کارێکی تێکدەرانە). کاربەدەستانی ئێران بەهاندانی بەریتانییەکان پرۆپاگەندەی درۆودەلەسەیان دەربارەی خیابانی بڵاوکردەوە، بەجیاخوازیان تاوانبار دەکرد، ئەگەرچی داخوازییەکانی بریتی بوون لە خودموختاری کە بەتەواوی لەگەڵ ناوەڕۆکی مادەی بیست و نۆیەمینی یاسای پاشکۆیی دەستووری ئێران ڕێک بوو[٢٢٦].

تاران پیلانێکی فێڵاوی بۆ لەناوبردنی ڕاپەڕینی خیابانی دانا. (مخبر السلطنة هیدایت)یان بەحاکمی نوێی گشتی لەسەر ئازەربایجان دانا، ئەوەی هەوڵی دەدا خۆی لە کراسی یەکێکی بڕوا بەبیروباوەڕی لیبرالی بوو نیشان بدا. هێزێکی قۆزاق تا ئازەربایجان

---

(٢٢٣) لەو ماوەیەدا ناوچەکانی دیکەی ئێرانیش جموجۆڵی شۆڕشگێڕییان تێکەوت، ڕووداوەکانی ئازەربایجانیش کاری لە هەندێکیان کرد.

(224) M. S. Ivanov, ochirk..., PP. 275 - 276.

(٢٢٥) س. علی ارزی، قیام شیخ محمد خیابانی در تبریز، ل٤١٣.

(226) Sh. M. Badi, Op. Cit., PP. 136 - 137.

لەگەڵی هاتن، لە نزیک تەوریز ئۆردووی هەڵدا. حاکمی گشتی نوێ کەوتە گفتوگۆیەکی (دۆستانە) لەگەڵ سەرکردەکانی ڕاپەڕین، لە بنەوەش پێوەندی گومان لێکراوی لەگەڵ کەسانی کۆنەپەرست دەبەست و ویژدانی کەسە بودەڵەکانی دەکڕی، ئەوانەی خۆیان کوتابووە ڕیزی شۆڕشگێڕان. بەدرێژایی دە ڕۆژی وتووێژیش، بەدیقەت قایمەکارییەکانیان دەرس کرد، بەجۆرێک کە دڵنیایی خستە دڵ و گیانی خیابانی و هاوڕێکانی. لە دواییدا (مخبر السلطنة) لە بەرەبەیانی ١٢ی ئەیلوولی ١٩٢٠ زەبرێکی ناکاوی سرەواندە شۆڕشگێڕان، لەگەڵیا دەستیان بەسەر بنکەکانی شۆڕشگێڕاندا گرت و زیاتر لە ٣٠٠ خانووی سەرکردەکانی ڕاپەڕینیان داگیرکرد و زۆربەیان کوژران و ئەوانی دیکەش گیران. خیابانی خۆی نەدا دەست، لەگەڵ هەندێ لە لایەنگرانی بۆ ماوەی دوو ڕۆژ بەرگری کرد، تا بەناپەسەندترین شێوە لەسەر دەستی پەلاماردەران لە ڕۆژی ١٤ی ئەیلوول کوژرا(٢٢٧)، بۆ ئەوەی سەردەمێکی خامۆشی دیکەی نوێ لە خەباتی ڕزگاریخوازی ئازەربایجان لە ئێران دەست پێ بکات.

ڕاپەڕینی خیابانی هەرچەند سەری نەگرت، بەڵام یاریدەی بەرزبوونەوەی وشیاری شۆڕشگێڕی لە ناوچەکانی دیکەی ئێراندا، بووە یەکێ لە هۆکانی ڕووخانی وەزارەتی (وثوق الدولة)ی سەر بەبەریتانیا لە ناوەڕاستی ساڵی ١٩٢٠. وێڕای ئەوانەش ڕاپەڕین هاوبەشی لە ڕیسواکردنی کەموکورتییەکانی حوکمی قاجاری کرد، کە دوای شەڕ بەتەواوی ئابڕووی لەبەرچاوی ئێرانییەکان لەدەست دابوو، دۆخێکی لەبارتری لابردنی بۆ ڕەخساند، ئەوەی ڕەزا مازندەرانی (پاشان پەهلەوی)زانی چۆن بۆ لەناوبردنی حوکمی ئەحمەدشا بەکاری بێنێت، بەوەش دوایی بەسەردەمی قاجارییەکان لە مێژووی ئێرانی نوێ هات لە ڕۆژی ٣١ی تشرینی یەکەمی ١٩٢٥، بۆ ئەوەی سەردەمێکی نوێی دیکە لە مێژووی هاوچەرخی (ئێران) دەست پێ بکات لە ڕۆژی ١٢ی کانوونی یەکەمی ١٩٢٥، کە ڕەزاشا دامەزرێن و یەکەم شای بوو(٢٢٨).

بەر لەوەی ڕەزاشا بەچەند ساڵێک بێتە سەر تەخت توانی بزووتنەوە و ڕاپەڕینەکانی شۆڕشگێڕانی گەلانی نافارس لە ئێران دلڕەقانە سەرکوت بکات، بۆیە ساڵانی حوکمە

---

(٢٢٧) بۆ درێژەی بڕوانە: س. علی ازری، قیام شیخ محمد خیابانی در تبریز، ل٦٤٨-٦٥٢؛ جبرائیل ڕوئین دژ، انقلاب کبیر سوسیالیستی اکتبر و جنبش خیابانی، ل٣٠٢-٣٠٣؛ Sh. A. Tagieva. Op. Cit,. PP. 113 -114.

(٢٢٨) بۆ درێژەی بڕوانە: بابەتی (رضا المازندراني والعرش الايراني) لە ئەسڵی کتێبەکە بەعارەبی.

دکتاتۆرییەکەی تا ڕادەیەک بەسەردەمێکی هێمن دادەنرێت، هەر هیچ نەبێت بەڕواڵەت، لە مێژووی ئێرانی هاوچەرخ. بەڵام ڕاستییەکەی کاری کەڵەکەبوونی چەندایەتی ڕقی پیرۆزی نێو دەروونی ڕۆڵەکانی ئەو گەلانە لە پەرەسەندن دا بوو، تایبەت لەبەر ئەوەی سەردەمی پەهلەوی لەسەر سیاسەتی شۆڤینیانەی بەفارسکردن بنیات نرابوو. پرۆفیسۆر م. س. ئیڤانۆڤ لەو بارەیەوە دەڵێت:

«ئێرانی سەردەمی ڕەزا شا زیندانێکی خامۆشی گەلان بوو، سادەترین مافی کەمینە نەتەوایەتییەکان پێشێل دەکرا»(٢٢٩). سەرەڕای زۆرداری و ئامرازەکانی سەرکوتکردن، بەڵام نارەزایی ئازەربایجانییەکان لە سەردەمی ڕەزاشا بەشێوەی جۆراوجۆر دەنوێنرا، ئەو ڕەزا شایەی، بەقسەی مێژوونووسی ئینگلیز پیتەرئەڤری، لە دڵەوە ڕقی لە ئازەرییەکان دەبۆوە(٣٣٠). ئەو ڕۆژگارە دۆخێکی نوێ لە خەباتی ڕزگاریخوازی ئازەربایجاندا سەری هەڵدا، ئەویش بەگەشەستاندنی دەوری ڕەنجدەران بەکرێکار و جووتیارەوە تێیدا. حوزەیرانی ساڵی ١٩٢٦ سەرباز و جووتیارەکانی دیلمان، کە لە سەردەمی پەهلەوی بەشاهپور دەناسرا، ڕاپەڕین(٢٣١). ڕەزا شا دڵڕەقانە سوپای بۆ سەرکوتکردنیان بەکارهێنا. لە ساڵی ١٩٣٠ دوو هەزار جووتیاری مازندەرانی، لەبەربڕینی ئاو لە زەوییەکانیان و کردنیان بەزەوی شا، یاخیبوونیان ڕاگەیاند، شاش هیچ سڵی لە بەکارهێنانی هێز لە دژیان نەکردەوە، بەدەیانیان پەنایان بردە بەر لێڕەوارەکانی دەوروبەری. لە ساڵی ١٩٣١ یاخیبوونێک لە کارگەی شقارتە لە تەورێز قەوما، دوو مانگرتنیش لەنێو کرێکارانی شەمەندەفەر لە مازندەران و دەوروبەری قەوما. لە هەمان کاتدا هەوڵدرا بۆ دامەزراندنی ڕێکخراوەکانی کرێکاران و لاوان لە گەلێ لە شارەکانی ئازەربایجان(٢٣٢). هەروەها لە شوێنی دیکەش، لە کاتی جۆراوجۆر، جموجۆڵی وەک ئەو ڕووداوانەی تەورێز و مازندەرانیان بەخۆوەبینی، کە ڕەنگدانەوەی ئەو واقیعە تراژیدیایەی چینە کۆمەڵایەتییەکانی ڕەنجدەرانی سەردەمی پەهلەوی بوو. ئەو بانگەوازەی کە (کۆمەڵەی لەناوبردنی ئیمپریالیزم) بۆ کرێکارانی جیهانی نارد لە مێژووی ٢٠ی تەمووزی ١٩٣١دا دەڵێت:

---

(229) M. S. Ivanov, Ochirk..., P. 325.

(230) P. Avery, Modern Iran, P. 387.

(٢٣١) دەسەڵاتدارانی سەردەمی پەهلەوی ناوی گەلێ شار و ناوچەی ئازەربایجانیان گۆڕی.

(232) A. E. Diomin, V. V. Trubetskay, Iran V Godi Economicheskovo Crisisa, "Iran Ochirk Noveyshi Istori", Moscow, 1976, PP. 106, 109; M. S. Ivanov, Ochirk..., PP. 325 - 327.

«زیاتر لە دوو هەزار زیندانی سیاسی لە زیندانەکانی فارس دووچاری ئازار و ئەشکەنجە بوون. حکوومەتی پەهلەوی تەنانەت مافی ئەوەیشیان ناداتێ بدرێنە دادگا. رێکخراوە شۆڕشگێڕییەکانی کرێکارانی ئێران دووچاری زەبروزەنگی درندانە هاتوون»(٢٣٣).

بەڵام ڕەزاشا تۆزقاڵێک بایەخی بەڕای گشتی ناوەخۆ و دەرەوە نەدا، بێ ڕەحمانە بەردەوام بوو لەسەر سیاسەتی سەرکوتکەرانەی دەرهەق بەئازەربایجانییەکان و ئێرانییەکان دی. بەپێلێنانی ڕۆژنامەکانی ئێران خۆیان، دادگا سەربازییە تایبەتەکان لە نیوەی دووەمی ساڵی ١٩٣٢دا، ١٥٣ کەسیان تاوانبار کردووە، فەرمانی مردنیان بەسەر ٣٦ کەسیان جێبەجێ کردووە، ١٩ کەسیشیان حوکمی ئەبەدی دراون. تێکڕایی حوکمی ئەوانەی دیکەش دەیکردە (٣٥٥) ساڵ(٢٣٤).

لە ساڵانی شەڕی دووەمی جیهان، خەباتی ڕزگاریخوازی ئازەربایجان پێی نایە هەوارێکی نوێ لە ڕەوتی پەرەسەندنیدا، تایبەت دوای دوورخستنەوەی ڕەزاشا لە تەخت لە ڕۆژی ١٦ی ئەیلوولی ساڵی ١٩٤١. لەو ڕۆژەوە تاران بەکردەوە هەموو دەسەڵاتێکی لە ئازەربایجان لە دەست دا، کە ببووە بەشێک لەو ناوچەیەی کەوتبووە بن دەسەڵاتی هێزەکانی سۆڤێت(٢٣٥). ڕاستییەکەی ئازەربایجانی ئێران لە ساڵانی شەڕدا لە ژانێکی شۆڕشگێڕی بەسۆ دەژیا، بێزاری زۆربەی هەرە زۆری دانیشتووانی گرتبۆوە. بەرێکەوت نەبوو کە محەمەد ڕەزا شا هاتە سەر تەخت دووپاتی کردەوە کە پێویستە چاککردن (اصلاحات) بەشێوەیەکی تایبەت لە ئازەربایجان بکرێت(٢٣٦). لەو هەوارەدا داخوازی ئازەربایجانییەکان بریتی بوو لە چاککردنی دەستوور بەشێوەیەک مافەڕەواکانی نەتەوەیی دابین بکات، دەزگاکانی دەوڵەت خاوێن بکرێتەوە، ئازادییە دیموکراسییەکان بەرەڵا بکرێن. لەبەر ئەوەی لایەنەکانی حکوومەت بەشێوەیەکی تایبەت لە دەستپێشخەری ئازەربایجانییەکان دەترسان، بۆیە پەنایان بردە بەر کاری سەیر سەیر دەرهەقیان. لە ساڵی

---

(٢٣٣) بڕوانە: M. S. Ivanon, Ochirk..., P. 328.

(234) A. E. Diomin and V. V. Trubetskay. Op. Cit, P. 110.

(٢٣٥) ٢٥ی ئابی ١٩٤١، دوای پەرەسەندنی دەسەڵاتی ئەڵمانیا لە ئێران، هێزەکانی سۆڤێت چوونە ناوچەکانی باکوور، بەریتانییەکانیش چوونە ناوچەکانی باشووری ئێران. دوای تەواوبوونی شەڕی دووەمی جیهان لێی کشانەوە.

(٢٣٦) بڕوانە: عبدالهادي كريم سلمان، ايران في سنوات الحرب العالمية الثانية، رسالة ماجستير، كلية الاداب - جامعة بغداد، ١٩٨٣، ص١٣٠.

١٩٤٤ شوورا ئەندامەتی سیاسی بەناوبانگی ئازەربایجان جەعفەر پیشەوەری پەسند نەکرد کە زۆربەی هەرە زۆری دەنگی دەنگدەرانی تەورێزی لە هەڵبژاردنی ١٩٤٣ وەرگرتبوو، ئەو کارەی بووە هۆی خرۆشانی شەپۆلێکی نارەزایی توند لەنێو ئازەربایجانییەکان و کاری لە تارانیش کرد، ٦٠ رۆژنامەنووس لە نووسەرانی رۆژنامەکانی پایتەخت نارەزاییان دژی ئەو بریارەی شورا دەربڕی. بەهەمان شێوە وەزارەتی ناوەخۆ لە ساڵی دواییدا دانی بەئەندامە هەڵبژێراوەکانی ئەنجوومەنی شارەوانی تەوورێز نەنا(٢٣٧).

لەگەڵ تەواوبوونی شەڕی دووەمی جیهان ئازەربایجانییەکان خەباتیان لەپێناو مافە نەتەوایەتییەکانیان بەتینتر کرد، لە جاران زیاتر بایەخیان بەرێکخستن دا. ئابی ١٩٤٥ نیشتمانپەروەرانی ئازەربایجان (فرقە دیمقرات ازربایجان) (پارتی دیموکراتی ئازەربایجان)یان دامەزراند، کە یەکەم کۆنگرەی خۆی لە رۆژی ٢ی تشرینی یەکەمی هەمان ساڵ بەئامادەبوونی ٢٣٥ نوێنەر لە تەورێز بەست و بەدرێژایی چوار رۆژ گفتوگۆیان دەربارەی بەرنامە و پەیرەوی ناوەخۆکرد، لیژنەی ناوەندییان هەڵبژارد. هەروا حزب ئۆرگانی خۆی بەناوی (ئازەربایجان) بەزمانی ئازەری دەرکرد(٢٣٨).

جەماوەرێکی فراوان لە دەوری پارتی دیموکراتی ئازەربایجان خڕبوونەوە. بەپێی ئەو زانیارییانەی رۆژنامەی (ئازەربایجان) لە ژمارەی رۆژی ٢٣ی کانوونی دووەمی ١٩٤٦ بڵاوی کردۆتەوە، ژمارەی ئەندامانی حزب لە کۆتایی ساڵی ١٩٤٥ گەیشتە دەوروبەری حەفتا هەزار ئەندام، پەنجا و شەش هەزاریان جووتیار و شەش هەزاریان کرێکار و سێ هەزاریان کاسبکار و دە هەزاریان رووناکبیر و دوو هەزاریان وردەبازرگان و پێنج سەدیان وردە مالیک و سەدیان پیاوی ئایینی بوون.

بەر لە تەواوبوونی ساڵی ١٩٤٥ ئازەربایجانییەکان هەنگاوێکی دیکەیان نا. بەهۆی ئەو کۆبوونەوە جەماوەریانەی لە سەرتاسەری ئازەربایجانی ئێران بەرێوەچوون، بریاردرا ئەنجوومەنی گەل دامەزرێنن، لە رۆژی ٢٠ی تشرینی دووەم بەئامادەبوونی ٧٤٤ نوێنەر لە

---

(237) P. Avery, Op. Cit. p. 388; M. S. Ivanov, Ochirk..., P. 367.

(٢٣٨) لە ساڵانی شەڕی دووەمی جیهان و تایبەت دوای رووخانی رەزا شا، ژمارەی ئەو رۆژنامانەی لە ئێران دەردەچوون بەشێوەیەکی بەرچاو زێدە بوون، تەنیا لە تارانی پایتەخت ١٠٣ رۆژنامە و ٢٩ گۆڤار دەرچوون، لە تەورێزیش چوار رۆژنامە دەردەچوون.

گشت چینە کۆمەڵایەتییەکان و گشت ناوچەکانی دیکەی ئازەربایجان کرایەوە.

ئەنجوومەن دروشمی (خودموختاری) بەرزکردەوە و لیژنەیەکی تایبەت هەڵبژێررا کە لە ۳۹ ئەندام پێک هاتبوو، بەڕێوەبردنی ئازەربایجان و هەڵبژاردنی ئەندامانی ئەنجوومەنی تایبەت ئازەربایجان لەگەڵ مافی گفتوگۆکردن لەگەڵ تاران بۆ چارەکردنی کێشەی ئازەربایجان بەئاشتیانەی پێ سپێررا. کە هەڵبژاردنی ئەنجوومەنی نیشتمانیی ئازەربایجان کرا، بۆ یەکەم جار لە مێژووی ئێران، ئافرەت بەشداری تێدا کرد، لە ۲۱ی کانوونی یەکەمی ۱۹٤٥ ئەنجوومەن کرایەوە و ژمارەی ئەندامانی گەیشتە ۱۰۱، هەروەها ئەنجوومەن سەرۆکایەتی حکوومەتی ئازەربایجانی خاوەن خودموختاری بەجەعفەر پیشەوەری سپارد، کە بەرنامەکەی لەو خاڵانەی خوارەوە دیاری کردبوو:

١- چەسپاندی خودموختاری بۆ ئازەربایجان.

٢- هەڵبژاردنی ئەنجوومەنەکانی کارگێڕی بۆ شار و هەرێمەکان.

٣- گۆڕینی دەستەی جەنگاوەران بەسوپای میللی.

٤- زمانی ئازەری ببێتە زمانی ڕەسمی.

٥- بڵاوکردنەوەی خوێندنی خۆڕا و بەزۆر، دامەزراندنی زانکۆیەکی تایبەت.

٦- پەرەپێدانی پیشەسازی و بازرگانی.

٧- دانانی یاسای کار و ڕێکخستنی پێوەندی نێوان خاوەن زەوی و جووتیارەکان.

٨- دابەشکردنی زەوییەکانی دەوڵەت و زەویوزاری دەرەبەگەکانی ئازەربایجان، ئەوانەی خۆیان دابووە پاڵ سەنگەری دوژمنان، بەسەر جووتیاران.

٩- دابینکردنی سەربەستی ڕا و بیروباوەڕ بۆ هەموو هاونیشتمانانی ئازەربایجان.

لەهەمان کاتدا حکوومەتی پیشەوەری ڕایگەیاند کە دان بەحکوومەتی ناوەندیدا دەنێت، هەر فەرمانێ لێوەی دەرچێت جێبەجێی دەکات، ئەگەر لەگەڵ بنەماکانی خودموختاری جاڕدراوی ئازەربایجان ناکۆک نەبێت(۲۳۹).

هەروەها زنجیرەیەک کاریشی بۆ ڕێکخستنی پێوەندییەکانی نێوان جووتیاران و خاوەن

---

(۲۳۹) بۆ درێژەی بڕوانە: M. S. Ivanov, Ochirk..., PP. 369 - 370; P. Avery, Op. Cit, PP. 390 - 391.

زەوییەکان کرد، کە تایبەت بوو بەدابەشکردنی بەرهەم. دەوروبەری ٢٦٠ هەزار هێکتار زەوی کشتوکاڵی بەسەر نزیکەی ٢١٠ هەزار جووتیاردا دابەش کرد، کاروباری ئابووری ناوچەکەی ڕێکخست، کارگەیەکی بۆ پیشەسازی مافوور دامەزراند، سەعاتی کاری ڕۆژانەی کردە هەشت سەعات. هەروەها حکوومەتی پیشەوەری بایەخێکی تایبەتی بەڕووناکبیری و هونەردا، دامەزراندنی (زانکۆی حکوومەتی ئازەربایجان)ی ڕاگەیاند، ژمارەیەکی زۆر فێرگەی نوێی کردەوە، تیپی تایبەتی بۆ نەهێشتنی نەخوێندەواری لە لادێ پێک هێنا و فێرگەیەکی هونەری و شانۆیەک و تیپی مۆسیقای دامەزراند. بەو کردەوە نوێیانە وای لێهات خەرجی گوزەران (كلفة الحياة) لە تەورێزی دووەم شاری گەورەی ئێران، بەڕێژە دوو هێندی تاران هەرزان بێت.

لە دۆخی ئەو ڕۆژەی ئێران و لە ئەنجامی سەرنەگرتنی تێکڕایی هەوڵی لایەنەکانی فەرمانڕەوا و دەرەبەگە گەورەکانی ئازەربایجان بۆ دروستکردنی گێروگرفت لە ئازەربایجان[٢٤٠]، حکوومەتی (قوام السلطنة) ناچار بوو کە لەگەڵ حکوومەتی پیشەوەری بکەوتە گفتوگۆ، بەمۆرکردنی ڕێککەوتننامەیەک لەبەینی هەردوولا لە ڕۆژی ١٣ی حوزەیرانی ١٩٤٦ کۆتایی پێ هات، بەندەکانی ئەو ڕێککەوتنە لایەنێکی گەورەی داخوازییەکانی ئازەربایجان بوو، بەڵام دەسەڵاتدارانی ئێران توانییان بەهۆی زنجیرەیەک مانۆڕی سیاسی و لە ئەنجامی پشتگیری ڕاستەوخۆی لەندەن و واشنتۆن، بارودۆخیان کۆک بکەنەوە. هەر لەناوەڕاستی ساڵی ١٩٤٦ زەبری یەک لە دوای یەک لەو دەسکەوتە دیموکراتییە کەمانە درا کە ئێرانییەکان لە ئەنجامی بارودۆخی شەڕ و تێکشکانی فاشیەت و وەدەستیان هێنابوو. پاشان نۆرەی ئازەربایجان و کوردستان[٢٤١] هات. لە ٢١ی تشرینی دووەمی ١٩٤٦ (قوام السلطنة) ڕایگەیاند کە تاران دەیەوێ هێزەکانی بنێرێتە هەموو هەرێمەکانی ئێران بێ هەڵاوێردن، گوایە بەئامانجی (دابینکردنی سەربەستی هەڵبژاردن)ی شوورا لە خولی پازدەمینیدا. هێزەکانی ئێران بەڕاستی ڕوویان لە ئازەربایجان کرد دوای بڵاوکردنەوەی ڕاگەیاندنەکە بەکەمتر لە سێ هەفتە، شاڵاوێکی تۆقاندنی بەرفراوانی دەست پێ کرد، بووە هۆی کوشتن و گرتنی هەزاران ئازەربایجانی و

---

(٢٤٠) تەنیا لە ماوەی مانگی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٤٥ کۆنەپەرستان دەوروبەری سەد کەسیان لە لایەنگرانی پارتی ئازەربایجان بەکوشت دا.

(٢٤١) دەربارەی ڕووداوەکانی کوردستان بڕوانە بابەتی (هەندێ ڕاستی دەربارەی خەباتی ڕزگاریخوازی کورد لە ئێران).

هەلاتنی دەیان هەزاریان بۆ ناو خاکی ئازربایجانی سۆڤێت، جەعفەر پیشەوەری خۆشی بۆ ئەوێ هەلات[٢٤٢]. بەپێی ئەو زانیارییانەی رۆژنامەی (مردم) لە ژمارەی رۆژی ٧ی تەمووزی ١٩٤٧ پەخشی کردووە، دوای لەناوبردنی حکوومەتی پیشەوەری، فەرمانی مردن بەسەر - ٧٦٠ کەس لە دیموکراتیانی ئازەربایجان درا. قەوماوەکانی ئەو دواییە زەبرێکی کوشندە بوو لە خەباتی رزگاریخوازی ئازەربایجان لە ئێران درا، پێویستی بەسالانێکی زۆر هەبوو تا سەرلەنوێ هەناسەی بێتەوەبەر، بۆ ئەوەی جارێکی دی ببێتەوە هێزێکی زەبر وەشێن و دیار لە گۆرەپانی سیاسی ئێران. هەردەم خەباتی رزگاریخوازی ئازەربایجان هەمیشە درکێکی ژەهراوی بووە لەبن کەلەکەی رژێمی پەهلەوی تا کۆتابوونی...

---

(٢٤٢) جەعفەر پیشەوەری لە نزیک باکۆ بەکارەساتی ئۆتۆمبیل کۆچی دوایی کرد. گومان کەوتە سەر باقرۆڤی سەرکردەی ستالینی سەرەرۆی، سکرتێری یەکەمی پێشووی پارتی کۆمۆنیستی ئازەربایجان، بۆ ئەنجامدانی. ناوبراو لەگەڵ بیریا گوناهبارکران و لە دار دران.